## مەلا بەختیار



# لەبری بیرەوەری





## خوێندنەوەیەکی جیاواز
## ڕەخنە، لێکدانەوە، توێژینەوەی:

- سایکۆلۆژیەتی توندو تیژی، زادەی چ کلتورێکە؟
- ڕاستیەکانی ئالأی شۆڕش و ڕەخنەکانی مام جەلال.
- دیلکوشتنی قڕناقاو پشت ئاشان و ئاشتی مەڵبەندی یەك.
- ترساندنی سایکۆلۆژی و پلنیۆمی تیربارانی ڕەنجدەران!
- سڕینەوەی پەڵە چڵکنەکانی فەرەیدون عەبدولقادر.
- هەڵبەستنی بکوژی فوئاد سوڵتانی.
- ئاسەواری: جەلالی ـ مەلایی، کارەساتی هەکاری، دانوستان.

# له بری بیرەوەری

## خوێندنەوەیەکی جیاواز

ڕەخنە، لێکدانەوە، توێژینەوەی:

- سایکۆلۆژیەتی توندو تیژی، زادەی چ کلتورێکە؟
- ڕاستییەکانی ئاڵای شۆڕشو ڕەخنەکانی مام جەلال.
- دیلکوشتنی قڕناقاو پشت ئاشانو ئاشتی مەڵبەندی یەك.
- ترساندنی سایکۆلۆژیو پلنیۆمی تیربارانی ڕەنجدەران!
- سڕینەوەی پەڵە چڵکنەکانی فەرەیدون عەبدولقادر.
- هەڵبەستنی بکوژی فوئاد سوڵتانی.
- ئاسەواری: جەلالی – مەلایی، کارەساتی هەکاری، دانوستان.

## مەلا بەختیار

تەممووزی - ٢٠٢٠

# لەبری بیرەوەری

ناوی نووسەر: مەلا بەختیار

تایپ: تەها حەمەنوری

بەرگ: باسم رەسام

دیزاینی ناوەوە: ئومێد محەمەد

هەڵبڕی: ناوەندی رۆشنگەریی چاودێر

نۆرەی چاپ: ٢٠٢٠

تیراژ: ٦٠٠٠ دانە

نرخ: ٨٠٠٠ دینار

چاپ: تاران

لەبەڕێوەبەرێتی گشتیی کتێبخانەکان
ژمارەی سپاردنی (١٦٨٥)ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە

لە بڵاوکراوەکانی
ناوەندی رۆشنگەریی چاودێر

# لە بری بیرەوەری

## خوێندنەوەیەکی جیاواز

رەخنە، لێکدانەوە، توێژینەوەی:

- سایکۆلۆژیەتی توندو تیژی، زادەی چ کلتورێکە؟
- ڕاستییەکانی نالای شۆڕشو رەخنەکانی مام جەلال.
- دیلکوشتنی قرناقاو پشت ناشانو ناشتی مەلبەندی یەك.
- ترساندنی سایکۆلۆژیو پلنیۆمی تیربارانی رەنجدەران!
- سڕینەوەی پەڵە چڵکنەکانی فەرەیدون عەبدولقادر.
- هەڵبەستنی بکوژی فوئاد سولتانی.
- ناسەواری: جەلالی – مەلایی، کارەساتی هەکاری، دانوستان.


## مەلا بەختیار



تەمموزی - ٢٠٢٠



## پێشکەشە بە:

کامەرانی سەید مەجید؛ کە لە کاروانی ئەو شەهیدانەی دادەنێم، لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا، لەگەڵ خۆمدا بوون:

- شەهید جەلال
- شەهید جەبار
- شەهید وشیار
- شەهید بارام
- شەهید حەمە پشتەیی
- شەهید رەزا خاوێیی
- شەهید رزگار
- شەهید جەبار خاوێیی
- شەهید کاوە مەخموری
- شەهید مەحمود ئەرکەوازی
- شەهید نامیق تەقتەقی
- شەهید حەمە ئازاد
- شەهید ئازاد چاوشین
- شەهید ئەحمەد سماقە
- شەهید حەمە حسین
- شەهید وشیار حاجی مامەندی
- شەهید سیروان
- شەهید سالار چاوشین
- شەهید بەکر
- ئەکرەم عەباس خانەقینی

# پێرست

**ڕشتەی سێهەم:**

**کارەساتی هەکاری و نەوەی یەکەم**

**١٣١ - ١٥٦**



**ڕشتەی چوارەم:**

**عێراقچی یان ساختەچی؟**

**١٥٧ - ٢١٠**



**ڕشتەی پێنجەم:**

**نەخۆشی عێراقچی و بنکەی سوور!**

**٢١١ - ٢٧٦**

## ڕشتەی شەشەم:
## کۆنفرانسەکان‌و پیلانگێڕان
٢٧٧ - ٢٨٤



## ڕشتەی حەوتەم:
## ئاڵای شۆڕش‌و جیابونەوەکانی تر!
٢٨٥ - ٤٦٢

## پاشەنگ

٤٦٣ - ٧٣٢

### کرۆنۆلۆژیای بەڵگەکان:

**وتارەکان:**



**نامەکان**



**نامیلکەکان:**

# ناساندنی کتێبە وەڵامدراوەکان

خوێنەر، دڵنیام دەبێ کاتێکی باش، بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە بدات، کە بەشی زۆری وەڵامدانەوەی چەندین کتێبە. رەنگە، بەشێک لە خوێنەرانی ئەم کتێبە، بەتایبەتی نەوەی نوێ، کتێبە وەڵامدراوەکانیان نەدیبێ، یان دەستنەکەوتبێ. بۆ کارئاسانی خوێنەران بەگشتی، بەپێویستمان زانی، چرە هەڵسەنگاندنێک بۆ کتێبە وەڵامدراوەکان بکەین.

## ١- دیداری تەمەن (مام جەلال)؛

دیداری تەمەن؛ دوو بەرگ لە کتێبی مێژووی زارەکی سەلاح رەشیدە. ئەم دیدارانە، سەبارەت بەوەی مام جەلال، بە دەستی خۆی بیرەوەری نەنوسیووە، یەکێکە لە سەرچاوە بەنرخەکان، بۆ زانینی بیرەوەریەکانی مام جەلال. خۆزگە پێش چاوپێکەوتنەکان، سەلاح، کۆرسێکی لەسەر چۆنیەتی نوسینی روداوەکانی مێژوو لە ئەڵمانیادا، خوێندبا، یان لەسەر دەستی مێژوونووسی گەورەی ئەڵمانی راهێنرابا، هەتا کتێبەکان، سودبەخشتر بان. وەکو:

١) زەمانو زەمینەی چاوپێکەوتنو چۆنیەتی وەڵامدانەوەی مام جەلال، لەگەڵ دۆخی بڵاوکردنەوەی کتێبەکەدا، جیاوازە. دەبوایە، لە هەر بوارێک، کە مام دواتر، بیری لەسەر بیرەوەریەکانی رابوردووی، گۆڕیبێ، سەلاح رەشید، لە پەراوێزدا، ئاماژەی بەو گۆڕانکاریانە دابا. هەتا خوێنەر زانیبای، ئەو بۆچونانە هی سەردەمی ناکۆکیو جیابونەوەو شەڕی ناوخۆن، کاردانەوەشیان پێوە دیارن!

٢) دورونزیک، لەم کتێبانەدا، نوسەر، بەلای هاوڕێ نزیکەکانی مام جەلالدا، نەڕۆیشتووە، کە سەرنجی لە پرسیارەکاندا، بەلای هەندێک هەڵەی کوشندە کوشندە.. کە لە شۆڕشدا کراوە، رابکێشێ.

٣) چاپکردنی کتێبەکە، لەکاتێکدا بوو، یەکێتی دوچاری جیابونەوەی نوێ کرابوو. خۆی لەخۆیدا جیابونەوەکەی (گۆڕان–نەوشیروان) دەریدەخات کە چاوپێکەوتنەکان رەگەزە دێرینەکانی ناکۆکی نێوان رابەرەکانو باڵەکانی ناو یەکێتی، بەتایبەتی (مام–نەوشیروان)ی فەرامۆشکردووە. چونکە ئەو جیابونەوەیە، لەپڕ روویان نەدا. رەگەزەکانی کۆن بوون!

## ٢- له کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ، پەنجەکان یەکتر دەشکێنن. (نەوشیروان مستەفا)

ئەم دوو کتێبە، پێش کتێبەکانی فەرەیدون عەبدولقادرو مێژووی زارەکی مام جەلال (دیداری تەمەن)، بەڵکو پێش جیابونەوەی لە یەکێتیو دامەزراندنی بزوتنەوەی گۆڕان، نوسراوون. لە رووی میتۆدەوە، زانستیانە نوسراوون. دارشتنەکەیان، نایابە. بە قەڵەمێکی کوردانەی پاراو بەرهەم هاتوون. خوێنەر گەلێ سودیان لەسەر کۆمەڵە، یەکێتی، شۆڕش، روداوەکانو کارەساتەکان، لێوەردەگرێ. بەڵام چەندین خەوش لە بیرەوەریەکاندا هەیە. لەوانە:

١- نوسەر، بۆ یەکجاریش، لەسەر بچوکترین هەڵەی خۆی، یان سەرکردایەتی کۆمەڵە، رەخنەی نەگرتووە.

٢- لە هەردوو کتێبەکەدا، هەوڵیداوە، خۆی بە شۆڕەسواری روداوەکان دەربخات. زۆر لە خوار خواری خۆشیەوە، باسی هەندێک لەو هاورێیانەی کردووە، کە لەخۆی نزیک بوون. تێکۆشانو قوربانی بێرادەی خەڵکی تری، دێزە بەدەرخونە کردووە. کە ئەمەش زیانی گەورەی لە رێرەوی راستەقینەی روداوەکان داوە.

٣- لە باسکردنی چەندین سەرکردەدا، کە بیری جیاوازیان بەرامبەر خۆیو بڕیارەکانی هەبووە، رق بەسەریا زاڵە!

٤- نوسەر، یەکێک بووە لەوانەی لە شەستەکانەوە، لە کۆڕی خەباتدایە؛ زۆر جار پێچەوانەی بۆچونەکانی، سوور بووە لەسەر هەڵوەشاندنەوەی باڵی مەکتەبی سیاسی- جەلالی ساڵی (١٩٧٠) کەچی لەم کتێبەی (لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ) بەهەمان هەناسەی ناکۆکی شەستەکان، روداوەکانی لێکداوەتەوە.

٥- لەم دوو کتێبەدا، ئەمیش بازی داوە بەسەر سەدان روداوداو باسی نەکردوون. تاوانەکانی چەواشە کردووە. ناکۆکیەکانی لەگەڵ سەرکردایەتی کۆمەڵەو مام جەلال لە دامەزراندنی کۆمەڵەدا، پۆشیووە.

تا ئیستا، بیرەوەری تری دوای جیابونەوەی لە یەکێتی، لەلایەن نوسەرەوە، دیار نییە. کە دڵنیاین، ئەگەر رۆژێک لە رۆژان لەمبارەوە، کتێبی نوسیبیو چاپ بکرێت، گەلێ جیاوازی دەخوێنینەوە، لەو کتێبانەی تری!

## ٣- هەڵۆ سوورەکانی قەندیل (فەرەیدون عەبدولقادر)؛

کتێبێکی قەوارە گەورەی (٧٦٨) لاپەڕەی سیاسەتمەدارو نوسەری ناسراوی کوردستان، فەرەیدون عەبدولقادرە. نوسەر لە کتێبەکەدا، هەوڵی داوە بە زمانێکی پاراو، مێژوویەکی درێژی خۆیو کۆمەڵە، هەتا نوسینی کتێبەکە، باسبکات. تێکڕا نوسینەکە، نەرمە. زانستییە. سەدان روداوی باسکراو و باسنەکراوی، لە روانگەیەکی ترەوە، خوێندۆتەوە. هەوڵی داوە دیوی شاردراوەی روداوەکان، لە تاریکیو داپۆشراویەوە، روناک بکاتەوە. لە هەندێک شوێندا، ئازایانە رەخنە لە سیاسەتی کۆمەڵەو یەکێتی، دەگرێ. بەڵام سەدان روداوی تر هەن، توخنیان نەکەوتووە. چونکە، بەشی زۆری ئەو روداوانە، بەهۆی دۆخی نالەبارەوە، دراوون. نوسەریش لە زۆربەی روداوەکاندا بەشدارە. یان ئاگادارە. کورتیەکەی: ئەوەی مایەی سەرنجە، نوسەر بۆچی، بەسەر گەلێ روداودا، گوزەری راگوزەری کردووە. پێمانوایە، لەمبارەوە نوسەر، غەدرێکی گەورەی لەخۆیو لە مێژووی کۆمەڵەو یەکێتی کردووە. ئەگەر بابەتیانەترو هەمەلایەنەتر، خۆی لەگەڵ نوسینی ئەم بیرەوەریەدا، ماندووکردبا، لاموایە، لەناو بەرپرسەکاندا، ئەو رچەیەی دەشکاند، کە هەڵەکانی زانستیانە دەخستەڕوو. لەگەڵ ئەوەشدا، هێندەی رەخنەی گرتووە، بوێری درکاندنی ئەو راستیانەی تیایە، کە باسیکردوون.

## ٤- چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە (برایم جەلال)؛

ئەمیش، یەکێکە لەو سەرچاوانەی ئاماژەیەکی زۆرمان بە بابەتەکانی کردووە. وەکو بابەت، گرنگە بۆچونی نوسەر لەسەر روداوەکان بزانرێ. لە رووی زانستی نوسینەوە، لاوازە. بەڵام لە هەندێک روەوە، نوسەر بوێرتر بووە لە نوسەری کتێبەکانی دیکە.

ئەوەی ناوەرۆکی کتێبەکەی سەراپا شێواندووە، خووڕەوشتی نوسەر، وەکو خود، زاڵە بەسەر نوسینەکەدا. کەچی لە کتێبەکانی تردا، کەمتر خووڕەوشت، زاڵکراوە. نوسەر نەیتوانیووە جیاوازی لەنێوان رقو ئەرکی مێژوونوسین بکات (لەکاتێکدا نەوشیروان زۆرجار خۆی لە بارە دەرونیەکەی دورخستۆتەوە!). برایم جەلال، زۆرجار بێ بەڵگە، رقی خۆی کردۆتە بنەمای حوکمدان. ئەمەش کتێبەکەی خستۆتە دەرەوەی نوسینی زانستیانەی روداوەکانی مێژوو.

## ( أ )
# هۆکاری وەڵامدانەوەم

ئەمڕۆ (٢٠٢٠/٦/٣)، بەهۆی تەشەنەسەندنی پەتای کورۆناوە، لە ماڵەوە قەتیس بووم. یادی لەدایکبونی دوا جگەرگۆشەمانە "مازان" کە ئومێدم زۆر پێیەتی دواڕۆژێکی هەڵکەوتوی بۆ کوردستانو مرۆڤایەتی هەبێ. لەم یادەدا شەو و ڕۆژێک لە ڕامانی چۆنیەتی نوسینی کورتەخنە، لەسەر ئەو ڕەخنانەی لە زیاتر سێ دەهەی ڕابوردودا، لەسەر مێژووی یەکێتی، کۆمەڵە، ئاڵای شۆڕش، شۆڕشو بەندە، ڕوداوەکان، نوسراونو گوتراوون، لەو (٣٥) ساڵەدا بەرامبەر گەلێ هێرشی ناڕەوا، بەگشتی بێدەنگ بوم. بەڵام ئیدی کاتی وەڵامدانەوەی بۆچونە سەرەکیەکان هاتووە، کە کاتی خۆی بڕیاری بەشی زۆری ڕوداوەکان لەدەست ئەم بەڕێزانە بووە. هەر ئەمانیش لە ڕوانگەی بڕیارەکانیانەوە، باسی مێژوویان کردوەو هەوڵیانداوە پاساو بۆ هەڵدێری بڕیارەکانیشیان بهێننەوە!

دوای نوسینی بەرگی یەکەمی کتێبی (چۆن چەپکێکو کام مێژووی کۆمەڵە؟) ٢٠١٢/١/١٢، بیرەوەری زۆرتر نوسراونو ڕەخنەی زیاتر گیراون. بۆیە، ئەم کتێبە جیاوازە لە بەرگی یەکەمی کتێبەکەی پێشووم. وەڵامی گەلێ بابەتو لێکدانەوەی ڕوداوە گرنگەکان، هەروەها ڕەخنەی فراوان دەگرێتەخۆی.

دوای نوسینی بەرگی یەکەمی کتێبەکە، خوێنەر کەوتنە سۆراغی کتێبە وەڵامدراوەکەو سێ جار چاپکرایەوە. ئەگینا پێشتر لە کتێبخانەکاندا، تەپوتۆزی لێنیشتبوو. بۆیە زۆرێک لە هاوڕێیانو دۆستان، دوو ڕەخنەیان لێگرتم:

**یەکەمیان**: دەیانگوت؛ ئەوەی نەدەهێنا ناوی بخەیتە سەر بەرگی کتێبەکەو گەورەی بکەیت. تەنانەت دەشیانگوت، هەر وەڵامت نەدایەتەوە!!

**دووەمیشیان**: دەیانفەرموو؛ بۆ یادەوەری خۆت نانوسیو ئەو مێژووە پڕ لە ڕوداوە، هەق نییە لە کتێبیکی وادا، خەسار بکەیت.

لەوەڵامدا ڕونمدەکردەوە کەوا: کاتێک بیرەوەریەکانم دەنوسم، ئەوەی لەژێر بەرەی ڕۆژگاردا باسنەکراوە، باسدەکەم؛ نوکی ڕەخنەش لە کەس نابوێرم. بەتایبەتی بەشی زۆری ئەوانەی لەناو یەکێتیو کۆمەڵەدا، بەناوی بیرەوەریو هەڵسەنگاندنەوە نوسیویانە، زۆرجار ڕقی خۆیانو ئەقڵیەتی شکاندنی بەرامبەرەکانیان، تەنانەت لە باسکردنی ڕوداوەکانیشدا، کە سەدان شایەتیان هەیە، شێواندووە. نەک نەیارەکانم، بەڵکو

دۆستەکانیشم لێرەو لەوێ، هەڵەی چاوەڕواننەکراویان لێ دەخوێنمەوە. ئەم نوسینە، تەنها وەڵامەکانی کتێبی (چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە) نییە. بەڵکو وەڵامی بەشێکی ئەو نوسین‌و چاوپێکەوتن‌و رەخنانەیە، لە سێ دەهەی رابوردودا، لەسەر روداوەکانی یەکێتی‌و کۆمەڵەو ئاڵای شۆڕش نوسراوون. بەتایبەتی، وەڵامی رەخنەکانی نەوشیروان مستەفا، فەرەیدون عەبدولقادر، رونکردنەوە لەسەر هەندێک بۆچونی مام جەلال‌و ئاماژەکردنیشە بە چەند وەڵامێکی چاوپێکەوتنەکان. کورتە وەڵامی مەلا ئەحمەدی بانی خێڵانی، هۆمەر شێخ موس‌و ئەرسەلان بایزیش، دەدرێتەوە!

لەم کتێبەدا سود لە (٥٥) سەرچاوە بە زمانی عەرەبی‌و فارسی‌و کوردی، وەرگیراوە. هەوڵمداوە، پەیوەندی رەخنەی سیاسی‌و سایکۆلۆژیەتی سیاسەتمەدارەکان، رونبکەمەوەو دیوی دیاری بڕیارە سیاسیەکان، بە دیوی شاردراوەی دەرونی سیاسەتمەدارەکانەوە ببەسترێتەوە. واتا: بەشێکی گرنگی کتێبەکە، شۆڕبۆتەوە بۆ دەرونشیکاری سیاسەت‌و سیاسەتمەداران! لەمەڕ روداوەکان‌و بەسەرهاتەکان!

لێکدانەوەو رەخنەکانی ئەم کتێبە، زۆربەیان (٣٥) ساڵ، لەناو روداوەکان، بەسەرهاتەکان، سەرکەوتن‌و شکستەکان، من هەر لە ویژدانی خۆمدا پاراستومن. دەرفەتی زۆرم بۆ هەڵکەوتووە، ئەمەی ئێستا نوسیومن، بیاننوسم. بەڵام هەر پاساووم بۆ خۆم دەهێنایەوە، دوامدەخستن.

زۆرجاریش، کە تانەو تەشەرم لەسەر ئەو روداوانە دەبیست، یان لە کۆمێنتی فەیسبوکدا، لە زمانی ئەم‌و ئەوەوە، چەند رستەیەکی بیرەوەریەکانی ئەوانەی لەم کتێبەدا، وەڵامم داونەتەوە، بڵاودەکرایەوە، نەمدەویست خۆم‌و مێژووی خەباتم دابەزێنمە ئاستی نزمی نوسینی ئەوان.

مرۆڤ دەتوانێ هەر (٣٥) ساڵ پەرۆشی‌و پشووی لەئاست روداوەکاندا، درێژ بکات. یەک دوو ساڵە، گەیشتومەتە ئەو باوەڕە، کە ئیتر لەوە زیاتر، وەڵامدانەوە دوابخەم، لای ئەو خوێنەرانەی بیرەوەری، یان وتارەکانیان خوێندۆتەوە؛ یاخود گوێ لە چاوپێکەوتنەکان دەگرن، ئیتر دەگەنە ئەو باوەڕەی کە سەرجەم ئەو تۆمەت‌و بڕیارو هەڵبەستنانەی دژم، بڵاوکراونەتەوە، دروستن، بۆیە "مەلا بەختیار" بێدەنگە بەرامبەریان. ئێستاش، دونیای نوسین، رەخنە، بۆچون دەبڕین، هێندە بەرین‌و فرە بوارە، نوسینی راستیەکان‌و گێڕانەوەی بەسەرهاتەکان، یاخود وەڵامدانەوەی رەخنەکان، دەچنە خزمەتی مێژووەوە. چونکە، بە سەدان نوسەرو باسنوس، سەرقاڵی نوسینی مێژووی؛ یەکێتی، کۆمەڵە، بزوتنەوەی

سۆسیالیست، شۆڕش، پارتی، شیوعی، ئاڵای شۆڕش‌و تێکڕا چەپەکانن. مێژووش هەتا لە بۆچونە جیاوازەکان‌و ڕەخنەکان، دەوڵەمەند بکرێ، سەرچاوەکانی توێژینەوەی زانستی نوسینی مێژوو، دەوڵەمەندتر دەبێ.

بەداخەوە، لە ڕێڕەوی خەبات‌و فیداکاریدا، زۆر هاوسەنگەری ئازیزمان شەهید بون‌و لە دونیای نەمریدان، بەشێکیان لەم وەڵامدانەوانەدا، شوێنیان هەیە. هیچ نەبێ بۆ کەسوکاریان، منداڵەکانیان، ئاسودەبەخشە، کە ڕاستیەکان سەبارەت بە خەباتی باوک، یان برا، یاخود خزمەکانیان بزانن. بەتایبەتی شەهیدانی ئاڵای شۆڕش کە هیچ گوناحێکیان نەبوو، شەهید کران. گوناحیان ئەوە بوو، ڕێبازی ڕێکخراوێکیان گرتبووە بەر، باوەڕی چەپی دیموکراسی هەبوو. دژی شەڕی ناوخۆ هەڵویستی وەرگرت. تێکۆشەرانی بە رقی سایکۆلۆژی پەروەردە نەدەکرد. دەستی نەچووە هیچ تاوان‌و تالانیەک. هاوڕێکانیشی شەهید دەکران، بەڵام بیریان لە تۆڵەسەندنەوە نەدەکردەوە.

شەهیدانی ئاڵای شۆڕش زۆر بێگوناح بوون. ئەو شەهیدانەی دەیانتوانی بۆ پلەو پایە هەلپەرست بن. ئاسان بوو دزی بکەن. دەشیانتوانی مەرایی بکەن یان دەست بە کڵاوی خۆپەرستیەوە بگرن. بەڵام هیچی ئەوانەیان نەکردو دوای بیروباوەڕی شۆڕشگێڕانە کەوتن. ئەوانیش؛ شەهیدان:

١. حەمید محەمەد عەبدوڵلا (شاسوار- بەمۆ خانەقین).
٢. فەرید برایم خەیات (خانەقین).
٣. خەلیل دەکەیی (دەکە – خانەقین).
٤. کەریم ئایشەیی (پەرویزخان – خانەقین).
٥. عیدان عەلی مەحمود (خانەقین).
٦. ئەکرەم حەسەن قادر (خانەقین).
٧. حەیدەر حەسەن ئیبراهیم بێرام (خانەقین).
٨. خەلیل عوسمان تورکمان (خانەقین).
٩. ئازادی فەقێ عەلی (کفری).
١٠. سالاری حاجی دەروێش.
١١. کاروان عەبدولرەحمان (هەولێر).
١٢. فەرهاد کاوانی (هەولێر- کاوان).
١٣. سەدرەدین ڕەمەزان (سورە – هەولێر).

١٤. ئازاد محەمەد ئەمین (د.ئازاد- گەلاڵە).
١٥. موئەید مەلا حەسەن (هەولێر).
١٦. رەشاد عەلی حسێن (هیوا جیهاز- هەولێر).
١٧. عەبدولواحید عوسمان (واحیده سور- رواندز).
١٨. فەرهاد عەلی حسێن (مامۆستا فەرهاد- هەولێر).
١٩. رزگار عەلی حسێن (هەولێر).
٢٠. لوقمان حەمەد ئەمین عەلی (کاروان چاوشین- هەولێر).
٢١. عەبدولرەحمان مەولود (کاروان- هەولێر).
٢٢. سەدرەدین رەزا (نەبەز- هەولێر).
٢٣. مەهدی باپیر (ریباز- هەولێر- بەرانەتی).
٢٤. عەبدولوەهاب سابیر (هەولێر- کونەگورگ).
٢٥. ئەسعەد رەسول (هەولێر- دارەتوو).
٢٦. خەسرەو کاوێس (سەپان- هەولێر).
٢٧. کامەران عەزیز (خەنجەری بازگر- هەولێر- بەحرکە).
٢٨. مەناف تایەر تۆفیق (زرارەتی- هەولێر).
٢٩. هەژار کەریم مەسیفی (مەسیف).
٣٠. جەنگی بەکر (رەوەند- هیرانی).
٣١. رەشاد موراد (شێرکۆ- هەولێر).
٣٢. رەشید موراد (د.نەهرۆ- هەولێر).
٣٣. زاهیر محەمەد خدر (دیار ئاژگەیی- ئاژگە).
٣٤. دڵشاد شێخ محەمەد (جەمال- هەولێر).
٣٥. محەمەد قادر مەولود (محەمەد شەقڵاوەیی- هەولێر).
٣٦. فاخر عەبدوڵلا (شەقڵاوەیی- هەولێر).
٣٧. حەمید وەستا خدر (هەولێر).
٣٨. نەریمان عوسمان عەبدوڵلا (هەولێر).
٣٩. سەفین عوسمان عەبدوڵلا (هەولێر).
٤٠. سەرکەوت پێنجوێنی.
٤١. موشیر سادق (کاردۆ- هەولێر).

٤٢. فەرهاد ئەحمەد رەسول (فەرهاد كاروانی).

٤٣. مستەفا حەمەئەمین رۆستەم شێخەڵمارینی (هەڵۆ).

٤٤. سۆران مەحمود ئەمین.

ئەم شەهیدانە، هەندێکیان بە دەستی یەکێتیو هەندێکیان بە دەستی بەعس، گیانیان لەپێناوی گەلەکەیانو کرێکاران بەخشی.

ئەوان لە دونیای نەمریدان. هەمیشە خۆم بە قەرزاربارییان دەزانم. ناوەڕۆکی کتێبەکەش، وەفادارییە بەرامبەر ئەو ئامانجانەی گیانیان لەپێناودا بەخت کرد. بەهیوام لەرێی راستییەکانی ئەم کتێبەوە، دەرخستنی راستییەکان رۆحی پاکیان لەگەڵ تەواوی شەهیدانی کوردستاندا، ئاسودە بکات!

دەبێ بە شانازییەوە بڵێین کە: هاوڕێیەکی زۆری ئاڵای شۆڕش، سەرەنجامی ئەو هێرشە عەسکەری-سیاسییە نارەوایەی لەلایەن یەکێتییەوە کرایە سەر ئاڵای شۆڕش، ناچار بون خۆیان لە شارەکانو لە ماڵاندا پەنا بدەن.. لەم دۆخە سەختەدا، دەیان هاوڕێی ئاڵای شۆڕش-کچو کوڕ- کەوتنە بەر شاڵاوی گرتنو ئەشکەنجەدان. ئەمەش لە دۆخێکی دەرونی دژواردا، کە لە دیێەکی ئازادکراودا، پەناو پەسیوێکیان نەهێشتەوە، تەنانەت وەکو سەربازی هەڵهاتوو، ئاڵای شۆڕشەکان ژیانی ئاسایی تێدا بەرنەسەر. پەلامارو فشاریان گەیاندە ئەو رادە توندوتیژییە دەیانگوت: جاش لە ئاش.. باشترە. لێرەدا، بە ئەرکی دەزانم، هەروەکو تێکۆشەری شۆڕشگێڕو پڕاوپڕ لە هەڵوێستی جوامێرانە، رێز لەو تێکۆشەرانەی ئاڵای شۆڕش بگرم، کە شەهیدبونو خۆشاردنەوەو سەنگەرەکانی زیندانیان هەڵدەبژارد، بەڵام خۆیان نەدەفرۆشت.

* * *

هەوڵمداوە، بابەتیی بم. بەڵام منیش مرۆڤم.. لەو رێڕەوەی خەباتدا، غەدرم لێکراوە. بریندار کراووم. ئەوەی چاوەڕوانم لە هاوسەنگەرەکانم نەکردووە، بەرامبەر خۆمو هاوڕێکانم کراوە. ئەگەر منیش لێرەو لەوێ، رەخنەکانم تارادەیەک توند بن، دیارە ئازارەکەم زۆرتر بووە، بۆیە بەو چەشنەی پێم دروست بووە، نوسیومە![*] ئومێدەوارم.. کۆی ئەم رەخنانە، یان هەڵسەنگاندنانە، روناکییان خستبێتە سەر لایەنێکی مێژووە تاریکەکەمان! ئەم نوسینەش، قەرزێکی سەر شانم بوو، دەبوو بیدەمەوە!

---

* لەو سی-چل ساڵەدا، لە دەیان وێستگەو روداودا، بەرگریم لە هاوڕێکانمو دۆستەکانم کردووە. تەنانەت، بەشێکی چارەنوسی سیاسیم، بەستۆتەوە بەو هاوڕێیانە، کەچی، جگە لە پشکۆ نەجمەدین، بەرگرییەک کە ویژدانم ئاسودە بکات، لە گەلێ نوسینی هاوڕێو دۆستەکانمدا، نەخوێندۆتەوە. جار جارە، غەدریشم لێ دیوون!

بێپرادە سوپاسی هـاوڕێی وەفـادارم (سـامی هـادی) دەکـەم، کە ئەگـەر ئەرشیفە دەوڵەمەندەکەی نەبوایە؛ ڕۆژانەش بە تەلەفۆن، قسەمان نەکردایە؛ لە پیاچونەوەشدا، تێبینییە جوانەکانی دەرنەبڕیایە، بەم چەشنە کتێبەکە نەدەکەوتە بەر دیدەی خوێنەرە ئازیزەکان. هەروا، ماندووبونی تەهای تاپێست، کە دیوانەئاسا، کارەکانی دەکات، مایەی پێزانینمە.

لەناخەوە پێزانینم بۆ هەردوو نوسەرو بیرمەندی کورد (مامۆستا جەعفەرو فوئادی مەجید میسری) هەیە، کە وشە بە وشەو ڕستە بە ڕستەی ئەم کتێبەیان خوێندۆتەوەو گەلێک سودم لە سەرنجو ڕەخنەکانیان وەرگرت.

دەمێنێتەوە بڵێم: شەو و ڕۆژێک (١٠بۆ١٢) سەعات کارم لەسەر ئەم کتێبە کردووە. لە(٢٠٢٠/٦/٣) دەستمپێکرد، بە پیاچونەوەو پاکچاپو ڕەچاوکردنی تێبینیەکانەوە، تێکڕا (٤٥٠) سەعاتێک هەتا (٢٠٢٠/٧/١٢) بەردەوام، لە کەرەنتینەی مێرگەپاندا، بابەتەکانی کتێبەکەم نوسیووە. بەدەمیەوە زۆرترین ئەدەبیاتی کۆمەڵە، یەکێتی، ئاڵای شۆڕش، بیرەوەریەکانو چاوپێکەوتنەکانم خوێندۆتەوە. (٨) قەڵەمی سۆفتو دوو بەند کاغەزی (A٤)ی (٥٠٠) پەڕەییم، بەکارهێناوە. لە ماوەی نوسینی کتێبەکەدا لە خێزانەکەم (میدیا)و مازانی کوڕم دورکەوتمەوە. بێپرادە سوپاسیان دەکەم؛ کە هاوکارم بونو بێبەشیان نەکردم لە خواردن و خزمەتکردن!

ئەگەر کتێبەکە، ڕاستیەکانی ئەنگاوتبێ، خوێنەرو کتێبخانەی کوردیم خزمەت کردووە. ئەگەر نەشمتوانیبێ، لە هەندێ شوێندا ڕەخنەکانم پەسەندکراوی خوێنەر بن، بابایەکی خانەقینی، هەر هێندەم لەدەست هاتووە، ببورن.. ئازیزان!

## ( ب )
## نوسینی چەواشەی نەیارو دۆست

لە بەشی یەکەمی وەڵامدانەوەکەدا، هاندەری سەرەکیم، بەرگریکردن بووە لە ڕاستی ئەو ڕوداوانەی کە هەمووومان، بەئەندازەی سەنگو توانای خەباتمان، دروستمان کردوون. گوناحێکی مێژووییە، ئەو ڕوداوانە بە چەواشەکراوی بنوسرێنەوە. تەنانەت نوسینی چەواشە بگەیەندرێتە ڕادەیەک، نەک نوسەری کتێبی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە" بەڵکو نوسەری "لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ"یش، هەروەها چەندین بیرەوەری

دیکەش، راستیگەلێکی روداوەکان، توانای کەسایەتیەکان، رۆڵی سەرجەم تێکۆشەران، سەرکەوتنەکان، شکستو بەسەرهاتەکانیان، بەچەشنێک چەواشەیان کردوون، بەش بەحاڵی خۆم سەرم سورماوە، چۆن ئەو مێژووە وا نوسراوە. هەر بۆ نموونە:

لە شەڕی ناوخۆدا، لە دۆڵە رەقە، لەسەر بەڵێن، کە بە سامان گەرمیانیدا، نێردراوە بۆ شەهید "عەبدوڵڵا سوور"، کە خۆی بدات بەدەستەوە رێزی دەگیرێ. لەسەر ئەو بەڵێننامەیە لە شاخ دێتەخوارەوە بۆ ناو سەدان پێشمەرگە، لەبەرچاوی هەمواندا، چل فیشەکی پێوەدەنرێ. کەچی لە لاپەڕە (٢٢٤)ی کتێبەکەیدا، نەوشیروان مستەفا دەنوسێ:

"کە چومە شوێنی شەڕەکە، خزمەکانی فەقی مستەفا بە ژنو پیاو و منالەوە وروژابون، چەکدارەکانیان ئەم بەر و ئەوبەری تەنگەکەیان لە پێشمەرگەکانی یەکێتی گرتبو. ژنو منالیش لە گیراوەکانو حەرەسەکانیان وروکابون بە بەردو تێلا تێیان بەربوبون. ئەیانویست هەموو گیراوەکان بکوژن، چەندی خەریک بوم خاویان بکەمەوە، کەڵکی نەبو. کەوتنە جنێودانو میل راکێشان لە منیش، خەریک بو ببێ بە شەڕی خۆبەخۆ. لەم هەرایەدا عەولا سور کوژراو ئاژاوەکە کوژایەوە".[1]

روداوێک لەبەرچاوی سەدان تێکۆشەر رویدابێ، کوشتنێکیش بەو دڵتەزێنییە ئەنجامدرابێ، لەیادەوەریدا ئاوها هەڵبگێردرێتەوە، ئیتر خوێنەری وشیار وردتربێتەوە لەو کتێبانەی لەسەر مێژووی نوێمان نوسراوون. بۆیە، زۆر گرنگە ئەو روداوە چەواشەکراوانە، راستبکرێنەوە. بیرەوەرنوسی وا هەیە، هەزاران لاپەڕەی لەسەر ئەو قسانە نوسیووە، کە بیستونی. ئاخر بیستن چۆن دەبێتە بەڵگەو کەرەستەی حوکمدانی مێژوویی؟!

شایەنی باسە، بەدیلکوشتنی "عەبدوڵڵا سوور" کە هاوزەمانی تراژیدیای قرناقاو پشتئاشانە، کە من ئەوکاتەش دژی ئەو تراژیدیایە بومو ئامادەش نەبوم بڕیاری سکرتێری کۆمەڵە، بۆ لێدانی شیوعیەکانی سنوری مەڵبەندی یەک جێبەجێ بکەم، کە خۆم بەرپرسیاری بوم. نەکا تەمەن مەودای نوسینی بیرەوەریەکانم نەدا، بەگرنگی دەزانم چ دەربارەی قرناقاو پشتئاشانو چ روداوگەلی دیکە، لە دووتوێی کتێبەکەدا، باسبکەم.

---

١ نەوشیروان مستەفا ئەمین. پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن- دیوی ناوەوەی روداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٧٩-١٩٨٣. چاپی دووەم ١٩٩٨-سلێمانی. ل(٢٢٤).

## ( ج )
# وەرچەرخانی رەش‌و تاساندن

روداوی قڕناقاو پشتئاشان‌و کوشتنی عەبدوڵلا سوور، جگە لەوەی پەیوەندیان بە دۆخی دانوستانی نهێنی نێوان "مام جەلال-نەوشیروان"ەوە، ژێربەژێر لەگەڵ حکومەتی بەعسدا هەبووە، دەڵێم جگە لەمە، خاڵێکی وەرگۆڕانی ترسناکیشە لە گۆڕینی سیاسەتی سکرتێرو سەرکردایەتی کۆمەڵەو ئەوانەی ئەوکاتە فریویان پێ خواردبوو، ئەویش ئەمەیە.. کە سکرتێری کۆمەڵە، کاتێک دۆخەکەی بە گونجاو بۆ دانوستان زانیووە، بەشی زۆری هێزی یەکێتیشی خستبووە ژێر هەژمونی خۆیەوە، دەیویست، سایکۆلۆژیەتی تۆقاندن رۆچێنێتە دەرون‌و ناخی لایەنەکان‌و پێشمەرگەو کادرەکانەوە، بۆیە (٥٦) دیلی قڕناقاو پشتئاشان بە بڕیاری خۆی کوژران.. عەبدوڵلا سوریش، لەناو هەمان شانۆگەری تۆقاندن‌و لەبەرچاوی سەدان پێشمەرگەدا، شەهید کرا.

زۆر بەداخەوە، ئەم سیاسەتەی چاندنی سایکۆلۆژیەتی تۆقاندن لەدەروندا، ئامانجەکانی بەدیهاتن، بەبێ ئەوەی جگە لە رەوتی "ئاڵای شۆڕش" لەناو یەکێتیدا، کە هەڵوێستی پێچەوانەی هەبوو، هیچ سەرکردەیەکی تر، ئەوکاتە هەڵوێست دەرببڕێ! لێکەوتە زیانبەخشەکانی ئەو رێبازە ترس چاندنەش، نەک هەر لە شکستی دانوستانی (١٩٨٣-١٩٨٥)دا دەرکەوت، بەڵکو دوای ئەوەش، لە زۆر سیاسەتی تری چارەنوسسازدا، هەر لە بردنی هێزی (پێشمەرگە- پاسدار) بۆ سەر کەرکوک، هەتا تراژیدیای هەڵەبجە.. کوشتنی دیل‌و رقئەستورکردن بەرامبەر بە خەڵکی عەرەب. تا دەگەیەندرایە بەرزکردنەوەی دروشمە کۆمیدیایەکەی کە دەیانگوت: ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان‌و فاشیەت بۆ عێراق.

سکرتێری یەکێتی (مام جەلال) لەناو کێشمەکێشەکاندا، سەرەتا پشووی لەگەڵ ئەو سیاسەتە تۆقاندنەدا درێژ بوو. بەڵام دوای شەڕی قڕناقاو پشتئاشان، گرتنی بێتواتەو کوشتنی عەبدوڵلا سوور، مام جەلال هەواڵە دڵتەزێنەکانی تێکڕا زانیبوو. بۆیە لە زیخان بوو، بە میوانەکانی دەوت:

ئاگری فاشیەت هەڵکراوە، نەیکوژێنینەوە هەمومان دەسوتێنێ. دەیان جار ئەم قسەیەی دوبارە دەکردەوە. نمونەشی بە دیلکوشتن‌و تاڵانیەکانی ناو شەڕەکان ئەهێنایەوە. ئەیوت:

تەنانەت ماڵی یەکێتیەکان لە بێتواتەو دێهاتەکانی دەوروبەری، لەلایەن فەرماندەکانی یەکێتییەوە تاڵان کراوە.

بەداخەوە، ئەمە رای بوو، بەلام لیبراوانە سنوری بۆ ئەو ریبازە ترسناکە دانەنا!! گوایە بەئومێدی ئەوەی یەکیتی دوچاری کێشەی قوولتر نەبێ. بەلام ئەو سیاسەتە پشودرێژییە، نەک نەیتوانی کۆتایی بە تۆقاندن بهێنێ، نەک نەشیتوانی یەکیتی لە هەلدێری ترسناک بپارێزێ!! بەلکو لەناو شۆرشداو لەدوای ئەنفالەکانو لە راپەرینیشدا، ئەو سیاسەتە درێژەی کێشا. تەنانەت لەشۆرشداو لە گەرمەی ئەنفالدا، گەیەندرایە پەلاماردانی "عەلی بچکۆلو سەید مەجید"و شەری سیاسی لەگەل خودی مام جەلالو خانەوادەکەی..تاد. لەدوای راپەرینیش، ئەم ریبازە بەردەوام بوو.. هەموو یەکێتیەکان دەیانزانی، لە هەناوی یەکێتیدا، لەمێژ سال بوو لە لوتکەدا ململانێیەکی دژوار هەیە. تا گەیشتە پێکەوەنانی رەگەزە نهێنیەکانی رێکخستن، لەدەرەوەدا بەناوی جۆراوجۆر (رەگ، چاک). ئاکامەکەشی لە "بزوتنەوەی گۆران"دا شکایەوە. بەمەش نەوەستا، گەیشتە جیاکردنەوەی هاوپەیمانی-د. بەرهەم.

ئەو رۆژە رەشەی لە قرناقاو پشتئاشانەوە، لەمێژووی شۆرشو یەکێتیو لەناو کۆمەلەدا دەستپێدەکات، سەرەنجامەکەی تەنها پاکتاوکردنی جەستەی تێکۆشەرانی چەپو پاکەکان، لەرووی فیزیکیەوە نەبوو، بەلکو تۆقاندن گەیشتە تیرۆرکردنی هزری جیاواز. بگرە گەیەندرایە رادەی سوکایەتیکردن بە بیروباوەری چەپو هەلمەتی دژایەتی "بانچەپ" لە گۆڤاری کۆمەلەو ئیزگەی یەکێتیدا؛ هەموی زادەی ئەو هەلومەرجە بوون. دەیان وتار، نامیلکە، هەلمەتی سایکۆلۆژی چەپکوژی، لەو چوارچێوەیەدا دەستپێیکرد. هەر ئەو هەلمەتەش بوو، لەناو یەکێتیو شۆرشو کۆمەلەدا، چەندین لێکەوتەی خستەوە:

**یەکەم**: هەلپەرستیو ناسیۆنالیستی راسترەو، تەشەنەیان سەند.

**دووەم**: کوشتنی نەیارو سەرکوتکردنی بیوورای جیاواز، کرایە رێباز.

**سێهەم**: ژیانی حیزبایەتی پێشێل کراو مەراییکردن بۆ سەرکردەکان پەرەی سەند.

**چوارەم**: دیاردەی ستەمکاریو سەرانەسەندن زەق زەق بونەوە.

**پێنجەم**: بوختان هەلبەستنو شکاندنی کەسایەتیەکان، بەلکو بێبایەخکردنی سەرکردە شەهیدەکانی رەمزی کۆمەلەش، برەوی درایە.

**شەشەم**: سوککردنی توانای ژنانو رەواج پێدانی ئەقلیەتی نێرسالاری دەورووژێندرا.

**حەوتەم**: ئەقلیەتی عەسکەرتاریەت زالدەکراو چاو لە تاوانو تالانیو دیلکوشتن دەپۆشرا.

ئەو سیاسەتو ئاکارانە، بەبێ کۆبونەوەو بڕیاری سەرکردایەتی کۆمەڵە، دەسەپێنران. تۆقاندن گەیەندرایە ڕەشەکوژی لەناو سلێمانیدا. کاتێک کادرەکانی شۆڕشی ئەیلول لە سلێمانیدا (عەبدولی سۆران، شەفیق ئاغا، نوری حەمەعەلی)(*) تیرۆر کران، نە مام جەلالو نە ناوەندی کۆمەڵە ئاگامان لێ نەبوو. تەنانەت مام جەلال هەڕەشەی کرد، ئەگەر ئەو تیرۆرکردنانە ڕاناگیرێ، بەیاننامە لەدژی دەردەکات. هەر لەسەر ئەم تیرۆرکردنانە بوو، لە دانوستانەکەدا، بە بڕیاری سکرتێری کۆمەڵە، جەبار فەرمان (وریای وەستا وەهاب) ی شەهید کرد.(+)

* لەوکاتەدا ئەو تێکۆشەرانە دەکوژران، مەحمودی عەزیز بەگ، لە گوندی ئاوەکەلە، لەگەڵ لالە سەرحەدو دلێری شێخ مستەفا، هاتنەلام.. هەوڵی کوشتنی درابوو. دیقەتم لێدەدا.. کەسایەتیەکی سەنگینو ماندوو بوو لە کوردایەتی. گفتم دایە، تا نامەم دەگاتە شار خۆی بپارێزێ، دوای ئەوە، خەمی نەبێ. هەر واشم کرد. لە حاجی مامەندیش، عەلی خڕەو حەمەعەلی کاژیک (ئیفلیجیش بوو) لەگەڵ شێخ عەبدول هاتنەلام. هەمان کێشەیان هەبوو، هەوڵی کوشتنیان درابوو.. بەڵێنم دانێ.. بیانپارێزم.. واشم کرد.
+ لە بناری کرکر، پشتی چاڵاوا، شەهیدیان کردو تەرمەکەشیان نەناشتبوو.. هەتا ئاوسابوو.. داڕزابوو.. ڕقیان ئاوها پێ ڕشتبوو!!

# ڕشتەی یەکەم:

## فەلسەفەی سیاسیو سایکۆلۆژیەتی سیاسی

( ١ )

## رق زادەی چ کولتورێکە؟

نەوشیروان مستەفاو نوسەری کتێبی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە" لە شاخەوە، لەبەرئەوەی پێکهاتەی دەرونییان، کوتومت لەگەڵ ئەو رێبازە سایکۆلۆژیەی رقی سیاسی دەسازا، بۆیە لەپێش خەڵکی ترەوە، بە دژایەتی چەپو ململانێکانی ئەو سەردەمەوە، هەروەکو بەو نوسینانە هەر چوار پارچەکەی کوردستان تەقەڵ بدرێتەوە، هەر زوو کەوتنە نوسینی نامیلکەی زەردو کۆڕو کۆبونەوەی دوور لە ئاکاری دیموکراسی، دژی ئەوانەی پێشوەخت درکیان کردبوو، دۆخێکی ترسناک لەئارادایە، بەتایبەت نوسەری کتێبی (چەپکێک) سروشتی لەو بابەتە بوو، بە پیاهەڵدانێکی سەروی خۆی، لە گۆلێکی بۆگەندا، غوسڵی رقی دەردەکرد!

کەم کەسم دیووە، یەک هەناسە، وەکو هەندێک سەرکردەو کادری کۆمەڵە، نوقمی رقی شەخسی بن‌و شەخسیەتی خۆیشیان لەسەر بنەمای رق رشتن بونیات نابێ. رقێک نیو سەدەی رەبەق، هەناسەی سوار کردبن‌و ناجوامێرانەش، هەلی هەلپەرستی بۆ رشتنی رقە دەرونیەکان، بقۆزنەوە.

لەبەرامبەر کەسانی ئاوادا، کە نمونەی دەیان کەسایەتی تری ناو یەکێتییەو سەدان کەسی تریشیان راپێچایە ناو گێژاوی توندوتیژیەوە، لەبەرامبەر ئەو کەسانەدا، دەبێ ئەو رقئەستوریە، کە سەرەنجام، دوای زاڵبونیان کارەساتی حیزبی‌و کوردستانی‌و ناوچەییشیان خوڵقاند، دەبێ بگەڕێین بەدوای رەگوڕیشەی کۆمەلایەتی-کولتوری- دیاردەکانی سیاسی-سایکۆلۆژی. نەک وەک خوییەکی تاکەکەس سەیر بکرێ. ئەم رەگوڕیشە کۆمەلایەتی-کولتورییە، پەیوەندیان بە گەلێ مەسەلەی ئابوری، کۆمەلایەتی، کولتوری‌و دابونەریتەوە هەیە. هەروەها بە ئاین‌و مەزهەبیش، پەیوەندی توندوتۆڵیان هەس! هەموو ئەوانەش پەیوەستی ئەوەن، کورد لەکۆنەوە، وەکو نەتەوەیەک، سەرەنجامی پەرەسەندنی ئابوری‌و پیشەسازی‌و کولتوری نوێگەری، پێکهاتە نەتەوەییەکەی نەڕسکابوو. بەڵکو بە کولتوری سەدەکانی ناوەڕاست، کەوتە دونیای کوردایەتی‌و خەباتی رزگاریەوە.. هەتا گەیشتە دونیای حیزبایەتیش، وەرچەرخان بەرەو کولتوری هاوچەرخی نەتەوەیی، لەکوردستاندا رووینەدابوو! بۆیە، دەسەلاتپەرستی‌و توندوتیژی سەدەکانی ناوەڕاست، بونەتە دوانەی لێکدانەبڕاوی ژیانی حیزبایەتی‌و پێشمەرگایەتی، لە مێژووی نوێشدا.

"لەزەتبردن لە دەسەلات لە لەزەتبردن لە توندوتیژی جیانابێتەوە، کەم دەسەلات هەیە لە جەوهەردا سادیست نەبێت.. دەسەلاتی رەها پێویستی بە داگیرکردنی هەموو شتێکە تا دلنیابێت دەسەلاتی رەهایە".[1]

هەر نەژادێک، یان پێکهاتەیەکی ئیتنیکی، لەگەل قۆناغەکانی گەشەکردنی پیشەسازی-کۆمەلایەتی پەرەنەسەنێ‌و قۆناغ بە قۆناغ، بۆ کۆمەل‌و سیستەمی مۆدێرن وەرنەچەرخێ، ئەو نەژادو پێکهاتەیە، رەگەزەکانی زەبروزەنگی سەدەکانی ناوەراست، لە شادەمارە کۆمەلایەتیەکانیدا، دەپارێزێ. یان لە رێی دەسەلاتی خێلەکیەوە، یاخود حیزبیەوە، یان حکومەتیەوە، ئەو زەبروزەنگە، لەکاتی کێشەکاندا، سەرهەلدەدەن‌و تاوانی جۆراوجۆر ئەنجام دەدەن. تەنانەت رەگەزەکانی فاشیەتیش، بەشێکی بۆ ئەو شا دەمارە کۆمەلایەتیانە دەگەرێتەوە.. کە بەهۆی رونەدانی شۆرشی پیشەسازیەوە، یان لاوازی شۆرشی پیشەسازیەوە، لەناو نەبراوون. نازیزمی ئەلمانی، یەکێک لە هۆکارەکانی، دواکەوتنی ئەلمانیا بوو لە شۆرشی پیشەسازی لەچاو ولاتانی دیکەی رۆژئاوادا. ئەمە بۆ ئەلمانیای زایگایەکی فەلسەفە وابوبێ، ئیتر با بۆ کوردستانی بێ فەلسەفەو فەیلەسوفی بپێوین‌و بزانین، بۆچی سەدەی رابوردومان لە گۆمی خوێنی شەری ناوخۆ ژەنراوە. ئێستاش ئەو رەگەزە هەلنەکێشراوانەی سەدەکانی ناوەراست، بۆ بونیاتنانی بیرو سیاسەت، مەترسیدارن!

لەناو توندوتیژیە جۆراوجۆرەکاندا، کە لە زانستە کۆمەلایەتیەکاندا پۆلێن کراوون، تیرۆری سیاسی، یان توندوتیژی سیاسی، زۆرتر پەیوەندییان بە دەسەلاتی کەسایەتیەکان‌و ئایدیۆلۆژیەتی حیزب، یان حکومەتەکان هەیە. دەسەلات‌و ئایدیۆلۆژیەتی تاک، یان تاکرەوی، مەترسیدارترین توندوتیژی‌و زەبروزەنگ بەرهەم دێنێ!

سەرەرای ئەوەی زاناکانی دەروونناسی، بەزۆری وای دەنوێنن کە مرۆڤ بە دابراوی لە دەوروبەری دەژی، بەلام لەراستیدا وا نییە. هەلسوکەوت زادەی خەسلەتی شەخسی‌و تاکگەرایی نییە، بەلکو سەرەنجامی هەلومەرجێک‌و هەلوێستێکە کە کەسەکە خۆی تیا دەدۆزێتەوە.[2]

رێک وایە، مرۆڤ لەئاسمانەوە، نە خۆی، نە پێکهاتەکەی، نە سروشت‌و باری دەرونیشی، بە دابراویی لە ژینگەو باری کۆمەلایەتی، پێکنایەت. دەوروبەر، ولات، کۆمەل، خێزان،

---

١ بەختیار عەلی. دوا خەندەی دیکتاتور. چاپخانەی کارۆ. ٢٠٢٠. ل(١٧٠).

٢ سایکولوجیة العدوان. بحوث فی دینامیکیة العدوان لدی الفرد، الجماعة، الدولة (فروید، لورنر، ولترز، میلر وأخرون). ترجمة عبدالکریم نامق. ص(١٢).

پەروەردەو ژیانی حیزبایەتی، تەنانەت روداوە سیاسیو شەخسیەکانیش، لە پێکەوەنانی کەسایەتی هەموو کەسێکدا، رۆڵی هەمەلایەنەیان هەیە. جیاوازیەکی گەورە لەنێوان ژینگەی دێهات، ناحیە، قەزاو پارێزگادا، بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی، لە باری ئابوری، سیاسی، خو و رەوشتەوە، هەتا ئاستی کولتوریو دەرونیش هەیە. بەڵکو جیاوازی گەورە لەنێوان وڵاتو شاری دواکەوتوو، لەگەڵ وڵاتی پێشکەوتودا، لە پێگەیاندنی مرۆڤ و ژیانی کۆمەڵایەتی، سیاسی، فەلسەفیو دەرونیش هەیە. ئەمە جگەلەوەی هەندێک جار، ژینگەی کۆمەڵایەتیو پەروەردە وا دەکات، خو و رەوشتی منالی گۆڕانی گەورەی بەسەردا نایەت.

ئەو کەسانەی، بەدرێژایی تەمەنیان، ڤایرۆسی کینە هەڵبگرنو ببێتە بەشێکی ناخیان، ئەم کەسانە، هەتا ئێستا، لە وڵاتانی دواکەوتودا، مەخابن وەکو نەخۆشی دەرونی سەیریان ناکەن. ئەمە لەکاتێکدا لە رۆژئاوادا، نەخۆشییە سایکۆلۆژیەکان، کەمتر لە نەخۆشییە فسیۆلۆژیەکان، بایەخیان نییە. کەچی لە کوردستاندا، زۆربەی دەرچووەکانی دەرونناسی، دانامەزرێن، چونکە بوارەکە لەکوردستاندا کەم بایەخە!

## (٢)

## کۆنژنکتۆری توندوتیژی

توندوتیژی، هەتا رادەی بکوژیی، بەڵکو تا دەگاتە دیلکوژیی، تەنانەت سڵنەکردنەوە لە تەفروتوناکردنی نەیار، هـاوڕێ، هاوسەنگەر، بـراو کەسوکاریان، کونژنکتوری[*] واتا: کۆی هەلومەرجە ئابوری، کۆمەڵایەتی، سیاسیو کولتوری یان رەگەزەکانی بۆ سەدەکانی پەیدابونی مرۆڤ و دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی-سیاسی لە سەرهەڵدانی خێزانو چۆنیەتی دابەشکردنی میراتەوە، لەسەردەمی کۆمۆنەی سەرەتاییەوە بۆ کۆیلەیەتی، هەتا ئەمرۆی سەرمایەداری-دیموکراسیش، چەکەرەکردنی رەگەزە کۆمەڵایەتیەکانی بۆ ئەو سەردەمانە دەگەڕێتەوە. لەخۆڕا نییە "ئەناتۆل رابۆرت" گوتویەتی: "توندوتیژی.. بابەتێکە لە هەر بابەتێکی دیکە زیاتر بیرکردنەوەی مرۆڤی سەرقاڵ کردووە، جگە لە بابەتی خوداو خۆشەویستی".[١]

---

* کونژنکتور: کۆی هەلومەرجی ئابوری، کۆمەڵایەتی، سیاسیو کولتوری.

١ لماذا يتمرد البشر. تأليف (تيد روبرت غير) ترجمة و نشر (مركز الخليج للأبحاث) ٢٠١٤. ص(٣٧).

(دە هەزار ساڵ) لەمەوبەر، کە مرۆڤایەتی لە ژیانی خۆرسکی مرۆڤ-ئاژەڵەوە، لە خۆراکی ناو سروشتەوە ژیانی بۆ بەروبومی کشتوکاڵی دەگوازرێتەوە، هەر لەوکاتەوە توندوتیژیش لە سروشتی ئاژەڵو یاسای دارستانەوە (مانەوە بۆ بەهێزە) بۆ پەیوەندی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵیی دەگوازرێتەوە. با دیقەت بدەین کە داهێنەری بەناوبانگ "بیڵ گیتس" دەڵێ: ئامۆژگاری هەموو ئەوانە دەکەم کە بایەخ بە ڕەگەزی مرۆییو پاشەڕۆژیی دەدەن، کتێبی (العاقل) بخوێننەوە. نوسەرەکەی دەڵێ:

زۆرێـک لە توێژینەوە مرۆییەکانو شوێنەوارناسی ئـامـاژە دەکـەن، کە کۆمەڵە کشتوکاڵییە ساکارەکان، کە هیچ چوارچێوەیەکی سیاسیان لـەدەرەوەی گوندو هۆزدا نەبووە، توندوتیژی مرۆیی بەرپرسیار بووە لە ١٥٪ی مردوەکان. کە ٢٥٪ی مردنی پیاوان بووە. لەدرێژەی باسـەکەدا دەنوسێ:

"لەگەڵ تێپەڕینی ڕۆژگـاردا، توندوتیژی مرۆیی بەسەر چوارچێوەی پەرەسەندوی کۆمەڵایەتیدا فراوانتر زاڵبوو: شارەکانو قەڵمڕەوەکانو دەوڵەتەکان. بەڵام بونیاتنانی پەیکەرەی سیاسی زەبەلاحو کارای ئاوها هەزاران ساڵی گەرەکە".[١]

ئەوەی لە هەموو دیاردە ترسناکەکانی توندوتیژی، ترسناکترە، ئەوەیە کە لەسەردەمی کۆیلەیەتیەوە، کە یەکەمین یاسا بۆ کۆیلەیەتی لەلایەن "حامورابی"یەوە دادەنـرێ، حامورابی پێی وایە، کۆیلەیەتیو خاوەن کۆیلە، کارێکی خوداوەندییە نەک بەشەری. کاتێک دەگەینە قۆناغی سەرهەڵدانی فەلسەفەش، فەیلەسوفێکی وەکو ئەرستۆ دەڵێ: کۆیلە سروشتی کۆیلەیەتیو سەربەستیش سروشتی سەربەستی هەیە. سروشت.. واتا پێکهاتەیەکی نەگۆڕ!! هیندۆسیەکانیش لە هیندستان، لەو بـاوەڕەدان هێزێکی گەردونی پلەبەندی چینایەتی خوڵقاندووە. بەپێی ئەفسانەی بەناوبانگی هیندۆسی، گوایە، خوداوەند بەم چەشنە جیهانی لەسەر پێکهاتەی جەستەی مرۆڤی سەرەتایی پێکەوەناوە، ناوی (بوروشا)یە.

- هەتاوی لە چاوی بروشا دروستکردووە.
- بەراهمە (قەشە) لە دەمی.
- کاشتریا (جەنگاوەرەکان) لە دەستی.
- فیشیا (جوتیارو بازرگان) لە ڕانی.
- شودرا (نۆکەر) لە قاچی.

---

١ يوفال نوح هراري. العاقل. تأريخ مختصر للنوع البشري. ترجمة: حسين العبرى. صالح بن على الفلاحي. دار منجول للنشر. ٢٠١٨. ص(١٠٥).

کاتێک ئەو پلەبەندییە کۆمەڵایەتیە وەکو عەقیدەی نەگۆڕ دەسەلمێندرێ، ئیدی تا هەتایە، کۆیلەو خاوەن کۆیلە، چەوساوەو چەوسێنەر، زەنگینو بەلەنگاز، دەپارێزرێن.

لەو سەردەمەشەوە کە دەگوازینەوە ناو ئاینەکان، هیچ ئاینێک، نە کۆیلەو نە چەوساوەکانی، بەیەکجاری رزگار نەکردووە. بەڵکو یاسای بە کۆیلەو چەوساوە مانەوەی بۆ دارشتوون!! پەیرەوانی ئایینی مەسیحی، ئاینەکەیان لەو دۆخەی رۆمادا بلاودەکردەوەو کۆمەڵ کۆمەڵ برواداریان پێکەوەدەناو کۆیلەشیان لە ریزەکانیاندا قبوڵ دەکرد، بەبێ ئەوەی بەڵێنی ئازادکردنیان پێ بدەن، بەڵکو بە ژیانی بەختەوەری هەمیشەیی دوای مردن، رایاندەهێنان.[1]

لەقورئاندا هاتووە: (انظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَلَلْآخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَاتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلاً- ئایەتی ٢١ی سورەتی الأسراء). قورئانیش بەپێی شەرعو سوننەت، قابیلی دەستکاری نییە. بەڵکو رەخنە یان لێکدانەوەی ئایەتەکانیش، بە گوناح دەزانرێو لەلایەن سەلەفیە توندڕەوەکانەوە، سزاکەی ملپەڕاندنە!!

## (٣)
## چاوگی توندوتیژی ئایینی

مەبەستمانە لەو باسانەدا بەدوای چاوگی توندوتیژی بگەرێین. کە گۆڕانکاریەکان لەروی ئابوریو سیاسیو کۆمەڵایەتیەوە، چەمکەکانی توندوتیژیان گۆڕیووە:

-لێکدانەوەی ئەفسانەیی هەرە دێرین، لەو باوەڕەدا بون، نادیارێکی گەردونی، یان خواوەندێک، سروشتی مرۆڤەکانی لە کۆیلەوە بۆ مرۆڤی باڵاتر خوڵقاندووە. لەسەر ئەم بنەمایە، توندوتیژی سەردەمی کۆیلەیەتی سەپێنراوە.

-ئاینەکان، لەو باوەڕەدان، جیاوازی پلەبەندی چینو توێژەکان، کاری خودایەو قابیلی دەستکاری نیە، ئەمانیش توندوتیژیو سەرکوتکردن هەتاڕادەی قڕکردنی ئەنفالو ملکەچکردن بە مرۆڤی چەوساوە، بە حەڵاڵ دەزانن. بەڵکو لایان پیرۆزیشە.

-شۆڤێنیستو فاشیستەکان، لێکدانەوەی فیزیکیان بۆ مرۆڤی باڵاو مرۆڤی نزم، ئاقڵو بێئەقڵ، زاناو نەزان، رەگەزپەرستی دژی رەشپێست..تاد. تیۆریزەی نازانستی

---

١ صراعات الكنيسة و سقوط القسطنطينية. نجيب اسطيفان. الطبعة الاولى ٢٠١١- دار التكوين. ص(١٥).

کردووەو جەخت لە تیۆریەکەی دەکەنەوە، کە سەرمایەدارو کرێکار، سپیو رەش، چەوسێنەرو چەوساوە، هەروا خولقاوونو جیاوازیەکانیشیان نەگۆڕە!

ئەو باوەڕو تیۆرو فەلسەفانە، بەدرێژایی قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی-چینایەتی، سەرچاوەی نەهامەتیەکانی مرۆڤایەتینو هۆکاری درێژەپێدانی چەوساندنەوەی مرۆڤن لەلایەن مرۆڤەوە، بە خوو رەوشتی توندوتیژیو دەسەڵاتی سەرکوتکەرانەشەوە.

مرۆڤایەتی، لەو خو و رەوشتانە. لەو دیاردە قێزەونانە. لەو باوەڕو رێبازانە. هێشتا رزگاری نەبووە. بۆ؟

چونکە، هۆکارە ئابوری، کۆمەڵایەتی، ترادسیۆنەکانی ئەو خو و رەوشتانە، لە دەرونی نەک تاک تاکو توێژ توێژدا، بەڵکو لەناو سەرکردەو حیزبو دەسەڵاتەکانیشدا، توندوتیژی وەکو چەکێکی کاریگەری دەسەڵاتپارێزیو سزادانی تاوانبار، تەنانەت بەرامبەر سەربزێوی رەوای دیموکراسیش، توندوتیژی سیاسی، تەکنیکی، ئایدیۆلۆژیو یاسایی، چ رەوا و چ نارەوا، هەتا ئێستاش پەرەی پێدەدرێ. لەناو رەوتە ئیسلامگەراکانو لەناو دونیاگەراکاندا. ئەگەر بمانەوێ نوکی قەڵەم لە راستییە کۆمەڵایەتیەکان پتر رۆچێنین، دەتوانین بڵێین:

لە وڵاتانی رۆژئـاوادا، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، قەلەمڕەوە ئوروستوکرات-تیوکراتی (دەسەڵاتی رەهای ئایینی دەرەبەگایەتی!) جگەلەوەی لەناو خۆیاندا، سەدان ساڵ خەریکی توندوتیژی ناوخۆییوماڵوێرانی بون، هەتا گەیاندیانە دۆخی جەنگی سی ساڵەی (کاتۆلیک-پروتستانت) ١٦١٨-١٦٤٨و ملیۆنەهایان کردە قوربانی رقی توندوتیژی مەزهەبی؛ هەتا لە یەکەمین پەیماننامەی نێودەوڵەتیدا بەناوی (ویستڤالیا) کۆتاییهات! جگە لەمە، بەناوی خاچپەرستیەوە، یەکەمین جەنگی هـەردوو ئایینی مەسیحی-ئیسلامیان بەناوی رزگارکردنی شوێنە پیرۆزەکانی مەسیحی-فەلەستین، بەرپاکرد، کە تا ئێستاش ئاسەوارەکانی ئەو جەنگە لەناو موسوڵمانو مەسیحیەکاندا، ماوە. ئەمە لەکاتێکدا، ئەگەر رەگەزەکانی توندوتیژی نەبوایەو دیالۆگێکی سەرەتاییش لەناو ئاینەکاندا هەبوایە، چارەسەرکردنی کێشەی قودس، هێندە قورس نەبوو، کە سەرەنجام، ئەم هەموو جەنگو لەشکرکێشی ئایینی-مەزهەبییەی لەسەر بەرپا بکرێ. چونکە پێغەمبەر، رووی قیبلەی موسڵمانانی لە قودسەوە بۆ مەککە وەرگێڕا. ئەگەر لۆژیکی ئایینی، دەسەڵاتەکانی ئایینی ئاڕاستە بکرایە، دەبوایە ئاشتەوایی ئایینی لەسەر قودس کرابا. هیچ نەبێ، بۆ سروت (طقس)ی ئایینی. هەروەکو چۆن پێغەمبەر،

پەیامبەری مەزنی موسڵمانانە، بەهەمان شێوە پێغەمبەر مەسیحیش، پەیامبەری مەزنی مەسیحیەکانەو مەسیحیەکانیش، بەپێی تێکستی قورئان، ئاینێکی ئاسمانیە. قیبلەش گواسترابێتەوە، کەوابێ، چارەسەر ئاسانتر بووە! لە قورئانیشدا، رێزگرتنی ئاینەکانی تر رەتنەکراوەتەوە. کەوابێ تەنها تەماحی دەسەڵاتو دەستکەوت، دەسەڵاتدارانی ئاینەکانی هانداوە جەنگ بەرامبەر یەکدی هەڵبگیرسێنن. نەک تێکستی پیرۆزی ئاینەکان!

سەرەڕای مانەوەی ئەو کێشە دێرینەیە بە چارەسەرنەکراوی، کەچی موسڵمانو مەسیحی، هەر لایەکیان زیارەتی پەرستگاکانی خۆیان دەکەن. مزگەوتی (قبة الصخرة) و قەبری مەسیح لە (بیت اللحم) روگەی هەردوو ئاینەکانە. کێشەی زیارەتو حەج، لەنێوان مەسیحیو ئیسلام، گوازراوەتەوە بۆ دژایەتی جولەکە!! بەهۆی باڵادەستێتی هێزو تەکنەلۆژیای وڵاتانی مەسیحیشەوە، وڵاتانی ئیسلامی ناچارن دۆستایەتیان قبوڵ بکەن. تەنانەت نەشیانتوانی، دەوڵەتی جولەکەش لەناوبەرن!

## ( ٤ )

## خاچپەرستیو رقی ئایینی

ئەو رقە ئایینیەی لە جەنگی خاچپەرستانەوە سەپێنراوە، دوای هەزار ساڵیش سەرچاوەی بەشێکی هەرە کاریگەری توندوتیژی گەلانی ناوچەکەیە، کە لە دوای جەنگی یەکەمو بەڵێنی بلفۆر (١٩١٧) ئایینی جولەکەو ئیسرائیلیەکانیش تێوەگلاوون. بەمەش، بەهۆی جەنگی خاچپەرستیەوە، هەرسێ ئایینە ئاسمانییە یەکتاپەرستیەکە، بەردەوام لەناو گێژاوی سیاسی-ئایینی-مەزهەبی-سایکۆلۆژی، کولتورینو بەیەکدا هەڵدەشاخێن. قوربانیەکانیشیان، خەڵکی باوەڕداری ستەملێکراوە، لەلایەن لایەنە دەسەڵاتدارو هەژمونی ئایدیۆلۆژیەتە مەزهەبیەکانەوە. کە ئێستاش، رۆژانە سەرچاوەیەکی هەرە کاریگەری توندوتیژی، لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستو تەنانەت لەجیهانیشدا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو جەنگە خاچپەرستییە، کە ئەگەر رادەیەک لۆژیکی لێبوردەیی مەسیحیو ئایینی ئیسلام کێ ویستی باوەڕدار بێو کێش نەیویست با گومرا بێ «فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ- ئایەتی ٢٩ی سورەتی الکهف» هەرگیز نەدەبوو ئەو جەنگە بەرپا کرابا.

مێژووش وا دەخوێنمەوە، کە زۆربەی ئەو جەنگانەو پێشتریش، بۆ خواستی دەسەڵاتدارێتیو چاوچنۆکی جەنگو داگیرکاری تاڵانی (ئەنفال) دەگەڕێنەوە. ئەنفال لە زمانی عەرەبیدا واتا: (دەستکەوتی جەنگ لە ماڵو مناڵو ژنو غوڵام..تاد).

کاتێک خاچپەرستەکان، بەناوی رزگارکردنی ئارامگای مەسیحو شاری قودسەوە، بەڵێن دەدەن شوێنە پیرۆزەکان لە موسڵمانو سەلجوقیەکان رزگار بکەن، بۆ دزیو تاڵانی، نەک موسڵمانەکان، بەڵکو جولەکەو مەسیحیەکانیش دەکوژنو تاڵان دەکەن. با دیقەت بدەین، توندوتیژیو تاڵانی چۆنچۆنی لەناخی جەنگاوەرانی مەزهەبو تایفەکاندا، لە باوەڕە رۆحیو خوداپەرستیەکە کاریگەرتر بووە، لەمبارەوە مێژوو ئەمەمان پێدەڵێ:

"دوای ئەوەی هێزی خاچپەرستەکان شاری قودسیان داگیرکرد، زیارەتکارە مەسیحیەکان، کاتێک گەیشتنە مەڵبەندی پیرۆز، هەستیان بە راچڵەکینو نەفرەت کرد لەو تاوانە قێزەونو ترسناکەی جەنگاوەرەکان بەناوی مەسیحیەوە ئەنجامیان دابوو، بە دڵێکی شکاوی بارگاوی بە خەم گەڕانەوە، چونکە دڵنیابون کە مەسیحیەکان نمونەی باشتریان لە ئیسلامەکان پێشکەش نەکرد".[1]

حوکمڕانی سەلجوقیەکانو پێشتریش دەسەڵاتەکانی تری ئیسلام (٤٠٠) ساڵ، هەر بە توندوتیژیو تاڵانی براوەتە سەر. هێرشی خاچپەرستەکانو سەرکەوتنیان لە (١٠٩٧-١٠٩٩) کوتومت ئەم تاوانەیان ئەنجامداوە:

"جەنگاوەرەکان لە تەمموزی (١٠٩٩) گەیشتنە شاری پیرۆزو دوای تێکشکاندنی بەرهەڵستی لەناوخۆدا، تاوانی کوشتنی بەکۆمەڵیان دەرهەق موسڵمانەکانو سەدان جولەکەشیان بەزیندویی لەناو پەرستگاکانیاندا سوتاند".[2]

## ( ٥ )
## باوەڕی رۆحیو دەسەڵاتی دونیایی

لاپەڕەکانی مێژوو، دێڕ بە دێڕیان لە تاوانی دەسەڵاتەکانی ئیسلامی-سەلجوقی-خاچپەرست، خەڵتانی خوێنن. هەموشی بۆ پەروەردەی توندوتیژیو بڕوای تەفروتوناکردن

---

١ صراعات الكنيسة و سقوط القسطنطينية. نجيب اسطيفان. الطبعة الاولى ٢٠١١- دار التكوين. ص(١٨٧).
٢ صراعات الكنيسة و سقوط القسطنطينية. نجيب اسطيفان. الطبعة الاولى ٢٠١١- دار التكوين. ص(١٨٦).

دەگەڕێتەوە. ئەم پەروەردەیە؛ هەم رۆحیو هەم دونیایی بووە. رۆحی بووە. بەناوی خوداو عەقیدەوە؛ دونیاییش بووە لەپێناوی دەسەڵاتو دەستکەوت. پرۆسەکە سەدانساڵیشی خایاندووە. واتا: وەچە دوای وەچە، میراتگری باوەڕی رۆحیو چاوچنۆکی دونیایی بوون. بەبێ ئەوەی لە سەدەی رابوردوی دونیای سیاسەتو حیزبایەتی دونیاییدا، بنچینەکانی پەروەردەی ئەو وەچانە، گۆڕدرابن. بەمەش، کەلەپوری پەروەردە رۆحیو دونیاییەکە، بۆ دەسەڵاتەکان چارەنوسساز بووەو بەردەوامیش بووە. لە سیستمەکان، کولتورەکان، دابونەریتەکانو تەنانەت لە پەروەردەی کۆمەڵایەتی، پاشان سیاسەتو حیزبایەتیشدا، ئەو پەروەردەیە، پارێزراوەو سەپێنراویشە. بەردەوامیش پەروەردەکە، سەدان هەزار ئەقڵو ئەقڵیەتی زاخاوی توندوتیژی داوەو بۆ تاوانو تاڵان پەروەردەی کردون.. لە هیچ بەربەستێکیش، نەپرینگاوەتەوە. لەناو ژانی ئەم پەروەردەیەوە، بەشێکی سیاسەتی حیزبەکان دارێژراوە؛ کادرەکانیان پەروەردە کراون؛ سەرکردەکانیان هەڵکەوتون؛ دەسەڵاتەکانیشیان پاراستوون.

قۆناغ بە قۆناغ، رەگەزە دێرینەکانی ئەو پەروەردە ترسناکەی سەدەکانی ناوەڕاست، لەڕووی رۆحیو دونیاییەوە، ئاوێتەی هەندێک چەمکی نوێ کراوون. بەڵام گەوهەرەکەیان، کە گەوهەری پەروەردەی توندوتیژی ئەندێشەکانی سەدەکانی ناوەڕاستە، نەگۆڕدراوە. هەربۆیە دەبینین، سەرکردەکان، لە پارتە دیموکراتو چەپەکانو لافلێدەرەکانی گۆڕانکاریشەوە، بەسانایی هانا بۆ ئەندێشە دێرینەکانی سەدەکانی ناوەڕاست دەبەن؛ لەپەنای دروشمی زەق زەقی دادپەروەریو "گۆڕان"ەوە، بۆ ئەندێشەی دژە گۆڕان هەڵدەگەڕێنەوەو خۆشیان دەهاونە ئەندێشەی سەدەکانی ناوەڕاستیش!! لە پەروەردەو هاندانی جەماوەریشدا، ئاژاوەگێڕییەکی فراوان بەسەریادا، زاڵدەبێ!!

نەگۆڕینی بنچینەی ئەندێشەکانی سەدەکانی ناوەڕاست، سەرچاوەی بەشی زۆری سایکۆلۆژیەتی توندوتیژیو هزری ستەمکارییە، سەرەڕای ئەوەی قۆناغەکانی کۆمەڵایەتی-سیاسی، دەسەڵاتەکان، ناوبەناو دەگۆڕدرێن. بەڵام هەموو دەسەڵاتێک، لەبەرئەوەی بنچینەکانی سایکۆلۆژیەتی توندوتیژی لەناو کۆمەڵدا نەگۆڕدراوە، بۆیە هێزی سیاسی نوێو دەسەڵاتی نوێش کە دێنەکایە، هێزە کۆنەکان، ئەندێشەی توندوتیژی بەهەموو رەهەندەکانیەوە، دەسپێرێنە هێزی تازە هاتوەکەی سەر حوکم. ئەم هێزەیش، ماوەیەک بە ئارایشتکردنی دەسەڵاتەکەی، ئارامییەک دێنێتەئارا، بەڵام لەناوەرۆکدا، پاشخانی توندوتیژی ئامادەشی هەیە، کەی خواستی بەکاریدەهێنێ. زۆریشی پێناچێ بۆ ئەم جۆرە هێزە سیاسی-کۆمەڵایەتی-حوکمڕانیانە، لەبەردەم خەڵکدا ئارایشتەکانیان دادەشۆردرێو تەنها هێزە

سەرکوتکەرەکانیان لەبەردەستدا دەمینێ. بێئاگا لەوەی هێزەکەی ئەمانیش، تا رادەیەک دەتوانێ بیانپارێزێ.. بەڵکو بەکارهێنانی هەمان هێز، بەبێ گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی هەمەلایەنە، سەری دەسەڵاتەکەش دەخوات. لەبەرئەوەی هێزی سەرکوتکەر، کاتێک بەرگری لە دەسەڵاتی ستەمکار، لەناو هەمان پەیوەندی کۆمەڵایەتی وەرنەچەرخاودا دەکات، لە دوائاکامدا زەمینەی لەناوچونی خۆی، بە زەبرو زەنگەکەی دەرەخسێنێ. چونکە زەبروزەنگی ناڕەوا، مادام ماکە کۆمەڵایەتیەکانی زەبروزەنگ لەناونەبراوون؛ زەبروزەنگی ناڕەوای تر بەرهەم دەهێنێت.

## (٦)
## دەرەبەگایەتی و زەبروزەنگ

مێژووی سەدەکانی رابردوو، لەسەردەمی میرنشینو پاشانیش کوردایەتی سەدەی بیستەم، پێماندەڵێ: گۆڕانکاری کوردەواری، لەناو بازنەیەکی داخراودا گیری کۆمەڵایەتی خواردووە. هۆکارەکەشی دیارە، ئەویش ئەوەیە، سەدەکانی ناوەڕاست، سەدەکانی قەڵەمڕەوی هێزە ئیسلامگەراکانی عەرەبو تورکو فارس بووە. بەرەنجامەکانیشی، درێژەپێدانی سیاسەتی زەبروزەنگی مەزهەبی (سونیگەرا-شیعەگەرا) لەڕێگەی ئایدیۆلۆژیەتی مەزهەبی، لەشکری مەزهەبی، کولتوری کۆمەڵایەتی مەزهەبیەوە بووە. جا بەناوی قەڵەمڕەوی ئیمپراتوریەتەوە بوبێ، یان لەناو هەمان کولتورو دابونەریتدا، یاخیبون دژی قەڵەمڕەوەکان رویدابێ. کانگاکانی توندوتیژیو زەبروزەنگ، هەمیشە لەناو کۆمەڵدا، بە بەرنامەو بەرژەوەندی پارێزراون. کاتێک جەنگی یەکەمی جیهانیش (١٩١٤-١٩١٨) قەڵەمڕەوی عوسمانیەکانی سەدەی ناوەڕاست، بە هێزی دەرەکیو بە جەنگی داگیرکاری گۆڕی، بەرژەوەندیە ئابوریەکان وایان دەخواست، گۆڕینەکە تەنها لوتکەی قەڵەمڕەوەکان بگرێتەوە، دامێنی کۆمەڵایەتی لوتکەکانی لەبنەچەوە نەگۆڕێ. بەڵکو بەرژەوەندیان وای دەخواست بەدواکەوتوویی بیانهێڵێتەوەو ئەمەش کرۆکی سیاسەتی کۆلۆنیالیستی کلاسیکی بوو. بۆیە، وێڕای ئەوەی لە تورکیا، ئێران، عێراقو سوریادا، حکومەتەکان گۆڕدران، بەڵام هێزە کۆنەپارێزەکان، بەدرێژایی سەدەی بیستەم، کەی ویستبێتیان حیزبی سیاسی، یان هێزی چەکداری تایبەتی، یان یاخیبونو هەڵگەڕانەوە، لەناو هەمان هزرو پەیوەندی کۆمەڵایەتی نەگۆڕدراودا، هێناوەتە کایەو کایەکانی تری

هەر گۆڕانكاریەكیش بە ڕواڵەتیش هاتبێتەدی، بەئاسانی تێكوپێكیان داون. لەسەردەمی داگیركاری بەریتانیاو فەرەنساو ئیتاڵیاوە، دوای جەنگ، بە زەقی ئەو ڕوداوانە دەبینین، كە بەهۆی كانگا دەستكارینەكراوەكانی ئەندێشەكانی سەدەكانی ناوەڕاستەوە، ڕویانداوە. لەمەوە، ئیخوان موسلیمین (١٩٢٨) دروستدەبێ‌و هەر لەناو ئەم كانگایەشەوە، هێزی دژە گۆڕانكاری سەرهەڵدەدەن. تەنانەت هێزە بۆرژوازیە لاوازو كۆمپرادۆرەكانی وڵاتانی دواكەوتوش، لەناو هەمان زایگای دواكەوتودا، لەدایكبوون. سەرەنجام، زەبروزەنگەكان تا ڕادەی كوشتنی بەكۆمەڵیش، لە توركیا، ئێران، عێراق‌و سوریادا، هەروەها لەناو تەواوی وڵاتانی ئیسلامیدا، سەپێنراوە. هەربۆیە، نە شۆڕشی نیشتمانی‌و نە شۆڕشی پیشەسازی‌و نە شۆڕشی دیموكراسیش، بە چەمكە زانستیەكان لە وڵاتانی دواخراودا، نەهاتونەتەدی.

كەمال ئەتاتورك ئەنفالی شۆڕشەكانی ئاگری داخ‌و دەرسیم‌و ناوچەی زیلانی كردووە. ڕژێمی شاهنشایی ئەنفالیان كردووەو سەدان هەزار كوردیان ڕاپێچاوەتە ناوچەكانی ئازەری‌و فارس. توركو فارسیشان لەكوردستاندا جێگری شۆڤێنیستانە كردووە. نەسەلماندنی مافی كوردو سەركوتكردنی بەردەوام بووە. لە سوریاشدا، شۆڤێنیەتی پشتێنی سەوزیان سەپاندو شانازیەكانی ئەمەویان لە نەتەوەپەرستیدا ژیاندەوە. عێراقیش، لە زەمانی پاشایەتیەوە، كورد قڕ دەكات‌و دەسەڵاتی كۆماری-ناسیۆنالیستی عەرەبی عێراقیش، گەیاندیانە ئەنفال، كیمیابارانی هەڵەبجە، قەراغ، خۆشناوەتی، بادینان، گۆپتەپە، ئۆردوگای زێوێ‌و تەنانەت سەردەشتی ڕۆژهەڵاتی كوردستانیش.

هەرگیز لەم وڵاتانەی ئیسلامیدا، وەرچەرخانێك بە ئاراستەی شۆڕشی پیشەسازی-دیموكراسی-كۆمەڵایەتی ڕاستەقینە، ڕوینەداوە. بۆیە بەئاسانی لە هەزارەی سێهەمیشدا، هەروەكو هەزارەی یەكەم‌و هەزارەی دووەم، هێزە كۆمەڵایەتیە دەستكاری نەكراوەكەی ئەم وڵاتانە، هەر هەلێكیان بۆ هەڵكەوتبێ، خاوەندارێتی ئەو هێزە كۆمەڵایەتیەی دێرزەمان، بە دەمامكی مەزهەبی-سیاسی-ئایدیۆلۆژی نوێوە دەكەن، توانیویانە لەماوەیەكی كورتیشدا، هێزە كۆمەڵایەتی‌و هزرە بارگاویەكەی توندوتیژی بجوڵێنن‌و ئاراستەی كۆنەپەرستیان.. هەتا ڕادەی كۆمەڵكوژی، ژنكوژی، دیلكوژی‌و بوژاندنەوەی تۆتالیتاریزمی ڕۆحیش، بۆ دیاری بكەن. بوژانەوەی نەریتی تایفی‌و باوكسالاری‌و كۆمەڵی شین‌و شەپۆڕو شەڕی ناوخۆی وڵاتانی ئیقلیمی، لە هەزارەی سێهەمیشدا، گەواهی ئەو كولتورو دابونەریتە دێرینەیە دەدەن.

## (٧)
## نەبونی ڕۆشنگەریو توندوتیژی

لە مێژووی وڵاتانی ئیسلامیدا، بەتایبەتی لە کوردستانی داگیرو دابەشکراودا، بە حوکمی ئەوەی دەوڵەتی نەبووە، هەتا ئێستاش، رادیکاڵیزم لە رۆشنگەریدا نییە. بەڵکو، سازشی ترسێنەر لەگەڵ ئەندێشەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا هەیەو، ئاسۆی گۆڕانکاری گەورەش لەمبارەوە، لە سیاسەتی حیزبە بەناو دیموکراتەکانی وڵاتانی ئیسلامی، تا هەنوکەش نییە. بەڵکو هێندەی رەچاوی سازان، لەگەڵ بیری بەسەرچووی رابوردوودا هەیە، نیو هێندە، خەبات دژی ئەندێشە زیانبەخشەکانی رابوردوو نییە. با دیقەت بدەینە چۆنیەتی هەڵوێست وەرگرتنی لیبرالو عەلمانیەکان، لە بۆتەی ململانێی فەلسەفیدا دژی سەلەفیەت:

"رەوتی نوێگەری لەرێگەی رەوتە جیاوازەکانی تەعریب، لیبرالیەت، ئەقڵانیەتو عەلمانیەتەوە بەرجەستەو گەڵاڵە بوو. بەڵام نەیوێراو نەیتوانی رووبەڕوو هێرش بکاتە سەر ئیسلامی نەریتگەرا، هەرکاتێک رووبەڕووبونەوەیەک لەنێوان ئیسلامو ئەقڵدا رویدابێ، رووبەڕووبونەوەیەکی خواروخێچو رسوایی بووەو ئەقڵ بەرامبەر ئەم ئیسلامە نەریتگەراییە خۆی بەدەستەوە داوە".[1]

لەخۆڕا نییە و نەبووە، زیاتر لە سەدەیەک بەسەر کۆتاییهاتنی عوسمانی، سەفەوی، قاجاری، شاهنشایی سونیو شیعە تێپەڕیووە، گوایە حکومەتەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست نوێ کراونەتەوە. بەڵام سەیری چواردەوری کوردستان بکرێ، هەردەم روداوی نەخوازراوی توندوتیژی کۆمەڵکوژی رویداوە:

-لە تورکیادا؛ چەند کودەتا رویداوەو لەسەر ئازادیو دیموکراسی، سەدان هەزار کەس کوژراوون.

-لە ئێراندا؛ بەردەوام کێشە هەبووەو سەدان هەزار کەس کوژراوون.

-لەعێراقدا؛ دەیان حکومەت گۆڕدراوەو سەدان هەزار کەس قڕ کراوون.

-لەسوریادا؛ بەردەوام لە ئاژاوەو شەڕو سەرکوتکردنی ئازادیخوازاندا بونو کورد سەرکوتکراوە.

---

١ حسين العودات- النهضة والحداثة بين الارتباك والاخفاق. دار الساقث- الطبعة الاولى ٢٠١١. ص: (١٤٠-١٤١).

ئەو روداوانە، بە ریکەوت نییە. بەڵکو زادەی باری کۆمەڵایەتی‌و هەڵقوڵاوی کولتوری زاڵی زەبروزەنگە، لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە بۆ سەدەی نویێ!! سەرنەکەوتی تاقە سیستەمێکیش لە بونیاتنانی سیستەمی دیموکراسیدا، دەگەڕێتەوە بۆ هەمان سەرچاوە کۆمەڵایەتیە دەستکارینەکراوەکەی سەدەکانی ناوەڕاست!!

## (٨)
## کوردایەتی‌و زەبروزەنگ

کوردایەتی لەکوردستاندا، لەو راستییە بەدەر نەبووە. راستە دەوڵەت‌و سیستەمی سەربەخۆیی کوردستانی نەبووە. بەڵام هێزە سیاسیەکان، هێندەی دەسەلاتیان هەبووە، لەکاتێکدا خۆیشیان قوربانی ستەمکاری بون، بەناوی پاراستنی کوردایەتی‌و دژایەتی داگیرکەرانەوە، ئەوەی لەدەستیان هاتووە، لەکوردستاندا بۆ پاراستنی هەژمونیان بە زەبروزەنگ، کردویانە. لە باکوری کوردستاندا، میری بەدرخان (١٨٤٧) هەڵەی نابەجێی بەرامبەر مەسیحیەکان دەکرد؛ بەهۆی ئەندێشەکانی سەدەکانی ناوەڕاستەوە، سوڵتان عەبدولحەمید (١٨٨٧) دەتوانێ بەشێک لە کورد سوارەی حەمیدیە دروستبکات‌و بیانکاتە جاشی لەشکری عوسمانی-سونیگەرایی، بۆ جینۆسایدکردنی ئەرمەنی نزیکترین گەلێک کە لەگەڵ نەتەوەی کورددا ژیابن؛ لە زەمانی شێخ مەحمودیشدا، هەرچەندە تەنها ساڵێک فەرمانڕەوا بووە، نەیارەکانی لەسەر رەخنەو بیروباوەڕی جیاواز تیرۆر کراوون؛ لە رۆژهەلاتی کوردستاندا، سمکۆ مار شەمعون‌و دۆستانی دەکوژێ؛[*] شۆڕشی ئەیلول، شەش ساڵ (١٩٦٤-١٩٧٠) دوچاری شەڕی ناوخۆ دەکرێ‌و بە هێزی چەکدار، ناکۆکیەکانیان یەکلاکردەوە؛ شۆڕشی نوێ (١٩٧٦)، بە شەڕی ناوخۆوە سەریهەڵداو لە شەڕەکانیشدا، توندوتیژی گەیشتە رادەی دیلکوژی؛ برایم عەزۆو هاوسەنگەرەکانی بە دیلی کوژران. قرناقاو پشتئاشان کرایە کوشتارگای دیلکوژی.

---

* کۆماری کوردستان، ساڵێکی خایاند، یەک زیندانی سیاسی نەبوەو هیچ کەسێکیش، لەسەر هیچ شتێک، نەکوژراوە. یان لەسێدارە نەدراوە. بەڵام کە ئەرتەشی شا هێرشی کرد، بەشێکی هۆزە کوردیەکان لە کۆمارو قازی هەڵگەڕانەوەو خیانەتیان کرد. تەنانەت، لەکاتی رۆشتنی بەرزانیەکان بۆ پەڕینەوە لە ئاوی ئاراس، هۆز دوای هۆز، شەڕیان دەکردن.

فەرماندەیەکی عەسکەری یەکێتی کادرێکی حیزبی شیوعی ئاخنیبووە ناو گونیەو (هەتا زو لە زێدا نوقم ببێ بەردی تێخستبو) خستبویە ناو زێی بچوکەوە. پێمزانی. بە سکرتێری کۆمەڵەم وت. کەچی لەوەڵامدا وتی: پیاوکوژ، حیز، دز کۆدەکەمەوە تەنها بۆئەوەی قیادە موەقەتە سەرنەکەوێ. منیش وتم: تەنها بە بیروباوەڕی شۆڕشگێڕانە سەردەکەوین. بە دز و پیاوکوژ دەشکێین!! ئەمەش، هەمان سایکۆلۆژیەتو نەریتی زەبروزەنگی دێرینەیە.

لەدوای راپەڕینیش تەنها سێ ساڵ ئارامیی سیاسی هەبوو.[+] دیسان بە شەڕی چەکداری تێهەڵچونەوە، کە تیایدا دیلکوشتن، کرایە خوویەکی ناجوامێرانە. تەنانەت شانازیشی پێوە دەکرا. هەردوو لایەنی سیاسی، یەکێتیو پارتی، ئەنجامیان دەدا. پاشان بزوتنەوەی ئیسلامیو ئەنسارولئیسلام.

توندوتیژی مرۆڤکوژی، نەریتێکی تا بڵێی نەگریسی ناو هێزە سیاسیەکانی کوردایەتی بووە. نەک هەر لە شەڕدا، بەڵکو لە سەیتەرەکانیشدا، دیل دەگیرانو دەکوژران.[*]

ئەنسارولئیسلام (٣٧) پێشمەرگەی یەکێتی لە (خێڵی حەمە) شەهید کرد. بەشی زۆریان بە دیلیی کوژران. تەنانەت سەری هەندێکیشیان بڕین. تەنانەت ناویان خرایە لیستی رەشی راپۆرتی (١٩٩٥)ی رێکخراوی مافی مرۆڤی جیهانی، لە دیلکوشتندا.

ئەم نەریتە، لەلایەن بەشێکی سەرکردایەتی حیزبەکانەوە، بەشانازییەوە بەناوی پاراستنی حیزبو ناوچەی ئازادکراوەوە، دەکرایە رێبازی پیاوکوژەکان!! ئەوەی مایەی سەرسوڕمانیش بوو، کوشتنو دیلکوژی، لە هەوڵی تاکە کەسیەوە، کرایە دیاردەیەکی باو!!

هەر لەناو ئەو رەوتە دڕندایەتیەوە، بەشێکی کادرە سیاسیو سەرکردەکانیش، بەنوسینو بە ئاراستەی ئاشکرا، برەویان دەدایە قووڵکردنی قینی دەرونیو دەرونی تەکەتولەکانیان بە گیانی یەکتر شکاندنو نابوتکردنی بەرامبەرەکانیان، لە رقی توندوتیژی دەئاخنی.

مەترسی گەورەی ئەم پەروەردەیە، لەناو ئۆرگانەکانی یەکێتی، بەتایبەتی لەناو کۆمەڵەدا،[+] گەیشتە رادەیەک، ئازادی بیروڕاو رەخنەگرتن، لە دوای مفاوەزاتی ١٩٨٥

[+] کە بزوتنەوەی گۆڕان دروست کرا، نەوشیروان مستەفا گوتبووی: ئەمەی ئێستا داوای دەکەین، کاتی خۆی لە شاخدا مەلا بەختیارو سالار داوایان دەکرد. من دژیان بوم. قسەکانی ئەوانیش راست بوو!

[*] ساڵی ١٩٩٤ محەمەد حەلاقو (٥) هەڤاڵی لە سەیتەرەی کۆیە داگیرانو بەناهەق کوژران. لەکاتێکدا ناوبراو تێکۆشەرێکی ئازا بوو. کاتێک راپۆرتی مافی مرۆڤ دەرچوو، من لە کۆبونەوەیەکی سەرکردایەتیدا، بەئامادەبونی مام جەلال، لە هەولێر وتم: من دژی دیلکوشتنم. گوناحم چییە دەبمە بەشێک لەم سیاسەتە خراپە؟! مەبەستیشم کوشتنی محەمەد حەلاقو هاوڕێکانی بوو!

[+] شۆڕشگێران، گەرچی هێزی چەکداری سەرەکی ناو یەکێتی نەبوون، بەڵام هێندەی بەرپرسیارێتی عەسکەریان هەبووە، نەمزانیووە دیلیان کوشتبێ. بەڵام هەڵوێستیان دژی دیلکوژی لاواز بووە!

بەیەکجارەکی سەرکوت کرا. لەتەواوی ئەو ماوەیەدا، لەناو ئەدەبیاتی کۆمەڵەدا، یەک وتاری رەخنەیی نابینرێ کە لە سیاسەتی هەڵەی یەکێتی، یان کۆمەڵە گیرابێ.(*) ئەمە لەکاتێکدا بەئاشکرا پەیڕەوی لە سیاسەتی سەرکوێرکردن کراوەو هەر کادرێک زمانی رەخنەی گێرابێ، دەمی بە هەڕەشەو سزادان داخراوە. بەتایبەتی لەدوای پەلاماردانی ناڕەوای هاوڕێیانی ئاڵای شۆڕشەوە، یەک کادرو یەک نوسەری کۆمەڵە نەیانوێراوە، لەسەر هەڵە، کەموکوڕی، تالانیو تاوان، بڵێن لەل!

سەرکوتکردن گەیەندرایە ئەو ئاستە ترسناکە، کاتێک لەسەر سنوری هەردوو بەشی رۆژهەڵاتو باشوری کوردستان، سکرتێری کۆمەڵەو ئەوانەی پەیڕەوییان لە سیاسەتەکەی دەکرد، کۆمەڵەیان هەڵوەشاندەوەو لەناو یەکێتیدا تواندیانەوە، تاکو تەرا نەبێ ناڕەزایی لاوازیان هەبوو، تەواوی کادرو سەرکردەکانی کۆمەڵە، لەبەرامبەر بڕیارێکی مەترسیداری وادا، تەنها ناخی ترسی لەدەستنەدانی پلەو پێگەی خۆیان دەخواردەوە. ئەمە لەکاتێکدا مێژووی هێزە شۆڕشگێڕەکان پێماندەڵێ: لەبەرامبەر بڕیاری چارەنوسسازی وادا، بۆ هەڵوەشاندنەوەی رێکخراوێکی وەکو کۆمەڵە، هەڵوێستێکی شۆڕشگێڕانە تا رادەی جیابونەوە، کارێکی رەوایە. بەڵام لەبەرئەوەی لەساڵی (١٩٨٤-١٩٨٥)ەوە، دوای ئەوەی باڵی راسترەوی کۆمەڵە، لە سێهەمین کۆنفرانسدا لە سەپاندنی دوا نەخشەو پیلانیاندا سەرکەوتن، دۆخی حیزبایەتی ئۆرگانەکانی کۆمەڵە، بەرە بەرە بەرەو خامۆشکردنی ئازادی بیروڕاو دژایەتی هەر هەوڵێکی شۆڕشگێڕانە دەبرا. بۆیە لەبەرامبەر هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەش فزە نەکرا. دڵنیام ترساوون لەوەی کاردانەوە بگەیەندرێتە دڕندایەتی چەکداریو دادگاییکردنی ناڕەزاکان!

لە دوتوێی کۆبونەوەی فراوانی یەکێتی شۆڕشگێڕان کە لەماوەی نێوان ٣-٥ی حوزەیرانی ١٩٨٩ لە نۆکان بەسترا، پرۆژەی یەکخستنەوەی هەردوو رێکخراو، لەچوارچێوەی یەکێتی نیشتمانیدا ئاماژەی پێدراو نوێنەری کۆمەڵەش کە لە کۆبونەوەکەدا وتاریدا، رەزامەندی لەسەر پرۆژەکە نیشاندا. لە هاوینی ١٩٨٩ بەدواوە تا بەسترانی یەکەمین کۆنگرەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەساڵی ١٩٩٢، کۆمەڵە هیچ هەڵسوڕانێکی

---

* هەربۆیە نامیلکەی هەڵوێست (١٩٨٤)، بە نهێنی نوسراو چاپکرا. لە سێهەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەدا، دادگای پشکنینیان لەسەر دانا!!

سیاسی سەربەخۆی نەنواندو وەک نەبوو وابوو. ساڵی ١٩٩٢ لە یەکەمین کۆنگرەی یەکێتیی نیشتمانیی، کۆمەڵە بەشێوەیەکی فەرمی هەڵوەشایەوەو بەتەواوی تێکەڵ بە ستراکتۆری یەکێتی بوو."[١]

## (٩)
## فەلسەفەو سایکۆلۆژیەتو مێژوو

ئەو راستییە فەلسەفییە، گەلێ راستە کە جەخت دەکرێتەوە: فەلسەفە پرنسیپە گشتیەکان لێکدەداتەوە. بەڵام مێژوو رووداوە تایبەتیەکان شیدەکاتەوە. فەیلەسوفێکی وەکو ئەرستۆ دەڵێ: تەنانەت شیعریش پتر لە مێژوو فەلسەفەیە. دیارە مەبەستی شێوازی هۆنراوەی تراژیدیاو هۆنینەوەی ئەفسانەو داستانە بە زمانی شیعر. تراژیدیا لە خوێندنەوەی "ئۆرستیا"[*]وە، بە زمانی شیعر دەستپێدەکات.

بۆ باری دەرونی سەرەتاکانی دەروونناسیش، ئەرستۆ باسی "ئەنتیگۆنا"[+] دەکات، کە تیایدا پێناسە سەرەتاییەکانی کۆششی ئەقڵ، لە ململانێی هەستەکانی دەرونی قارەمانەکانی تراژیدیاکە دەکات.

کەواتا: زمانی شیعر، زمانی فەلسەفە، زمانی فسیۆلۆژیا، زمانی تراژیدیای داستانو شانۆگەریەکانیش، بەشێکن لە مێژوو. بەشێکیشن لە سایکۆلۆژیەتی مرۆڤ!

هۆکار چین، لە زەمانی گریکو تراژیدیاو فەلسەفەوە، کاریگەریە سایکۆلۆژیەکان نەک ماوون، بەڵکو بەهێزیشن؟ هۆکار چین تراژیدیای شیعرو داستان، دوای زیاتر لە (٢٥٠٠) ساڵ، تێکەڵاو بە ئایدیۆلۆژیەتی حیزبەکان، کوشتو کوشتاری دەسەڵاتو سەرکردەکان دەبێ؟

ئاسەواری هەرە زیانبەخشی سایکۆلۆژیی غەریزەی کوشتن، لە هێماسازی ناو ئەفسانەکانی کۆندا، کالیگۆلایە،[*] کە یەکسانە بە پوچگەرایی (نەهلستیەت). کالیگۆلا،

---

١ ئینسکلۆپیدیای یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان- فەرید ئەسەسەرد. سەرپەرشتیاری گشتیو سەرۆکی دەستەی کارا. لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای هۆشیاریو پێگەیاندنی کادیران. چاپی دووەم. ل(٦١٤).

* ئۆرستیا: کارەساتێکی سێ بەشی ئەغریقیە، دانەرەکەی ئیسخیلوسە. ساڵی ٤٥٨ی پ.ز پێشکەش کراوە.

+ ئەنتیغۆنا: بەپێی میتۆلۆژیای ئیغریقی کچی پاشا ئۆدیبەو دایکیشی شاژنە «جۆکاست»ە.

* کالیگۆلا (کایوس سیزار ئۆکوستوس جێرمانیکوس ناسراو بە کالیگۆلا) لە ٣١ی٨ی ساڵی ١٢ی زایینی

رق له کەسێکی دیاریکراو، یان روداوێک، یان دیاردەو بەسەرهاتێک نییە. بەتەنها رقی له دایک یان باوک، یاخود پاشاو پاسەوان نییە... بەڵکو رقی له هەرچی هەیەو نییە، هەڵدەستێ. تەواوی بون لەبەرچاو له بیرکردنەوە دەخات. ئەوەی پێی بوترێ، یاساو رێساو گەردونسازی، قبوڵ نییە.. نەهلستیەت، لەوساوە، خوویەکی ترسناکی رقی رەشە.. رقی سایکۆلۆژیە، رقی ناخی ئەو کەسانەیە، ژیان دەکەنە دۆزەخو کۆمەڵیش بۆ مەرگو مەرگپەرستی هەڵدەگێڕنەوە.

ئەلبێرت کامۆ، ئازا بوو، ئەم فەلسەفە سایکۆلۆژیەی لەناوەراستی سەدەی بیستەمدا، زیندووکردەوە. ئەمیش لەکاتێکدا، یادەوەریەکانی دوو جەنگی جیهانو کوشتارگاکانی جەنگەکان؛ جەنگی داگیرکاری فەرەنسا بۆ جەزائیر، دۆخی ناو فەرەنساو ململانێ فەلسەفیەکانی ئەو سەردەمە.. کامۆ، بە فەلسەفەی نەهلستیەت، مرۆڤایەتی، له سەردەمی کالیگولای ئەفسانەوە، گواستەوە بۆ دیاردە دزێوەکانی سەردەمی کۆلۆنیالیزمو تەنانەت مۆدێرنێتەش؛ پەیامێکی دا بە مرۆڤایەتی، بەڵکو راچڵەکاندنێک بوو، هەتا وا تێنەگەن، نەخۆشی سایکۆلۆژی پوچگەرایی، تەنها له ئەفسانەی گریکدا هەبووە، نەخێر، سەلماندی کە بەردەوام له ناخی بەشێک له مرۆڤەکانی هەموو سەردەمەکاندا هەیە. بەلام بە دەمامکی فەلسەفەی پوچگەراییەوە!

تراژیدیای گریکەکان، تراژیدیای سەردەمی کشتوکاڵ، سیستەمی کۆیلایەتی، سەرهەڵدانو ئاوێتەبونی فەلسەفەیە بە ئەفسانەو داستانەکان. لەو ململانێیەدا، ئەقڵ بەسەر

---

لەدایکبووەو له ٢٤ی١ی ساڵی ٤١ی زایینی کۆچی دوایی کردووە، سێیەم ئیمپراتۆری رۆمانی بووە، له ساڵی ٣٧ی زایینی بۆ ٤١ی زایینی فەرمانڕەوایی کردووە. کە دەکرێتە ئیمپراتۆر سەرەتا لەلایەن خەڵکەوە زۆر پێشوازی لێدەکرێ، بەلام دواتر وردە وردە روو له دیکتاتۆری دەکاو لەکۆتاییەکانی فەرمانڕەوایی خۆی خۆی بە «دیکتاتۆر» دەناسێنێ. لەسەرەتای ژیانی کەسێک بووە زۆر حەزی له هونەرو ئەدەب کردووە، بەلام لەکۆتایی ژیانی سەرەڕای کەمیی تەمەنی کەسایەتییەکی نەفرەتلێکراو بووە، پەیوەندییەکی سێکسی دوورودرێژی لەگەڵ خوشکی خۆی دروزیلا هەبووە، زۆرجار بۆ پیشاندانی هێزو توانای خۆی وەک دیکتاتۆر بە خوشکەکەی خۆی گوتووە بە ئاماژەیەکی من ئەو ملە جوانە دەشێ ببڕدرێتەوە، یان زۆر جار بە راوێژکارەکانی خۆی گوتووە من دەتوانم هەر ئێستا سەرتان له ملتان جیابکەمەوە. بە راوێژکارو سوپاییەکانی گوتووە بڕۆن مانگم بۆ بێننە خوارەوە، مانگ لەو ئاسمانە چی دەکا، دەبێ ببێتە هی من. بەهۆی هەموو ئەم هەڵکەوتەیە مێژوونووسەکان بەتایبەتی (سوێتۆن) بە شێتیان داناوە. له ساڵی ٤١ی زایینی لەلایەن سوپای هەڵبژاردەی ئیمپراتۆری دەکوژرێو کۆتایی بە دەستەلاتی دەهێنرێ. سەرەنجام ئەم کەسایەتیە لەلای ئەلبێر کامۆ بۆتە بابەتێک بۆ شانۆنامەیەک لەبارەی کەسایەتی دیکتاتۆرو مەسەلەی توندوتیژی له ژیانی نوێ، چۆن ئەگەر یەکێک داوای مەحاڵ بکاو لافی مەحاڵ لێبدا وەک ستەمکارانو دیکتاتۆرەکان، ئەو کەسە دەبێتە سەرچاوەی تێکدانی ژیانی ئاسایی‌و نەمانی ئاشتی‌و پێکەوەژیان.

ئەفسانەدا سەردەکەوێ. ئیدی ئەفسانەو داستانە خەیاڵیەکان پاشەکشە دەکەن. بەلام سەرچاوەی کێشە کۆمەلایەتیەکان‌و چەوساندنەوەی چینایەتی: کۆیلایەتی، دەرەبەگایەتی، سەرمایەداری، شەڕی مەزهەبەکان، قەڵەمڕەوەکان، سایکۆلۆژیەت، فەلسەفەو جیهانبینیە جیاوازەکانیش، وەکو ڕەنگدانەوەی هەمان ئەو ڕاستییە بابەتییە کۆمەلایەتی-ئابوری-حوکمڕانیانە، درێـژەی کێشاوە. کاتێک دۆخێکی کۆمەلایەتی‌و سیاسی‌و کولتوری لەو چەشنەش، سەراپای مێژوو داگیـردەکات، بێگومان بـارە دەرونیـەکەش وەکو ئاڕاستەیەکی جودا، بەلام ئۆرگانیک لەتەک دیاردەو دەرکەوتەکانی ترداو، هاوتەریب لەتەکیاندا، ئینتەراکسیۆنی (کارلێک دەکەن)و بەردەوامیش دەبن. تەنانەت بە فەلسەفەی پوچگەراییشەوە، لە سیاسەت‌و دەسەلات‌و حیزبایەتیشدا!

ئەقڵ‌و ئەقڵانیەت، قۆناغی باشیان لە پێشکەوتن‌و سەرکەوتن بڕیووە. بەلام هێشتا جەنجاڵیە دەرونیەکان، بەردەوام لەبەردەم حوکمەکانی ئەقڵدا بەربەستن. بەڵکو هێشتا، ناکۆکی لەنێوان هەستە شاردراوەکانی مرۆڤ‌و هەستە دەربڕاوەکاندا، نەبڕاوەتەوە. ئەو ناکۆکییە، ئاڵۆزترین جۆری ناکۆکییە، کە زۆرجار، لای سەرۆک هۆز، یان سەرکردە، یان ڕەمزە دینی‌و دونیاییەکان، هەستە شاردراوەکان، لەپشت دێوجامەی(*) هەمان ئەو ئامانجانەی ئامانجی خەڵکن، دێنە سەر شانۆو شانۆکەش خوێناوی دەکەن، بەو ئەکتەرانەی بەناوی پیرۆزیەکانەوە خەریکی هونەری سیاسەت، یان خەبات، یاخود قوربانیدانن.

بەربەستەکانی حوکمڕانی ئەقڵانی ئەوەندە بەهێز و کاریگەرن، نائەقڵانیەت هەژمونی هەیەو جەنگی ماڵوێرانکەریش بەرپا دەکات. خراپترینی ئەو هەژمونانە، سایکۆلۆژیەتی پوچگەراییە، لە دونیای سیاسەت‌و دەسەلاتدا. دیـارە حوکمە لۆژیکیەکانی ئەقڵ‌و فەلسەفە، گەلێ جار هاوکێشەکانی مێژویان، بە دابـڕاوی لە رابـوردوو گۆڕیووە. نمونەی شۆڕشەکانی بەریتانیا، ئەمریکا، فەرەنسـاو هۆڵەندا..تاد. لەو شۆڕشانە بەدواوە دەرکەوت، ئەقڵ هەرکاتێک لەسەر بنچینەی فەلسەفەی ئازادی ڕۆنرا، دەتوانێ ئاڕاستەکانی مێژوو بگۆڕێ. بەڵکو بەربەستە سایکۆلۆژی-ڕۆحیەکانی سەدەکانی ناوەڕاستیش رادەماڵێ.

'کانت'ی فەیلەسوف، کە بناغەی تێڕامانی فەلسەفەی لەسەردەمی خۆیدا گۆڕی‌و هەتا ئێستاش فەلسەفەکەی کاریـگەرە، وەکـو ئەندێشە خۆپارێز بـوو، بـەلام گیانە

* دێوجامە: ئەو پەردە ڕەنگاوڕەنگەیە، کە ڕاوچی لەسەر کانیاوەکان، لەپشتیا خۆی بۆ ڕاوە کەو دەشارێتەوە. کەوێکیش دادەنێ بەجوانی دەخوێنێت، هەتا کەوەکان کۆببنەوە!

شۆڕشگێڕانەکانیشی لەبەرامبەر زاڵبونی ئەندێشەی سەدەکانی ناوەڕاست، پشتیوانی دەکرد. وەکو فەیلەسوفێکی ڕۆشنگەر، مێژووی بە دەستکارینەکراوی قبوڵ نەبوو. بەڵکو پێی وابوو، باوەڕهێنان بە تواناو کاریگەریەکانی ئەقڵ، ئێستا دەگۆڕێو ئایندەش دیاریدەکات. ئەگەر وای نەکردبا، کانت، لەبری خزمەتکردن بە ڕۆشنگەری، خزمەتی تۆتالیتاریزمی دەکردا

هیگڵی فەیلەسوف، زیاتر لە کانتو فەیلەسوفەکانی پێشوو، کاری لەسەر چارەسەرکردنی گرفتی نێوان فەلسەفەو مێژوونوسیندا کرد. چونکە پێی وابوو، خودی ئەقڵ، لەژێر کاریگەریەکانی مێژوودایە. بەڵکو، گەرچی هیگڵ مەتریالیستی نەبوو، فەیلەسوفی دیالیکتیک بوو. زۆر جوانی نەخشاندووە کە دەفەرموێ:

"ئەقڵ بەشێکی دابڕاوی هەست نییە، کە بەخشرابێتە تەواوی مرۆڤایەتی، هەتا بتوانێ خودی خۆی لەسەر بنەمای خودێتیدا بسەلمێنێ، بەڵکو ئەقڵ لەرێگەی تێگەیشتنی تاک بۆ خۆی نشونما دەکات کە تێگەیشتنێ بەشێکە لە کۆمەڵ".[1] هیگڵیش ئەگەر وای نەگوتبا، واتا: ئەقڵی نەبەستبا بە تێگەیشتنی کۆمەڵو گۆڕانکاریەکانەوە، ئەویش، فەلسەفەی لە ناوەندی ئەندێشەکانی سەدەی ناوەڕاستدا، چەقی دەبەست.

مێژوو، لە مێژووی سیاسەت جیاناکرێتەوە؛ مێژووی سیاسەتیش، لەدوای شارستانیەتی گریکەکانەوە، لە مێژووی فەلسەفە دانابڕێ؛ مێژووی فەلسەفەش، بەشێکی هەرە گرنگی ئەقڵو دونیاگەراییە. تەواوی فەلسەفەو فەیلەسوفەکان، لەناو روداوەکانو دیاردەکانی مێژووی کۆمەلایەتی-زانستی-سیاسیدا کاریان کردووە. هەموو فەیلەسوفەکانیش، دانیان پیادا نابێ یان نەنابێ، لەروانگەی ئەقڵو لۆژیکەوە بنچینەکانی بیرکردنەوەو رەخنەو بیرمەندییان داڕشتووە. تەنانەت، فەیلەسوفە ئایدیالیستو میتافیزیکیەکانیش، هەتا فەلسەفە پەیدا نەبوو، نەیانتوانی لەروانگەی ئەقڵەوە، بیر لە لاهوتیەتو فەلسەفە ئایدیالیستەکان لە دیدی فەلسەفیەوە، بکەنەوە. داهێنانی زانستو فەلسەفە دنەی فەیلەسوفە ئایدیالیستەکانی داوە، ئاینەکان لەروانگەی فەلسەفیەوە تاوتوێی ئەقڵانی بکەن. پێغەمبەرەکان هیچیان بە دیاریکراوی فەیلەسوف نەبون. بۆیە گوزەر بە مێژووی فەلسەفە، ئەم راستیەمان پێ دەسەلمێنێ، گەرچی هەمیشە فەلسەفە لەناو هاوکێشەکاندا، خۆی لەخۆیدا پرسێکی تایبەتی بووەو خەسڵەتە لۆژیکیەکانی لەدەستنەداوە. تەنانەت فەلسەفە نەبوایە، لەدوای

---

١ جیوفانا رورادوري. الفلسفة في زمن الارهاب. حوارات مع یورغن هابرماس و جاك دریدا. ترجمة: خلدون النبواني. الطبعة الاولى. بیروت- حزیران/٢٠١٣.

رینیسانس‌و ئاینسازی‌و رۆشنگەری، فەیلەسوفە ئایدیالیست‌و میتافیزیکیەکان نەیاندەتوانی، پاشماوەی لاهوتیەت‌و کاسولیک، پاشان ئاینەکانی تریش، بپارێزن.

لەناو میللەتانی موسڵماندا، هێشتا، لاهوتیەت، لە تەوقە ئاسنینەکانی ئەندێشەکانی سەدەی ناوەڕاست، ڕانەپسکاوە. لە نیو سەدەی ڕابوردودا، لەناو عەرەب‌و فارسدا، لەسەر دەستی چەندین نوسەری گەورە، ئەم ڕاپسکانانە دەبینین، وەکو محەمەد ئەراگون، جۆرج تەرابیشی، د.محەمەد ئەلجەداد، د.محەمەد شەحرور، ئەدۆنیس‌و سادق جەلال ئەلعەزم..تاد.

هیگڵ لەناو ئەو فەیلەسوفانەدا، (پێش مارکس) شاسوارە، ڕاستە ئەفلاتون داڕێژەری نمونەگەرایی بوو؛ واتا: لەسەر نمونەی جۆراوجۆر کاری کردووە، ئەرستۆش باوکی لۆژیک‌و ژیانناسییە؛ دیکارت ڕوانگەی ڕۆشن‌و جوێکارە؛ کانت بە بیرمەندی پرسیارو ڕەخنەگرانەی ورد ئەندێش ناسراوە؛ بەڵام هیگڵ لەناو سەرجەم فەیلەسوفەکاندا، زۆرتر بە فەیلەسوفی دەوڵەتداری ناسراوە. بەڵکو دەوڵەت‌و سەرداری یەکەمی دەوڵەتداری بەهەموو شتێک زانیوە؛ نەک خوی، بەڵکو هەموو کەسێکی لەڕووی ڕۆحی‌و ئاکارەوە بەستۆتەوە بە دەوڵەتی بەتوانای سەقامگیرو سیاسەتیشی لەهەمان ڕوانگەوە بینیووە. بۆیە فەلسەفەی دیالکتیکی لە گەڕان بەدوای مەعریفەدا بەستۆتەوە بە ژێرخانەوە.[1] دیارە، هەڵەی گەورەی هیگڵ، ئەو تێڕوانینە ڕەهایە بوو، کە ڕوداوە مێژووییەکانی، لەدەسەڵاتی ڕەهای ئیمپراتۆردا دەبینی. نەک لە گۆڕانکاری هەمەلایەنەی قۆناغەکانی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی‌و دەسەڵاتەوە!! پێی وابوو ناپلیۆن، بە سواری ئەسپەکەیەوە، کەوتۆتەڕێ ئیتر جیهان دەگۆڕێ.. جیهان دەگەیەنێتە ئەو بۆچونە ئایدیاڵەی هیگڵ باوەڕی پێی بوو. بەڵام وادیارە، فەیلەسوفی گەورەش، کە بنچینە فەلسەفییەکانی دەبەستێتەوە بە ڕەهەندی دەسەڵاتەوە، پاشایەکی داگیرکەری وەکو ناپلیۆنیشی لێ دەبێتە ڕزگارکەری ڕۆحی بەشەریەت.

هیگڵ هەڵەی گەورەی وای کردبێ، ئاخۆ، گەلە مێگەلەکانی دونیای سیاسەت‌و حیزبایەتی‌و شۆڕش، چەندیان هەڵەو تاوان بەرامبەر سەرکردەو ڕەمزەکان، لە ئیدیال کردنی ئایدیۆلۆژیەتدا، کردبێ. چەندیش بەناوی سەرکردەوە، تاوانیان کردبێ‌و تاوانیان داپۆشیبێ؟

---

١ افكار هگل. دكتر كريم مجتهدي. چاپ دوم. پژوهشگاه علوم انساني و مطالعات فرهنگي. ل(٨٤).

## ( ١٠ )
# کادری لاوازو چەکداری زاڵ!

لەوە زیاتر ناچینە ناو فەلسەفەو مێژووی فەلسەفە؛ کە بەداخەوە، مێژووی کوردایەتی تارادەی بەزەیی پێداهاتنەوە، بێبەشە لە فەلسەفەی مێژوو، یان لە فەلسەفە بەگشتی. ئەوەی هەشە، بەزۆری لەناو چەپەکاندا بووە. ئەویش زۆرتر لەبەر پێویستیە ئایدیۆلۆژیەکەی ناکۆکی چەپەکان لەگەڵ لایەنە سیاسیەکانی تردا، هانا بۆ فەلسەفە براوە. فەلسەفەش بە تاکڕەهەندی وەرگیراوە. هەتا نەوەدەکانیش، کەمترین سەرچاوەی فەلسەفە لەناو ئەدەبیاتی سیاسی وەرگێردراوە. ئەوەی هەشبووە، لەچاو قووڵی فەلسەفەکاندا، ساکار بووە. بۆیە لە کوردەواریدا، کە سیستەمی دەرەبەگایەتی هەڵنەتەکێنراوەو، وەرچەرخانی کۆمەلایەتی-رۆشنگەری روینەداوە، زمانی فەلسەفەش نوزەی هاتووە، سەرەنجام ئاسایی بووە حیزبە سیاسیەکانی کوردستان، هزری فەلسەفیان لاوازو فەلسەفەی سیاسیان لاوازتر بێ. لەحاڵەتی واشدا، هەموو حیزبە سیاسیەکانی کوردستان، کاتێک لە قۆناغی خەباتی ژێرزەمینی گواستویانەتەوە بۆ خەباتی چەکداری، بەو ژمارە کەمەی کادرو ئەندامانیان، کە بە نهێنی پەروەردەیان کردوون، دەرەقەتی لەشکرێک چەکدارو ئەندامو لایەنگری کۆنەپارێزی دەستکارینەکراو، کە بەهۆی شۆڕشی چەکداریەوە لەدەوریان ئالاوون، نەهاتوون. بەمەش، چەندایەتی حیزبایەتی زاڵکراوەتە سەر چۆنیەتی. بەرە بەرەش، لەگەڵ پەرەسەندنی خەباتی چەکداری، بەرپرسی خاوەن زۆرترین هێزی چەکدار، بەڵکو ئاغاو کوێخای خاوەن هێزی بەرگری میللی، زاڵبونو کادرو ئۆرگانە حیزبیەکان، کە لایەنی کەمی وشیاری 'فەلسەفی-سیاسی'یان هەبووە؛ زیاتر کاری لۆجستیو رابەری سیاسیان پێ سپێردراون. لەئاستی فەرماندەو ئاغا عەسکەریەکاندا، کە ئامادەگی هەمیشەییان بۆ هەڵگەڕانەوەو شەڕەنگێزی هەبووە، هیچیان پێ نەکراوە. هەرکاتێک ململانێی ئایدیۆلۆژیو بۆچونی جیاوازی کادرە هەڵکەوتوەکان، یان رەوتە رەخنەگرەکان، سەریهەڵدابێ، بەحوکمی لاوازی هزرو فەلسەفەی لاواز، توێژی هەلپەرستی، لاولاوئاسا سیاسەتیان کردووە. لەناو کێشمەکێشەکاندا، زوو دایانشکاندووە بەلای هێزداردا. بەڵکو عەسکەریەکانو سەرکردایەتی سیاسی بالادەست، کە کۆنترۆڵی هێزی چەکدار دەکەن، ئەمانیش بایەخە کەمەکەی فەلسەفەو هزر دەبێتە مەسەلەیەکی لاوەکی لایان، بۆیە لەم حاڵەتەدا، لە رێگەی زەبروزەنگی عەسکەریەوە، هەلپەرستە

لاولاوەکـان زوو دەستەمۆ دەکـەنو لەناو هەلپەرستەکانیشدا، پاساوی پاسکردنی سیاسەتی میللیتاریستیو سەرکوتکردنی بیری ئازاد، وردە وردە دەبێتە سیاسەتی باو. ئەگەر دەسەڵاتە عەسکەریەکەش، مەترسی بکەوێتە سەر، پەنابردن بۆ سەرکوتکردن، تا رادەی تاوانکردن، ئاساییە لایان! وردە وردە، هەلپەرستو رەدووکەوتوانی سیاسەتە باوەکان، لە بیروباوەڕ دادەشـۆردرێـنو دەکرێنە لەشکری داهـۆڵ ئاسای دەسـتو دەسیسەی ئەو سەرکردانەی بەهۆی هێزی چەکدارەوە، بەهۆی قەڵەمە لەرزۆکەکانەوە، بەهۆی لاولاوەکانی داکەوتوو بەلای دەسەلاتەوە، چەند مەترسییان لە ئازادی بۆچونو رەخنەی ئازاد هەبێ، دوو بەرامبەر، دەبنە جەلاد. لێرەدا جەلادو قوربانی لەتەنیشت یەکەوە ریزدەبەستنو تەراتێنی سەرکەوتنە عەسکەرییەکانی مێژوو نمایش دەکەن. هەتا مێژوو دادگاییان دەکات. کە دادگایی ویژدانی لەو چرکەساتەوە دەستپێدەکات. سەرکردە لە بیروباوەڕ هەڵدەگەڕێتەوەو هەلپەرستیش دەبێتە کۆمبارسی بێگیانو بێ هەڵوێست.

## ( ١١ )
## دامەزرێنەران و سەرکردایەتی دامەزرێنەر

هەلومەرجی دەستەی دامەزرێنەر، هەلومەرجێکی سیاسی دەگمەنە لە مێژووی دامەزراندنی رێکخراوە سیاسیەکانی کوردستاندا. بۆ؟

**یەکەم**: لەبەرئەوەی دوور لە فاشیەتی رژێم، لـەدەرەوەی وڵات، ئازادانە دەستەی دامەزرێنەر کۆبونەوەکانیان کردووە.

**دووەم**: دەستەی دامەزرێنەر لەلایەن سوریا، لیبیا، فەلەستینیەکانو تەنانەت شورەویش پشتیوانی کراوون؛ یارمەتی مادیو چەکو تفاقیش دراوون.

**سێیەم**: یەکەمین جار بوو لە مێژووی شکستی شۆڕشە چەکداری-سیاسیەکانی کوردستاندا، دەستبەجێ دوای دوو مانگ رێکخراوێکی نوێ دابمەزرێو بەڵێنی بەرپاکردنی شۆڕشیش لە یەکەمینساڵرۆژی دامەزراندنی رێکخراوەکەدا، بدات.

ئەو بارودۆخو خەسڵەتانە، یارمەتیدەری گرنگ بوون، هەڤاڵانی دەستەی دامەزرێنەر، بتوانن لەماوەیەکی کەمدا، بێ سڵەمینەوەو بە پشتو پەناوە، دەستبەجێ، دوای هەرەس بکەونە تێکۆشان.

سەرنجێکی توێژینەوە لە ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەر بدرێ، چەند راستیەک روندەبێتەوە، لەوانە:

ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەر، جگە لە مونزر نەقشبەندی، کە موخابەراتی عێراق دەرچوو، باقیەکەیان، تێکۆشەرانی کوردایەتی پاک، خاوەن بڕوانامەو کەسایەتی بوون.
پێشینەی سیاسیان بەمشێوەیە بووە:

-مام جەلال، د.کەمال فوئاد، نەوشیروان مستەفا، عەبدولرەزاق فەیلیو هۆمەر شێخ موس، تێکۆشەرانی باڵی مەکتەبی سیاسی-پارتی-جەلالی بوون.

-د.فوئاد مەعسوم، عادل موراد، مونزر نەقشبەندی، باڵی پارتی-بارزانی-مەلایی بوون.

واتا: (٥) جەلالیو (٣) مەلایی. لەم سیانەش، مونزر خائین دەرچوو. دوانیان ماونەتەوە.

لەناو ئەم (٨) کەسەدا، مام جەلالو نەوشیروان، لەسەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەدا، لەناو پرۆسەی دامەزراندنەکەی بوون. مام ئەندام بووەو نەوشیروان دورکەوتۆتەوە. پاشان، عەبدولرەزاق فەیلی، کراوەتە ئەندامی کۆمەڵە. بەڵام هیچیان بەناوی کۆمەڵەوە، دەستەی دامەزرێنەر نەبوون.

هیچ ئەندامێکیان، دورونزیک، نە بزوتنەوەی سۆسیالیست بونو نە زانیوشیانە، بزوتنەوە گەلاڵەکەی دەستبەجێ، لەدوای هەرەسەوە، لە شاری مەهابادەوە، دارێژراوە.

لەو ماوەی دەرەوەی وڵاتدا، پێش گەڕانەوەی نەوشیروان، یەکەمین جارو دووەمین جاریش، مام جەلال، دەستەی دامەزرێنەر، هیمەتی زوریان لەو ماوە کەمەدا کردبوو. جگە لە کامپی مەشقو پەیوەندیکردن بە دەیان ئەفسەرو پێشمەرگە، جموجوڵێکی فراوانیشیان لەدەرەوەی وڵاتدا دەستپێکردبوو. کە ئەگەر دامەزراندنی یەکێتیو جموجوڵەکان نەبوایە، ئاسان نەبوو، ئەو هەموو کاریگەریە سیاسیو راگەیاندنە بۆ کوردایەتی رویدابا. مەیدانەکەش، بۆ پارتی بەتەنها چۆڵ دەبوو. بەڵکو دامەزراندنی یەکێتیو چالاکیەکانی مام جەلال، کاریگەری لەسەر رای گشتی کوردو کۆمەڵەش زۆر بوو.

بەلام، هەندێک گیروگرفتیش، کە لە بونیاتنانی یەکێتیەوە، لەناو یەکێتیو پاشان شۆڕشیشدا، هەبووە، وەکو:

-بە چ پێوەرێکی رێکخراوەیی، یان تێکۆشانی سیاسیو ئایدیۆلۆژی، ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەر دەستنیشان کراوون؟

-ئایا دەستەی دامەزرێنەر بەشێوەیەکی کاتی بوون تەنها بۆ جموجوڵی دەرەوەی وڵات هێنرابوون، یان هەمیشەیی بوون.. ئەمەیان لەسەرەتای دامەزراندندا، دەستنیشان نەکراوە؟ لەمەوە، گرفتی ڕێکخراوەیی دێتەپێشەوە، وەکو:

-عەبدولرەزاق فەیلی، لە ئەندامانی ئاسایی کۆمەڵە بووە، دەکرێتە دەستەی دامەزرێنەر. ئۆتوماتیک دەبێتە بەرپرسی سکرتێرو سەرکردایەتی کۆمەڵە، ئەمەیان بۆچی کۆمەڵە بیری لێنەکردۆتەوە؟

-کە مام جەلال‌و نەوشیروان گەڕانەوەو سەرکردایەتی ناو کوردستان بە یەکگرتوویی دامەزرا، بۆچی باقی ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەر نەگەڕانەوە؟ واتا: لە (٧) ئەندامی دامەزرێنەر (مونزرمان لێدەرکرد) تەنها دوو هەڤاڵیان ئامادە بوون، بێنەوە ناو شۆڕش. بە سەرکردایەتیش مانەوە.

-ئەوەش لەبەرامبەر سەرکردایەتی ناو کوردستان، کە (١٠) ئەندامی کۆمەڵەو بزوتنەوە بوون. هەر ئەم سەرکردایەتیەش، زۆرترین ئەرکی بەرپاکردنی شۆڕشەکەی لەسەرشان بوو. کەچی لە پلەو پۆستدا، لەگەڵ دامەزرێنەران هاوتا بون. لەهەمووش سەیرتر، ئەوەیە، کە دوای پێکەوەنانی سەرکردایەتی‌و مەکتەبی سیاسی لەناو کوردستان، ڕاگەیاندنی کۆبونەوەکەو بڕیارە پەسەندکراوەکانی، مام جەلال بە عەرەبی نوسیبووی‌و بۆ دەرەوەی ناردبوو، کەچی ئەو هەڤاڵانەی دەستەی دامەزرێنەر، کە نەگەڕابونەوە، ناوی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لەناو کوردستان، نەنوسیبوو.. چونکە خۆیان لەو کۆبونەوەدا، نەکرابونە مەکتەبی سیاسی!

لە کۆبونەوەی سەرکردایەتی (١٩٨٠) بڕیار درا، تەواوی ئەندامانی دامەزرێنەر بگەڕێنەوە. شا ڕوخا بوو. دۆخێکی باشیش لەئارادا بوو، کەچی کەسیان ئامادە نەبوون بەیەکجاری بمێننەوە. بۆیە، بڕیاری لابردنیان لە سەرکردایەتی درا.

سەرکردایەتی ناو وڵات، پێش گەڕانەوەی مام‌و نەوشیروان، بەناوی (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان-دەستەی دامەزرێنەر-وڵات) بەیاننامەی دەردەکرد. ئەمەش ئەوەی دەگەیاند، کە دامەزرێنەرە ڕاستەقینەکانی شۆڕش‌و ڕێکخستنەکانی یەکێتی، لەناو وڵاتدا، سەرکردایەتی ناو وڵات بوون. نەک ئەوانەی دەرەوە!

ئێستاش‌و ئەوساش، ڕێزی تایبەتیم بۆ دەستەی دامەزرێنەران هەیە، بەڵام جگە لە مام جەلال‌و نەوشیروان، گوناحە دەرهەق بە مێژووی شۆڕشی نوێ، ئێستا وا

ماوەتەوە کە دەستەی دامەزرێنەری دەرەوەی وڵات، دامەزرێنەرانی یەکێتین‌و ئەوانەی ناو وڵاتیش، کراونەتە قوربانی بڕیارو بەرنامەیەک، کە هەم تێکۆشانی کۆمەڵەو (٧) ساڵ خەباتکردنی پێش دامەزراندنی یەکێتی، قوتدراوە. هەم تێکۆشانی سەرکردەکانی بزوتنەوەی سۆسیالیستیش، لەناو کوردستاندا، فەرامۆش کرا.

مادام کۆمەڵە، لەناو یەکێتیدا هەڵوەشێندراوەتەوە، هەقوابوو، چۆن کادرو ئۆرگانەکانی کۆمەڵە قوتدران، ئاواش، مێژووی کۆمەڵە بخرایەتە سەر مێژووی یەکێتی. کەچی مەخابن، سەرکردایەتی کۆمەڵە بیریان لەم مافە مێژووییەی کۆمەڵە نەکردۆتەوە!

هەروەها، چۆن دامەزرێنەرانی دەرەوەی وڵات، ساڵانە ناویان دێت، هەقبوو، زۆرتر سەرکردایەتی دامەزرێنەری ناو کوردستان لە ساڵڕۆژی یەکێتیدا ناویان هاتبا. ئەمەش شانازیەکانی یەکێتی زیاتر دەکرد. نەک، چۆن بە پیلان کۆمەڵەش کۆتایی پێهێنرا، هەر بەوشێوەیەش، مێژووی کۆمەڵەو قوربانی سەرکردایەتی ناو کوردستان، کرایە قوربانیەکی تری سەپاندنی دەستەی دامەزرێنەری دەرەوە بەسەر سەرکردایەتی دامەزرێنەری کوردستان.

دڵنیام، هەن، ئێستا دەڵێن: ئەی کە مام جەلال مابوو، بۆ ئەم قسانەتان نەدەکرد؟ پێیان دەڵێم:

فەرموون سەروتاری رۆژنامەی چاودێر، ژمارە (٣٢٦)ی ٢٠١١/٦/٦، بخوێننەوە، بزانن ناوەرۆکی ئەم بۆچونانەمان، ئاڕاستەی مام جەلال نەکردووە!

## (١٢)
## چۆنیەتی چونە ناو یەکێتی !

کۆمەڵەی رەنجدەران، سەرەڕای ئەوەی وەکو هێزێکی چەپی شۆڕشگێڕ دەرکەوت، بەڵام روداوەکان دەریانخست، لەناوەرۆکدا کۆمەڵە، تەنها وەکو مەحفەلێکی بچوکی نهێنی، لە دۆخێکدا، چەپەکان بەر شەوارەی چەپی چەکداری کەوتبون‌و رێگای ئایدیۆلۆژیان لێ ون بووبوو، کۆمەڵە لەناو ئەو شەوارەیەدا چەپی شۆڕشگێڕ بوو. کە ململانێ لەنێوان هێزی سیاسی-چەکداری بە رابەرایەتی بۆرژوازی فراوان بوو، کۆمەڵە بەو پەروەردە

لاوازەی هەبیوو، تەنانەت دەرەقەتی هێزی بۆرژوازی تێکشکاوی کوردستانیش نەهات. بۆیە، قوتیش درا!! هەڵەکانیشی بنچینەیی بوون کە رویاندا. وەکو: کاتێک بڕیاری بەرپاکردنی شۆڕشی چەکداری دا، دوو هەڵەی زەقی کرد:

**یەکەمیان**: سەرکردایەتی کۆمەڵە بە رابەرایەتی شەهید شیهاب، بەبێ رێکەوتنی سیاسی رۆشنی یەکالاکردنی مافو ئەرکەکان، بۆ چۆنیەتی رابەرایەتیکردنی یەکێتیو شۆڕش، چونە ناو یەکێتی. ئەمە لەکاتێکدا کە یەکێتی لە شامدا دامەزراوە، هیچ کەسێک لە دامەزرێنەرانی یەکێتی، بە مام جەلالیشەوە، لە سەرکردایەتی کۆمەڵەدا نەبوون. تەنانەت لە دەستەی دامەزرێنەردا هەبوون دژایەتی کۆمەڵەشیان لەسالانی (١٩٧٠-١٩٧٥) کردووە. واتا: رێکخراوێکی چەپ، چۆتە ناو یەکێتیەکی پاشماوەی وردە بۆرژوای تێکشکاوی دوای بەیاننامەی ئازاری ١٩٧٠. ئەمیش، بەبێ رێکەوتنی کۆنکرێتی، بۆ دیاریکردنی ئەرکو ماف! ئەمە تەنها کورتبینی سیاسی نەبوو، بەڵکو لە رووی تیۆریو لێکدانەوەی باری چینایەتیەوە، بۆچونەکانی کۆمەڵە لاواز بوون. لاوازی تیۆریەکەی لەو ئاستە ترسناکەدا بوو، لە یەکەمین تاقیکردنەوەی ململانێی ئایدیۆلۆژیدا، لەگەڵ هێزی جولاوی بۆرژوازیدا، هێزی بێ رەهەندی سیاسیدا، کە خۆشیان نەیاندەزانی، دەگەنەوە ولات یان نا، تاقە هێزیش پشتیان پێ بەستبوو، کۆمەڵەی مارکسی-لینینی بوو. کەچی کۆمەڵەش، بە پێخاوسی تیۆریو چینایەتی، خۆی هاویشتبووە ناو کێڵگەیەکەوە، کە مینی جۆراوجۆری تیادا، چێنرابوو.

کە کۆمەڵە چۆتە ناو یەکێتی، یەکێتی لەناو کوردستاندا یەک شانەی رێکخستنی نەبووەو نەشیدەتوانی بەبێ کۆمەڵە مەفرەزەی چەکداریش پێکەوە بنێ.

**دووەمیان**: دوای گەڕانەوەی مام جەلالو نەوشیروان مستەفا، مانگی ٧/ی ١٩٧٧، شەهید ئارام خۆی بۆ سەردانی سکرتێرو مەکتەبی سیاسی بەمەبەست دواخست. کە دەستەی دامەزرێنەرو سەرکردایەتی ناو ولات، ئاوێتە کران. بزوتنەوەی سۆسیالیست دوای کۆمەڵە هاتبووە ناو یەکێتی.(*) کەچی دیسان کۆمەڵە بەبێ رێکەوتن؛ بەبێ دڵنیابون لە چارەنوسی چوارچێوە نیمچە بەرەییەکەی یەکێتی؛ بەبێ دڵنیابون لە دواڕۆژی لایەنەکانی ناو یەکێتی؛ قبوڵی کرد بچێتە ناو فۆرمیلا نوێکەی سەرکردایەتیەوە، بەبێ یەکالاکردنی ئەرکو مافەکان، درێژەی بە خەباتی سیاسی لەناو یەکێتی دا. واتا: لاوازی لێکدانەوەی

* کۆمەڵە، لەدوای دامەزراندنی یەکێتی بە دوو-سێ مانگ چووە ناو یەکێتی. بزوتنەوە، وتوویژیان لەگەڵ مام جەلال هەبوو، بەلام دوای دەستپێکردنی شۆڕش، کاتێک عومەر دەبابە گەیشتە شام، داوای چونە ناو یەکێتییان کردوە.

تیۆریو شیکردنەوەی هاوکێشە چینایەتیەکان، لەم دۆخەشدا، لای کۆمەڵە لاواز بووە! ئەم هەڵەیە، لە هەڵەی یەکەمی سەرکردایەتی کەمتر کاریگەر نەبوو، لە چۆنیەتی چونە ناو یەکێتی.

لەدوای پێکەوەنانی سەرکردایەتی ناو وڵات، هێڵی گشتیش، ئەوانەی کۆمەڵەو بزوتنەوە نەبون، بەحوکمی بونی کێشە و بێشە لەنیوان کۆمەڵەو بزوتنەوە، قوتکرایەوەو کرایە پارسەنگێک لەبەرامبەر کۆمەڵەو بزوتنەوەدا؛ ئەمە لەکاتێکدا هێڵی گشتی، ئۆرگانی نەبوو. شانەو کادری ئاراستەکراوی نەبوو. بەڵام مام جەلال پشکی لە سەرکردایەتیدا پێدەدان. لێرەشدا، پێگەی باڵی بۆرژوازی بەهێزتر دەسەلاتی سیاسیشیان بەرامبەر کۆمەڵە فراوان کراوە!

کە بزوتنەوەی سۆسیالیست جیابونەوە. رەوتێکیان لەناو یەکێتیدا مانەوە. ساڵی ١٩٨٢ بەهەوڵی مام جەلالو د.فوئاد مەعسوم، هێڵی گشتیو رەوتی بزوتنەوە، یەکخرانو مام جەلالیان بە سکرتێری خۆیان هەڵبژارد. ئەمە لەکاتێکدا مام جەلال هەتا ئەوکاتەش، لە کۆبونەوە تایبەتیەکاندا دەیووت: من کۆمەڵەم. ئەوکاتە بەرپرسی مەڵبەندی یەک بوم، بروسکەیەکم بۆ کرد، هۆی ئەو بڕیارەی چی بووە؟ وەڵامی نەدامەوە. لەوەش دەچوو نەوشیروان مستەفا، پێی خۆشبوبێ ئەو بڕیارەی داوەو تا بەتەواوی ساغبێتەوە! دوای ئەوەی کۆمەڵە مەرجی نوێی بۆ سکرتێری یەکێتی دانا کە بە نۆرە بێ، مام لە سکرتێری شۆڕشگێران کشایەوە!

## (١٣)
## هەڵەی کۆمیتەی هەرێمەکان

لەو دوو قۆناغەدا، کە بەبێ رێکەوتنی هەمەلایەنە بۆ دیاریکردنی ئەرکو مافەکان، کۆمەڵە چووە ناو یەکێتی؛ لەکاتێکدا ئەگەر لە قۆناغی دامەزراندندا (١٩٧٥/٦/١) کە هێشتا بزوتنەوەی سۆسیالیست نەچوبێتە ناو یەکێتی، سەرکردایەتی کۆمەڵە پاساویان ئەوە بوبێ تاقە رێکخراوون لەناو یەکێتیدا، بۆیە کۆمەڵە دەبێتە داینەمۆ، لە پاشەڕۆژیشدا دەبێتە پارتی پێشڕەو؛ خۆ لە قۆناغی دووەمی تێکەڵاوکردنی سەرکردایەتی ناو وڵاتو دەستەی دامەزرێنەر، بزوتنەوەی سۆسیالیست چوبووە ناو یەکێتی، هێزی چەکداری

فراوانیان بە نیازی فشار خستنەسەر حکومەت، بەڵکو مفاوەزات بکات، دروستکردبوو، مام جەلال گەڕابوەوەو دۆخی ناو یەکێتیو شۆڕش سەراپا جیاواز بوو، لە دۆخی ناو شام، پشتیوانی بزوتنەوە زیاتر دەکرا؛ هەر ئەوکاتەش، هێڵی گشتی قوتکرایەوە، ئەو راستیانە، لە قۆناغی دووەمدا، کاتێک شەهید "ئارام"یش خۆی بۆ کۆبونەوەکانو بینینی مام جەلال دواخستبوو، نەدەبوو، کۆمیتەی هەرێمەکان، بەبێ رێکەوتن لەسەر وردو درشتی سیاسەتی یەکێتی، پەیوەندی لایەنەکانی ناو یەکێتی، ئەرکو مافەکان لەناو یەکێتیدا، رۆڵی سکرتێری لایەنەکانی یەکێتی لە چۆنیەتی دانانی سکرتێری یەکێتیەوە بۆ ئۆرگانە باڵاکانی تری سیاسیو حیزبیو عەسکەری؛ هەروا، چۆنیەتی دابەشکردنی چەکو تفاقو پشتوانی دارایی..تاد.؟ دەبوایە، سەرکردایەتی کۆمەڵە ئەو مەسەلانەی بە تەرازوی ململانێ چینایەتیەکان، بۆ ئەو قۆناغەو ئەگەرەکانی دوای ئەو قۆناغەش، هەڵبسەنگاندایە، ئینجا بڕیاری چۆنیەتی قبوڵکردنی فۆرمیلاکەی یەکێتی؛ بڕیاری چۆنیەتی درێژەپێدانی خەباتی لە قۆناغی دوای گەڕانەوەی تەنها دوو هەڤاڵی دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی (مام جەلال-نەوشیروان)، لەناو یەکێتیدا بدابایە. نەک بە هەندێک پلەوپایەو چەکێکی کەم رازی بونایە. ئەوکاتە لە کۆمیتەی هەرێمەکان سالار عەزیزو من لەکۆبونەوەکاندا بەشداریمان دەکرد. بەبێ زانینی وردو درشتی رای شەهید ئارامو شەهید ئازاد هەورامی، سەرەڕای تێبینیو هەر رەخنەیەک کە ئەوسا هەمانبوو، بەڵام لە دوائەنجامدا، ئەو سیاسەتو بڕیارانەمان قبوڵ کرد. کاتێک شەهید ئازاد هەورامیش گەیشتە مەکتەبی سیاسی، بڕیارەکان تێکڕا درابون. هیچ نارەزایەتیەکم لێ نەبیست. سالار عەزیزیش قبوڵی کرد ببێتە مەکتەبی سیاسی. بەندەش قبوڵم کرد ببمە بەرپرسی لقی کەرکوکی یەکێتی. دوای ئەوە سالار عەزیز سەفەری دەرەوەی کرد. منیش نەگەیشتمە قەراغ. بڕیار بوو ملازم عومەر ببێتە ئامر هەرێمی قەراغ. ئەویش چوار مانگ لەگەڵ نەوشیرواندا مایەوە.. سەرەنجام ئارام لە (١٩٧٨/١/٣١) شەهید کرا. لەو باوەڕەدام نەوشیروان مستەفا بە مەرام ملازم عومەری لە چونە قەراغ دواخستبێ!!

لەم کۆبونەوەی سەرکردایەتیدا، باشتر دەرکەوت کە یەکێتی چۆنچۆنی رابەرایەتی دەکرێ، زانرا رۆڵی کۆمەڵە خراوەتە دوای بزوتنەوەش، ئەویش نەک بە پێگەی جەماوەریو رێکخراوەییو چۆنیەتی هێزەکە، بەڵکو بە سیاسەتی مام جەلالو ئیدارەدانی باڵەکانی ناو یەکێتی، بەوجۆرەی لەخزمەتی چۆنیەتی بیرکردنەوەی مام جەلال بوو، بۆ ئایندەی یەکێتی!

بۆیە دەبوایە، ئەو هاوڕێیانەی کۆمیتەی هەرێمەکان کە ڕاستیەکان تاڕادەیەک دەرکەوتن‌و بڕیارەکان دەرکران، دەبوایە بمانگوتبا: هەڤاڵان بەخێربێنەوە، بەڵام ئێمە بۆ دوابڕیار پێویستە بگەڕێینەوە بۆ لای ڕابەری کۆمەڵەو کۆبونەوەیەکی کۆمیتەی هەرێمەکان بکەین. دڵنیام لەو دۆخەدا، بڕیارێکی وامان دابا، بگەڕاینایەتەوە بۆ لای شەهید ئارام، هاوکێشەکان، هەم لەبەرژەوەندی یەکێتی‌و هەم باشتر بەڕێوەبردنی یەکێتی، هەم بۆ پێگەو ئایندەی کۆمەڵە، گەلێ کاریگەر دەبوو. بەدڵنیاییەوە، مام جەلالیش، باشتر گوێی دەگرت‌و لە مەترسییەکانی پەراوێزخستنی کۆمەڵە، وردتر تێدەگەیشت. لەم هەلومەرجانەدا، هەڵوێستی لێبڕاو، هەڵوێستێک خاڵی بنچینەیی بخاتە سەر پیتەکان، هەتا مانای تەواو ببەخشن، گەلێ گرنگە. ئەو هەڵوێستانە، لەو چرکەساتانە، ئاڕاستەی مێژوو دەگۆڕن.

من دڵنیام، شەهید ئارام وردتر ئەو کێشانەی لێکدابوەوە. دواکەوتنەکەشی، بۆ بەشداری لە کۆبونەوەی سەرکردایەتی، بەشێکی پەیوەندی بە کێشەکانی بزوتنەوەی سۆسیالیست‌و کۆمەڵەوە هەبوو. بەشێکیشی مەترسی بووە لە چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کۆبونەوەکان‌و دابەشکردنی هاوکاریەکان. هەروا پێگەو ڕۆڵی کۆمەڵە لەناو یەکێتیدا. وتومە، ئەشێلێمەوە، شەهید ئارام، مام جەلالی وەکو سکرتێری یەکێتی قبوڵ بوو. بەڵام هەرگیز کۆمەڵەی تەسلیم نەدەکرد. نەوشیروان مستەفاشی بۆ سکرتێری کۆمەڵە قەت قبوڵ نەبوو.

لە سەرەتای ١٩٧٦وە، یەکەمین جار لەڕێگەی شەهید جەماله ڕەشەوە، یەکەمین نامەی کۆمیتەی هەرێمەکان، کە شەهید ئارام نوسی، گەیەندرایە مام جەلال. دوای ئەوە هەتا بەرپابونی شۆڕش سێ-چوار نامەی تری بۆ مام جەلال ناردووە، ناوەڕۆکی نامەکانم بەگشتی بیرە. ئارام وەکو بەرپرسی یەکەمی یەکێتی نامەکانی بۆ مام جەلال دەنوسی. مامیش وەکو بەرپرسی کۆمەڵە وەڵامی شەهید ئارامی دەدایەوە. لەو ماوەیەدا، هیچ نامەیەک لەلایەن کۆمیتەی هەرێمەکانەوە، یان شەهید ئارامەوە، بۆ نەوشیروان مستەفا، وەکو کادری کۆمەڵە، یان هەر پلەو پایەیەکی تر، نەنوسراوە. هیچ بڕیارێکیشی دەربارە نەدراوە، کە لە شام، یان لە گەڕانەوەدا، چ بەرپرسیارێتیەکی بۆ دیاری بکرێ.. بە نوێنەرایەتی کۆمەڵە.

دوای ئەو هەموو ئەزمون‌و ڕوداوانە، ئێستا کە (٤٤) ساڵ بەسەر بەرپابونی شۆڕش تێدەپەڕێ، کاتێک بیرەوەری (١٩٧٦) دوای بەرپابونی شۆڕش، تا شەهیدبونی ئارام بیر دەخەمەوە، دوو ساڵی ڕەبەق بووە. لەو دوو ساڵەدا، کۆمیتەی هەرێمەکان یەک

کۆبونەوەی بۆ هەڵسەنگاندنی دۆخی شۆڕش‌و پەیوەندی بزوتنەوەو کۆمەڵە نەکرد. تەنها یەک جار، ئەویش بەهاری (١٩٧٧) لە چۆخماخ (ئارام، سالار، مەلا بەختیار) وەک کۆمیتەی هەرێمەکان کۆبوینەوە، ئەویش دوو سەعاتێکی خایاند، ملازم عومەریش بانگ کرایە کۆبونەوەکە، باسەکەش هەموو لەسەر کێشەکانی پێشمەرگە، بوونی ناکۆکی بزوتنەوەو کۆمەڵە، رەفتاری نابەجێی هەندێک بەرپرس (هی کۆمەڵەو بزوتنەوە) لەگەڵ پێشمەرگەو لەناو جوتیاران، کەمیی چالاکی‌و خۆپارێزی..تاد. دورونزیک لە کۆبونەوەکەدا باسی ئەگەرەکانی ناو شۆڕش، گەڕانەوەی مام جەلال، دەستەی دامەزرێنەر، ئەرک‌و مافەکانی لایەنەکانی ناو یەکێتی نەکران. لەوانەبوو، کۆمیتەی هەرێمەکان، لەو دوو ساڵەدا، یان پێش گەڕانەوەی مام جەلال، کۆبونەوەیەکمان بەسەرپەرشتی شەهید ئارام کردبا، تاڕادەیەک دۆخەکەمان باشتر تاوتوێ بکردایە. هەروەکو چۆن، کۆبونەوەکانی کۆمیتەی هەرێمەکان، پێش بەرپاکردنی شۆڕش، بڕیاری گرنگیان تیا پەسەند کران‌و چەندین بەیاننامەو راسپاردەو پەیڕەوی ناوخۆی پێشمەرگەی تیا بەرهەم هاتن.

کۆنەبونەوەی کۆمیتەی هەرێمەکان، گەرچی دۆخی سەرەتای شۆڕش سەخت بوو، لایەنی کەم، هەر وەرزێک جارێک، یەکێکە لە هەڵە کوشندە سیاسی‌و رێکخراوەییەکانی کۆمەڵە!

## ( ١٤ )
## پەیوەندی ئارام‌و مام

شایەنی باسە، ئەوانەی بە هەر مەبەستێک گومان دەخەنە سەر هەڵوێستی شەهید ئارام‌و کۆمیتەی هەرێمەکان، دەربارەی مام جەلال‌و یەکێتیی، تەنها بەم بەڵگانە وەڵامیان دەدەینەوە:

١- یەکێتیی نیشتمانیی بۆچی؟ شەهید ئارام وەریگێڕایە سەر زمانی کوردی‌و بە تایپ‌و رۆنیۆش چاپ کرا.

٢- بەشێکی بەیاننامەکان، لەناو وڵاتدا شەهید ئارام بەناوی یەکێتیەوە نوسیونی. وەکو: پەیڕەوی ناوخۆی پێشمەرگە، بەیاننامەی (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان-١٩٧٦/٩/١) ئاماژەی وردی تیایە لەسەر پێکهاتەی یەکێتی، کە ئاوا لێکدراوەتەوە:

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان تێدەکۆشێت بۆ کۆکردنەوەو ڕێکخستنی هێزە نیشتمانیو دیموکراتە شۆڕشگێڕو پێشکەوتووەکان، لەچوارچێوەی شێوە بەرەیەکی نیشتمانیی دیموکراتیدا، بەجۆرێک کە هەم هێزو پێگەی پێشکەوتنخوازو نیشتمانپەروەرەکان خەباتیان بەتوندوتۆڵی یەکخەن. یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان حیزب نەبوو، بەڵکو نیمچە بەرەیەک بوو لەپێناوی یەکگرتنی هێزە نیشتمانییەکانو بۆ لەناوبردنی دەستەگەریو دووبەرەکیدا دروستبووەو ئەو هێزانەی تا ئێستا لەم چوارچێوەیەدا کۆبونەوە، لەسەر ئەم بنچینەیە یەکیانگرتووە بۆ خەباتکردن لەسەر ڕێبازی پێشکەوتووی دژ بە ئیمپریالیزمو زایۆنیزمو کۆنەپەرستی، شانبەشانی هێزە شۆڕشگێڕەکانی سەرانسەری عێراق لەپێناو عێراقێکی دیموکراتیدا کە لەچوارچێوەیدا کوردستان بە ئۆتۆنۆمی ڕاستەقینە شاد بێ.[1]

٣- شەهید ئارام، لەسەر ئەو بنەمایەی کە سەرکردایەتی پێشووی کۆمەڵە، بە ڕابەرایەتی شەهید شیهاب (یەکێتیو مام جەلال)یان قبوڵ بووە، درێژەی بەو پەیوەندییە بەناوی کۆمیتەی هەرێمەکانەوە داو نامەکانی لەسەر هەمان ڕێچکەی سیاسیو چوارچێوەی ڕێکخراوەیی نوسی.

٤- تا گەڕانەوەی مام جەلال لە (١٩٧٧/٧/٢٠) بۆ "دۆڵی گۆستێ" لەڕێی تورکیاوە، مام نەکرابووە سکرتێری یەکێتی. هەموو ئەو نامانەی لە دەرەوەی وڵاتیش، بۆ هەر لایەکی نوسیبێ، یان لە ئەدەبیاتدا ناویان هێنابێ، بە نازناوی (هەڤاڵ مام جەلال) ناوبراوە. پلەو پۆستی دیارینەکراوە. کەچی شەهید ئارام هەر وەکو بەرپرسی یەکێتیو بەڕێزیشەوە نامەکانی بۆ دەنوسی.

٥- لە خۆئامادەکردن بۆ بەرپاکردنی شۆڕش، کاتێک فەرماندەو پێشمەرگەکانی شۆڕشی ئەیلول دەبینران، بەڕێزەوە باسی مام جەلالو ڕۆڵی لە دامەزراندنی یەکێتیو گەڕانەوەی بەو زوانەی دەکرا.

٦- هەر لەلایەن شەهید ئارامەوە، مەلا بەختیار، ڕاسپێردرا، شانەو کۆمیتەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، لە شارەکاندا دروستبکرێ، چونکە ئەوکاتە سەرجەم شارەکان پەیوەندییان بەمنەوە دەکرد. جگە لە سلێمانی. یەکەمین شانەی ڕێکخستنەکانی یەکێتی لە دوو شانە پێکهات: ڕوناکی شێخ جەناب، شەهید ئاشتی حەمەسەعید، شوکری هاوسەری حاکم برایم،و شەهید جەماڵە ڕەش. دووەم شانە لە شەهید شێخ عەبدول،

---

١یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان. لە کۆمەڵی بەڵگەنامەی ساڵی ١٩٧٥-١٩٨٣دا. کتێبی یەکەم. ئامادەکردنو ساغکردنەوەی (یوسف محەمەد بەرزنجی) ٢٠١٧. ل(٩٧).

یونس، مەسعود. لە قەلادزێو رانیە شەهید فاروق ڕێکیخستن. لە هەڵەبجە شەهید وەستا ئەنوەر (دوای شێخ عەلی) لە خانەقین عیماد ئەحمەدو مامۆستا فازیلو مامۆستا موحسین، لە کەرکوک شەهید ئازادو سەلام چاوشینو نەجمەدین فەقێ عەبدوڵلاو هاوڕێ کرێکارو حەمید شورتە. لە کەلار عەبدولرەحمان زەلکەو سەمین دەوڵەتو برایم سەمین. لە هەولێر شەهیدان: عەبدولرەزاقو مەلا غەفورو محەمەد زەنگەنەو ئاراس. لە بەغداد شەهید ملازم جوامێرو عەلی شامارو مامۆستا بەندەر مەندەلاوی. لە کفری مامۆستا عەلی پەرلەمان. لە دەربەندیخان مامۆستا مەحمود قەراغیو شەهید شاسوار (حەمید)و مامۆستا مەحمودی پەیوەندییە کوردستانیەکانو شەهید هیوا. لە دهۆک لەڕێی منەوە، مامۆستا ئیسماعیل حەسەن باجەلانو مامۆستایەکی دهۆکی بەناوی عەلی لە پەروەردە بوو، چالاک بوون. (ئەندامی تریش هەبون.. خۆیان دەرنەدەخست!). سەرەتا ئەمانە بون. لە سلێمانی هاوڕێیانی کۆمەڵە بەجیا تێدەکۆشان دوای کۆمیتەی هەرێمەکان سالار عەزیز بوو بە بەرپرسی رەسمییان هەرێمی سلێمانی. لە دیبەگەو مەخموریش ڕێکخستن هەبوو بەداخەوە ناویان نازانم.

بۆیە، هەموو ئەو قسەو قسەلۆکانەی لەبارەی پەیوەندی کۆمیتەی هەرێمەکانو شەهید ئارام لەگەڵ مام جەلال، لێرەو لەوێ دەوترێن، بە مەرامی جۆراوجۆر داتاشراوون.(*)

قسەکانمان، بۆ ئەو بارودۆخەیە، کە کۆمیتەی هەرێمەکان خۆمان شاردبوەوە. یان کە شۆڕش کرا. ئایا، شەهید ئارام ماباو زیاتر رووبەڕووی روداوەکانو کێشمەکێشەکان ببوایە، هاوکێشەکان چییان بەسەردا دەهاتو هەڵوێستی شەهید ئارامو کۆمیتەی هەرێمەکان، چەند دەگۆڕان! ئەمەیان تەنها ئەگەری سیاسین.. بە شەهیدبونی ئارام هەمووی لەگۆڕ نران! بەڵام دڵنیام، بە مانەوەی شەهید ئارامو کۆبونەوەی ناوبەناوی کۆمیتەی هەرێمەکان، یان کۆبونەوەی نیمچەفراوانی کادرانی کۆمەڵە، بۆ هەڵسەنگاندنی دۆخی یەکێتی، لەدوای گەڕانەوەی مام جەلال، کاریگەری پۆزەتیڤی دەبوو!

---

* لەکاتی خۆشاردنەوەدا، لە سلێمانی جگە لە فوئادی مەجید میسری، کە لەگەڵ شەهید ئارام لە ماڵێک بوون، لەهیچ کەسی ترم نەبیستووەو نەزانیووە، باسی مەترسی توانەوەی کۆمەڵەو زاڵبونی مام جەلالو عەلی عەسکەریو نەوشیروان مستەفا، لەناو یەکێتیو شۆڕشدا، بکات. دوای بەرپابونی شۆڕشو گەڕانەوەی مام جەلال، بەڵێ بۆچونی جیاواز لەسەر چۆنیەتی پاراستنی کۆمەڵە، سەریهەڵدا. لە هەولێر-کەرکوکیش، شەهید عەبدولرەزاق، جارجار، ئەو مەترسییانەی باسدەکرد!

( ١٥ )

# باجی هەڵەکان

لەو مەسەلە باسکراوانە، مەبەستمان بووە، لە هەموو بارێکەوە، ڕەگو ڕیشەی ئەندێشەی ڕق، هزری توندوتیژی، سایکۆلۆژیەتی دوژمنایەتیو دڕندایەتی، لەڕووی: مێژووییەوە، لە باری ئابورییەوە، چەوساندنەوەی چینایەتیەوە، نەبونی ڕۆشنگەریەوە، سەرهەڵنەدانی دیموکراسیەوە، وەرنەچەرخانی کۆمەڵایەتیەوە، بنچینەی لاوازی فەلسەفیەوە، کوردایەتی کلاسیکیەوە، حیزبایەتی گۆشەگیریەوە، تاکپەرستیەوە، سەرکوتکردنی ئازادیەوە، هەلپەرستیەوە، زاڵکردنی هێزی چەکدارەوە، لادانو بادانەوە.. تاد. بۆ ئاسانکاری تێگەیشتن لە بابەتەکانی کتێبەکە، باسبکەین.

مەبەستمان بووە، تەواوی ئەو ڕەگو ڕیشانە، بە میتۆدی دیالیکتیک، بدەینە بەر ڕەخنەی زانستی، هەتا خوێنەر هۆکارە ڕاستەقینەکانی کارەساتەکان، تاوانەکان، ڕشتنی ڕقە دەرونیەکان، لەناو لایەنەکانو بەرامبەر بیری ئازاد، هەڤاڵ دژی هەڤاڵ، هاوسەنگەر دژی هاوسەنگەر، لایەن دژی لایەن، هێز دژی هێز، دەربخەین.

هەن پێیانوایە، بەشی زۆری ئەو ڕوداوانـە، کارو کاردانـەوە، یان هەڵە بە هەڵە چارەسەرکردن بوون. بۆچونی وا، بۆ ڕوداوی ڕێکەوتو ڕاگوزەر، یان لەکاتی تووڕەبونو هەڵچوندا، ڕاستە. بەڵام کاتێک کارەسات، پیلانگێڕی، غەدری خۆبەخۆیی، دیلکوشتن، ژنکوشتن، خوێنڕشتن، هاوسەنگەر کوشتن، کودەتا کردن، هەڵمەتی ناڕەوا بردن، سایکۆلۆژیەتی ڕق وروژاندن، بوختان هەڵبەستن..تاد، کاتێک تەواوی ئەو ڕوداوانە، دەبنە دیاردەو لەناو پرۆسەیەکی مێژوویی قۆناغ جیاوازدا بەردەوام دەبن، ئیتر ناکرێ ئەم ڕاستیە تاڵانە، بە کارو کاردانەوە، یان هەڵە بە هەڵە چارەسەرکردنی ڕاگوزەرو هەڵچون، سەیر بکرێ. بەڵکو دۆزینەوەی ڕەگو ڕیشەی قۆناغ بە قۆناغی ئەو دیاردەو ڕوداوانە، لە زانستی کۆمەڵناسیدا، بێڕادە گرنگە. بەپێچەوانەوە، بەدرێژایی مێژوو نەدۆزینەوەی ڕەگو ڕیشەی ئەو دیاردە هەرە زیانبەخشانە، لایەنی کەم، لەدوای پەنجاکانەوە، کە ئیتر بەرەبەرە، دەرگاکانی خوێندنو خوێندنی باڵا ئاوەڵا کراوون، زیانی زۆری گەیاندوەو تەنها ئەوانەی نەخۆشی سایکۆلۆژییان ئاوێتەی سیاسەتو لوتکەی دەسەڵات کردووە، سودیان لەو باسنەکردنو ڕەخنەنەگرتنانە بینیوە. پێکهاتەی سایکۆلۆژی لە بڕیاری سیاسی کوردایەتیدا، لەخۆڕا سەریهەڵنەداوە، بنەچەی خێزانو بنچینەی کۆمەڵایەتی هەیە. زانای کۆمەڵناسی عێراق، دەڵێ:

"زۆرێک لە توێژەران لە رابوردودا پێیانوابوو، رەچەڵەک فاکتەری یەکلاکەرەوەیە لە پێکهێنانی کەسایەتیدا، کاتێکی تر هات، هەندێک لە توێژەران گوتیان کە پەروەردەو ژینگەی کۆمەلایەتیو ئەو دۆخەی مرۆڤی تیا گەشەدەکات، لە رەچەڵەک کاریگەرترن بۆ پێکهێنانی کەسایەتی. دەشتوانین بڵێین، ئێستا زۆرترین توێژەران لەنێوان ئەم دوو بۆچونەدا مامناوەنجی بیر دەکەنەوە.

ئێستا رونبوەوە کە کەسایەتی ئەنجامی کارلێکی دوو کۆمەڵە فاکتەرن، ئەوانیش فاکتەری رەچەڵەک لەلایەکو فاکتەری ژینگەی کۆمەلایەتیو ئەو بارە کۆمەلایەتیەی مرۆڤ تیادا دروستدەبێ لەلایەکی ترەوە".[1]

سۆسیۆلۆژو سایکۆلۆژیستەکانی رۆژئاوا، سەدان چەشن نەخۆشی سایکۆلۆژییان شیکردۆتەوەو فێرگەی جۆراوجۆریان بۆ پۆلێن کردون، خۆزگە وەرگێرێکی کوردی-فارسی (فرهنگ توصیفی علوم رفتاری شناختی. دکتر علی اکبر شعاری نژاد)ی وەکو نمونەیەک وەردەگێڕایە سەر زمانی کوردی. لە پێشەکیەکەدا، ئێران بەو هەموو دەوڵەمەندییەو ملیۆنەها نوسینو چاپی وەرگێران، نوسەر دەڵێ:

"نوسینی فەرهەنگی زانستی لەئێراندا، پێشینەیەکی درێژی نییە، گەرچی لە بواری نازانستیشدا رابوردویەکی درێژ نییە. سەرەڕای ئەمە، ئاوڕدانەوە لە نوسینی فەرهەنگ دەتوانرێ بە ئاوڕدانەوەیەک بژمێردرێ کە نوێنەرەوەی رەگو ریشەی بیرکردنەوەی دروست لەنێو خەڵکی یەک کۆمەڵدا".[2]

لەم فەرهەنگەدا، سەدان دەستەواژەی سایکۆلۆژی شیکراونەتەوە، کە بەشی زۆری ئەو نەخۆشییە دەرونیانە، بە کردەوە، رۆژانە لەناو ماڵ، خێزان، سیاسەتو ژیانی کۆمەلایەتیدا، روبەڕوویان دەبینەوە؛ زیانەکانی هەستپێدەکەین؛ باجی کێشە کۆمەلایەتیو سایکۆلۆژیەکانی دەدەین؛ تاوانەکانی دەبینینو دەبیستین؛ دەبنە مایەی فیتنەو فەرتەنە؛ تەنانەت بەشی زۆری کێشەکانی دادگا، گرفتی خێزانیی، ململانێی سیاسی، سەرچاوەکەیان ئەو نەخۆشییە سایکۆلۆژیانەن، کە لە کەسانی ئاساییدا، لەناو خێزانو هاوڕێدا، لە مێشکی سەرکردەو ژیانی حیزبایەتیدا، گینگڵ دەدەنو بەردەوام ماخۆلانیانە. بەلام هێشتا، لە زانکۆو پەیمانگاکانی کوردستاندا، کەمترین بەرنامەی خوێندنیان بۆ تەرخان کراوە. ئەوەی بۆیشی تەرخانکراوە، سودێکی ئەوتۆیان لێنەبینراوە. فارس، سەرەڕای ئەوەی زۆریان لەمبارەوە ئەنجامداوە، بەلام لەبەرئەوەی دیاردەکە هێندە پەلوپۆدارە، هێندەش

١ د.علي الوردي في الطبيعة البشرية. محاولة في فهم ما جرى. تقديم: سعد البزاز/١٩٩٦. ص(٣٣).

٢ فرهنگ توصيفي علوم رفتاري: شناختي. دكتر علي اكبر شعاري نژاد. انتشارات اطلاعات. چاپ اول١٣٩١.ص(٥).

ئاویتەی ژیانمانە، لەخۆبوردوانە دەڵێن: "لەئێراندا پێشینەیەکی درێژمان نییە" لەکاتێکدا زۆر بەدیقەتیش رەفتاریان وەکو زانست ناوناوە (علوم رفتاری-زانستی رەفتار) واتا: وەکو لقێکی جیای زانستی کۆمەلایەتی لێکیانداوەتەوە.

بەختیار عەلی، ئێجگار جوانی بۆچووە کە دەڵێ:

"ئەم خۆشباوەڕیە، ئەم وێنە سادەیە بۆ تاوان لەبەردەم مێژووی سەدەی بیستو سەدەی بیستویەکدا تەواو تێکدەشکێت. مرۆڤ تەنها لەبەر ناچاری، پێویستی، پەراوێزخستن، کەسێکی دی ناکوژێت، بەڵکو جیا لەوانە چەندەها هۆکاری ناعەقلانی دیکەش هەن بۆ کوشتن. کە کۆکردنەوەو دیاریکردنیان ئەستەمە، هۆکاری کوشتن بەئەندازەی ئاڵۆزی خودی مرۆڤ ئاڵۆزە".[1]

## (١٦)
## رقی سایکۆلۆژیو تاوانی یاسایی

رقی سایکۆلۆژی، کە قووڵ دەبێو دەشکرێتە بەشێکی بەرنامەو بڕیاری سیاسی، سەرکردە، یان هێز، یاخود دەزگاو ئۆرگان، بە نارەواش دەیسەپێننو تاوانی لێدەکەوێتەوە. چون جەنگ درێژەپێدانی سیاسەتە، بەشێوازی توندوتیژی، هەروەکو (فۆن کلاوزە ڤتز-von Klawoewitz) وتویەتی: نەخۆشی سایکۆلۆژیش، کە دەخرێتە ناو بەرنامەو بڕیاری سیاسیەوە، لەکاتی ناکۆکیو ململانێکاندا، سەرەنجام، روداوی چاوەڕواننەکراو، یان کوشتو کوشتاری لێدەکەوێتەوە. نەخۆشی سایکۆلۆژی لەم حاڵەتەدا دەبێتە بەشێکی روداوی خوازراو، یان نەخوازراو، چونکە نەخۆشیەکە، هەوێنی بڕیارو بەرنامە سەپێنراوەکانە. بۆیە، لە یاسای کەتنو تاواندا، کەمتر نەخۆشی سایکۆلۆژی کراوەتە هۆکاری تاوانگەلی سیاسیو کۆمەلایەتیو شەخسی. زۆرتر تاوانی مادی، بنەمای یاساو دادوەرییە!

ئەگەر، لە داوودەزگا رەسمیەکانی حکومەتدا، تارادەیەک نەخۆشی سایکۆلۆژی بخرێتە ژێر چارەسەر، یان دوربخرێتەوە لە ژینگەی کار، خۆ لەناو حیزبەکانو لە دەسەلاتی بالای سیاسی-عەسکەریدا، نەخۆشی جۆراوجۆر هەیە، لە ناخی کەسایەتیەکاندا کاریگەرن، بەلام لە لوتکەی بڕیارداندا، هەر درێژە بە بەرپرسیارێتی دەدەن. ئەمەش لەناو هێزە

---

١ بەختیار عەلی. دوا خەندەی دیکتاتور. چاپخانەی کارۆ. ٢٠٢٠. ل(٢٧٤).

سیاسیەکان‌و شۆڕشە چەکداریەکانی کوردستاندا، مەترسی سایکۆلۆژی نەزانراوی ترسناک بون. کەتنی گەورەشیان ناوەتەوە. لەناو شۆڕشەکانیشدا، هەر بیریش لە نەخۆشی سایکۆلۆژی نەکراوەتەوە!! ئەمە لەکاتێکدا، نەخۆشی سادیزم‌و نەهلیستیەتیش، لە لوتکەی دەسەلاتی سیاسی‌و عەسکەرییشدا هەبووە. ئەنجامەکانیشی لە دیلکوشتنەوە، بۆ نەهێشتنی ئازادیەکان، هەتا دەگاتە بڕیاری رەفتار فاشیانەی ریشەکێشکردنی جیاوازیە فکریەکان.

هەموو جۆرە هەڵگیرساندنی شەڕی نارەوای ناوخۆ، یاخود، کوشتنی دیلی شەڕ، یان پاکتاوکردنی نەیاران، بەبێ بەڵگەی سەلمێنەر، تەنها بە بڕیاری تاکە کەسێک، هۆکارەکەشی نەخۆشی سایکۆلۆژی بوبێ، درابێ. ئەمە بۆ بڕیاردەرەکە تاوانی گەورە بووە. بۆ ئەوانەی تاوانەکەشیان جێبەجێ کردووە، هاوبەشی تاوانەکان. یاخود ئەوانەی تاوانەکەیان داپۆشیووە، یان بەرامبەر تاوانی جۆراوجۆر، لەبەرامبەر جۆرەها لایەن‌و لە دۆخی جیاواز جیاوازدا، بەردەوام چاو لە تاوانی پۆشراوە، یان پاساوی بۆ داتاشراوە، نوسین‌و شانامەیان بۆ هۆنیوەتەوە؛ لەوەش خراپتر، هەر جۆرە پەسەندکردنێکی ئەو تاوانانە، بەرامبەر خەڵکانی بیر جیاواز، کە پێشوەخت زانراویشە، سەرکردەکان بە رقی سایکۆلۆژی، یاخود بۆ تۆڵەسەندنەوە، لەو جۆرە بڕیارانەیان داوە، کەچی زۆریش بون ئەوانەی بەم جۆرە بڕیارانە رازی بون، ئەمەش دەبێتە بەشێک لەو جۆرە تاوانانەی کە لەناو شۆڕش‌و لەناو یەکێتی‌و کۆمەڵەدا، ئەنجامدراوون.

نوسەری کتێبی (چەپکێک) بەدرێژایی خەباتی سیاسی لەناو کۆمەڵەدا، بە نەخۆشی سایکۆلۆژی، ململانێی ناوەختی لەپێناوی نەخۆشییە دەرونیەکانی قووڵ کردووە. لەناو شۆڕشیشدا، هەمیشە بۆتە بڵندگۆی هەڵبەستنی درۆو دژایەتی نەیارە فکریەکانی. لەکاتی ئەنجامدانی تاوانەکانیشدا، لە دیلکوشتن، غەدر کردن، ناجوامێری نواندن، بڕیاری پاکتاوکردن، ئەم لەپێشەوەی خەڵکانی تر، بەو جۆرە بڕیارانە، دەرونی نەخۆشی ئاسودە بووە. زۆری تر بون ئەوانەی وەکو ئەم، بە کوشتنی دیل‌و خوێنڕشتن، ماوەیەک دەرونیان ئاسودە دەبوو! وایاندەزانی دادگای مێژوو، بەرامبەریان تا هەتایە داخراوە. بۆیە تاوان دوای تاوانیان ئەنجامدەدا.

لەم کارەکتەرانە، یەک‌و دە نین. سی‌و سیش نین. سەدانن. سەدانی خوێنەوارو نەخوێنەوار. کۆیلەی سیاسی‌و خاوەن کۆیلەی سیاسی، کە لە بنەچەدا دەرونیان زوخاوی رقی لێ تکاوە، بەڵام بە دەمامکی مارکسیەت‌و رەنجدەران دایانپۆشیوەو بە چەکی پێشمەرگەش تاوانیان ئەنجامداوە. ئەمانە، پێش ئەوەی کەڵەکە دیواری زیندان بۆ نەیارانیان هەڵچنن، ناخی سەدان تێکۆشەری شۆڕشگێڕیان لێوڕێژ دەکرد، لە پروپاگەندەی

هەڵبەستراو. لە کینەی نەزانراو. لەم ڕێگەیەشەوە، دەوروبەری خۆیان بەرامبەر تاوان بێدەنگ دەکرد. یان دەنگیان بە بڕیاری تاوانکردن دەدا. با دیقەت بدەین سیاسەتمەدارێکی بەئەزمونو روناکبیری ماندوو، چۆن ئەم راستییە، دان پیا دەنێ:

"لەکاتی جیابوونەوەی ئالای شۆڕشو کاک مەلا بەختیار من بێگومان لەلایەنی مام جەلالو کاک نەوشیروان بووم.. دژی ئالای شۆڕش بوومو چەندین وتاری توندیشم لەدژیان نووسین.. کاتێکیش کۆنفرانسی کۆمەڵە لەبارەی تاوتوێکردنی سەرکردایەتی یەکێتیو شۆڕشو جیابوونەوەی ئالای شۆڕش بەسترا، وابزانم ٦٣ کەس بووین، هەموومان واژۆی بڕیاری گوللەبارانکردنی مەلا بەختیارمان کرد، بەڵێ منیش واژۆم کرد.. بێگومان ئەمەش لەژێر گوشارو کاریگەری کاک نەوشیرواندا بوو".(١)

د.ئەرسەلان بایز، نمونەیەکی گرنگە بۆئەوەی لێکی بدەینەوە کە پروپاگەندەی "گوشارو کاریگەری" سایکۆلۆژی، چەند کاریگەر بووە لەسەری. کە هاتە دەرەوە، بەوپەڕی ڕێزەوە، پێشوازیم لێکرد. هاوسەرەکانیشمان پەیوەندی جوانیان هەبوو. بچوکترین گرفت لەنێوانمان روینەدا. کەچی، لەسەر جیاوازی بیروباوەڕ، دەکەوێتە دۆخێکی سایکۆلۆژی واوە، توندترین وتارمان لەسەر دەنوسێ. لەمەش خراپتر، بەناچاریی، لەژێر کاریگەری سیاسەتی نەوشیروان، لەناو پلینیۆمدا، دەست بۆ کوشتنمان، هەڵدەبڕێ!! ئەمە چ حاڵەتێکی دەرونییە، چ کاریگەرییەکی ترسناکە، لەماوەیەکی کەمدا، هاوڕێ دەکاتە دوژمنی هاوڕێ. ئەم نمونەیە، راگوزەر نییە. بەشی زۆری ئەندامی پلینیۆمەکە، هەروەکو د.ئەرسەلان دەستیان بۆ تاوانەکە بەرزکردۆتەوە!

چەند دۆخێکی سایکۆلۆژی ترسناکە. نەوشیروان دەتوانێ، وا لە (٦٣) کادر، کە شادەماری کۆمەڵە بوون، لە ماوەیەکی کورتدا، خەیاڵدانیان لێوڕێژ بکات لە رق. دوا شانەی بیرکردنەوەی ئازادیان کوێربکاتەوەو دەسەلاتی بڕیاردانیان کۆنترۆڵ بکات. شانەیەک لە هزریاندا نەمێنێ، بیرێک لە سەربەستی خۆیانو کەسایەتیان بکەنەوە. ئەمە چ دردۆنگیەکی دەرونییە وا لە تێکۆشەر، کادر، سەرکردە بکات، بە ئاستەمیش بیر لە خۆیان، لە مێژوویان، لە دوارۆژی بیروباوەڕیان نەکەنەوە. دیکتاتۆرەکانیش لەمێژوودا هەر وایان کردووە. دیکتاتۆرەکان، پێش ئەوەی هێزی سەربازی بەکاربێنن.. دەستەمۆی سایکۆلۆژی رای گشتی، دەکەنە بەشێک لە سیاسەتەکانیان. دەستەمۆی سایکۆلۆژی.. لە هێزی سەربازی ترسناکترە.. بۆ قۆناغێک!

---

١ ژیانو خەباتی سیاسی د.ئەرسەلان بایز لە چاوپێکەوتنێکی مێژوویدا. چاوپێکەوتن: ئیسماعیل کوردە. چاپی یەکەم: ٢٠١٩. ل(١٤٠).

سەیر ئەوەیە هاوڕێم د.ئەرسەلان دەڵێ: تەنها عەبدوڵڵا توفیق دژی کوشتنی مەلا بەختیار بووە، وتویەتی پیاوێکی تێکۆشەرەو خزمەتی زۆر کردووە، نابێ بکوژرێ.. ئەمە چی دەگەیەنێ؟

رێک ئەوە دەگەیەنێ لە (٦٣) کادری سیاسیو عەسکەریو سەرکردە، تەنها یەک کەسیان ویژدانیان هەبووە. تەنها یەک کەسیان نەچۆتە ژێر کاریگەری سایکۆلۆژی نەوشیروان مستەفاوە، کە هەموویانی دەستەمۆی بڕیارێک کردووە، بیانەوێو نەیانەوێ، مێژوو، شوناسی شۆڕشگێڕێتی وشیارو تێکۆشەری ئازادیخوازیان، بە چەمکە فراوانەکەی، لێدەسەنێتەوە.

ئەو بڕیارەی کەسانی وەکو هاوڕێم ئەرسەلان، لە ویژدانم دەرهێنابوو. نەشمکردبووە رق، بۆیە کە ئازاد بومو لە سەیارە وەرگەڕا، لە ورمێ سەرم لێدا. بەڵکو کەوتینە گفتوگۆ، بۆئەوەی لەبەرامبەر سیاسەتە شکستخواردوەکەی نەوشیرواندا، بیر لە بەدیلێک بکەینەوە. چەندین کۆبونەوەشمان کرد. داگیرکردنی کوەیت، ئاراستەکەی گۆڕی!

لەم نمونەیە مەبەستمە بڵێم: لە دونیای سیاسەتدا، تەنانەت روداوی وەکو پلینیۆمە قەرەقۆشیەکەی نەوشیروانیش، نابێ، ببێتە مایەی رقو لێکدابڕانی هەمیشەیی! ئەگەر دەرونی مرۆڤ، لە بنچینەدا، دوچاری نەخۆشی نەبوبێ!!

## (١٧)
## کنەو کینەی شاردراوە!

ئەم کارەکتەرانە، لە کنەی شانەی نهێنی کۆمەڵەوە، کینەی شاردراوەیان پەنا دەداو لە شکستی دوای جەلالیەکانەوە، رقی پەنگخواردویان بۆ هەلی رقڕشتنو هەلی تۆڵەسەندن، خۆیان مەڵاس دابوو!

شکستی جەلالیەکانو هەرەسپێهێنانی شۆڕشی ئەیلول، دوو روداوی راگوزەر نەبون. هەردوو ئەم روداوە، لە (٥٦) ساڵی رابوردوودا (١٩٦٤-٢٠٢٠) رقبەندیکی(*) پەی پێنەبراویان لە ناخی هەردوو جەمسەرەکەدا، پەنگ دابوو. بۆیە، زۆر جار کە دەشمان گوت گوایە: ئێمە شۆڕشی نوێینو کومەڵەی مارکسین، کەچی خوتو خۆڕاییش دەستمان دەچووە خوێنی یەکتر. تومەز ئەمە باکگراوندی سیاسی-سایکۆلۆژی هەبووە. بۆیە کە

---

* رقبەند: دەستەواژەیەکی نوێیە، لەم نوسینەدا یەکەمین جارە دایدەڕێژین. مەبەست پەنگخواردنی رقی کۆنو نوێیە.

ئاوڕ له روداوەگانی ئەو ساڵانه دەدەینەوە، هیچ هۆیەکی سیاسی لەپشت قەتڵوعامکردنی برایم عەزۆو هاوڕێکانی لەو دۆخەدا ئەوەی نەدەهێنا، به دیلیی شەهید بکرێن. تەنها ئەو هۆکاره رقبەندییه دەروونییه نەبێ، که له وشیاریی‌و ناوشیاریی سیاسیدا، بڕیاری کوشتنی دیلی بەکۆمەڵی دەدا. هەمان رقبەندی دەرونی، هاندەری کاریگەری قەتڵوعامی (قڕناقاو پشتئاشان-١٩٨٢) بوو. ئەم رێبازەی دیلکوشتن، هەتا ئەنفالەکانیش درێژەی کێشا. له راپەڕیندا، له هەڵمەتی رۆژانی یەکەمدا، دیلکوشتن هەبوو، بەڵام دوای دڵنیابون له سەرکەوتنی راپەڕین، راگیرا. کاتێک راپەڕین دوچاری شکست کراو بەکۆمەڵ کۆڕەو رویدا، ئەم قینه سایکۆلۆژییه به چەشنێکی ترسناک گرێدرایه گرێی دەرونی. خۆ لەخۆڕا نەبووه دوای کۆڕەو، به فەرمانی تایبەتی (ن.م) هێزێک به چەندین تەن دینامیتەوە بەسەرپەرشتی (ش.ح.م) نێردرا بۆ بەنداوەکەی دەربەندیخان‌و لەژێر سەدەکە، دوو تۆڕبین تەقێندرایەوە، بەڵام سەدەکه بەو دینامیته دانەڕوخا. ئەگەر دابڕوخایە، تەواوی کەلارو باوەنور، هەتا دەگەیشته خوار بەعقوبەی رادەماڵی، که ئەوکاته قوربانیەکانی به (٤٠٠-٥٠٠) هەزار کەس خەملێندراوە. وتراویشه: قیروسیا چەند کورد تیادەچن، گرنگ ئەوەیه زۆرینەی عەرەب دەخنکێن‌و تۆڵەی ئەنفال دەکەینەوە. بەمەدا دەردەکەوێ، ئەنفال، روداوێکی کوت‌وپڕی سیاسی نەبوو. بەڵکو ئایدیۆلۆژیەتێکی بنجداکوتراوی دێرینه بوو، بەعس، به دیوه ئاشکراکەی‌و فاشیستیەکەی سەپاندی، سەرکردەکانی کوردیش، دەیانویست، به دیوه شاردراوەکەی بەناوی تۆڵەسەندنەوە، دوبارەی بکەنەوە. چۆن بەعس ئەنفالی لەناو خەڵکدا سەپاند، هەر بەوشێوەیەش، دەویسترا، بەناوی تۆڵەسەندنەوە، بەجۆرێکی کوردیانه، پرۆسەیەکی ترسناکی ئەنفال بسەپێنن. ئەم بڕیارەو چۆنیەتی جێبەجێکردنی، باشترین بەڵگەیه بۆ سایکۆلۆژیەتی نەهلستی (پوچگەراییی)، پوچگەراییەک، تا ئەوڕادەیە، سەدان هەزار کەس دەکرێنه قوربانی.. بەناوی تۆڵەسەندنەوە. واتا: یەکسانیکردنی قوربانی‌و جەلاد، له تاوانکاریدا. ئەمەش خەتەرناکترین جۆری بیرکردنەوەیە، که سەرکردەی قوربانیەکان، دەگەنه ئاستی یەکسانی بوون لەگەڵ سەرکردەیەکی جەلاددا. لێرەشدا، دیسان، به دیوه تراژیدیاکەی، جیاوازی نامێنێ.. لەناو شۆڕشدا، بەناوی پاراستنی شۆڕش، جیاوازیەکان دەکوژن. لەدەرەوەی شۆڕشیشدا، بەناوی تۆڵەسەندنەوە، جیاوازی نێوان جەلادو قوربانی.. فاشیست‌و ئازادیخواز، دەکوژن.

رەنگه هەبن، ئێستاش باوەڕنەکەن، نەخشەکێشراوه دیوێکی شاردراوەی کۆمەڵکوژی به روخاندنی بەنداوی دەربەندیخان، ئەنجام بدرێ. بەڵام شوێنەواری ئەو دوو تەقینەوەیە، هەتا

حکومەتی ئیدارەی سلیمانی لە کەمبونی بەرهەمهێنانی کارەبادا کاریگەری مابوو. بۆیە کارەبای دەربەندیخان بەرهەمی کەمبوو. کۆمپانیای بێگانە بۆ چاککردنی بانگ کرابون، داوای دەیان ملیۆن دۆلاریان کردبوو. بەڵام بە هیمەتی وەزارەتی کارەبا، کە ئەوکاتە (تەحسین قادر) جێگری وەزیر بوو، بە کەمترین تێچوون چاک کرایەوەو تۆرباینە تێکدراوەکانیش خرانەوە گەڕ!

## (١٨)
## هەڵچون یان ڕێباز؟

من دەپرسم: ئایا هەموو ئەو روداوانـەی لەناو شۆڕشدا، لە ریزەکانی یەکێتیو کۆمەڵەدا، هەروەها پارتیو سۆسیالیستو پاسۆکدا، کە قوربانیەکانی سەدان تێکۆشەر بون، تا دەگاتە بڕیاری تەقاندنەوەی بەنداوی دەربەندیخان، ئایا، ئەمە ڕێکەوتی سیاسی، یاخود هەڵچونی کاتیی بـووە؟ یـان سـەرکردە بـاڵاکان، لەڕێگەی فەرماندەو کـادرە دەستەمۆکراوەکانەوە، بە بڕیاری سیاسیو رقی سایکۆلۆژی ئەنجامیان داوون؟ ئاخر ئەو رەفتارانە، چ پەیوەندیەکیان بە خەباتی رزگاریخوازی گەلێکی ستەملێکراو هەبووە؟ چ پەیوەندییەکی بە ڕێکخراوێکی چەپی دامـەزراو لەسەر بنەمای مارکسیزم هەبووە؟ ستالین، یان پۆلپۆت، هەر ئەم تاوانانەیان ئەنجامداوە، تا مێژوو خستنیە دادگای رەوای خۆیەوە. ستالین، دەوڵەتێکی تۆتالیتاری-پۆلیسی بەدەستەوە بوو، ملیۆنەها کەسی کوشتو باشترین سەرکردەکانی حیزبەکەی لەناوبرد، هەندێک سەرکردەی کوردیش، تەنها زیندانێکو چەند فەرماندەیەکو چەند تیپێکی پێشمەرگەیان، بەدەستەوە بووە، ئەو هەموو تاوانەیان ئەنجامداوە. بەدڵنیاییەوە بۆیان بلوایە، دەوڵەتو دەزگای زەبەلاحیان بەدەستەوە با، خراپتریان ئەنجامدەدا.

دوو کچو دوو کوڕ یەکتریان خۆشدەویست. یەکێکیان لە چاڵاوای دۆڵی جافایەتی بوەو ئەوی تریان شەهید ڕێبوار لە تیپی قەراغ کچێکی خۆشدەویست. بە فەرمانی نەوشیروان مستەفا مەکتەبی سیاسی، هـەر چواریـان شەهید کـران. ئـەوەی چاڵاوا (مەڵبەندی دوو) جێبەجێی کردو ئەوەی قەراغیش (هەرێمی پێنج). شەهید ڕێبوار تا بڵێی ڕێکوپێکو دڵسۆزیش بوو. دوای جیابونەوەی ئاڵای شۆڕشیش، نەوشیروان مستەفا بەبێ دادگا سالاری حاجی دەروێشی شەهید کرد. بەبێ ئەوەی لە بەڵگەنامەکانی عێراقو کوردستاندا، بچوکترین بەڵگەی لەسەر دۆزرابێتەوە. هەروەها جوامێری سەرتیپی بەبێ

دادگا، لەناوبرد، خەلیفە عەبدوڵڵا مارفی، بێ تاوان، کوشت. لەهەمان کاتدا (عیدان ناسر- لەدایکبوی ١٩٥٨و حەیدەر حسێن ئیبراهیم- لەدایکبوی ١٩٥٤و ئەکرەم حەسەن قادر- لەدایکبوی ١٩٦٣) کە سێ لاوی دڵسۆزی خانەقینی بون، هەرسێکیان لەخوار بارەگاکەی نەوشیروان ساڵی ١٩٨٥ شەهید کردن.(*) شەهید ئەکرەم، لەکاتی دەستبەسەرکردنیدا، ئەوەندە دڵسۆز بووە، بە پێشمەرگەی وتووە: دورکەوە نەکا پرشکی بەردو گوللەکەت بەربکەوێ.

رەنگە، هەبن بڵێن: دوای مردنی بەشێک لەو سەرکردەو فەرماندانە، تازە ئەم قسانە بێهودەن. لەوەڵامدا دەڵێم:

لە یەکەم بینینی منو نەوشیروان مستەفاوە، لەناوچەی هەکاری، شێوەی هەڵسوکەوتو گوفتاریم بەدڵ نەبووە. لەسەر سوکایەتیکردن بە شەهید شیهاب، دوو رۆژ دوای یەکتر ناسینمان، قسەی زبر کەوتە نێوانمان، ئەو دەیووت: باسی شیهاب مەکەن، گێلو ترسنۆک بووە. لەگەڵ جەمال ئاغا جیاوازی نەبووە. منیش بەرپەرچم دایەوە! بە مام جەلالیشم وت، بانگی کردو بێدەنگی کرد!!(+)

لە کۆبونەوەکاندا، زۆرجار بۆچونەکانیم رەتکردۆتەوە، بەڵکو هەندێک جار کە ویستویەتی هاورێیان بشکێنێ، بەرگریم لێکردوون.

لە یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەدا، کە بۆم دەرکەوت، پیلانیان لە هاورێ هیلاکەکان گێڕاوە، تا رادەی هەڵچون پیلانەکەم قانگ دا. بەشێک لەو هاورێیانەی بەرگریم لێکردون، لە نوسینی مێژوودا، قەڵەمەکانیشیان لەو راستیانە لادەدەن. یان کە قسەیان بۆ رۆژنامەو خوێندکارانی تێزەکان کردووە، راستیەکانیان بەئارەزوو هەڵگێڕاوەتەوە. ئەمە لەکاتێکدا نەوشیروانو فەرەیدون عەبدولقادرو برایم جەلالو زۆری تر، لەسەر ئەو تورەبونە، لەسەر منیان نوسیوە!

لەکاتی شەڕی نەگریسی قرناقاو پشتئاشاندا، کە بیستم (٥٦) دیل بە بڕیاری سکرتێری کۆمەڵە کوژراوونو زۆربەشیان ژنو پیاوی عەرەبی شیوعی بون، هەڵوێستم تا ئەو رادەیە توند بوو، کە لە قرناقاو پشتئاشانەوە، نەوشیروان مستەفا بە جیهازی راکاڵ بڕیاری پێ

* ئەم سێ لاوە، لەبەر دوو هۆ شەهید کران.. یەکەم: ئالای شۆڕش بوونو دووەمیش: خانەقینی بوون. دوای رزگارکردنی خانەقین، پۆستەرم بۆ دەرکردنو لەژێریا نوسیمان (شەهیدی غەدرلێکراو) خانەنشینی شەهیدانەشمان بۆ برینەوە. دوای جیابونەوەی بزوتنەوەی گۆڕان، لە هەڵبژاردندا سەرپەرشتی هەڵمەتی هەڵبژاردنی خانەقینم دەکرد. لە وتارێکدا وتم: دەبێ نەوشیروان مستەفا رونکردنەوە بدات، کە ئەم سێ لاوەی شارەکەمانی، بەبێ دادگا، چۆن شەهید کردووە. ئەگەر بەڵگەیان لەسەرە، فەرموون بیخەنەڕوو. بەم قسەیە، خەڵکی خانەقین تۆڵەی شەهیدەکانی لێکردنەوە. بزوتنەوەی گۆڕان کەمترین دەنگی هێنا. بەشێکی بەرچاویشیان هاتنەوە ناو یەکێتی!

+ هەر ئەوکاتە تێگەیشتم نێوان شیهابو نەوشیروان، باش نەبووە!

راگەیاندمو گوتی: من سەرم پان کردونەتەوە، تۆش پەڕوباڵیان بکە. دەستبەجێ پێمگوت: کاری وا ناکەم، چونکە ڕێکەوتنمان لەگەڵ شیوعیەکاندا هەیە. وتی: وەکو سکرتێری کۆمەڵە ئەمرت پێدەکەم. هەر نەمکرد. لای مام جەلال شکاتی لێکردم، مام هاتە سەر جیهازو گوتی: کاکە نەوە عاجز مەکەو چی ئەڵێ بەقسەی بکە. پێموت: ژنە عەرەبو تێکۆشەری شیوعی، لەناویاندا (د.ئیمان) کچی شەهید (سەلام عادل) هەیە، بە من ناکوژرێن. مام زۆری لەسەر نەڕۆشت. ئەگینا دەیتوانی دەستبەجێ لام ببا. نەوشیروان تەکلیفی لە ملازم عومەر کردو هاتە سەر جیهازو گوتی: کاک نەوشیروان توڕەیەو ئەڵێ هەر دەبێ لە شیوعیەکان بدرێ. وتم: هەرگیز کاری وا ناکەم. وتی: ئاخر سزات دەدەن. وتم: با بۆ یەکەمجار لەسەر برانەکوژی، سزا بدرێم! بۆ مێژوو، شەهید ئازاد هەورامی، لە فەرماندەی قوڵێکی شەڕەکان بووە. (١٦) دیلی گرتووە، سکرتێری کۆمەڵە ئەمری پێکردووە پەرێزی پاک بکات. واتا: بیانکوژێ. شەهید ئازاد بەقسەی نەکردووە.

سەدان بەڵگەش هەن، کە لە بۆتەی ململانێکانی ناو کۆمەڵە، لە کۆبونەوەکان، نوسینەکان، کۆنفرانسەکان، بەرە بەرە لەگەڵ نەوشیرواندا، دوو هێڵی ناتەریب بوین، هەتا گەیشتە جیابونەوەی ئاڵای شۆڕش. لەم کاتەشدا، ئێمە لەناو وڵاتدا دەمانویست بە ئاشتیی جیابینەوەو بۆ دڵنیابونیش خۆمو شێخ عەلیو مامۆستا پشکۆو عیماد ئەحمەدو زیاتر لە (٢٠) پێشمەرگە چوینە تەکیەی قەراغ، هەتا پەیامێک بگەیەنین کە ئێمە نامانەوێ بچینە ناو ئێرانو ناشمانەوێ بچینە ناو "جود"و بەهیچ شێوەیەکیش نامانەوێ هێز جیابکەینەوەو ببینە بەشێکی شەڕی ناوخۆ. کەچی هیچی ئەم نیازپاکیە، لای نەوشیروانو سەرکردایەتی ئەوسای کۆمەڵە، بە چاوپۆشینی مام جەلال، دادی نەداو پەلاماریان داین. لەکاتێکیشدا کە هاتنە سەرمان، حەرەسەکانیشمان لەگەڵ نەبوو. ئەوەی لەو شەفەقە ڕەشەی ڕشتنی قینی سایکۆلۆژیدا بینیمان، کە بەگوێی خۆمان دەمانبیست، بمانکوژنو لە ماڵو منداڵیشمان دەست نەپارێزن.(*)

نەوشیروان مستەفا، ئەم ڕوداوەی بەمشێوەیە لە بیرەوەریەکانیدا تۆمار کردووە:

"شەوی ١-١٩٨٥/١١/٢ هێزێک چووە سەر ماڵەکەی مەلا بەختیار لە گوندی تەکیە. بەبێ شەڕو تەقە خۆیو هاوڕێکانی گیران".(١)

* لەوکاتەدا، جگە لە من، دلێری سەید مەجید، عیماد ئەحمەد، ئاسۆ عەلی، ڕوناکی شێخ جەناب، تارای هاوسەری عیماد، لاڤەی کچم کە تەمەنی دووساڵ بوو، ئەگەر یەک تەقە کرابا، دەیانکردینە قوربانی ئەو ڕقە سایکۆلۆژییە. ڕوناکی شێخ جەناب برازای شەهید شیهاب بوو. دڵنیام لەگەڵ ئێمەدا دەیانکوشت. کاتێک تەقە نەکرا. بۆ مێژوو حامیدی حاجی خالیدو مام ڕۆستەمو وەهاب، هەڵوێستی جوامێرانەیان هەبوو.

١ -١٩٨٤،

١٩٨٨). چاپو بلاوکردنەوەی (ناوەندی چاپەمەنیو ڕاگەیاندنی خاک) ١٩٩٩. چاپی دووەم. ل(٩٩).

بەم گێڕانەوەیە، پێدەچێ هێزێکی (٣٠٠) کەسی، بۆ رەشبەڵەکو خواردنی نانی شایی ناردبێ! راستگۆیەتی لەوەدابوو وردەکاری ناردنی هێزەکەی نوسیبا. روداوێک، کە سەراپا هاوکێشەکانی ناو یەکێتی گۆڕی!

سەبارەت بەم روداوە، پشکۆ نەجمەدین لە کتێبی (ئەزموونو یاد-کتێبی دووەم)دا بەشێوەیەکی هونەریو گێڕانەوەیەکی رۆمان ئاسا، ئەم تراژیدیایەی وێناکردووە:

"شەوێکم لەگەڵ خەونی بزرکاو و زیندەخەوندا بەسەر برد. لە سپێدەدا، لە دەرێ ڕا، هەرا و هەنگامەیەک پەیدا بوو. ئێمە کە بێدار بووینو دڵەڕاوکێ بواری خەوتنی نەدابوین، لەجێگادا ڕاست بووینەوە، لە پەنجەرەکانەوە، لە دەرێمان ڕوانیو ئیدی تێگەیشتنی دۆخەکە، هیچ زرنگییەکی نەگەرەک بوو.

-وەرنە دەرێ! بێ چەک وەدەرکەون! بە نیازی دەستکردنەوەو بەرگری بن، بارەگاتان بەسەردا دەڕوخێنین!

چواردەوری بارەگاکە، تەنرابوو، چەکەکان ئامادەو ئاربیجییەکان لەسەرشانو ڕوو لە دەرگاو پەنجەرەکان بوون.

پێشتر، مەفرەزەکەو هەندەک کادریان لە بارەگایەکی پشتەوەدا چەک کردبوون.

من دەرگاکەم بە ئەسپایی کردەوە، چەند پێشمەرگە کە چەکەکانیان ڕوو لە من بوون، هاواریان کرد: وەرە دەرەوە! غەریب هەڵەدنی، (بی کەی سی)یەکی ئاراستەی دەرگاکە کردبوو. من گوتم: دێین بەڵام پەلە مەکەن، با خۆمان کۆکەینەوە. دەرگاکەم داخستەوە. من، چوومە ژوورەکەی مەلا بەختیار. ئەو، لەسەر تەختی خەوتنەکەی دانیشتبوو، دەستەکانی لەنێو جانتاکەدا، نامەو کاخەزەکانیان ئەمدیوئەودیو دەکردن، وەک کەسێک لە دۆخێکی وەها چاوەڕواننەکراو بکەوێت، کەمێک پەشۆکابوو، بەڵام کۆنترۆڵی لەدەستنەدابوو. هەندەک لە نامەکانی جیاکردنەوەو ڕووناکی خێزانی، لە دەستی وەرگرتنو بۆ لایەکی بردن. مەلا، جانتاکەی هەڵگرتو لە هۆڵەکەدا، بە دلێری گوت: کاک دلێر، تۆ برۆ دەرەوەو بڵێ تا گفتی سەلامەتیمان نەدەنێ، وەدەر ناکەوین.. بڵێ: متمانەمان بە حامیدی حاجی خالیدو کاک وەهاب هەیە.. با ئەوان بێنو لەگەڵ ئەوان دەچینە دەرەوە. دلێر، ڕۆیشتو پاش کەمێک لەگەڵ حامیدو وەهاب، هاتەوە، مەلا بەختیار، پاش ١٠ ساڵو منیش پاش ٨ ساڵ، بۆ یەکەمجار، بەبێ چەک، لە بارەگایەک وەدەرکەوتینو هاوڕێکانی خۆمان، دیلو دەستبەسەریان کردین. هەمانرۆژ و ڕەنگە هەمانکاتیش، قادری حاجی عەلیو چەند پێشمەرگەیەک، لە گوندی (مالوومە)، بە ڕێزەوە، شێخعەلی کە لێپرسراوی یەکەم

مەفرەزەی چەکداری دەستپێکردنەوەی شۆڕشی نوێ بوو. چەک دەکەن‌و لەگەڵ خۆیان دەیبەنە بارەگای تایبەتی نەوشیروان مستەفا".[1]

چ روداوێک دەتوانێ، لەم کارەساتە نالەبارتر، گەوهەری بڕیاری نەوشیروان دەربخات، کە هێزێکی پڕ چەکی وا بنێرێ، بۆ کوشتنمان. کام کەس هەیە، تۆزقاڵێک ویژدانی هەبێ، کاتێک روداوەکە بەو چەشنە دەخوێنێتەوە، ئیتر تێنەگات، کۆمەڵەو یەکێتی، بەرەو چ دۆخێکی ترسناکی سیاسی پەلی ناجوامێرییان کوتاوە. بێگومان ناجوامێرییەک، بە هیچ پاساوێکی سیاسی، داناپۆشرێ. ئاخۆ، لەوێدا، تەقە کراباو بیانکوشتینایە، دوای کوشتنمان دەبێ، چەند درۆو دەلەسەیان لە ئیزگەکەو راگەیاندندا، بۆ ریزبکردینایەو (فەرهاد سەنگاویش) وەکو سەرکەوتنێکی پیرۆز، بە دەنگی گڕتر ئالای شۆڕشی بچواندایەتە جاش!

کە ئێمە هاتینە دەرەوە. وەهابو حامیدی حاجی غالی‌و مام رۆستەم، هەڵوێستیان باش بوو.. لەگەڵمان بوون. کە هاتینە دەرەوە، چاوێکم گێڕا بەو هەموو چەکدارەدا.. دەست لەسەر پەلەپیتکە، روخسار هەڵگەڕاو، لەپشتی کەڵەکە بەردەکانەوە، سیرەیان لێگرتبوین. لاقەی کچم، دوو ساڵی تەمەن بوو، هاواری دەکرد، باوکە منیش دێم.. مەڕۆ.. روناک وەک شێرە ژنێک، هەموو نیگایەکی، پڕ بوو لە حەسرەت‌و نەفرەت.. کە سەیری دەکردن. تارای هاوسەری عیماد، ئازایانە ناڕەزایی دەردەبڕی.. هاتین جەبار فەرمان[*]و سامان گەرمیانیمان بینی.. بە دەم‌وچاوی پێشمەرگەکانی دەوروبەریان، خەفەتباریم هەستپێدەکرد. بەڵام جەبار، کە یەکەمین جار هاتە دەرەوە، دوو-سێ هەفتەیەک لە

---

١ پشکۆ نەجمەدین. ئەزموون‌و یاد. کتێبی دووەم. ئالای شۆڕش‌و حیکایەتەکانی زیندان ١٩٨٣-١٩٨٨. چاپی پێنجەم ٢٠١٩. چاپخانەی هەژار موکریانی. ل(١٠٩-١١٠).

* جەبار فەرمان؛ کە کرایە بەرپرسی مەڵبەندی یەک. ئێوارەیەک هاتە گوندی تەکیە، لەماڵی مامۆستا ئازادی برازای بەهادین نوری، داوەت بوو. هاوین بوو، لە حەوشەکە دانیشتبوو. لۆکسیان بۆ دانابوو. کە بوو بە شەو (سەلامی فەقێ عەلی، برایم گەرمیانی‌و جەماله رەش) لە سێوسێنانەوە بەنهێنی هاتنەلام. جەباریان دیبوو، تەنها عوسمان هەڵەدنی (زاوای شەهید غەریب) حەرەسی بووە. بەدزیەوە هاتن‌و پێیان وتم: جەبار فەرمان تەنها دانیشتووە. فرسەتە ئێستا دەیکوژین‌و کەسیش نازانێ ئێمە بوین. لێیان تورە بوم. وتم: نەک کاری وا قبوڵ ناکەم، بەڵکو ئەگەر خۆشم بکوژرێم، پێم خۆش نییە، تۆڵەشم بسەنن‌ەوە. من باوەڕم بە کورد کوشتن نییە.. نەخوازەڵلا بەوشێوەیەش. تێبینی: هەرسێ ئەو تێکۆشەرانە ماویشن!

دوای یەککگرتنەوەی ئالای شۆڕش‌و یەکێتی، لەگەڵ جەبار فەرمان، سەرەتا نێوانمان خۆش نەبوو. بەڵام زۆری نەبرد، لە یەک تێگەیشتین. لەگەڵ عیماد ئەحمەد، جارێکیان هاتە ماڵمان‌و گوتی: بە قسەی نەوشیروان، کاری زۆر خراپم بەرامبەرتان کردووە. هەتا ئەمرم ویژدانم ئازارم دەدات. چەند جارێکی تر، بە ئامادەبونی عیماد ئەحمەد، دلێری سەید مەجید، مامۆستا موحسین، دانی پیا دەنا کە لەسەر بڕیاری نەوشیروان هەڵەی زۆر خراپم کردووەو لێشیان پەشیمانم.

بارەگای من بوو، کلاشینکۆفەکەی خۆمم پێشکەش کرد. سامان گەرمیانی؛ شەش دانە مانگ لە دەشتی هەولێرو خۆشناوەتیو حاجی قەلاو دۆلی جافایەتی قەراغ بەیەکەوە بووین. پێشمەرگەیەکی ئازا بوو هەتا گەیشتە ئامر کەرتیی.. بە سەیرکردنێک، هەستمکرد، لەنێوان شانازیو شەرمەزاریدا، روخسارو جولەجولیان، تێکەڵ بوبوو. هەروەکو ئەفسەرە لوتبەرزەکانی سوپا دڕندەکان دەهاتنەبەرچاوم. کە من خۆم، لە منالیەوە، لە پەروێزخانو دەربەندیخانو قۆرەتوو، لەکاتی شەڕەکاندا، ئەو ئەفسەرانەم دیووە، چەند لوتبەرز بونو چەندیش، خەڵکیان پێ کۆیلە بوو!

دوای گرتنمان، شەو لە ئاوایی حەمەی کەرەم لایاندایە مالی شێخ مستەفا (باوکی شێخ جەعفەر)، هەموویان ئەتگوت تەعزییانە. زۆریان روداوەکە پێناخۆش بوو. بەیانیەکەی کە کەوتینەڕێ. شەوکەتی حاجی موشیر، هەڵسوکەوتی باش نەبوو، ویستی قسەی نابەجێ بکات. پەلامارم دا، کەوتنە نێوانمان. بەڵام کە بردیانین بۆ بازیان، ئازادی سەگرمە وەریگرتین. هەتا ئەوپەڕی جوامێری، جوامێریی لەگەڵ منو مامۆستا پشکۆدا نواند. ئەمە لەکاتێکدا، تا ئەوکاتە، نێوانمان باشیش نەبوو. لەڕێگادا، لەپشت گوندی (سلێمانە گردە-بازیان) لە سەیارەکەی ئازاددا بوم، کەوتینە بۆسەوە. لە رەبایەکانەوە زۆریان دەستڕێژ لێکردین. ئازاد ویستی تەقە بکات، من نەمهێشت. چونکە شەو بوو، شوێنەکەیان کەشف دەکردین.. هەمومان تیادەچوین. تەقەکە بەردەوام بوو. پێشمەرگەکان بڵاوەیان لێکرد. من بەتەنها مامەوە. دەمتوانی هەڵبێم، بەڵام لەترسی ئەوەی نەکەومە دەست حکومەت، هەڵنەهاتم.

## ( ١٩ )
## بیری جیاواز و منالٚ کوشتن !!

کوشتنی مالٚو منال، ژنو ئیمەی هاوسەنگەر، تەنها لەسەر بیری جیاواز، بڕیارێکی ئاسایی بووە لایان. ئێستا دوای (٣٥) ساڵ دوای ئەو روداوە، کە زایەڵەی ئەو هاوارەی کوشتنمان لەگوندی تەکیە، لەگوێمدا دەزرنگێتەوە، قەت ئاواتم نەدەخواست، روداوی وا ببینمو بڕیاری وا بەگوێی خۆم ببیستم. چونکە هەرگیز کاری وام لەناو شۆڕشدا نەکردووەو بڕیاری سەروی خۆشم بۆ تاوانی ئاوها، تەنانەت بەرامبەر نەیارەکانیشمان، جێبەجێ نەکردووە؛ نەوشیروان مستەفا، بروسکەی بۆ کردم لە مەڵبەندی یەک، ئاراسی

قاله منەوەرو دیلەکانی سۆسیالیست بکوژم. چوار کەس بون، هەر چواریانم ئازاد کرد. تەنانەت چەکێکی ژێرسێشم دا بە ئاراس، چونکە کاتێک خۆم شاردبوەوە، لە یانەی سلێمانی تێنسم لەگەڵ دەکرد.(-)

بەلام ئێستا کە لەسەر ئەو روداوە دەنوسمو رۆچومەتە بنجو بنەوانی ئەو بڕیارانە، ویژدانم زۆر ئاسودەیە، کە لە چەندین قۆناغو لەناو روداوە خوێناویەکاندا، خاوەن هەڵوێستی خۆم بوم. ئەو هەڵوێستانەشم، نە بۆ پلەوپایە، نە لەترسا، نە لەبەر هیچ جۆرە نەخۆشییەکی خۆپەرستی، نەشاردۆتەوە. گەر لەسەر ئەو هەڵوێستانەش، لە پلەوپایە خرابم، یان گیرابم. لەهەموشی ناخۆشتر، جگە لە پەلاماری عەسکەری، هەڵمەتێکی فراوانی راگەیاندنیش دژمان، بەو رقە سایکۆلۆژییە بەرپا کرا، دەویسترا، وەکو خیانەتکردن لە شۆڕشو کۆمەڵەو یەکێتی بمانخەنە بەر ویژدانی خەڵکەوە. سەرەنجام، مێژوو تەنها چەند ساڵێکی بەس بوو راستیەکان دەربخات. وەکو:

**یەکەم**: ساڵی (١٩٨٨-١٩٨٩) ئەو شۆڕشە دیموکراسیەی ئەوانەی پێیانوابوو، هێندە پیرۆزە، کە ناکرێ بیری جیاوازیش لەناویا ئازاد بێ، سکرتێری کۆمەڵە، سەرەتا بڕیاری دابوو، بەیاننامەیەک دەربکاتو بلاوەی پێ بکات.(*)

**دووەم**: ئەو کۆمەڵەیەی رەنجدەران، کە نەوشیروانو پەیڕەوانی، سەری خەڵکیان لەسەر دەپەڕاند، گوایە تاقە هێزی شۆڕشگێڕە ناکرێ لە رێبازەکەی لابدرێ، ناکرێ بیری جیاوازی تیا بمێنێ، بەحساب پێیانوابوو، تاقە هێزە دەستەبەری هەتاسەری سەرکەوتنە. هەر نەوشیروان خۆیو پەیڕەوانی، لە زەڵێ، لە سنوری دوو بەشی کوردستانی داگیرکراو و دابەشکراودا، بە رەتکردنەوەی لاوازی چەند کەسێک نەبێ، (١٩٩٠/١٠/٣٠) هەڵوەشاندەوە.

**سێهەم**: ئەو بیروڕا کوردستانیەی، پروپاگەندەیان بۆ دەکردو هێزی پێشمەرگەی باشوری کوردستانیان، بە پاساوی یەک مەسەلەی کوردستانیەتی کوردایەتی، بەهانای دیموکراتو

---

+ سێ کەسەکە: ١- ئاراسی قالە منەوەر. ٢- بەهادینی شێخ عەبدوڵلا. ٣- شۆڕش جوانڕۆیی. جگە لەم دیلانە، لە شەڕی کانی ژنان-١٩٧٨/٨/٢٠و لاوەران چوار پارتیمان گرت. پێشتریش لە لاوەران دووی ترمان گرتبوون. یەکێکیان حەمە پشتەیی بوو، قسەم بۆ کردو لای خۆم بوو بە پێشمەرگە. پێنجەکەی تریشمان دوای دوو رۆژ لە لاوەران ئازاد کرد.

* لە کۆبونەوەیەکی مەکتەبی سیاسیدا، دوای تێکشکانی ئەنفالەکان، نەوشیروان مستەفا، ویستویەتی قەناعەت بە کۆبونەوەکە بکات، بەیاننامەیەک بلاوبکەنەوەو بلاوەی لێبکەنو لەدەرەوەی ولات خەریکی کاری دیپلۆماسی بنو رۆژنامە بە زمانی کوردی-عەرەبی دەربکەن. تەنها کۆسرەت رەسول عەلیو جەبار فەرمان بەرپەرچیان داوەتەوەو پێیانگوتووە: ئەم شۆڕشە هی تۆ و مام جەلال نییە. تۆ ئارەزووی خۆتە، ئێمە درێژە بە شۆڕش دەدەین.

کۆمەڵەوە برد، ڕەوتی ئاڵای شۆڕشیشیان بە تومەتی عێراقچی، تاوانبار دەکرد، هەر نەوشیروان‌و پەیڕەوانی بون، لەکاتی ئەنفالەکاندا، چەندین نامەی نهێنییان، بۆ سەدام‌و کاربەدەستانی بەعس دەنارد، داوای لایەنی کەمی مافی کوردیان دەکردو هەوڵیاندەدا، نەک کێشەی کورد، بەشێک بێ لە کێشە دیموکراسیەکانی عێراق، بەڵکو دەیانویست سۆزی سەدام بۆ چارەسەری پینەوپەڕۆ ڕاکێشن! ئەوکاتە مام جەلال نەیهێشت، ئەگینا ڕێکەوتنی خراپتریان لە ڕێکەوتنی ۲۹/ی حوزەیرانی ۱۹٦٤ جێبەجێ دەکرد. لەسەر ئەم ڕێڕەوەش، سەدان پێشمەرگەیان پاڵ پێوە نا تەسلیم بنەوە. کەوتنە گیانی دەرپەڕاندنی کادرە باشەکانیش، بە هەندێک لە سەرکردەکانیشەوە. بەڵکو سەدام لێیان خۆشبێ!

**چوارەم:** دوای کۆڕەو، کاتێک زانرا هاوپەیمانان پشتیوانی کوردستان دەکەن‌و ناوچەی ئارام دروستبوو، نەوشیروان‌و پەیڕەوانی، بەگەرمیی کەوتنە پیاهەڵدانی عێراق‌و لەگەڵ سەرجەم لایەنە عێراقیەکاندا ڕێک کەوتن، کە کێشەی کورد بەشێکی دانەبڕاوی کێشە دیموکراسیەکانی عێراقە.(*)

دوای ڕوخاندنی سەدامیش، لە کۆبونەوەیەکی مەکتەبی سیاسیدا لە بەغداد، بە سەرپەرشتی مام جەلال‌و ئامادەبونی نەوشیروان‌و باقی ئەندامان، نەوشیروان تەرحی کرد کە کاتی هاتووە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بکەینە حیزبێکی سەرانسەری عێراق. دەستبەجێ من وەڵامم دایەوەو گوتم:

ئەمە کارێکی زۆر خراپە. ئێستا سەردەمی بوژانەوەی بزوتنەوەی ناسیۆنالیستییە لە ڕۆژهەڵاتی ئۆروپاو ئاسیادا، هەروا لەکوردستانیشدا، بڕیاری وا بدەین کێشەی کورد لە باشوری کوردستان دەکەوێتە دەست پارتی‌و لەعێراقیشدا، سەرکەوتوو نابین. مام جەلال پشتیوانی قسەکانی کردم‌و لەسەری نەڕۆشت!

تەنانەت، نەوشیروان مستەفا، کە بزوتنەوەی گۆڕانیشی دروستکرد، ناسنامەی کوردستانی پێنەبەخشی. ناوی (بزوتنەوەی گۆڕان)ە. بەڵکو، زۆرتر بەلای عێراق‌و هێزە عێراقیەکاندا دایشکاند. زۆرترین دوژمنایەتی یەکێتی‌و پارتیشی دەکرد. لە بەغداشدا، ئومێدێکی زۆریان لەسەر هەڵچنی، تا بتوانێ یەکێتی‌و پارتی لاواز بکات.(+)

* لە دانیشتنێکی بچوکی ماڵی مام جەلال، نەوشیروان، سەعدی پیرە، سەلاحەدینی موهتەدی، ئامادەبون. نەوشیروان کەوتە پیاهەڵدانی عێراق؛ ئابوری بەهێزە، زانکۆکانی گرنگن، نەوتی هەیە. پشتیوانی عەرەبی‌و جیهانیی هەیە..تاد. ڕووی کردە من وتی: مەلا بەختیار وا نییە؟ منیش وتم: دەمێکە من ئەزانم وایە، برۆ بۆ فەرەیدون‌و هاوڕێ کۆنەکانتی باس بکە.

+ تەنها لە یەک سەرۆکی حیزبی عێراقیەوە (دوو ملیۆن) دۆلاری بۆ نێردرا. هەتا باشتر بەگژ یەکێتی‌و پارتیدا بچێتەوە. ئەو کەسەش دەناسم پارەکەی بۆ هێناوە!

( ٢٠ )

## رقی سایکۆلۆژیو سۆسیال-میدیا

له شاخداو لەناو شۆڕشی چەکداریدا.. تاقە ئیزگەیەکو، چاپخانەی ساکارو سەرەتایی هەبوو، زۆرترین پەیامەکان هەتا ساڵی ١٩٨٠-١٩٨١ بە تەتەر دەنێردرانو دەهاتن. سەردەمی جەنگی ساردو بەرگری چەکداری بوو. ئینجا، رقی سایکۆلۆژیو کولتوری توندوتیژی، بەوشێوەیە پەرەی پێدەدرا، کە باسمان کرد.

ئێستا، سەردەمەکە گۆڕدراوە، لە جیهانگیریو دونیای سۆسیال-میدیادایین، لە ئانو کاتدا، هەواڵ، بڕیار، پەیوەندی، پروپاگەندەو ئاراستەکان، دەگەنە دورترین جێو دەشگەنە دوا هاوڵاتی وڵاتانی سەر زەمین.

ئەم سەردەمە، لە بارێکی کۆمەڵایەتیو ئاستێکی رای گشتیدا، هاتۆتەکایە، کە هێشتا کوردەواری لە سەرگوزشتەی رشتەی مرواریو لەژێر هەژمونگەری ئەندێشەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدایە. هێشتا وەرچەرخانی کۆمەڵایەتیو ئاینسازیو رۆشنگەری، نەهاتونەتە دی. هزرە چەقبەستوەکان نەهەژاوون. پرسیاری ناباو نەکراوون. تەنانەت ئایدیۆلۆژییەتی حیزبایەتیو گیانی بەرزی کوردایەتیش، کەوتونەتە ژێر کاریگەری سەردەمەکە. لە دۆخێکی وادا، بێگومان ئەوانەی قینی سایکۆلۆژییان هەیە، دەتوانن ترسی سایکۆلۆژی زوتر بڵاوبکەنەوەو هەڵوێستی ئازاد بتاسێنن. لە چرکەساتێکدا هەواڵی راستو ناڕاست، پروپاگەندە، درۆو دەلەسە، بە دوا کەلەبەری جیهان بڵاودەبێتەوە. تێبینی دەکرێ کەوا:

١)رۆژگار تەقینەوەی بینیووە. واتا مرۆڤ لە کەمترین کاتدا توانی پەیامی خۆی بۆ دورترین خاڵی جیهان بنێرێ.

٢)فەزا تەقینەوەی بینیووە، لە کەمترین کاتدا، بەربڵاوترین مەودای جوگرافی دەپێوێ[1]

خەسڵەتی وردەکاری ئەنتەرنێتو سۆسیال میدیا، ئەوەیە دەتوانێ سەرجەم بەربەستەکان ببڕێو سەربەستیەکان بوروژێنێ. هیچ بەربەرستێکی کۆمەڵایەتی، خێزان، زەبروزەنگ، ترسو تۆقاندن، ترادسیۆن، ئاینو مەزهەب، عەیبە، حەرامەو قەدەغە، ناتوانێ رێگە لە هەواڵەکان، زانیاریەکان، نهێنیەکان، وروژاندنی غەریزەکان، رەخنەکانو بۆچونە جیاوازەکان..تاد، بگرێ. تەنانەت لە داخراوترین وڵاتی ئیسلامیو عەقیدەگەراشدا!

---

١ دانشنامه ارتباطات ٢٠. جامعه شناسي نوين ارتباطات رسانه هادر جهان امروز. دکتر باقر ساروخاني. استاذ دانشگاه تهران. انتشارات اطلاعات. تهران-١٣٩١.

پروپاگەندە دزە دەکاتە دررزە نهێنیەکانو ئەوەی نەوتراوە، دەبیستریێ، ئەوەی نەشبینراوە، دەبینریێ. بەمەش، بوارێکی تیشک ئاسا، بۆ قینی سایکۆلۆژی دەرەخسێنێ. ئەو قینەی کە رەنگە ماوەیەکی زۆر کپ کرابێو لەبەر گەلێ هۆکار، دەرنەبڕدرابێ، سۆسیال-میدیا، بواری جۆراوجۆری رشتنی ئەو قینە سایکۆلۆژیەیە. کێشەی سۆسیال-میدیا، لەکوردستاندا زۆرترە، بۆ؟

چونکە، ولاتە پێشکەوتوەکان بە قۆناغ گەشەیان کردووەو تەواوی دەستکەوتەکانی تەکنەلۆژیاو زانستو زانیاریان تاقیکردۆتەوە. جگەلەوەی سیستەمو فەلسەفەی پەروەردە لە رۆژئاوادا، هێندە پێشکەوتووە، هزرو سایکۆلۆژیەتی زۆرینەیان سازە بۆ چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەم بوارە هەرە پێشکەوتووەی تەکنیک. بەلام ولاتانی دواکەوتوو، جگە لە تەی نەکردنی قۆناغە سروشتیەکانی پەرەسەندن، لاوازی فەلسەفەی پەروەردە، ئاستی نزمی پێشکەوتن، ناخی زۆرینەی چەپێنراو، بەوانەشەوە نەخۆشی سایکۆلۆژی جۆراوجۆریان هەیە، لەپڕ خەڵکی ولاتە دواکەوتوەکان کە تێکەلاوی سیستەمی ئینتەرنێتو لقو پۆکانی سۆسیال-میدیا دەبن، بە پەیجی فەیکو فێڵی سەیرو سەمەرە، ناخە چەپێنراوەکانیانو نەخۆشیە سایکۆلۆژیەکانیان، هەڵدەڕێژن. چەشنی وروژاندنی سەدان شارە زەردەواڵە دەئاڵێنە نەیارەکانیان.

نەخۆشییە سایکۆلۆژیەکان، لەم دۆخەدا، کە عیراقو ناوچەکەو کوردستان، ساڵەهایە دوچاری قەیرانی ئابوری، ئاستەنگی سیاسی، شەڕی تیرۆرو... ماوەیەکیشە کۆرۆناشیان هاتۆتە سەر، بێگومان زیادیان کردووە، رایەڵەی ئینتەرنێتو لقو پۆ تەکنیکیەکانیش، ناوبەناو زیاد دەکەن. گەیەندراوەتە رادەی دەستەبەری تەکنیکی، کە پەیجو هێڵەکان هاک نەکریێ. هاک نەکردن، دەرفەتی سەربەستی زۆرتر بە بڕیارو پروپاگەندەو ئازادیە شەخسیەکان دەدات. ئەگەر لە شاخدا، حیزبەکان ژمارەیان کەمو تەکەتولەکان کەمو گرفتەکانیش کەم بوبن، لە شارداو لەسایەی ئازادی سۆسیال-میدیادا، فەزایەکی ترسناک بۆ هەڵڕشتنی ناخە چەپێندراوەکان هەڵکەوتووە. هەربۆیە، لەپاڵ سودوەرگرتنی پۆزەتیڤ لە ئینەرنێت، سەدان پەیجی تایبەتی، نەک لەناو حیزبەکان، تەکەتولەکان، سەرانی ئەمو ئەو گروپ هەیە، بەڵکو بەناوی ساختەی کەسایەتیەکان، تەنانەت کەسوکاری کەسایەتیەکان، جگە لە فرتو فێڵی بێسنوری هونەری تەکنیکی، ئەمانە خەسڵەتە رەخساوەکانی زوخاو رشتنو جنێوفرۆشتنو بوختان هەڵبەستن. بۆیە، لەناو ئەم ژینگە کۆمەلایەتی-سیاسی-سایکۆلۆژیەدا، بۆئەوەی سۆسیال-میدیا، زۆرتر بە لایەنی پۆزەتیڤ بەکاربێتو رقی نێگەتیڤ کەم بکرێتەوە، پێویستە فەلسەفەی پەروەردەو سیستەمی خوێندن، سەرلەنوێ

لەبەر رۆشنایی نوژەن بونی تەکنیکو داهێنانە سەرسورهێنەکان، دارێژرێتەوەو لەگەڵ سەردەمەکەدا بگونجێندرێ. ڕاگەیاندنیش دەبێ، ستراتیژی دیموکراسی-کۆمەلایەتی-زانستی بکەنە ئاراستەی میدیای دەربەستی سەربەخۆ. دەربەستی ویژدانی، لەچوارچێوەی یاساو ڕێسا گونجاوەکاندا.

من مەترسی زۆرم هەیە، لەم بارودۆخەدا، سۆسیال-میدیا زیاتر لەگرێژنەی ویژدان بترازێو لەناو دژواری نەخۆشییە سایکۆلۆژیەکانو ڕقە تایبەتیەکان، ئەزمونەکەو کۆمەڵەکەمان دوچاری کارەساتی نەخوازراو بکەن. ئێستا گیروگرفت لەناو تاکو خێزاندا، تا دێت زیاتر دەبێ. نێوان حیزبەکانیش، ساڵ بە ساڵ خراپترە لە پار. ناکۆکی نێوان لایەنەکان گەیشتۆتە ئاستێک، بەشێک لە سەرکردەکان، جگە لە هێزی چەکداری بەرژەوەند پارێزی ئەمو ئەو دەفەر، سۆسیال-میدیاشیان کردۆتە مەیدانی پاساوهێنانەوە بۆ تاوانو تاڵان. بە پیلان نێوان لایەنەکان تێک دەدەن، هەتا چۆنیان مەرامە، بەوشێوەیە لە گەندەڵیو سەرانەسەندن بەردەوام بن. ئەم دۆخە چارەسەر نەکرێو سنورێک بۆ فەیسبوکبازەکانی گەندەڵی دانەنرێ، چاوەڕێی ڕوداوی دڵتەزێنم. چاوەڕێم، ڕقە سایکۆلۆژیەکەی شاخ، کە لەسەر پلەوپایە، یان لەپێناوی سەپاندنی ئەم لایەنو ئەو تەکەتولو سەرکردە، تا ڕادەی تاوان پەیڕەو دەکرا. ئێستا لە شارداو لە سۆنگەی ئەو بەرژەوەندییە بێشومارەی نەوتو گومرگی سنورەکان، لەنێوان سەرانی دەستڕۆیشتودا، مەترسی هەیە، تەنانەت لەسەر بەرژەوەندیەکانیش نەزانن ڕێک بکەون.. سەرەنجام کار لەکاری بازاڕ بترازێو بشقەومێ!!

ڕقی سایکۆلۆژی نابینرێ، بەڵام ڕقێکی ئەوەندە ئەستورە، وەکو دوپشک وایە، هەمیشە لەسەر چزی تەقاندنەوەی کێشەکانە.

لەکۆتاییدا.. لارو شفوکو (١٦١٣-١٦٨٠)ی فەرەنسی، لە کتێبی (حکمت ها) سەدان پەندو حیکمەتی سایکۆلۆژی فەرمووە. لە یەکێکیاندا دەڵێ:

"لە موڵکی خۆپەسەندیدا، هەرچی بدۆزینەوە، هێشتا سەرزەمینی نەزانراو فراوانە".[1]

چەند جوانی فەرمووەو چەندیش لە دەیان کەسایەتی جڵەوبەدەستدا.. کە شارەزای کێشەنانەوەن، نەک چارەسەر، هێشتا مەودای خۆپەسەندییان.. سەرزەمینێکی فراوانی مینڕێژی ڕقی سایکۆلۆژی نەزانراوە!!

---

١ لارو شفوکو- حکمت ها، ترجمه دکتر حمدي گلپایگاني. انتشارات اطلاعات. تهران. ١٣٩٠. ص(٢٣).

# رشتەی دووەم:

## ئەشکەنجە و تۆقاندن

١- مەفرەزەکانو لافلیدان
٢- وا، مەفرەزەکان نەنێردراوون!!
٣- برایم خەلیلو عێراقچی!!
٤- سیروان تاڵەبانیو سەرکردایەتی
٥- دوڕیانی کۆڵنەدانو هەڵەداوان
٦- بە ڕێکەوت نەگیراین
٧- گرێکان بە دەست کرانەوە
٨- شاربازێڕ، جافایەتی، یان قەراغ؟
٩- سۆسیالیستو ڕەخنەی ناڕاست
١٠- کێشەکانو خەسڵەتی مام
١١- پەلاماردانی هاوخەبات!!
١٢- هەڵوێستێکی هێمنو کاردانەوەی توند
١٣- ئەشکەنجە، تۆقاندن، زانیاری
١٤- سوکایەتی، پێشێلی ئازادی؟
١٥- سیاسۆسیۆلۆژی زەبروزەنگ
١٦- دیموکراسیو شۆڕشگێڕیتی!!
١٧- دیموکراسیو هەڵکوتانەسەر!!
١٨- عێراقیو کوردستانی ئۆتۆنۆمی

## (١)
## مەفرەزەکانو لافلێدان

نوسەر، هەموو بیرەوەریەکانی، لە لوتکەی خۆ بە سەرکردە زانێکی بڕیاردەرەوە، داڕشتووە. دەرونی هێندە پەنگی خۆپەرستی خواردووە، بیری دەچێتەوە، کە کۆمیتەی هەرێمەکان دوای رۆشتنی سەرکردایەتی کۆمەڵە بۆ ئێران، رابەرایەتی کۆمەڵەی کردووەو بڕیاری بەرپاکردنی شۆڕشیشی داوە؛ هەر کۆمیتەی هەرێمەکانیش پەیوەندیان بە مام جەلالەوە کردووە. پۆستیان ناردوەو پەیکی نهێنیو تایبەتی لەنێواندا هەبووە. ئەمانەی هەموو لەکاتی نوسینی خەیاڵە سەرکردەبونەکەیدا فەرامۆشکردووە، بۆیە لە لاپەڕە (١٨٥-١٨٦)دا دەنوسی:

"دوای پەیوەندی کردن بە کاک شەهابو جەعفەر عەبدولواحید لە زینداندا، کە پێشتر باسم کردوونو هاتنی نامەی مام جەلال بۆ کۆمیتەی شارەکانو هەرێمەکانو پاشان بۆ کاک عومەر دەبابەو عەلی عەسکەریو چوونی کاک عومەر بۆ سوریا. کۆمەڵە لە بڕیاریدا، کە دەست بکات بە ناردنە دەرەوەی ئەو هەڤاڵانەی کە ئامادەییان تیا نیە یان مەترسی گرتنو راونانیان لەسەرە".[١]

جارێ، کۆمیتەی هەرێمەکان پەیوەندییان بە شەهید شیهابو فەرەیدون عەبدولقادرو عومەری سەید عەلیو هاوڕێیانی زیندان، لە سەرکردایەتی پێشووی کۆمەڵەدا هەبووە. چاوەڕێشیان نەکردووە نوسەر پەیوەندی بەو بەڕێزانەوە بکاتو رەزامەندییان لەسەر کردنو نەکردنی شۆڕش وەربگرێ. تاقە جارێکیش نوسەر لەلایەن کۆمیتەی هەرێمەکانەوە رانەسپێردراوە، لە زینداندا سەردانی سەرکردایەتی کۆمەڵە بکات.[*] بڕیاری بەرپاکردنی شۆڕشیش، یەکەم لە وڵاتدا لای کۆمیتەی هەرێمەکان بوو، دووەمیش لەدەرەوەی وڵاتدا بە پەسەندی مام جەلال بڕیاری درا. نوسەریش، کادرێک لەو کادرانە بوو، ئەرکێکی دیاریکراوی لەو دۆخەدا پێسپێردرابوو. بەشێکی ئەو قسانەی رستنی خەیاڵاتی خۆی بوو. کە پێی وایە خۆی هەموو شتێکەو لای کۆمیتەی هەرێمەکانو تەنانەت هاوڕێیانی زیندانیش، تەنها کادرێک بووە لە کادرەکان، بتوانێ بڕیاری گەورە بدات. ئەم خەیاڵە تا

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(١٨٥-١٨٦).

* جگە لە کەسوکاری شەهید شیهاب، کۆمیتەی هەرێمەکان دەیناردن بۆ لای شیهابو هاوڕێکانی، جارێکیان شەهید ئارام «دلێری سەید مەجید»یشی ناردە لای عومەری سەید عەلیو دوا بۆچونی ئەوانی هێنایەوە!

ئێستاش بەرینەداوە. ئەمە لەکاتێکدا هاوڕێیانی زیندانیش پێیان وتووە، شاسوارو کۆمیتەی هەرێمەکان چی دەڵێن وا بکەن..

"شەهید (ئارام) تێکۆشەرێکی پڕ و ژیر و هوشیار بوو، لە هاوڕێکانی تری (کۆمیتەی هەرێمەکان)، هێمنتر بوو بەبێ کینە و حەساسیەت، کارەکانی رێک دەخستو ژمارەیەک تێکۆشەری چاکو چالاکیشی لەدەوری خۆی کۆکردبوەوەو (کۆمیتەی هەرێمەکان)یان پێکهێنابوو! بۆ مێژوو دەیڵێم.. ئەگەر ئەوکاتە هەریەکێک لە ئێمە دەنگمان بگەیشتایە بە هاوڕێیانی رێکخستن لەخوارەوە، بێگومان هەموویانمان وا ئاراستە دەکرد، کە گوێڕایەڵی ئەوان بن! بە کردەوەش هەروامان کردو لە یەکەمین دەرفەتدا کە هاوڕێیان هاتن بۆ لامان بۆ زیندان، بەوجۆرە ئامۆژگاریمان کردن! ئیتر (کۆمیتەی هەرێمەکان)، توانیان بەگوێرەی هەلومەرجە نوێیەکە، هەم کاری رێکخراوەیی‌و هەم کاری پێشمەرگانەی ناو شار رێک بخەن‌و لە رووداوەکاندا رۆڵی قارەمانانەو کاریگەریان نواند!".[1]

سەبارەت بەوەی گوایە مام جەلال، نامەی بۆ کۆمیتەی شارەکان نوسیوە. ئەمەش، هەڵبەستنێکی ناڕاستە. چونکە مام جەلال لەو چاوپێکەوتنانەیدا، کە باسی دامەزراندنی یەکێتی‌و شۆڕش‌و پەیوەندی بە ولاتەوە دەکات، تەنها باسی کۆمیتەی هەرێمەکان‌و شەهید د.خالید لەئارادایە. ناوی کۆمیتەی شارەکان، نە لە وەڵامەکانی مام‌و نە لە نوسینی بیرەوەری هیچ هاوڕێیەکی تردا نییە. تەنها لە کولەکەی تەڕی نوسەردا هەیە.

لە (بیرەوەریەکانم لەگەڵ خاڵە شیهاب‌و هاوڕێکانی)دا وا هاتووە:

"هەر ئەو ئێوارە حاکم (ف) لە سلێمانی ئاگاداری کردین کە بڕیاری گرتنی (خاڵە شیهاب، هاوڕێیان جەعفەر، عەلی بچکۆل، عومەری سەید عەلی، فەرەیدون) لەلایەن ئەمنی سلێمانیەوە دەرچووە. ئیتر هەموو خۆمان شاردەوە، لەو ماوەیە لەماڵی خاڵم بوین (وەستا بەکری دارتاش) لەوێوە خەریکی پەیوەندی بووین. لیژنەیەکی سەرپەرشتیمان لە هاوڕێیان (ئازاد هەورامی، ئەرسەلان بایز، عوسمان‌و هاوڕێیەکی بەغداو راوێژکاری ئەبو شیهاب) دروستکرد".[2]

کە دێتە سەر بڕیاردانی دەستپێکردنی شۆڕشیش، بەجۆرێک بۆچونەکانی دادەڕێژێ، هەروەکو (کۆمیتەی هەرێمەکان)و (کۆمیتەی شارەکان) پێکەوە بڕیاریان دابێ. بۆئەوەی

١ فەرەیدون عەبدولقادر. هەڵو سوورەکانی قەندیل. دەزگای چاپ‌و پەخشی سەردەم. چاپی یەکەم. سلێمانی-زستانی ٢٠١٧. ل(٢٨٨).

٢ فەرەیدون عەبدولقادر. بیرەوەریەکانم لەگەڵ خاڵە شیهاب‌و هاوڕێکانی. لە بلاوکراوەکانی رۆژنامەی کوردستانی نوێ. چاپخانەی شەهید (ئازاد هەورامی) چاپی یەکەم ٢٠١١. ل(٤٣).

لەمبارەوە گومڕایی لای خوێنەر لەسەر هەردوو کۆمیتەکە دروست بکات، کە گوایە پێکەوە بڕیاری بەرپاکردنی شۆڕشیان دابێ، لە لاپەڕە (١٨٦)دا دەڵێ:

"کۆمەڵە بڕیاریدا کە دەست بکات بە ناردنە دەرەوەی ئەو هەڤاڵانەی کە ئامادەییان تیا نیە، یان مەترسی گرتن‌و راونانیان لەسەرە".[1]

رەنگە هەڵەی چاپ بوبێ، ئەگینا دەبوایە بنوسرایە (ئەو هەڤاڵانەی ئامادەییان تیا هەیە) نەک (تیا نیە). مەبەستە سەرەکیەکە چۆنیەتی باسکردنی بڕیاری شۆڕشە.. پێشتر دەنوسێ نامەی مام جەلال بۆ کۆمیتەی شارەکان‌و کۆمیتەی هەرێمەکان هاتووە. بۆئەوەی گومڕاییەکە بۆ بڕیاری شۆڕش دروستبکات، دەڵێ (کۆمەڵە لە بڕیاریدا) ناڵێ (کۆمیتەی هەرێمەکان لەگەڵ مام جەلال رێکەوتون‌و بڕیاریانداوە). ئەمە فێڵە لە خوێنەر.

## ( ٢ )
## وا، مەفرەزەکان نەنێردراون!!

لەم باسەدا، دوای ئەوەی پەیوەندی بە مام‌و بڕیاری بەرپاکردنی شۆڕش، دەکاتە کاری هاوبەشی (کۆمیتەی شارەکان‌و هەرێمەکان) بۆئەوەی خوێنەر باوەڕی پێبکەن، زانیاری بێسەروبەر (کەمێکیش راست) دەنوسێ. کورنۆلۆژیای ناردنە دەرەوەی مەفرەزەکان، لە لاپەڕە (١٨٦)دا ئاوها باسدەکات:

"لە سوریاشەوە سەرکردایەتی یەکێتیی بڕیاری دابوو، یەکەم دەستەی چەکدار لە سوریاوە بەبۆنەی تێپەڕبوونی ساڵێک بەسەر دامەزراندنی یەکێتییدا واتە لە ١٩٧٦/٦/١ دا بنێرێتەوە کوردستان، هەمویان ٣٧ پێشمەرگە بوون، بە فەرماندەیی نەقیبی فڕۆکەوان (ئیبراهیم عەزۆ)".

ئەمەیان راستە. بەڵام دیسان نایەوێ باسی ئەوە بکات، کە برایم عەزۆ، راسپێردراوە تەنها پەیوەندی بە کۆمیتەی هەرێمەکانەوە، لە رێگەی شازاد سائیبەوە بکات. پێشمەرگەیەکیان بەناوی (عەلی عەبداڵ- دهۆکی) نامەکەی گەیاندبوو. (مەلا بەختیارو ئازادی سەگرمەو کەمال محەمەد ئەمین-خانەقین) چوین بەپیر نامەکەوە. مەخابن، رێک لەوکاتەدا پارتی پەلاماری دابون‌و گیرابون‌و دوایی شەهیدیش کران. ئەمەیان دێزە

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(١٨٦).

بەدەرخۆنە دەکات، چونکە بەڵگەیەکی گرنگە کە کۆمیتەی هەرێمەکان شۆڕشی کردووەو دەستەی دامەزرێنەریش، تەنها لەگەڵ کۆمیتەی هەرێمەکاندا، لەسەر بەرپاکردنی شۆڕش رێکەوتون. لەمبارەوە لە تێزی دکتورای (د.ئەحمەد حەمەئەمین)دا هاتووە:

"دوای ئەوەی سەرکردایەتی کۆمەڵە لەناوەوەی وڵاتو سەرکردایەتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەدەرەوەی وڵات. رێککەوتن لەسەر هەناردەکردنی هێزی چەکدار بۆ ناوچە شاخاویەکانو دێهاتەکان".[1]

نوسەر ئەو دەقەی سەرەوەی لە سەرچاوەی (هەواڵنامەی خەباتی شۆڕشگێرانەی گەلی کوردستانی عێراق لەماوەی دوو ساڵدا. مایسی ١٩٧٨. ل٢٦-٢٨) وەرگرتووە، لەکاتێکدا کە نوسەری (چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە) دوای ئەوکاتە دێتە دەرەوە.

بەم دەقە ئاماژەپێکردنەی هەواڵنامە، دەبوایە هیچ قسەیەک بۆ لەوەبەدوای نوسەر، نەمابا. چونکە کاتێک (هەواڵنامە) لەلایەن نەوشیروان مستەفاوە، بەئاگاداری مام جەلال دەنوسرا، هەرگیز ئەو شایەتیەیان بۆ کۆمیتەی هەرێمەکان نەدەنوسی، ئەگەر خۆیان ئاگاداری ئەو راستیە نەبان! لەبەرئەوەی نوسەر، دەیەوێ خووە سایکۆلۆژیەکەی دابمرکێنێتەوە، سەرەڕای زانینی ئەو راستیانە، کە بەڵگەی حاشاهەڵنەگرن، روداوەکان هەر ئاوەژوو دەکات.

لەسەر چۆنیەتی ناردنەدەرەوەی مەفرەزەکانی تر، جارێکی دیکە راستیەکان تێکدەداتو دەیەوێ وای بگەیەنێت، خۆی بڕیاردەر بوەو هەر خۆیشی وردو درشتی چلۆنایەتی پێکەوەنانو ناردنەدەرەوەی چەندین مەفرەزە دەزانێ. لەمبارەوە ئاوای دەگێڕێتەوە:

"لە ناوچەی حاجی ئۆمەران: دەستەیەک پێشمەرگەی شۆڕشی نوێ پاش ئەوەی لە ١٩٧٥/٨/٣٠ پەیوەندی بە کاک عومەر دەبابەوە دەکەن، لە ٢٥،٢٦/١٩٧٦/٥دا رووەدەکەنە شاخ بە رابەری مەلا شیمەی حاجی ئۆمەرانیو حاجی شێخەی بنێرە. ئەمانە سەرەتا سەر بە یەکێتیی بوون. بەڵام پاش ماوەیەک، کە نە عومەر دەبابە و نە کەسی تری یەکێتیی و کۆمەڵە دەبینین پەیوەندی بە پارتیەوە دەکەن. جگە لە حاجی شێخەو چەند پێشمەرگەیەک کە تا مانگی ١٩٧٨/٧ لێپرسراوی دەستەیەک بوو، لە هەرێمی پارێزگاری".[2]

---

١ د.ئەحمەد حەمەئەمین. رەوتی چەپ لە باشووری کوردستان، کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان نموونە. ٢٠١٦- هەولێر- چاپخانەی رۆژهەلات. ل(١٣٨).

٢ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(١٨٦).

جاری، پێش ئەو مەفرەزانە، مەفرەزەی شەهید مەحمود سەیدەو قادر خەبات، دوو مانگ پێشتر چونە دەرەوەو خۆیان مات دا. هەتا باقی مەفرەزەکان دەستپێدەکەن. مێژووی چونە دەرەوەیان ١٤/ی نیسانی ١٩٧٦. گەیشتنە کوێستانی مێرگانە-بناری قەندیلو لەڕێگەی هاوڕێیانی هەولێریشەوە (شەهید عەبدولرەزاق) کۆمیتەی هەرێمەکانیشیان ئاگادار کردەوە. دەستبەجێ هەواڵمان بۆ ناردن، بە هیچ چەشنێک بەرنامە لە ئێمە تێکمەدەن، خۆیان قایم بشارنەوە، هەتا مەفرەزەکان دەنێرینە دەرەوە. لە هەواڵنامەی کوردستانی عێراق -یەکەمین هەواڵنامەی شۆڕشی نوێ- ئاماژەی جوان بەو مێژووەی چۆنیەتی چونەدەرەوەی مەفرەزەی ناوبراو کراوە، کە دوو مانگ پێش چونەدەرەوەی ئەو مەفرەزانەیە نوسەری (چەپکێک) ریزی کردون. لەهەواڵنامەدا بەمشێوەیە هاتووە:

"٢٣/ی مایسی ١٩٧٦:

دوژمن دەستی کرد بە گرتنو گواستنەوەی هەندێک خێزانی دانیشتوانی ناوچەکانی حاجی ئۆمەرانو باڵەکایەتی بۆ خوارووی عێراق، خەڵکی ناوچەکە بڕیاری بەرگری کردنیان دا، عەلی کۆ و ئەحمەد نەبی کە ئاگاداری هەندێک جموجوڵی شۆڕشگێڕانەی ی.ن.ک بوون لەناوچەکەدا، بە فێڵو تەڵەکەبازی بۆ لەباربردنی ڕاپەڕینی چەکدارانە بێ ئاگاداری لێپرسراوی ناوچەکە چەکیان بە هەندێک لە پ.مو دۆستانی یەکێتی دەرهێناو ناچاریان کردن بێ هیچ تەگبیرو پیلانێک بدەنە شاخ".[1]

ئەم هەواڵەی هەواڵنامە کوتومت، بۆچونەکانی ئێمە دەسەلمێنێ.

مێژووی کۆن بەبێ بەڵگە باوەڕی پێناکرێ. کە بەڵگەکانی مێژووی دێرین، زۆر کەمن. هەندێک تێکستی شیعرو داستانو هەڵکۆڵینی وێنە داتاشراوەکاندان. یان دۆزینەوەی پاشماوەی شوێنەوارەکانن. هاوکات دۆزینەوەی نوسینی بزماری، سانسکریتی، سۆمەری، بابلی، ئارامیو فیرعەونییە..تاد. دەمێکیشە، داستانو میتیۆلۆژیاش، وەکو سەرچاوەی هەندێک ڕوداوی مێژوویی هەرە دێرینە، سودیان لێوەردەگیرێ. چ جای بۆ نوسینی مێژووی نوێو لەم مێژووەشدا، ڕوداوەکانی شۆڕشی نوێ.. کە چاپەمەنیەکانی هەنو ساڵەهایە چاپیش دەکرێنەوە.

بەبێ ئەوەی ئاماژە بە بەڵگەیەک بکات، یان نامەیەک بڵاوبکاتەوە، دەیەوێ قەڵەمی ڕقەکەی بکاتە مێژووی ڕاستەقینە. هەواڵنامە دەیسەلمێنێ کە کۆمیتەی هەرێمەکان پێش

---

١ هەواڵنامەی کوردستانی عێراق. یەکەمین هەواڵنامەی شۆڕش. ئامادەکردنی: نەوزاد عەلی ئەحمەد. ئەکادیمیای هۆشیاریو پێگەیاندنی کادیران- سلێمانی-٢٠١١. ل(٤٠).

هاتنەوەی شەهید برایم عەزۆو هاوڕێکانی، لە باڵەکایەتی، مەفرەزەکان داویانەتە شاخ. دوای هەفتەیەک، بەبێ ئاگاداری کۆمیتەی هەرێمەکان، لە کاتو گەیشتنی پێشەنگی مەفرەزەکانی کەمپی قامیشلو، لە ١/ی حوزەیرانی ١٩٧٦ لەسەر روباری (هیزل) لە پشتی زاخۆ، برایم عەزۆو دەستە چەکدارەکانی شەهیدان (١- عیزەت ئیسماعیل شەنگاری. ٢- عومەر برایم رەشید. ٣- جەباری مەلا غەنی سندی) یەکدەگرنەوەو ئەرکو فەرمانەکانیان دابەشدەکەن.[1]

بۆ کوت‌ومت زانینی کۆرنۆلۆژیای (زنجیرە مێژووی رووداوەکان)ی ناردنی مەفرەزەکانی تر، هەر لە هەمان ژمارەی هەواڵنامە، رۆژژمێری چونەدەرەوەی مەفرەزەکان، وەکو خۆیان باسدەکەین (ئەوەی نوسەر زۆربەی هەڵەیە).

-٢٧/ی حوزەیران؛ مەفرەزەی شـارەزوور: شێخ عەلی، حەمەسەعید حەمەئەمین (د.رەزا) عەلی شیعە، شەوکەتی حاجی موشیر، محەمەدی حاجی مەحمود، حامیدی حاجی غالی. چونە سورێن‌و دەوروبەری. (بەندە سەرپەرشتی ناردنەدەرەوەم کردوون).

-٢١/ی حوزەیران؛ دەستەیەکی چەکداریی بە فەرماندەیی جەمالی عەلی باپیر لە جافایەتی، لەگەڵ یەکەمین بەرپرسی مەفرەزەکانی کۆمەڵە-یەکێتی، سالار عەزیز چونە دەرەوە.

-٢٩/ی حوزەیران؛ دەستەیەک بە فەرماندەیی ملازم جوامێر، سایە میر لە شارباژێر پێکهاتووە.

-١٤/ی ئابی ١٩٧٦؛ شەهید د.خالید سەعید، عومەر دەبابە، شەهید سەعدی گچکە، سەید کاکە، شەهید یاسین قادر، جەعفەر ئەسوەد، جەوهەر سەعید گەیشتنە ئیندزی- قەندیل.

-١٨/ی ئاب؛ شەهید عەلی عەسکەری، شەهید تایەری عەلی والی، لەگەڵ شەهیدان ئەحمەد چەقۆی، باهر ئەحمەد، سـەلاح سەعید، زیرۆ عەبدوڵلا، لە تەنگی "مادین" یەکیانگرتەوە.

-٣/ی ئەیلولی ١٩٧٦؛ شەهیدان: ئەنوەر مەجید سوڵتان‌و سیروان تاڵەبانی، شێخ مەحمود، حسێن کەریم، شەهید تایەری حاجی عەزیز، شەهید ئەنوەر تۆفیق (سۆران هەورامی) مەفرەزەکەیان پێکەوەنرا!

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل(٤٠)

منیش سەرپەرشتی ناردنەدەرەوەی مەفرەزەکانی قەراغ، بازیانو گەرمیانم خرایە (ئەستۆ) لە١٩٧٦/٨/٥، شەهیدان، گۆران تلەزەیتی، مامۆستا محەمەد ئەمین (شەماڵ) حسێنە سور، ئەبوبەکر قەرەداخی (شەهید ئاشتی)و مامۆستا هێرش (خوشکەزای شەهید شەماڵ)و نەجمەدینی فەقێ عەبدوڵڵا (فەرهاد)و سۆرانی خوشکەزای ئەبو شیهاب. بە دوو گروپ نێردرانە دەرەوە.(*)

## (٣)
## برایم خەلیلو عێراقچی!!

بە چەپو راست، رقی خۆی بەناو عێراقیەکان دەڕێژێ. هەموو ئەوانەی نوسەریان بە بەرپرسی کۆمەڵە نەزانیووە، یان بە کەسێکی ئاژاوەگێڕیان ناسیووەو ئامادە نەبون گوێی لێبگرن، ئەم هەوڵ دەدات بە تۆمەتی عێراقچێتی، رقیان پێ بڕێژێ. ئەمە لەکاتێکدا، تەنها لەسەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵە، چەند تێکۆشەرێک، بەئاشکرا، باوەڕیان وا بوو حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاری لەسەر بنەمای یەکێتی چینی کرێکار، لە یەک وڵاتدا دادەمەزرێ، نەک کوردستانی، خۆیان جیاکردەوەو برایەوە.(١) ببڕای ببڕ، لەدوای ئەمانەوە، نە کەسێکو نە رەوتێکو نە جیابونەوەیەک، بەناوی پارتی پێشڕەوی کرێکارانی عێراق، لەئارادا نەبووە. هەتا سەرهەڵدانی کارو رەوتی کۆمۆنیست، لەدەرەوەی کۆمەڵە!

ئەوەندە پەنگی بەم رقەی عێراقچێتیەوە خواردووە، سەرو بنی زمانی دژی ئەم رێبازە دەگێڕێ. کەچی لە یەکەمین هەلدا، کە بۆی هەڵکەوت، لەدوای روخاندنی بەعس، خۆی بۆ

---

* ملازم جوامێر، ملازم ئەنوەری مەجید سوڵتان، عەلی شامار، شێروان شێروەندی، سیروان تاڵەبانی، مامۆستا شەماڵ، گۆران تلەزەیتی، ملازم عومەر، حەمەسەعید قەڵەو، ئەبو شیهاب، نەجمەدینی فەقێ عەبدوڵلا، شەهید ئازاد هەورامی.. من بەرێم کردنە دەرەوە.

١ ئەو هاوڕێیانە: ١- فازیلی مەلا مەحمود. ٢- شێخ ئەشرەف. ٣- فوئاد قەراغی. ٤- سلێمان عومەر حەسەن. ٥- وشیار محەمەد ئەحمەد بەرزنجی. ٦- عەبدولرەحمان سدیق قەراغی (گۆران قەراغی). ٧- فەوزی مەلا مەحمود. ٨- سەردار حەسەن سیوسێنانی. ٩- زاهیر باهیر مەردۆخی. ١٠- پرشنگ مامەند ژاژڵەیی. ١١- عەبدوڵلا موعتەسەم دەباغ. ١٢- حەسەن حەمەخان ئەمین (حەسەن جاف). ١٣- شیروان شێخ نوری. ١٤- شەماڵ شێخ جەمال. بڕوانە: "بە خەونی گەورەوە کەوتینەڕێ. مامۆستا جەعفەر (فازل کەریم ئەحمەد). چاپی یەکەم.٢٠١٩. ل(٤٢٧)".

پەرلەمانی عێراق کاندید کرد!! ئێستاش بە مۆڵیی موچەی خانەنشینی پەرلەمانی عێراقچی وەردەگرێ!!

بینی بەو رقەوە گرتووە. تەنانەت، کۆمەڵەی رەنجبەران، کە دوای هەڵهاتنی سەرکردایەتی کۆمەڵەو چونیان بۆ ئێرانو تەسلیمکردنەوەیان بە عێراق، لەسەر هەڵەی ئایدیۆلۆژیو سیاسی کۆمەڵە، پێش پێکەوەنانی کۆمیتەی هەرێمەکانیشو دوای ئەوەش، بەڵگەیەک لەسەر (عێراقچێتی)یان نادۆزرێتەوە. کەچی ئەم زاتە، گوێ بەو راستییانە ناداتو خوی شیری تەرک ناکات!!

سەراپا رەنجبەرانم قبوڵ نەبووە. لەسەر بڕیاری شەهید ئارام، یەک دانیشتنیشم لەگەڵدا کردون، وەکو چەند هاوڕێیەکی تری تەجمیدکراو، داوام لێکردون، بگەڕێنەوە ناو کۆمەڵە (لەگەڵ برایم خەلیلو برایم حەسەن، شەهید شامیل لەگەڵم بوو، دانیشتین) لەو دانیشتنەدا، دوای مشتومڕێکی گەرم، رێکنەکەوتین، بەڵام بەتاوانیشی دەزانم برایم خەلیل، دوای شەهید بونیشی، تۆمەتی بۆ هەڵببەستێ. نوسەر لە لاپەڕە (١٨٧)دا بەمشێوەیە پەلاماریان دەدات:

"مەفرەزەکەی (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان)، باڵێک بوون، رێبازی عێراقچێتیان لەناو کۆمەڵەدا هەبوو، بە خەت مائل کاریان دەکرد بەسەرپەرشتی ئیبراهیم خەلیلو ئیبراهیم حەسەن، کە ئەوانیش لە مانگی ١٩٧٦/٦دا لەناوچەی هەڵەبجە بەسەرپەرشتی ئیبراهیم خەلیل دەستەیەکی چەکداریان پێکهێنا".[1]

ئەمانە، عێراقی نەبوون. خەت مائیلیش نەبون. بەڵام رەخنەیان هەبوو. رەخنەکانیان کەمەندکێشی کردن بەرەو نائومێدی بە سەرکردایەتی کۆمەڵە، پاشان دژی کۆمیتەی هەرێمەکانیش درێژەیان دایە. ژمارەیەک تێکۆشەرو کادری باشی کۆمەڵەشیان لەگەڵ کەوت. شەهیدیشیان لەزینداندا بەخشی. خۆیشیان بەجوانی رێکخستبوو. رۆژنامەیەکیان بە دەستنوس بەناوی "رەنجدەران" دەردەکرد. هەڵە بوبن یان نا، ئەمەیان لە خانەی خۆیدا، هەتا بەڵگەو نوسینەکانیان دەستنەکەوون، یان ئەوانەی لەگەڵیاندا بون، کە ئێستاش هەندێکیان ماوون، تا ئێستاش دانیان پیا نەنابێ کە عێراقی بوبن، بە چ مافێکەوە، نوسەری (چەپکێک) چەپۆکی عێراقی بون، دەکێشێ بەمانیشدا؟!

ئەگەر عێراقی بونایە، بۆچی شەرمیان دەکرد رایبگەیەنن؟ یان بۆ نەچون لەگەڵ پارتی کۆمۆنیستی عێراق –قیادەی مەرکەزی- کە لەناو شۆڕشدا شەهید فازیلی مەلا

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(١٨٧).

مەحمودو هاوڕێكانی نوێنەرایەتی دەكردن، لەهەمان كاتدا كە برایم خەلیل چووە ریزی شۆڕشەوە، كار بكەن؟ بەپێچەوانەوە لە شارەزوور خۆیان گەیاندۆتە مەفرەزەكانی كۆمەڵە.. هەتا شەهیدیش كران. كێ رێی لێدەگرتن خۆیان بە عێراقی رابگەیاندایە. خۆ ئەوكاتە، نە شەهید ئارامو نە سالار عەزیزو نە هیچ فەرماندەیەكی تر، بیروڕای ئازادیان سەركوت نەدەكرد. بەڵكو رێزیان لێدەگیرا، هەروەكو قیادەی مەركەزی (وحدة القاعدة)، خەڵكی تریش!

مرۆڤ، كە ئەم نوسینانە، بەم هەڵبەستنانە دەخوێنێتەوە، بەزەیی بە درێژەكێشانی نەخۆشییە دەرونیەكانی نوسەردا دێتەوە، كە نازانیو ناتوانی، رقە دەرونیەكانی پەنا بدات. نە هاوڕێكانی فریای كەوتونو نە خۆیشی توانیویەتی لـەدەرەوەو كوردستاندا نەخۆشیەكەی چارەسەر بكات.

## ( ٤ )
## سیروان تاڵەبانیو سەركردایەتی

لە كەركوكدا، دەبێتە هاوڕێی شەهید سیروان تاڵەبانی. سیروان، من لەساڵی (١٩٧٤) وە، لە دێی (مەحمود قەجەر) ناسیمو لەكاتێكدا خیانەتنامەی جەزائیر كرا، شەهید سیروان خاڵە شیهابی دەناسی، ناردمان بۆ پێنجوێن بەسەركردایەتی كۆمەڵە بڵێ، كۆمیتەی خانەقین، لەسەر راسپاردەی سەركردایەتی، زۆر بە چاكیی خۆمان بۆ بەرگری ئامادە كردووە. رۆشتو (١٩٧٥/٣/٢٣) بە بڕیاری بەرگرینەكردن گەڕایەوە. ئەمە بڕیارێكی سەخت بوو. بەڵام بڕیاری سەروی خۆمان بوو، جێبەجێمان كرد. ئەوساو ئێستاش، ئەو پاساوانەی بۆ درێژەپێنەدانی شۆڕش لەلایەن بارزانیو بێهەڵوێستی سەركردایەتیو فەرماندەكانی شۆڕشەوە دەهۆنرێتەوە، ناچێتە ئەقڵم. چونكە لەچوارچێوەی هەمان هەلومەرجی جیهانیو ئیقلیمیو ناوخۆییدا، كە شۆڕشیان تیادا بڵاوە پێكرد، دوای دامەزراندنی یەكێتی، چۆن قیادەی موەقەتە-پارتی، دامەزراو چۆنچۆنی ئەوانیش هاوكاتی یەكێتی بڕیاری دەستپێكردنی پارتیزانییان دا؟ مادام توانییان لە دۆخی نەشیاوتردا دەستپێبكەنەوە، كەواتە، دەشیانتوانی لە دۆخی شیاوتری دوای رێكەوتی ٦/ی ئازار، درێژە بە بەرەنگاری بدەن.

له هەمانکاتدا، تائێستاش پاساوەکانی کۆمەڵە ناچێ بەئەقڵما، کاتێک دڵنیابون سەرکردایەتی (پارتی-بارزانی) بەرەنگاری ناکات، ئەی کۆمەڵە بۆچی بڕیاری بەرەنگاری نەدا؟ هەرچی لەمبارەوە نوسراوە، وتراوە، داتاشراوە، هەڵە بووە.

سەرکردایەتی کۆمەڵە، هەموی سەلامەت بون، چەکو تفاقی زۆریان لەبەردەستدا بووە. وەکو "فەرەیدون عەبدولقادر" دەڵێ:

"نامەیەکی هەڤاڵ مام جەلالیش هاتبوو کە داوای خۆسازدانی ئەکرد بۆ بەرگری".[1]

مام جەلالیش دەیگێڕێتەوە کە:

"لە ٢٧/ی مارتی ١٩٧٥دا هێرۆی خێزانم ناردەوە بۆ کوردستان. هێرۆ گەیشتەوە، تەلەفۆنی بۆ کردمو گوتی: هەموو شتێک تەواو بووەو بڕاوەتەوە. ئەگینا من بەتەمابوم لە ٢٩/ی مانگدا بگەڕێمەوە".[2]

ئەو قسەیەی کاکە فەرەیدون، لەناو کۆبونەوەی سەرکردایەتی کۆمەڵەدا باسکراوە، کە لە گوندی (کێلێ)ی پێنجوێن بۆ بەرەنگاری دانیشتون. ئامادەبوانیش: (خاڵە شیهاب، عەلی بچکۆل، عومەری سەید عەلی، ئاوات عەبدولغەفور، حەمەی میرزا سەعید، شەهید عەبدولرەزاقو فەرەیدون عەبدولقادر) بون. جگە لە هاوڕێ کاریگەرەکانی ئەوکاتەی کۆمەڵە، لەوانە: (ئەرسەلان بابیز، ئەنوەر شاکەلی (فەرهاد)، حەمیدە سوور، عەلی مغاویر، کەمال عەلی، وەستا کەمال، ئازاد هەورامی، سادق، مامۆستا ئەمین، سیروان تاڵەبانی، بێستون..) لە دیداری راوێژدا ئامادە بون.

تا ئێرە، سەرگوزشتەکە ئاساییە. لە درێژەدا دەنوسێ:

"هاوڕێکانمان ئامادەبوون بۆ بەرگری. خاڵە شیهاب سوور بوو لەسەر بەرگری".[3]

نامەی مام جەلال بۆ بەرگری پێیانگەیشتووە. شیهابی شێخ نوریو کۆمیتەی سەرکردایەتیو کادرە پێشکەوتوەکان، سوور بوون لەسەر بەرگری. ئەی کێ بون ئەوانەی دژی بەرگری بون؟ ئایا ئەم دژانە، بۆچی کاریگەرییان لە نامەی مام جەلالو سوربونی شیهابو زۆربەی کۆبونەوەکە، زیاتر بووە؟

بەپێی گێڕانەوەی (ئاوات عەبدولغەفور) ئەندامی سەرکردایەتی ئەوکاتەی کۆمەڵە بێ،

١ فەرەیدون عەبدولقادر. بیرەوەریەکانم لەگەڵ خاڵە شیهابو هاوڕێکانی. لەبڵاوکراوەکانی رۆژنامەی کوردستانی نوێ. چاپخانەی شەهید (ئازاد هەورامی) چاپی یەکەم ٢٠١١. ل(٤٥).

٢ مام جەلال. دیداری تەمەن- لە لاوێتیەوە بۆ کۆشکی کۆماری. ئامادەکردنی: سەلاح رەشید. ل(٢٩).

٣ فەرەیدون عەبدولقادر. بیرەوەریەکانم لەگەڵ خاڵە شیهابو هاوڕێکانی. لەبڵاوکراوەکانی رۆژنامەی کوردستانی نوێ. چاپخانەی شەهید (ئازاد هەورامی) چاپی یەکەم ٢٠١١. ل(٣٥).

شەهید شیهابو چەند کەسێک چونەتە لای شەهید فەتاح ئاغا.. سەرگوزشتەکە ئاوهایە:

"چوینە لای فەتاح ئاغا، کاک شیهاب پێی وت با یەک دوو هەزار چەکدار کۆبکەینەوە.. بەڵام فەتاح ئاغا وەڵامی دایەوە، سەرکردایەتی ئێمە بەڵێنی ئەوەی پێدراوە ١٥٠ سەدوو پەنجا هەزار چەکدارمان بۆ مەشق پێ بکەن لە ئێرانو لە هەلومەرجێکی تر دێینەوە. ئیتر کاک شەهاب توورە بوو و هاتینەوە، ئەمەش زۆر کاریگەری لەسەر کاک شەهاب هەبوو، بۆیە شەو وتی بەرگری ناکرێتو دەڕۆینەوە ناو شار".[١]

سەیرە، ڕێکخراوێکی مارکسیستی ماویستی خاوەن ستراتیژی شۆڕشی درێژخایەن، چەند مانگێک پێشتر، بەیاننامەی ناوخۆی دەرکردووە: ئەگەر سەرکردایەتی خێڵەکی-بارزانی، سازش لەگەڵ حکومەتدا بکات، کۆمەڵە بەرگری دەکات. واتا: بەرگری بەرامبەر ڕێکەوتنی سازشکارانەی پارتی-بەعس. کەچی پارتی، کۆتایی بە شۆڕش دێنیو کارەسات دەقەومێ. هەرەسێکی سیاسیو عەسکەریو سایکۆلۆژی ڕودەدات. پێشمەرگەو خەڵک، ڕقیان لەو بڕیارەی پارتی هەستاوە. هەزاران چەک فڕێدراوە، بەڵام بە قسەیەکی فەتاح ئاغا، گوایە ئێران مەشقیان پێدەکاتو لەهەلومەرجی تردا دێنەوە، بەبێ ئەوەی کۆبونەوەی تر بکەن، یان بەیاننامەیەک بۆ ڕونکردنەوەی بڕیارو هەڵوێستی کۆمەڵە دەربکەن، خاڵە شیهاب تورە دەبێو دوای بڕیاری یەکەمی بەرگرینەکردنی سەرکردایەتی بارزانی، بڕیاری بەرگرینەکردنی دووەمی سەرکردایەتی کۆمەڵە- شیهابی شێخ نوری دەدرێ.

## (٥)
## دوڕیانی کۆڵنەدانو هەڵەداوان

شەنوکەوی ئەو دۆخە هێشتا پێویستە. لەناو هاوڕێیانی جارانی کۆمەڵەدا، مقۆ مقۆ تا ئێستاش لەسەر ئەو بڕیارە نەبڕاوەتەوە. لێکدانەوەکان ساغنەکراونەتەوە. بۆچونی من سەبارەت بە کۆمیتەی هەرێمەکانو شەهید ئارام، لە هەموو کەسێک ڕونترە. لە شاخو دوای ڕاپەڕینیش، هەموو ساڵێک، بە دەستپێشخەری ئێمە، بەیاننامە بۆ (ساڵڕۆژی شەهید ئارام) دەرکراوە. یەکەمین ساڵڕۆژیشی، لەشێنیو لەسەربانی مەقەڕەکەی برایم جەلال سازمان دا. سەرپەرشتی چاپی بەرهەمی یەکەمی بەرهەمەکانیمان کردو

---

١ ڕەوتی چەپ لە باشوری کوردستان- کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان نموونە. ل(٩٤).

پێشەکی چاپی دووەمیشمان نوسی. هەموو ساڵێکیش، یان لەسەر ئارامگاکەی ئارام، مەراسیم ڕێکدەخەین، یاخود لە هۆڵێکدا، بە باسکردنی لایەنی جۆراوجۆری ژیانو خەباتی، یادی دەکەینەوە. سەرپەرشتی زۆربەی یادەکانی شەهید شیهابیشمان کردووە. یەکەمین جاریش لە گوندی سێگردکان لە مزگەوتەکە یادمان کرد. کتێبی (لەسێدارەوە بۆ ڕاپەڕین) لەسەر شەهید شیهاب، ناونیشانەکەیو سەرپەرشتی بابەتەکانی، ئێمە کردمان، کتێبی شەهید عەلی عەسکەریش هەروەها. بەڵام جاروبار دەمبیست، گوایە لەبەر تێزی سێجیهان سەرکردایەتی کۆمەڵە، بەرگری نەکردووە. چونکە، بەپێی ئەو تێزە، عێراق دۆستی سۆڤیەت بووەو لە ناکۆکبەندی[*] دەوڵەتەکاندا، نابێتە ناکۆکی سەرەکی. ئەم بۆچونەم پێ ڕاست نییە. چونکە، ماوەیەکی کەم گفتوگۆ کەوتە ریزەکانی کۆمەڵە لەسەر تێزی سێجیهانو کۆتایی پێهێنرا. تەنانەت یەک بڕیارو پەخشنامەیەکی ناوخۆش، لەوبارەوە دەرنەکراوە (هێندەی من ئاگادارم). ئەوەی من لێکیدەدەمەوە، ئەوەیە کە: سەرکردایەتی کۆمەڵە، لە پێشەوەدا شەهید شیهاب، لەئاستی لێکدانەوەی هەمەلایەنەی ڕوداوەکەی خیانەتنامەی جەزائیر نەبون. بایەخی بەرەنگاریشیان بۆ چۆنیەتی درێژەپێدانی خەباتی شۆڕشگێڕانە، وەکو پێویستە لێکنەداوەتەوە. ئەزمونی خەباتی چەکداریو بڕیاری عەسکەرییان نەبوو. کاریگەری سایکۆلۆژی هەرەسەکەش، ڕۆڵی لەسەریان هەبووە. بۆ ئەو قۆناغە، شیهاب پێی وابووە هەر کاتی خەباتی چەکداری نییەو باوەڕیشی بە جۆرێک دانوستان هەبووە. مام جەلال دەڵێ:

"نامەیەکی شەهابی شێخ نوریم بۆ هاتبو ئیشارەتێکم پێکردوە لە باسی کۆمەڵەدا، شەهاب لە نامەکەیدا زۆر مەدحی من دەکاو دەڵێ: ئێستا خەڵک هەموو چاویان لە تۆیە، بەڵام چاویان لە تۆیە بۆ مەسەلەی گفتوگۆ لەگەڵ ڕژێم. باسی لەوە کردبوو ئێستا مەسەلەی مفاوەزاتو ڕێگای مفاوەزات کارێکی خراپ نیە بەشکو تۆ هەوڵێک بدەیت لەگەڵ حکومەتو قەناعەتیان پێبکەیت، دەستبکەین بە گفتوگۆ".[1]

بۆیە، نە لەکاتی هەرەسی شۆڕشی ئەیلولو نە لە سلێمانیش، باوەڕیان بە چونە شاخ نەبووە. دوای چەند کۆبونەوەیەکو هەوڵێکی بێهودە، دەستبەرداری بەرەنگاری بون. بە هەڵەداوان ویستویانە بگەنە شاخ، مام، لێرەدا.. ڕۆڵی سەرکردە بۆ بڕیارە ستراتیژیەکان لە دۆخی چارەنوسسازدا، دەردەکەوێ.

* ناکۆکبەندی: دەستەواژەیەکە لم نوسینەدا دامانتاشی. مەبەست لێی ریزکردنی ناکۆکیە سەرەکیو لاوەکیەکانە.

١ مام جەلال. دیداری تەمەن- لە لاوێتیەوە بۆ کۆشکی کۆماری. ئامادەکردنی: سەلاح ڕەشید. ل(٣٥).

مام جەلال.. کە (٣) ساڵیش لەدەرەوەی کوردستان بووە. چونکە بەتواناو ئەزمونی شۆڕشی ئەیلولی هەبووە. لەناو فەلەستینیەکانیش بووەو لەگەڵیاندا لەکاتی پیلانی ناوخۆییو شکست بەرامبەر هێرشەکانی ئیسرائیل، ژیاوە؛ بۆیە لە دوورەوڵاتیشەوە، دەستبەجێ بە راسپاردەی خۆیەوە، دەرکی دوربینانەی مانەوە لە شاخو بەرەنگاری کردوەو نامەشی بە هێزۆی هاوسەریدا ناردوە، کە بەرەنگاریی بکەنو ئامادەش بووە زوو بگەڕێتەوە. سەرکردایەتی کۆمەڵە بە نامەکەیشیان زانیووەو جێبەجێشیان نەکردووە. گەڕاونەتەوە!

رۆژگـار زۆری نەویست، تـەواوی بۆچونو توانـای سـەرکـردەکـان، لە مەحەکی روداوەکان بدات. دوای شەش مانگ لە هەرەسی شۆڕش، کۆمەڵە بەر شاڵاوی گرتنو راوەدوونـان کـەوت، ئەمەش دووەم تاقیکردنەوەی بێتواناییو توانای سـەرکردایەتی کۆمەڵە بوو، دوای بەرەنگارینەکردن، بۆ لێکدانەوەی دۆخەکەو بڕیاری ستراتیژی. لەم دووڕیانەشدا، هەڵبژاردنی رێی شۆڕشگێڕانە، یان رێی دەربازبون هاتەئارا. سەد مەخابن، رێی شۆڕشگێڕانەکەیان هەڵنەبژارد. پێموایە رێگای چونە شاخیان هەڵبژاردایە، هاوکێشەکان زۆربەیان دەگۆڕان. شەهید شیهاب، فەرەیدون عەبدولقادر، عومەری سەید عەلی، شەهید جەعفەرو عەلی بچکۆل، دەبونە پێنج سومبلی بەرەنگاری گەورە. وردە وردە هەڵەکانی خۆیان چارەسەر دەکرد. کادری زۆری سەرکردایەتیو شادەمارەکانی ناو شۆڕش، کۆمەڵە دەبون. نەوشیروان مستەفاش نەدەبووە سکرتێری کۆمەڵە.. لەناو هێڵی گشتیدا دەمایەوە.

شایەنی باسە، بەدرێژایی ساڵانی دامەزراندنی کۆمەڵە، هیچ پەیوەندییەک لەنێوان شیهابو سەرکردایەتی کۆمەڵە، دوای کۆمیتەی هەرێمەکانو شەهید ئارامیش، لەگەڵ نەوشیروان مستەفادا نەبووە. لەدەرەوە، بچوکترین چالاکیشی بۆ کۆمەڵە نەبووە. تەنانەت ئەوکاتەی کراوەتە دەستەی دامەزرێنەرو لە شامو قامیشلوش بووە. کێشەی لەگەڵ شەهید برایم عەزۆ و هاوڕێیانی کۆمەڵەدا هەبووە. هەندێک لە هاوڕێیانی کۆمەڵە. لەوانە: (عارف کەریم، فەرهاد شاکەلی، برایم عەبدەلیو ملازم سەردار..تاد) لەبەر فشاری نەوشیروانو گوێنەدان بە پرەنسیپو دیسپلینەکان، بەرەو هەندەران رۆشتون. سەرکردایەتی کۆمەڵە لەبری جێبەجێکردنی بەرنامەی چونە دێهاتو پێکەوەنانی مەفرەزە سەرەتاییەکانی سەرەتاتکێی پارتیزانی، هەتا دڵنیابون لە کاتی گەڕانەوەی مەفرەزەکانی کەمپی قامیشلو، کەچی کوێرە رێی ئێرانی شایان هەڵبژاردو خۆیان خستە داوێکەوە، لێی دەرباز نەبون.

چونەدەرەوەی مەفرەزەکانی کۆمەڵە لە (باڵەیانو باڵەکایەتی، شارباژێڕ، جافایەتی، شارەزوور، قەراغو گەرمیان، دەشتی هەولێرو خۆشناوەتی، مەرگە) لەسەر ئەو بنەمایە بوو، مەفرەزەی وشیارکردنەوەی جەماوەر بن، هەتا زەمینە خۆشبێ بۆ گەڕانەوەی مەفرەزەکانی دەرەوە. تەنانەت، هۆکارێکی ناردنی مەفرەزەکانی دەرەوەش (نەک هەموو هۆکارەکان) بۆ ئەوە بوو حکومەت هەموو فشارەکانی نەخاتە سەر چالاکی ڕێکخراوەییو پێشمەرگەیی ناو وڵات. چیرۆکی چۆنیەتی بڕیاردانیان بۆ چونە ئێرانو زیندانو رادەستکردنیان، یەک بە یەک شڵەژانی بڕیاردانی سەیر سەیری تیادایە.

لەو سەروبەندەدا، بە بڕیاری کۆمەڵە، فەرەیدون عەبدولقادر دەچێتە سەردانی مام جەلال بۆ دوا ڕێکخستنی پەیوەندی کۆمەڵە-یەکێتیو دوا بڕیاردان لە چۆنیەتی ناردنەدەرەوەی مەفرەزەکان. هەر لەدەرەوە دەبێ، سەرەتای پەلاماردانی کۆمەڵە دەستپێدەکاتو شەهید ئەنوەر دەگیرێو دەیگێڕێتەوە کە:

"هاوکارێکم پێی وتم: چەند ئەمنێک هاتبوونە سۆراخی تۆ. ئیتر نەوەستام بە وریایی تەواو چووم پرسیار لە هاوڕێ ئەنوەر زۆراب بکەم لە دراوسێییەکیان حاڵی بووم کە گیراوە. سامێکی گەورە پەڵە هەورێکی رەشی ئاراستەی هیواو خەیاڵە خۆشەکانم کرد".

لە درێژەی گێڕانەوەکەیدا، بەناوی خاڵە شیهابەوە دەڵێ:

"وەزعی ئێمە باش نییە هەندێ لە هاوڕێیانمان گیراون، گوێ مەدەرێ تەگبیری لێ ئەکەین. گرنگ دەنگوباس لای تۆیە".[1]

هەر بە زمانی خاڵە شیهابەوە دەنوسێ:

"دوو ئەندامی سەرکردایەتیو دوو کادرمان گیراون.. دیارە لەوانە یەکێک یا زیاتر نهێنییەکانیان درکاندووە".[2]

شەنو کەوی ئەم گێڕانەوانە، بۆ دەرخستنی ڕاستیەکان، کە ساڵەها لەناو کۆمەڵەدا دیزە بەدەرخۆنە دەکران، بەڵکو بە ئاراستەی تری پێچەوانەدا دەبران:

یەکەم: دوای زانینی یەکەم گرتنی دۆستە عەرەبەکە، دەبوو دەستبەجێ شەهید ئەنوەر خۆی حەشاردابایەو هەڵبێ. نەک بێباکی بنوێنێ.

دووەم: هەموو ئەوانەی دۆستە عەرەبەکەیان ناسیووە، دەبوایە دوربخرێنەوە لە شوێنی کاریان،هەتا دۆخەکە روندەبێتەوە. ئەوەتا خودی فەرەیدونیش لە "رومادی" بە

١ فەرەیدون عەبدولقادر. بیرەوەریەکانم لەگەڵ خاڵە شیهابو هاوڕێکانی. لەبڵاوکراوەکانی رۆژنامەی کوردستانی نوێ. چاپخانەی شەهید (ئازاد هەورامی) چاپی یەکەم ٢٠١١. ل(٤٠-٤١).
٢ سەرچاوەی پێشوو چاپی یەکەم ٢٠١١. ل(٤٢).

ڕێکەوت دۆستێکی پێی ڕاگەیاندووە، ئەگینا بچوایەتە فەرمانگەکەی، ئەویش وەکو ئەوانی تر. زووتر دەگیرا!

سێهەم: کاتێک دوو سەرکردایەتی‌و دوو کادر لە یەک هەفتەدا دەگیرێن، ئەمە ئیتر گومان ناهێڵێ، کە یەک یان هەردوو سەرکردەکەو یەک یان هەردوو کادرەکەش، نهێنییان درکاندووە. خاڵە شیهابیش وتویەتی: (لەوانەیە یەکێک یان زیاتر نهێنیەکانیان درکاندووە). لەراپۆرتی شوباتی (١٩٧٦)یشدا، کە دۆخی کۆمەڵە هەڵسەنگێندراوە، هەر هێندە وتراوە. باسی شەهید شیهاب‌و هاوڕێیانی زیندان نەکراوە. ڕاپۆرتەکەش، ئەوساو ئێستاش دەست حکومەت نەکەوتبوو. وتارەکەی باوکی ئاوارە (مەلا بەختیار) جگە لەو قسانەی شەهید شیهاب، هیچی تری تیا نییە.. کەچی هاوڕێیانی زیندان، لەوبارە سایکۆلۆژییە هاتبونە دەرەوە. ئەو راپۆرتی شوبات‌و نوسینەکەی باوکی ئاوارەیان کردە کراسی عوسمان‌و کێشەی هەڵەکانی بەرەنگارینەکردن‌و چونیان بۆ ئێران، بە پشتیوانی مام جەلال‌و نەوشیروان بیر برایەوە.

ئەو قسەیە سەبارەت بە گرتن‌و نهێنی درکاندنی گیراوەکان، بەس بوو، تەواوی کۆمەڵە بخرێتە ئامادەباشیەوە. باقی سەرکردەکانیش لە شار دوربکەونەوەو شوێنی دورەدەست هەڵبژێرن. نەک تەگبیرو رای نەگونجاو، لەگەڵ ئەو دۆخە مەترسیدارەی کۆمەڵە بکەن. لەم کەین‌و بەینەدا، ئێمە "کە لە کۆمیتەی باڵای بەغداد، خانەقین، گەرمیان، کفری بوین، بە ڕێکەوت نەگیراوین. کە فەرەیدون دەنوسێ:

"بڕیار بووە یەکەمین پێنج شەممەی ئەیلولی ١٩٧٥ هاوڕێیان لەماڵی ئەوان کۆبوونەوە بکەن ئەویش دڵی لای هاوڕێکانی بووە هەوڵی داوە بەهەر نرخێ بێ هۆشیاریان بکاتەوە"[(١)]

## ( ٦ )
## بە ڕێکەوت نەگیراین

ئەو هاوڕێیانە ئێمە بوین پێنج شەممان لەماڵی شەهید ئەنوەر کۆدەبوینەوە. فەرهاد شاکەلی لەڕێی هاوسەری ئەنوەرەوە بە گرتنی ئەنوەر زۆرابی زانیبوو، ئەویش دەستبەجێ (١٩٧٥/٩/٥) بە "عەلی شامار"دا هەواڵی بۆ ناردم (واتا دوو رۆژ دوای گرتنی ئەنوەر زۆراب)، بەبێ هیچ بڕیارێکی سەروی خۆم، دەرکی مەترسی دۆخەکەم کرد.

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو، چاپی یەکەم ١١٠٢. ل(٢٤).

زانیم دوو سەرکردە گیرابن‌و کادری تریش، کەواتا: شیرازە پساوە. دوای دوو سەعات بە شوناسنامەی ساختە کە سەلاح نەقشبەندی هاوڕێم بۆی سازدام، خانەقینم جێهێشت بەرەو سلێمانی. بەم بڕیارە، تەواوی ڕێکخستنەکانی خانەقین‌و گەرمیانم پاراست.

شەهید شیهاب فەرمویەتی: وەزعمان باش نییە. گوێ مەدەرێ تەگبیری لێ ئەکەین.

ئەو قسەیە، لەو دۆخەدا، قسەی سەرکردەیە. بەڵام دیسان سەد مەخابن، تەگبیرەکە خراپ کراوە.

بۆئەوەی رونی بکەینەوە کە تەگبیرەکە چۆن خراپ کراوە؟ هەر لە قسەکانی فەرەیدون عەبدولقادرو لە هەمان سەرچاوەو لەهەمان کاتدا، با گفتوگۆی هاورێیانی سەرکردایەتی کۆمەڵە بهێنینەوە، چۆنچۆنی دۆخەکەیان لێکداوەتەوەو بۆچی بڕیاری دەربازبونیان بەرەو ئێران-سوریا، داوە؟

شانۆی سیاسی: ماڵی شەهید بەکری دارتاش. خاڵی فەرەیدون عەبدولقادر.(*) ئامادەبوانی سەر شانۆ: شیهابی شێخ نوری، فەرەیدون عەبدولقادر، عومەری سەید عەلی، عەلی بچکۆڵو مامۆستا جەعفەر.

بابەت: چونە شاخ، یان دەربازبون بۆ دەرەوە.

پەردە دەکرێتەوە، شەهید شیهاب دەدوێ: "وا چاکە ئێوەش لەگەڵ من بن تەگبیر لە هاتنی هاوڕێ ئاوات بکەن".

لێرەدا، سەرنج بدرێ، ئاوات عەبدولغەفور، لەو هاورێیانە بووە، کێشەی لەگەڵ سەرکردایەتی کۆمەڵە هەبووەو لە یەکەمین کۆنفرانسدا، باسی دورخستنەوەی کرا. لە

* دوای رۆشتنی هاورێیانی سەرکردایەتی، من لە هەمان ماڵدا، بە راسپاردەی فەرەیدون عەبدولقادر، خۆم لە هەمان ژوردا، چوار مانگ شاردەوە. کە بەهۆی سالار عەزیزەوە، بە عومەری سەید عەلی ناساندمو ئەویش بە فەرەیدونی گەیاندم. بڕیار بوو فەرەیدون عەبدولقادر دوای چونە شاخ، منیش ئاگادار بکات. هیچ هاورێیەکی تر بەشوێنی منی نەزانیبوو، لەو کومیتەیەی دوای سەرکردایەتی کومەڵە، کارەکانیان دەکرد. کە زانیم سەرکردایەتی کومەڵە چونەتە ئێران‌و گیراوون، زۆر ناخۆشبوو. بۆچی وایان کردبوو؟ بۆ نەچونەتە شاخ؟ سەرلێشێواوی لەناو کومەڵەدا بۆ دروستبوو؟ لەرێی شەهید بەکر دارتاشەوە (عوسمان نانەوا)م پەیدا کرد. ئەویش زۆری پێنەچوو، گیرا. دوای گرتنی عوسمان، من ئیتر چووم بەقوتا. هەتا دوو مانگیش نەجولامو چاوەرێی دۆخەکەم دەکرد. پاشان کاک سالار عەزیزم دۆزیەوەو کەوتینە تەگبیر. من ئازاد هەورامی‌و شەهید عەبدولرەزاقیشم هێنایە سلێمانی. تەکلیفمان کرد، شەهید ئارامیش بێتە کۆبونەوە. کە ئەوکاتە شەهید ئارام‌و فوئادی مەجید میسری، تەنها کاری روناکبیرییان بۆ کومەڵە پێ سپێردرابوو. سالار عەزیزیش، سەرەرای ئەوەی کادرێکی ناسراوی قوتابیان‌و کومەڵەش بوو، بەڵام بەرەسمیی بەرپرسی هیچ ئۆرگانێک نەبوو. بیری جیاواز و رەخنەی لە سیاسەتی کومەڵە هەبوو.

هەمانكاتدا، سالار عەزیزو فوئادی مەجید میسریو شاسوار جەلالیش، لەسەر بیری جیاواز، خۆیانو چەندین كادری تری كۆمەڵە دورخرابونەوە. وەكو: ئازادی مەلا، بەختیار شاڵی، برایم خەلیل، بەختیار مستەفا عارف، جەبار مستەفا، سەلاح حسێن ئەفەندی، هیوا رەئوفو ئاسۆ رەئوف. بەڵام دەركەوت ئەو بڕیارانە چەند هەڵە بوون.

لێرەدا بەجوانیی دەردەكەوێت، كە ئاوات عەبدولغەفور دورخراوەتەوەو بەقسەشی نەكردوون. بەڵام شیهاب، بە وریایی باسی دەكاتو دەیەوێ بە تەگبیری هەمویان، بیهێننە لای خۆیان. ئەمە رەنگدانەوەی كێشەكانی ئەوكاتەی هەناوی كۆمەڵەیە. هەر لەسەر قسەی فەرەیدون لەناو شانۆكەدا بەردەوامینو دێتە سەر گرنگترین بڕیار، كە ئیتر گرێكوێرەكانی چۆنیەتی رۆشتنی هاوڕێیانی سەركردایەتی دەكرێتەوە. فەرەیدون ئاوای دەگێڕێتەوە:

"لەسەر قسەی مام جەلال ئەبێ منو ئاوات بچین كەواتە ئێوەش وەرن با رێكخستن سەلامەت بێ پاشان لەوێوە پاش تەگبیری تەواو هەموو پێكەوە ئەدەینە شاخ. مشتومڕ زۆری خایاند لەئانجامدا پێكەوە روومانكردە شاربازێڕ تا لەئێرانەوە پەیوەندی لەگەڵ سەفیری سوریا بكەین بۆ گەیشتن بە هەڤاڵ مام جەلال".[1] [+]

ئەم بۆچونە هی فەرەیدونن، لە كۆبونەوەی رەسمیو لە دۆخی لیقەومانی كۆمەڵەدا. دۆخێك، هەمان ساڵ، خۆیو هاوڕێی تریش سەفەری شامیان كردووە؛ كۆمەڵە چۆتە ناو یەكێتی؛ بڕیاردراوە لە یەكەمین یادی یەكێتیدا شۆڕش بكرێتەوە. لەبری ئەوەی پەلاماردانی كۆمەڵە بكەنە هەل بۆ جێبەجێكردنی بڕیاری شۆڕش بەرپاكردن، كە سەرەتا دەیانتوانی چەند مانگێك خۆیان بشارنەوە. پەیوەندی بە مام جەلالەوە بكەن. پاشان لە ئانو ساتی بڕیارلێدراودا، شۆڕش رابگەیەنن. با دیقەت بدەینو بزانین ئەو بڕیارە، كە فەرەیدون خۆی دانی پیا ناوە پێشنیازی كردووە، چەند لەگەڵ رێكەوتن لەگەڵ یەكێتیو مام جەلال، دوورن لەیەك:

"گرنگترین راسپاردەكانی مام جەلال بۆ سەركردایەتی كۆمەڵە ئەمانە بوون:

١-دەستەی دامەزرێنەری یەكێتی لە وڵات دابمەزرێنن، تێكەڵاو بێ لە ئەندامانی كۆمەڵەو كەسایەتی ناسراو و نیشتمانیو دیموكرات، ناوی هەندێ كەسیشی دیاری كردبو، قسەیان لەگەڵ بكەن.

---

١ فەرەیدون عەبدولقادر. بیرەوەریەكانم لەگەڵ خاڵە شیهابو هاورێكانی. لەبڵاوكراوەكانی رۆژنامەی كوردستانی نوێ. چاپخانەی شەهید (ئازاد هەورامی) چاپی یەكەم ٢٠١١. ل(٤٤).

+ فەرەیدون عەبدولقادر لە كتێبی (هەڵۆ سوورەكانی قەندیل)دا، تەنها باسی عەلی بچكۆل دەكات، كە وتویەتی بچینە شاخو حەشارگەیەک دروست بكەینو كاری گرنگتر بكەین. ل(٢٢٥).

٢-پەیوەندی لەگەڵ کادرە پێشمەرگەکانی شۆڕشی ئەیلول بکەن، ڕێکخراوی پێشمەرگەیان لێ پێکبهێنن‌و ئامادەیان بکەن بۆ دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداری.
٣-لە هیچ حاڵەتێکدا نابێ کوردستان بەجێبهێڵن. لە کاتی لێقەومان‌و ئاشکرابوندا خۆیان بشارنەوە، یان بچنە شاخ".[١]

# (٧)
# گرێکان بە دەست کرانەوە

گرێکان ئەگەر پێشتر بە دەم‌و بە سەختی دەکرانەوە. ئێستا ئیتر بەڵگەکان پێماندەڵێن: گرێکوێرەکانی ئەو روداوانە بە دەست دەکرێنەوە. دەرکەوت، پێشنیازی چونە شام، لەلایەن فەرەیدونەوە کراوە، نوسیویەتی: "مشتومڕی زۆری خایاندووە" بەڵام لە دوائاکامدا، پێشنیازەکە کراوەتە بڕیار. واتا:
لەناو مشتومڕەکەدا، فەرەیدون هەر ئەو بۆچونەی پێ ڕاست بووە، بچنە شام‌و لەگەڵ مام بگەڕێنەوە شاخ. ڕێگای کورتی چونە شاخیان، خستۆتە قورگی نەهەنگی ئێران. سەرەنجامەکەی، کارەساتی لێکەوتەوە.
لەمەبەدواوە، کە سەرکردایەتی کۆمەڵە، سەبارەت بەوەی لە (٥)ساڵدا نەیتوانیووە:
١)بابەتە تیۆری‌و فەلسەفیەکان، بنوسێ‌و ئەڵقەکانی ڕۆشنبیری پێ گۆش بکات.
٢)بۆ کاتی لێقەومان، تەنانەت ژورێکی ئامادە نەکردووە، لەکاتێکدا لە شاخ‌و شاردا دابینکردنی حەشارگە، ئاسان بوو. ئەزمونی کۆمیتەی هەرێمەکان ئەمەی لە شارو شاخدا سەلماند.(*)
٣)لە کاتی هەرەسی شۆڕشی ئەیلولدا، نەک بەرەنگارییان نەکردووە، بەڵکو ژمارەیەک چەکی شیاویشیان بۆ تەنگانە پەنا نەدابوو.
٤)لەدوای هەرەس، هەتا لێقەومانی کۆمەڵە مانگی ئەیلولی ١٩٧٥ سەرەڕای ڕێکەوتن لەگەڵ یەکێتی‌و مام جەلال، بەرچاویان روون نەبووە بۆ جێبەجێکردنی ستراتیژی چەکداری، هەروەکو لەتەک مام جەلالدا، بڕیاریان لێدابوو.

١ نەوشیروان مستەفا ئەمین. لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ. دیوی ناوەوەی روداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٧٥-١٩٧٨. چاپی دووەم. سلێمانی-١٩٩٧. ل(٤٨).
* جگە لە ئارام، سالار، مەلا بەختیار.. جەمالی عەلی باپیر، سەلاح چاوشین، شێرکو جدی، حەمەسەعید قەڵەو، زێرۆی عەبدوللا رێوی خۆیان شاردەوەو نەشگیران!

٥)کێشەکانی ناو کۆمەڵەیان بە هەڵپەسێردراوی لەسەر ئایدیۆلۆژیەتی کۆمەڵەو چۆنیەتی چارەسەرکردنی ناکۆکیەکان، هێشتبوەوە.

٦)ئەو کۆمیتانەی دروستیان کردبوو، تەمەنیان دوو مانگی نەخایاندووە، گیراون‌و هەڵهاتون.

کەوابێ..

ئەو هاورێیانەی خۆڕاگر بوون‌و کوردستانیان جێنەهێشت، چ ئەوانەی بەهۆی بیرو رەخنەی جیاوازەوە دورخرابونەوە، لەگەڵ بەرپرسی هەرێمەکانی کۆمەڵە (هەولێر، کەرکوک، بەغداد، خانەقین‌و گەرمیان) مافی خۆیان بووە: ١- شانە و ئەندامە پەراگەندەکانی کۆمەڵە کۆبکەنەوە. ٢-سلێمانیش رێکبخەنەوە. ٣- کۆمیتەی هەرێمەکان دروستبکەن‌و بشکەونە تێکۆشان بۆ راپەڕاندنی ئەرکی رێکخستنەوەی کۆمەڵە. ٤- پەیوەندی کۆمەڵەو مام جەلال‌و پێشمەرگەکانی قامیشلو دروستبکەن. ٥- خۆسازدان بۆ بەرپاکردنی شۆڕش. کە سەرەنجام، هەر ئامادەکاریەکانی کۆمیتەی هەرێمەکان کرایە داینەمۆی راستەقینەی شۆڕش. باشترین بەڵگەش هەواڵنامەیە کە وا هاتووە:

"دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکدار، لەپێشەوە بە دروستکردنی تاقمی هوشیارکردنەوەی چەکدار لە لادێ، ئینجا نواندنی زەبروزەنگی شۆرشگێڕانە لە شارو لادێدا. بۆ هێنانەدی هەمان نیاز لەدەرەوەی وڵاتەوە چەندین دەستەی هوشیاریی رێکخران‌و چەکدار کران بەسەرۆکایەتی قارەمانی نەمرو هەڤاڵی هێژا ئیبراهیم عەزۆ نێردرانەوە وڵات. بەڵام لە هەمان کاتدا هیواو ئومێدی سەرەکی بە هەڤاڵانی ناوەوەی وڵات بوو. لەگەڵ هەڤاڵانی کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان‌و چەندین هەڤاڵی تری وەک دکتۆر خالید سەعیدو بەهۆی ئەویشەوە لەگەڵ شەهیدانی نەمر سەعدی عەزیز (گچکە-نوسەر)و هەڤاڵ سەید کاکە تەگبیری دروستکردنەوەی هێزی چەکدار کرابوو"[١]

دیقەت بدرێ لەوەی ئەم نوسینە هی مام جەلالە (٢٩) لاپەڕەی چاپی فلسکاپە. دەستبەجێ دوای کارەساتی هەکاری نوسراوەو کاریگەرییە سیاسی، عەسکەری‌و سایکۆلۆژیەکانی کارەساتەکە، قووڵە لەسەر نوسینەکە. ٩٠٪ی تەرخانی باسکردنی کێشەکانی یەکێتی‌و قیادە موەقەتەی پارتییە.

---

١ هەواڵنامەی کوردستانی عێراق. یەکەمین هەواڵنامەی شۆڕش. ئامادەکردنی: نەوزاد عەلی ئەحمەد. ئەکادیمیای هۆشیاری‌و پێگەیاندنی کادیران- سلێمانی-٢٠١١. ل(٢٠).

بێ تەمومژ مام جەلال دەنوسێ، لەگەڵ کۆمەڵەی مارکسی-لینینی ڕێکەوتون شۆڕش بەرپا بکەن‌و کۆمەڵەش (هیواو ئومێدی سەرەکی) بووە، لەگەڵ شەهیدان د.خالیدو سەعدی گچکەو سەید کاکە. تەنانەت ناوی بزوتنەوەی سۆسیالیستیش نەهاتووە. چونکە تا ئەوکاتە، واتا هەتا ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٦، سەرکردەکانی بزوتنەوە، تەنها تەگبیریان لە دۆخەکە دەکردو ناوی لە بزوتنەوە نەنابوو. یەکەمین جار کۆمەڵە کە ناوی بزوتنەوەی سۆسیال-دیموکراتمان بیست (پاشان دیموکراتیەکەیان لەسەر داوای مام جەلال لێکردەوە) لە (١٩٧٦/٨/٢١)، کە یەکەمین دیداری شەهید عەلی عەسکەری‌و شەهید ئارام لە مێرگەپان، باس کرابوو کە بزوتنەوەی سۆسیال-دیموکراتیان تازە دامەزراندووە. تا ئەوکاتەش بەیاننامەی دامەزراندنەکەشیان نەنوسیبوو.

## (٨)
## شارباژێڕ، جافایەتی، یان قەراغ؟

لە گێڕانەوەی ناردنەدەرەوەی مەفرەزەکاندا، بەئارەزووی خۆی، لە لاپەڕە (١٨٧)دا مێژووی ناردن‌و شوێنی مەفرەزەکان دیاریدەکات. وەکو:

"٥- لە مانگی ١٩٧٦/٧دا، دوو مەفرەزەی چەکداری لە شارباژێڕ بە سەرپەرشتی نەجمەدین عەزیز (سالار)و مەفرەزەیەکیش لە دۆڵی جافاتی بە سەرپەرشتی جەمال عەلی باپیرو بە هاوکاریی عەبدولقادر هەڵەدنی. باوکی شەهید غەریب هەڵەدنی پێکهات

٦-هەر لە مانگی ١٩٧٦/٧ مەفرەزەیەکی چەکدار بە سەرپەرشتی فەیسەل تاڵەبانی "شەهید سیروان" لە بەری قەرەداغ و لە ١٩٧٦/٧/٢٩ دا لە شارباژێر مەفرەزەیەکی تر بە سەرپەرشتی ملازم جوامێر سیامیر پێک هات.

٧-پاشان لە نیوەی مانگی ١٩٧٦/٨ دا عەلی عەسکەری و د.خالید و سەید کاکەو سەعدی گچکە و عەمەر دەبابە، چەند کەسێکی تر، کە خەلیل جەلال لە ڕێگەی سەنگەسەر دۆڵی شەهیدانەوە دەیانگەیەنێتە گوندی ئینزە، لەوێ لەگەڵ عەلی کۆ دا یەکدەگرنەوە".[1]

ئەم دوو گێڕانەوەیە، بێسەروبەرن. جارێ لە تەواوی ناوچەی سلێمانی، یەکەمین مەفرەزە، سالار عەزیز و سێ کەس چونە دەرەوە بۆ دۆڵی جافایەتی-تەنگی مادین-

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(١٨٧).

هەڵەدن. سالار عەزیز، وەکو بەرپرسی مەفرەزەکانی کۆمەڵە، بە بڕیاری کۆمیتەی هەرێمەکان نێردرایە دەرەوە. بەپێی بڕیاری کۆمیتەی هەرێمەکانیش کە بەرنامە دارێژرابوو، ئاگاشی لەوە بوو کە بۆ شارباژێڕ، قەندیل، مەرگە، بەرزنجە، دەڤەرەکانی تریش، کەرکوک، هەولێر، هاوزەمان مەفرەزەکان دەنێردرێنە دەرەوە. کاتێک ئەمان چونە دەرەوە، هیچ هەواڵێک لە هاتنەدەرەوەی هەڤالانی بزوتنەوەی سۆسیالیست نەبوو!

دوای چونەدەرەوە بە ماوەیەک، مەفرەزە بۆ شەهید جەمال عەلی باپیر دروستدەکرێ. ئەویش دوای هەرەس سوێندی خواردبوو یەکەمین تەقە لە شۆڕشی نوێدا خۆی بیکات. وایشی کردبوو، هەڵیکوتابووە سەر رەبایەیەکی شاخی ئەزمەڕ. ئەمە یەکەم چەخماخەی شۆڕش بوو، لەو دەڤەرەدا.

عەبدولقادر هەڵەدنی، لەسەرەتای بەرپاکردنی شۆڕشدا، دێکەیانو ماڵو منالیشی، خانەخوێی مەفرەزەکە بونو هەر ئەویش "تەنگی مادین"ی بۆ دابین کردبونو خزمەتی دەکردن. بەلام لەدوای کارەساتی هەکاری، لەلایەن دوو خۆفرۆشەوە (عەلی گاور-گودرون) فریو درابوو.(*) بەلام دوای جێبەجێکردنی بڕیاری شۆڕش بۆ کۆتاییهێنان بەو مەترسیە، عەبدولقادر، هاتەوە ریزی یەکێتیو هەتا مردیش، وەفادار مایەوە، غەریبی کوڕیشی، لە قارەمانە دیارەکانی سەرەتای شۆڕشو پارتیزانی دوای ئەنفالەکانیش بوو. مەخابن، بە رێکەوت شەهید کرا.

لە باسکردنی شەهید سیروان تاڵەبانیدا (فەیسەڵ) لەمەشدا تێکیدایەوە.

سیروان، کۆتایی مانگی هەشتی ١٩٧٦، من لەماڵی ئەشرەف تاڵەبانیەوە، بەڕێم کرد بۆ ناوچەی بەرزنجە. لەوێ، بەحوکمی ئەوەی کادری وشیاری کۆمەڵە بوو، کرایە رابەری سیاسی. لەگەڵ بزوتنەوە هەڵینەکردو لە ١٩٧٧دا گواسترایەوە بۆ قەراغ. لە قەراغدا، زوو جێی خۆی گرتەوەو دوای شەهیدکردنی ئارامو شەهیدکردنی خالید گەرمیانی (١٩٨١/١٢/٨)، سەرپەرشتی مەفرەزەکانی سەرکەوتووانە کردبوو. کاتێک بۆ لێکۆڵینەوەی چۆنیەتی شەهیدکردنی ئارامو ئاشتی، چومە قەراغ، سیروانم بینیەوە. بینیم چەند فەرماندەیەکی لێوەشاوەیە. بەپێی دەسەلاتی کۆمەڵە کە هەمبوو، کردمانە سەرپەرشتیاری

---

* کارەساتی هەکاری کاریگەری نالەباری دەرونی لەسەر سەدان پێشمەرگەی خێڵەکانو دێهاتەکانو کادری شارەکانیش هەبوو. هەندێکی وازیان هێنا. بەشێکی تەسلیم بونەوە (٥٠) کەسێکیش لە دۆلی جافایەتی پەیوەندییان بە ئیستخباراتەوە کردبوو. بە هێزێکی هاوبەش هاتینە سەریانو، چەکمان کردن! ئەمە گورزێکی گەورە بوو، لە نەخشەی شۆڕشی چەواشە، دوای کارەساتی هەکاری، کەوت.

گەرمیانو بازیانو قەراغ. لە مەکتەبی سیاسیشدا، پێشنیازمان کرد، کرایە ئامر هەرێم. مەخابن، زۆری نەخایاند، لە شەوی (٢٩/٣٠)ی ٤/ی١٩٧٩دا شەهید کرا.

هەمان مەفرەزەکەی شەهید ملازم جوامێر سایە میر بوو، کە سیروان تاڵەبانی رابەری بوو. جوامێریش لەگەڵ فەرماندەکانی بزوتنەوە هەڵینەکرد، ئەمیش گواسترایەوە قەراغ.

جوامێر، لە بەغداد دوای هەرەس رێکمخست.(+) کەسێکی هەتا بڵێی قارەمان بوو. بەڵام پەروەردە کۆمەڵایەتیەکەیو کولتورە مەندەلاویەکەی، لەگەڵ بزێوەکانی سلێمانیدا نەدەسازا. تەنانەت سۆرانییشی باش نەدەزانی. لەو ماوەیەدا، دوا دیدارم لەگەڵ شەهید ئارام، پێش رۆشتنم بۆ هەکاری هاوینی (١٩٧٧) پێم وت:

هاوڕێیانی بەغداد، بەتایبەتی رێکخراوی خوێنی شەهیدان بە رابەرایەتی شەهید "سەلمانی حاجی داود" بێ بەرپرسیار دەمێننەوە. بۆشم باسکرد، کە چالاکی گەورەیان بەدەستەوەیەو بڕیارە عوسمان محەمەد فایەق تیرۆ بکەن. بۆیە گرنگە هاوڕێیەک بنێرێتە بەغداد کۆیانبکاتەوە.(*)

## (٩)
## سۆسیالیستو رەخنەی ناڕاست

سەبارەت بە شەهیدان عەلی عەسکەری، د.خالید، سەعدی گچکە، عومەر دەبابەو سەید کاکە.. ئەمانەش، پێکەوە نەچونەتە دەرەوە. بە جیا و دوو دوو چونە دەرەوە. چۆنو چۆنیەتی هاتنەدەرەوەیان؟ بۆچی نەمانتوانی پێش ئەوە، وەکو کۆمیتەی هەرێمەکان بیانبینین؟ کە هاتنە دەرەوە روانینمان چەند جیاواز بووە؟ سەرەنجام کێشەکان بۆچی لەنێوانماندا سەریانهەڵدا؟ ئەنجامی کێشەکان گەیشتنە چی؟ ئەو پرسیارگەلە، وەڵامەکەیان تا ئێستاش، لە یادەوەری تێکۆشەرو مێژوونووساندا، وەکو رویداوە، نەزانراوە. نوسینەوەشیان، بە لایەنی پۆزەتیڤو نێگەتیڤەوە، بۆ مێژووی شۆڕشە نوێکە گرنگە.

---

+ ملازم جوامێر؛ لە هەرەسی ١٩٧٥، ئامادە بوو لەگەڵماندا بەرگری بکات.. هێشتا بۆ کۆمەڵەش رێکنەخرابوو. شیروان شیروەندی قسەی لەگەڵ کردبوو!

* لێرەدا، کۆمەڵێک راستی هەیە سەبارەت بە هاوڕێیانی رێکخستنی بەغدادو رەفتاریان لەگەڵ هەڵۆی سور، کاتی باسکردنی نییە.

بەمەرجێ لەهەموو رویەکەوە، بابەتییانە بنوسرێ. چونکە، نە کۆمەڵە هەموو سیاسەت‌و بڕیارەکانی راست بون، هەتا تەواوی کێشەکان لە بزوتنەوەی بئاڵێنین. نە بزوتنەوەی سۆسیالیستیش، بەرپرسیاریتی تەواوی کێشەکانیان لەئەستۆدایە. تەرازوی کێشەکانی لایەنە باش‌و خراپەکانی هەردوولا، لەگەڵ هەڵەکانی مام جەلالیش‌و باقی سەرکردەکانی هێڵی گشتی، پێویستە بە بەڵگەی تەواوەوە بنوسرێتەوە. نەک بەئارەزووی سەرکردەو کادرەکانی هەردوولا. چۆن کۆمەڵە، رۆڵی قارەمانانەی هەبووەو قارەمانەکانی بەرەو پیری مەرگ، فرسەخ بە فرسەخ رۆشتون.[*] لە هەمانکاتدا سەرکردەو فەرماندەکانی بزوتنەوەش، لە عەلی عەسکەریەوە بۆ د.خالید، سەعدی گچکە، تایەری عەلی والی‌و رەئوف بەگ..تاد، هیچ فرسەخێک بەرامبەر مەرگ پاشەکشەیان نەکردووە. جگە لەوەی هەتا راپەڕین، پشووی خەباتیان درێژ بووە. ئیتر گوناحێکی گەورەیە، بە زەرەبینی ئایدیۆلۆژی، تەنها هەڵەی بزوتنەوە ببینرێ‌و بە چاوی گەشیشەوە، سەیری دۆخی کۆمەڵە بکرێ. کۆمەڵەیەک، بە قۆناغی جیا، لە هەندێ وێستگەدا، تەنانەت راستڕەوەکانی کۆمەڵە، تاوانی بەرچاویان لە شۆڕشەکەدا ئەنجامداوە. کە بزوتنەوە لەو تاوانانەیان دژی ئازادی لەناو یەکێتیدا نەبووە!!

لەمبارەوە، لە لاپەڕە (١٨٩)دا نوسەر بۆچونی دروستی دەربڕیوە. لەمەیاندا، بەگشتی بۆچونەکانی بابەتین. وەکو:

"یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، کە لە سێ باڵی لە یەکتر جیای (کۆمەڵە، بزوتنەوە، هێڵی گشتی)، پێک هاتبوو، دیارە لە سەرەتاوە سێ ناوەندی بڕیارو سێ سەرکردایەتی‌و سێ جۆر دیسپلین‌و پرەنسیپ‌و کاری رێکخراوەیی جیاواز لە یەکتریشی تێدا بوو، ئەم جۆرە پێکهاتەیەی یەکێتیی لە سەرەتاوە تا رسکانی، کەندو کۆسپێکی زۆری خستبووە بەردەم تەقەلای پاک‌و پوختەکردن‌و بژارکردنی هەم رێکخستنەکانی یەکێتیی‌و هەم هێزە چەکدارەکەشی. گرێ‌و گۆڵی زۆری لەرێگەی پەروەردەکردن‌و هوشیارکردنەوەو سازدانی رێکخستنەکانی‌و هێزە چەکدارەکەیدا قوت کردبووەو نەیدەتوانی پەیڕەوی تەواوی دروشمەکەی بکا. کە بریتی بوو لە (شۆڕشی نوێ، سوپای رزگاری نوێ، دەست‌و دەم‌و داوین پاک".[1]

---

[*] لە شیعرێکی مەحویدا هاتوو: (بە پیری مەرگەوە فرسەخ بە فرسەخ رۆیون مەردان.. ئەوی باکی لە مردن بێ دیارە بلح‌و نامەردە).

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(١٨٩).

ئەم بۆچونە دروستە. وردەکاریەکی جوانی کێشمەکێشەکانی سەرەتاکانی ناکۆکیو روانگە جیاوازەکانە. جوانتریش لەوانە، نوسەر لە لاپەڕە (١٨٩)دا دەنوسێ:

"جگە لەوەش پەیدابوونی سەرکردەی تازەو کەم ئەزمون، هەم لە خەباتی سیاسیو هەم لە خەباتی پێشمەرگانەو پێک هاتوو لە جۆراوجۆر بیروڕا و تیۆر لە هەر سێ باڵەکە، ئەمەش کۆسپێکی تری لەبەردەم کاری بەکۆمەڵی سیاسیو رێکخراوەییو خەباتی چەکداریدا قوت کردووە. هەر یەک لە ئەندامانی سەرکردایەتی باڵەکان خۆیان بە ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتییو بڕیاردەرو خاوەن فەرمانی بڕەو بکوژی هەموو هێزە چەکدارەکە دەزانیو هەموو دێو ناوچەیەکی ژێر دەسەڵاتی شۆڕشی نوێشیان بە ناوەندی کارو دەسەڵاتو جێبەجێکەری بڕیارەکانی بێ چەندوچۆنی خۆیان دەزانی، دەیانویست بیرو بۆچوونەکانی خۆیان بە داسەپاندن، بەسەر پێشمەرگەو لایەنگرەکانی باڵەکانی تردا بسەپێنن".[1]

ئەم قسانە، سەبارەت بە کەم ئەزمونی زۆربەی سەرکردەکانی باڵەکانی یەکێتی، لە هەموو بارێکەوە، راستن. رەخنەیەکە لەشوێنی خۆیاندا شایەنی باوەڕپێهێنانە. زۆربەی سەرکردەکانی کۆمەڵە، ئەزمونی عەسکەریمان نەبوو. پاڵنەری سەرەکیمان باوەڕی پتەومان بە رێبازەکەمان، کێشەی رەوای گەلەکەمانو، ورەی بەرزی شۆڕشگێڕانە بوو.

فەرماندە عەسکەریەکانی کۆمەڵە، لە تەمەنی سیاسی-پێشمەرگایەتیدا تاکوتەرا نەبێ، تاقیکردنەوەی ئامر مەفرەزەشمان نەبوو. رووبەڕووی ئەرکێکی سەخیش بوینەوە، دەبوو رایبپەڕێنینو باری روخاوی کوردایەتی راستبکەینەوە. ئەمەش شەرەفێکی شۆڕشگێڕانەی گەورە بوو. بەڵام کێشەی جۆراوجۆریشی لەبەرامبەر فەرماندە بەئەزمونەکانی کوردستاندا، لێدەکەوتەوە.

ئەوەندەی مێژووی شۆڕشەکانی جیهانم خوێندبێتەوە، کە لە کتێبی (شۆڕشەکانی کوردستانو گۆڕانکاریەکانی سەردەم-١٩٨٩) زۆربەیانم باسکردووە، ئەم کێشانە لەناویاندا هەبووە. بۆ نموونە:

-ماوتسیتۆنگ هەتا مردیش تەقەی نەکرد. بەڵام سەرۆکی حیزب بوو. کاری عەسکەری دەسپاردە عەسکەریەکان.

-کاسترۆ و چیگوارا، هیچ ئەزمونێکی عەسکەرییان نەبوو. تەنانەت کاسترۆ، هێندە بێئەزموون بوو، لە قۆناغی یەکەمی شۆڕشی کوبادا، شەوێکیان لە پرخەی خەودا، لە شاخی سیراماسترا دەگیرێ.

---

١ سەرچاوەی پێشوو.

-چیگوارا، بەهۆی کەمیی ئەزمونو هەڵەی دۆخی بەرپاکردنی شۆڕش لە بۆلیڤیا، بە برینداریی گیراو شەهید کرا.

-کوبا؛ ئەگەر راپەڕین دژی پاتیستای دیکتاتۆر، دوای سێ ساڵ بەرپا نەکرایە، رەنگبوو، شۆڕشەکەیان لەناوچوبا.

-چین؛ ئەگەر بەهێزترین بزوتنەوەی، جوتیاران دژی چەوساندنەوەی چینایەتی نەبوایە، رەنگبوو بەرگەی هێرشەکانی حکومەتی کۆمینتاگ نەگرن. خەریکیشبوو ببەزن، بەلام بە بڕیاری رێپێوانی گەورە (المسیرة الكبرى) خۆیان لە پێنج هێرشی سەدان هەزار سەرباز، رزگار کرد. بەمەشەوە، مەترسی لەسەریان هەبوو، ئەگەر لە جەنگی دووەمی جیهاندا شورەوی‌و بەریتانیا، پشتیوانییان نەکردنایەو ژاپۆن لە جەنگەکەدا تێکنەشکایە.

-کۆریا؛ ئەگەر جەنەراڵەکانی سوپاو پشتیوانی چین‌و شورەوی نەبا، هەرگیز بەرامبەر ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی سەرنەدەکەوتن. بەمەشەوە، لە کۆریای باشووردا شکان.

تایبەتمەندی شۆڕشی نوێ لەوەدا بوو، کۆمەڵە بە بڕوابون بە خەبات، بەبێ پشتیوان‌و بەبێ بونی یەک جەنەراڵیش، دەستی دایە چەک. کاتێک فەرماندە بەئەزمونەکانی وەکو: عەلی عەسکەری، د.خالید، سەعدی گچکە، سەید کاکە، ملازم تایەر.. هاتنە دەرەوە. لەناو کۆمەڵەدا تەنها ملازم عومەر، ملازم جوامێرو ئەنوەری مەجید سوڵتان، پلەی ئەفسەری‌و تاقیکردنەوەی شۆڕشی ئەیلولیان هەبوو. ئەمانیش، وەکو ئێمەمانان، هاتنە ناو مەفرەزە سەرەتاییەکانی پارتیزانی. واتا: زانستە عەسکەری‌و تاقیکردنەوەکەیان، لە چوارچێوەیەکی دیاریکراوی مەفرەزەکاندا، بەکاردەهێنا. لە دۆخێکی وا، دوو رێکخراوی مارکسیستی‌و سۆسیال-دیموکراتی پێچەوانەی مارکسیزم، دەکەونە ناو خەباتی چەکداری.. نامۆ نییە کێشەیان هەبێ. بەتایبەتی مام جەلال کە لەهەمومان بەئەزمونتر بوو، دوای ساڵێک گەیشتە کوردستان. کە گەیشتیشە کوردستان، هەتا ساڵی (١٩٨٢) لە سەرکردایەتیدا مایەوەو پێشمەرگە کە سەریان لە مەکتەبی سیاسی دەدا، دەیانبینی. زۆربەی کێشەکانیش، لە هەرێم‌و کەرت‌و مەفرەزەکاندا، لەنێوان فەرماندەکاندا رویاندەدا. دوای ساڵێک لە گەڕانەوەی مام جەلالیش، کێشەکان قووڵتر بون‌و سۆسیالیست بە زۆری دژی سیاسەتەکانی مام جەلال، هەڵوێستیان وەرگرت. دیارە کێشەی تریشیان لەڕووی فکری‌و سیاسیەوە هەبوو!

## ( ١٠ )

# کێشەکانو خەسڵەتی مام

کێشەکان قووڵ بونو سۆسیالیست جودابونەوەو کەوتینە ویزەی یەکتر، هەنگینی مام جەلال، باوەڕی بەوە کرد کە لەسەرەتای بەرپاکردنی شۆڕشدا، هەڵەی زۆر کراوە. کە پێشتر بۆمان روندەکردەوە، نەک باوەڕی نەدەکرد، بەڵکو زۆرتر باوەڕی بە سەرکردایەتی بزوتنەوە دەکرد؛ پلە عەسکەریە بەرزەکانی بەوان رەوا دەبینی؛ زۆربەی هاوکارییە عەسکەریەکانیشی پێشکەشی ئەوان دەکرد. بەلام کە هەموو ئەو نەرمییەی مامو هاوکارییە سودیان نەبوو، ئەوسا، دانی پیا نا: کۆمەڵە هەقتان بوو. قسەکانتان راست دەرچوو. خۆیشی ئیتر هەڵوێستی وەرگرت. لەمبارەوە، بە رۆشنیی هەمان رەخنەکانی کۆمەڵە، لەسەرەتای بەرپابونی شۆڕشدا، لەسەر چۆنیەتی هەڵگێڕانەوەی گەوهەری شۆڕشەکە، لە هەواڵنامەدا دەنوسێ:

"لایەنە سلبیەکانیش بریتی بون ، لە هێنانەوەکایەی هەندێک ئاغاو ماوەدان بە بووژاندنەوەی تاقمی سەر بە ق.م ی ماڵی بارزانی لە هەندێ شوێنی کوردستان، زۆریو بۆری لە ریزی پ.م دا کە پاشان راکردنەوەی چەکدارە خێڵەکیو بەزیوەکان بۆ ریزی دوژمنو دانی زەرەر لەو کەسانەی یارمەتی شۆڕشیان داوە لە شارەکاندا بووە هۆی هێنانەخوارەوەی ورەی خەڵکو درووستکردنی هەستی سڵەمینەوە لە پ.م و جۆرە بێمتمانەییەک لەلای زۆر کەسو باغرکردنەوەی کاربەدەستان، سەر لە خەڵک تێکدانو بووژاندنەوەی هەندێ دەرەبەگ لەلایەن میریەوە لەئەنجامی خۆفرۆشتنەوەیان بە دوژمن".[١]

کوتومت، هەمان بۆچونەکانی کۆمەڵە بوون، کە لەدوای گەڕانەوەی مام جەلالو نەوشیروان مستەفا، باسمان دەکردن، بەلام دۆخەکە بۆ "مام" وای دەخواست، گوێ لە رەخنەکانو مەترسیەکانی کێشەکان نەگرێ. هەتا قەوما! قەومانەکەش (١٥) ساڵی رەبەق شەڕوشۆڕ رویدا!!!

---

١ هەواڵنامەی کوردستانی عێراق. یەکەمین هەواڵنامەی شۆڕش. ئامادەکردنی: نەوزاد عەلی ئەحمەد. ئەکادیمیای هۆشیاریو پێگەیاندنی کادیران- سلیمانی-٢٠١١. ل(٢١).

خەسڵەتی مام جەلال وابوو، کاتێک بەشێک لە کێشەکان رووبەرووی خۆی نەبونایەتەوە، پشووی لە چارەسەردا درێژ دەکردو کاتی زیاتری دەدایە چارەسەر؛ بەڵام کە کێشەکان رووبەرووی خۆی دەبونەوە، یان دەتەقینەوە، هەڵوێستی توندی وەردەگرتو نەرمییەکەی جارانی نەدەما. ئەمەش زۆرجار زیانی دەگەیاندە یەکێتیو شۆڕشو کۆمەڵە. هەروەکو پێشو پاش جیابونەوەی بزوتنەوە. ئەم خەسڵەتە، لە سیاسەتی مام دا، هەتا جیابونەوەی ئاڵای شۆڕش، درێژەی کێشا. لەسەرەتای کێشەکاندا، گوێی لە هەموو ئەو رەخنانە نەدەگرت کە لەسەر نەوشیروانو باڵی راستڕەوی کۆمەڵە، لەمەڕ زۆر راستی، کە دەیزانیو دەیبیست. بەڵام دۆخەکە وایلێهات ئاڵای شۆڕش چیکە پشووی بەرامبەر تاکڕەوێتی نەوشیروان، پێشێلکردنی ئازادیەکانو تاوانە ئەنجامدراوەکان، نەما، ناچار بڕیاری جیابونەوەی رێکخراوەیی ئاڵای شۆڕش درا؛ بەداخەوە، مام سەرەتا کەوتە ژێر کاریگەری نەوشیروان، بۆ پەلاماردانی ئاڵای شۆڕش، بەڵام کە گەیشتە رادەی بڕیاری کوشتنی (مەلا بەختیار، شێخ عەلی، پشکۆ نەجمەدین) لە پلینیۆمی کۆمەڵەدا، دژی جێبەجێکردنی بڕیارەکە نەبوو. دەسەڵاتی سکرتێریی خۆی چەسپاند، کە جێبەجێکردنی بڕیارەکەی، بەبێ پەسەندکردنی سکرتێری گشتی، راگرت.(*)

ئەم بڕیارە، کە تەنهاو تەنها تاوانەکەمان لەسەر ئەوە بوو، لەگەڵ نەوشیروانو راستڕەوەکانی کۆمەڵە هەڵمان نەکردووەو نەشمانویستووە، لەڕووی عەسکەریەوە جیاببینەوە (٦٠) کادری کۆمەڵە لە پلینیۆمێکدا، کە هەمووی بە پروپاگەندە جۆشی رقێکی بێوێنەی سایکۆلۆژی، درابون. هاوسەنگەری گیانیی بەگیانی، کە (١٥) ساڵی رەبەق لەناو کۆمەڵەدا، خۆمانو پاشان کەسوکارو هاوسەرەکانیشمان تێکەڵاو بوین، وایان لێکردبوون، مزگەوتەکەی بەرگەڵو، ببێتە دادگای تیربارانکردنمان. کە دڵنیام، زۆربەی ئەو کادرانە، لە ناخی خۆیاندا بڕیارەکە ئازاری ویژدانی داوون. بەڵام وا زاخاوی سایکۆلۆژی رق درابوون، کە گوایە ئەو بڕیارە لە بەرژەوەندی کۆمەڵەو

---

* شەوێکیان لە بەغداد بوین؛ مام جەلال، بەئامادەبونی د.فوئاد مەعسوم، د.لەتیف عەبدولرەشید، گێڕایەوە کە سەعات ١٢/ی شەو، دوو ئەندامی ناوەندی کۆمەڵە هاتون، من بەرنو بڕیاری کوشتنم جێبەجێ بکەن. مام، وتویەتی بەبێ کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی رازی نابم، دوایی رێی نەداوە. واتا: هەر ویستویانە لە رووی جەستەییەوە، لەناوم بەرن. ئەمەش لە رووی دەرونیەوە، دەریدەخات، بڕیارەکەیان هێندە هەڵە بووە، نەوشیروان ویستویەتی لەناومان بەرێ، هەتا ئەگەری ئازادبونو سەرهەڵدانەوەمان، لەئارادا نەهێڵێ.

یەکێتیو شۆڕشە. لەکاتێکدا، بناغەی جیابونەوەی سیاسی-عەسکەری لە مێژووی کوردایەتی-حیزبایەتی-پێشمەرگایەتی، باشوری کوردستاندا، مام جەلال-برایم ئەحمەد دایانڕشتبوو. ئێمە نەشماندەویست هێز جیابکەینەوە. نەشمانویستووە بچینە ئێران. تەنانەت خۆشمان لە چوونە ناو "جود"(*) کە ئەوکاتە لەشەڕدا بون دژی یەکێتی دەپاراست.(+)

## (١١)
## پەلاماردانی هاوخەبات!!

لەدوای ئەوەی لە (١٩٨٥/١١/١) کە دەکاتە (٣٢) ساڵ، پێشتر، ئەو تاوانە بەرامبەر ئاڵای شۆڕش ئەنجامدرا، جگە لە فەرەیدون عەبدولقادر کە جوامێرانە رەخنەی لێ گرتووە، تا ئێستا ئەو رقە سایکولۆژی-سیاسییە، لەناو زۆری سەرکردەو بڕیاردەرانیەوە، لە گۆشەی ئەو رقەوە جارێ ویژدانیان ئاسودە نەکردووە!

"کۆمەڵە بۆ بڕیاردان لە چارەنوسیان، لە رۆژی ١٩٨٥/١٢/١٠دا، پلینۆمێکی بە ئامادەبونی ٦٠ سەرکردەو کادرو پێشمەرگەو رێکخستن بەست. کە لە دۆخێکی گرژو هەڵچوودا، کێشەی (ئاڵای شۆڕشو مەلا بەختیار)ی خستە بەر باسو لێکۆڵینەوە! لەئەنجامدا داوا کرا بڕیاری کوشتنی هاوڕێی دوێنێی سەنگەرو سەرکردەیەکی چالاکو دڵسۆز بەدەستی هاوڕێکانی (کۆمەڵە) بدرێو جێبەجێ بکرێ! خۆ ئەگەر ژیریو دانایی (مام جەلال)، نە بوایە، هیچ دوور نەبوو ئەو بڕیارە بەو ئاقارەدا بڕۆشتایە، کە پلینۆم داوای کردبوو!".(١)

پێشتریش دەنوسێ:

---

* جود: جەبهەی وەتەنی دیموکراتی نێوان پارتی، سۆسیالیست، حیزبی شیوعیو پاسۆک، دژی یەکێتیو هاوپەیمانەکانی لە «جەوقەد» دروستکرا.

+ لە کۆبونەوەیەکی هاوبەشی مەکتەبی رێکخستن، راگەیاندنو رێکخراوە دیموکراتیەکان، هاوینی ١٩٩٨، لە قەلاچۆلان، مام قسەی لەسەر خراپیی تەکەتول دەکرد. گوتی: ئەگەر واز لە تەکەتول نەهێنن، مەلا بەختیار، رادەسپێرم، کورتان لەسەر خراپی جیابونەوە، بۆ ببەستێ. منیش گوتم: مام جەلال، لەم مەجلیسەدا، لە من بەئەزمونتر هەیە لە تاقیکردنەوەی جیابونەوە. مەبەستم مام جەلالو عادل موراد بوو!

١ فەرەیدون عەبدولقادر. هەڵۆ سوورەکانی قەندیل. دەزگای چاپو پەخشی سەردەم. چاپی یەکەم. سلێمانی-زستانی ٢٠١٧. ل(٥١٠).

"له چارەسەری ئەو کێشە سیاسیەدا، لە رۆژی ١٩٨٥/١١/١دا، گرتمانە بەرو ناچار بووین خۆشەویستیو برایەتی فەرامۆش بکەینو لەئەنجامدا بە ریگەیەکی ناسیاسیو ناهیمنانە هاورێکانی خەباتی خۆمان زیندانی بکەینو بوار بدەین سوکایەتیشیان پێ بکرێت".[1]

من، لەکاتێکدا بێرادە سوپاسی نوسەری ئەو پەرەگرافانە دەکەم. لەهەمانکاتدا، بۆ مێژوو بەئەرکی دەزانم، دەرونیشکارییەک بۆ دێر بە دێری دانپیانان لەو بریارە پڕ لە تاوانە بکەم، کە خودی فەرەیدون دەڵێ (یەکێ بووم لەو بەرپرسە بالایانەی یەکێتی کە شەریکی هەموو ئەو بریارانە بووم).

جارێ با وشەی (ناچار بووین) لێکبدەینەوە، کە بریار بدەن (خۆشەویستیو برایەتی فەرامۆش بکەین) تاوتوێ بکەین.

ناچاربوون لە زمانی کوردیدا، بۆ حاڵەتێک بەکاردێ، کە چارەسەری دیکە لەئارادا نەمابێ. با بزانین ئالای شۆڕشەکان کارێکی وامان کردبوو، هەتا بهێنێ (خۆشەویستیو برایەتی فەرامۆش) بکرێ، هەڵبکوتنەسەرمانو بە مەرامو بەرنامەش، سوکایەتیمان پێ بکەن؟!

لە سێ کۆنفرانسداو لە دەیان کۆبونەوەو چەندین نوسیندا، تا دەهات، رێبازی جیاوازی نێوانمان لێک دەترازا. هەر پشوومان درێژ کرد. لەبەرئەوەی شۆڕشەکە دوچاری کێشەی عەسکەری تر نەکەین. تەنانەت کە مفاوەزاتەکەی (١٩٨٣-١٩٨٤)یش کرا. خۆم هەر باوەڕم بەوە نەبوو بەعس مافی کورد بدات، بۆئەوەی لەبەرامبەر رژێمدا کەلێن نەکەوێتە ناو وەفدی گفتوگۆ، دوا شەوی رۆشتنی وەفدەکە لە "زیخان"ەوە بۆ کەرکوک-بەغداد، رازی بوم ببمە ئەندامی وەفدەکە. لە بەغدادیش، دوای دوو کۆبونەوە، مام جەلال لە باخچەی میوانخانەکەی موخابەراتی عێراق، کە وەفدەکەیان لێ دابەزاندووە، بەدەم پیاسەوە لێی پرسیم: مەلا بەختیار، بۆچونت چۆنە؟ وتم: هەروەکو جەنابت بیردەکەمەوە، بەعس هیچ بە کورد نادات. چونکە مەحاڵە ببێتە دیموکراتی. وتی: ئافەرین!

پەیوەند بەو باسەوە، لە رێرەوی مفاوەزاتەکەدا، ناکۆکیەکانمان لەناو کۆمەڵە تا دەهات قووڵتر دەبوون، مەخابن، سالار عەزیز جێیهێشتینو سەفەری دەرەوەی کرد. باری من

---

١ سەرچاوەی پێشوو.

زۆر قورستر بوو.(*) هاوینی (١٩٨٤) بۆچونە جیاوازەکانمان لە نامیلکەی "هەڵوێست"دا، رونکردەوە. بەڵام دیسان، بۆئەوەی پێگەی یەکێتی بەرامبەر رژێم لاواز نەبێ، دانمان بەخۆماندا دەگرت. ئەوکاتە لەناو هاوڕێیانی ئاڵای شۆڕشدا دەموت:

مفاوەزات هەر تێکدەچێ، بەڵام با کۆمەڵە ئۆباڵەکەی نەخەنە ئەستۆی ئێمە. یان بەهۆی ناکۆکیەکانی ئێمەوە، با یەکێتی لاواز نەبێو ناچاریش نەکرێ سازش لەگەڵ حکومەتدا بکات. تەواوی شانەکانی ئاڵای شۆڕش، تەنانەت لە یەکەمین کۆبونەوەی فراوانی ئاڵادا کە هاوینی (١٩٨٥) لە سێوسێنان لەماڵی (عیماد ئەحمەد) سازمان دا، لەناو ئامادەبواندا(**) هەمان بۆچونم دوپاتکردەوەو دەمگوت: خۆمان بگرین باشترە لەوەی زمانی حکومەت بەسەر یەکێتیدا زاڵبکەین.

## (١٢)
## هەڵوێستێکی هێمنو کاردانەوەی توند

مەبەستمان لەو بۆچونانە ئەوەیە، راستە کێشە و ناکۆکی نێوانمان دەگەیشتە بنبەست، بەڵام هەرگیز بە رقو کاردانەوە، ئاڵای شۆڕش بڕیارمان نەدەداو دژی هەموو چەشنە جیابونەوەیەکی عەسکەریو قووڵکردنی شەڕی ناوخۆش بوین. هاوڕێیانی ناو وڵات، رازیش نەبوین، بچینە ئێرانو بیشچینە ناو جود. ئەم پەیامانە گەیشتنە مام جەلالو نەوشیروان.. بانگیشیان کردم بۆ مەکتەبی سیاسی. رۆشتمو خۆم پێشنیازم کرد بچمە تاران (سالار عەزیزو مامۆستا جەعفەر) رازی بکەم دوربکەونەوە لە پارتیو لە "راژان".. هەوڵیش بدەم بێنەوەو بە گفتوگۆ کێشەکان چارەسەر بکەین. لەرێگەی "شێخ مەحمود"(+) ەوە، سەفەریشم کردو لە هوتێل (ئەتڵەس)دا لەگەڵ ئەو دوو هاوڕێیەو هاوڕێیان: د.هەژار،

* ئەم جێهێشتنەی سالار عەزیز، کاریگەری لەسەر بڕیارەکان هەبوو. هەروەکو چۆن ساڵی ١٩٧٧یش، سەفەرکردنی بۆ دەرەوەی وڵات.. کاتی نەبوو.

** ئاسۆ عەلی، پشکۆ نەجمەدین، شێخ عەلی، عیماد ئەحمەد، مامۆستا ئەحمەد-زیندان، شێخ جەمال، مەلا بەختیار، ئەحمەد نیزامەدین (کەلار) مامۆستا موحسین، روناکی شێخ جەناب، مامۆستا عادل (رەئوف) لە کۆبونەوەکە بوون!

+ شێخ مەحمود باوەڕپێکراوی یەکێتی بوو. ئەوکاتە کە نێوان یەکێتیو ئێران تێکچووبوو، شێخ مەحمود لە هاتوچۆی ئێراندا هەندێک کاروباری بۆ یەکێتی دەکرد.

د.حەسان، حاجی ئومێدو خەباتی شێخ جەناب، بە دووررودرێژی دانیشتین. نەگەیشتینە بیرورای هاوبەش. بەڵام بەڕاشکاویی پێمگوتن:

دژی جیابونەوەی عەسکەریم. رازی نیم خوێن لە لوتی پێشمەرگەیەکی یەکێتی بڕژێ.. قبوڵیشم نییە بچینە ناو جود. ئەگەر بیشزانم دەگاتە جیابونەوەی عەسکەریو یەکترکوشتن، من وازدێنم.(*)

لەم کۆبونەوەیەدا، زۆرم هەوڵدا، کێشەی نێوان ئاڵای شۆڕشو یەکێتی، ئارام بکەمەوە. مەترسیەکانیشم دەخستە بەرچاو. داواشم کرد سالار عەزیزو مامۆستا جەعفەر بێنەوەو لەگەڵ مام جەلالو مەکتەبی سیاسیدا، رووبەڕوو کێشەکان باسبکەین. سودی نەبوو!

لە گەڕانەوەدا، پوختەی دانیشتنەکەم بۆ مام جەلالو نەوشیروان گێڕایەوە. گەڕامەوە قەراغ. لەو ماوەیەدا هەر ئارام ئارام تێدەکۆشاین، چونکە یەکێتی دانوستانەکەی درێژەدەدایە. یەک بەڵگەش لای یەکێتی نەبووە کە ئێمە ویستبێتمان جیابونەوەی عەسکەری بکەین. کاتێک بۆ دواجاریش لەگەڵ مام جەلالو نەوشیروان لە یاخسەمەر دانیشتم؛ دوپاتمکردەوە نامانەوێ جیابونەوەی عەسکەری بکەینو دەشمانەوێ، دوای کۆبونەوەی فراوانمان، لەناو یەکێتیدا وەکو باڵێک بمێنینەوە. وتیشم: ئێمە دەچینەوە قەراغ-تەکیە، هەتا بۆتان رونبێتەوە ناچینە ئێرانو ناشچینە ناو جود.. هێزیش جیاناکەینەوە، هاتمەوە بۆ هاوڕێیان: م.پشکۆو عیماد ئەحمەدم گێڕایەوە. کاک دلێری سەید مەجیدیش لەگەڵمان هات، ئەویش شایەتە. تەنانەت لە دانیشتنێکدا، پێشتر ئەو بۆچونانەم بۆ بەڕێزان: عەبدوڵڵای موهتەدی، برایم عەلی زادە، مامۆستا برایم (ساعدی وەتەن دۆست)، د.جەعفەر شەفیعیو فاروقی بابان میران، گێڕایەوە. فاروقی بابان میران وتی: جا یەکێتی رێگەی ئازادیتان لێناگرێ؟ وتم: هەوڵدەدەین. گرنگ ئەوەیە دەستمان نەچێتە خوێنی یەکتر. ئەم قسانە لە خێمەکەی شەهید (د.جەعفەر)دا کران. مەلەکەی هاوسەریشی (خوشکی شەهید فوئاد سوڵتانی) هاوکاری دەکردین. نامیلکەی (نما نامەی تیۆری)م لە ئۆردوگای کۆمەڵەدا چاپکرد.(**)

ئەوە رێبازو ئاکارمان بووە. کە دڵنیام سەرکردایەتی کۆمەڵە باش دەیزانی، ئەوە رێبازمانە. کەچی فەرەیدون عەبدولقادر دەنوسێ: (ناچار بووین خۆشەویستیو برایەتی فەرامۆش بکەین).

---

* بەڵگەی دەستنوسم لەسەر ئەم بۆچونانە ماوون. لە پاشکۆی کتێبەکەدا بڵاودەکرێتەوە.

** دوای پەلاماردانمان، مام جەلال سەردانی ئۆردوگای کۆمەڵە دەکات. باسی روداوەکە دەکرێ. د.جەعفەر شەفیعی، کە زۆر هاوڕێم بوو، بەتوڕەییەوە بە مام جەلال دەڵێ: مام جەلال هەر شۆڕشێک سەری سەرکردەکانی بخوات، لەناودەچێت.

راستیەکەی ئەوەیە، ناچار نەبون، بەڵکو بۆ هەل دەگەڕان، ئەو بڕیارو بەرنامەیەی لـەدوای دووەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەوە، بۆ پاکتاوکردنمان هەیانبوو، لە سێهەمین کۆنفرانسیش هەوڵیاندا بیسەپێنن، بەحوکمی هەڵوێستی ئەقڵانی ئێمەوە، بۆیان نەدەچووەسەر، لە ١٩٨٥/١١/١دا پەلاماری عەسکەرییان داین‌و، ئەو بڕیارەی لەسەر بنجی رقی دوور لە رەوشتی هاوڕێیانە، بەدییانهێنا. فەرەیدون، لە من باشتر نەوشیروان دەناسێ. لەزۆربەی کەین‌و بەین‌و پیلانەکانیشدا، لەناو کۆمەڵە، لە شەڕی ناوخۆدا، لە کۆنفرانسەکاندا، لەدوای یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەوە کە لە (ئایاری ١٩٨١)دا بەسترا، بەتەواوەتی دایشکاندبووە لای نەوشیروان.[+] لەناو کۆنفرانسەکەدا، یەک ئەندامی تەمەنی نەدەگەیشتە (٤٥) ساڵیش. (١٣٢) ئەندامی لە تەمەنی (٢٠-٣٠) ساڵیدا بوون. واتا: هێزی بەگوڕی سیاسی بون.[1] کە بەداخەوە زوو کەوتنە ژێر پروپاگەندە!!

لەم کۆنفرانسەدا، سەرەتای پیلانەکانی نەوشیروان‌و شوێنکەوتوانی دەرکـەوت‌و دەریشکەوت، زۆربـەی تەکەتولی زیندان چارەنوسیان بەتەواوەتی بەستۆتەوە بەو رێبازەوە، کە نەوشیروان بەرە بەرە هەوڵی سەپاندنی دەدا. تاکوتەرایان لە یەکەمین کۆنفرانسدا، نەکەوتبووە ژێر کاریگەری نـەوشـیروان، ئەمانیش لـەدوای دووەمین کۆنفرانسەوە، هەڵخزان!

بێگومان لەناو تەکەتولی زینداندا بیری جیاوازیش هەبوو، بەڵام لە دوائەنجامدا، بڕیارەکانی سکرتێری کۆمەڵەیان جێبەجێ دەکرد. لە کۆبونەوەو نوسین‌و پروپاگەندەدا، بەرگرییان لە بڕیارو بەرنامەکانی دەکرد. تەنانەت هاوبەشی تاوانەکانیشی بوون!!

کەوابێ "ناچار بووین"، بۆ بڕیاری هاتنەسەری ئاڵای شۆڕش لەئارادا نەبووە. بەڵکو بەرنامەو سیاسەتی پێشوەخت بڕیارلێدراوی ساڵەهای پێشتر بووە. ئێستا کە دەرکەوتووە، ئەو پەلاماردانە، بەشێک بووە لەو سیاسەتەی لە دوای یەکەمین کۆنفرانسەوە، بۆ پاکتاوکردنی خاوەن هەڵوێستەکان گیراوەتەبەر، تازە، بە دەستەواژەی "ناچار بووین" پاساوی بۆ ناهۆنرێتەوە! بەتایبەتی ئەو پاکتاوکردنە درێژەی کێشا بۆ هاوڕێیانی زیندان‌و گەیەندرایە هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەش!

+ یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵە لە مالیمۆس بەسترا. سەرەتای جیاوازی بۆچونەکان‌و بەرنامەی زاڵبون لەناو کۆمەڵەدا، دەرکەوت. تەکەتولی زیندان دایانە پاڵ نەوشیروان. توانییان سەربکەوون. تەنها ملازم عومەرو منیان پێ نەخرا. (١٨٥) ئەندام بەشدارییان کرد. من سەرپەرشتی رێکخستنەکانی شارەکانم دەکردو دەمامکەکانم بۆ دروستکردن‌و نەمهێشت بناسرێن.

١ بروانە: راگەیاندنی کۆتایی یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان. لەژێر دروشمی (بەرەو پتەوکردنی ریزەکانی کۆمەڵەو راپەراندنی جەماوەری گەلەکەمان) ئایاری ١٩٨١.

## ( ١٢ )

# ئەشکەنجە، تۆقاندن، زانیاری

مێژوو، پڕە لە تاوانو تالآن، بەڵام لە دادگای مێژوودا، ڕاستیەکان ون نابن. وتومەو دەیڵێمەوە: تەواوی سەرکردەو کادرو ڕوداوەکانی مێژووی یەکێتی، کۆمەڵە، شۆڕشو شۆڕشگێڕان، گەرچی بە هەڵمەتی ڕاگەیاندنو شەڕی سایکۆلۆژی، تائێستاش بەشێکی زۆری شێوێندراوون. بەڵام دەرگای دادگای مێژوو، دانەخراوەو داشناخرێ. لە دواسەرەنجامدا تاوانی گەورەو بچوک، دەردەخرێ. ئۆباڵی تاوانەکانیش هەر دەزانرێ. کەسیش لەو دادگاییکردنە دەرباز نابێ!

با دیقەت بدەینو بزانین فەرەیدون عەبدولقادر، چۆن دەرگای دادگای مێژوو لەسەر هەندێک ڕاستی دەکاتەوە، کە هەتا ئەم نەینوسی، زیاتر لە (٣٠) ساڵ، بەشی زۆری کادرەکانی کۆمەڵەو یەکێتی، پروپاگەندەکانیان دژی ئاڵای شۆڕشو خودی "مەلا بەختیار" بە ڕاست دەزانی. ئەوانەی بەڕاستیشیان نەزانیووە، بەداخەوە تائێستا، بەرامبەر بەو تاوانانە، تاوانی بێدەنگییان هەڵبژاردووە. لای من، تاوانو داپۆشینی تاوان، لە ویژداندا، یەکسانە بە تاوان. لە یاساشدا داپۆشینی تاوان سزای لەسەرە!

لە یاسادا بەندێک هەیە تاوانبار دەخاتە بەردەم توندترین سزا. ئەویش (سبق الاصرار) یان (جنحة عن عمد)ە. واتا: پێشوەخت بڕیاری تاوان درابێو نەخشەی بۆ کێشرابێ. با دیقەت بدەین، بەپێی گێڕانەوەی شایەتحاڵی گەورە، لەسەر تاوانی گرتنو ئەشکەنجەدانو زانیاری وەرگرتن، چی دەڵێ:

"ڕێگەمان دا بە گرتنەبەری ترسو تۆقاندنو ئەشکەنجەدان، تا زانیاریو دان پێدانانیان لێوەربگرین! بەوشێوەیە سوکایەتی بە (مەلا بەختیار)و ئەو هاوڕێیانە کرا."[١]

کەوابێ:

یەکەم: ڕێگەیان داوە ڕێگەی ترسو تۆقاندن بگیرێتەبەر.

دووەم: ڕێبازی بە ئەشکەنجەدان زانیاریو دانپێدانانیان لێوەرگرتن، گیراوەتەبەر.

سێهەم: سوکایەتی بە مەلا بەختیارو هاوڕێکانی، بە بڕیاری پێشوەختیان کراوە.

با خوێنەر خۆی بخاتە جێی منو مامۆستا پشکۆو شێخ عەلی، بزانێ ئەمەی بە بڕیار

---

١ فەرەیدون عەبدولقادر. هەڵۆ سوورەکانی قەندیل. دەزگای چاپو پەخشی سەردەم. چاپی یەکەم. سلێمانی-زستانی ٢٠١٧. ل(٥١١).

بەرامبەرمان کراوە، ئا ئەمە تاوانە؟ یان ئێمە داوای ئازادی بیروڕامان لە شۆڕشێکدا کردووە، کە منو شێخ عەلی لە دامەزرێنەرانی بوین. م.پشکۆش نمونەی تێکۆشەری ڕاستگۆ بووە. نەوشیروان دوای ساڵێک گەڕاوەتەوە ناو شۆڕشەکە. فەرەیدونو هاوڕێکانی لە دوو قۆناغدا، لەدوای هەرەسو دوای لێدانی کۆمەڵە، لەماوەی یەک ساڵدا، ئامادە نەبوون شۆڕش بکەن. ڕۆشتنیان لە خۆڕاگرتن پێ باشتر بووە. بەڵام دوای ئەوەی ڕۆژگاری شۆڕشو کۆمەڵە، بە پیلان هەڵدەگەڕێتەوە، لەخۆیان رادەپەرموون پرنسیپەکان پێشێل بکەنو ڕێگەیەک دەگیرێتەبەر، کە لە مێژوودا ڕێگەی ستەمکارەکانە. مەترسیدارترین دۆخی سیاسی، ئەو دۆخەیە کە ئیتر جیاوازیە سیاسیو ئایدیۆلۆژیەکان، بە زەبروزەنگ کۆتاییان پێدێتو لەبری بیری جیاواز، یەک سەرکردەو یەک ئاراستەو یەک سیاسەت، دەسەپێنرێ.

لە کاکە فەرەیدون دەپرسم: ئەگەر شەهید شیهاب سکرتێری کۆمەڵە بوایە، هەرگیز ڕێگەی دەدا تاوانی وا ئەنجامبدرێ؟ دڵنیام بڕیاری وای نەدەدا. یان ئەگەر شەهید ئارام مابا، قەت بڕیاری لەوجۆرەی بەرامبەر تاوانی بەرگرینەکردن لەدوای هەرەسو ڕۆشتن لەکاتی لێقەومانی کۆمەڵە، دەدا، هەرگیز بڕیاری وا نەدەدرا.(+)

فەرەیدونو هاوڕێکانی، پێیان قوت نەدەچوو لە ڕاپۆرتی شوباتدا، ڕەخنەی دروستیان لێگیرابێو (باوکی ئاوارە- مەلا بەختیار) لە ژمارە (٦)ی کۆمەڵەدا هەمان ڕەخنەی دوپاتکردبێتەوە.(*) کەچی لە دەسەڵاتدارێتی خۆیاندا، تەواوی تەکەتولی زیندان لە پلینۆمەکەدا بون، بڕیاری "تۆقاندنو ئەشکەنجەدانو دانپیادانانو زانیاری وەرگرتن"ی وەکو دەزگا تۆقێنەرەکانی حکومەتە فاشیستەکان دەدەن. خۆیان، ڕەخنەیەک قوت نادەن. بەڵام بڕیاری پاکتاوکردنی فیزیکیو هزر ئاسایی بووە لایان!! ئاسایی بووە نوزە لە ئازادی ببڕن.. بە گرتنو کوشتنی هاوڕێکانیشیان!

بۆئەوەی راستییەکان لە ڕێڕەوی مێژوویی خۆیاندا باسبکەین، گرنگە ئاماژە بەو ڕەخنەیەی باوکی ئاوارە بکرێ، هەتا خوێنەر بزانێ، ڕەخنەیەکی ئاسایی، چۆن لەکاتی

---

+ لەدوای گەڕانەوەی نەوشیروان، رقی زۆری لە هاوڕێیانی زیندان بوو. دەیگوت: شیهابو هاوڕێکانی تەواوی بەرنامەی بەرپاکردنی شۆڕشیان تێکدا. ئەگەر حکومەت لەسێدارەی نەدانایە، ئێمە دادگاییمان دەکردنو دەمانکوشتن. بەتوندی بەرپەرچم دایەوە!

* وتارەکە بەناونیشانی (چەند تیشکی بەسەر هەندێ لایەنی خەباتی کۆمەڵەدا) (٧) لاپەڕەی فولسکاپی گۆڤارەکەیە. لە ١٩٧٩/١٠/٨، لە گوندی شێنێدا نوسیومە. وەکو بەڵگەنامە لە پاشکۆی ئەم کتێبەدا بڵاودەکرێتەوە.

هەستیاریی کێشەکاندا، دەکرێتە کالآی پڕ بە باڵای هەلپەرستی. لە وتارەکەدا، جگە لە باسکردنی قارەمانێتی بێوێنەی شەهید شیهابو جەعفەرو کاریگەری رۆحی چۆنیەتی شەهیدکردنیان، لەسەر هاوڕێیانی کۆمەڵەو قووڵکردنی تەوژمی خەبات، ئەم پوختە رەخنە ئاساییەش گیراوە:

"لێرەدا، راستیەک هەیە، پێویستە نەیشارینەوەو بیخەینەڕوو، بۆ کەڵک لێوەرگرتن بۆ ئەوەی هەڵە دووپات نەبێتەوە، بۆئەوەی چیدی کارەساتی لەو چەشنە روونەدەن، ئەویش ئەوەیە، نەدەبوایە ئەو هاوڕێیانە مەیدانی خەبات جێبهێڵن، کە بەجێشیان هێشت نەدەبوایە رێگای ئێران بگرنەبەر، هەق نەبوو، چاوی لای دوژمن بنوقێنن‌و هەروا بەئاسانی بکەونە داویەوە، لەوکاتەدا کە ئەوان نیشتیمانیان بەجێهێشت، ناوەوەی نیشتیمان، سەنگەری خەبات‌و خزمەتکردن‌و چەسپاندن‌و جێگیرکردنی کۆمەڵە بوو، نەک دەرەوە".[1]

عادل مورادیش لە یاداشتەکەیدا هەمان رەخنەی هەیەو دەنوسێ:

"هەقبو شەهیدەکان هەڵنەیەن بۆ ئێران، بەڵکو لە شاخ‌و دێهاتی کوردستان خۆیان بشاردایەتەوە. تەنانەت کە لەسەر سنور رادەستی دەسەڵاتدارانی عێراق کران، دەیانتوانی لەچنگی پۆلیسی عێراق هەڵبێن".[2]

ئەمە لەکاتێکدا، ساڵێک پێشتر لە هەواڵنامەی ژمارە (١)دا، مام جەلال دەنوسێ:

"بەداخەوە کارەساتی راونان‌و گیرانی هەڤاڵان شەهاب شێخ نوری‌و جەعفەری مام واحید کارێکی زۆریان کردە سەر دواخستنی پلانەکەمان‌و چەندین مانگی دواخستین".[3]

-باوکی ئاوارە.. وتویەتی نەدەبوو ئەو هاوڕێیانە مەیدانی خەبات جێبهێڵن.

-مام جەلال.. نوسیویەتی: گیرانی هەڤاڵان شیهاب شێخ نوری‌و جەعفەری مام واحید کارێکی زۆریان کردە سەر دواخستنی پلانەکەمان‌و چەندین مانگی دواخستین.

-نەوشیروان نوسیویەتی: "پەیوەندی لەگەڵ کادرە پێشمەرگەکانی شۆڕشی ئەیلول بکەن، رێکخراوی پێشمەرگەیان لێ پێکبهێنن‌و ئامادەیان بکەن بۆ دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکدار. لە هیچ حاڵەتێکدا نابێ کوردستان بەجێبهێڵن. لە کاتی لێقەومان‌و ئاشکرابوندا خۆیان بشارنەوە، یان بچنە شاخ".[4]

١ کۆمەڵە. (گۆڤاری کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان). ژمارە (٦) پایزی ١٩٧٩. ل(١٠).

٢ عادل مراد. الانطلاقة من طليطلة الى بغداد. من ارشيف الانصات المركزي. ص(٣٥).

٣ هەواڵنامەی کوردستانی عێراق. یەکەمین هەواڵنامەی شۆڕش. ئامادەکردنی: نەوزاد عەلی ئەحمەد. ئەکادیمیای هۆشیاری‌و پێگەیاندنی کادیران- سلێمانی-٢٠١١. ل(٢٠).

٤ نەوشیروان مستەفا ئەمین. لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ. ل(٤٨).

-عادل موراد دەڵێ: "هەقبو شەهیدەکان هەڵنەیەن بۆ ئێران، بەڵکو لە شاخو دێهاتی کوردستان خۆیان بشاردایەتەوە".

دەپرسین: کام لەو بۆچونانە، قورسترنو زیاتر زیانی رۆشتنەکەیان دەرخستووە؟ بۆچونی باوکی ئاوارە، یان مام جەلال..؟ یاخود نەوشیروان؟ یاوەکو عادل موراد؟ سەرەڕای رەخنەلێگرتن لە هەڵهاتنیان، نەوشیروان دەڵێ: "ئێمە دڵێکمان بە رێکخستنەکانی کۆمەڵە خۆش بو. هیوایەکی زۆرمان لەسەر هەڵچنی بو. بەڵام روداوەکانی کوردستان کاری لەسەر کۆمەڵەش کردبو. ناکۆکی لە ریزەکانیاندا تەقاندبوەوە. تاقمێکی رێکخستنەکانی خوارەوەی کۆمەڵە دژی سەرکردایەتیەکەی راوەستابون، بەئاشکرا کەوتبونە جموجوڵو موهاتەراتو دامەزراندنی رێکخستنی تازە. سەرکردایەتی هەرچەند هەوڵی دابو بە رێگایەکی ئسولی چارەی ناکۆکیکان بکا. کەڵکی نەبو. سەرەنجام، بۆئەوەی لەو ئاژاوەیە دەربچنو رێکخستن لە لێدان بپارێزن. بڕیار ئەدەن بڕۆن بۆ ئێران بۆئەوەی لەوێوە بچن بۆ سوریا".[1]

با خوێنەر حوکمی ویژدان بدات. لەبەرامبەر هەموو ئەو رەخنانەو رەخنەی تریش، لەسەر رۆشتنی هاوڕێیانی زیندان بۆ ئێران، بێدەنگ بوون. بەڵام کە هاتنە دەرەوە، هەستیان کرد مام جەلالو نەوشیروان پشتیوانیانن‌و باسی رۆشتنەکەیان دادەپۆشن، بە هەلیان زانی وتارەکەی باوکی ئاوارە گەورە بکەن. تا ئێستاش نایبڕنەوە.

## (١٤)
## سوکایەتی، پێشێلی ئازادی؟

هەرچەندە نەمدەویست هەتا بیرەوەریەکانم دەنوسم، باسی وردەکاری گرتنەکەمانو ئەو نامانە بکەم، کە هەر لەکاتی گرتنو هەڵمەتی پروپاگەندە بۆ "سوکایەتی"و شکاندنمان، بڵاویان کردبوەوە. بەڵام دیسان، ئەمە تەمەنو ژیانە، رەنگە نەگەمە کاتی بڵاوکردنەوەی بیرەوەریەکانم. لێرەدا ئەوەندەی بەپێویستی دەزانم، روانگەی خۆم بڵێم. بۆئەوەی ئەو روانگەیەش بڵێم، جارێ با پەرەگرافێکی تری فەرەیدون عەبدولقادر لەمەڕ هەمان بابەت ئاماژە پێبکەم، ئینجا ئەوەی پێویستە روونیبکەمەوە. لەمبارەوە دەنوسێ:

---

١ سەرچاوەی پێشوو.

"هەرچەند لاپەڕەکانی ئەو سوکایەتی پێکردنە لای کاک (ئیبراهیم جەلال) مایەوە، بەڵام ئەگەر (نەوشیروان مستەفا)، بە زیرەکانە لێی نەسەندایەتەوە دوور نەبوو ئێستا لە بەڵگەکانی کتێبەکەیدا بڵاوی بکردنایەتەوە. داواشم لە کاک (نەشیروان) ئەوەیە.. ئەگەر نەیسوتاندون لەناویان بەرێت، تا چیتر پەڵەی چڵکنی ناوچەوانمان دەستاودەست نەکات"[1]

بۆ کۆتایی ئەم پەرەگرافە کە دەڵێ: (پەڵەی چڵکنی ناوچەوانمان دەستاودەست نەکات) ئەمە خۆی لەخۆیدا ئازایەتی نوسەرە، بۆ دانپیانان بەو تاوانە کە بۆتە پەڵەی چڵکنو ناوچەوانی سواغ داوون. وەکو تر..

کاکە فەرەیدون!

بەپێچەوانەوە، داوات لێدەکەم، وەکو سەرکردەیەک (٤٤) ساڵیشە یەک دەناسینو ئێستا نێوانیشمان خۆشە، قەتیش ئەو تاوانەم نەگرتوتە دڵ.[*] کە بەرپرسیارێتی ئەو "پەڵە چڵکن"ە هەڵدەگری، چیکە بڵاوکردنەوەی دوامەخەن. ئێستا کە تەواوی روداوەکانی رابوردوو، هۆکاری ململانێکانی رابوردوو، تاوانی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە، جیاکردنەوەی بزوتنەوەی گۆڕان لەیەکێتیو هەزاران نوسینو پەلاماردانی مام جەلال؛ سەرکردایەتی بێوەڵامی یەکێتی، لەبەرامبەر هێرشە پەیتاپەیتاکانی گۆڕان، دەرکەوتن.. دەریشکەوت، ئەو بڕیارانەی ئێوە لە سەرکردایەتی کۆمەڵەدا بە پیرۆزتان دەزانینو بەخوێنێکی ساردەوە، بڕیاری سوکایەتیکردنو تۆقاندنو ئەشکەنجەدانمان درا.. ئێستا کاتێتی هەرچی ئێمە لەزینداندا، وتومانەو نوسیومانە، بڵاوی بکەنەوە. کاتێتی:

کاکە فەرەیدونو هەموو ئەوانەی ئۆباڵی ئەو بڕیارانەتان لەئەستۆیە، با رووبەڕووببینەوە. ئێوە دادگای عەسکەریتان کردین، دادگای ئەشکەنجەدانتان کردین، دادگاییتان دەکردین وەکو تاوانبار، کە گوایە شۆڕش جیادەکەینەوەو مەترسی یەکتر کوشتنمان خستوتە ئاراوە.. ئێستاش کاتێتی ویژدانی گەلەکەمان بکەینە دادگای ئەو روداوانە. بەتایبەتی گەوهەری راستەقینەی بەشی زۆری ئەوانەی لە پلینیۆمەکەدا بون،

---

١ فەرەیدون عەبدولقادر. هەڵۆ سوورەکانی قەندیل. دەزگای چاپو پەخشی سەردەم. چاپی یەکەم. سلێمانی-زستانی ٢٠١٧. ل(٥١١).

* مام جەلال رۆژێک پێش ئازادبونم هاتەلام. گوتی: خراپەمان زۆر بەرامبەر کردویت. برادەران دەترسن بیر لە تۆڵەسەندنو هەڵمەتی راگەیاندن بکەیتەوە. وتم: ئەوەی چاکەی لەگەڵ کردم لەم زیندانە بیرم ناچێتەوە، ئەوەی خراپەی لەگەڵ کردوم، بیرم چۆتەوە! وتیشی ئەی ئەگەر ئێران یارمەتیان دای دژمان؟ وتم: ئێران نەک ئیسلامی بێ، بەڵکو دەوڵەتێکی سۆسیالیستیش بێ، یارمەتیم بدات دژی یەکێتیو ئەو پارتیزانانەی دوای ئەنفال، هەرگیز قبوڵی ناکەم.

لەدوای راپەڕین دەرکەوتون، نەک هەر تاوانیان بەرامبەر ئێمە کردووە، بەڵکو لە دەسەڵاتی بەرەی کوردستانیەوە کوردستانیشیان تالاّن کردووە. یەکێتییان تێکوپێک داوە. مێژووی خەباتی پێشمەرگەو شۆڕشیشیان خستۆتە بەر رەخنەو نارەزایی بێرادەی خەڵک!! بەو رەفتارو کردارانە دەریانخست کە بڕیاری کوشتنی ئێمە، بۆ پاراستنی کۆمەڵەو یەکێتی نەبوو، بەڵکو بۆ درێژەپێدانی تاوانی ترو تەختکردنی رێگاکانی تالاّنی بوو!! بۆ ئەوە بوو، هەموو ئەوانەی بڕیارەکەیان دا، کۆمەڵەو یەکێتیان بۆ تەخت ببێ، بەئارەزووی خۆیان تەراتێن بکەن‌و چۆنیان بوێ بڕیار بدەن، وەکو بڕیاری ترسناکیان دا!!!

کاکە فەرەیدون!

ئێستا تۆ دوریت لە دەسەڵات‌و منیش هەڵوێستم وەرگرتووە. هەندێک لە بۆچونەکانیشمان لەسەر چارەنوسی هەرێم‌و یەکێتی‌و سەرکردەکان، هاوبەشن.. ئیتر کاتێتی، بەئاشکرا، رووبەڕوو بەرێزت، یان هەر کەسێکی تر کە وەکو جەلادو چەشنی ئەفسەرە دڕندەکانی ئەمنی عێراق، بەرتاندابونە گیانی ئێمەی هاوخەباتتان.. ئەوکاتە چێژتان لە ئەشکەنجەدانی جەستەیی‌و دەرونی ئێمە وەردەگرت.. زۆرم پێخۆشە، لەنوسینی یاداشتەکانتدا رەخنە لەخۆت دەگریت، هیچ نەبێ یەکەمین کەسیت، لە سڕینەوەی ئەو "پەڵە چڵکن"ە ویژدانی خۆت ئاسودە دەکەیت. بەلاّم ئەگەر من بەو کەسە دەزانیت کە بێویژدانیی بەرامبەرم کراوە، تکام لێتە، هەرچی هەیە لەو پەڵە چڵکنە، لەسەر تەنافی رۆژگار هەڵیبخەن. پاشان دانیشین لە هۆڵێکدا، یان لەناو بازنەی هاوخەمەکانی خۆماندا، یاخود لە دیبەتی تەلەفزیۆندا، مشتومالّی ئەو دۆخەو ئەو بڕیارانەو ئەو سوکایەتیانە بکەین. هەتا بۆ دواجار، بەهەمووماننەوە وردەکاری‌و چۆنیەتی ئەو روداوانە بدەینە بەر نەشتەری رەخنەی ویژدان. نەک رقی سایکۆلۆژی. کاتی هاتووەو هەستیش دەکەم، خەڵکیش ئامادەیە سەرلەنوێ، لە دەمی خۆمانەوە راستیەکان وردتر بزانن! هەستی خەڵکیش بە فلتەری زەمانە، پاکبۆتەوە بەرامبەر ئەو روداوە!! بەتایبەتی لە شاخدا، چۆن بتانویستایە، تۆمەتتان بۆ هەڵدەبەستین.. بەلاّم لەم سەردەمەدا، تۆمەت هەڵبەستن ناچێتە سەر!

من ئامادەم، ئەگەر ئەو نامەیەی نوسیومە، یان ئەو قسانەی تۆمارتان کردووە، هەڵەم کردبێ، یاخود، تاقە کەسێکم لە هاورێیانی ئالاّی شۆڕش بەگرت دابێ.. ئامادەم سەرلەنوێ لە ویژدانی هاورێکانم دادگایی بکرێمەوە. نەک دادگای ژێر چەقۆی ترسنۆکێکی وەکو برایم جەلال.. کە خۆت دەڵێی.. بەڵگەکان بەهۆی نەوشیروانەوە نەبوایە، رەنگە بلاّویان بکاتەوە. بەلاّم خۆت دەزانیت ناوبراو، نامەشی بلاّوکردۆتەوەو کاری خراپتریشی کردووە. ئەوەی باشە، قسەکانی کاریگەرییان لەسەر هاوهەڵوێستی سوکی وەکی خۆی

نەبێ، لەسەر خەڵکی بەویژدان بەپێچەوانەوە، نەک کاریگەرییان نییە، بەڵکو نەفرەت لەو بڕیارانەش دەکرێ!!

ئەو قسانەش، تەنها ئەو قسانەی من دەسەلمێنێ، کە ناوبراو رقی هێندە ئەستورە، ویژدانی ئەوەندە بێبەزەییە لە ئاکاری هاوڕێیەتی‌و دوچاری نەخۆشی سایکۆلۆژی درێژخایەنێکی ئەوتۆشە.. هێشتا بە ئەشکەنجەدان‌و هەموو ئەو ناجوامێرییە، رقی کوێرانەی دانەمرکاوەتەوە. لە کتێبەکەشیدا، لێوان لێوە لەو رقەو لەو ئاکارە، کە هەر لەو دەوەشێتەوە! کە باسیشی دەکات، شانازی بە جەلادی بونی خۆیەوە دەکات.. دیقەت بدرێ، کەسێک نەخۆشییەکی کوشندەی دەرونی نەبێ، شانازی بە جەلادیەوە دەکات؟!

تەنها ئەو دڵڕەشە نەبوو، وەکو گەماڵی پۆلیس بەردەدرایە جەستەو هەڵوێستی ئەوکاتەمان.. کەسانی تر هەبوون، گرێی دەروونی منالییان، بە ئەشکەنجەدانی ئێمەمانان دەکردەوە. کە هەموان دەزانین، ئەوانە، لەو کەسانە بوون، لە تەواوی ژیانی پێشمەرگایەتیاندا، نەک فیشەکێکیان نەتەقاندبوو، بەڵکو تاقە چاکەیەکیشیان بەرامبەر کەس لێنەوەشایەوە. تاقە شانازییان لە شۆڕشدا، کە بتوانن باسی بکەن، شارەزاییان بوو لە ماستاوکردن‌و راپۆرت نوسین لەسەر هاوسەنگەرەکانیان. پاداشتی ئەو ناجوامێرییەش کە بەرامبەرمان دەیانکرد، چاوپۆشینی مەکتەبی سیاسی یەکێتی بوو لە دزییەکانیان‌و خۆفرۆشتنیان!! بەڵێ.. کاتێکیش، لە یەکێتی قەوما.. چەند کەسێکیان دەرکەوتن کە فایلیان لای ئیستخبارات هەیەو تاکو تەرایشیان نێوانیان لەگەڵ ئیتلاعاتی ئێران تەواو جێگەی گومان دەرچوو.(*)

بۆئەوەی ئەو قسانەمان جوانتر دەربکەون، بزانن کاکە فەرەیدون، خۆی بە دڵخوازی خۆی چی نووسیوە:

"هاوکات نەریتێکی خراپیشی لە رێڕەوی خەبات‌و لە کاری حیزبی‌و پێشمەرگانەدا جێ کردەوەو دەروازەیەکی گەورەشی بۆ سەرهەڵدان‌و پەرەسەندنی زەبروزەنگ و گیانی چز کردنی یەکتری‌و تاکڕەوی‌و تەنانەت دیکتاتۆریش کردەوە!".[1]

---

* سالح مالومەیی، کە بەرپرسی زیندانەکەم بووە لە یاخسەمەر، ژیانی منیان خستبووە دەست. دوایی جاسوسی لەسەر سەرکردایەتی کردبوو. تیرباران کرا. من خۆم گومانیشم لەم کوشتنە هەیە. گومانەکەشم ئەوەیە، وای دەبینم بەم ساڵحەیان وتبێ، بمکوژێ‌و تەسلیم بێتەوە. بەڵام ویژدانی قبوڵی نەکردووە، کوشتویانە هەتا پیلانەکەیان ئاشکرا نەبێ. چونکە مام جەلال، منی تەسلیم نەدەکردن، بمکوژن. بەو رێگایە هەوڵیانداوە، لەناووم بەرن!!

١ فەرەیدون عەبدولقادر. هەڵو سوورەکانی قەندیل. دەزگای چاپ‌و پەخشی سەردەم. چاپی یەکەم. سلێمانی-زستانی ٢٠١٧. ل(٥١١).

## ( ١٥ )

# سیاسۆسیۆلۆژی زەبروزەنگ(+)

لە پێشەکیدا، چەندین جار جەختمان کردۆتەوە کە ئەو رقو کینە سایکۆلۆژیە، هەڵەی سەرپێیی‌و کاردانەوە بەرامبەر هەڵە نەبووە. بەڵکو رێبازی سیاسی-سایکۆلۆژی کە دەتوانم دەستەواژەی (سیاسۆسیۆلۆژی) بۆ دابتاشم، ئەم سیاسۆسیۆلۆژیە، رێبازێکی دیاری ناو کۆمەڵەو یەکێتی‌و شۆڕش بووە، کە بەردەوام پەیڕەویی لێکراوەو لێکەوتەی ترسناکیشی لێکەوتەوە. بۆئەوەی لە قسەکانی فەرەیدون ئەو راستییە بێ تەمومژ دەربخەین، با بگەڕێینەوە سەر بۆچونە بوێرانەکانی:

"بەو شێوەیە چارەسەری کێشەی ناکۆکی ناوخۆ و رەفتار لەگەڵ تێکۆشەرەکانی خۆماندا، هێندە توندڕەویی‌و کاڵفامی گرتەخۆ، کە ئێستاش بیرم دەکەوێتەوە لە خەجاڵەتی بەولاوە ناتوانم هەستێکی ترم هەبێت".[١]

یەکێک لە خەسڵەتەکانی شەڕی سایکۆلۆژی، هەوڵی گەوجاندنی خەڵکە. زۆرجار پێویست بکات، بەڵگەی ساختەش بۆ گەوجاندنەکە دروستدەکرێ. فەرەیدون دەڵێ: رەفتارەکان کاڵفامی‌و توندڕەویی گرتۆتەخۆی.. واتا: ئەوانەی بڕیاری خراپیان داوە، خۆیان کەسی بەتوانا بوون، بەڵام لە رووی دەرونیەوە بەچەشنێک کاریگەری خراوەتە سەر دەرونیان، کراونەتە کاڵفام. کاڵفامی توندڕەویش. جا وەرە مێشک داشۆردرابێ، گۆڕدرابێ بە کاڵفامی، بە توندڕەویش جێبەجێ کرابێ. ئیتر بزانرێ گاڵتەجاڕیەکەی پلینیۆمو بڕیارە کاڵفامەکانیان، گەیاندۆتە چ ئاستێکی ترسناکی پێشێلکردنی ئازادی‌و رق!

شەڕی سایکۆلۆژی، لەناو خەڵکی پێشکەوتوشدا، رەواجی دەبێ. تەواوی جەنگەکان، تایبەت جەنگی دووەمو سەردەمی جەنگی سارد، بەشێکی بە جەنگی سایکۆلۆژی دەکرا.. لەناو خەڵکی پێشکەوتوشدا کاریگەری هەبووە. جۆزێف گۆبلز(*)ی وەزیری

---

+ سیاسی-سایکۆلۆژی. پێشگری سیا کۆبکرێتەوە لەتەک پاشگری لۆژی.. زاراوەیەکی جوانی لێدەردەچێ. پێکەوە رقی سیاسی‌و سایکۆلۆژی دەگرێتەوە (سیالۆژی).

١ فەرەیدون عەبدولقادر. هەڵۆ سوورەکانی قەندیل. دەزگای چاپو پەخشی سەردەم. چاپی یەکەم. سلێمانی-زستانی ٢٠١٧. ل(٥١١).

* جۆزێف گۆبلز (١٨٩٧-١٩٤٥)؛ وەزیری پروپاگەندەی سیاسی بووە لەسەردەمی هیتلەر و ئەڵمانیای نازی و یەکێک بووە لەدیارترین کەسایەتیەکانی حکومەتەکەی هیتلەر. ناوبراو هاوڕێ و دۆستی هیتلەر بووە تا دوا ساتەکانی هیتلەر، بەیەکێک لەئەفسانەکانی بواری جەنگی دەرونی دەژمێردرێت و دروشمی ئەوە بووە و بەردەوام وتویێتیوە «ئەوەندە پێداگری لەسەر درۆ بکە، تاکو خەڵکی باوەڕت پێدەکەن». لە ١ی ئایاری

پروپاگەندەی هیتلەر، لەناو ولاتی کانت، هیگل، نیتشە، مارکس‌و هایدگەردا.. پروپاگەندەی نازیەتی بلاودەکردەوەو سەدان هەزار سەربازو هەزاران نوسەرو پلەداریشی گەوجاند. تەنانەت فەیلەسوفێکی وەکو هایدگەریش ماوەیەک بەو پروپاگەندانە، فریو درا. بۆیە، ئەو (توندڕەویی‌و کاڵفامیی)یەی باسی دەکات، بە ئاراستەکراوەو بە بڕیار سەپێنراوە. بۆئەوەی بڕیاری هەرە خراپ بە مرۆڤ بدرێ، دەبێ هزری مرۆڤەکە لە بیروباوەڕی باش بەتاڵ کرابێتەوەو کرابێتە کاڵفام. کە کرایە کاڵفام، ئیتر دەبێتە مرۆڤی بێهەست‌و بێ هەڵوێست‌و بێ بڕست. کە مرۆڤیش لەناو حیزب‌و دەزگاکاندا وای بەسەرهێنرا، ئیتر ئاسانە لەبری ئەو بڕیار بدرێ. خۆم کەم کەسم دیووە، بەئەندازەی نەوشیروان مستەفا، توانای پروپاگەندەی سایکۆلۆژی هەبێ‌و بشتوانێ لە ماوەیەکی کەمدا، مەرامە سایکۆلۆژیەکانی بلاوبکاتەوە. سەرەنجام، ویستی مرۆڤ، لە ویستێکی وشیارەوە، بگۆڕێ بۆ رۆبۆتێکی بێهەست‌و بێ نەست‌و بێ ویست! چەندین کادرو سەرکردە هەبون، زوڕنای دەمی ئەو بوون، بۆ هەر پروپاگەندەیەک مەبەستی بوایە. وایشی تێدەگەیاندن، ئەو پروپاگەندانە لە پرنسیپی کۆمەڵەو پێویستیی ململانێکانەوە سەرچاوەی گرتووە. پێش‌و پاش یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵە، بارەگاکانی پڕ کردبوو لە دژایەتیکردنی سالار عەزیزو مامۆستا جەعفەرو لەناو کۆنفرانسەکەشدا، بەشێکی وا گەوجاندبوو، هەرچی ئەو دوو هاوڕێیە بیانگوتایە، نەک کاریگەری نەبوو، بەڵکو بە جۆرەها شێوەو بە کارەکتەری جیاوازیش، بەرپەرچ دەدرانەوە. کورتیەکەی نەوشیروان، نزیکەکانی دەستەمۆ دەکردو نەیارەکانیشی دەکردە شەیتان!

سەرکەوتنی باڵی راستڕەوی کۆمەڵە، لە یەکەمین‌و دووەمین‌و سێهەمین کۆنفرانسدا، ساڵ بە ساڵ مەترسییەکانی زۆرتر دەبوو. تاوانە ئەنجامدراوەکانیش، لەو ساڵانەدا، رەوتی هەڵچونیان بەخۆیانەوە دەبینی. تا گەیاندیانە رادەیەک، هاوڕێ رقی لە هاوڕێ‌و هاوسەنگەر رقی لە هاوسەنگەری خۆی بێ. نەک هەر لەناو کۆمەڵەدا، بەڵکو دژی شۆڕشگێڕانیش. با دیقەت بدەینەوە بزانین فەرەیدون عەبدولقادر، چۆن وێنای ئەو روتە رەفتارفاشییە دەکات:

"هاوکات نەریتێکی خراپیشی لە رێڕەوی خەبات‌و لە کاری حیزبی‌و پێشمەرگایەتیدا

---

ساڵی ١٩٤٥ جۆزیف گۆبلز خۆیی و خێزانەکەی و هەر شەش منداڵەکەی خۆی کوشتووە. (سەرچاوە: ویکیپیدیا)

جێکردەوەو دەروازەیەکی گەورەشی بۆ سەرهەڵدانو پەرەسەندنی زەبروزەنگو گیانی چزکردنی یەکتریو تاکڕەویو تەنانەت دیکتاتۆریش کردەوە!".[1]

با شیکاریەکی ئەو پەرەگرافە بکەین، هەتا بزانین چەند جومگەی هەرە مەترسیداری تیایە، کە ناکرێ بە راگوزەر بەسەر خوێنەردا تێپەڕن. وەکو:

-نەریتێکی خراپ لە رێڕەوی خەباتو کاری حیزبیو پێشمەرگایەتی.

-دەروازەی گەورەی سەرهەڵدانو پەرەسەندنی زەبروزەنگ.

-چزکردنی یەکتر.

-تاکڕەویو دیکتاتۆریەت.

سەد جار سوپاس کاکە فەرەیدون.. ئێستا ئیتر هەقوایە نەک ئەم رستەو راستیانە دوای ئەم کتێبە بزانرێ، کە نوسەرەکەی دوای سکرتێری کۆمەڵە، تەواوی دەسەڵاتی هەبووە. هیچ شتێک نییە ئەوکاتە رویدابێو دەرنەکەوتبێ نەیزانیبێ. ئیتر دەبێ، خوێنەر قووڵتر بڕوانێتە ئەو جومگانەو بگەڕێتەوە بۆ ئەوکاتە، لە یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەوە، سەرەتاکانی رەوتی ئاڵای شۆڕش درکیان پێکردبوون، بەڵکو زۆر جار زەنگی مەترسیەکانی ئەو زەبروزەنگەشمان لێداوە. بەڵام دەسەڵاتی راستڕەوەکانو قووڵکردنی گیانی هەلپەرستیو پلەپەرستی لەسەر حسابی بیروباوەڕ، تارادەیەک بەپشتیوانیی دەسەڵاتەکانی مام جەلالیش، توانییان لەناو یەکێتیو شۆڕشدا، زاڵبنو شۆڕشەکەش بگەیەننە "تاکڕەوی"و "دیکتاتۆریەت".[*] بێگومان، تاکڕەویو دیکتاتۆریەت، "دەروازەی گەورەی پەرەسەندنی زەبروزەنگ"یش لەناو شۆڕشو کۆمەڵەدا، دەکاتەوە. کە ئەم دەرگایەش کرایەوە، ئیتر زەبروزەنگەکە، ڕووبەڕووی تێکۆشەرە پاکو رەخنەگرە راستگۆکان دەکرێتەوە. وەفا نامێنێو رقو گیانی تۆڵەسەندن، پەرەدەسەنێ. کاتێک تاکڕەوێتیو دیکتاتۆریەت دەگەنە لوتکەی دەسەڵات، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، دەوروبەری

١ فەرەیدون عەبدولقادر. هەڵۆ سوورەکانی قەندیل. دەزگای چاپو پەخشی سەردەم. چاپی یەکەم. سلێمانی-زستانی ٢٠١٧. ل(٥١١).

* پێشتر باسمان کردووە کە مام جەلال لەدوای شەڕی بێتواتەوەو لە زیخان بەئاشکرا دەیگوت: ئاگری فاشیەت هەڵکراوە، نەیکوژێنینەوە، هەموتان دەسوتێنێ. مەخابن نەک نەیکوژاندەوە، بەڵکو چاویشی لێ پۆشی! با راستییەکیش پەیوەست بەم کێشەیە باسبکەم. هەڵەی چەند هاوڕێیەکی ئاڵای شۆڕش، بەتایبەت «سالار عەزیز» ئەوە بوو، پێکەوە ململانێی دژی مامو نەوشیروان دەکرد. من، ئەوکاتەش ئەو سیاسەتەم بە هەڵە دەزانی. بەڵکو مام جەلال لەسەر ئەوەی کێشەی کورد بەشێکە لە کێشە دیموکراسیەکانی عێراق کوتومت وەکو ئێمە بیری دەکردەوە. لەم ساڵانەدا کاک سالار عەزیز، بۆی دەرکەوتووە کە نەدەبوو سیاسەتەکە بەو چەشنە بکرایە.

ئەوانەی دیکتاتۆرن، تەواو بێدەسەلات کراون. بێ پەرچەکردار کراون. تەنها چاوی بینینی دیمەنە جەرگبڕەکانیان بۆ ماوەتەوە. کە حیزبێک وای بەسەرهات، دیکتاتۆر فەرمانڕەوای بێت، ئیتر ئەو حیزبە، حیزبێکی شۆڕشگێڕ نەماوە. حیزبێکی خاوەن بیروباوەڕ نەماوە. حیزبێکە، وەکو تەواوی حیزبە دەسەلاتدارەکان، هێزی چەکداری هەیە. ڕێکخستنیش دەکاتە دەزگایەکی بێهەلوێست کە تەنها ئەرکی چاودێریو راپۆرت نوسین دەبێ. راگەیاندنیش دەکرێتە، ئامرازی رازاندنەوەی بڕیارەکانی دیکتاتۆر. ئامرازێک جگە لە چەواشەکاری، کارێکی شۆڕشگێڕانەی نامێنێ!!

## (١٦)
## دیموکراسیو شۆڕشگێڕێتی!

دیموکراسی، فەلسەفەی سیاسیو شێوەیەکی حوکمڕانییە. وڵات نییە لەجیهاندا، لافی دیموکراسی لێنەدات. وەنەبێ سیستەمی دیموکراسی باشترین سیستەم بێ. نەخێر. چەرچڵ جوانی گوتووە کە گوتویەتی: "لەناو سیستەمە خراپەکاندا، سیستەمی دیموکراسی باشەکەیانە". دوای سێ هەزار ساڵ لە سەرهەڵدانی دیموکراسی لە شارستانیەتی گریکو (٢٥٠) ساڵیش لە سەرکەوتنی دیموکراسی سەرمایەداری رۆژئاوایی، هێشتا چۆنیەتی جێبەجێکردنی دیموکراسی هەر رەخنەی لەسەرەو مشتومڕ زۆر هەڵدەگرێ.

شۆڕشە چەکدارەکانی دونیا، تایبەتمەندییان وایە، هێزی سیاسی-چەکداری زاڵ، بە پاساوی دوژمنایەتی حکومەتە دیکتاتۆرەکان، یان داگیرکەران، هەمیشە کێشەی دیموکراسی لەناویاندا، کێشەیەکی ستراکچەرییە (بونیەوی).

یەک شۆڕشی چەکداری نییە، لەدوای جەنگی یەکەمەوە، سەرکەوتنی لەکاتی شۆڕشو لە ناوچەی ئازادکراودا، گەیاندبێتە هەڵبژاردنی ئازاد بۆ نەیارەکانی. پرۆسەی وا لە مێژووی شۆڕشە چەکداریەکان، لەسەدەی رابردوودا بونی نەبووە.

ئەوەی هەبووە، تەنها رادەیەک بواردانە بە بیروڕای جیاواز، یان رەخنەی تارادەیەک ئازاد. لەمە زیاتر پرۆسەی دیموکراسی بەو چەمکەی دەستاودەستکردنی دەسەلاتی شۆڕشگێڕەکان، لە گەرمەی شۆڕشەکاندا نەبووەو نییە. لە دۆخی ئەو شۆڕشانەشدا کە فرەلایەنی تیایە، ئەمانیش، هەمیشە هێزی باڵادەست وەکو دەسەلاتداری یەکەمی

ناوچە ئازادکراوەکان هەڵسوڕاون. بەردەوامیش لەسەر چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ناوچە ئازادکراوەکان، کێشەی جۆراوجۆر هەبووە. رادەی سەربەستی لایەنە لاوازەکانیش لەبەرامبەر هێزی باڵادەستدا، بگرەوبەردەی زۆر لەسەر بووە.

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، وەکو هێزی نیمچە بەرە، کە دەستی بە شۆڕشکردن کرد، دەستپێشخەر بوو لە پەلاماردانی سیاسی دژی پارتیو بنەماڵەی بارزانی. پارتیش بە شەڕی چەکداری ناوخۆ، وەلامی رەخنەکانی یەکێتی دایەوە. ئەمە لە سەرەتای دامەزراندنی یەکێتیەوە، روویدا. ئەو پەلامارە سیاسییە، کە رەخنەگرتنی توند بوو بەرامبەر هەرەسپێهێنانی شۆڕشی ئەیلول، کە ئەگەر بەچاوی ئێستا بخوێنرێتەوە، بەئاسانی هەمان ئەدەبیاتی سیاسی سەردەمی جەلالی-مەلایی، لە فۆرمێکی تردا، دوبارەکراوەتەوە. کە ئەدەبیاتی پارتیو کاردانەوە عەسکەریەکەشیان هەڵدەسەنگێندرێ، ئەمانیش، هەمان بڕیارو بەرنامەی سەردەمی جیابونەوەی شەستەکان دوبارە دەکەنەوە. بەمەش، بەشێوەیەک لە شێوەکان، شۆڕشی نوێش، کەوتە ناو گێژاوی جەلالی-مەلاییەوە! بەڵام لە فۆرمی شۆڕشی نوێو شۆڕشی گوڵاندا!! هەر لە دامەزراندنیانەوە، کە یەکێتی فەلسەفەی فرەیی هێنایەگۆڕێو پارتیش بەناوی قیادەی موەقەتەوە، گوایە ڕێبازێکی رەخنەگرانەی لەچاو شۆڕشی ئەیلولدا هەیە، کەچی لە دامەزراندنەوە، بە پەلاماردانی سیاسی بێسنور بەرامبەر یەکدیو لێدانی عەسکەری مەفرەزە سەرەتاییەکان، دەرکەوت، فرەییەکەی یەکێتی ناچێتەسەرو رەخنەلەخۆگرتنەکانی پارتیش، هیچی لە گەوهەری پارتی نەگۆڕیبوو.

لەناو خۆیشیا، یەکێتی باڵەکانی ڕێسای هەڵسوڕانی ئازادییان، دیارینەکرابوو. بۆیە، لەساڵی یەکەمی شۆڕشدا، کۆمەڵەو بزوتنەوەی سۆسیالیست، ناکۆکیەکانیان تەشەنەیان سەند. ناکۆکیەکەش، وەنەبێ لەسەر ئێزگەی جیاواز، یان ئۆرگانە چاپەمەنیە ئازادەکان بوبێ. نەخێر. لەسەر بەڕێوەبردنی یەکێتیو دابەشاندنی پۆستەکانو پشکی کۆمەکەکان بوو. لەسەر رەفتارو هەڵسوکەوتو چۆنیەتی شۆڕشەکە بوو! تەنانەت لەسەر ستراتیژی شۆڕشەکەش بوو!

هەتا ساڵی ١٩٧٨، جگە لە هەواڵنامە، بۆ چالاکی پێشمەرگەو سیاسەتی یەکێتی کە هاوبەش بووە، یەکەمین جار، پێش هەموو لایەک لەکوردستاندا، کۆمەڵە گۆڤاری کۆمەڵەی وەکو ئۆرگان لە دووەمین کۆبونەوەی فراوانی کادراندا (١٩٧٨/١١/٨-شێنێ) بڕیار لێداوە. ژمارە (١)ی پایزی ١٩٧٨ دەرکرا. تێکڕا (٣١) ژمارەی هەتا نیسانی ١٩٨٧

لێدەرچوێندراوە. هەتا بزوتنەوەی سۆسیالیست جیابونەتەوە، ئۆرگانیان نەبوو. کۆمەڵەش لە هیچ بابەتێکدا دژی هزری سیاسی، یان هەڵسوکەوتی بزوتنەوە، رەخنەی نەگرتووە. سەرەڕای ئەوەی جیاوازیی ڕێبازی هەردوولا زەق بوو. ناکۆکیەکانیش بەرە بەرە هێندە قووڵبون، گەیشتە جیابونەوەی بزوتنەوە لە (زستانی ١٩٧٩)دا. ئەمەش لەخۆیدا مایەی رامانێکی مێژوویی قووڵە. بزوتنەوەیەکی سیاسی، حیزبەکەی‌و هێزەکەی جیادەکاتەوە، ئۆرگانی نەبووەو هێڵە جیاوازەکانی ئایدیۆلۆژی جیابونەوەکەی دیارینەکراوە. نمونەیەکی دەگمەنە. هەمیشە جیابونەوە لەسەر ئایدیۆلۆژیەت‌و سیاسەتی قووڵی جیاواز رودەدا. کەچی لەکوردستاندا، بزوتنەوە جیابۆتەوە، کەمترین کێشەی ئایدیۆلۆژی دیاریکراویان بە چاپکردن هەبووە. بەش بەحاڵی خۆم، جگە لە رەخنەی بزوتنەوە لە ئیدارەدانی یەکێتی‌و سیاسەتەکانی، بەشێکی شاردراوەی جیابونەوەکە، بۆ شوێنەواری سیالۆژی (سایکۆلۆژی-سیاسی) سەردەمی جەلالی-مەلایی دەگێڕمەوە. رۆڵی پارتی‌و پاسۆک‌و د.مەحمودیش لەم جیابونەوەدا کاریگەر بووە.[*] خۆ بە رێکەوت نەبوو، زۆربەی ئەوانەی لەگەڵ بزوتنەوە کەوتن، کۆنە مەلاییەکان بوون!! ئەو بزوتنەوانەی لەناو یەکێتیشدا مانەوە، کۆنە جەلالیەکان بوون!

دوای جیابونەوەی سۆسیالیست، هاوکێشە سیاسی-عەسکەریەکەی شۆڕش گۆڕدرا. پارتی، لەقۆناغی بەرگرییەوە، دوای کارەساتی هەکاری، دۆخەکەی قۆستەوە بۆ کۆکردنەوەی ئەو هێزانەی نزیکن لێی. هەتا بزوتنەوە جیانەبوەوە، بە هێزێکی بچوکی وەکو پاسۆک، پارتی نەیتوانی ئەو کارە بکات. بگرە پاسۆکیش خۆی بە تەواوەتی بە لای پارتیدا، دانەدەشکاند. ئەمە لەکاتێکدا، ئەگەر کاریگەریە مەنەلۆگەکانی[+] سایکۆلۆژی سەردەمی جەلالی‌و مەلایی نەبوایە، دەبوایە دوای کارەساتی هەکاری، بزوتنەوەی سۆسیالیست، لەبەرئەوەی سەرکردەکانی شەهید کران، ریزی یەکێتییان بەهێز بکردایە. کەچی پێچەوانەکەیان کردو کەوتنە دژایەتی یەکێتی.

لەو دۆخەدا حیزبی شیوعیش، کەوتنە بەر پالاماردان، پۆل پۆل دەهاتنە دەرەوە. دەرکەوت، ئەو سیاسەتەی لەگەڵ حکومەتی عەبدولکەریم قاسم (١٩٥٨-١٩٦٣) گرتیانەبەر، بەناوی ئاشتییانە چارەسەرکردنی کێشەکان، هەتا کودەتاکەی بەعس ١٩٦٣،

* حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیش، پشتیوانی بزوتنەوەی سۆسیالیستیان دەکرد. تەنانەت هاوکاری مادی‌و عەسکەریشیان دەکردن. ئەوکاتە، یەکێتی‌و دیموکرات، ناکۆک بوون.

+ مەنەلۆگ: گەڕانەوە بۆ دیالۆگ‌و روداوی رابوردوو.

چۆن سودی نەبوو، ناوەرۆکی هەمان سیاسەتی راستڕەوێتییان، بە پاساوی بەرەی نیشتمانیی عێراقەوە.[*] ئەمیش تەنها چوار ساڵی خایاند. بەعس پەلاماری دانەوە. هەروەکو ١٩٦٣ پەناگایان هەر شۆڕش بوو. لەمەشدا حیزبی شیوعی، لە زۆربەی حیزبە لێدراوەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست جیادەبێتەوە. ئەو حیزبە لێدراوانە دەکەونە خەباتی ژێرزەمینیو لافلێدانی ئاشتیانە چارەسەرکردن، حیزبی شیوعی، هانا بۆ شۆڕش دەباتو بەشداری دەکات. بەڵام وا رێکەوتووە، هەمیشە ئەم حیزبە بەسەر ناکۆکیە سیاسیەکانی کوردایەتیدا کەوتون. چۆن لە شۆڕشی ئەیلولدا کەوتن بەسەر ناکۆکیەکانی باڵی مەکتەبی سیاسیو باڵی بارزانیدا، سەرەنجام دایانشکاند بەلای باڵی بارزانیدا، هەر بەهەمان شێوە، لە شۆڕشی نوێشدا، سەرەڕای ئەوەی یەکێتی هەموو توانای خستە کار بۆ دالدەدانو هاوکارییان، بەڵام لە دوائەنجامدا، هەر دایانشکاندەوە بەلای پارتی-سۆسیالیست-پاسۆکدا؛ سەیر ئەوەیە، لە شۆڕشی ئەیلولدا، کە جەلالی لەپاڵ حکومەتو شیوعی لەپاڵ مەلایی بوو، حیزبی شیوعی شەڕی عەسکەری جەلالیەکانیان نەدەکرد. کەچی لەشۆڕشدا یەکێتی چاکەی زۆریشی بەسەریانەوە هەبوو، شەڕی حکومەتیشی دەکرد، لەپاڵ پارتی شەڕی یەکێتییان بە سیاسیو عەسکەریو پەیوەندی ئینتەرناسیۆنالیش کرد! لە درێژەی ئەم سیاسەتەشدا بەرەی "جود" دامەزرا. شەڕی مەڵبەندی سێ هەڵگیرسا. گەیشتیشە قرناقاو پشتئاشان.

بە سیاسەتی دیفاکتۆ، نەک بە رێکەوتن، ناوچەکانی هەولێر بەکردەوە بوو بە ناوچەی نفوزی سۆسیالیست. یەکێتی هەتا ساڵی ١٩٨٠یش لەوێ لاواز بوو. سلێمانی، کەرکوک، گەرمیان، راپەڕینو هەڵەبجەش، بون بە ناوچەی نفوزی یەکێتیو سۆسیالیست لاواز بون. کە محەمەدی حاجی مەحمود دایە پاڵ سۆسیالیست لە شارەزوور-سورێندا، سۆسیالیست هێزی پەیداکرد.[**]

* لە ساڵڕۆژی کودەتاکەی حیزبی بەعس (١٩٧٣/٧/١٧) بە واژۆکردنی سەرۆک کۆماری ئەوسای عێراق ئەحمەد حەسەن بەکر- عەزیز محەمەد سکرتێری حیزبی شیوعی عێراق بەرەی نیشتمانیی نەتەوەیی پێشکەوتنخواز- ئیمزا کرا.

** بزوتنەوەی سۆسیالیست پێش ئەوەی ببنە حیزب جیابونەوە. سەرەتا شەوکەتی حاجی موشیر لەگەڵیان کەوت. رەسول مامەندیشی بردە شارباژێر بۆ زاڵبون لە ناوچەکە. بەڵام کە بۆی دەرکەوت زاڵ نابنو زانیی حەمەی حاجی مەحمودو رەئوفی خەلیفە سەعید چونەتە پاڵ بزوتنەوە، بایدایەوەو هاتەوە ناو یەکێتی. بەئومێدی ئەوەی بکرێتە ئامر هەرێم. بەشێکی زۆری ئەو کێشەیەی نێوان بزوتنەوە-کۆمەڵە لە ناوچەی هەڵەبجە، هۆکارە سەرەکیەکەی هزرو فەلسەفە نەبوو، بەڵکو هەڵپەی بەرپرسە عەسکەریەکان بوو بۆ دەستکەوتو کۆنترۆڵکردنی ناوچەکەو هێزەکە. شەوکەتی حاجی موشیر، بەردەوام، بەشێکی ئەو کێشانە بوو.

له کۆی ئەو ناکۆکیو ململانێو کێشانەدا، کە شەڕی ناوخۆیشی تێکەوتو سەدان قوربانیش دران. تەنها یەکێتیو پارتی، دوو ڕێبازی ئایدیۆلۆژی جیاواز بونو دەشێ جەخت بکەین، پارتی-بنەماڵەی بارزانی، لە شۆڕشی نوێشدا، لەسەر هەمان ڕێی کوردایەتی کۆن بەردەوام بون. بەگشتی یەکێتی ڕێبازی فرەیی هێنایەگۆڕێو ئایدیۆلۆژیەتی جیاوازی تارادەیەک لەناوخۆو دەرەوەدا، پەیڕەو دەکرد. ئەمەش، لەدوای سێهەمین کۆنفرانسی کۆمەڵە هەنسکی بڕا. وەکو تر، سۆسیالیست-پاسۆک، نەیانتوانێ تا سەر ململانێی سیاسیش بپارێزن. بۆیە، هەردوولایان، لەناو پارتیو یەکێتیدا گیرسانەوە. کەسی یەکەمی پاسۆک چووە ناو پارتیو کەسی یەکەمی سۆسیالیست هاتەوە ناو یەکێتێ! هەروەها زۆربەی سەرکردەکانی تریشیان.(+)

لێرەدا ڕاستیەکی مێژوویی هەیە، گرنگە باس بکرێ. سەرەڕای ئەوەی پارتی بەرپرسیارە لە هەرەسی شۆڕشی ئەیلول. کە دروستیش بونەوە، بەهەمان ڕێبازی جارانیان هاتنەوە مەیدان. یەکێتیش بە ڕێبازی فرەیی سەریهەڵدا. کەچی ڕای گشتی گەلەکەمان، لەڕووی دەرونیەوە، کاریگەری (پارتی-بارزانی)یان، هەر لەسەر مابوو. هەروەها کاریگەری دژایەتی جەلالیش، لەسەر خەڵکەکە بەهێز بوو. تەنانەت لەهەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستانیشدا (١٩٩٢) ئەم کاریگەرییانە دەرکەوتن.

## (١٧)
## دیموکراسیو هەڵکوتانەسەر!

هێزی سیاسی-چەکدار، لایەنی کەمی مەترسی لەسەر نفوزی چەکدارو ناوچەی پاوانکراوی هەبێ، چ چەپ چ ڕاست، مەحاڵە بە پرۆسەی دیموکراسی کێشەو ناکۆکیەکان چارەسەر بکات. کاتی خۆی تیتۆ، هەڵیکوتایە سەر جەنەراڵە نەیارەکەی لەناو سەنگەری بەرەنگاری یوگسلافیادا. شۆڕشگێڕەکانی ئەفریقیا دژی یەکتر هەروایان

+ ئاڵای شۆڕش، دوای هەوڵێکی زۆر بۆ ڕێکخستنی بەرەی چەپ. سەرنەکەوت. کە شورەویو ئورووپای ڕۆژهەلات شکستیان خواردو هەڵوەشانەوە. ڕاپەڕین بەرپا بوو. ئەزمونێکی تازەی دیموکراسی بونیات دەنرا. فەلسەفەی چەپ، لەسەر ئاستی دونیا بەزۆری لەسەر دیموکراسی ساغبوەوە. ئاڵای شۆڕش بۆ پتەوکردنی ئەزمونی دیموکراسی، لەگەڵ یەکێتیدا یەکیگرتەوە.

کرد. ڕێکخراوی فەتح بەرامبەر چەپەکان، توند بوو. لەکاتێکدا، هەموو دەسەڵاتەکەیان لەناو ئۆردوگاکانی لوبنانو ئوردندا بوو. پەکەکە، تائێستاش ڕێ نەداوە، تاقە گروپی سیاسی نەک لەناو باکوری کوردستانداو لە شاخەکاندا مەفرەزەیان هەبێ، بەڵکو لە شاخی قەندیلو گارا و شنگاریش کە لە باشوری کوردستانیشدایە، ڕێگەی ئازادی عەسکەری نادەن. لە ڕۆژئاواش پەیەدە، جگە لە هێزی خۆی، هێزی دیکەی قبوڵ نەکرد. دیموکراتو کۆمەڵە، هەر لەسەر ناوچەی نفوز بوو بەشەڕیان. کەمتر لەسەر ئایدیۆلۆژیەتی جیاواز بوو.

لە باشوری کوردستاندا، سەرەتا مەکتەبی سیاسی هەڵەیەکی قورسی کرد لە چوارەمین کۆنگرەی ماوەتدا مەلا مستەفای تەجمید کرد. مەلا مستەفاش کاردانەوەی عەسکەری توندی بەرامبەریان نواند. بارزانی هەر زوو چارەسەری عەسکەری سەپاندو سەریشکەوت. لە شۆڕشی نوێشدا، چ یەکێتیو چ پارتی، دوو هێزی بەدەسەڵاتو بە زەبروزەنگ بون. تەنها ڕێگەیان بەو لایەنە سیاسی-چەکدارانە دەدا لەسایەیاندا هەڵسوڕێن، کە ترسیان لێیان نەبوو. ئەگینا لەهەر دەڤەرێک ترسیان لە هەر هێزێک پەیداکردبێ، لەسەر نفوزی خۆیان، خەفەیان کردون؛ خەفە نەبوبن، توانیبێتیان سەرکوتیان دەکردن. نمونە حیزبی شیوعی بون. لە شۆڕشی ئەیلولدا هەردوو حیزبی شیوعی لیژنەی مەرکەزیو قیادەی مەرکەزی، بچوکترین دەسەڵاتیان نەبوو. لەم شۆڕشەشدا، نە لە ناوچەکانی یەکێتیو نە هی پارتی، حیزبی شیوعی دەسەڵاتیان بەسەر گوندێکیشدا نەدەشکا. نەشیاندەتوانی بڕیاری یەک شەڕ بدەن. بەناچاریی دەسەڵاتی هەردوولایان قبوڵ دەکرد.

با بگەڕێینەوە بیرەوەریەکەی فەرەیدون عەبدولقادر، کە لەمبارەشەوە بێ چەندوچۆن ڕاشکاو دەنوسێ:

"ئێمە کە ڕێکخراوێکی چەپ بووینو لەناو قەوارەی ڕێکخراوێکی نیمچەبەرەییدا، کە پێی دەوترا (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان) خەباتمان دەکردو درێژەمان بە تێکۆشان دەدا! زۆر باسمان لە دیموکراسیو ژیانی دیموکراسیو سیستەمی دیموکراسی لە حیزبو لەکۆمەڵدا دەکرد، بۆیە گەر بەپێی ئەو بانگهێشتە بووایە، دەبوو ئەو کێشەیەمان بە ئاسانترین شێوەو بە دیموکراسیترین ڕێگەو بەوپەڕی برایانەو هێمنانەو لەسەرخۆ چارەسەرو تەماشا بکردایە!".[1]

١ فەرەیدون عەبدولقادر. هەڵۆ سوورەکانی قەندیل. دەزگای چاپو پەخشی سەردەم. چاپی یەکەم. سلێمانی-زستانی ٢٠١٧. ل(٥١١).

بەڵێ.. ڕاستی وتووە: زۆر باسیان لە دیموکراسیو ژیانو سیستەمی دیموکراسی کردووە. کەوابێ:

-تەنها باسیان لە دیموکراسی کردووەو کاتێک مەترسی ئازادی ڕێبازی جیاواز تینی بۆ هێناوون، لە دیموکراسی هەڵگەڕاونەتەوە.

-کێشەکەیان، بەپێی دیموکراسی چارەسەر نەکردووەو هێزو زەبروزەنگیان بەکارهێناوە.

-ڕێگای برایانەو هێمنانەو لەسەرخۆیان نەگرتۆتەبەر، بەڵکو پێچەوانەکەیان سەپاندووە.

لەکۆتایی ئەم بەشەدا، با ئەو قسانەی کاکە فەرەیدون لێکبدەینەوە، ئەوکاتە پاساوی بڕیارەکانیان دژمان چی بووە؟ هەتا بزانین پاساوەکان، پاساوی ڕاستەقینە بون، یان بۆ سەپاندنی بڕیارە دژە دیموکراسیەکان، داتاشرابون؟

"هاوکات دەبوو ئەوانیش، واتە (ئاڵای شۆڕش) دەستیان بۆ هێزی پێشمەرگە نەبردایە! بۆیە کاری سیاسیو مرۆڤ دۆستانە وا بوو، کە دەبوو ئێمە خۆمان هێزەکانی پێشمەرگەمان وریا بکردایەتەوەو پاسای سەربازیمان پەیڕەو بکردایە بۆ پاراستنی ئاسایشی هێزەکانمانو هاوکات سەرکردەکانی ئەوانیشمان بە نامە و نێردراو جارێکی تر لەو هێڵە سورە هوشیارو ئاگادار بکردایەتەوە، نەک کوتوپڕ هەڵکوتینە سەریانو دەستگیرو زیندانیان بکەین! لەکاتی ناچاریشدا، کە ئەگەر گرتنیان پێویستیەکی گرنگی ئاسایشی شۆڕشو (یەکێتی) بووایە، دەبوو بەڕێزەوە ڕەفتاریان لەگەڵ بکرێ".[1]

ئەمەیە کورد بدوێنی شەرعی خۆی دەکات. سەپاندنی بڕیارو تاوانەکەیان هێندە قێزەونە، فەرەیدون نە دەتوانێ دانی پیا نەنێو نە دەشتوانێ پاساوێکی لاوازیش بۆ بڕیارەکە دوای (٣٢)ساڵیش، بهۆنێتەوە. ئەمە لەکاتێکدا نوسەر، بەتواناشە لە نوسیندا. کەچی، ئەو مێژووەیان هێندە نادیموکراسییە.. قەڵەمەکەیشی گۆ ناکات، هیچ نەبێ کەمێک ئۆباڵی ئەو تاوانە لەئەستۆدا سوک بکاتەوە!!

کاکە فەرەیدون دەڵێ:

دەبوایە ئاڵای شۆڕش دەستیان بۆ هێزی پێشمەرگە نەبردایە. جارێ، ناکرێ نکوڵی لەوە بکرێ کە خۆمان پێشمەرگە بوین. ئەوەش بوین کە هەبوین. ئاسایی بووە، لەناو

---

١ سەرچاوەی پێشوو، زستانی ٢٠١٧. ل(٥١١-٥١٢).

هێزەکە هاوسەنگەرو هاوڕێو دۆستی نزیکمان بوبێ. بەڵام ئایا، دەستمان بۆ هێزەکە بۆ جیابونەوە بردووە؟ نەخێر. باشترین بەڵگەشمان ئەوەیە کە لە دۆڵی جافایەتیەوە چوینە شارباژێڕی تەختو تیپەکەی شەهید (جەلالی حەمەی محێ)مان بینیو بەپیریشمانەوە هاتنو پێشیانوتین: بچنە بەرکێو، لەوێ خۆتان پەنا بدەن هەتا دۆخەکە روندەبێتەوە. ئێمە وتمان: نامانەوێ هیچ گومانێک دروست بکەین.. دەچینەوە (تەکیە-قەراغ) هەروەکو گفتمان داوە. چویشین. ئێتر دەستی چیمان بۆ پێشمەرگە بردووە؟ بە یەک فەرماندەی پێشمەرگەشمان لەسەرانسەری کوردستان نەوتووە، کە بەرنامەی جیابونەوەی عەسکەریمان هەیە. لەکاتێکدا دەیان سەرتیپو ئامر کەرتو ئامر مەفرەزە هەبون، یان ئالای شۆڕش بون، یان سۆزیان لەتەکماندا هەبوو. ئێتر پاساوی دەستبردن بۆ هێزی پێشمەرگە، بێبناغەیە. هەر قسەی پێشوی کاکە فەرەیدون راستە کە تاکڕەوێو دیکتاتۆریەت بوو.(*)

دیکتاتۆریەت، لە هزری تاکو فەزای تۆقاندنی دەرونییش، لەدوای روداوێک کوتوپڕ سەرهەڵنادات. هیتلەر، بە هاوپەیمانی لەتەک ژەنەراڵ هندبنوورگ، لە هەڵبژاردندا (١٩٣٣) بردیەوە. مۆسۆلینی وەکو چەپ دەرکەوت. هیتلەرو مۆسۆلینیش، لەئۆپۆزسیۆنەوەو بە پروپاگەندەیەکی زۆر، هاتنە سەر حوکم. کەچی چییان بەسەر جیهان هێنا. زەمینەی ئەم فەزایە، لەدوای یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەو پاکتاوکردنی سەرکردە شایستەو کادرە هیلاکەکانی کۆمەڵە، لە ئۆرگانەکان، دەستیپێکردبوو. کە بەداخەوە، تەکەتولی زیندان، بە بیانووی لاواز لاوان، یان بەهۆی هەندێک هەڵەی بچوکەوە، دەرفەتیان گەورە کردو بوون بە بەشێک لەو سیاسەتە، کە لەئاکامدا ئاگرەکەی، خۆشیانی سوتاندو کۆمەڵەشی لەناوبرد!! یەکێتیشی گەیاندە دۆخێک، فەلسەفەی لە دامەزراندنی بەرەی کوردستانی فراواندا، زڕ دەرچوو. لەدوای راپەڕینیشەوە، کێشەگەلی زۆر لەناویا تەقیەوە!!

---

* نەوشیروان، دوو کەسی راسپاردبوو (سەرتیپێکو ئامر کەرتێک) کە لێمان نزیک ببنەوە هەتا زانیاریمان بگەیەنن. من گومانم لێیان هەبوو. بەردەوام پرسیاریان لێدەکردم. منیش بەڵگەم نەدەدا بەدەستەوە. کە لە زیندان بومو نەوشیروان سەری لێدام، وتی: بۆچی وەلامی (!!)ت بە نامە نەدەدایەوە. وتم: ئەمزانی تۆ راتسپاردوون. لای سەیر بوو. ئەو دوو کەسە، تاوانیشیان کردو لە ئەنفالەکاندا تەسلیم بونەوە. رەگی خیانەت.. مەترسیدارە!!

# (١٨)
# عێراقیو کوردستانی ئۆتۆنۆمی

نوسەری (چەپکێک) لەلایەکەوە وەکو مێژوونوسێکی کارامە، لەلایەکی تریشەوە وەکو تیۆرسێنو جاروباریش وەکو جەنەراڵێکی عەسکەری دەدوێ. لەکاتێکدا، یەک لاپەڕەی ڕێکوپێکی لەسەر مێژوو نەنوسیووە. نیو وتاری تیۆریشی نییە. لە عەسکەریشدا، نەک فەرماندەی شەڕێک نەبووە، بەڵکو هەمیشە لەشەڕدا ترساوەو لەرزاوە. بەرپرسیشە لە شەهیدکردنی چەندین قارەمان، لەوانە شەهید فوئاد سوڵتانی،. کە لەکاتی لێقەوماندا تۆقیوەو تەقەی لەسەر نەکردووە. لەمەڕ مێژوونوسینو مەسەلە تیۆریەکان لەناو شۆڕشدا دەنوسێ:

"لەناو یەکێتییدا دروشمی شۆڕشی نوێ و ئامانجو لە خەباتی چەکداری بەشێوەیە روونو ئاشکرا دیاری نەبوو، لەلایەکەوە دروشمی مافی چارەنووسو بنیاتنانی کوردستانێکی دیموکراتی، لەلایەکی ترەوە خەبات بۆ بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی (راستەقینە) و عێراقێکی دیموکراتو لەلای سێهەمیشەوە دروشمی ناچارکردنی رژێم بۆ چاو داگرتنێک کە وتووێژ و رێکەوتنی لێ بکەوێتەوە".[١]

کە یەکێتی دامەزراوەو شۆڕش بەرپا کراوە، هەتا نوسینی (أغدّ دیمقراطي و حرمان الشعب من حق تقریر المصیر- مام جلال) بە دەگمەن مەگەر باسی چارەی خۆنوسین کرابێ. ئەگینا (عێراقی دیموکرات و ئۆتۆنۆمی راستەقینە) دروشمی سەرەکی بووە.

بونیاتنانی کوردستانی دیموکراتیش لەو ساڵانەدا، مەگەر لە خەیاڵی نوسەردا، لە خەو نوسرابێ.

ناچارکردنی رژێم بۆ وتووێژ.. ئەمەیان راستە، بەتایبەتی بزووتنەوەی سۆسیالیستی، کە هاتنە دەرەوە، سیاسەتیان وا بوو، خۆپیشاندانی چەکدارانە بکرێتە فشار، بەڵکو حکومەت ناچار بێ وتووێژ بکات. هەر وایشیان کرد. مام جەلالیش بەناچاری رازی بوو. شەهید عەلی عەسکەری نێردرایە بەغداد، سەدامیشی دیبوو، بەڵام پێیانوتبوو بگەڕێنەوە ریزی نیشتمانی!! دوای ئەو سەفەرەی بەغداد، گەلی کوردستان رووبەرووی سیاسەتی راگواستن کرایەوە. بزوتنەوەش بۆچونی وتووێژ لایان کز بوبوو. دوای ساڵێک، دیسان سەریهەڵدایەوە!

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(١٩٠).

که نوسەریش دەنوسێ:

"لەلایەکەوە ناوزەدکردنی شۆڕشی نوێ، بە شۆڕشی گەلی کوردستانو پەیڕەو کردنی کوردستانیەت، لەلایەکی ترەوە بیرو بۆچوونی شۆڕشی کلّپەسەندوی عێراق لە کوردستانەوە و پێکهێنانی ناوکی بەرەیەکی عێراقی پیشکەوتوخوازی نوێنەری کرێکارانو رەنجدەرانی عێراق، کەوا هەم دژ بە بەرەی ئیمپریالیزمیو سەرمایەداری ئەورووپیو هەم دژ بە دارو دەستەکانیان بێ، کە خۆی لە رژێمی دکتاتۆری شۆڤێنی عێراقیو کۆنەپەرستو دەرەبەگەکانی ناوخۆدا دەنوێنێ".[1]

ئەم قسانە راستن. لەساڵی ١٩٧٨یشەوە، دروشمێکی شۆڕشەکە (شۆڕشی عێراقی هەڵگیرساو لە شاخەکانی کوردستانەوە) بوو. ئێزگەی گەلی کوردستانیش بەو دروشمە دەکرایەوە. ئەوەی مایەی سەرنجە، ئەوکاتە زۆرتر بزوتنەوەی سۆسیالیست ئەو دروشمەیان نەدەسەلماند. نوسەر بەرگری لە شۆڕشە عێراقیەکە دەکرد. دژی عێراقچێتی مام جەلال نەبوو. بەڵام کاتێک، هاوڕێیانی زیندان هاتنەدەرەوەو کەوتنە ململانێ لەسەر پۆستەکان؛ خۆیشیان لە کۆمیتەی هەرێمەکان بە شایستەتر دەزانی، لەگەڵ سکرتێری کۆمەڵەدا یەکیانگرتەوە، هیچ خاڵێکی لاوازی کۆمیتەی هەرێمەکانیان دەستنەکەوت. بۆیە لە کۆبونەوەیەکدا، بە پیلان، دەستەواژەی عێراقچێتییان بۆ هاوڕێیانی ئێمە داتاشی، کە دەمانگوت:

- بە شۆڕشی چەکداری، سوپای عێراق لەکوردستان راناماڵدرێ. بە راپەڕین دەکرێ.
- شۆڕشی کوردستان، لەو قۆناغەدا، بەشێکی پرسی دیموکراسی عێراقە.
-مەگەر لە جەنگێکی ئیقلیمیدا یان راپەڕینی سەرانسەری عێراقدا، رژێمی بەعس بروخێ، تەنها بە خەباتی چەکداریی کورد، دەسەڵاتی مەرکەزی عێراق ناڕوخێ.
- دەشمانگوت: کۆمەڵە مەترسی لەسەرەو لەناودەبرێ.

ئەمە بۆچونە سەرەتاییەکانی ئێمە بوون، کە سەرەنجام لە (ئاڵای شۆڕش)دا گیرساینەوە. کەچی نوسەرو باڵی زاڵی کۆمەڵە، هەڵمەتێکی ناڕەوای عێراقچێتییان کردە سەرمان.. رۆژگاریش کوتومت بۆچونەکانی ئێمەی سەلماندو بۆچونەکانی ئەوانی پوچەڵکردەوە.

ئەوساو ئێستاش، نەتەوەکەمم لەهەموو نەتەوەیەکی تر خۆشتردەوێ. لە هەموو نیشتمانێک زیاتر شەیدای کوردستانم. هۆگری ئەدەبو هونەری کوردیم، زیاتر لە

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(١٩٠).

هەر ئەدەبو هونەرێکی دیکە، زمانی کوردیشم پێ لە زمانە پاراوەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، بەڵام لەهەمان کاتدا، رزگاری نەتەوەکان بە تاکرەوی نەتەوایەتی نەکراوەو ناکرێ. تاکرەوی نەتەوایەتی، لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی سیخناخ بە ئاینو مەزهەب، هەر بەرەو شۆڤینیەتو فاشیزم هەڵدەدێرێ! دیموکراسی شاڕێی رزگارییە. دیموکراسیش، فەلسەفەیەکی مرۆیی-جیهانییە. چۆن بۆ تەواوێ گەلانی جیهان، بەدیهێنانی دیموکراسی مافێکی رەوایە. بێگومان بۆ گەلانی دراوسێمان، هەم مافی رەوایەو هەم بەدیهێنانی ئەرکی هاوبەشە. سێ پرس، ئێمەو نەتەوەکانی دەوروبەرمان پێکەوە دەبەستێتەوە: ١- دیموکراسی. ٢-مرۆڤایەتی. ٣-کلتوری هاوبەش. کە بەدرێژایی مێژوو، لەسەر جوگرافیای هاوبەشدا بۆ هەموو لایەکمان دروست بووە. پرسی دیکە هەن، بەڵام زۆرتر فەلسەفیو رەهەندی تیۆری-ئایدیۆلۆژییان هەیە. لەناو ئەو سێ ئەرکە هاوبەشانەدا تێهەڵدەکێشرێن.

دیموکراسی، کە شاڕێی خەباتی هاوبەشی گەلان بێ، هەڵگەڕانەوە بوو لەم شاڕێیە، لە قۆناغی رزگاریدا، کە نوسەرو هاوپێناوەکانی، بە پاساوی کوردستانیبونو مەسەلەی کورد یەک مەسەلەیە، چوار مەسەلە نییە، کە هەلومەرجە بابەتیەکەی نەڕەخسابوو، ئەو هەموو بوختانەیان بۆ هەڵبەستینو ئەو هەموو هەڵمەتەیان دەکردە سەرمان.

نەماندەوت: قەڵەمڕەوی عەرەبی عێراق، دژە دیموکراسیش بێ، قبوڵمانە. یان هی فارسو تورک.. بەڵکو بەگاڵتەش بێ، ئەوان دەیانگوت: فاشیەت بۆ عێراقو ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان.. ئەوان بون، دوای تێکچونی مفاوەزاتی ١٩٨٣-١٩٨٥، رقێکی زۆریان دژی عەرەب لەناو پێشمەرگەدا بڵاودەکردەوەو گاڵەو گاڵتەیان بە خەباتی ناوکۆیی گەلان دەکرد. چەند جارێکیش، تاوان بەرامبەرماڵو منالی عەرەب، ئەنجامدرا!! (*)

جاری وا هەیە، هەتا هەڵەکان راستدەکرێنەوە، ئاڕاستەی شێواندنی راستیەکان، لەژێر کاریگەری پروپاگەندەی سایکۆلۆژی دەسەڵاتو سەرکردە، دەکرێنە راستی. هەر لەسەر ئەم بنەمایەی توانای گۆڕینی ئاڕاستەی مێژوو، لەلایەن دەسەڵاتەوە، بەشێوەیەکی کاتیی، بەشێک لە مێژوونوسان پێیانوایە، مێژوو دەسەڵات دەینوسێ (کە وا نییە!) بەهۆی بەردەوامیی ستەمکاریی دەسەڵاتەکانیشە، میتافیزیکیەکان دەڵێن: مێژوو دوبارەدەبێتەوە (ئەمیش وا نییە!!).

ئەوەتا، وردە وردە لاپەڕە رەشەکانی مێژوو، خەریکە سپی دەکرێنەوە. خەریکە دەردەکەوێ، ئەوانەی دەسەڵاتی رەهایان لەناو شۆڕشدا هەبوو، توانیشیان زیاتر لە (١٠)

* پێم باش نییە تاوانەکە باسبکەم. کە مایەی قێزەونیە!!

ساڵ زۆربەی بڕیارەکان بە ڕەوا و ناڕەوا بدەن، ئەوەتا بڕیارە ناڕەوا و تاوانەکانیان نوسەرە بوێرەکان کەوتونەتە قانگدانیان.

ئەمساڵ، پێچەوانەی ساڵانی ڕابـوردوو، وتـاری گرنگ گرنگ، لەسەر بزوتنەوەی گۆڕانو ڕابەرە گشتیەکەی نوسرا! دڵنیام، لەمەودوا، ڕاستیەکان فراوانتر باسدەکرێ. بەربەستە سایکۆلۆژیەکان.. خوسان!! شمشێرەکەی هیرکلسیش لەسەر سەری نوسەران نەماوە، هەتا بە زنجیرە وتار، تاوانەکان بشاردرێنەوە.

مایەی خۆشحاڵیە، لەم دوو-سێ ساڵەدا، نوسەرو ڕەخنەگری بوێر دەرکەوتونو دڕیان بە شەوەزەنگی پروپاگەندە ناڕاستەکان داوەو ئەشیعەی کەسایەتیەکانیش، بە ویژدان دەگرنو بەو چەشنەی کە هەن دەیانناسێنن. چاوەڕوانیشم، مێژووی نیو سەدەی ڕابوردوش، دوور لە پیاهەڵدانو شکان، دوور لە سۆزو ڕق، سەرپاکی زانستیانە، لەسەر کۆی ڕوداوەکانو کەسایەتیەکان، بنوسرێ. هەنگێنێ، هەموان بە ڕاستەقینەیی خۆمانەوە، بکەوینە بەر ئاوێنەی ویژدان.

# رشتەی سێهەم:

## کارەساتی هەکاریو نەوەی یەکەم

١- کارەساتی هەکاریو کۆمەڵە
٢- هەڵەی نەوەی یەکەمو هەڵوێستی نەوەی دووەم
٣- نەوەی یەکەمو هەکاری!
٤- ناکۆکی ئەزمونو تێگەیشتن
٥- نەوشیروانو کۆمەڵەو کۆمۆنیزم!!
٦- نەوشیروانو ڕێکخستنی تازە!
٧- کۆمەڵەو کاریگەری نەوەی یەکەم!

( ١ )

## کارەساتی هەکاری‌و کۆمەڵە

کارەساتی هەکاری، لە ناوخۆی کوردستاندا، یەکێک لە گەورەترین روداوە ناوخۆییەکانی هەردوو شۆرشی ئەیلول‌و نوێیە. جەلالی‌و مەلایی، بەدرێژایی شەش ساڵی شەڕی ناوخۆ، نیوەی کارەساتی هەکاری، لە تێکرای شەڕە بێهودەکەی نێوانیاندا، قوربانییان نەداوەو جەزرەبەیان لەیەک نەوەشاند. ئەم کارەساتە، تائێستاش، لە سێ روانگەی جیاوازەوە، لێکدراوەتەوە:

**یەکەم**: روانگەی یەکێتی‌و باڵەکانی ناو یەکێتی.
**دووەم**: روانگەی پارتی‌و دۆستەکانی پارتی.
**سێهەم**: روانگەی هێزو نوسەرانی تری کوردستان.

ئەو سێ روانگەیە، دوانیان لەسەر کارەساتەکە، بۆچونە رەسمیەکانن. نوسەرانی تریش، هێندەی بەڵگەنامەیان لەبەردەست بووە، بەپێی توانای خۆیان، کارەساتەکەیان لێکداوەتەوە. بەلام هێشتا، تەواوی روداوەکە، زۆری بەبەرەوە ماوە لەسەری بنوسرێ. ئەوانەی نوسیویانە، لایەنی سیاسی‌و نوسەری سیاسین، ئەمەی ئێمەش دەینوسین، هەر سیاسییە. دەبێ چاوەڕێ بکەین، پسپۆڕەکانی بوارەکانی: عەسکەری، سیاسی، مێژوویی‌و سایکۆلۆژی، دەربارەی روداوەکە بنوسن. ئەمەش بەبێ بلاوبونەوەی بەڵگەنامەکانی حکومەتی تورکیاو هی سەردەمی شا، کە لە ئەدەبیاتی سیاسی یەکێتیدا، بەشێکی بەرچاوی کارەساتەکە، دەخاتە سەر دەستێوەردانی ئەو دوو دەوڵەتە (هی ئیسرائیل وازلێدێنین مەگەر خۆیان بەڵگەنامەیان، ئەگەر لابێ بلاوی بکەنەوە، ئەگینا ناڕوخێن!) ئەمە جگە لە باسکردنی ئیمپریالیزمی ئەمریکی‌و زایۆنیزم، کە مام جەلال‌و نەوشیروان مستەفا (لەسەر کارەساتی هەکاری) لە دوو لێکۆڵینەوەی ژمارە یەک‌و دووی هەواڵنامەدا (١٩٧٨)، بەدرێژیی، دەستێوەردانی عێراق، ئێران، تورکیا، ئەمریکا، زایۆنیزم، گوایە هەمویان بەپشتیوانی (پارتی-ق.م)یان کردووە، بۆ شکستپێهێنانی هەڵمەتی هەکاری.

مام جەلال لە ل(٢١)داو لە ناونیشانی (٢)دا، لە توێژینەوەی یەکەمی دوای کارەساتی هەکاری، دەنوسێ:

"هێنانەوەی ئەسپە دارینەکەی تەڕوادەی ئیمپریالیزمو ئێرانو ئیسرائیل بۆ کوردستان"[1]

لە لاپەڕە (٢٥)دا لە دوو دێڕدا دەنوسێ:

"بنەماڵەی مستەفا بارزانیو دەستەو تاقمە چڵکاوخۆرە بەکرێگیراوەکەی ق.م هەر بەڕاستی دەوری ئەسپە دارینەکەی تەڕوادە ئەبینن لە نەخشە ئیمپریالیستییە-زایۆنسیتییەکەی دوژمن بە کوردایەتی گەلانی تری ڕۆژهەڵات لەکوردستاندا."[2]

ئەوکاتە، دوای هەرەسی ١٩٧٥و ڕوداوەکانی تری شەهیدکردنی برایم عەزۆ، حەسەن خۆشناو، حەمە غەفور ئاغجەلەری..تاد، لەگەڵ کارەساتی هەکاری، دۆخێکی سیالۆژی (سیاسی-سایکۆلۆژی)یان خوڵقاندبوو، باوەڕمان بەو بۆچونانە هەبوو. ناکۆکی سیاسیو شەڕی پێشمەرگایەتی وای بەرچاوگرتبوین، بە چەشنێکیش ڕایچڵەکاندبوین، لەخۆمان نەدەپرسی: ئەگەر قیادەی موەقەتە وان، ئەی بۆچی شۆڕشەکەی ئەیلولیان لەلایەن ئێرانو بە پەسەندی ئەمریکاو بێدەنگیی ئیسرائیل، فرۆشرایە ڕێکەوتننامەی جەزائیر؟ وەڵامەکەشی دەرکەوت، کە شۆڕشی ئەیلول، لەناو هاوکێشەکاندا، لەو باوەڕەدا بون کە بە پشتیوانی ئەمریکا-ئێران، دژی حکومەتی عێراق، ڕەنگە سەربکەوون. ڕۆژگاری سیاسەت دەریخست، لەو بۆچونەدا بەهەڵە چون، ئەمە مانای ئەوە نەبوو، کە لە ڕووی تەکتیکیەوە هەڵە کرابێ، ئیتر مێژوو مۆری بەکرێگیراوی داوەتە ناوچەوانی پارتی-بارزانی. دەرکەوت، پەیوەندیکردن تەنانەت لەگەڵ ئەمریکاو ئێرانیش یەکسان نییە بە خیانەت. ڕێکەوتنی جەزائیر، ئەو ڕاستییەی لەمەڕ خیانەتی نەتەوایەتی، یان ئەو تۆمەتانەی دەدرانە پاڵ شۆڕشی ئەیلول، کۆتایی پێهێنا. بەتایبەتی، یەکێتیو خودی مام جەلالیش، هەر لەم شۆڕشەدا، هەوڵی زۆریان دا، لەگەڵ ئەمریکاو دەوڵەتانی ڕۆژئاوادا، پەیوەندی ببەستن. کە یەکێتی کرایە سۆسیال-دیموکراتو داواش کرا، لە سۆسیال-ئینتەرناسیۆنالدا وەربگیرێ، ئاشکرایە کە سۆسیال-دیموکرات، نەک دژی ئەمریکا نین، بەڵکو لە ڕووی بابەتیەوە، لەئاستی جیهان، دۆستی ئەمریکان. بەڵکو حیزبە سۆسیال-دیموکراتەکانی ڕۆژئاوا، کە دێنە سەر حوکم، دەبنە حوکمڕانی دەوڵەتانی ناتۆ. دەشبنە هاوپەیمانی ئەمریکاش! بەدڵنیاییەوە، هەر ئەوکاتە، ئەمریکاو ئێران یارمەتی یەکێتییان بدایە، وەردەگیرا. ئەمریکا، هەر ئەمریکایە، نەگۆڕدراوە. یەکێتی سیاسەتی گۆڕیو بەهۆی ئەمریکاشەوە، عێراق روخێندراو ئیستاش، پەیوەندی یەکێتیو ئەمریکاو هاوپەیمانەکانیشی، بەهێزە!

---

١ هەواڵنامەی کوردستانی عێراق. یەکەمین هەواڵنامەی شۆڕش. ئامادەکردنی: نەوزاد عەلی ئەحمەد. ئەکادیمیای هۆشیاریو پێگەیاندنی کادیران- سلێمانی-٢٠١١. ل(٢٥).

٢ سەرچاوەی پێشوو.

خۆ (١٩٧٧/٣/١) مام جەلال لەگەڵ کاک مەسعود بارزانی ڕێک کەوتبوو. ئەی ئەوکاتە بۆچی چاو لەو هەموو ناسنامە سیاسییەی پارتی پۆشرابوو، کە ڕێکەوتنیان لەگەڵدا مۆرکرا؟ دوای ئەوەش، بەردەوام بەرپرسەکانی پارتی لەدەرەوە بینراوونو هەوڵدراوە ئاشتینامەیان لەگەڵدا مۆر بکرێ. خۆ پێش ناردنی هەڵمەتەکەی هەکاری، نامەی جۆراوجۆری مام جەلالو عەلی عەسکەری بۆ ئیدریس بارزانیو مەسعود بارزانی، تەنانەت بۆ حەمایل خانیش، نێردرابوو، هەتا لە هۆکاری نیازپاکی هەڵمەتی هەکاری تێبگەیەندرێن. ئەگەر دوای ئەو ڕێکەوتنانە، پارتی دەستی لە کوشتنی تێکۆشەرانی یەکێتی هەڵگرتبا، بێگومان یەکێتی دەستی لە شەڕەجنێو هەڵدەگرت. پارتیش دەکرایە هاوپەیمان. هەروەکو چۆن، لەدوای ٣١/ی ئابیش، دوای (٣٢) ساڵ لە شەڕی ناوخۆو شەڕە سیاسەتو بوختانهەڵبەستن بۆ یەکدی، لەگەڵ پارتیدا هاوپەیمانی ستراتیژی مۆرکرا.

یەکێک لە کاریگەریە هەرە زیانبەخشەکانی شەڕ، بەتایبەتی لەکاتی شکستدا، ئەوەیە، لۆژیکی سیاسی لەدەستدەدرێو ئەقڵانیەتی سیاسیش لاواز دەبێ. ڕقو تۆڵەسەندنەوەو سەرکەوتن، جێگەی هاوپەیمانی سیاسی دەگرێتەوە.

نوسەر (١٦) لاپەڕەی لەسەر کارەساتەکە نوسیووە. دوای (٣٣) ساڵ، بەهەمان لەدەستدانی لۆژیکی گەرمەی کارەساتەکە، بۆچونەکانی دەردەبڕێ. دوای سێ دەهە زیاتر، نوسەر نەیتوانیووە ڕاستیەکان باشتر ببینێو هاوکێشەکان وردتر بخوێنێتەوە. بە هەڵەشدا چووە کە لە لاپەڕە (١٩٣)دا دەڵێ:

"لەبەرئەوەی زۆری لەسەر نوسراوە. لەلایەن سەرکردەکانو کادرە سیاسیو پێشمەرگەکانی بەشداربوی ڕووداوەکەو هیچ لایەنێکی شاردراوەو باس نەکراوی ئەو کارەساتە نەماوە، باس نەکرابێو نەنوسرابێتەوە، چ بە بەیانی سەردەمی خۆیو چ بە نوسینی یادەوەریەکان، لەلایەن بەشداربوەکانی کارەساتەکەو لەلایەن هەردوو لایەنی بەشداربوی کارەساتەکە (قیادەی موەقەتە و یەکێتیی)".[1]

ئاخر کام زۆری لەسەر نوسراوە؟ ئەو پەڕەکەی (١٥-٢٠) بابەتی لەسەر نوسرابێ. بابەتەکانیش توێژینەوەی قووڵ نین. کارەساتێکی لەوچەشنە، سەدان توێژینەوەی ئەکادیمیی هەڵدەگرێ.

ئەو بابەتانەی لەسەر کارەساتەکە نوسراوون، هەمووی هەڵسەنگاندنن. هیچی بۆ ئەوە نەبووە، کەمتەرخەم، یان ئەوانەی بڕیاری هەڵەیان داوە، لە چۆنیەتی بیرکردنەوە لە ناردنی هەڵمەتەکەوە، هەتا دەگاتە پلانی ناردنەکە، فەرماندەکان، ئەرکەکان، کاتی ڕۆشتنیان،

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(١٩٣).

نەگونجاویی هێزەکە، ئیدارەی هێزەکە، حسابنەکردن بۆئەوەی کە لەوانەیە هێزەکە ڕێی لێبگیرێ لەلایەن ئێرانەوە، یان لەناو تورکیا دوچاری کێشە ببێ لەلایەن ژاندرمەوە، یاخود هۆزەکانی سەر بە پارتی ق.م، کە یەکێتی باش دەیزانی زۆربەیان، دۆستی پارتینو چەکداریشن. جگە لە هەموو ئەمانەو لە هەموو ئەو ئەگەرانە مەترسیدارتر، دڵنیانەبوون لە پارتی.

پارتی، پێش کارەساتی هەکاری، گفتی تریان دابوو، کەچی پێشێلیان کردبوو، روداوی خوێناویش رویدابوو. وەکو:

١- شەهیدکردنی برایم عەزۆو هەڤاڵەکانی.

٢- شەهیدکردنی حەمە غەفور ئاغجەلەری.[*]

٣- رێگرتن لە کاروانی نەوشیروانو زیاتر لە (٨٠) پێشمەرگە لە قوناغی یەکەمی هاتنیان، مانگی ١١/ی١٩٧٦ بۆ ١٩٧٦/١١/١٤.

٤- رێگەگرتن لە کاروانی دووەمی نەوشیروانو شێخ حوسێنی ئێزیدی.

٥-بۆسە نانەوە بۆ حەسەن خۆشناو و (٥) پێشمەرگەو شەهیدکردنو دەستبەسەراگرتنی تفاقو پارەیەکی زۆریش.

لەو ماوەیەدا، دوو جار لەگەڵ پارتی، ساڵی ١٩٧٧ دۆخەکە هێورکراوەتەوەو گفتیان داوە، (١٩٧٧/٣/١) لە دیمەشق مامو مەسعود یەک دەبینینو رێکدەکەون، شەڕ رابگرنو دیلەکان ئازاد بکەنو هاوکاری یەکتر بکرێ. سودی نەبووە. دووەم جار لە لەندەن مەسعود بارزانیو سامی عەبدولڕەحمان دەبینێ. رێکیش کەوتون.. دیسان سودی نەبووە!

"عارف تەیفورو وریا سەعاتچیو کەریم سنجاری کەوتبونە هاتوچۆ بۆ سوریا. مام جەلال چو بۆ لەندەن. مەسعودو سامی بینیبو. یەکێ لە مەسەلەکانی باسیان کردبوو لێکۆڵینەوەی هاوبەش بو لە کوشتنی مەفرەزەکانی یەکێتیو، سزادانی بکوژەکان. مەسعودو سامی بێئاگایی خۆیان لەو روداوە پیشاندابو. بەڵێنیان دابو کە ئەگەر لەگەڵ یەکێتی پێک بێن یا پێک نەیەن لەو روداوە بکۆڵنەوەو سزای تاوانبار بدەن. مام جەلال پرۆژەیەکی سیاسی پێدابون بۆ رێککەوتن. پاش دەسکارییەکی کەم قوبوڵیان کردبو".[1]

هیچی ئەمانە سودیان نەبووە. هەموو جارێکیش وەڵامی دەیان نامەیان بە زارەکیی دابێتەوە، مام جەلالو یەکێتییان سڕ کردووە. بەڵام بڕیارەکانی خۆیان بۆ رێگرتن لە یەکێتی لە بادینان، هەر جێبەجێ کردووە؛ جار دوای جاریش، روداوی خوێناوی رویداوەو

---

* لە دێی کانی سوور (١٩٧٧/١٠/٢٤) بەهەمان پیلانی شەهیدکردنی حەمە غەفور ئاغجەلەری، هەوڵی کوشتنی منیش درا. تۆماری دەنگیی خەڵکی گوندەکەم لایە، کە باسی لە بۆسەخستنی ئێمەو چۆنیەتی هەوڵی لەناوبردنمان دەکەن.

١ نەوشیروان مستەفا ئەمین. لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ. ل(١٢٩).

کەلوپەل‌و تفاقی یەکێتییان تالان کردووە. لەم روداوانە دوو راستی بەبەڵگەو بە روداو، دەردەکەوێ:

یەکەمیان: پارتی، بە هەموو شێوەیەک، بە بڕیاری رەسمیی‌و بە پەسەندی مستەفا بارزانی، دوا بڕیاریان داوە، کە نەهێڵن یەکێتی لە بادیناندا، لەناو هۆزەکان‌و لایەنە سیاسیەکانی باکوری کوردستاندا، بنکەکانی، هێزەکانی، رێگای هاتوچۆو دۆستەکانی قایم بکات.

دووەمیان: لەساڵی ١٩٧٦وە، سەرکردایەتی یەکێتی، کە نەوەی یەکەمی بەئەزمونی شۆڕشیش بوون، چەندین جار، لەخشتەبراون‌و چەند جارێک، لە هەمان کونی متمانەپێکردنی پارتیەوە، یەکێتی داغ کراوە. هەر هیچ نەبێ، مام جەلال دەیان نامەی دەستنوسی بۆ ناردون، ئەوان وەلامی یەک نامەشیان بە نوسین نەداوەتەوە!!

## (٢)
## هەڵەی نەوەی یەکەم‌و هەڵوێستی نەوەی دووەم

ئەو دوو راستییە، هەردوکیان تاڵن. بەلام راستیەکی تر بەبێ تەمومژ دەریدەخەن، ئەویش ئەوەیە، گوایە سەرکردایەتیە بەئەزمونەکەی یەکێتی، لە نەوەی یەکەم (مام جەلال، عەلی عەسکەری، عومەر دەبابە، د.خالید، تەواوی دەستەی دامەزرێنەر..تاد) بەو هەموو ئەزمونەوە، فێڵیان لێکراوەو سەرەنجامی هەموو فێڵ لێکردنێکیش، سەر و ماڵی یەکێتی تیاچووە.

کەچی لەبەرامبەردا، نەوەی دووەمی یەکێتی (ئەندامانی کۆمیتەی هەرێمەکان)و هاورێکانیان، کە ئەزمونی پێشمەرگایەتی‌و تەمەنیان کەم بووە، بەلام لەرووی ئایدیۆلۆژی‌و سیاسییەوە، ستراتیژی سیاسییان لەناو ئەو ناکۆکیەدا، رۆشنتر بووە. هەمیشە، سەرکردایەتی نەوەی دووەم، لە نوسیندا، لەچۆنیەتی پێکهێنانی مەفرەزەکاندا، لە هەڵسوڕان‌و هەڵسوکەوت لەگەڵ هێزەکانی پارتیدا، فێڵیان لێنەکراوەو جەزرەبەیان لێنەدراوە؛ تەنانەت، ئەگەر سەرکردایەتی نەوەی یەکەم بەقسەی سەرکردایەتی نەوەی دووەم (کۆمیتەی هەرێمەکان) یان کردبا، نە پێکهاتەی شۆڕش بە عەشائیر تێکدەدراو نە هەر لەسەرەتاوە، رێگە دەدرا تەرازووی هێز، بەوشێوەیە بشکێتەوە کە لەبادینان، ئەو روداوانەی لێبکەوێتەوە. پارتیش کە زانییان بەرچاوی کۆمیتەی هەرێمەکان، لەسەرکردایەتی ناو ولاتدا رونە، ساڵی ١٩٧٧

هێزە پەراگەندەکانیان لە ناوچەکانی سۆران تێکرا، کشاندەوە (ئەمە پێش گەڕانەوەی مام جەلال). ئەوانەی نەشیانتوانی گورز لە پێشمەرگە بوەشێنن، لە سۆراندا، خۆیان کردەوە بە حکومەتدا. (تەحسین شاوەیس و کانۆ چاوشین و قالە فەرەج..تاد).

لەکاتێکدا وا دەڵێین، دەشبێ باسی بکەین کە وەنەبێ (کۆمیتەی هەرێمەکان) ئاڵای سووری شەڕیان دژی پارتی بەرزکردبێتەوە. نەخێر. هەرگیز لەگەڵ قووڵکردنی شەڕی ناوخۆ نەبوین. ئەوەی ئێمە دەمانویست، ئەوەبوو کە: سیاسەتی دوودڵی و ڕاڕایی لە بڕیاردان، لە زیانی یەکێتییە. پێویستە لە سەرانسەری کوردستاندا، بە یەک پاکێج گفتوگۆ لەگەڵ پارتی بکرێ، وریای نەخشەکانی پارتی بین، هەتا دڵنیا دەبین. شەهید ئارام بە گەورەیی خۆی، لەگەڵ کەسێکی وەکو (عەبدولمەلیک) لە دێی سورەبان (هاوینی ۱۹۷۷) ڕێکەوت و لە ڕێکەوتنەکەشدا:

١- بە دیاریکراوی، تێگەیاندن، کە دەبێ چۆن هەڵسوکەوت بکەن و چەند دەسەڵاتیان هەیە.

٢- لە قەراغ، بازیان، گەرمیان و هەڵەبجە، کە بزوتنەوەی سۆسیالیستی لێنەبوو، سەرەتا، هەمان بەرنامەی عەسکەری جێبەجێکرا. ڕێگە نەدرا دوای شەهیدکردنی برایم عەزۆو حەسەن خۆشناو، پارتی جێگیر بێ. تەحسین شاوەیس و مەفرەزەیەکیشیان هاتنە ناوچەکە. ویستیشیان کەتنی حەمە غەفوورە ئاغجەلەری دوبارە بکەنەوە، بەڵام بە وریایی، نەمانهێشت و ڕاومان نان![*]

لەسەر دەستی پارتی، تەنها جارێک شەهیدێکمان دا. دوای کارەساتی هەکاری، لە شەڕێکدا لەسەر شاخی سورێن، ڕۆژی (١٩٧٨/٦/٦- شاخی شرام- کەلی وەزەرا- لای مڵەخورد) ڕێی هەڵە گیرابوەبەر (وشیار حاجی مامەندی) شەهیدکرا. ئەمە یەکەمین سەرکەوتنی پارتی بوو بەسەر یەکێتی لەو ناوچەیەدا. لەبەرئەوەی کەرتەکانی شارەزوور- هەڵەبجە. مەلا بەختیار، دوای ئەوە بە مانگونیوێک لە دێی کانی ژنان (١٩٧٨/٨/٢٠) ویسترا بخرێنە بۆسەیەکەوە، لەوریایی و نەبونی دوودڵی بەرامبەر پارتی، بەسەرکەوتوییش لێیان هاتنەدەست! ناوچەکە تەواو کۆنترۆڵ کرا!

دەبوایە، چۆن پارتی لە قفڵکردنی بادینان بۆ هێزەکانی ڕاڕا نەبووە. یەکێتیش ڕاڕا نەبوایە، ناوچەی سۆران بۆ پارسەنگ قفڵ بکات؛ هەتا بە هاوسەنگیی، ڕێکەوتن لەگەڵ پارتیدا دەکرێ. هەردوو لا، لە بادینان و سۆران، بەپێی ڕێکەوتننامەکە ئازادبونایە.

کە بزوتنەوەیەکی چەکدار، بە دوو هێزی جیاواز و دوو ڕوانگەی ناکۆک، دەستپێدەکات،

[*] خۆم لە گەرمیان بوم. ئاگادار کراین کە ئەو مەفرەزەیە بۆ دەستوەشاندن هاتون، زانییان پێمانزانیوون، هەڵهاتن!

پێشینەی خوێنڕشتنو ناكۆكی سیالۆژی لەنێواندا هەبوبێ، دوودڵـی لە چۆنیەتی مامەڵەكردن لە ناوچە جیاوازەكانداو، لە چارەسەری كێشەكانداو، لە نەچەسپاندنی ڕێكەوتنی دەستەبەردا، مەترسیدارە.

ئێمەی نەوەی دووەم (كۆمیتەی هەرێمەكان)و هاوڕێیانی مەفرەزە سەرەتاییەكانو رابەرە سیاسیە وشیارەكان، دەركی ئەو مەترسیەمان كردبوو. لە كۆمیتەی سەركردایەتیدا، دوای هاتنەوەی مام جەلالیش، ئەم قسەوباسانە كران. بەڵام دیسان، بڕیاری شۆڕشگێڕانە، بۆ چۆنیەتی دروستكردنی پارسەنگ، لە كۆنترۆڵكردنی ناوچەكانی سۆران، بەرامبەر بادینان، هەتا لە یەک دڵنیا دەبینو بەپێی ڕێكەوتنێكی هەمەلایەنەی دەستەبەر، كوردستان بۆ هەموو لایەكمان چونیەک ئازاد بێ، سیاسەتی دوودڵیو ڕاڕایی بەردەوام بوو. هەتا كارەساتی هەكاری قەوما.(+)

"دووبارەبونەوەی ئەم روداوە خوێناوییانە، دوای روداوی كوشتنی ئیبراهیم عەزۆو مەفرەزەكانی بادینانو چاوپۆشینی یەكێتی لە خوێنی ئەوانو، دوای ئیمزاكردنی ڕێكەوتنی (هاوكاری مەیدانی) شام، كارێكی زۆر خراپی كردە سەر ورەی پێشمەرگەكانی ینکو سەر دەرونـی بەرپرسەكانی. قم بڕیاری دابو ینک نەهێڵێ بۆ ئەو مەبەستەش پەنای ئەبردە بەر هەمو ڕێگایەكی ناجوامێرانە. ینک كە بڕوای بە فرە-پارتیو ململانێی ئایدیۆلۆجیو سیاسی هەبو، ئەیویست نەریتێكی تازەی ژیانی دیموكراتیو بۆڕبۆڕێنی پارتایەتی دابهێنێ، لەبەردەمی تاقیكردنەوەیەكی دژواردا بو. مەیدان چۆڵ بكا بۆ قم و ئاشتبەتاڵی لێ بكا، یان رابوەستێو بەرپەرچی قم بداتەوە؟ ئەم مەسەلەیە ئەوەندە كۆبونەوەی لەسەر كراو، بڕیاری تێدا درا و هەڵوەشێنرایەوە، ئەو دۆڵەی لێی بوین ناوی گۆستە بو، لەئەنجامی ئەو هەموو كۆبونەوە بێ ئەنجامانەدا ناوی (دۆڵە گۆستە)یان كرد بە (دۆڵە فشە)".(١)

پێش ئەو ڕێكەوتنە، كوتومت لەو مانگەدا كە مەفرەزەكانی كۆمەڵە، بەناوی یەكێتیەوە دەنێردرانە دەرەوە. پێش ئەوەی بیشبیستریێ پارتی هاتونەتەوە، شەهید ئارام، لە دووربینیەكی

---

+ ئەو كۆبونەوانە، لەدوای كۆبونەوەی سەركردایەتیو روداوی شەهیدكردنی حەسەن خۆشناو و هاوڕێكانی، مەكتەبی سیاسی بەسەرپەرشتی مام جەلال كراوون. دوودڵیو ڕاڕایی مەكتەبی سیاسی، هێندەی خایاندوەو ئەوەندە بڕیاریان داوەو جێبەجێیان نەكردووە، ناووناتۆرەیان لەخۆیان ناوەو دۆڵی «گۆستێ»یان ناوناوە، دۆڵە فشە. حیزبێک، ئەو هەموو شەهیدە ببەخشێ. چەندین جار فێڵو تەڵەكەی بەسەردا تێپەڕێ. ئینجا، بڕیارەكانی بگاتە «فشە» ئیتر دیارە، دوودڵی چۆن وەكو خۆركەی سیاسی، ناخی یەكێتی خواردووەو كردویەتیە نێچیری چەوری بەردەم بڕیارە یەكلاكەرەوەكانی پارتی. خۆشبەختانە، ئەوەی یەكەم كە كۆمیتەی هەرێمەكان بوین، ئەو «فشانە»مان نەكردبوو!!

١ نەوشیروان مستەفا ئەمین. لە كەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ. ل(١٧٩).

شۆڕشگێڕانەی ریالیستیەوە لەسەر ناکۆکیو ئەگەری سەرهەڵدانی پارتی دەنوسێ:

"ئێمە بەرامبەر ئەوانەی کە لە ئێرانەوە ئەیانەوێت ئەم دەورە ببینن هەڵوێستمان ئەوەیە کە پێش هەموو شتێک ئەو راستیەی سەرەوەمان لەپێش چاو بێتو هەمیشە هەوڵ بدەین بۆ جەماوەری روون بکەینەوەو راستیو ئەنجامی جموجوڵەکانیان تێبگەیەنینو تا ئەتوانین عەزلیان بکەین لە جەماوەر. لە هەمان کاتیشدا ئەوەش روون بکەینەوە کە نامانەوێ دوژمنایەتی ئەوان بکەینو ناچین بەگژیانداو تەرکیز ئەکەینە سەر ئەوەی کە یەکێتیی نیشتمانیی بۆ یەکێتییە نەک بۆ دووبەرەکی، هەر هێزێک نیشتمانپەروەر بێت ئەبێ لەچوارچێوەی ئەم یەکێتییەداو بەپێی رێبازەکەی کاربکات. ئەوەی بیەوێ خۆی بە سەربەخۆ بە رێبازی کۆندا بڕوات ئەوە دیارە ئەیەوێت دیسان جەزرەبە بە بزوتنەوەکە بگەیەنێت. بێگومان ئەوان بەوە رازی نابنو بەم رێبازەشدا ناڕۆن. لەم حاڵەتەدا ئێمە ئەبێ جەماوەرمان تێگەیاندبێو عەزل کردنیانمان مسۆگەر کردبێت. خۆ ئەگەر هاتو رازی بون لەچوارچێوەی ی.ن.ک دا کار بکەنو لەسەر رێبازەکەی، ئەوە با بیکەنو بەلام لەهەمان کاتدا ئەبێ زۆر وریایان بین".[1]

ئەم بۆچونە دەرگاداخستنە لەڕووی یەکترکوشتندا. بەلام بە لۆژیکێکی تۆکمەی ئەو قۆناغە سیاسییە. نە راڕایی لە هەڵوێستەکەدا هەیەو نە سیاسەتەکەش، بۆ شەڕی یەکدی کوشتن دارێژراوە.

مەخابن، شەهید عەلی عەسکەری، کە بەوپەڕی راستگۆیانە، لەڕوانگەی سۆزو ئەزمونەوە، نەیدەویست شەڕی ناوخۆ رووبدات، بەو سیاسەتە نەک پارتی لە دوژمنایەتی یەکێتی پاشگەز نەکردەوە، یان وای لە پارتی نەکرد، تەنانەت بەرامبەر بە بزوتنەوەی سۆسیالیست، کە سەرجەمیان بۆچونیان لەگەڵ کۆمەڵە جیاواز بوو، بۆ ئەو پارسەنگەی وتمان، ئاکامەکەی پارتی، هەر بڕیارەکانی خۆی سەپاندو تۆزقاڵێک نەرمیی بەرامبەر نەرمییەکەی بزوتنەوەش نەنواند. بەداخەوە، لە کارەساتی هەکاریدا، شەهید عەلی هێندە بە دڵپاکیی بێباکیی نواندبوو، لەوباوەڕەدا نەبووە، پارتی دەستی بۆ بەرن، بەلام دەست بۆبردنەکەی، توندتریش بوو.

دوای روداوە دڵتەزێنەکان، کە یەکێتی کورنۆلۆژیای (رۆژ ژمێری وردەکاری روداوەکان) تراژیدیاکانی روداوەکانی کردە پەندی دوو ساڵ خەبات، ئینجا بۆچونەکانی (کۆمیتەی هەرێمەکان) دەرکەوت چەند راستو دروستن. بۆیە مام جەلال لە هەواڵنامەدا، دەنوسێ:

---

١ هەڵبژاردەیەک لە نوسینەکانی شەهید ئارام. ناوەندی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان-عێراق- چاپخانەی شەهید برایم عەزو. ١٩٨٠. ل(٥٨).

"ماوەدان بە بووژاندنەوەی تاقمی سەر بە پ.م ی ماڵی بارزانی لە هەندێ شوێنی کوردستان، زۆریو بۆری لە ریزەکانی پ.م دا.. بووە هۆی هێنانەخوارەوەی ورەی خەڵک..تاد".[1]

تەواوی ئەو بۆچونانەمان لە کۆبونەوەکانی بزوتنەوەی سۆسیالیستو یەکەمین کۆبونەوەی سەرکردایەتیدا، پاش گەڕانەوەی مام جەلال، روندەکردەوە، بەڵام بەداخەوە، گوێیان لێدەگرتینو گوێشیان نەدەداینێ.

لەبەر رۆشنایی ئەو روداوانە، نوسینێکم لە گۆڤاری (کۆمەڵە) (ژ٢- نیسانی ١٩٧٩) بەناوی "گرتنی هێڵی راستو دروستی سیاسیو ئایدیۆلۆژی سەرکەوتن ئەهێنێتەدی" تیایدا، جەخت کراوەتە سەر سەربەخۆیی کۆمەڵەو سیاسەتی راستو دروست. (دەقی وتارەکە، لە پاشکۆی کتێبەکەدا، بۆ مێژوو بڵاودەکرێتەوە).

## ( ٣ )

## نەوەی یەکەمو هەکاری!

پێش هەکاری، سەرکردایەتی یەکێتی (هاوینی ١٩٧٧) کۆدەبێتەوە. ئەم کۆبونەوەیە، دوای تەسلیمبونی هەموو ئەو عەشایرو کوێخاو ئاغایانە، کە پێچەوانەی رێبازی شۆڕشی نوێ کۆکرابونەوە، کرا. هەروا کەسانی هەناسە کورت، کە خۆیان تەسلیم بە حکومەت دەکرد. ئیتر دەرکەوت، تەواوی رەخنەکانی "کۆمیتەی هەرێمەکان" لەسەر زیانەکانی کۆکردنەوەی ئەو هێزە زۆرو بۆرە، راستو دروست بوون!

"ئەگەر دوژمن بە بەزینو روخانی هەندێ کەسانی بودەڵەو بەکرێگیراو کە خۆیان بەدەستەوە داوە وا تێبگات کە گوایە شۆڕشی لاواز و بێهێز کردوەو سەرکەوتنێکی باشی بەدەستهێناوە ئەوە هەر خۆی گێل ئەکاتو بەس، ئەگینا ئەو ترسنۆکو بەزیوانە هەمیشە بارو کۆسپ بون بەسەر شۆڕشەوە، ئەبوایە زوتر ریزەکانی شۆڕشیان لی پاک بکرایەوە، بۆیە خۆبەدەستەوەدانی ئەمانە نەک سەرکەوتنێکی گەورە بو بۆ شۆڕش بگرە بەڵایەکی زلیش بو بۆ دوژمنەکەمان".[2]

---

١ هەواڵنامەی کوردستانی عیراق. یەکەمین هەواڵنامەی شۆڕش. ئامادەکردنی: نەوزاد عەلی ئەحمەد. ئەکادیمیای هۆشیاریو پێگەیاندنی کادیران- سلێمانی-٢٠١١. ل(٢١).

٢ هەڵبژاردەیەک لە نوسینەکانی شەهید ئارام. ناوەندی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان-عێراق- چاپخانەی شەهید برایم عەزو. ١٩٨٠. ل(٦٢).

لەم پەرەگرافە مێژووییەدا، جیاوازی ڕێبازی کۆمەڵەو بزوتنەوە، لەسەرەتای بەرپابونی شۆڕشدا، شەهید ئارام بەرجەستەی کردووە. دەریخستووە کۆمیتەی هەرێمەکان بیرکردنەوەیان چەند جیا بوە. چەندیش بەرچاویان لەسەر کێشەکان ڕۆشن بووە.

هەقوابوو، یەکێتیی ئیتر بیری باشتر لە پێکهاتەی هێزەکانی بکاتەوەو پۆستەکانیشی لەبەر ڕۆشنایی دەرکەوتنی ڕاستیەکان، دابەش بکردایە. بەڵام، سیاسەتی پینەوپەڕۆو چاوپۆشین لە بۆچونە هەڵەکان، درێژەی پێدرا؛ سەرباری درێژەپێدانی ئەو سیاسەتە، ئەرکی ڕێکخستنو بەرێکردنی هەڵمەتی هەکاریش هاتەپێشەوە. ئەمە، وێڕای ئەو ناکۆکیو کێشە قووڵانەی لە هەناوی بزوتنەوەی سۆسیالیستیش تا دەهات، قووڵتر دەبوو. گەیشتە ئاستێک، ڕەسول مامەند،(+) هەر ئامادە نەبوو بێتە مەکتەبی سیاسی. تەنانەت لەگەڵ عەلی عەسکەریدا، قسەشیان نەمابوو. لەبری خۆی، ملازم تایەری عەلی والی کردبووە نوێنەری بزوتنەوە.(*)

هیچ گۆڕانکارییەک لە پێکهاتەی هێزەکە، هەروا ئۆرگانەکانی باڵا، نەکرا. بەڵکو بەو هەموو کێشەشەوە، بەهەمان ڕەوتو ڕیتمی عەسکەریەوە، کاروانی هەکاری، لە پێشەنگەوە هەتا پاشەنگی، بۆ قورسترین ئەرکی سیاسی-پێشمەرگایەتی لە مێژووی خەباتی چەکداری کوردستاندا نێردران. واتا: ئەرکی شۆڕش قورستر دەبوو. مەترسیەکان

---

+ ڕەسول مامەند: یەکەمین جار ڕەسول مامەندم لە (١٩٧٧/٧/١٢) لە کیفارینای قەندیل بینی. ماوەیەک بوو هاتبووە دەرەوە. پیاوێکی هێمن بوو. ڕێزی خۆی زۆر دەگرت. کوردپەروەرێکی ڕاستگۆ بوو. لەسەر بۆچونو هەڵوێستەکانی سوور دەبوو. کە بینیم، نامەیەکی نەوشیروان مستەفای بۆ هاتبوو، قادر خەبات هێنابوی. یەکەمین کلاشینکۆفی یەکلاقیش، هەر قادر خەبات گەیاندیە قەندیل. ڕەسول مامەند، شانازی بە مێژووی خۆیو شۆڕشی ئەیلولەوە دەکرد. دوورونزیک ڕەخنەم دژی پارتی لێدەبیست. سەراپا دژی شەڕی ناوخۆ بوو. لەخوار کیفارنا، لە کۆبونەوەیەکدا، بەسەرپەرشتی عەلی عەسکەری، باسی شەڕی ناوخۆ کرا. ڕەسول مامەند ئامادە بوو بچێتە سوریا، مام جەلالو سەرکردایەتی پارتیش ببینێ، کێشەی ناوخۆ چارەسەر بکرێ. لەم پێشنیازەوە وەفدێک پێکهێنرا. منیش هەر عەلی عەسکەری تەکلیفی کرد لە وەفدەکە بم. عادلی قیادەی موەقەتەش (فازیل جەلال) لەو نزیکانە بوو، نێردرا بەدوایدا، ئەویش ئامادە بوو لەگەڵ وەفدەکەدا بێت. ئیتر ١٩٧٧/٧/١٧ کەوتینەڕێ. شەوی ٧/٢٠ گەیشتینە ماسی ڕۆ. مام جەلال گەیشت. مام جەلال ڕەسول مامەندی ناسیەوە. ڕێزی گرت. یەکەمین پرسیاری ڕەسول مامەند لە مام جەلالی کرد، وتی: مام جەلال، دژە ئاسمانی نەهێناوە لەگەڵ خۆت؟ مام وتی: کاک ڕەسول، لە تورکیاوە هاتوم، چۆنی بێنم. ئەو ماوەیەی لە دۆڵی گۆستێ بوین.. دیار بوو ڕەسول مامەند بیرکردنەوەی لە هەندێک بارەوە جیاوازە. وەکو: ڕوخانی ڕژێم، دژایەتی ئێران، شۆڕشی عێراقی..تاد. (کیفارنا: گۆرەپانێکی دڵڕفێنی ناوقەدی قەندیلە. ١٦ کانیاوی ئاوی تەزیوی تێدایە. کیفر: دڕکێکە).

* بەهاری ١٩٧٨ نوێنەرانی بزوتنەوە لە مەکتەبی سیاسی، عەلی عەسکەریو ملازم تایەر، یەکێتی سالار عەزیزو ئازاد هەورامی.. من بۆ ئامر هەرێمی هەورامان دانرام.

زۆرتر دەبوون. لەگەڵ پارتی-ق.م لە شەڕی خوێناویدا بوین، تەسلیمبونەوەی بەشی زۆری چەکدارە بێ بیروباوەڕەکانو تێکشکانی ڕێبازی خۆپیشاندانی چەکداریی لەپێناوی مفاوەزاتدا، هیچی ئەمانە، نەبوبونە مایەی قووڵتر بیرکردنەوە لە دۆخی کوردستانو پێکهاتەی هێزەکانو دابەشکردنی پۆستەکان. یان باشتر ڕێکخستنەوەی هێزەکانو قووڵتر بیرکردنەوە لە کێشەو شەڕەکان. بەتایبەتی بۆ سەفەری هاتونەهاتی هەکاری!

کەچی نوسەر، هیچی ئەو ڕاستیانە و ڕوداوانـەو گۆڕانکاریانە، ڕەچاو ناکاتو لە لاپەڕە (١٩٤)دا دەنوسێ:

"سەبارەت بە دووبـارە هەڵبژاردنەوەی سەرکردایەتی م.س بریتی بووە لە ئازاد هـەورامـی، نەجمەدین عەزیز کە نەجمەدین لەو کاتە لـەدەرەوەی وڵات بـووەو هیچ ئاگاداریەکی لەو بڕیار و نەخشانە نەبوو، و دیارە ئازاد هەورامیش ئەو کاتە لە تەمەنێکدا بووە، کە ڕەنگە حساب بۆ بیروڕاکانی هێندە نەکرابێ. لە بزوتنەوەش بریتی بووە لە عەلی عەسکەری، تایەری عەلی والی، کە هەردووکیان هەم نوسراو و خاوەن بیرورا و هەم بە هەق دوو سەرکردەی عەسکەری خاوەن ئەزمون بوون، لەو کۆبوونەوەیەدا، گەورەترین حساب بۆ ڕاکانیان کراوە".[1]

لە درێژەی هەڵسەنگاندنی کەسایەتیەکاندا، دەڵێ:

"لێرەدا گەر ورد سەرنج بدەین، دەتوانین بە ئاسانی کەسایەتیە خاوەن بڕیارەکان دەستنیشانکەین:

أ- جەلال تاڵەبانی وەک سکرتێری گشتیو خاوەن بڕیار.

ب- عەلی عەسکەری وەک لە پێشەوە باسمکردو فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگەش، د.خالید سەعید.

ج- نەوشیروان مستەفا، وەک ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە و گوێ لێگیراوی لای مام جەلالو عەلی عەسکەری.

د- تایەر عەلی والی و عومەر عەبدوڵڵا، بە پلەی دووەمی گوێلێگیراو.

واتە لەناو بڕیاردەرەکان بە پلەی یەکەم جەلال تاڵەبانی، عەلی عەسکەری، نەوشیروان مستەفا، د.خالید سەعید، و بە پلەی دووەم عومەر عەبدوڵڵاو تایەر عەلی والی دێ. واتە نەوشیروان ئەوکاتە گەر شەخسی دووەم نەبووبێ شەخسی سێهەم بووە".[2]

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(١٩٤).

٢ سەرچاوەی پێشوو، چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(١٩٤-١٩٥).

خۆشحاڵین، لەو پێکهاتەیە، بەشدار نین‌و ئۆباڵی بڕیارەکانی مەکتەبی سیاسی هەڵناگرین. کە نەوشیروان مستەفا، بە دوورودرێژیی زیاتر لە (٣٠) لاپەڕەی هەڵسەنگاندنی رەخنەیی لە کتێبی (لەکەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ) لە لاپەڕە (١٦٧ بۆ٢٩٧)دا لەسەر ئەو مەکتەبی سیاسی‌و بڕیارە سیاسی‌و عەسکەریەکانی بەجوانیی نوسیووە. دەریخستووە کە تەنانەت یەک بڕیاریشیان لەو هەلومەرجەدا، دروست نەداوە!

کورد کوژراوی ناو و ناوبانگە. نەک ئەنجامی تێکۆشانی ئەو کەسانەی ناوبانگیان هەیە. ئەمە لەتەواوی دونیای دواکەوتودا وایە.

تەواوی سەرکردەکانی شۆڕشی ئەیلول، بە هەردوو باڵەکەیەوە، دوای (١٤) ساڵ خەباتی چەکداریی‌و (٣٠) ساڵ خەباتی سیاسی، دوای دامەزراندنی پارتی، شکستیان خوارد. باڵی مەکتەبی سیاسی-جەلالی، وا شکستیان خوارد، هەتا ئێستاش ناتوانن بیر لەو ساڵانەی سیاسەت‌و شکستەکەیان بکەنەوە. تەنانەت تاقە یادەوەریەکی ئەو ساڵانە، لە هیچ بۆنەیەکدا، یاد ناکرێ‌و شانازی پێوە ناکرێ. قوربانیەکانیشیان، کەس ئاوڕ لە کەسوکارو نەوەکانیان ناداتەوە. موچەی کۆمەلایەتیش بۆ چەکدارەکانیان، چەند ساڵێک بڕایەوە، ئەویش لەڕێی حکومەتەوە نەبوو. سەدان قوربانی جەلالی.. رەنجیان بە با دراوە!!

پارتیش، رێکەوتننامەی جەزائیری قبوڵ کردو کۆتایی بە شۆڕشەکە هێنا، کە پێشمەرگەو خەڵک ئامادەی درێژەپێدانی خەبات بوون. تا ئێستا، پاساوەکانی پارتیش بۆ درێژەپێنەدانی شۆڕش، شەرمنانەیە. بەڵام بەشانازیەوە باسی شۆڕشی ئەیلول دەکەن‌و دەزگای شۆڕشی ئەیلولیشیان بۆ هاوکاری پێشمەرگەکانی دامەزراندووە. دڵیشیان راگرتوون.

نوسەر هیچی ئەو مێژووە بەخەیاڵیدا نایەت، تەنها مەبەستێتی بنوسێ، جگە لەو کەسایەتیانەی باسیکردوون، کەسەکانی دیکە، خاوەن بڕیار نەبوون. هەر بۆ کەمبایەخ سەیرکردنی ئەو کەسانەی مەبەستێتی، لە کۆتایی هەمان لاپەڕە، ئاوا قوفڵ دەدات:

"لەناو ئەندامەکانی سەرکردایەتیشدا، هاوڕێیانی کۆمەڵە، تەنها نەوشیروان مستەفاو لە ئەندامانی بزوتنەوەش عەلی عەسکەری، د.خالید سەعید زۆر شارەزای ناوچەکە بوون".[1]

ئەمەشیانی هەر بە مەرام نوسیوە. ئەگینا، ناوچەکە یەکەمین جار بووە، تەواوی ئەو سەرکردانەی یەکێتی، دوای تێکەلاوبونی دەستەی دامەزرێنەرو سەرکردایەتی ناو ولات، سەردانی بکەین. هەموشمان سێ مانگ کەمتر لە ناوچەکانی دۆڵی گۆستێ، دەریاسور، برادۆست، خواکورک، جورجان، کێلەشین، تەنانەت بەشێکی هەکاریش نەبوین.

---

١ سەرچاوەی پێشوو، چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٤٩١-٥٩١).

( ٤ )

## ناکۆکی ئەزمونو تێگەیشتن

ئەگەر شارەزابون مەرجی قاڵبون لە بۆتەی خەبات بوبێ، خۆ نەدەبوو، عەلی عەسکەریو د.خالیدو ملازم تایەر، بچنە قووڵایی ناوچەکانی هەکاری، گەڤەر. هیچ نەبێ لە گوندی (ماسی ڕۆ) بارەگایان دانابا، هەتا کارەکان رادەپەڕێنن. ماسی ڕۆ، دوا گوندی هەکاریە. لە بناری شاخی دالانپەڕ.. یەکێک لە سەختترین شاخەکانی کوردستانە. سێ بەشی کوردستانی ئێرانو عێراقو تورکیاش، پێکەوە دەبەستێ. هەڵکەوتەیەکی لەباری عەسکەریشە، بۆ شەڕی بەرەیی.(*)

نوسەری کتێبی (لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ) لەمبارەوە لە لاپەڕە (٢٨٣)دا ڕەخنەی ئاوای گرتووە: "قووڵایی تورکیا: کەوتنە ناو تەپکە

بەڕێکەوتنی هێزەکەی یەکێتی بەرەو قووڵایی تورکیا، پشت ئەستور بە بەڵێنەکانی (دەدەقەدە- پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا)، بەناوی هێنانی چەکەوە، بێ ئەوەی بنکەیەکی پشتەکی یان بنکەیەکی پێشەوەیان هەبێ، بێ ئەوەی بزانن بۆ کوێو، بەرەو کوێو، بۆ لای کێ ئەچن، بێ ئەوەی لەوێ بنکەی سیاسیو جەماوەریان هەبێ".(١)

کەواتا؛ ئەزموندیدەو شارەزایی لەو دۆخەدا، کە دوچاری هێزەکانی یەکێتی هاتووە، ڕۆڵی نەگێڕاوە. چۆنیەتی بڕیاردانو شوێنی بڕیاردان، چارەنوسساز بووە. بڕیاردەریش هەر نەوەی یەکەمی ئەزموندیدەو شارەزاو بەتەمەنەکان بوون. سەرکردەکانی نەوەی دووەم، گوێڕایەڵی سەرکردەکانی نەوەی یەکەم بون! هەموو بڕیارەکان لای نەوەی یەکەم بووە. دەسەڵاتەکانیش بەزۆری لای ئەوان بووە!

لەناو بزوتنەوەی سۆسیالیستیشدا، لەسەر هەڵمەتی هەکاری دوو ڕای جیاواز هەبوو. ڕایەکیان: ڕەسول مامەند، ساڵح یوسفی، کاردۆ گەلاڵی، عەلی هەژارو کەسانی تر، دەیانگوت: تکایە هەڵمەتی هەکاری نەنێردرێ، چارەنوسێکی نادیار چاوەڕوانیانە. عەلی عەسکەریو د.خالید پێیانوابوو، بڕۆن باشەو خۆیشیان لادەدەن لە شەڕی پارتی. ڕەسول مامەند، ئەوکاتە نەدەهاتە کۆبونەوەکانی مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتی. ئەمەش، نیشانەی ڕاڕایی سەرکردایەتی یەکێتی بوو. کە پێموایە، باشتر بوو، بۆ چارەسەرکردنی ئەو ڕاڕاییە، باشترین چارەسەر، دواخستنی هەڵمەتەکە بوو بۆ زیاتر لە مانگێک، هەنگێنی،

---

* بەندە، یەکەمین جار مام جەلالم لە (١٩٧٧/٧/٢٠) لە گوندی ماسی ڕۆ، بینی.

١ نەوشیروان مستەفا ئەمین. لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ. ل(٢٨٣).

وردتر لەناو یەکێتیدا بیر لە هەڵمەتەکە دەکرایەوە. کەشوهەوا باشتر دەبوو. زانیاریش لەسەر پارتیو تورکیا، زۆرتر کۆدەکرایەوە.

فەلسەفەی ئەو بیرکردنەوەیە بۆ هێنانی چەکو تفاق، هەتا فریای دیهاتەکان پێش (١٩٧٨/٦/١) بکەوێ، بۆئەوە بوو بەرگری لە راگواستن بکەن؛ ئەم بیرکردنەوەیە، لەبەردەم تـەرازوی هێزو جۆری ئەو چەکە سوکانەی دەهێنران، بۆ بەرهەڵستی هێزو جۆری چەکەکانی رژێم، نیشانەی کورتبینیو بیری تەنک بووە لە خەسڵەتی پارتیزانیو شەڕی بەرەیی. هەناردنی هێز بۆ هێنانی چەک، وای دەگەیاند چەکەکان بگەن، جۆری شەڕو شەڕگەکان لە پارتیزانییەوە بۆ بەرەیی دەگۆڕدران. ئەمە لەکاتێکدا تێکڕا بێچەکەکان کە بۆ هێنانی چەک نێردرابوون، نەدەگەیشتنە (٧٠٠) کەس. گریمان دوو هەزار چەکیش هێنرابان، پێکەوە ژمارەی هێز بگەیشتایەتە سێ هەزار، دەی بە سێ هەزار پێشمەرگەی مەفرەزەی پارتیزانی، ناتوانرێ (٢٠کم٢) بپارێزرێ بەرامبەر رژێمێکی قاڵبوی جەنگی بەرەیی کە شۆڕشی ئەیلول، لە شەڕەکانی رواندزو گەلی عەلی بەگو هەندرێن..تاد، بە سەد هەزار پێشمەرگە بەرگەی نەگرت. ئەمە جگە لە تەکنەلۆژیای جەنگو شێوەی جەنگین، کە سوپای عێراق، لەکوردستاندا قاڵو قووڵ کرابوو! هەم سوپای عێراق چەندین بەرامبەر زیادی کردبوو، هەم تەکنەلۆژیای جەنگینی، گەلێ پێشخرابوو. بەتایبەتی دژی پارتیزانی!

ئێستا، کە ئەو هەلومەرجە بیردەخەمەوەو سەرگوزشتەی کۆبونەوەکەمان دەدەمەوە بەر هزری مێژووم، ئەنجامی روداوەکانو کارەساتی هەکاری دەخوێنمەوە، ئەو بڕوایەم لا پتەوتر دەبێ، ئاستی تێگەیشتنو چۆنیەتی بڕیاردان، لە ڕێڕەوی خەباتدا گرنگە. نەک تەنها تەمەنو ئەزموندیدەیی. دیارە ئێمەمانانی نەوەی دووەم، بەو تەمەنە کەمەوەو بەو ئەزمونە سەرەتاییەی شۆڕشەوە، لە کۆبونەوەکاندا بوینو ئۆباڵیشی هەڵدەگرین. بەڵام ئەقڵی بڕیاردەرو بەرنامەڕێژ، سەرکردەکانی نەوەی یەکەم بوون.. ئەوەش ئەنجامە سیاسیو عەسکەرییەکەی بووە.. لە کارەساتی هەکاریو روداوگەلی تریش!

## ( ٥ )
## نەوشیروانو کۆمەڵەو کۆمۆنیزم!

لە باسکردنی سەرکردەکانی نەوەی یەکەمو دووەم، نوسەر جگەلەوەی بەئارەزوو بڕیارەکان شەنوکەو دەکات. چاو لە مێژووی دامەزراندنی کۆمەڵەو دامەزرێنەرانیو هۆی ئەوەی نەوشیروان بۆچی نەخراوەتە دەستەی دامەزرێنەر، دەپۆشێ. دامەزرێنەرانی

کۆمەڵەش، دوورونزیک توخنی پەیوەندی نەوشیروان‌و شیهابی شێخ نوری ناکەوون. لەکاتێکدا، پەیوەندی نێوانیان، باش نەبووە. بەڵگەش ئەوەیە، شیهابی شێخ نوری، لەکاتی دامەزراندنی کۆمەڵەدا خۆی لەگەڵ مام جەلال قسەی کردووە. لە یەکەمین کۆبونەوەش مام جەلالیان کردۆتە سکرتێر. بەڵام هەر ئەوکاتە، نەوشیروانی نەدیووەو هەوڵی زۆریشی لەگەڵ نەدراوە، ببێتە دەستەی دامەزرێنەریش. کە بە نەوشیروانیش وتراوە کۆمەڵە دادەمەزرێ، خۆی نەهاتۆتە ریزی، بەڵام گوایە بە هاورێکانی وتووە، قبوڵی بکەن.(*) ئەو ماوەیەی لەدەرەوەی وڵاتیش بووە، دوورونزیک پەیوەندی پێوە نەکراوە. خۆیشی توخنی جموجوڵی سیاسی نەکەوتووەو خەریکی خوێندن بووە. رۆژێ لە رۆژانیش نەیوتووە کۆمەڵەم! نوسەر ئەوەندە رقاوی‌و هەڵپەرستە، لەکاتێکدا شیهابی شێخ نوری قسەشی لەگەڵ نەوشیرواندا نەبوەو نەوشیروان بەردەوام قسەشی بە شیهاب دەووت، بەڵام بۆ یەک جاریش، خۆی لەقەرەی ئەم کێشەیە لەنێوان ئەم دوو زاتە نادات. کەچی شیهاب‌و ئارام، خزم بون. لە زیندانەوە شیهاب وتویەتی دوای من ئارام هەموو شتێکە. بە نوسەریش گوتراوە بەقسەی کۆمیتەی هەرێمەکان بکات. سەرەڕای ئەو راستیانە نوسەر پەیتا پەیتا، رەخنە لە شەهید ئارام دەگرێ‌و بوختانی بۆ هەڵدەبەستێ!

نوسەر لە لاپەرە (١٩٦)دا بەمجۆرە ئاماژە بە پەرەگرافێک لە کتێبی نەوشیروان مستەفا دەدا:

"سەرانی کۆمەڵە کە لە برادۆست بوون، سالار، مەلا بەختیار، ئازاد هەورامی‌و ملازم عومەر لە کۆبونەوەیەک کە منیشیان بانگکرد بۆ کۆبونەوەکە، داوایان لێکردم، کە منیش یەکێ بم لە نوێنەرانی کۆمەڵە".(١)

ئەم قسانەی نەوشیروان راستن. بەڵام ناکرێ بە دابراوی لە دۆخی شۆرش، کۆمەڵە، بزوتنەوەی سۆسیالیست لەناو یەکێتیدا باسبکرێ.

ئەوکاتە، ناکۆکی کۆمەڵەو بزوتنەوە، خەریکبوو قووڵدەبوو. هێزی زۆرو بۆری بزوتنەوە باڵادەستییان پەیداکردبوو. مام جەلال زیاتر بەلای بزوتنەوەدا دایدەشکاند. تەنها سالار عەزیزو ئازاد هەورامی‌و بەندە، کۆمیتەی هەرێمەکان بوین. ملازم عومەر سەرکردایەتی یەکێتی بوو، بانگکرایە کۆبونەوەکە. بەبێ‌ئەوەی بگەرێنەوە بۆ بۆچونی شەهید ئارام، بە هاندانی مام جەلال، ئەو تەکلیفە لە نەوشیروان کرا. بەش بە حاڵی خۆم،

---

* عومەر فەتاح دەیگێرێتەوە کە لەکاتی رۆشتنی نەوشیروان ١٩٧٢ بۆ دەرەوەی وڵات، بەرێی کردوە. لەفرۆکەخانە نەوشیروان پێی وتووە: «بە برادەران بڵێ لەگەڵ کۆمەڵە کار بکەن». ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، دوای دوو ساڵ لە دامەزراندنی کۆمەڵە، نەوشیروان‌و پەیرەوانی، خۆیان دور راگرتووە.

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(١٩٦).

لەو کۆبونەوەیە بۆ هاتنی نەوشیروان، نە حەماسم هەبوو، نە دژیشی بوم. بەتایبەتی پێشتر چ لە گوندی "ماسی رۆ" لە یەکەم دیداردا لەگەڵی هەڵچوین. چ دوای ئەوەش، دژی شەهید شیهاب قسەی نابەجێی دەکرد. بڕیاری تەکلیف لێکردنەکەی سالار عەزیز پێی راگەیاندو ملازم عومەرو ئازاد هەورامیش پشتیوان بوون. مام جەلال، زۆری هاندەدا بێتە ناو کۆمەڵە! بڕیارو بەرنامەکەش وا بووە، دوای ئەوەی نەتوانراوە یەکێتی بکرێتە حیزبێکی جەماوەریی فراوان، نەوشیروان بێتە ناو کۆمەڵە، هەتا کۆنترۆڵی بکات. بەتایبەتی نەهاتنی شەهید ئارام، بۆ کۆبونەوەکان دڕدۆنگی کردبون!

لە شیکردنەوەی ئەو بابەتەدا، هەر لە لاپەڕە (١٩٦)دا پەرەگرافێکی تریش بەمشێوەیە دەکاتە پاڵپشتی بۆچونەکانی:

"من خۆم پێم خۆش نەبوو...... راستیەکەش ئەوە بوو، توشی «خيبة أمل» ببووم لێیان و بڕواشم بە کۆمۆنیزم نەبوو..... و جگە لەوەش رەئی عەلی عەسکەری و د.خالید وابوو، کە بە هەموومان رێکخستنێکی تازە بەگوێرەی پێویستیەکانی شۆڕشەکە دابمەزرێنین، کە جێگەی کۆمەڵە و بزوتنەوەو خەتی گشتیش بگرێتەوە«.[1]

لەم دەقەدا، نەوشیروان راشکاو بووە. توشی (خيبة أمل) بوبوو، چونکە کێشە لەناو شۆڕشەکەدا زۆر بوو. کۆمەڵەش ئەو هێزە تۆکمەیە نەبوو. بەڵام بۆ دۆخی سەرەتای شـۆڕش، ئەو کێشانە ئاسایی بـوون. دەستەی دامەزرێنەرو ئەو هێزەی لە قامیشلو دروستیان کردبوو، پڕ بوو لە گیروگرفت، کە هێزەکانیشیان دەنـاردەوە، دەشکان. چەکەکانیان تەسلیم دەکران. ئەوان، لەناو سوریاو بەو هەموو چەکو تفاقەوە، بەو هەموو توانا داراییەو بە پشتیوانی سوریا-لیبیاو فەلەستینییەکان، ئەو هەموو کێشەیەیان هەبوبێ، کۆمەڵە بە نەبوونیی، بێ پشتیوان، بە نەبونی توانای دارایی، چۆن کێشەی نابێ؟ لەکاتێکدا، لە سوریا ئەوان یەکباڵ بوونو لەکوردستاندا، دوو باڵی ناکۆکیش بوین. پاشان خۆ بۆ مامو نەوشیروان دەرکەوت، کە بزوتنەوە بەقسەی ئەوانیشیان نەدەکرد. ئەو پاساوەش بەتاڵبویەوە گوایە، لەبەر بێئەزمونیو توندڕەویو بۆ پلەوپایە، کۆمەڵە کێشەیان لەگەڵ بزوتنەوەدا ناوەتەوە. خۆ مام جەلالو نەوشیروان بەئەزموون بون. مام سکرتێری گشتی یەکێتی بوو. پارەو چەکو چۆڵیشیان هێنابووەوە.. ئەی بۆ نەیانتوانی هێزەکانی بزوتنەوە رێکبخەنەوە؟ بەڵکو بۆ نەیانتوانی راڕایی بزوتنەوە بەرامبەر پارتی یەکلابکەنەوە؟ هەتا لە هەڵمەتی هەکاریش پێیان نەکرا، رێڕەوی کاروانی هەکاری باش بکەن. یان تاکتیکەکەی لەکاتی رۆشتندا بگۆڕن. سەرەڕای ئەوەی لەکاتی رۆشتنیاندا، رووداوی چاوەڕواننەکراویش رووبەڕوویان بوبووەوە! با دیقەت بدەین لەمبارەوە نەوشیروان چی نووسیوە:

١ سەرچاوەی پێشوو.

"کۆبونەوەی یەک لەدوای یەکو، گۆڕینی پەیتا پەیتای بڕیارەکانو، نوسینو ناردنی ئەم نامانە، رادەی دودڵیی سەرکردایەتی یەکێتی دەرئەخا لە مەسەلەی لێدانی قم دا، دودڵیی و ڕاڕایی لە بڕیاردانی جەنگییدا، بەتایبەتی لەکاتی ناسکدا، دەردێکی کوشندەیەو، دوژمن ئەتوانێ بە چاکترین شێوە کەڵکی لێوەربگرێ. لەکاتێکدا سەرکردەکانی قم کە هەمو چەکدارو دۆستو لایەنگرەکانی خۆیان بە گیانی دوژمنایەتیەکی سەختو بێ ئەندازەی یەکێتی پەروەردەکردبو. بۆ ئەوەی کە بێ سێو دو لەرویدا ڕابوەستنو بەگژیدا بچنو ئەگەر بتوانن، یەکێتی وەکو حیزبێکی دوژمن بە خۆیان، لە ڕەگووریشە دەربهێنن، کەچی گومانو دودڵیی‌و ڕاڕایی خرابوە ناو هێزەکانی یەکێتیەوە کە: ئاخۆ ئەو شەڕە بکرێ باشە یا نەکرێ! ئەو شەڕە براکوژیە یان براکوژی نیە! قم لە یەکێتی نادەن ئیتر بۆچی یەکێتی لەوان بدات؟".[1]

لەوەش گرنگتر، نەوشیروان لە لاپەڕە (٢٧٠)دا بەمشێوەیە بە ڕاشکاوی دانی پیادەنێ کە نەیانتوانیووە، ڕاڕایی‌و دوودڵی لەناو سەرکردایەتی‌و مەکتەبی سیاسی یەکێتیدا یەکلایی بکەنەوە:

"یەکدڵی لە هەڵوێستی سیاسی هێزەکەدا لەڕوی دیاریکردنی دۆستو دوژمنەوەو، یەکدەستی لە هەڵوێستی سوپایی هێزەکەدا لەڕوی لێدانی بێ چەندوچونی دوژمنانەوە، کە شتێکی پێویست بو، دیسانەوە خرایەوە سەر مێزی لێدوانو گفتوگوو باسکردنەوە. دودڵی و ڕاڕایی لە لێدانی قم دا جارێکی تر لە دڵی هەندێکدا شین بوەوە. تەنانەت لەناو ئەندامانی مەکتەبی سیاسیدا هەبو رەئی وابو کە بۆئەوەی یەکێتی بتوانێ بێ گێرمەوکێشە ڕێگەی هێنانی چەک بکاتەوەو، ماوەی خەڵک چەکدارکردنی هەبێ، لەگەڵ قم ڕێک بکەوێو، نیسبەتێکی ئەو چەکانەی ئەیهێنێ لەباتی "گومرگ"و "باج" بدات بەوان".[2]

لەهەموو ئەوانە زەقتر، نەوشیروان دانی پیادەنێ کە لەناو یەکێتیدا، ڕاڕایی‌و ناکۆکی، لە هەستیارترین دۆخی عەسکەریشدا، گەیشتۆتە ئەوەی عەلی عەسکەری گوێنەداتە بڕیاری مەکتەبی سیاسی‌و فەرمانی سکرتێری گشتی‌و لەژێر ناونیشانی (گۆچانەکەی عەلی عەسکەری)دا، لە لاپەڕە (٢٧٥-٢٧٦)دا دەنوسێ:

"مام جەلال وتی: "پێئەچێ هەلومەرجەکە گۆڕابێ، جموجوڵی دوژمنانەی ئێران زۆر زیادی کردوە. ڕۆیشتن بەم قەرەباڵخییە بەناو ئەرزی ئێراندا کارێکی خەتەرە. لەبەرئەوە پێشنیار ئەکەم هەمومان بگەڕێینەوە "دۆڵە کۆکێ"و، بەپێی ئەو فاکتەرە نوێیانەی هاتونەتە ناو مەسەلەکەوە، سەرلەنوێ بیر لە هەمو نەخشەکە بکەینەوەو حسابو نەخشەڕێگە و شوێنی نوێ دابنێین".

کاک عەلی وتی: "ئێمە هێزێکی ترمان ناردۆتە ناوچەی برادۆست. چاوەڕوانی گەیشتنی

١ نەوشیروان مستەفا ئەمین. لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ. ل(٢٧١-٢٧٢).
٢ سەرچاوەی پێشوو. ل(٢٧٠).

ئێمە ئەکەن، من فەرماندەی پێشمەرگەم بەڵێنم پێ داون لەوێ یەک بگرینەوە لەبەرئەوە من هەر ئەڕۆم".
مام جەلال وتی: "مەبەستم لەوە نەڕۆیشتن نیە، بەڵکو گۆڕینی جۆری ڕۆیشتنەکەیە".
لەم بارەیەوە هەندێ مشتومڕ کرا. کاک عەلی سوور بۆ لەسەر هەڵوێستەکەی‌و وتی: "ئێمە چۆن ئەبێ هەر دوو تۆپ تەقی ئێمە نەخشەو پلانەکانی خۆمان بگۆڕین..؟".
کاک عەلی لەکاتی ڕۆیشتندا گۆچانی بەدەستەوە ئەگرت، لەکاتی قسەکانیدا گۆچانەکەی بەتوڕەییەوە کێشا بە بەردێکدا گۆچانەکەی شکا".[1]
بەو سێ تێکستە، تەمومژی سەر ڕوداوەکان دەڕەوێنەوەو دەسەلمێ، کە کێشەی ناو یەکێتی گەلێ لە کێشەی بێئەزمونیی کۆمەڵەو بەئەزمونیی مام جەلال‌و نەوشیروان‌و سەرکردەکانی بزوتنەوەی سۆسیالیست قووڵترە. هەتا دەگاتە ئەو ڕادەیە، فەرماندەی هێزی پێشمەرگە گۆچان لە بەرد بداتو ئامادە نەبێ تەنانەت تاکتیکی ڕێڕەوی جۆری ڕۆیشتنی کاروانەکەش بە قسەی سکرتێری گشتیش، بگۆڕێ!!
سەبارەت بەوەی نەوشیروان باوەڕی بە کۆمۆنیزم نەبووە. کۆمەڵە لە دامەزراندنیەوە، باسی ئەوەی نەکردووە کە ڕێکخراوێکی کۆمۆنیستییە. مام جەلالیش لافی وای لێنەداوە. خودی نوسەریش، خۆی بە کۆمۆنیست نەزانیووە. کێشەکە لەمەدا نییە کۆمۆنیست بوین یان نا. کێشەکە لە دوائەنجامدا دەرکەوت، کە نوشیروان هەر باوەڕی بە کۆمەڵەو بە لایەنی کەمی مارکسیزم-لینینیزم نەبووە. هەروا بە چەپیش. کەسێکی ناسیۆنالیستی توندڕەو بوو.
ئەوکاتەی دوچاری کێشەی قووڵ هاتبوین، تەکلیف لە نەوشیروان کراوە بێتە ناو کۆمەڵە، نەوشیروان ئەوکاتە ڕادەی تێکۆشانی بۆ کۆمەڵە، باشتر بوو لەوکاتەی، لە کۆنفرانسی یەکەمەوە هەتا دەگاتە سێیەمین کۆنفرانس، بەرە بەرە دادەشـوردرا لە بیری لایەنی کەمی دیموکراسیش. ئێمە ئەوکاتە بەرە بەرە هەڵوێستیشمان لێوەرگرتبوو. مەترسییەکانی بۆ سەر کۆمەڵەمان باسکردبوو. ڕێک ئەوکاتە، نوسەری کتێبی (چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە)و بەشی زۆری تەکەتولی زیندان، پەیڕەوییان لە بڕیارو بەرنامەکانی نەوشیروان دەکرد. ئا ئەمەیە دووڕوویی نوسەر، کە دەیەوێ هزری ڕاستڕەوانەی بە پەلاماردانی مێژووی کۆمیتەی هەرێمەکان، لەسەرەتای شۆڕشەوە هەتا پەلاماردانی ئاڵای شۆڕش، داپۆشێ. تورک قسەیەکی هەیە لەسەر هەموو مەسەلەیەک، دەڵێ: ئاخر نە باخ. واتا: سەیری کۆتاییەکەی بکە.
نوسەر لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٨وە، دوای کارەساتی هەکاری هاتۆتەدەرەوە. لەو

---

١ سەرچاوەی پێشوو.

ماوەیە، ماوەیەکی کەم نەبێ، نێردرایە قەراغو بە شکاویی گەڕایەوە. دوای گەڕانەوەی، ئیتر ئەم زاتە، ناخی زوخاوی دژایەتی لێدەباری. چونکە، توانای خۆی دەزانیو دڵنیابوو، بە رێکەوت لە قەراغ تێکنەشکاوە، بەڵکو پێکهاتەی وایە کە ناتوانی ئەرکەکان راپەڕێنێ. ئازاش نەبوو. ئیتر دوو نەخۆشی هەتا دەهات زیاتر لە دەرونی کەسایەتیدا، تەشەنەیان دەسەند. خۆهەڵکێشانو تێکدان. لەسەر هەردوو ئەم نەخۆشییانە، لە کۆنفرانسی یەکەمو تەواوی کۆنفرانسەکانی کۆمەڵەو کۆنگرەی یەکێتی، بۆ کادرو ئەندامان دەرکەوت، هەمیشە لایەنی کەمی دەنگی دەهێنا. تەنانەت ئەو تەکەتولانەی خۆیشی پیادا هەڵدەواسین، بۆئەوەی بیانکاتە پشتیوانی رشتنی نەخۆشیەکانی، دەنگیان نەدەدایە. هەر ئەم دوو نەخۆشیەش، وایان لێکرد، لەدوای هاتنەدەرەوەی، سەرەڕای ئەوەی نەوشیروان بە لای راستڕەویدا لای دەدا، ئەم، بەناوی بەرگری لە کۆمەڵە، خۆی بە لای نەوشیرواندا بایدەدا! هەروا بە تەکەتولی سجن. هەردوو لاش باشیان دەناسی. بۆیە دەنگیان پێنەدەدا. بەڵام دەشیانزانی چ نەخۆشییەکی هەیە. بەپێی کەسایەتیەکەی هەڵیاندەداو هانیان دەدا. هەتا دوا شەرەفی گەورە کە پێیانبەخشی، لەبەر رقەکانی، ئەوەندە بچووکو ئاستی کەسایەتی ئەوەندە نزمە، شەرەفی زیندانەوانی ئێمە بوو. شەرەفی کۆمەڵەیەکی جەلاد. جەلادێک کە لەکاتی جەلادییشدا، ترسنۆک بوو. هەر لەبەر ئەم ترسنۆکییەی، نەکا رۆژێک بێ تۆڵەی لێبکەینەوە، جەلادیەکەشی بە نامەردی لەرێی حەرەسەکانەوە، ئەنجامدەدا.

## (٦)
## نەوشیروانو رێکخستنی تازە!

لەکۆتایی دوا پەرەگرافدا، نەوشیروان مستەفا، راستیەکی مێژوویی دەدرکێنێ، بەم درکاندنە، ئیتر دەریدەخات ئەوکاتە، بەڵکو دوای ئەوکاتەش، چۆن بیری کردۆتەوە. کاتێک نوسەر لە کتێبی (چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە)دا لە لاپەڕە (١٩٦)دا ئاماژەی پێکردووە، کە دەڵێ:

"رەئی عەلی عەسکەریو د.خالید وابوو، کە بەهەمووومان رێکخستنێکی تازە بەگوێرەی پێویستیەکانی شۆڕشەکە دابمەزرێنین. کە جێگەی کۆمەڵەو بزوتنەوەو خەتی گشتیش بگرێتەوە".[1]

بەداخەوە، هەتا ئێستا ئەم دەقە، کەمترین توێژینەوەو رەخنەی لەسەرە. کە دەقێکی هەتا بوترێ، لەبەر چەند راستییەک گرنگە، وەکو:

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(١٩٦).

- نەوشیروان وەکو خۆی، قەت کۆمەڵە نەبووە.
- کە هاتۆتەوە، بەبێ بەرنامە گەڕاوەتەوەو لەناو رووداوەکاندا ویستویەتی، دوابڕیاری خۆی بدات.
- باوەڕی بە کۆمەڵە-بزوتنەوە-خەتی گشتی، نەبووە.
- عەلی عەسکەریو د.خالیدیش باوەڕیان بە بزوتنەوەو کۆمەڵەو خەتی گشتی نەماوە.
- هەرکە هاتۆتەوە، نەوشیروان، لە د.خالید نزیک بووە، پاشان لەگەڵ عەلی عەسکەری.. کە دوای د.خالید گەیشتە دۆڵی گۆستێ.
- پێکەوە تەگبیریان کردووە حیزبێکی تازە دابمەزرێنن. واتا: هەوڵبدەن کۆمەڵەش، لەگەڵ بزوتنەوەو خەتی گشتی لەناو حیزبە تازەکە بتوێننەوە.

هەر کە دەگاتە دۆڵی گۆستێ، دۆخەکە دەبینێ، نامەیەک بۆ د. کەمال فوئاد دەنووسێ بەناوی (فەرید)، تیایدا تابلۆی سیاسی و هەڵوێستی خۆی، لەپوختەی نامەکەدا دەنەخشێنێ[1]: (برای بەڕێزو خۆشەویستم کاکە فەرید سڵاوێکی گەرم هیوادارم شادو بەختیار بیت. زۆر بە پەرۆشەوە هەواڵی خۆشی و سەرکەوتنتان ئەپرسم. پێش ئەم نامەیەش نامەیەکەو دوو بڵاوکراوەی ناوەوەی وڵاتمان بۆ ناردیت و بەڵێنم دابویتێ کە لە نامەیەکی درێژدا وەزعی ئێرەتان بۆ بنووسم، وا ئەمڕۆ فرسەتم بە دەسکەوتوەو بەڵێنەکەم بەجێئەهێنم) پاشان دەنووسێت: (بۆ ئاگاداریت دەربارەی تەیارەکانی ناو یەکێتی ئەم زانیاریانەت بۆ ئەنوسم:

١-کۆمەڵەی مارکسی – لینینی کوردستان: ئەمە رێکخراوێکە بەشێوەیەکی بچوک لەساڵانی ٧٠-٧١ دامەزراوە. من و عەجولیش ئاگاداری سەرەتای دەس پێکردنەکەیان بووین، بەڵام خۆیان سەربەخۆ گەشەیان کردوەو دروست بون و بەهێزبون، دوای ئاشبەتاڵ تەنیا هێزی رێکخراو بون، وە ئەگەر لێدانی شەهاب و هاوڕێکانی نەبوایە ئەبونە گەورەترین رێکخراوی کوردستانی عیراق. ئەمە کاتی خۆی لەسەر بنچینەی م. ل. بیروباوەڕی ماوتستۆنگ دامەزرا بوو، بەڵام ئێستا لەڕووی فیکرییەوە وەکو جاران توندوتیژیان نەماوە، رێکخراوەکانی ی.ن.ک لەهەموو شارەکانی عێراق دا ئەمان دروستیان کردوە، هەموو ئەو چالاکیانەی لە شارەکاندا بەتایبەتی کوشتنی پیاو خراپانی سلەیمانی و هەولێرو کەکروک و بەغدا ئەمان کردویانە، یەکەمین دەستەی چەکدار کە چونەتە شاخیش هەر ئەمانە بون، بەڵام ئەمانە چەند کەموکوڕیەکیان هەیە ئەویش ئەوەیە هەموو کادرە پێشکەوتوو ئەساسیەکانیان ٣ لەگەڵ شەهاب اعدام کران وە دوایی تر لە سلەیمانی هەندێکی تریان اعدام کراون و نزیکەی ٦٠-٧٠

[1] نەوزاد عەلی ئەحمەد، سەرەتای کاروانەکە، باری دوێنێی خەباتی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان، لەکۆمەڵێک بەڵگەنامەی گرنگدا ١٩٧٥-١٩٨٠.

کادری بەقابلیەتیان گیراون کە خەڵکی شارە جیاجیاکانن، لەبەرئەوە هەندێک گەنجی خوێن گەرم کەوتونە سەرکردایەتیەکەیەوە، بەگشتی ئاستی تیوریان نزمە، بیروڕای دەستەگەرییان تێدا پەیدابوە، خەڵکی ناسراویان کەمە لەناو خەڵکدا کە بینە واجهەی رێکخراوەکەیان، بەڵام لەروی تەنزیم و رێکخستنەوە دژی رێکخستنن بەشێوەی کۆن واتە کۆکردنەوەی زۆرو بۆر هێنانەوە پێشەوەی عناصری کۆن و ئاغاو کوێخاو لایەنگری پێشخستنی خەڵکی گەنجن لەسەر بنچینەی دڵسۆزی بیروباوەڕو تواناو کارامەیی نەک لەسەر اساسی ناوبانگی پێشو و مرکزی اجتماعی) پاشان نووسەری نامە ئەوە دەدرکێنێت کە چۆن ئینتمای کۆمەڵەی مارکسی –لینینی کوردستان دەکات، بەڵام ئەو ناوی لیناوە (چوومە سەر میلاکی ئەوان) و لەنامەکەیدا لەو رووەوە دەڵێت: (خولاسە ئەمانە لایەنی سەلبی و ایجابی یان هەیە، بەڵام لایەنە اجابیەکانیان زۆر زیاترە لەلایەنی سەلبی. من تا ئەم کۆبونەوەیەش هەروەکو خەتی گشتی ی.ن.ک بووم بەو جۆرەی کە لەدەرەوەی وڵات ئەمان کرد، بەڵام لێرە بەداخەوە برادەرانی بزوتنەوە وەهایان لەگەڵ رەفتار نەئەکردم، وە بۆ قازانجی یەکێتی لەسەر داوای عەجولی و کاک عەلی و هەندێکی تر چومە سەر میلاکی ئەوان و ئەوانیش وەکو خۆیان ئەڵێن منیان قبوڵە*).

لەخۆڕا بینینێکی سەیر بووە. لە قوڵەی قافی سیاسیەوە سەیری خۆیان کردووە. بەداخەوە، ئەوکاتە، ئەم مەسەلانەمان وەکو کێشەیەکی گەورە دژی کۆمەڵە سەیر نەکردووە. چارەسەرەکەمان تەنها ئەوە بووە نەوشیروان راکێشینە ناو کۆمەڵە. ئەمەمان لەوکاتەدا بە چارەسەرو سەرکەوتن زانیووە، بەبێئەوەی لێکدانەوەی دەرونشیکاری بۆ ئەو تێزانە بکەین، کە لە ئایندەشدا، چەند مەترسین بۆ سەر کۆمەڵە، تەنانەت شۆڕشەکەش. ئا لەمەیاندا، بە راستی ئاستی لاوازی تیۆریو زاڵبونی هەستی دڵسۆزی پەتیی بۆ کۆمەڵە، دەردەکەوێ. ئەمە جگە لەوەی، دوریی شەهید ئارام لە کۆبونەوەکان، کاریگەری نالەباری لەسەر ئەو بڕیارانەمان هەبووە. ئێستا، بە ویژدانی ئاسودە دوای (٤٣) ساڵ لەسەر ئەو رووداوە دەنوسم، دڵنیام ئارام لە کۆبونەوەکان بوایە، یان ئێمە دوابڕیارمان بۆ کۆبونەوە لەگەڵ شەهید ئارام دوابخستایە.(**) دڵنیام هاوکێشەکان بەشی زۆری دەگۆڕدرا. مام جەلالیش ئەوکاتە لە دۆخی بزوتنەوەکەو پێکهاتەکەیو ناکۆکیەکان تێگەیشتبوو، ئەویش مەترسی هەبوو دۆخەکە لە گرێژنە دەربچێ، بۆیە بەگشتی (مسایرە)ی باڵەکانی دەکرد.

* دەقی دەستخەتی بەشێکی نامەکە لە لاپەڕە (٥٥٠)ی ئەم کتێبەدا بڵاوکراوەتەوە.

** لەسەر کۆی کێشەکان من وتم: با دوابڕیار هەڵگرین لەگەڵ شەهید ئارام بیبڕێنینەوە. بەڵام وترا: زۆرینە لێرەین پێویست ناکات.

زورتریش گوێی لە عەلی عەسکەری.. دوای ئەم لە نەوشیروان دەگرت. ئەگەر هاتباو ئێمە گوتبامان تا نەچینە لای سکرتێری کۆمەڵە دوابڕیار نادەین، بەدڵنیاییەوە، هاوکێشەکان دەگۆڕدراو مام جەلالیش پێینەدەکرا، گوێ لە بڕیاری سەربەخۆی کۆمەڵە نەگرێ. دەتوانم جەختیش بکەمەوە، ئەگەر بڕیاری لەوچەشنەمان دابا، نەک تەنها هەر لەو دۆخەدا هاوکێشەکانمان دەگۆڕی.. بەڵکو دوای ئەوەش ئاڕاستەکان ئاقاری سیاسیی و حیزبایەتی تریان وەردەگرت. بۆ مێژووش دەبێ بڵێم:

سالار عەزیز، هەتا رادەیەک دەرکی مەترسیەکانی لە من باشتر کردبوو. باسیشی دەکرد. بەڵام لەدوائەنجامدا، بڕیارەکان چۆنیان ویست سەپێنرا. نەوشیروانیش، بە ڕێنوێنی مام جەلال، خزێنرایە ناو کۆمەڵەوە.

لە ناخی خۆما، نیگەرانیم لە دۆخەکە هەبوو. بەڵام مێژووش وەکو خۆی باسدەکەم، نیگەرانیەکەم نەگەیشتبووە هەڵوێست وەرگرتن لە مام جەلال. بەگشتی نیگەران بوم. جارێکیان مام جەلال چوبوو بۆ سەردانی "شێخ محەمەدی لۆلان" پێم جوان نەبوو بە مام بڵێم تاقەتی ئەو دۆخەم نەماوە. شەهید سەعدیی و سەید کاکە دەرۆیشتن بۆ دەشتی هەولێر. منیش لەسەر بڕیاری شەهید ئارام دەبوایە بڕۆم بۆ ماوەیەک لای هاوڕێیانی کۆمەڵە بم لە دەڤەرەکانی هەولێر. شەهید شاخەوان عەباس، چۆنیەتی بڕیاری شەهید ئارام ئاوها باسدەکات:

"لەگەڵ شەهید ئارام چوینە ماڵە ناسیاوێکی، لەوێ چاومان بە هاوڕێ مەلا بەختیار کەوت کە شەهید ئارام بەدوایدا ناردبوو لەسلێمانیەوە هاتبوو، شەهید ئارام بەیەکتری ناساندین، وتی لەمەودوا ئەم دەبێتە لێپرسراوتان، خۆشحاڵی خۆمان سەبارەت بەو هاتنەی ئەو نەشاردەوەو رامانگەیاند کە ئێمە ئەوپەڕی هاوکاری دەکەین".[1]

ئەو بڕیارە لەسەر ئەم بنەمایەی گفتوگۆی هاوڕێیانی هەولێرو شەهید ئارام لە قەراغ دراوە، کە هاوینی ١٩٧٧ گەیشتبونە قەراغ. شاخەوان دەڵێ:

"هاوڕێ ئارام لەسەر کانیوئاوێک داوەتێکی بۆ کردین کە حەیوانێکی سەربڕیبوو (دەبێ پێشمەرگە سەریان بڕیبێ.. ئەگینا شەهید ئارام حەیوانی سەرنەدەبڕی!) ئەو ڕۆژە داوامان لێکرد ئەندامێکی سەرکردایەتی کۆمەڵە بێتە هەولێرو هاتنیشی کارێکی پێویست بوو، بەحوکمی ئەوەی ئێمە ئەزمونێکی ئەوتۆی پێشمەرگایەتیو رابەرایەتیکردنمان نەبوو".[2]

پێشتر، سالار عەزیز هەوڵی دابوو سەردانیان بکات. بەڵام:

---

١ شاخەوان عەباس. سەفەری کوردایەتی بیرەوەریەکانی شارو شاخ ١٩٧٤-١٩٨٠. چاپی دووەم. ٢٠١٢. ئەکادیمیای هۆشیاریو پێگەیاندنی کادران. ل(٦٣)

٢ سەرچاوەی پێشوو. ل(٦٢).

"هیچ ئەندامێکی سەرکردایەتی کۆمەڵە نەهاتبووە دەڤەری ئێمە جگە لە هاوڕێ سالار عەزیز کە لە ١٩٧٧/٥/١٣ هاتبوە دەشتی کۆیەو لە گوندی حاجی قەڵا توشی شەڕوو پێکدادان بوبوون لەگەڵ هێزەکانی ڕژێم، دوو پێشمەرگەش لە نەبەردیەکەدا شەهید بوون، یەکێکیان بەناوی ئیسماعیل صدرالدین لە دەستەی عەلی صالح لەدوای بەدیل گیرانی ئیعدام کرا، ئەوی تریش شەهید فازیل کێخوا مستەفا بوو. ئیتر جەولەکەی تەواو نەکردوەو گەڕاوەتەوە سنوری سلێمانی".[1]

ڕۆشتنی کاروانی شەهید سەعدیم بە هەل زانی (٧) چەکم بارکردو لەگەڵیان کەوتم. ئێوارەکەی کەوتینەڕێ. شەوەکەی لەدورەوە هاوارمان بیست (مەلا بەختیار.. مەلا بەختیار) دەنگەکەیم ناسییەوە شەهید داود (خەڵکی جەلەولا) بوو. وەستاینو گەیشت. وتی: مام جەلال تورە بووەو ئەڵێ بێ پرسی من بۆ ڕۆیشتووە؟ با بگەڕێتەوە. ناچار گەڕامەوە. مام هیچ قسەی نەکرد. منیش بێتاقەتو دوور لەو دانیشتم. دوایی نەوشیروان وتی: نەمووت مەڕۆ هەتا مام دێتەوە. وتم: بۆ ئەرکی کۆمەڵە دەڕۆیشتم. بڕیاری کاک ئارامم پێ گرنگە جێبەجێی بکەم. دوایی لە مام جەلالیان گەیاندو ناردی بەدواما.. داوای لێبووردنی کردو چەکەکانی دامیو ڕۆیشتم.. هەتا مانگی ٢/ی ١٩٧٨ بەهۆی زۆریی ئەرکەکانو چەندین شەڕی سەختو پیلان لێگێڕانم لە (کانی سور، کونە گورگ) کە لە هەردوو پیلانەکەدا، بە ڕێکەوت ڕزگارم بوو. مام جەلال ناوی نابوم (شەهیدی زیندوو!) پێشموایە، ئەگەر شەڕو لێقەومانەکانی دەشتی هەولێر، خۆشناوەتی، کونەگورگو حاجی قەڵام توش نەبوایە، مانگی دوانزە-یەک فریای شەهید ئارام دەکەوتمو ئەویش دەکەوتە ڕێ بۆ مەکتەبی سیاسی.

## (٧)
## کۆمەڵەو کاریگەری نەوەی یەکەم!

نوسەر، لەژێر ناونیشانی (ڕۆڵی کۆمەڵەو ڕێپێوانو لەو کارەساتەدا) دیسان دەیەوێ نوکی ڕەخنە بکاتە سنگی کۆمیتەی هەرێمەکان.

باسی چوار هەڵەی کوشندە دەکات کە ئەمیش لە کتێبەکەی (لەبناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ) هەڵیهێنجاندووە. تازە تازە بیری دەکەوێتەوە خۆی بە خاوەن هەڵوێست پیشانبدات، دوای باران کەپەنەک.. بەدرێژایی مێژووی ١٩٧٨ کە هاتوتە دەرەوە هەتا

١ سەرچاوەی پێشوو. ل(٦٢-٦٣).

نوسینی ئەم کتێبە، کەسێک بووە لەو داشانەی دەستی نەوشیروانو شوێنکەوتووانی، تەنانەت داشە هارەش بووە. تازە بیری دەکەوێتەوە هەڵە کراوە.. بە هەرحاڵ، لەو چوار رەخنەی گواستونیەتیەوە، ئەمانەن:

١) گۆڕینی بەرنامەو دانەنانی بارەگای جێگیر.
٢) تێپەڕبوونی پیلانی ئیدریس بارزانی بەسەریاندا.
٣) نەمانەوە لە برادۆست هەتا گەیشتنی رەتلی سێهەم.
٤) حساب نەکردن بۆ ئەگەری شەڕ لەگەڵ ق.م.

لە تێکشکانی هەڵمەتی هەکاریو هەرەسی ئومێدی هەڵچنراو لەسەریان.. شەهیدکردنی سەرکردەکان..تاد، هیچی ئەو کارەساتانە، بەئەندازەی ئەوە لای نوسەر گرنگ نییە، جەخت بکاتەوە کە هاوڕێیانی کۆمەڵە، بڕیاریان بەدەستەوە نەبووە. بزوتنەوە بڕیارەکانیان داوە. ئەمەیە رادەی رقی کوێرانە، کە تەنانەت قەبارەی کارەساتی هەکاریش، ئەو رقەی دانامرکێنێتەوە!! تێکڕا (٨) فەرماندەو پێشمەرگەی کارەساتی هەکاری رزگاریان بوو. کە هاتنەوەو گەیشتنەوەیان بە سەلامەتی، خۆی لەخۆیدا داستانێکە، دەهێنێ رۆمانێکی لەسەر بنوسرێ!(*)

لێرەدا، لەبری ئەوەی دانی پیا بنێ کە بڕیاری سیاسی ستراتیژی، بەشێکی پەیوەندی بە تەمەنو ئەزمونەوە هەیە، بارتەقای ئەو بەشەش، زیرەکیو لێوەشاوەیی لە وردتر بینینی رووداوەکان، کاریگەری زۆری هەیە. بەڵام رقەکەی رێگەی لێگرتووە دان بەو راستیەدا بنێ. گرنگ لای ئەو ئەوەیە، چۆن هەل دابتاشێ رقەکەی هەڵڕێژێ.

نەوەی یەکەم، بڕیارەکانی داوە. هەر خۆیشیان هەڵەیان کردووە. تەنانەت گوێیان نەداوەتە بۆچونی یەکتریش، بە مام جەلالیشەوە کە لە قەندیل وتویەتی: تاکتیکی رۆشتنەکە بگۆڕن. کارەساتەکەیان قەوماندووە.. کۆمەڵە، هیچ بڕیارێکی لەو بڕیارانە نەداوە. پێشمەرگەی ئازاو پابەندی بڕیارەکانیش بون. شەڕیان کردووەو شەهیدی کۆمەڵەشیان بەخشیووە. خراونەتە زیندانو خۆڕاگر بوون. کەچی نوسەر، دەیەوێ، نەوەی دووەمیش بداتە بەر نەشتەری رق. چونکە بڕیاری سەرەکییان بەدەست نەبووە!!

---

* ناوی ئەو پێشمەرگانەی کە لە کارەساتی هەکاری گەڕانەوە: (تاهیری حاجی عەزیز، مەحمود زەردۆیی، رەفیق پارەزانی، حەمەڕەش گریزەیی، جەمال عەلی باپیر، بەکرە سوور، ئاوات گەڕەدێیی، محەمەدی حاجی مەحمود).

# رشتەی چوارەم:

## عێراقچی
## یان ساختەچی؟

## ( ١ )

# فوئاد میسری‌و جەزراوی.. هەڵبەستن!

لەم بەشەدا، نوسەر باسی ڕێکخستنی ناوخۆ دەکاتو دەشیەوێ بەپێی خەیاڵاتی خۆی، درەختی ڕێکخستنی شارەکان، بچێنی. لە لاپەڕە (٢١٠)دا دەڵێ:

"لەدوای چوونە دەرەوەی شاسوار جەلالو نەجمەدین عەزیز و حیکمەت محەمەد کەریمو ئازاد عبدولمەجید، ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە هێڵەکانی سەر بە کۆمیتەی هەرێمەکانو کۆمیتەی شارەکان ڕووبەڕووی چەند هاوڕێیەک کرانەوە، لەوانە عبدولرەزاق لە هەولێرو ئەحمەد کرێکارو حەمیدی پۆلیس لە کەرکوکو شازاد سائیبو جەمال تایەرو بەنلنۆالدە لە سلێمانی".[١]

جارێ با هەندێ هەڵەی بۆ ڕاستبکەینەوە، بەمشێوەیە:

- سالار عەزیز؛ یەکەم ئەندامی کۆمیتەی هەرێمەکان مانگی ٧ی ١٩٧٦ چووە دەرەوە.
- ئازاد هەورامی؛ دووەم ئەندامی کۆمیتەی هەرێمەکان، مانگی ٨ی ١٩٧٦ چووە دەرەوە.
- شەهید ئارام؛ سێهەم ئەندامی کۆمیتەی هەرێمەکان شەوی (١١/١٠)ی ١٩٧٦/١٠ چووە دەرەوە.
- مەلا بەختیار؛ چوارەم ئەندامی کۆمیتەی هەرێمەکان شەوی (٢٦/٢٥)ی ١٩٧٦/١٢ چووە دەرەوە.

دوا کەس مەلا بەختیارە، هەر لەبەرئەوەش بە بڕیاری کۆمیتەی هەرێمەکان مایەوە، هەتا رایەڵەی ڕێکخستنو پێشمەرگەی ناو شارەکانو پەیوەندییان بە دەرەوە ڕێکبخات.

هەتا مانگی ١٢/ی ١٩٧٦ بەرپرسی تەواوی ڕێکخستنەکان بووم، برایم جەلال بەرپرسی "ڕێکخراوی پێشمەرگە دێرینەکان" بوو، کە لەسەر پێشنیازی مام جەلال دروستکرا. لە هەمانکاتدا، پەیوەندی بە کۆمیتەی سلێمانیەوە هەبوو. کۆمیتەی پێشمەرگە دێرینەکان.. تازە دامەزرابوو، بە ژمارەی پەنجەی دەست ئەندامی هەبوو!

دوای چونەدەرەوەی بەندە، جەمال تایەر، کرایە بەرپرسی سلێمانی‌و پاشان سەرپەرشتیاری ڕێکخستنەکانی کوردستان. شازاد سائیب، لەناو هاوتەمەنەکانیدا

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢١٠).

زۆر جێگەی بڕواو، لە هەرە ئازاكان بوو. خۆی لە هیچ ئەركێك نەدەدزیەوە. تەنانەت پێشمەرگەشم پێ گواستۆتەوە.. هەرگیز، هیچ بڕیارو ئەركێكی ڕەتنەكردەوە. بەڵام لەبەر كەسایەتیەكەی، نەماندەویست بیخەینە ناو كۆمیتەكان. شەهید جەمال تایەر، دوای من پەیوەندی پێوە كردبوو. بەڕاستی شازاد سائیب، لە تێكۆشەرە ئازاو دڵسۆزو جوامێرە دەگمەنەكانی كۆمەڵە بوو.

حەمە چاوشینو د.خەسرەو، عومەر فەتاح، ئەمانە لەو هەڤاڵانەی جێی بڕوا بوون. كۆمەڵەش بوون. بەڵام هەتا ڕاپەڕینی (١٩٨١)یش هێڵی گشتی یەكێتییان پێ سپێردرا. دوای جەمال تایەر، هاوڕێ دلێر (سەلیم سەرسپی) پەیوەندی پێوە دەكردن.

من كە چوشمە دەرەوە، هەتا یەكەمین كۆنفرانسی كۆمەڵە، لە هەر شوێنێك بومایە، پەیوەندییان پێوە دەكردم. دوای دامەزراندنی بەشی ڕێكخستنیش لە ناوەندی كۆمەڵە، هەر من بەرپرسیاری ڕێكخستنەكانی كوردستان بوم.

كە دەشڵێ:

"لە كۆتایی ساڵی ١٩٧٧دا نامەیەكم لە كاك نەوشیروانو مام جەلالەوە پێگەیشت. كە بارودۆخی پەیوەندی سەركردایەتی بە ناوەوە دژوارەو دەبێ هەوڵی دروستكردنی خەتێكی پەیوەندی بكەین.

بۆ ئەو مەبەستە هەوڵمدا لە دوولاوە هێڵی پەیوەندی دروستكەم.

أ- لەڕێگەی "شارباژێر و دۆڵەرووت"ەوە. بەهۆی ناردنە دەرەوەی خاڵە شێخ سدیق بۆ دۆڵەڕووت و لەو ڕێگەیەوە.

ب- لە ڕێگەی ڕانیە-سەنگەسەر-قەلاتوكان و ئەبوبەكرەوە، بۆ ئەو مەبەستە لە ڕانیە پەیوەندیم بە خاڵم كرد (حەمە مستەفا محەمەد، حەمەی مەجید هاوار) ئەویش بردمی بۆ لای سەید ئەحمەد (ئەحمەد سەید زادە)".[1]

ئەوكاتە شەهید ئارام مابوو. من لە دەشتی هەولێر بوم. نەوشیروان كرابووە ئامر هەرێمی سلێمانی-شارباژێڕ. ئەو هێڵەی باسی دەكات، زۆرتر بۆ پێویستیەكانی مام جەلالو مەكتەبی سیاسی بووە.. نەك سەرپەرشتی ڕێكخستن. چونكە، دوای من شەهید ئارام سەرپەرشتی ڕێكخستنەكانی دەكرد. نە مام جەلالو نە نەوشیروان كۆدی ڕێكخستنەكانیان نەدەزانی. نەشیاندەزانی ئەندامانی كۆمیتەكانو بەرپرسەكان كێنو ناوی نهێنیشیان چییە؟

---

١ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەكەم-٢٠١١. ل(٢١١).

خاڵە شێخ سدیق، هەرگیز لە دۆڵە رووت نەبووە. بەڵکو لە چۆخماخ بوو. ئەوەی لە دۆڵە روتەوە، پۆستەکانی دەهێناو دەبرد، شەهید حامیدی یاخسەمەری بوو. دوای ئەوەش، بورهانی کوێخا حسێنی هەناری سەروو، لەگەڵ هەڵۆی ئەحمەد کوردەوە، کە ئەندام کۆمیتەی شار بوو، کەسێکی بەهیمەتیش بوو، بەریدی شارو شاخی رێکخستبوو.

لە سەرگوزشتە هەڵبەستراوەکانیا، لە لاپەڕە (٢١٢)دا دێتە سەر باسکردنی روداوێکی ترو ئاوای دەهۆنێتەوە:

"رۆژێ کاک ئەکرەم سەید مەجید پێی وتم: کە تەها باراوی‌و فوئادی مەجید میسری لە سلێمانین، با بچین بیان بینین؟، چویت بۆ لایان؟. کە چوومە لایان‌و قسەم لەگەڵ کردن، تەها باراوی داوای کرد بینێرینە دەرەوە بۆ دۆڵی رووت، کە ئەوکاتە نەجمەدین عەزیزو برادەرانی تر لەوێ بوون. تەها باراوی رۆیشتوو پاش چەند مانگێک گەڕایەوەو وازی لە پێشمەرگایەتی هێنا، لەگەڵ سوارەی کاک ئەحمەد، تەها بێ چەک گەڕایەوەو سوارەش دەمانچەیەکی هێنابوو، چومە لایان، سوارە دەمانچەکەی دایەوە بە رێکخستن، هەردووکیان گلەییان لە هەڵسوکەوتی نەجمەدین بوو، هەر لەبەر ئەویش تەسلیمبوونەوە.

بەڵام فوئاد وەڵامی تەواوی نەدایەوە، من فوئادم زۆر لە نزیکەوە نەدەناسی، بەڵام زیادی برای فوئادم دەناسی، کاتی خۆی لە هەمەدان لەگەڵمان بوو، پاشان چووە ناو حزبە کارتۆنیەکەی شێخ ستار تایەرەوە.

فوئاد وەڵامی ئەوەبوو، کە بیری لێ دەکاتەوە وەڵاممان دەداتەوە، پاش یەک هەفتە بیستمان لە رێگەی زیادی برایەوە چۆتە لای شێخ ستارو ئەویش بردویەتی بۆ لای تەها یاسین رەمەزان و تەها یاسین داوای لە فوئاد کردووە، کاریان لەگەڵ بکا و رێکخراوێکی بەدیلی کۆمەڵەی سەر بە رژێم دروست بکات، هەر بەناوی کۆمەڵەوەو، ئەویش گفتی دابوو بە تەها یاسین".[1]

ئەم زاتە هەڵبەستچیەکی کارامەیە لە هەڵبەستنی بەسەرهاتەکان.

هەر ئێستا کە ئەم دێڕانە دەنوسم، تەلەفۆنم بۆ فوئادی مەجید میسری کردو ناوەرۆکی ئەم هەڵبەستنەم لێپرسی. لەوەڵامدا وتی:

برایم جەلالم هەرگیز نەدیووە. دلێری سەید مەجیدو سوارە ئەحمەد بەرپرسی گواستنەوەی من بون. بەوەشەوە نەوەستا، لە پیاچونەوەی کتێبەکەدا، بەسوپاسەوە لە تێبینیەکانیدا چەند خاڵێکی گرنگی لەسەر ئەم مەسەلەیە نوسیووە.

١ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١ ل(٢١٢).

بۆی نوسیوم:

"ئێستا هەرسێکمان لەژیاندا ماوین‌و باوەڕیش ناکەم چ دلێرو چ من پێویستمان بە پاکانەو شاهیدی درۆینەی برایم جەلال بێت. ئەوەی ئەو دەیگێڕێتەوە نە ئەسڵی هەیەو نە ئەساس. نە هاتۆتە لای من‌و نە دیومە و نە باسی چوونەدەرەوەی لەگەڵ من کردووە. ئەشێ تەها باراوی بینیبێ، بەلام بۆچی ئەو دەبێ رای من وەربگرێ؟ سەیرە من لەگەڵ شەهید ئارام لە ماڵێکدا موختەفی بووین‌و بیست‌وچوار سەعات مشتومڕمان بوو لەسەر خەباتی چەکداری‌و پێکهێنانی مەفرەزە سەرەتاییەکان. کاک سالار عەزیزیش لە چەند دانیشتندا لەگەڵمان بووە. بەپێویستی دەزانم بۆ مێژوو تەواوی بیروڕای خۆم سەبارەت بە سیاسەتی ئەوکاتی کۆمەڵەو یەکێتی بخەمەڕوو:

١- من لەوکاتەدا باوەڕی تەواوم بە دامەزراندنی حزبێکی مارکسی هەبوو. یانی ئەرکی کۆمەڵەم لە دروستکردن‌و راگەیاندنی حزبدا دەبینییەوە، نەک بزووتنەوەی چەکداری.

٢- لە بۆنەیەکی تریشدا باسمکرد، دروستکردنی ینک تەجرەبەیەکی فاشیلی جەبهەی شەعبی جۆرج حەبەش بوو، بە کۆپیکراوی گوێسترابووەوە بۆ کوردستان.

٣- دروستکردنی شانەی چەکدار لەو هەلومەرجەدا، جۆرێک بوو لە باوەڕبوون بە بوئرەی شۆڕشگێڕی‌و تیۆرەکەی گیڤارا کە لەگەڵ بیروباوەڕ و هزری سیاسی من نەئەگونجا.

٤- من باوەڕم وابوو، کە هەرگیز ئێران سەرەڕای رێککەوتننامەی جەزائیریش هەر دەستبەرداری پارتی نابێ، بەتایبەت گەر بزووتنەوەیەکی چەپیش لە بندەستی خۆیەوە سەرهەڵبدا. ئێرانی ئەوسا هەموو توانای سەربازی خۆی بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەی (زەففار) تەرخانکردبوو، ئێستا چۆن ماوە ئەدا رێکخراوێکی چەپ بزووتنەوەیەکی چەکداری دروستبکەن. قیادەی مووەقەتەو دروستکردنەوەی پارتی بۆ خۆی بەڵگەیەکی راستی ئەم بۆچوونە دەرچوو.

٥- ئەگەرچی من زانستی سەربازیم نەخوێندووە، بەلام ئەوەندەی بابەتم لەسەر شەڕی پارتیزانی خوێندبێتەوە تێگەیشتووم کە هەلومەرجی شەڕی پارتیزانی بەوجۆرەی ماو، گیڤارا، جیاب، خیاو سامغان، کاسترۆ باسیانکردووە، لە سەروبەندی داهێنانی تەکنۆلۆژیای نوێدا، لەگۆڕێ نەماون. بۆیە سەرەنجام بە شکست کۆتایی دێ وەک هات... ئەوەی چەند ساڵێک درێژەی پێدا شەڕی عێراق-ئێران بوو، دەنا لەمێژ بوو سەرکردەکان جانتاکانیان پێچابووەوە.

٦- من قەناعەتی تەواوم بەوە بوو کە: کۆمەڵە دەکرێتە پردێکو مام سیاسەتەکانو مەرامە دوورونزیکەکانی خۆی پێ جێبەجێ دەکا. هیچ حسابێک بۆ سەرکردایەتی کۆمەڵە ناکاو هەر ئەوەندەی هێزێکی لەدوای خۆیەوە بینی، هەوڵی پاکتاوکردنی نەیارەکانی ئەدا..*

گوتیشی: من نامەم بۆ شەهید ئارام نوسیووەو پێموتووە: باوەڕم بەو سیاسەتە نییە ئێوە گرتوتانەتە بەر. یەک کاربەدەستانی گەورەی عێراقم نەدیووە. لەژیانیشما تەها جەزراویم نەدیبوو!!

من نامەکەم دیووە. ئەوکاتە لەگەڵ شەهید ئارام لەماڵی ئاوات قارەمانی بوین، کە فوئاد خۆی ئاشکرا کرد، چونکە بڕیاری گرتنی دەرنەچووبوو، تەنها لەترسی رەشبگیری گرتنی جەلالیەکان خۆی پاراستبوو. بیریشمە وتم: با ماڵەکە جێبهێڵین نەکا فوئاد قسە بکات. ئارام وتی: خەمتان نەبێ، قەت شتی وا ناکات.

مرۆڤ کە ئەم نوسینانە دەخوێنێتەوە، نازانێ بگری یان پێبکەنێ! ئاخر ئەم هەموو هەڵبەستنە، بە هەموو کەسێک ناکرێ؟!

پاشان سوارە، منی لەنزیکەوە دەناسی، هەموو رۆژێک یەکمان دەبینی، هاتوچۆی کەسوکاریشم دەکردن. دلێری سەید مەجید هاوڕێی بوو. بۆچی دەمانچەی بە ئێمەی نەدابێ، تەسلیمی نوسەری کردبێ؟! تەها باراوی‌و سوارەش، زورتر لەبەر ناکۆکی بزوتنەوەو کۆمەڵەو رەفتاری ناشۆڕشگێڕانەی بەرپرسەکانی کۆمەڵە، بێزار بون، بەڵام جوامێریی خۆیان پاراست.

ئەم رقە چییە لە فوئادی مەجید میسری، کە دەنوسێ:

"تەها یاسین داوای لە فوئاد کردووە، کاریان لەگەڵ بکا و رێکخراوێکی بەدیلی کۆمەڵەی سەر بە رژێم دروست بکات، هەر بەناوی کۆمەڵەوەو، ئەویش گفتی دابوو بە تەها یاسین".[1]

منالێکیش دەزانێ، ئەگەر تەها فوئادی دیبێ‌و گفتی پێدابێ، بەدیلی کۆمەڵە دروست بکات، تازە ئەو گفتە دەبووە ماڵ لەسەر فوئاد مەجید میسری و نەیدەتوانی خۆی لێ بدزێتەوەو چاودێرییان دەکرد. خۆ تەها یاسین رەمەزان، کەسێکی ئاسایی نەبوو، هەتا فوئاد بتوانێ کڵاو بخاتە سەری.

تومەز ئەم درۆو دەلەسانە بووە، بەردەوام بۆ نەوشیروانیان بە راپۆرت نوسیووە، بۆیە ئەویش هەوڵی تیرۆرکردنی فوئاد مەجید میسری دەدا.(*)

---

١ سەرچاوەی پێشوو.

* ئازاد چاوشین، پێشمەرگەیەکی دەستوەشێنی ناو شار بوو، لە دەستەکەی مندا بوو. نەوشیروان دەمانچەو پارەی پێدا فوئاد مەجید میسری تیرۆ بکات، من نەمهێشت!

( ٢ )

## تالیب ڕۆستەم قوربانیەکی رق

کارەساتی هەکاری، لێکەوتەی ناخۆش ناخۆشی لێکەوتەوە. لە روخانی هەندێکەوە، تا هەڵگەڕانەوەی هەندێکی تر. تا دەگاتە بەناچاریی تەسلیمبونەوەی بەشێکی هێزەکە.. تاقە مەفرەزەیەک بە سەلامەتیی گەیشتنەوە.

تالیب ڕۆستەم، نوێنەری یەکێتی بوو لە سەرکردایەتی، ئامر هەرێمیش بوو. لە خەباتی نهێنیدا، دابڕا بوو. پەیوەندی بە منەوە کرد. لەو ماوەیە، ئەرکەکانی بە ڕێکوپێکی رادەپەڕاند. هەر لەرێگەی ئەمیشەوە محەمەد مۆریاسیو مەفرەزەکەی ڕێکخران. حاجی داوودی باوکی شەهید سەلمان (هەڵۆی سوور) خزمی تالیب بوو، کاتێک خوێنی شەهیدانیان دامەزراندبوو، تالیب ڕۆستەم حاجی داودی پێناساندمو حاجی داودیش سەلمانی هێنایە لام. بە دڵسۆزیی خۆی، زوو چووە ریزی شۆڕشەوە. نازانم هۆیە شاردراوەکەی چییە، بەڵام کە من لە نۆکان بینیم، پێش هەڵمەتی هەکاری، زۆر بێزار بوو، زۆریش لە عەلی عەسکەری دەسڵەمیەوەو فشاری دەرونی زۆری لەسەر بوو. هەستی بە شکاندنی کەسایەتی خۆی دەکرد. تازەش لە سوریا گەڕابوەوە، پێی سەیر بوو، یەکێتی ئەو پەیوەندییە توندوتۆڵەی لەگەڵ سوریاو موخابەراتدا هەبوو.

لە هەڵمەتی هەکاریدا، گەرچی نەیدەویست بڕوات، بردیان. لەکاتی شەڕو شۆڕشەکاندا، خۆیو بەشێکی پێشمەرگە، بەناچاریی تەسلیم بوبوونەوە. کە تەسلیم بونەتەوە، نەوشیروان بێزادە رقی لێی هەستابوو. ئەویش یەک زەرە زیانی بە کۆمەڵەو شۆرش نەگەیاندبوو. بچوکترین نهێنی نەدرکاندبوو. تەنانەت لەگەڵ شەهید جەمال تایەر، ناکۆکیش بونو دەشیزانی بەرپرسێکی باڵایە، زمانی لێنەدابوو. نوسەر لە لاپەڕە (٢١٩)دا بە ویژدانەوە لە زمانی تالیبەوە دەیگێڕێتەوە کە:

"من چومە لای و تەواوی سەرگوزشتەی کارەساتەکەی لە ماڵی خۆیان بۆ گێڕامەوەو پاشان ناچاربوونی بەو تەسلیمبونەوەیە، دواجار داوای لێکردم ئاگاداری سەرکردایەتی بکەم، کە بە هیچ جۆرێ لەسەر ڕێکخستنی شارو نهێنیەکانی ناو کۆمەڵە و یەکێتی قسەی نەکردووەو ناشی کات، وتیشی: "من ئامادەم هەر یەکێک لەمانە، گەر سەرکردایەتی قایل بێ، بیکەم".

١- بچمەوە ناو شۆڕش و وەک پێشمەرگەیەک کار بکەم.
٢- بچمە ناو ئێران و لە دێیەکدا خۆم ستار کەم.
٣- لە هەر دێیەکی کوردستان دەڵێن و وەک هاوولاتیەک دانیشم.
٤- بچمە دەرەوەی ولات.
٥- گەر بە هیچی قایل نەبن، بەڵێن دەدەم گەر بنێرنە سەرم بۆ کوشتنیش ناوی بکوژەکە نەدرکێنمو هەتا هەم خیانەت لە کۆمەڵەو یەکێتی نەکەمو نەبمە پیاوی ڕژێم.[1]

ئەو گێڕانەوەیە، سەبارەت بە تالیب ڕۆستەم، دەیسەلمێنێ کە بە هیچ شێوەیەک ناوبراو، نیازی خیانەتی کۆمەڵەو یەکێتیو شۆڕشیش نەبووە؛ پەیوەندی بە بەکری حاجی سەفەرەوە کردووەو نامەی بۆ مەکتەبی سیاسی نوسیووە. چییان لێ داوا بکردایە، دەیکرد. ئەم هەوالانە هەموو گەیشتنە سەرکردایەتی. کەچی بەبێ پرسی ناوەندی کۆمەڵە، دوو هاوڕێی تر، کە ئەوانیش بەناچاریی لەکاتی هەکاریدا، تەسلیم بوبوونەوە، بڕیاریان بۆ دابون تالیب بکوژن، ئینجا بێنە دەرەوە. بڕیارەکە جێبەجێ دەکەن. تالیب بریندار دەکرێ. هەردوو هاوڕێکە دەناسێ. بەگرتیشیان نادا. دیسان هەواڵەکە دەنێرێ کە فلانو فلانتان ناردووە.(*) دەڵێ لەکاتی تەقەلێکردنم ناسیومن. ناویشم نەبردون. تکایە وازم لێبهێنن!!

بەداخەوە، هەر لەبەرئەوەی تالیب نەدەبووە داردەستی کەس، جارێکی تر ناردیانو کوشتیان. کوشتنی غەدرێکو تاوانێکی ئەوەندە بێڕەحمانەیە، ئێستاش کە بیرم دەکەوێتەوە، موچڕک بە لەشما دێت. لەکاتێکدا، بەپێی ڕادەی تاوانەکەی دەتوانرا بانگ بکرێتە سەرکردایەتیو سزا بدرایە. نەک بەبێ دادگاو بە بڕیاری شەخسی، تیرۆر بکرایە. ئەمەش نمونەیەکی تری ئەو ڕقە بەردەوامەیە، کە نەوشیروان وازی لێنەدەهێنا، هەتا دەیگەیاندە تاوانکردن!! بەهەمان شێوە مامۆستا نەریمانیشی کوشت. نەریمان، خزمی ئەحمەد کوردەی تێکۆشەری ناسراوی یەکێتیو شۆڕش بوو. من لەماڵیاندا، کۆبونەوەم کردووە، ئەوەندە دڵسۆز بوو، لە خزمێکی خۆی دەترسا، ئاگاداری کردین، کە وریابین نەکەوینە داویەوە. ئاخری ئەم زاتە، بووە مایەی شەهیدکردنی مامۆستا عەزیز مەحمود!

ئەوەی لام سەیرە، گێڕانەوەی بینینی تالیب ڕۆستەم، لەلایەن نوسەرەوە، ویژدانی تیایە. بەلام دوورونزیک، باسی چۆنیەتی کوشتنەکەی ناکاتو خۆی لە تاوانبارەکە نەبان دەکات. ئەمیش هەر لەبەرئەوەی نەیویستووە باسی نەوشیروان بکات. بەڵکو لە ناوبراویش ترساوە!!

---

١ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١ ل(٢١٩).

* ئەو دوو کەسە هەردوکیان ماوون. یەکێکیان بزوتنەوەی گۆڕانەو ئەوی تریان وازی لە یەکێتی هێناوە!

## ( ٣ )
## راستیەکانی کۆبونەوەی شێنێ

کۆبونەوەی شێنێ، لە کۆبونەوە فراوانەکانی مێژووی کۆمەڵەیە. نوسەر هەر لەسەرەتاوە لەسەر مێژووەکەی، بەهەڵەدا چووە. سەبارەت بە روداوی شەڕەکەش؛ شەڕەکە شەوی (١١/١٠)ی١٩٧٨/١١ قەوما. نەک (١٩٧٨/١١/٥). پاشان، ئەمە دووەم کۆبونەوەی فراوان بوو. یەکەم، بە کۆبونەوەی فراوانی نەورۆز بەناوبانگە، لە نۆکاندا پێش هەڵمەتی هەکاری، لەخوار بارەگاکەی مام جەلالو عەلی عەسکەری، سازمان دا. لەم کۆبونەوەدا (٢٢) کادر، بەشدارییان کرد. لە خانەقینەوە هەتا هەولێر. هەڵبژاردنیشی تیا ئەنجامدرا. بەڵام پۆستی سکرتێر دیارینەکرا. هەر لەو کۆبونەوەدا، نوسەر نامەیەکی دوورودرێژی بۆ نەوشیروان نوسیبوو، ئەویش لە کۆبونەوەکەدا تەسکیەی کردو نیوەی دەنگەکانی هێنا. ئەم زاتە بیری دەچێتەوە، دوای ئەوەی دەرچێندرا بۆ سەرکردایەتی، ئینجا بڕیاری هاتنەدەرەوەی دا. کە هاتیشە دەرەوە، لەخۆی ناپرسێ، ئەگەر کۆبونەوەی فراوان نەکراوە، چۆنچۆنی خۆیو مامۆستا جەعفەریش، کراونەتە ئەندامی ناوەندی کۆمەڵە کە لە کۆبونەوەکەشدا نەبوون؟ مامۆستا جەعفەر بە قابیلیەتی قەڵەمەکەی بوو بە بەرپرسی راگەیاندن. ئەویش لەبەر بێقابیلیەتەکەی، سزا دەدرا! لەمبارەوە نەوشیروان باسی یەکەمین کۆبونەوە ئاوها دەکات:

"بۆ کۆبونەوەی کادرەکانی کۆمەڵە لە نۆکان نامەیەکی درێژی بە عەرەبی بۆ من نوسی بو".[١]

لە کۆبونەوەی فراوانی نەورۆز، لەژێر کاریگەری نەوشیروانو کەسانی تر، سالار عەزیز، لە قۆناغی یەکەمی هەڵبژاردن دەرنەچوو. لەگەڵ ملازم عومەر پێمانداگرت کە غەدری لێکراوەو هەڵبژاردنەکەمان دوبارەکردەوەو دەرچوو! نەوشیروانیش نەیتوانی رێ لە هەڵبژاردنەوەی بگرێ! لێرەشدا دەردەکەوێ کە لەپێش کۆنفرانسەکانەوە، نەوشیروان، کەوتوتە پیلانگێران.

کە دێتە سەر هۆکارەکانی کۆبونەوە فراوانەکە، دیسان بە خواروخێچیو بەپێی نەخۆشییە دەرونیەکەی باسی دەکات. لە لاپەرە (٢٣٢)دا دەنوسێ:

---

١ نەوشیروان مستەفا ئەمین. لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ. ل(٣٢٣).

"تا ئەوکاتە کۆمەڵە بە شەرعی سەرکردایەتیەکی نەبوو، هاوڕێیانی سەرکردایەتی پێشوو لە زینداندا بوون، کۆمیتەی شارەکان دوو ئەندامیان لە دەرەوە بوو (ئەبو شەهاب، ئیحسان نەجمو بەندە) کۆمیتەی هەرێمەکان تەنیا مەلا بەختیارو ئازاد عەبدولمەجید (عادل) مابوون، نەوشیروان بە هەڵبژاردنو بە شەرعی نە سەرکردایەتیو نە سکرتێری کۆمەڵە بوو".[1]

جارێ، لە هیچ بەڵگەنامەیەکدا باسی کۆمیتەی شارەکان لە کولەکەی تەڕیشدا نییە. هەتا برایم جەلالو ئەبو شیهاب ئەندامی بن. فەرەیدون عەبدولقادر، لە لاپەڕە (٢٢٣-٢٢٤) ی (هەڵو سوورەکانی قەندیل)دا تەنها باسی ئازاد هەورامی، ئەرسەلان بایز، عوسمانی نانەوا، عەبدولرەزاق سیگردکانی، دەکات. لەتەنیشتیشەوە، نەک راستەوخۆ، ئەبو شیهاب وەکو راوێژکار دانراوە. ناوی نوسەری تیا نییە.

"منیش ناردم بەشوێن شەهید (ئازاد هەورامی)داو پاش تاووتوێکردنی ئەو ناوانەی بۆ من پێشنیار کرابوو، لەگەڵ کاک (ئـازاد)دا، کۆمیتەیەکمان پێکهێنا لە (شەهید ئازاد هەورامی، ئەرسەلان بایز، عوسمانی نانەوا، عەبدولڕەزاق سێگردکانی)و لە تەنیشتەوە نەک راستەوخۆ (ئیحسان نەجم- ئەبو شەهاب)و تێکۆشەرێکی بەغدا، بەناوی (سەلام برزو) دیاریکرا بوو، بەڵام دواخرا بۆ دوو سێ هەفتە. تا تەموومژی گرتنو پریشکەکانی لە بەغدا روون دەبێتەوە، ئیتر بانگ کردن یا نەکردنی (سەلام)، بۆ شەهید (ئازاد هەورامی) مایەوە. تا لەبەردەم رۆشنایی رووداوەکاندا بڕیاری لێبدات!".[2]

دەشڵێ، نەوشیروان بە هەڵبژاردنو بە شەرعیی نە سەرکردایەتی کۆمەڵەو نە سکرتێری کۆمەڵە بوو. ئەمیش راست نییە. لە نەورۆز لە کۆبونەوەی نۆکان، نەوشیروان یەکەمو بەندە دووەم دەنگم هێنا.

"شـەوی (١١/١٠-١١-١٩٧٨) رژێـم بە هەماهەنگی لـەگەڵ رژێمی شـا لـە ئێران گەورەترینو پڕچەکترین پـەلامـاری بۆ سـەر بارەگاکانی سەرکردایەتی لە شێنێو ناوزەنگو دەوروبەری دەست پێکرد کە لە سەعات (١,٥)ی ئەو شەوە دەستی پێکردو تا ١١/١٩ی درێژەی کێشاو بەرەنجامەکەی رژێم تیای شکستی خوارد. ئەم هێرشەی رژێم هاوکات بوو لەگەڵ رۆژانی کۆتاییهاتنی کۆبونەوەی فراوانی دووەمی کادیرانی کۆمەڵە

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٣٢).

٢ فەرەیدون عەبدولقادر. هەڵو سوورەکانی قەندیل. دەزگای چاپو پەخشی سەردەم. چاپی یەکەم. سلێمانی-زستانی ٢٠١٧. ل(٢٢٣-٢٢٤).

که له گوندی شێنێ ئەنجام درا. لەم کۆبونەوەیەدا جارێکی تر سەرکردایەتی کۆمەڵە هەڵبژێردرا کە ئەمانە بوون:

١- نەوشیروان مستەفا    سکرتێری کۆمەڵە
٢- مەلا بەختیار
٣- سالار عەزیز
٤- ئازاد هەورامی
٥- ئاوات قارەمان
٦- ملازم عومەر عەبدوڵلا
٧- بەکر حاجی سەفەر
٨- شێخ عەلی
٩- سەید کەریم
١٠- فازیل کەریم (مامۆستا جەعفەر)
١١- مستەفا چاو رەش
١٢- دلێر سەید مەجید
١٣- ئیبراهیم جەلال".[١]

لە کۆبونەوەی شێنێدا، من تازە لە هەورامان-شارەزوور گەڕابومەوە. دۆڵی جافایەتیشمان لە خۆفرۆشان پاک کردبوەوە. لەلایەن هەموانەوە رێزم دەگیرا. کەچی مەخابن مام جەلال دەنوسێ:

"نەوشیروان هەوڵی دا ئازاد هەورامیو مەلا بەختیارو چەند برادەرێکی تر لەوان دەرچن، دەنا دەرنەئەچون".[٢]

ئەم قسانەی مام جەلال، هی دوای جیابونەوەی "ئاڵای شۆڕش"ن لە یەکێتی، لە چەندین شوێنی دیکەدا بە کاردانەوە باسی هاوڕێیانی ئاڵای شۆڕشی کردووە. بەدڵنیاییەوە، ئەو بۆچونانە، لەو زەمانو زەمینەیەدا، لەکاتی خۆیدا، رونکردنەوەی لەسەر دەدەین. لێرەدا هێندە دەڵێین: هەر مام جەلالیش، لە سێهەمین کۆنگرەدا وتی: کە کارەساتی هەکاری رویدا، منو نەوشیروانو (١٥-٢٠) کەسێک مابوینەوە لەقەندیل. مەلا بەختیار، لە هەورامانەوە تا هەولێر شۆڕشی هەڵسانەوە. ئەم قسەیە هی ئەوکاتەیە مام ئارام

١ شاخەوان عەباس. سەفەری کوردایەتی بیرەوەریەکانی شارو شاخ ١٩٧٤-١٩٨٠. چاپی دووەم. ٢٠١٢. ئەکادیمیای هۆشیاریو پێگەیاندنی کادران. ل(١٧٤).

٢ مام جەلال. دیداری تەمەن- لە لاوێتیەوە بۆ کۆشکی کۆماری. ئامادەکردنی: سەلاح رەشید. ل(١١١).

بووه. ئەوی تر هی توڕەبونە! کێشەیەکی گەورەی ڕوداوەکانی مێژوو، لە زمانی مام جەلالو کەسانی سەرکردایەتی، ئەوەیە لەکاتی توڕەبونیشدا، قسەکانیان بکرێتە بەشێکی ڕاستیەکانی مێژوو. ڕاستیەکەی ڕوداوە مێژووییەکان، بە ئارامیو بەبەڵگەو بە شایەت دەنوسرێن.. نەک بە توڕەبوون. یان کاردانەوە!

نەوشیروان خۆی شتی وای نەنوسیووە. تەنها نوسیویەتی "من هەوڵم دا سالار عەزیز دەربچێ". باشترین بەڵگە کە مام بە توڕەبون ئەو بۆچونانەی دەربڕیوە. ئەنجامی هەر سێ کۆنفرانسەکانی کۆمەڵەو دوو کۆنگرەی یەکێتییە. لە هەر سێ کۆنفرانسەکەدا، یەک لەدوای یەک نەوشیروانو تەکەتولی زیندان هەوڵیان دا من بۆ سەرکردایەتی دەرنەچم. هەر دەرچوم. لە کۆنگرەکانی دوو-سێی یەکێتیشدا، هەوڵێکی زۆر درا دەرنەچم.. دیسان دەرچووم. نەوشیروان مستەفا، لە دووەمینو سێهەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەدا، خۆی بە وەفدی شارەکانو کەرتو ڕێکخراوەکانی وتبوو: "پێمخۆش نییە مەلا بەختیار دەربچێ". لەکۆنفرانسی یەکدا، گوتبوی: "سالار عەزیزو مامۆستا جەعفەر دەربچن، کوردستان جێدێڵم". ئەو ڕەوشەی حیزبایەتی، پەیوەندی بە ڕقەوە هەیە. نەک تێکۆشانو شایستەیی بۆ دەرچونو دەرنەچون. مام جەلالیش ئەو ڕاستییانە هەمووی باش دەزانێ.

لە خاڵی شەشەمدا دەنوسێ: "نەوشیروان مستەفا وەکو سکرتێری کۆمەڵەو جێگری سکرتێری گشتی یەکێتی کار بکات".

ئەم قسەیەش لەئارادا نەبووە. لەڕاستیدا، لە مێژووی کۆمەڵەدا هەتا بەستنی یەکەمین کۆنفرانس، شیهابو ئارامو نەوشیروان پۆستی سکرتێریان نەبووە. بەڵام وەکو سکرتێر ڕێزیان دەگیراو بەقسەیان دەکرا!!

## ( ٤ )
## ماویزمو ناوگۆڕین

لە کۆبونەوەکەدا، پەرۆشیی گیانی هاوڕێیەتی زاڵبوو. گرفتێکی ئەوتۆی مەترسیدار لەڕێی کۆبونەوەکەو سەرخستنیشی نەبوو. هەمومان، بەشانازیی بەخۆکردنەوە لە دەربازبون لە کارەساتی هەکاریو تۆکمەیی ڕیزەکانی شۆڕشو کۆمەڵە، بە خەمی دواڕۆژی سەرکەوتن، لە کۆبونەوەکەدا بوین. تەنانەت لەسەر کێشە ئایدیۆلۆژیەکانیش،

ناکۆکی لەنێوانماندا نەبوو، چونکە داکۆکی لە پاراستنی هەڵەکانی کۆمەڵە نەبوو. کەمترین باسی تیۆریش هێنرانە ئاراو پەسەندکران.

لەوباوەڕەدام بەم رۆحیەتەوە، دوور لە گیانی رقو تۆڵەسەندنەوە، گرفتی بچوک گەورە نەکرابا، رقی سایکۆلۆژی جێگەی بە گیانی هاوڕێیەتی لێژ نەکردبا، لە یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەشدا، سیاسەتی پاکتاوکردن نەگیرایەتەبەر، وردە کێشەکان چارەسەر کرابان، نەوشیروان، خۆی نەکردبایەتە بەشێکی کێشەکانو لایەنگری لایەک دژی لایەکی تر نەبوایە، رەنگبوو، یەکەمین کۆنفرانس بکرایەتە دەستەبەری پتەوکردنی گیانی هاوڕێیەتیو لەناو کۆنفرانسەکانی تریشدا، رەنگی هاودەنگیی رشتبا. بەڵام، کاتێک فەلسەفەی هاوبەش نەکرێتە بنەمای پێکەوە تێکۆشانی حیزبایەتی، بە نیەت پاکی کۆبونەوەیەکو دوان، کێشە فکریو فەلسەفیەکان، تا سەر خەفە ناکرێن!

بەرنامەی کۆبونەوەکە، چەشناوچەشن بوو. دوا بڕیاردان لەسەر ماویزم، تا ناوگۆڕینی کۆمەڵە، پەیوەندی یەکێتیو کۆمەڵە، گەشەپێدانی راگەیاندنو دەرچواندنی ئۆرگان بۆ کۆمەڵە..تاد.

ئەم جومگە ئایدیۆلۆژیو رێکخراوەییانە، باسکردنیان لەناو دووەمین کۆبونەوەی فراوانی کۆمەڵەدا، ئەگەر پەرۆشیی کۆمەڵەو گیانی لەخۆبوردنی هاوڕێیانە زاڵنەبونایە، بابەتەکان بایی ئەوە بوون کە هزری جیاواز سەرهەڵبدەنو گرفتی گەورەشیان لێبکەوێتەوە. بەڵام ئیدارەی کۆبونەوەکە باش درا، هەلومەرجی بابەتیی دوای کارەساتی هەکاریش، بۆچونی هاوڕێیانی نزیکخستبوەوە. مەترسی ناکۆکی بزوتنەوەو یەکێتیو کۆمەڵەش، کەوتبووە ئاراوە.

لەسەر لابردنی ئەندێشەی "سەرۆک ماوتسیتۆنگ" با پێشەکی بگەڕێینەوە بۆ ئەو هەڵە ئایدیۆلۆژییەی لە دامەزراندنی کۆمەڵەوە، چۆن ئەم ئەندێشەیە، کرایە رێباز.

چین ساڵی ١٩٧٠، لەسەر ئاستی جیهان، بە پروپاگەندەو ئەدەبیاتو پەرستنی "سەرۆک ماو!" هەژمونێکی بەسەر چەپە چەکدارەکانی دونیادا پەیداکردبوو. لەسەر بزاڤی خوێندکارانیش کاریگەریان ١٩٦٨ لە فەرەنساو ئۆروپا، هەبوو. بەتایبەتی، چگوارا شەهید کرابوو، ڤێتنامو لاوس دژی ئەمریکا لە شۆڕشدا بون. فەلەستینیەکان، جۆرەها سەرکردەو بەرەی چەپگەرایان دەرکەوتبوون. چینیش، لەسەر ئاستی دونیادا بەناوی دژایەتی ریڤیژنیزمو بیرکراسیەت لە وڵاتی سۆسیالیستیدا، پروپاگەندەیەکی فراوانی دەکرد.

لەسەردەمی جەلالیەتەوە، رەوتی ماویزم لەژێر کاریگەری "سازمان انقلابی" حیزبی تودەی ئێران، لە بەکرەجۆ، سالانی (١٩٦٨-١٩٧٠) رەوتێک بە ئاراستەی ماویزم چالاک بوون. خەسلەتی ئایدیۆلۆژیەت وایە، کاتێک وەریدەگری، دوای ماوەیەک، وەکو سەلەفیەکانت لێدەکات. بیری ترو رەخنەی تر بایەخی نامێنێ. ئەوەی ئۆلیڤەر روا پێیدەڵێ: کوێرەوەری پیرۆز. واتا: هزرو ئایدیۆلۆژیەت، بەبێ ئاستی روناکبیری بەرز، کە دەپیرۆزێندرێ و راتدەکیشێ بۆ کوێرەوەریەکی داخراو!

دامەزرێنەرانی کۆمەڵە (بە مام جەلالیشەوە) ئەوکاتە باوەڕی رەهایان بە ماویزم‌و پاشکۆیەتی چین دژی شورەوی‌و ریڤیژنیزم هەبووە. زۆر بیری لێدەکەمەوە کە، گۆڕینی ئایدیۆلۆژیەتی مام جەلال، لە پەیڕەوکردنی بیری شورەویەوە، لە پەنجاکان‌و شەستەکان، بۆ ماویزم، هۆکارە نەزانراوەکانی چین، بۆم ساغ نەبۆتەوە. تەنها هۆیەک کە دێتە بیرم، ئەوەیە شورەوی لەسەردەمی جەلالی‌و بەیانی ئازاردا ١٩٧٠، پشتیوانی پارتی-بارزانی دەکرد. ئاوڕیان لە جەلالی-مەکتەبی سیاسی نەدایەوە. ئەمەش رەنگە لەژێر کاریگەری حیزبی شیوعیدا بوبێ. ئەگینا هۆکاری ئایدیۆلۆژی بەتەنها، بۆ گۆڕینی ئاراستەکە لە دۆستایەتی شورەویەوە بۆ جیفاریزم‌و ماویزم، لەناوەڕاستی شەستەکانەوە، نازانم!! کە یەکێتیش دامەزرا، مام جەلال خۆی بە کۆمەڵەش دەزانی، کەچی پەیوەندی بە شورەوی بۆ هاوکاری کردبوو. بریماکۆف مام جەلالی لە بەیروت دیبوو، گفتیشی دابویە هاوکاری یەکێتی بکەن، بەو مەرجەی نهێنیەکەی بپارێزرێ! عادل موراد بۆ پەیوەندیەکەش راسپێردراوە.

مونزر نەقشبەندی (ئەندامی دەستەی دامەزرێنەر-دەستچێنی موخابەرات) لە رێگەی عادل مورادەوە زانیبوی. موخابەراتی عێراقی ئاگادار کردبوو. عێراق گلەییان لە شورەوی لەسەر ئەو پەیوەندییە کردبوو، ئیتر شورەوی، پەیوەندیەکەی پساندبوو!! ئەمە لەکاتێکدا، چین‌و ماویزم، ئەوکاتە تەنها بە پروپاگەندە هەژمونی ئایدیۆلۆژییان هەبوو، ئەگینا لەناو چیندا، دوچاری قەیرانی ئابوری‌و دژایەتی یەکترو قەڵاچۆکردنی دەیان ملیۆن کەس بەناوی ئابوری سۆسیالیستی بوبوون. بەڵام دامەزرێنەرانی کۆمەڵە، لەو زەمان‌و زەمینەیەدا، بەتایبەتی دوای تێکشکانی باڵی جەلالی، خوێندنەوەی هەمەلایەنەیان بۆ ئەو هاوکێشانە نەبوو. تەنها پاڵنەری ئایدیۆلۆژییان کردبووە بنەمای بیرکردنەوە، ئەویش لە دۆخی شکستی (سیاسی-سایکۆلۆژی) دوای بەیاننامەی ١١/ی ئازار.

له دامەزراندنی کۆمەڵەدا، گەرچی نەوشیروان مستەفا، نەکرابووە دامەزرێنەر، ئاماژە سیاسی‌و فکریەکان پێماندەڵێن؛ نەوشیروان‌و شیهابی شێخ نوری ناتەبا بون. باشترین بەڵگەش ئەوەیە، هەردووکیان لەکاتی دامەزراندنەکەدا یەکیان نەبینیووە. پێناچی "مام جەلال"یش هەوڵی ناوبژیکردنی راستەقینەی لەنێوانیاندا دابێ. چونکە هیچ کەسێک لەوانەی یاداشتی ئەوکاتەیان نوسیووە، باسی یەکتربینینی نەوشیروان‌و شیهاب ناکەن. باسی ناوبژی مام جەلالیش نەکراوە!! لەگەڵ ئەوەشدا، نەوشیروان لەکاتی دامەزراندنی کۆمەڵەدا، وتویەتی: پێمخۆش نییە کۆمەڵە ماویزم بێ. ئەمە لەکاتێکدا، نەوشیروان گۆڤاری رزگاری، بۆ ئەندێشەی سەرۆک ماو تەرخانکردبوو! خۆیشی لە کتێبی (لەکەناری دابونەوە بۆ خڕی ناوزەنگ) باسی ئەمە دەکات. هەروەها کتێبی چەپکێک لەقسەکانی سەرۆک ماو، برایم ئەحمەدو نەوشیروان وەریانگێڕاوە. دیارە کۆمەڵە بەقسەیان نەکردووە. مام جەلال‌و شیهاب ماویزمیان چەسپاندووە. ماویزم رێبازی نەگۆڕدراوی کۆمەڵە بووە، هەتا دامەزراندنی کۆمیتەی هەرێمەکان.. بەکردەوە ئارام، ماویزمی لە رێبازی کۆمەڵە لابرد. لە تەواوی ئەو ئەدەبیاتەی کۆمیتەی هەرێمەکاندا، یەک جاریش ناوی "ماو" نەهاتووە. ئەم راستییە لە مێژووی کۆمەڵەدا، تا ئێستاش چەواشە دەکرێ.(*)

بەڵام بە بڕیاری رەسمی‌و، لە کۆبونەوەی فراوانی کۆمەڵەدا، بە سەرپەرشتی نەوشیروان، ماویزم لە سیاسەتی کۆمەڵەدا هەڵگیرا.

لەسەر کۆی ئەم گۆڕانکارییانە، پێشتر نوسەر پروپاگەندەی ئەوەی دەکرد، کۆمیتەی هەرێمەکان لە رێبازی ماویزمی کۆمەڵە لایانداوە. بەڵام لەترسی ئەوەی نەکا لە کۆبونەوەکەدا، دەنگ نەهێنێ. متەقی لەخۆی بڕیبوو!!

بۆ ناوگۆڕینیش، دوای ئەو کۆبونەوەیە، لە ئایاری ١٩٧٩ نەوشیروان مستەفا لەدەرەوەی وڵات بوو، سالار عەزیزو مەلا بەختیار سەرپەرشتی کۆبونەوەیەکی تری فراوانمان کردو ناوەکەمان گۆڕی بە (کۆمەڵەی رەنجدەران). بەیاننامەی ناوگۆڕینەکەش من نوسیم‌و مام جەلال کەمێک دەستکاری کرد.

---

* لە کۆبونەوەیەکی ناوەندی کۆمەڵەدا، نەوشیروان وتی: «کارێکی باشمان کرد لە کۆبونەوەی شێنی ماویزممان لابرد». منیش بۆم رونکردەوە کە شەهید ئارام یەکەمین سەرکردەیە ماویزمی لابرد. پێی ناخۆش بوو.

( ٥ )

## شەڕی شێنێ‌و (٥٤) کۆپتەر

شەڕی شێنێ، یەکێکە لە گرنگترین شەڕەکانی شۆڕشی نوێ، هەتا شەڕی بێتواتە کرا. شەڕی بێتواتە، کاریگەرتر بوو لە شەڕی شێنێ.

هێشتا لە کۆبونەوەی فراوانی شێنێدا بوین، دوارۆژی کۆبونەوەکە بە هەواڵی هێرشی سوپای عێراق، شڵەژاین. سەرکردایەتی هەڵبژێردراوی کۆبونەوەکە، بە عەسکەری‌و سیاسیەوە، گوندی (شێنێ)یان جێهێشت. لەوانە: نەوشیروان، ملازم عومەر، سالار عەزیز، ئەبو شیهاب، مامۆستا جەعفەر، ملازم سەید کەریم‌و برایم جەلال.. تەنها من لە گوندەکەدا مامەوە. هەمووی پشتی بەو نەخشەیە بەستبوو کە هەرێمی پارێزگاری‌و حاجی برایم، دایاننابوو بۆ پاراستنی: قوتەی مامەندە، جاسوسان، دەوروبەری گوندی شێنێ. من جێمام بەبێ ئەوەی پێمبوترێ ئەرکم چییەو چی بکەم! لەناو هێزەکەدا.

گەیشتینە نیوەشەو، قوتەی مامەندە گیرا. کە فەرماندەیەک بەناوی (سەعیدی دارایی)و هێزێکی بچوکی (٢٠-٢٥) کەسی لێدەبێ، بەرگەی هێرشەکەو سەرمای مامەندە ناگرن، بەبێ ئەوەی یەک کەسیشیان لێ شەهید یان بریندار بکرێ، مامەندە چۆڵ دەکەن. لەم جۆرە شەڕانەدا کە هێزی دوژمن زۆر دەبێ‌و پێشمەرگە دەکەوێتە شەڕی ڕووبەڕووبونەوە، پێشمەرگە کە بێ‌زیان دەبێ‌و شوێنەکەشی زوو دەگیرێ، مانای ئەوەیە بەرگری کەم کراوەو زوو سەنگەر چۆڵکراوە.[*] بەیانیەکەی، سروشت بوو بە گەورەترین پشتیوانمان‌و لەناوەختدا بەفر، شەو و ڕۆژەکەش، تێی کرد. سەرمایەکی کەسیرەش هەڵیکرد. بەڵام سوپای عێراق، بەردەوام هێرشی لە سونێ‌و پشتی ڕەزانەوە، ئاخورە، زینوێ، کیوژان، باسکی سەر لێرەوار، دەکرد. تۆپبارانێکی خەست. پۆلە کۆپتەریش پەیتا پەیتا لەسەری جاسوسان، دەووربەری بێدەلان، سەری گوڕە شێر، هەڵدەنیشتن‌و سەربازیان هەڵدەڕشتن.

نوسەری کتێبی (چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە) لە لاپەڕە (٢٣٧)دا دەنوسێ:

"کۆپتەرەکانی ڕژێم کە پتر لە ٥٤ کۆپتەر بوون، بە نۆرەی شەش شەشی ئەو ڕۆژە

---

* هاوینی ١٩٨٠ دیسان قوتەی مامەندە گیرا، بە فەرماندەیی بەندەو ملازم عومەر (٧) شەهیدو زیاتر لە (١٥) بریندارمان دا، ئینجا مامەندە ئازاد کرایەوە. بەفرو بارانیش ئەمجارە نەباری.

تا ئێوارە تەقەیان لە ناوچەکە و لە پێشمەرگەکان کرد".[1]

ئەمە شایەتی یەکەمە.. (٥٤) کۆپتەر دەخەملێنێ. ناهەقیشی نییە ئاسمانی ناوچەکە کۆپتەر وەکو قەلەڕەشکە فڕکان فڕکانیان بوو.

شایەتی دووەم؛ کە نەوشیروان مستەفایە، جوانتر دیمەنەکانی شەڕی شێنێ باسکردووە، غەدریشی کردووە، بەڵام کە دێتە سەر کۆپتەرەکان، دەنوسێ:

"ڕۆژی دوەم دیسان، زیاتر لە ٥٠ هالیکۆپتەر کەوتەوە فڕینو تەقە. لە قوڵی شێنێ هێرش دەستی پێ کردەوەو، هالیکۆپتەر هێزی لە جاسوسان دابەزاند. هێزەکەی جاسوسان خۆیان پێ نەگیرا بە هالیکۆپتەر هەڵگیرانەوە. هێزەکەی شێنێ شکێنرا".[2] (+)

شەڕەکە (٧) ڕۆژی خایاند. هەر (٧) ڕۆژەکە، من شێنێم چۆڵ نەکرد. سێ جاریش لەگەڵ هێرشەکاندا توشی شەڕ بوین. بەردەوام، سەرم لە هەموو سەنگەرەکان دەدا. هێزی باڵەکایەتی لەم شەڕەدا نمونەی قارەمانێتییان نواند. هەر لەم شەڕەدا "زیرۆ عەبدوڵلا" ئامر هەرێمی باڵەک نەیتوانی ئەرکی خۆی ڕاپەڕێنێ، لێخرا. لە ڕۆژانی شەڕەکەدا، یەک بەرپرسی عەسکەریو سیاسی کۆمەڵەو بزوتنەوەم نەبینی، سەردانی شەڕگەکە بکەن.

"دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە مەلا بەختیار وەک سەرکردەیەک سەرپەرشتی شەڕەکەی دەکردو دژە هێرشی پێشمەرگە دەستیپێکرد. سەر لێرەوارو زینویو گیوژان، بەفەرماندەیی مەلا بەختیار پاک کرایەوە".[3]

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٣٧).

٢ نەوشیروان مستەفا ئەمین. لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ. ل(٣٦١).

+ هەردوو شایەت، لە (٥٠) کۆپتەر کەمتر لە شەڕەکەدا باس ناکەن. کەچی لە شەڕی (١٩٧٨/٢/٢٨) دوای شەهیدبونی ئارام، لەنێوان میریاسیو ئاوایی حەمەی کەرەمدا.. لە سەرانسەری ناوچەی قەراغدا، (٢٢) کۆپتەری جەنگیو باریمان بۆ هات. کە سامان گەرمیانیو ئازادی سەگرمەو ئاوات قارەمانی دەڵێن (٢٦) کۆپتەریش بووە، هەڵسوڕاوەکانی گۆڕان، لە فەیسبوکدا، بە بڕیاری گۆڕان، ئێستاش نەیانبڕیوەتەوە، بەوەی گوایە ژمارەیەکی زۆرمان کۆپتەر وتووە. ئەمە لەکاتێکدا ئەوکاتە ئەگەر مەفرەزەیەک یەک کۆپتەریشی بۆ فڕیبا، لەبەرئەوەی چەکەکان سوک بون، مەترسیدار بووە. ئەو کەسانەی ئەو ڕەخنانە بە مەرام دەگرن، نازانن کەوا هەتا شەڕی ئێران-عێراق، حکومەت نەخشەی گەمارۆدانو لەناوبردنی دژی پێشمەرگە نەگرتەبەر. لە هەر شوێنێک حکومەت بە مەفرەزەیەکی زانیبا، بە پیادەو کۆپتەری زۆریش هێرشی دەکردو، سەربازی لە شوێنە سەختەکاندا هەڵدەڕشت. لەئاسمانیشەوە دەسترێژی لێدەکردن هەتا کەسیان دەربازیان نەبێ. چەندین مەفرەزە ئاوا شەهید بوون. لە پیلانی داگیرکەراندا، بەم نەخشەیە دەوترێ: گەمارۆو لەناوبردن (تطويق والأبادة).

٣ لەیادی ١٩ ساڵەی داستانی شێنێ دا، محەمەد سور شێنەیی. ڕۆژنامەی ئاڵای ئازادی. ژمارە (٢٥٦). ١٩٩٧/١١/١٧.

دوا شەوی شەڕەکە واتا (١٦/١٧)ی١٩٧٨/١٠، فەرماندەی سەربازی ئەرتەشی ئێران لە گوندی داوداوا دەبێ. بە موختارەکەدا هەواڵ بۆ مام جەلال دەنێرێ، دەڵێ: لەگەڵ عێراقدا تەنها بۆ حەوت ڕۆژ ڕێکەوتوین، تەنها سبەینێ خۆتان بگرن، هەردوو سوپاکە دەکشێینەوە. مام جەلال بە نامەیەک هەواڵەکەی پێ ڕاگەیاندم. بەلام کێشەمان ئەوە بوو، پێشمەرگە فیشەکیان نەمابوو. مام دلێری سەید مەجیدی ڕاسپاردبوو، نیوەی فیشەکی پێشمەرگەکانی خڕی ناوزەنگ کۆبکاتەوەو بۆمان بنێرێ. تێکڕا نەدەگەیشتە هەزار فیشەک، گەیشتە دەستمان. دوا ڕۆژی هێرشەکە بۆ سەر شێنێ سەخت بوو. بە تاکتیک، بڕیارمان دا لە زنجیرەی ڕەزاندا پێشمەرگە پاشەکشە بکات، بۆ باکوری شێنێ. سوپا هاتە سەر مەخفەری شێنێو تەقاندیەوە. نەگەیشتە ناو گوند. دوای ئەوە تۆپبارانی خەستی کردین(*)و بۆ عەسرەکەی.. بەرەی شەڕ ئارام بوو!

نەک وەکو نوسەر، بەڵکو وەکو فەرماندەیەکی سیاسیو عەسکەری قسان دەکات. لەکاتێکدا لەو ڕۆژانەی شەڕدا، بۆ چا خواردنێکیش سەردانی دێکەی نەکرد. هەروا، هیچ سەرکردەیەکی تر، سەری شەڕگەکەیان نەدا. کەچی هەندێکیان، یادەوەری خۆیان نوسیووە، دورونزیک باسی ڕاستەقینەی شەڕەکەو بونی ئێمەیان لەو ڕوداوە چارەنوسسازەدا نەکردووە. ڕق تا ئەوڕادەیە! بڕوانن لە لاپەڕە (٢٣٨)دا چی دەنوسێ:

"ڕۆژی ١٩٧٨/١١/١٧ تینێکی زۆرمان بۆ هات، بیر لەوە کرایەوە، کە ئێزگەکەو بەڵگەنامەکانو هەندێ کەلوپەلی پێویست کۆبکەینەوەو ئامادەی ڕەوانەکردنیان بکەین، بۆ دیوی "مالیمۆسو پشتی هەڵشۆ"و خۆمان لەگەڵ پێشمەرگەکان بە سەڵتی، تا بکرێ بەرگری بکەین. دیسان لەو ڕوژەدا لە عەسردا بەفرێکی زۆر دایکردەوە و ئیتر هەورو بەفروسەرما، ڕێگەی لە جوولەی کۆپتەرو سوپا گرت. ڕۆژی ١٩٧٨/١١/١٨ ئەو فەیلەقە سوپایەی کە "وەلید مەحمود سیرەت" قیادەی دەکرد. بە شکاوی گەڕانەوە قەلادزەو ڕانیەو پایەگاکانی خۆیان. پاش شەڕێکی (٩)ڕۆژی، لەو شەڕدا تەنیا یەک پێشمەرگە بریندار بوو، بەلام پتر لە(٥٠)سەرباز بە چەکەکانیانەوە لە بەفردا بەجێمانو ڕەقبوونەوە یا کوژران".[1]

---

* لەناو دێ، چەندین جوتیار بریندار بون. ئاژەڵێکی زۆریش بەرکەوتن. لەکاتی کشانەوەدا، لەپشتی گوندی شێنێدا، تۆپ بەر کۆتایی مەفرەزەکەمان کەوت. محەمەد کەریم کەشخە، لەناو تەپوتۆزی تۆپەکە، دیارنەما. وامزانی شەهید بووە. هاتمە لای. سەلامەت بوو. محەمەد ئێستا نوێنەری یەکێتییە لە نەمسا.

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٣٨).

جارێ، هەتا ئەوکاتە ئێزگەمان دانەمەزراندبوو. ئێزگە لە (١٩٧٩/٣/٢١)دا دامەزراو دەست کرایە پەخش.

پاشان.. بڕیار درا، بە دیوی (هێرۆ-هەڵشۆ)دا شارەزا پەیدا بکرێ، مام جەلال‌و مەکتەبی سیاسی دەرباز بکرێن. بەڵگەنامەکانیش سوتێنران. مالیمۆس هەر باسنەکراوە. مالیمۆس لەناو ئێران بوو. ئەرتەشی ئێرانیش ناوچەکەی گرتبوو!! سەبارەت بەوەش کە دەڵێ: بە سەڵتیی تا بکرێ بەرگری بکەین.. ئەم توخنی شەڕ نەدەکەوت. ئەشیویست بە بیانووی بردنی بەڵگەکان‌و شارەزایی خۆی‌و هاواری برایەوە، خۆی دەرباز بکات.

ئەوەش وا نییە کە پتر لە (٥٠) سەرباز بە چەکەکانیانەوە لە بەفردا جێمابن.

لە بەهاردا، قادر خەبات‌و حەسەن شێنێیی‌و مەفرەزەیەک چوبونە مامەندە. (١٠-١٢) سەربازی رەقهەڵهاتویان بینیبوو. تێکڕا یەک هاوەن‌و یەک ئاربیکەی‌و (٥) کلاشینکۆفیان دەستکەوتبوو.

## (٦)
## شێرکۆی شێخ عەلی‌و مەلا بەختیار

نوسەر، لەبەرئەوەی خۆی یادەوەریەکی شایەنی باسی نییە، بۆیە زۆربەی نوسینەکەی، گێڕانەوەی بەسەرهاتی تێکۆشەرانی ترە. ئاوهاش روداوەکان، یان کلک‌و گوێ دەکات، یاخود دەیئاوسێنێ!!

ئەوکاتە لە شێنێ دانرابوین، ئەرکمان بوو ئاگامان لە جموجوڵی حکومەت‌و روداوەکان‌و بەڕێوەبردنی دێکەش بێ. هەتا لەو گوندە بەئەمەکەدا بوم، مایەی شانازیمە، نە خۆم‌و نە مەفرەزەکەمان، یەک شێنێ نشینمان لێ زویر نەکرد. هێندەی پێشمان کرا، خزمەتمان دەکردن. تا لەوێ بوین، یەک سکالامان لێنەکرا. بەڵام نوسەر، هەفتە نەبوو لەسەر تورەبون‌و خۆهەڵکێشان‌و زویرکردنی خەڵکەکە، سکالایەکی لەسەر نەکرێ.

لەناو گوندەکەدا، پێشمەرگەکانی شەهید شێرکۆی شێخ عەلی تەقەیەکی زۆریان دەکرد. خەڵکەکە بێزار دەبوو. منیش ناردم کە بەڵکو تەقە لەناو گوندەکەدا نەکەن. پێشمەرگەیەکم نارد بەناوی شاخەوان، خەڵکی گوندی یەخی ماڵیی بوو. چاووم لێی بوو، لە پێشمەرگەکەیان دا. ئەرکم بوو برۆم‌و نەهێڵم لێی بدەن. لەسەر ئەمە بوو بە ناخۆشیی.

ئەوان میلیان هێنایەوە، نوسەرو هەردوو براکەی نەیانوێرا هەنگاوێک بێنەپێشەوە. هەواڵەکە گەیشتبووە مەکتەبی سیاسی. کاک نەوشیروان سەید کەریمو مەفرەزەیەکی ناردو پێشمەرگەکان روداوەکەیان بۆ گێرایەوە. ئەویش وتی: "بۆ نەتانکوشتن.. مادام ئاوا بوون". تەنانەت کە چوینە لای مام جەلالیش روداوەکەی بیستبوو، وتی: "بۆ قبوڵت کردووە لە پێشمەرگە بدەن؟ ئیجرائاتت بکردایە، چی دەبوو با ببێ". ئەم گرفتە هەر زوو کپ کرایەوە کۆتایی هات. کەچی نوسەر لە لاپەڕە (٢٤١)دا ئاوای هەڵدەبەستێ:

"لە مانگی شوباتی ١٩٧٩، ڕۆژێک شێرزادی برای شێرکۆ شێخ عەلی کە (پ،م) بوو، لەگەڵیا تەقەی لە باڵندەیەک کرد. لای بارەگاکەی خۆیان، مەلا بەختیار لە بارەگاکەی خۆیەوە، دوو پێشمەرگەی نارد، بزانن کێ تەقەی کردووە؟ بیگرنو بەچەککراوی بیبەنە لای مەلا بەختیار. پێشمەرگەکان پاش تاقیبو گەڕانەوە، پێیان وتبوو: لە مەقەڕی بزووتنەوەوە کراوە، مەلا بەختیار بە تووڕەبوونو هەڕەشەو گووڕەشەوە، پێشمەرگەکانی لای خۆی کۆکردەوەو بەرەو بارەگای شێرکۆ ڕۆیشتو بە هاوارو هەڕەشە داوای تەسلیمکردنو چەککردنی شێرزادی کرد. ئەم کارە بووە، هۆی لێک دامەزراندنی هەردوولا، پاشان ئێمەو هەندێ لە خەڵکی شێنێ کەوتینە بەینەوەو نەمانهێشت تەشەنە بکا".[1]

ئەمە بەڵگەیە بۆ دڕدۆنگی دەرونی نوسەر، کە هەموو ڕاستیەک دەشێوێنێ. لەهەمان لاپەڕەدا، دەشنوسێ:

"لەڕاستیدا مەلا بەختیار تازە سەرکردەیەکی گەنج بوو، لە هەر شوێنێک بوایە، خۆی بە مەسئولی ئەو ناوە دەزانی، و پێی وابوو، دەبێ خەڵکی کڕنوشی بۆ بەرن. ئەم ڕووداوە ئەوەندەی تر، کاری کردە سەر بزووتنەوە، بەتایبەتی، کە پاش شکاتی ئەوان لای مام جەلال و کۆمەڵە، هیچ کاردانەوەیەک بەرامبەر مەلا بەختیار نەکرا".[2]

ڕاستە من تەمەنم ئەوکاتە (٢٦) ساڵ بوو. خۆ مام جەلالیش کە یەکەمین جار کراوەتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی، تەمەنی (٢٨) ساڵ تێنەپەڕیبوو. چگوارا لە هەمان تەمەندا، بوو بە ڕەمز. زۆربەی سەرکردەکانی کوردستان هەر لەو تەمەنەدا، ناویان دەرکردووە. وەکو تر: دەی نوسەر تەمەنی ئەوکاتە (٣٤) ساڵ بوو، بۆچی یەکێتی هیچ پلەیەکی عەسکەرییان پێنەدا. خۆ لە پەنجاکانیشەوە لە پارتی بووە. ئەی بۆ کە کرایە بەرپرسی لقی کەرکوک،

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٤١).
٢ سەرچاوەی پێشوو.

به سزادراویی لابرا. هەمووی لەبەرئەوە بوو هەرگیز خۆی لە قەرەی شەڕ نەدەدا. هەمیشەش گرێکوێرەی ئەم ترسنۆکییەی بە ئاژاوەی ناو کۆمەڵە قەرەبوو دەکردەوە.

ئەوەی نوسەر باسی دەکات، شەهید شێرکۆی هەر تیا نەبوو. تا ئەوکاتەی گرفتەکەش هێمن کرایەوە، شێرکۆ نەهاتبووە شێنێ. ئیتر بۆچی کێشەکە لەنێوان منو ئەو شەهیدەدا بێ. ئەگەر هەڵەیەکی بچوکیش لەبەرامبەر تەقەی پێشمەرگەکانی شێرکۆ کرابێ، من کردومە. نە تەقەکردنەکەو نە کاردانەوەکەش، پەیوەندی بە شێرکۆوە نەبوو. نەک ئەمە، من لە زنجیرە چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنی (NRT)دا، کە پرسیاری شەڕی سێوکانیان لێکردم تیایدا جەمالی عەلی باپیرو شێرکو شەهید بوون، هێشتا من نەگەیشتبوومە بارەگای شێرکۆ، و گوتم: تاقە شەڕ لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا، کە بە بڕیاری مەکتەبی سیاسیش ئەنجامدراوە، ئەو شەڕەیە کە پەشیمان بومەتەوە. ئێستاش دەڵێم: پەشیمانم لەو شەڕە. دەشتوانم بڵێم: لەدوای ئەو هەموو کێشانەی یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵە، نەدەبوو رازی بم بە سەرپەرشتیکردنی ئەو شەڕە. گەرچی، نامەی شێرکۆو ملازم تایەر گیرابوو، دەیانویست، هێرش بکەنە سەر سەرکردایەتی، ئەوان لەپشتەوەو لەپێشەوەش، لە بێدەلانەوە هەڵبکوتنە سەرمان، لەگەڵ پارتی!

## (٧)

## راپەڕینی ئێرانو نوسەر!

دوای سەرکەوتنی شەڕی شێنێ، روداوی گەلێ چارەنوسساز لەئێراندا رویدا. خۆپیشاندانەکان لە سەرکەوتن نزیک دەکەوتنەوە. ئەمەش بۆ باشوری کوردستانو بەتایبەتی یەکێتی، وەرچەرخانی سیاسی بوو. روداوەکە زۆر گەورە بوو. بەلام لە سەرکردایەتی یەکێتیدا، تەنانەت مام جەلالیش، بەرچاومان روون نەبوو، ئاکامی راپەڕینی گەلانی ئێران دەگاتە کوێ؟! نەشماندەزانی رۆژهەلاتی کوردستان چارەنوسیان چی دەبێ؟!

- لەلایەکەوە، بزوتنەوەیەکی مەزهەبی گەورەو کاریگەر بە رابەرایەتی ئیمام خومەینی، لەراپەڕینەکەدا بالادەست بوو.

- لەلایەکی ترەوە، جەبهەی میللیو دیموکرات-لیبراڵەکان سەرکردەی دیارو ئەستێرەی رابەرانیان لە گەشییدا بوو.

- چەپەکان، بەتایبەتی چریکەکان،(*) سەرکردەکانیان هاتبونەوەو بزاڤێکی بەهێزیان هەبوو.

- شا هەڵدەهاتو سەڵتەنەت تەلەبەکان، هەرەسیان هێنابوو. سوپاو ژاندارملیو چریکەکان (جاشەکانی شا) تێکوپێک چووبون.

- موجاهیدینی خەلقی ئێرانو ناوبانگی مەسعود رەجەوییش، لە تاراندا، دەدرەوشایەوە.

- تەنها حیزبی تودە، گەرچی ناویان هەبوو. بەلام لاواز بوون.

- رۆژهەلاتی کوردستان، بەگشتی خەڵکەکە خرۆشابونە ناو راپەرینەکەو ناکۆکیەکی ئەوتۆ لەسەرەتاوە لەگەڵ رابەرایەتی خومەینیدا، دەرنەکەوتبوو.

- مامۆستا شێخ عیزەدین، ناوبانگی دەرکردبوو، رۆژانـە لە ئێزگەکانی لەندەن، مۆنتیکارلۆ، چاوپێکەوتنی لەگەڵ دەکرا.

- بیستمان بە بێدەلانداو لەرێگەی رەسول مامەندو بە حیمایەی ئەوانیش، د.قاسملوو سەرکردەکانی دیموکرات، گەراونەتەوە. ئەمەش نیشانەی ناکۆکی بوو لەگەڵ یەکێتیدا.

- کۆمەڵەی زەحمەتکێشان، جموجوڵیان بەناوی "شوراکان"ەوە هەبوو. د.جەعفەر و سەید برایمو پاشان مامۆستا برایمیش، گەرانەوە رۆژهەلاتو رەوشێکی چەپی بەهێز، لـەدەوری ئـەوانو گروپە چەپەکانی تر کۆبونەوە. مام جـەلال زۆری هاندان خۆیان رابگەیەننو کاتی خەباتی نهێنی نەماوە. کردیشیان.

راپەرینی گەلانی ئێران، سـەرەتـا، لای یەکێتی وا لێکدەدرایەوە کە بۆچونەکانی سەرەتای دامەزراندنی یەکێتی بۆ خەباتی ناوکۆیی گەلانو هێزە دیموکراتو چەپەکان، راستو دروست دەرچوو. هەر لەسەرەتای دەستپێکردنی شۆرشیشەوە، ئەم تێزانەی یەکێتی سەبارەت بە جۆشدانی خەباتی شۆرشگێرانەی هێزە پێشکەوتوەکانی ناوچەکەو عێراق، لەلایەن بزوتنەوەی سۆسیالیستیەوە، قووت نەدەچوو:

---

* چریکهای فیدایی خلق. ٨/ی شوباتی ١٩٧١ دامەزراوە. بەهێزترین رێکخراوی چەپی ئێرانو ناوچە بوو، هەتا دوای روخاندنی شا. بەلام دوای ئەوە، خوێندنەوەی هەڵەیان بۆ دۆخی ئێران هەبوو. سێ جیابونەوە رویدا لەناویاندا. مانگێک دوای روخانی شا، سەرکردەیەکیان بەناوی حەمادی شیبانی گیرا. کۆبونەوەیەکی فراوانیان لە گۆرەپانی زانکۆی تاران بۆ ئازادکردنی رێکخست. خۆم لەوێ بوم (٥٠٠) هەزار کەس ئامادە بوون. بەوپەری حەماسەوە، هاواریان دەکرد: حەمادی شیبانی ئازاد بایەد گەردەد. بەلام ناکۆکیو جیابونەوە، دایرزاندن. کە لێیان قەوما، لە ولاخلوو حەمادی شیبانیم بینی. هەمووی (١٠) کەسی لەگەڵدا نەبوو. چەپی رستەی بریقەدار، هەرگیز سەرناکەوون!

"کوردستانی داگیرو دابەشکراو لەنێوان چەندین دەوڵەتی ڕۆژهەڵاتدا ئەشێت بەهۆی پەرەسەندنی کوردایەتیی شۆڕشگێڕانەوە ببێتە هۆیەکی گرنگی بەیەکەوە گرێدانی خەباتی شۆڕشگێڕانەی گەلانی عەرەبو کوردو فارسو تورکو ئازەرو کڵپەسەندنی بڵێسەی ئاگری شۆڕشێکی دیموکراتی نوێ لە ڕۆهەڵاتدا".[1]

ئەمە ستراتیژو ئایدیۆلۆژیەتی یەکێتی بوو. بۆیە کە ڕاپەڕینی گەلانی ئێران هەڵایسا، مام جەلال بێڕادە دڵی خۆشبوو. هەموو هەوڵێکیشی دا کە لەگەڵ لایەنە چەپو شۆڕشگێڕەکاندا، سەنگەر تێکەڵاو بکات. هەر ڕێکخراوێک، چەپ، دیموکرات، ناسیۆنالیستی، هاتبان بۆ لای یەکێتی، هاوکاریی دەکردن.. نەک هەر بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان.. بەڵکو بۆ سەرانسەری ئێرانیش. بەڵام بەرە بەرە چەپ شکان. دیموکراتەکان پاشەکشەیان کرد. لە هەڵبژاردنی ئێراندا، هەم شیعەکان سەرکەوتنو هەم دەستوری گەلپەسەندی هەمیشەیی ئێران، کرایە ویلایەتی فەقیە. تەنانەت موجاهیدینی خەڵقیش، کە سەدان هەزار لایەنگریان هەبوو، بەرگەیان نەگرت.

لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا، داوای مافە دیموکراتیەکان پەرەی سەند. لەسەر چۆنیەتی بەدیهێنانی مافەکان، کۆمەڵە بە جۆرێکو دیموکرات بە جۆرێکی تر، بیریان لە چارەسەر دەکردەوە. مامۆستا شێخ عیزەدینیش هێڵی نافینی دەگرتەبەر.

کۆمەڵە، بنمیچی داخوازییەکانی بەرز رادەگرتو دیموکرات ریاڵیتر بوون.

"دانوستانەکان هێشتا دەستییان پێنەکردبوو. پێش گرتنی پادگانی مەهاباد، دکتۆر قاسملو یاداشتێکی بۆ خومەینی نوسی کە لەوێدا دەنوسێت (حەزرەتی ئیمام) تۆ تا ئێستا سەلماندوتە لەگەڵ سەرەڕۆییو دیکتاتۆری خەبات دەکەیتو ئازایانە لەگەڵ کێشەکان بەرەوڕوو دەبیتەوە، وەرە لەبەر حەقیقەتو مێژوو تۆ کە پێت دەڵێن بت شکێن ئەو بتەش کە پێیدەڵێن جیاخوازی بشکێنەو کێشەی کورد چارەسەر بکە. (شتێکی ئاوا بوو، ئێستا وشە بە وشە لەبیرم نییە) دڵنیابە کە قەت مێژوو ئەو خزمەتە گەورەیە لەبیر ناباتەوە. ئەوکات ئەوەمان کرد".[2]

سەرەنجام لەسەر (قطعنامەی -٨- مادەیی) ڕێکەوتن. بەڵام حکومەتی ئێران، «قطعنامە»کەی ڕەتکردەوە. ئاکام، شەڕ دەستپێکردەوە. بەڵام شەڕێکی نابەرامبەر بوو.

---

١ هەواڵنامەی کوردستانی عێراق. یەکەمین هەواڵنامەی شۆڕش. ئامادەکردنی: نەوزاد عەلی ئەحمەد. ئەکادیمیای هۆشیاریو پێگەیاندنی کادیران- سلێمانی-٢٠١١. ل(٢٤).

٢ عەبدوڵڵا حەسەن زادە-سکرتێری پێشووی حیزبی دیموکراتی کوردستان. ئەفشینی مدریسی- (لەڕۆژهەڵاتەوە ٤). ٢٠١٩. ل(٩٨).

سەدان هەزار پاسدار تارادەی خۆکوژیی هێرشیان کردە سەر رۆژهەلاتی کوردستان، دوای (٣ مانگ) کۆنترۆلیان کرد. لایەنە کوردستانیەکان، هانایان بۆ یەکێتی هێناو لەسەر ئەرزی واقیعو شەڕدا، لەم دونیایەدا، تەنها یەکێتی پشتیوانیی کردن. بەکردەوەو ئاشکرا، هیچ دەولەتێکو لایەکی تر بەهانایانەوە نەهاتن. تەنانەت موجاهیدینی خەلقو چریکو چەپەکان، لەکاتی هێرشکردنە سەر شارەکانی رۆژهەلات، خۆپیشاندانێکی گەورەشیان لە تاران ئەنجام نەدا. هەموو ئەو لایەنانەش کە لەخۆیان قەوما، هانایان بۆ کوردستان هێنایەوە!!

حکومەتی عێراق، لەگەڵ حیزبی دیموکرات، پەیوەندی دێرینەی هەبوو. هاوکاریشیی دەکردن. بەلام هاوکارییەکە تەنها لۆجستیو چەکی تاکتیکی بوو. ئەوەی عێراق دوای سالێک بۆ موجاهیدینی خەلقی ئێرانی کرد، لە چەکی قورسو راگەیاندنو لۆجستی، سەدان بەرامبەر هاوکاری دیموکرات بوو.

کۆمەلەی زەحمەتکێشانی شۆرشگێڕ، زۆر دوودڵ بوو لە پەیوەندی پێوەکردنی عێراق. لەگەڵ مام جەلال لە شێنێو لە بارەگای ئێمەدا کۆبونەوە. مام بۆی رونکردنەوە، ئەمەی خوارەوەم لەبیر ماوە:

خەسلەتی خەباتی چەکداریی وایە، لە کوردستاندا، کە ناچار دەبی دەبێ پەنا بۆ یەکێک لە حکومەتەکان بەریت. ئێستا هاوکاری لێوەربگرنو بەدوریشی دەزانم لەمکاتەی جەنگدا، مەرجتان بەسەردا بسەپێنێت.

عەبدوللای موهتەدیو سەید برایم، لە کۆبونەوەکە بون. هەروا مامۆستا شێخ عیزەدینو سەلاحەدین موهتەدیش، ئەمانیش رازی بونو جەختیشیان کردەوە کە هیچ مەرجێک کە سەربەخۆییمان پێشێل بکات، لەعێراقی قبوڵ ناکەین.

نوسەر، لەسەر بابەتی لاوەکی چەند لاپەڕەیەک دەنوسێ، بەلام تەنها لاپەڕەو نیوێکی لەسەر ئەم وەرچەرخانەی رۆژهەلات هەژێنە نوسیوە، ئەویش، تەنها بۆئەوەی تانەو تەشەر بگرێتە ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەر، کە تێکچونی دۆخی ئێرانیان بە هەل زانیو بەوپەڕی خۆشییەوە گەڕانەوە، لەبری تەقدیرکردنی گەڕانەوەکەیان، کەچی دەیانشکێنێ.

## (٨)
## هەڵگەڕانەوەی د. فوئادو هەڵهاتنی عادل موراد

لەو لاپەڕەو نیوە کاڵو کرچەی لەسەر وەرچەرخانی سیاسی ئێران، نیوەی تەرخان کردووە بۆ رقە دەرونیەکەی. ئەمجارەیان دژی دوو سەرکردەی دامەزرێنەری یەکێتی. لە لاپەڕە (٢٤٣)دا دەنوسێ:

"کە چوومە ژوورەوە پاش بەخێرهاتنیان، زۆرم لا سەیر بوو، کە د.فوئاد مەعصومم دی و مام جەلال هەمومانی بە یەکتر ناساند، من وتم: د.فوئاد دەناسم "د.فوئاد" لای سەیر بوو، کە دەیناسم پاشان بیرم هێنایەوە کە لەپاش ئازاری ١٩٧٠ من دوورخرامەوە بۆ بەسرە بە تۆمەتی گوایە "جەلالیم". ئەویش لە بەسرە لێپرسراوی ناوچەی مەلایی بوە بانگی کردم بۆ محاسەبە، وای دەزانی لە بەسراش دەستیان دەڕوا دەمەقاڵەیەکی باشمان بوو، سەیر بوو "د.فوئادێکی" مەلایی دژە جەلالی بە قودرەتی قادر، هەڵگەڕایەوە، بووە ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی، کە سکرتێرەکەی مام جەلال بوو".[١]

سەیری ئەم بێنەزاکەتییە بکەن! یەکەمین جار، د.فوئاد مەعسوم دەبینێ، لەبری پێشوازی گەرم، بیری خستۆتەوە کە (٩ ساڵ) پێشتر لە بەسرەدا، وەکو جەلالیەک لێپرسیوەتەوە. لەلایەک ئەمەیان بەڵگەی وشکو برینگی نوسەرە، لەلایەکی تریشەوە، نیشانەی ئەوەشە کە ناوبراو، چەند دڵڕەش بووەو هیچی بیر نەچۆتەوە، لە یەکەمین چرکەساتی بینینی پیاوێکی دڵفراوانی وەکو د.فوئاد، ناکۆکی رابوردوی داوەتە رووی.

ئینجا، سەیرتر لەوەش، دەنوسێ: "د.فوئادێکی" مەلایی دژە جەلالی بە قودرەتی قادر، هەڵگەڕایەوە، بووە ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی، کە سکرتێرەکەی مام جەلال بوو".

لەمەیاندا، بێنەزاکەتیی بێلەزەت کردووە. ئەوکاتە هاوارمان دەکرد کە یەکێتی جەلالی نییە، کەچی ئەم هەر لەو روانگەیەوە قەزاوەت دەکات. د.فوئاد مەلایی بووە، خۆ نەیشاردۆتەوە. بەڵام ئەندامی دەستەی دامەزرێنەرە. دەیتوانی بیبێتەوە بە (قیادەی موەقەتە-پارتی). کە نەبووە، لەبەر گۆڕانکاریەکانی دوای هەرەسی شۆڕش بۆتە یەکێتی، نەک لەبەر هەلپەرستی. لەبری ئەوەی گوتبای، زۆرم پێخۆشە دەستەی دامەزرێنەری‌و گەڕاویتەوە کوردستان.. هەمومان ئیتر لەسەر رێبازێکی ترین. کەچی نەیتوانیوە گینگڵە دەرونیەکەی پەنا بدات، رەق‌و تەق، رقەکەی هەڵڕشتووە.

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٤٣).

که دێته سەر باسی عادل موراد، نوسەر دەڵێ: "هەندێ بیروڕای خۆی دەربڕیوە سەبارەت بەو بارودۆخەی ئەوسای یەکێتی‌و ئێران‌و عێراق نەوشیروان زۆر بەتوندی بەرپەرچی دایەوە".[1]

ئەمەیان، لە سەرگوزشتەکەی د.فوئاد، زۆر زیاتر گەوهەری نوسەر دەردەخات‌و دەشهێنێ، شیبکەینەوە.

لەسەر گرفتی پێشمەرگەی ئێمەو شەهید شێرکۆ، وەکو کەتنێکی گەورە باسی دەکات. لەکاتێکدا خوێن لە لوتی پێشمەرگەیەک نەهات. کەچی کە دێتە سەر باسی سکرتێری کۆمەڵە، بەو روشکێنییە لەگەڵ ئەندامێکی دەستەی دامەزرێنەر دەدوێ، ئەمە بەشانازیشەوە دەیگێڕێتەوە. بۆچی؟ لەبەرئەوەی ئەم جۆرە رووشکێنییە، کوت‌ومت لەگەڵ دەرونە رقاویەکەی دەسازێ.

ئەندامێکی دەستەی دامەزرێنەر، تەنها ویستویەتی بۆچونی خۆی دەربڕێ، نە هێزی هەبووە. نە قسەی رەقی کردووە. بە کۆڵێ پەژارەوەو بە دڵخۆشی بۆ کۆبونەوەی سەرکردایەتی گەڕاوەتەوە، یەکەمین کۆبونەوەشە بەشداری تیادا دەکات، زمانی هەڵهێناوە، کەچی دەمکوت کراوە. دەبوایە نوسەر، بەخەفەتێکی قووڵەوە باسی روداوی ئاوها بکات. نەک بەشانازییەوە. لەوەش خراپتر، لەدرێژەی وتووێژەکەدا، باسی ئەمەش دەکات:

"شەو ویستی دوو بە دوو گلەیی لە نەوشیروان بکات، بەڵام نەوشیروان بە رەقی وەڵامی دایەوەو پێی وت (جەنابتان وا سێ ساڵە، لە سوریاو ئۆروپا رادەبوێرن‌و ئێستا کە هاتونەتەوە دەتانەوێ رای خۆتان بسەپێنن، فەرمون خۆتان‌و جانتاکانتان خواحافیزتان بێ)".[2]

ئەمەیان زۆر خراپتر. چەند جومگەیەکی مەترسیدار لەو باسەدا هەیە، کە ئەو رەوشە دەمکوتکردنە، ساڵەهای دوای ئەوەش درێژەی کێشا. تەنانەت بەرامبەر خودی نوسەریش.

جومگە مەترسیدارەکان ئەمانەن:

-جەنابتان سێ ساڵە لە سوریاو ئۆروپا رادەبوێرن.

-دەتانەوێ رای خۆتان بسەپێنن.

-فەرموون خۆتان‌و جانتاکانتان خواحافیزتان بێ.

---

١ سەرچاوەی پێشوو.

٢ سەرچاوەی پێشوو.

ئەم دیالۆگە زبرە، جگە لە سەپاندنی تاکڕەوایەتیو سەرکوێرکردنی سەربەستی رادەربڕین، چی تر دەگەیەنێ؟

نەوشیروان مستەفا، بەوشێوەیە لەگەڵ سەرکردەیەکو لەناو کۆبونەوەی سەرکردایەتیدا، وای قسە کردبێ، ئیتر بزانرێ بە نهێنیو بۆ سەپاندنی نەخشەکانی، چۆن پیلانی گێڕاوەو چۆنچۆنییش هەوڵی شکاندنو پەراوێزخستنی هەرکەسێکی داوە، کە بچوکترین گومانی لێی بوبێ.. هاوڕای نەبوبێ!!

بە سەرکردەیەک دەڵێ: چەند ساڵێکە لەدەرەوە رادەبوێرێ. بیری چۆتەوە خۆیشی زیاتر لە عادل موراد لەدەرەوە بووە. ئەو ساڵانەی لەدەرەوەش بووە، دووروونزیک توخنی کوردو کوردایەتیش نەکەوتووە. عادل موراد، لە شۆڕشی ئەیلولەوە، یەکسەر چۆتە سوریاو بەردەوامیش تێکۆشاوە.

بەئاسانیش پێی وتووە، جانتاکانتان هەڵگرنو بڕۆن. کەسێک، ئەو هەموو دەسەڵاتەی لەکوێ بوو، بتوانێ ئەندامێکی دەستەی دامەزرێنەری سەرکردایەتی لەناو شۆڕش دەربکات؟!(*)

## ( ٩ )
## ئێزگە و رابواردن

ئێزگەی گەلی کوردستان.. کە سەرەتا بە ئێزگەی شۆڕشی عێراقی هەڵگیرساو لە چیاکانی کوردستانەوە، کرایەوە. چیرۆکە راستەقینەکەی چۆنیەتی کڕینی، عادل موراد لەدەرەوەی ولات باسی کردووە. لە تورکیاوە، شەهید نەجمەدین-نەجۆ- گەیاندیە دۆڵی گۆستە. دوو ساڵ، بە پشتی ولاخ گوێزە گوێزەی پێکراوە. هەندێک جار دەپێچرایەوەو لەسەر شاخ، لە زستاندا خلۆر دەکرایەوە خوارەوە. چیرۆکی ئێزگە دەهێنێ، نوسەرێک وردەکاریەکەی کۆبکاتەوەو چیرۆکێکی سیاسی جوانی لەسەر دارێژێ.

ئەم ئێزگەیە، لە ئەندازیارەکانی یەکێتیو دۆستەکانی، هەوڵێکی زۆر درا سەری لێدەربکەن، بەڵکو بیخەنەکار. نامەی جۆراوجۆر بۆ شارەکان دەنوسرا، سودی نەبوو.

* لە کۆبونەوەکە بوم.. قسەکان راستن. لە دووەم جاردا، کە عادل موراد ویستی کێشەکە باسبکاتەوە لەگەڵ نەوشیروان، قسەی ناخۆشتری پێووت. هی نوسین نین! ئیتر چووە ناو سۆسیالیست!

هەتا، ڕێکخستنەکانی دەرەوە، ئەندازیارێکی تەکنیکی کارامەو ئازایان لە کوەیت دۆزییەوە. کە ئەوکاتە شانەیەکی ڕێکخستنی یەکێتی لێبوو (تەلعەت گلی) پێی وترابوو، ئازایانە بە سەیارەی خۆی هاتبووەوە، گەیاندیانە سەرکردایەتی. لەماوەی هەفتەیەکدا، خستیە کار. نوسەر لە لاپەڕە (٢٤٥)دا دەڵێ:

"ئیزگە لە گوندی نۆکان بە هیمەتی هاوڕێ تەلعەت گلی ناسرا بە (ئاشتی) و بە بەشداری د.خدر مەعسوم‌و ئیحسان نەجم ناسراو بە "ئەبو شەهاب"و بەندەش. ئیزگەکە ڕۆژی ١٩٧٩/٣/١٩ خرایە ئیش‌و د.خدر بۆ گاڵتە هاواریکرد "ئێرە ئیزگەی دەنگی برایم جەلال"ە، مام جەلال لەوە تورە بوو".[1]

جاری خۆزگە ڕونی بکردایەتەوە، ڕۆڵی خۆی چی بوو؟ تێدەگەین ئەبو شیهاب تەکنیسیۆن‌و دەستڕەنگین بوو. د.خدریش بەرپرسی لق‌و سەرپەرشتی پاراستنی ئیزگەکەی دەکرد. ئەی جەنابی نوسەر فەرمانی چی بووە..؟! دیارنییە؟!

پاشان، لەبەرئەوەی نەخۆشیی خۆ بە زلزانینی هەیە، نەشیدەتوانی کاری گەورەی لەدەست بێت (جگە لە ئاژاوە) توخنی شەڕیش نەدەکەوت.

د.خدر، تاقە پزیشکی ئەوکاتە بوو، کە لەسوریاوە گەڕایەوە. پیاوێکی بە هیمەت بوو. باشیش لەگەڵ دۆخی ژیانی پێشمەرگایەتی دەگونجا، گەرچی لەدەرەوەی وڵات بڕوانامەشی هێنابوو. دوای مفاوەزاتی ١٩٨٤، لەگەڵیا گەشتێکی سیاسی دەرەوەی وڵاتمان کرد، هەتا بڵێی خۆش مەجلیس بوو. بەردەوام خەریکی نوکتەو کڵاوخستنەسەر دەوروبەری بوو. کورتیەکەی هۆگری ڕابواردن بوو. بەڵام نەک بۆ شکاندنی کەس، بەڵکو بۆ خۆشیی. قەتیش غەدری لە کەس نەدەکرد!

نوسەر، ئەوەی لا گرنگ بوو ناوی بهێندرێ. بە ناوهێنانی لە کۆبونەوەیەک، بەسەرهاتێک، هی شار یان شاخ، بەهەر چەشنێک بوبێ، ئاسودە دەبوو. لە کردنەوەی ئیزگەکەدا، ناڵێ بۆ لەگەڵ تیمەکەدا بووە، بەڵام د.خدر کە پێی ڕابواردووەو گوتویەتی "ئێرە ئیزگەی دەنگی برایم جەلالە" شاگەشکە گرتویەتی. تەنها بۆ ڕابواردنیش بووەو هیچی دیکە. بەڵام لای نوسەر لەبەر ناوهێنانەکەی ڕابواردنەکەیشی پێخۆشبووە. خۆیشی دەنوسێ: "مام جەلال پێی تورە بووە". بۆ تورە بووە، چونکە مام زانیویەتی پێی ڕابواردووەو ئیزگەش لە تێستا بووە، خەڵک گوێیان لێبووە. شوێنی ڕابواردن نەبووە.

وەکو تر، لە مێژوودا تۆمارە کە یەکەمین کەس (مەلا بەختیار) ئیزگەکەی کردۆتەوە. تەلعەت گلی (ئاشتی) لە چرکەساتی کردنەوەی ئیزگەکەدا، وێنەی گرتوم‌و مێژووی گرتنی

١ هەمان سەرچاوە چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٤٥).

وێنەکەشی لەسەرە. پێش کردنەوەی ئێزگەکە بە رەسمی، بۆ تێستو رابواردن د.خدر، بەوشێوەیە قسەی کردووە لە ١٩/ی مانگدا، بۆیە لە چاوپێکەوتنێکدا وتویەتی یەکەمین کەس من لە ئێزگەدا قسەم کردوە. بەڵام قسەکە تێستو رابواردن بووە بە "برایم جەلال" ئەگەر ئەو تێستکردنە، کردنەوەی ئێزگە بوبێ بە رەسمی، چۆن دەوترێ "ئێرە دەنگی برایم جەلالە"؟ بۆچیش مام جەلال تورە بووە؟

نوسەر ئەو راستیانە باش دەزانێ. باشیش دەزانێ کە چەند رۆژێک بەندە ئێزگەکەم دەکردەوەو گوتارەکانم دەنوسی‌و دەشمخوێندنەوە. بۆئەوەی ئەم راستیانە نەڵێ، هەر دوای ئەو پەرەگرافە لەلاپەرە (٢٤٥)دا دەڵێ:

"بە بڵاوکردنەوەی چەند سروودێکی نیشتمانی بۆ ماوەی ٢٠ بیست دەقیقە ئێوارەی رۆژی ١٩٧٩/٣/٢١ ئێزگەکە کرایەوە".[1]

سرود لێدرا. بەڵام سەرەتا بەناوی (ئێرە دەنگی شۆرشی عێراقی هەڵگیرساو لە چیاکانی کوردستانەوە) وترا. پاشان، مژدەی کردنەوەی ئێزگەکە بە خەڵک وترا. کورتە وتارێکی لەبەرم لەسەر شۆڕش‌و قارەمانێتی پێشمەرگە خوێندەوەو چەند جارێک هەر ئەو رۆژە پەخش کرا. هەواڵی سەرکەوتنی پێشمەرگە بە فەرماندەیی سالار عەزیز بەسەر قیادە موەقەتە لە "دزلی" بڵاوکرایەوە. ئەمە یەکەمین هەواڵی عەسکەری ئێزگەکە بوو. رۆژی دوایی، لەگەڵ (پشکۆی سەعید ناکام) تەسجیلێکی کۆن‌و شریتی گۆرانی گوگوشمان پەیدا کرد. چاوپێکەوتن لەگەڵ مام جەلال بەبۆنەی نەورۆزەوە کرا. مام لەسەر چیچکان دانیشتبوو. سۆسیالیست تازە جیابوبونەوە. حاڵەتی دەرونی دڕدۆنگ بوو. من دەمویست، لە ئێزگەی خۆمانەوە، نەبینە بڵندگۆی پروپاگەندە بۆیان. بۆیە بە "مام"م وت: باسیان مەکە. وتی: کەمێک باسیان دەکەم‌و گەورەیان ناکەم. کە دەستیکرد بە قسە، حەماس گرتی، بیست دەقیقە، بەوپەڕی شۆڕشگێڕانەوە، بەبێ نوسراو، قسەی کرد. پێنج دەقیقە باسی لادانی بزوتنەوەی لە ڕێبازی یەکێتی کردو جەختی کردەوە کە ئەمانە بە فیت‌و فات، هەڵگەڕاونەتەوە. شۆڕشی کوردستان‌و یەکێتی (بەقسەی مام) لەو هەلپەرست‌و تێکدەرانە پاکبۆتەوەو شۆڕش ئیتر باشتر ئەرکەکانی جێبەجێ دەکات.

کە مام لێبوەوە، تومەز گۆرانیەکەی گوگوشمان نەسڕیبوەوەو بەسەریا وتارەکەمان تۆمارکردبوو، کاتێک هەر لەبەرچاوی مام، لێماندایەوە، وتارو گۆرانیەکە ئاوێتە بوبون. مام پێکەنی. سڕیمانەوە. سەرلەنوێ وتارەکەی تۆمار کردەوە. ئەمجارە خەستتر هێرشی کردە سەر بزوتنەوە!!

---

١ هەمان سەرچاوە. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٤٥).

## ( ١٠ )

# حیزبی شیوعی‌و شۆڕشی نوێ

حیزبی شیوعی، که له قۆناغه هه‌ره سه‌خته‌کان (که‌مترین قۆناغی ئاشتییان دیووه) به‌پێی ڕێبازی خۆیان خۆڕاگر بوون. حیزبه دێرینه‌کانی بیسته‌کان‌و سییه‌کان، له‌چاو ئه‌ماندا، هیچیان به‌سه‌ر نه‌هاتبوو، هه‌ڵوه‌شانه‌وه. نوسه‌ر له رقی ناکۆکی ئایدیۆلۆژی ماویزمه‌وه، سێ لاپه‌ڕه‌ی پڕ له ره‌خنه‌ی له لاپه‌ڕه‌کانی (٢٥٦-٢٥٨) له‌سه‌ر نوسیوون. پرزه‌ی لێبڕیون. به‌نده به درێژایی مێژووی سیاسیم، ئایدیۆلۆژیه‌ت‌و سیاسه‌تی حیزبه‌که‌م به‌گشتی به‌دڵنه‌بووه. به‌ڵام نوسینی بابه‌تیی، ڕێگه‌م نادا، حیزبێکی دێرین‌و قوربانی به‌خش‌و مێژوویی ئاوها، به رق چز بکه‌م. که چزیش ناکرێن.

کۆمه‌ڵه، له‌سه‌ره‌تای دامه‌زراندنیه‌وه، به‌بێ قووڵبونه‌وه له کێشه‌ی شوره‌وی-چین، خۆی کرده پاشکۆی چین. ئه‌مه له‌کاتێکدا، چین هه‌ر ئاوڕیشی له کۆمه‌ڵه نه‌دایه‌وه.(*) هیچ نه‌بێ حیزبی شیوعی که په‌یڕه‌وی له سیاسه‌تی شوره‌وی ده‌کرد، په‌یوه‌ندییان پێکه‌وه هه‌بوو، هاوکاری ده‌کران‌و له‌کاتی لێقه‌وماندا داڵده ده‌دران. کادره‌کانیان ده‌خرانه به‌ر خوێندن‌و بریندارو نه‌خۆشه‌کانیان چاره‌سه‌ر ده‌کردن. له کۆڕو کۆنفرانسی حزبه‌کانی پرۆ شوره‌وی، به‌شدار ده‌بون.

کۆمه‌ڵه، له‌دوای ئه‌وه‌ی به‌ر شاڵاوی گرتن که‌وت‌و کۆمیته‌ی هه‌رێمه‌کان دامه‌زرا، ده‌مانبیست نێوان حیزبه‌که‌و به‌عس باش نییه. له‌ڕێگه‌ی شه‌هید "شوان عه‌لی-شامیل"ه‌وه که باوکی ئه‌ندامی ناوچه‌ی سلێمانی حیزبی ناوبراو بوو، ناڕاسته‌وخۆ په‌یامامان ده‌نارد که هه‌ین‌و ئاماده‌ین بۆ دۆستایه‌تی. جاریکیان نێوانیان له‌گه‌ڵ عێراق، ساردی تێکه‌وتبوو، عه‌زیز محه‌مه‌د، به‌دزیه‌وه هاتبووه ماڵی باوکی شوان. له‌گه‌ڵ شه‌هید ئارام له ماڵی ئاوات قاره‌مانی بوین، که دراوسێی ماڵی شامیل بون. ئارام رازی بوو عه‌زیز محه‌مه‌د ببینێ،

---

* هاوینی ٢٠١١، وه‌فدی یه‌کێتی به سه‌رۆکایه‌تی د.که‌مال فوئاد، ئه‌رسه‌لان بایز، ئازاد جوندیانی، کافیه سلێمان، هاوژین مه‌نمی‌و به‌نده، به ره‌سمی سه‌ردانی چینمان کرد. له کۆبونه‌وه‌یه‌کی ره‌سمی له‌گه‌ڵ مه‌کته‌بی سیاسییاندا، من ره‌خنه‌م لێگرتن‌و گوتم: کۆمه‌ڵه، زیاتر له (٥)ساڵ په‌یڕه‌وی له سیاسه‌تی چین‌و ماوتسیتۆنگ ده‌کرد. پێشمه‌رگه‌و فه‌رمانده‌کانی به ئه‌ستێره‌ی سووری ئێوه‌وه، شه‌هید ده‌کران. که‌چی ئێوه، ئاوڕیشتان لێنه‌دراینه‌وه. گوتیان: ئه‌م ره‌خنه‌یه ده‌گه‌یه‌نینه بالاترین ده‌سه‌ڵات. ئێمه ئه‌و مه‌سه‌له‌یه‌مان هه‌ر نه‌زانیووه. که هاتینه‌ده‌ره‌وه، هه‌ڤاڵ کافیه سلێمان، وتی: به‌و قسانه‌ت ده‌ستم به گریان کرد.

بەلام ئەو وتبوی: کاتی نییە. بۆ هەلێکی تر. لەوانەبوو، ئەم دوو سەرکردە تێگەیشتووە، یەکیان دیبا، لایەنی کەم لەسەر هەندێک مەسەلە رێکەوتبان. لەوانەبوو!

کە شۆرش دەستیپێکرد، لە ئەدەبیاتی ناو ولاتو دەرەوەشدا، بەدەگمەن نەبێ، هێرش نەدەکرایە سەر حیزبی شیوعی، گەرچی لەناو بەرەی نیشتمانی بەعسیشدا بوون. ئەگەرێکی سیاسی چاوەروانکراو بوو، لەگەڵ بەعس تێکبچن‌و بێنە دەرەوە. ئەمە جگەلەوەی نەدەویسترا شورەوی لە شۆرشی نوێ‌و یەکێتی برەنجێندرێ. ئەم قسانە بۆیە بیر دەخەمەوە، هەتا بزانرێ، لەلایەکەوە کۆمیتەی هەرێمەکان، تەنها بە جەزبەی ئایدیۆلۆژی ماویزم بیری لە شۆرش نەکردۆتەوەو دەست لە دژایەتی ریڤیژنیزم هەڵگرتنیش، لە ئەدەبیاتدا، وەکو دووربینیەکی روداوەکان، زادەی ئەو سیاسەتە دروستە بوو!

مام جەلالو دەستەی دامەزرێنەریش، بێئەوەی لەگەڵ کۆمیتەی هەرێمەکاندا، لەسەر ئەم سیاسەتە قسەش کرابێ، یان لە هیچ نامەیەکی مام جەلالدا رایسپاردبێ، ئەو سیاسەتە بگرینەبەر، ئەوانیش لەدەرەوەدا، هەمان سیاسەتیان پەیرەو کردووە. بەمەشدا دەردەکەوێ کە:

هەلومەرجی بابەتیی، دیاریکەری سیاسەتی شۆرشگێرانەیە، نەک دروشمی سووری سواوی دابراو لە هەلومەرجە بابەتیەکە.

نوسەری (چەپکێک)، نەک لەکاتی خۆشاردنەوەی کۆمیتەی هەرێمەکاندا، هزری خوێندنەوەی ئەو هاوکێشەیەی نەدەبرِی، بەڵکو لەدوای شۆرشیش، هەر بە پێپێوی کۆن کێشەکانی دەپێوێت.

راستە حیزبی شیوعی، لەگەڵ بەعسدا لە حوزەیرانی ۱۹۷۳ چونە بەرەیەکەوەو هەتا تشرینی دووەمی ۱۹۷۸یش بە سیخناخی لەگەڵیاندا هەڵیانکرد. پێشتریش لەگەڵ رژێمی قاسم هەڵەی سوکتریان کرد. بەلام، تەنها ئەو حیزبە، ئەو هەڵە قورس‌و سوکەیان لە نیو سەدەی رابوردودا کردووە.

- کام حکومەت هاتبێتە سەر کار، لە زەمانی ئینگلیزو شێخ عبدولسەلامی بارزانی شەهیدەوە، هەتا بارزانی‌و ئێستای پارتی، ئامادە نەبون لەگەڵیاندا رێک بکەون.. ئەوە حکومەتەکان بون مافی کوردیان نەدەسەلماند. نەک سەردارو سەرکردەکان دانوستانیان رەتکردبێتەوە!

- باڵی مەکتەبی سیاسی-جەلالی. لەگەڵ عەبدولسەلام عارف، عەبدولرەحمان عارفو پاشان بەعس ١٩٦٦-١٩٦٨ بەردەوام پەیوەندییان هەبوو، بەبێ ڕێکەوتنێکی سیاسی کۆنکرێتیش.. بە هێزی چەکدارو شەڕی خۆکوژی ناوخۆشەوە.

- لە شۆڕشی نوێدا.. یەکێتی لە ساڵی ١٩٧٧وە هەتا دوای ڕاپەڕینیش، ناوبەناو دانوستانی نەکردووە؟

- ئەی پارتی، ناوبەناو نەیکردووە؟

- ئەی سۆسیالیست، ناوبەناو نەیکردووە؟

- ئەی بەرەی کوردستانی.. دوای ئەنفالو کیمیابارانیش، نەیکردووە؟

هەڵوێست فرۆشتن ئاسانە. بەڵام هەر نوسەرو سیاسیەک، ڕوداوەکان، ڕاستیەکان، بڕیارو دەستکەوتەکان، پاڵپشتی بۆچونەکانی نەبن، هەڵوێستو ڕەخنەکانی وەکو بڵقی سەر زەلکاون، ڕەنگیان جوانە، بەڵام پڕن لە میکرۆب.(*)

لەکۆتاییدا ڕێژنەیەک ڕەخنە، هەروەکو بیەوێ بڵێ؛ لە هەموو سەرکردایەتی یەکێتی، زیرەکتر بوم، لە لاپەڕە (٢٥٨)دا دەنوسێ:

"یەکێتی هاتنی حزبی شیوعی بۆ ناو شۆڕش و دەرچونیان لە جوغزی بەعس زۆر لا گرنگ بوو، بە ڕوداوێکی مێژوویی‌و وەرچەرخانێکی گەورەی دەزانی بەتایبەت مام جەلالو هەندێ لە برادەرە عێراقیە کۆمەڵەکان، کە ئاییندە دەریخست تەواو پێچەوانە بوو"(١)

ئەمەیە کەسایەتی نەرجسیەتی. پێیوایە، لەبەرئەوەی کاتی خۆی بە کەللەڕەقی، نەک بە لۆژیکی سیاسی، دژی حیزبی شیوعی بووە، ئیتر هەتا هەتایە، هەر ئەو بۆچونە ڕاستە. بۆچونەکە نابەستێتەوە بە زەمانو زەمینەی خۆی، بە هاوکێشەکان، بە لاوازبونی شۆڕش، بە پێویستی شۆڕش بۆ پشتیوانی نێودەوڵەتی، بە شەڕی ناوخۆ.. بە کۆنتێکستی (ڕێڕەوی) ڕوداوەکان..تاد. هیچی ئەوانە نابینێ. چونکە نوسەر هەمیشە ڕوداوەکان، لە کونی دەرزیەوە دەبینێ. نەک بە مایکرۆسکۆبی ئەقڵ!

---

* ساڵی ١٩٨١ سیمینارێکم بەناونیشانی (حیزبی شیوعی‌و مەسەلەی کورد) لە هۆڵی شەهید شیهاب- خڕی ناوزەنگ، گێڕا. ڕەخنەی بابەتیم لێگرتن. بە تۆمارکراوی ماوەمە. یەک قسەی زبرم بەرامبەر نەکردن.

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٥٨).

## ( ١١ )
## هەڵەی شیوعیو مەلای بانیخێڵانی

دورونزیک، کێشەکانی ناو حیزبی شیوعیم نەدەزانی. نەشمبیستبوو بەو رادەیە بەهادین نوری (ئەبو سەلام) لەگەڵ مەکتەبی سیاسیاندا کێشەی لەمێژینەی هەیە. لە مەڵبەندی یەکدا زورتر لەگەڵ (مەلا عەلی)دا لەسەر بێلایەنبونیان قسەم دەکرد. بێئاگا لەوەی، زۆربەی کۆمیتەی ناوەندیو هەموو مەکتەبی سیاسی حیزبەکە، لەتەک بەهادین نوریدا ناکۆکنو هەموشیان هەڵوێستەکەیان پێ خراپ بووە، لە شەڕەکەدا بێلایەن بن. بەڵام بۆ ویژدان، هێندەی پەیوەندی بە پەیمانی دووقوڵیمانەوە بوو، لە سنوری مەڵبەندەکەدا، بەهادینو مەلا عەلی، بەڵێنەکەیان بردەسەر. کارێکی مێژوویشیان کرد. بەڵام خووی کوردە، هەڵوێستی باشیش، تێکەڵاوی رقی سیاسی کۆنو نوێ دەکرێ. بۆیە، ئەمانیش سزا دران.

رۆژگار دەریخست، مەکتەبی سیاسی هەردوولا و ناوەندی کۆمەڵەش، بە تاکتیک باسی ئاشتی دەکەن. سیاسەتی راستەقینەیان، تێکوپێکدانی یەکتر بوو. لەسەر ئەو هەڵوێستەی بڕیاری لێدانی شیوعیەکانم جێبەجێ نەکرد، یەکێتی سزایان دام. لەبەرامبەریشدا، حیزبی شیوعی غەزەبی لە بەهادین نوریو مەلا عەلیو ئەو هاوڕێیانەیان گرت، کە شەڕیان نەکرد. کەچی لە هەردوولا، ئەوانەی شۆڕشەکەو دۆخەکەیان خەڵتانی خوێن کرد، شانازییان پێوە کرا!

با بگەڕێینەوە بۆ بەڵگەنامەو شایەتەکان، لەمبارەوە، چی دەڵێنو چۆن بڕیاریانداوە:

"کە چەکدارانی یەکێتی شەڕیان بە (پارتی)و (سۆشیالیست) دەفرۆشت، حزب داوای لە (بەهادین) دەکرد کە پشتیوانی (جود) بکەن دژی خۆفەرزکردنو شەڕفرۆشتنی یەکێتی. (بەهادین) بڕیارەکانی حزبی ئەنجام نەدەدا. کاتێکیش چەکدارانی یەکێتی پەلاماری پشت ئاشانو سەرکردایەتی حزبیان دا، سەرکردایەتی حزب داوای لە (بەهادین) کرد هێزی پشتیوان بۆ سەرکردایەتی بنێرێ، نەی نارد. داوای لێ کرا ئەوانیش لەشارباژێڕو شوێنەکانی تر پەلاماری یەکێتی بدەن، تا فشارەکەیان بۆ سەر بارەگای سەرکردایەتی کەم بێتەوە ئەوەشی نەکرد. بەڵام ڕێکەوتننامەکەی (کەمپی دیوانە)ی لەگەڵ ئیمزا کردن. تەنانەت لەوکاتەدا یەکێتی بۆسەیەکیان لە قەرەداغ بۆ هاوڕێیانمان دانا هاوڕێ (گۆران)و (ئازاد کانی ساردی)یان شەهید کردو ژمارەیەکی تریان لێ بریندار کردین، ڕەدی ئەو جۆرە دەستدرێژیانەشیان نەدایەوە".[١]

١ ئەحمەد بانیخێڵانی. یادەوەرییەکانم. چاپی دووەم- سلێمانی-٢٠١٤. ل(٤٤٧-٤٤٨).

ئەم بڕیارانە، چەندین جومگەی مەترسیداری تێدایە:

یەکەم: کە چەکدارەکانی یەکێتی شەڕیان بە (پارتی)و (سۆسیالیست) دەفرۆشت، حیزب داوای لە (بەهادین) دەکرد کە پشتیوانی (جود) بکەن دژی خوفەرزکردن و شەڕفرۆشتنی یەکێتیی.

تا بیرەوەریەکەشی نوسیووە، مەلا ئەحمەدی بانی خێلانی، بەو هەموو ئەزمونو هێمنیەی کە هەیبوو، رقی لە دڵ دەرنەچووە، دەڵێ: چەکدارەکانی یەکێتی.. بە پێشمەرگەشیان نازانێ.

گریمان وایە، شەڕەکە بە پارتیو سۆسیالیست فرۆشراوە، دەی کەوابێ، یەکێتی خۆی لە شیوعی پاراستووە. نەشیویستووە شەڕیان بکات. مەلا ئەحمەد کە وەکو سەرکردەی عەسکەری یەکەم، ئەوکاتە بڕیاری داوە، دەبوایە ئەم سیاسەتەی یەکێتی بقۆزێتەوە، حیزبەکەی لە شەڕ دووربخاتەوەو سیاسەتی ناوبژیکردن، گەرمتر بکات. کەچی پێچەوانەکەی سەپاندووە!

دووەم: کاتێکیش چەکدارانی یەکێتی پەلاماری پشتئاشانو سەرکردایەتی حیزبیان دا، سەرکردایەتی حیزب داوای لە (بەهادین) کرد هێزی پشتیوان بۆ سەرکردایەتی بنێرێ، نەینارد.

ئەم بڕیارە، نیشانەی نەشارەزایی سەرکردایەتی حیزبی شیوعییە لە جوگرافیای-سیاسی، ئەوکاتەی ناوچە ئازادکراوەکان. ئاخر لەکوێوە بەهادین نوری بتوانێ هێز بنێرێ؟ ناوچەکە هەمووی کۆنترۆڵکراوە. پارتیو سۆسیالیست لە سنوری مەڵبەندی یەک تێک شکابونو هەڵهاتبوون. ئەم هێزەی بەهادین ئیتر چۆن دەیتوانی بەهانای سەرکردایەتیەکەیانەوە بچێ؟

ئاشکرایە، بەهادین نەیکردووە. ئەی خۆ مەلا ئەحمەد دەڵێ: مەڵبەندەکە زۆربەیان بەقسەی بەهادینیان نەکردووە، بەتایبەتی (ئەبو تارا). هێزێکیشی بردە سورێن، ئەی بۆ ئەمان فریایان نەکەوتن؟ ئەو بڕیارانە، تەنها بۆ ئەوە بووە، خۆیان لەو سیاسەتەی شەڕخوازی شکستیان هێنابوو، نەیاندەویست بەهادین نوری، بەو هەموو ناکۆکیەی لەگەڵیاندا هەیەتی، تەنانەت لەم سیاسەتە باشەشدا، سود وەربگرێ. کورتیەکەی، گەڕیان پێ کردووە.

جەخت دەکەمەوە، ئەو رێکەوتنە بۆ شەڕنەکردن لەنێوان حیزبی شیوعیو یەکێتیدا، لەگەڵ شەخسی بەهادین نەبوو. بەڵکو لەتەک حیزبی شیوعی، لەبەر پێگەی حیزبەکەیان

بوو، لەکوردستان‌و عێراق‌و دەرەوە. بەڵام سەرکردایەتی حیزبەکە، لێکدانەوەی دیکەیان بۆ ڕێکەوتنەکە هەبووە. پێیانوابووە من‌و بەهادین، کەین‌وبەینی تریشمان لەژێر سەردایە. کە پاشان ڕۆژگار دەریخست، من‌و بەهادین، کە لە گوندی تەکیەدا، هەوارمان هەڵخستبوو، لەڕوی ئایدیۆلۆژی‌و سیاسیەوە زۆر ناکۆک بوین. تاقە مەسەلە کۆیدەکردینەوە شەترەنجمان پێکەوە دەکرد.

"ئەو دەمە (بەهادین نووری)ش هەر لەو گوندە دەژیا، بۆیە سەرەتا کردمانە گاڵتە و وتمان: کاک بەختیار لەنێو خەڵکیدا دەنگۆی ئەوە هەیە، تۆ و بەهادین نووری لە تەکێ خەریکی دامەزراندنی حیزبی کۆمۆنیستی عێراقن! مەلا بەختیار دەستی کردە پێکەنین‌و وتی: وەڵا پەیوەندیی من‌و کاک بەهادین هەر ئەوەندەیە، پێکەوە یاری شەترەنج ئەکەین"[1]

لەدوای ڕاپەڕینیش، لە دەرکردنی گۆڤاری "دیموکراسی"، لەکۆبونەوەی ئامادەکاری دەرکردنی گۆڤارەکەدا.. وتم:

مادام بەهادین نوری لەم پرۆژەیەدا بەشدارە. سەرناگرێ. کۆبونەوەکەم جێهێشت. (خالید دلێرو بەکر حەسەن‌و حەمەفەریق حەسەن) لە کۆبونەوەکە بون.

هەر لەبەر بەهەڵەچونەکەیە، هەمیشە هەستمدەکرد، حیزبی شیوعی ئەو هەڵوێستە جوامێریەی مەڵبەندی یەک، وەکو رویدا تەقدیر ناکەن.

مەلا ئەحمەد، دوو لاپەڕەی (٤٨١-٤٨٢)ی بۆ ئاڵای شۆڕش تەرخانکردووە. یەک دێری نوسینەکەشی، دژی پێشێلکردنی ئازادیەکانی ئەوسای یەکێتی نەنوسیووە. ئەمە لەکاتێکدا، هێشتا خوێنی دیلە کوژراوەکانی قەندیلیان وشک نەبووبوو! لەوەش خراپتر، ئەم پەرەگرافەمان لەسەر دەنوسێ:

"زۆری پێ نەچوو لە پاییزی ١٩٨٥دا یەکێتیی هێزێکی پێشمەرگەی بە سەرکردایەتی کاک شەوکەتی حاجی موشیر ناردە سەر مەلا بەختیارو بە قۆڵبەستراویی هێنایان بۆ سەرکردایەتی یەکێتی‌و تۆبە نامەیەکیان پێ نووسی‌و لەو پاکانەکردنەیدا لە هەموو کردەوەو چالاکییەکانی خۆی پەشیمان ببووەوە، ئەو کارەی ئەنجامیان دابوو بە خیانەتی لەقەڵەم دا. داوای لە ئەندام‌و پێشمەرگەکانیشیان کردبوو چاو بە هەڵوێستی خۆیاندا بگێڕنەوەو بگەڕێنەوە باوەشی یەکێتی. ئەمەش پاش ئەوەی کە دادگای یەکێتی بڕیاری ئیعدامکردنی دەدەن‌و نزیکەی (٣٦) کادیرو سەرکردەی یەکێتی ئیمزای بڕیارەکە دەکەن. بەڵام جێبەجێکردنی بڕیارەکە لەسەر دوا ئیمزا واتە ئیمزای مام جەلال دەمێنێتەوە.

١ سالار رەشید. ئەو کاروانەی بۆ هەواری ئێمە نەچوو. چاپخانەی تاران. چاپی یەکەم ٢٠٢٠. ل(٤١٧).

بەڵام مام جەلال حوکمی گوللەبارانکردنی مەلا بەختیار ئیمزا ناکاتو بەشێوەیەکی تر لەسێدارەی دا. ئەوەبوو تۆبەنامەو پاکانەکەی مەلا بەختیاریان بە دەستخەتی خۆی بڵاوکردەوەو نوسخەیەکیشیان دا بە حزبی ئێمەو زۆر لایەنی تر."[1]

سەیرە؛ چ رقێک لەناخیا، بەرامبەر بێلایەنکردنی شیوعیەکان لە مەڵبەندی یەکدا، پەنگیخواردووە. وشەگەلی وا بەکاردێنێ، ئێستا یەکێتیو ئەوانەی ئەو تاوانەیان ئەنجامداوە، بەکاریناهێنن. وەکو: قۆڵبەستراوی؛ تۆبەنامە؛ پاکانە؛ خیانەت..تاد.

ئێستا کە ئەم رونکردنەوانە، لەسەر یادەوەریەکانی ئەو تێکۆشەرە ماندووەی رێبازی حیزبەکەی دەنوسم، ئەگەر بە لۆژیکی ئایدیالیستیش بدوێم، گەردنی ئازاد دەکەم. وەکو شەخسی، بەرپرسیارێتیەکە هەڵناگرێ. سیاسەتی حیزبەکەی وا بووە. هەروەکو چۆن سیاسەتی حیزبەکەی منیش بەوشێوەیە بوو، کە رویدا. مێژووش دەریخست، هەردوو سیاسەتەکە هەڵدێری بۆ هەردوولا هێنا. ئەم رونکردنەوەیەش تەنها بۆ مێژوو دەبوایە منیش لە روانگەی خۆمەوە راستیەکان بڵێم.

## (١٢)

## لقی کەرکوکو شەرمەزاریی!

کەرکوک، هەمیشە شادەماری ستراتیژیی کوردو یەکێتیی بووە. بەدرێژایی سەدەی بیستەمیش، لە راپەڕینەکانی شێخ مەحمودەوە، هەر وا بووە. بۆیە، لە سەرەتای شۆڕشەوە، لە پەیکەرەی رێکخراوەیی یەکێتیدا، کەرکوکیش لقی بۆ دانراوە. یەکەمین جار من کرامە لێپرسراوی (١٩٧٧-١٩٧٨) دووەم جار مامۆستا عەزیزی شەهید (١٩٧٨-١٩٧٩). من پێش کارەساتی هەکاری کرامە ئامر هەرێمی هەورامان-هەڵەبجە. واتا: بەرز کرامەوە. مامۆستا عەزیز شەهید کرا. ئیبرایم جەلال، هەڵهات. دوای ئەم، ئازاد هەورامی کرایە بەرپرسیاری لقی کەرکوک هەتا دانوستانەکەش، بەجوامێریی مایەوە. واتا: تاقە بەرپرسیار، کە ئەرکەکانی جێبەجێ نەکردو شکاو سزا درا، لە لقی کەرکوکدا، نوسەری کتێبی (چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە)یە! کەچی لە نوسینی چۆنیەتی چونی بۆ ئەو لقە، نەک لە لێپرسراوانی لقی پێش خۆی، بەڵکو لە شەهید ئارامیش خۆی بە سەرکەوتوتر دەزانێ.

---

١ ئەحمەد بانیخێڵانی. یادەوەرییەکانم. چاپی دووەم- سلێمانی-٢٠١٤. ل(٤٨٢).

با ویستگە ویستگە، لەگەڵ ئەم (شۆڕەسوار!!)ەی گەرمیانو کوێستانی کوردستان، گەشتێکی هەڵسەنگاندن بکەین.

رۆژی ٣/٢٦، کەوتوتەڕێ. لە لاپەڕە (٢٦١-٢٦٢) دا دەڵێ:

"زۆرم لا خۆش بوو، کە بۆ لێپرسراوی لقی دووی کەرکوک دانرام، سەبارەت بەوەی، کە هەم لە ناوچەکە شارەزا بووم. هەر لە ساڵی ١٩٦٣-١٩٦٤ وەک ئەندامی لیژنەی ناوچەی قەزای سلێمانی لەوێ بوومو بارەگاکەی لە ناوچەی قەراغ بوو، هەم ئامر هەرێمەکەی فەیسەڵ تاڵەبانی، هاوڕێی چەند ساڵە و هاوبیرم بوو".[1]

کەوابێ، ئەم شۆڕەسوارە، پێشینەی هەیەو دوو ساڵ لەدوای ١٩٦٣وە، ئەندام ناوچە بووە. شەهید سیروانیش هاوڕێی بووە. بە هەموو پێوەرێک، دەبێ سەرکەوتوو بێ.

جارێ بۆ مێژوو ئەوە رونبکەمەوە کە: راستە شەهید سیروان هاوڕێی نوسەر بووە. راستێشە هەتا کۆمیتەی هەرێمەکان دروست بوو، دوای سێ مانگیش، هەر هاوڕێی بوو. بەڵام کاتێک ناکۆکی کەوتە نێوان نوسەرو شەهید عەبدولرەزاقو چەند هاوڕێیەکی تر، لەسەر شۆڕشکردنو نەکردن، ئەوان لایەنگری شۆڕش نەبوون، پاساوەکەشیان ئەوە بوو، مەترسی لەسەر ژیانی شیهابو هاوڕێکانی هەیە. ئێمەش دەمانگوت: تازە ئەوان گیراوونو بەپێی ئەو بەڵگانەی لەسەریانە، یان وتویانە، دادگایی دەکرێن. ئۆباڵی شۆڕشکردن لەئەستۆی مام جەلالو کۆمیتەی هەرێمەکانە. شەهید عەبدولرەزاق، مەترسی تریشی هەبوو، ئەویش ئەمەیە کە دەیگوت: مام جەلالو د.خالیدو عەلی عەسکەری زاڵدەبنو کۆمەڵە لاواز دەبێ.(*)

سیروان کە لێیان تێگەیشت، پەیوەندی بە منەوە هەبوو. دوو ناسنامەی ساختەشی بەناوی جیاوازەوە، بەناوی فەرمانبەری خانەنشینی لقی کەرکوکو لقی سلێمانی بۆ دەرکردم. تا بڵێی ئامادەباشی هەموو ئەرکەکان بوو. لەو رەوشە دابڕا و بەوپەڕی تواناوە کەوتە چالاکیو ئامادەیی دەربڕی لە مەفرەزە سەرەتاییەکاندا بێ، قسەی تریشی لەسەر نوسەر دەکرد، بەڵام نامەوێ بیانگێڕمەوە. لەبەرچاوی شەهید سیروان، لە گردی سەیوان، لەگەڵ نوسەردا لێکهەڵبەزین، ئەوەی رویدا.. ئەویش ناگێڕمەوە!!

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٦١-٢٦٢).

* فوئادی مەجید میسری، هەمان رای هەبوو. دوای دەستپێکردنی شۆڕش سوارەی ئەحمەد عارفو تەها باراویش هەمان رایان لا دروست بوو. لە سوریاش فەرهاد شاکەلیو عارف کەریمو برایم عەبدەلیو ملازم سەردارو هاوڕێی تریش، لەگەڵ نەوشیروان نەگونجابونو دورکەوتنەوە. هەمان رایان لا دروست بوبوو.

که دێته سەر بەرنامەو بڕیارەکانی، لە لاپەڕە (٢٦٢)دا دەنوسێ:

"هەوڵدەدەین چەند جەولەیەکی دوورودرێژ بە ناوچەکانی قەرەداغو بازیانو گەرمیاندا بکەین، کە تائەوکاتە نە شەهید ئارامو نە شەهید مامۆستا عەزیز بەو فراوانیەو بگرە لە چەند دێیەکی ناوچەی قەرەداغ تێپەڕیان نەکردبوو".(١)

کاری راست بێ کە جەولەی دوورودرێژی کردووە، بەڵام ناوی دێهاتەکان کە بۆی رۆیشتون، نابات. دەشڵێ: شەهید ئارامو شەهید مامۆستا عەزیز چەند دێیەکیان تێنەپەڕاندووە.

مادام ناوی دێهات نانوسی، کەواتە: ئەوە جەنابتی چەند دێیەکت تێنەپەڕاندووە. پاشان کاری شەهید ئارام تەنها گەڕان نەبوو بە دێهاتدا. ئەو رابەری کۆمەڵە بوو، بۆی هەبوو لەشوێنێکدا دانیشێو سەرپەرشتی کارەکانو نوسینەکان بکات. لەڕاستیدا هەڵەی شەهید ئارام، کە خۆیشی لەسەری دانا، ئەوە بوو شاخو دێیەکی هەرە سەختی لەسەر سنور، یان لە قەندیلو هەڵگوردو دۆڵی جافایەتی هەڵنەبژارد، بیکاتە ناوەندی سیاسی. سەرەڕای ئەوەش، ئارام، چاوەڕێی گەیشتنی ملازم عومەری دەکرد، هەتا ناوچەکەی رادەست بکاتو جێی بهێڵێ. نەک وەک نوسەر، کە کێشەکان قورس بوون، هەڵبێ!!

بەڵکو لە نوسینێکی تردا، نوسەر، ناوی ئەو دێهاتانە بنوسێ کە مام جەلال هەتا مفاوەزاتی ١٩٨٤ جەولەی تیا کردبن. بەهۆی شەڕی ئێران-عێراقەوە نەبا، مامو مەکتەبی سیاسی، قەت خڕی نێوزەنگیان جێنەدەهێشت. بۆ رابەر، خۆقایمکردن لە شوێنی سەختدا، بڕیاری دروستە.. نەک جەولە!

## (١٣)
## لاسارێکو جاسوسێک

لە هەموو ئەو چوار-پێنج مانگەی لە لقی کەرکوکدا بووە، یەک شەڕی نەکردووە. کە پێشمەرگە شەڕیان کردووە، نزیکیشیان بووەو تەقەی لەسەر نەکردون.

کەسێکیان گرتووە، رەوشتی لاسارانە بووە لەگەڵ کوڕانو کچاندا. شکاتی لای نوسەر لێکراوە. ئەویش ئاوای دادگایی کردووەو لە لاپەڕە (٢٦٤)دا باسی جوامێریی خۆی ئاوەها دەنوسێ:

---

١ هەمان سەرچاوە. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٦٢).

"داوامـان له خەڵکەکە کرد چ بڕیارێک بە شایستەی ئەو گەنجە تاوانبارە دەزانن هەموویان داوایان کرد سەرو برۆی بتاشرێو بە پەند بکرێ، لەسەر داوای خەڵکەکە لە چەند لاوە سەری تاشرا و کرا بە خەریتەو لایەکی سمێڵو برۆشی تاشرا و هەر یەک لە شایی کەران تفیان لێکردو بەجێمان هێشت".[1]

بە فەرمانی سکرتێری کۆمەڵە، لەسەر دڵداری، پێشتر باسمان کرد، دوو کچو دو دڵدارەکەی دەکوژرێن. ئەمیش، کەسێکی گرتووە. وەکو سەردەمی کۆیلایەتی، چارەنوسی لاساریەکەی داوەتە دەستی خەڵک، ئەویش بۆ شاییو رەشبەڵەک لە دێی (کودەمیر) کۆبونەتەوە. لە چەندین لاوە سەری کابرایان تاشیووە، سەریان کردۆتە خەریتەو سمێڵو برۆیشیان داپاچیوە، گوایە، کردویانەتە پەنگ!!

ئەم سزایە، سزای سەردەمی کۆیلایەتیە. لەناو ئەو خەڵکەی بۆ شایی هاتوون، زەوقی خەڵکەکەشیان تێکداوە. نوسەر، ویستویەتی لاوازی خۆی بە زەبروزەنگی وا بشارێتەوە، کە بەرپرسێکی بە هەیبەتە. گوایە بەمە کارێکی قارەمانانەی!! ئەنجامداوە. ئەمە لەکاتێکدا دەبوایە، لەناو خەڵکەکە بیروباوەڕی شۆڕشو رەوشتی شۆڕشگێڕانەی باسکردبا. گوتبای: ئەم بەدڕەوشتە، بە لێکۆڵینەوە تاوانەکەیو سزاکەی دیاریدەکرێ. نەک وەک قەرەقوش، بڕیاری لەو چەشنە بدات.

لەدوای ئەوە، باسی جاسوسێک بەمشێوەیەی خوارەوە دەکات، گوایە لە دێیەکدا، کەسێک لەکاتی کۆبونەوەدا، زۆری خزمەت کردونو گومانی لێ پەیدا کردووە. ئاکام بڕیاری داوە:

"منیش شەهید ئاسۆی دەلاکو ئازادی شێخ رەئوفـو شەهید هـاواری برام نارد بەدوای گەنجەکەدا، هەر کە چووبونەماڵەکەیو بانگیان کرد یەکسەر ورەی ڕووخابوو کە هێنایان لە یەکەم پرسیارو لێکۆڵینەوەدا دانی بەوەدا نا کە ڕژێم لە دەربەندیخان داوای لێکردووە یەکێک لەم (س) ناوانە بکوژێ (سامان، ساڵح کە مامی خۆی بوو، سۆران بوو کە ڕابەری سیاسی هەرێمەکە بوو، سیامەند کە بەندە بوو".[2]

دەستی خۆشبێ، ئەمە یەکەمین کاری شۆڕشگێڕانەی بووە لەناو شۆڕشدا. ئەنجام چی بووە؟ هەر لەو لاپەڕەیەو دوای ئەو پەرەگرافە دەنوسێ:

---

١ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٦٤).

٢ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٦٤-٢٦٥).

"پاشان لەسەر داوای مام صالح لێی خۆشبوینو بەڵێنی خۆچاککردنیمان لێوەرگرت"[١]
با هەموو ئەوانەی کە لە یاسای شۆڕشو شۆڕشگێڕێتی دەزانن، ئەم دوو روداوەو ئەم دوو دادگاییەو ئەم دوو بڕیارە، بەراورد بکەن؟
کەسێک لەسەر بەدڕەوشتیی دەگیرێ، ئەتکی دەکەنو ئەوەی نەشێ لەگەڵیا دەیکەن.
جاسوسێک دەگرن، بە واسیتە ئازادی دەکەنو لە گوڵ کاڵتری پێناڵێن. ئەمە لەکاتێکدا ئەوکاتە، بەپێی بڕیاری سەرکردایەتی جاسوسی لەو چەشنە، بڕیاری کوشتنی هەبوو. بەڵام نوسەر، بۆ خۆهەڵکێشان کابرای کودەمیر ئەتک دەکات. بەڵام لەترسی دوژمنایەتی جاسوسێک ئازاد دەکات. لەوەش سەیرتر، باسی مامۆستا جەعفەر دەکات گوایە ئەو رێکیخستووە. گریمان ئەم هەڵبەستنە راست بێ. قابیلە مامۆستا جەعفەر زانیبێتیو رێکیشی خستبێ. لەکاتێکدا برا گەورەکەی (غاندی) بە دەسیسەی جاسوسێک لەسێدارە درابێ؟! هەر بۆئەوەی رقی بە مامۆستا جەعفەردا بڕێژێ.. خستویەتیە رستەوە.
ئەم وردە بەسەرهاتانە، دەیسەلمێنن کە نوسەر، بەسەرهاتی دیکەی نییە باسی بکات. بۆیە ناچارە ئەم روداوە لاوەکییانە باسبکات، کە پێشمەرگە رۆژانە دەیان روداوی وایان توش دەبوو.

## ( ١٤ )
## چکوارا جەلالو.. ئینزال!

هەموو ئەوانەی لەناو شۆڕشدا، حەزیان لە زەبروزەنگ بوبێو نەیانتوانیبێ، ئەو هەستەیان لە کەسایەتییاندا بەدی بهێنن، بەردەوام مەجلیس بە ئاژاوە، یاخود بە داتاشینی داستانی سەیرو سەمەرە، گەرم دەکەن. لە نوسینیشدا، ئەو ئارەزووەیان پاڵنەریانە ناوبانگ بۆ خۆیان هەڵبەستن. ئەمە جۆرێکە لە نەخۆشی. هی وا هەیە لەناو کەسوکاریا، هەشە لەناو هاوڕێو دۆست، هەشیانە لە شارەکەیاندا (وەکو خولە چەخمامە) هی واشیان هەن، لە دونیای سیاسەتو پێشمەرگایەتیدا، پشکۆی ناخیان بۆ خۆدەرخستن بە خۆهەڵکێشان دەگەشێننەوە.

---
١ هەمان سەرچاوە. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل (٢٦١).

نوسەر، لە تافی لاوێتیەوە، کۆکەرەوەی ئەو خووڕەوشتەیە تا گەورەبون. خوەکەی بەرینەداوەو ئەمیش شەیدای خوەکەیە!

ئەگەر کەسێک نەخۆشیی ناوبانگو زەبروزەنگی دەرونیی، ئۆقرەی ژیانی ئاسایی لێنەبڕیبێ، ئەم داستانە هەڵدەبەستێ:

"لەو ماوەیە ڕژێم هێرشو پەلاماری توندی دەکردە سەرمان بۆ هەر شوێنێک بڕۆیشتینایە دوای ڕۆژێک یا چەند سەعاتێک ئینزالی بە کۆپتەر دەکرد تەنانەت جارێکیان مام ڕۆستەم وتی: "دە برۆ ماڵت بەقوڕگیرێ، حکومەتت لێ وروژاندین، بەرۆکمان بەردە لەوەتەی تۆ هاتووی ئیسراحەتمان نەکردووە بەردەوام جەولەو ئینزال جەولەو ئینزال".[1]

ئاخر نوسەر، لە شاردا ئۆقرەت لە حکومەت بە چاپوکی ناوشار، بڕیووە؟! ئاخر بەرپرسی مەفرەزەکانی ناوشار بووی؟! ئاخر کۆمەڵە هەر شەهیدێکی دابێ، تۆڵەی جەرگبڕت کردۆتەوە؟! ئاخر چەندین معەسکەرو ڕەبایەت گرتووە؟! کاربەدەستی گەورەی حکومەتت کوشتووە؟! چەندین بانقت بڕیووە؟! شاری گەورەت ڕزگار کردووە؟! ئاخر چیت کردووە؟! هەتا حکومەت حسابی بۆ کردبێتو بەردەوام ئینزالی بۆ لەناوبردنت کردبێ؟!

بۆ لەو هەموو ئینزالە، لەو هەموو کۆپتەرە، لەو هەموو هێرشە توندەی کراوەتە سەرتان، بۆ تەنها جارێکیش توشی دوورە تەقەش نەبویت؟! بۆ لە مەفرەزەکاندا، نینۆکی پێشمەرگەیەکیش بریندار نەکراوەو مویەکی سەری خۆشت لە هەڵهاتنو قوچاندندا، هەڵنەوەریووە؟

بەقسەی نوسەر بێ، کە خۆی دەڵێ، زۆرەبەی دێهاتی قەراغو گەرمیانو بازیان گەڕاوین، لایەنی کەم لە (٥٠) شوێندا ئینزالیان بۆ کراوە. چونکە دەڵێ: بۆ هەر شوێنێک بڕۆیشتینایە دوای ڕۆژێک، یان چەند سەعاتێک ئینزالی بە کۆپتەر دەکرد.

مەعقولە لەو هەموو ئینزالەدا حکومەت ئێوەی نەدۆزیبێتەوەو بۆ جارێکیش بێ، دەستڕێژێکی بە کۆپتەر لێنەکردبن؟!

چیگوارا.. نە لە کوباو نە لە بۆلیڤیا، ئەوەندە ئینزالی بۆ نەکرا، وا دیارە، چیگوارا جەلالی سەنگەسەری، لە چیگوارای کوباو بۆلیڤیا مەترسیدارتر بووە، بۆ ڕژێمی بەعسو هاوپەیمانە نێودەوڵەتیو ئیقلیمیەکانی!!

---

١ سەرچاوەی پێشوو.. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٦٨).

## ( ١٥ )
## شکست، یان ڕاپۆرت ؟

لە هەموو ژیانی پێشمەرگایەتیدا نوسەر، دوو جار سەرکردایەتی جێهێشت. جارێکیان بۆ لقی کەرکوک-قەراغ. جارێکیشیان بۆ ناوچەی مەریوان. لە مەریوان بوو بە مایەی شەهیدبونی فوئاد سوڵتانیو لە قەراغیش بوو بە مایەی کێشەیەکی زۆرو لە شەڕی (١٩٧٩/٦/١٢) لەنێوان سێوسێنانو کەولۆشدا، کوپتەر دوو پێشمەرگە دەبینێو تەقەیان لێدەکات. ئەمیشو کەرتێک لەسەر شاخ، پشتی سێوسێنان دەبن، بەرگرییان لێناکەن. پێشمەرگەکان شەهید دەبن. شەهید هاواری برای پێی وتووە: تۆ لەترسا ناهێڵی تەقە بکەین. ئەو هەر نەیبردۆتە سەر خۆیو گوتویەتی: با کەشف نەبین. ئەم روداوە، بەرپرسیاری لقی تەواو لەبەرچاوی هەرێمەکەو لقەکە، خستووە. هەرێمەکەش بەناوبانگ بوو لە ئازایەتیو چاپوکی. بەئاشکرا پێیان وتووە: بڕۆرەوە تۆمان ناوێ. ئینجا دوای ئەم هەڵهاتنە، لەگەڵ مستەفا چاوڕەشدا چوینە قەراغ، یەک کەسیش دانی خێری پیا نەنا. کەچی وا دایتاشیووە، گوایە مامۆستا ئەنوەر ڕاپۆرتی لێنوسیووە. مامۆستا ئەنوەر، پیاوێکی جوامێری شاخو شار بوو. کۆڵنەدەر بوو. لەسەرەتای گرتنەوەی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەوە،ماڵو حاڵیان لەخزمەتی کۆمەڵەدا بوون. کەچی نوسەر بەشێوەی ناپەسەند ناونیشانەکەی ناو ناوە (مامۆستا ئەنوەرو ڕاپۆرتەکانی). گوایە مامۆستا ئەنوەر ڕاپۆرتەکەی بۆ سالار عەزیز نوسیوەو ناوبراویش داویەتی بە مامو مامیش ئاوا بانگی کردووە:

"ڕۆژێک چووم بۆ لای مام جەلال من بە نیازبووم باسی پێویستییەکانی هەرێمەکەو دانانی ئامر هەرێمی لەگەڵدا بکەم. مام جەلال بە گرژییەوە باسی ڕاپۆرتەکەی مامۆستا ئەنوەری لەگەڵ کردم، گوایە من لە لقی دوو ڕێزم لە کادرو ئەندام لقەکان نەگرتووە، لەباتی کاری سیاسی خۆم بە ئامر هەرێم داناوە خۆم لە کاری عەسکەری هەڵقوورتاندوە، فەزڵی براکانی خۆم بەسەر کادرەکانی تردا داوە".[١]

لەراستیدا، ئەو قسانە زۆر کەمن کە باسیان دەکات. ئەوەی ئێمە لە قەراغ لەسەر نوسەر بۆیان باسکردین، سەربەقوڕ دێنێتە پێکەنین. کە دەڵێ مام جەلال بە گرژیی لەگەڵم باسی ڕاپۆرتەکەی کردووە. هۆیەکەی تەواوی ئەو دەنگوباسانە بوو، کە لەسەری هەبوو. هەروا، داوای چەکی ستراتیژی بۆ گەڕانەوە بۆ قەراغ کرابوو. مامیش پێی وتبوو:

---

١ هەمان سەرچاوە. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٧٠).

جاریَ تۆ بەبێ پرس لقەکەت جێهێشتووە. ملازم عومەرو سالار عەزیزو مامۆستا جەعفەری لێبوون، پاشان ئەم گفتوگۆیە کەوتبوە نێوانیان:

مام: فەرموو، بۆ هاتوی؟
برایم: هاتوم بۆ چەکی ستراتیجی.
مام: چەکی قورسی وەکو چی؟
برایم: دۆشکا و ئار بی جی و هاوەن.
مام: جا ئەوانە کەی چەکی ستراتیژین؟!
برایم: ئەی؟

مام: ئەو چەکانە دۆشکا هی جەنگی یەکەمی جیهانو ئار بی جی چەکی تەکتیکیە. ستراتیژی نییە. ستراتیژی کاتیوشاو فرۆکەو کۆپتەرو زرێپۆشە، چەکی ئەتۆمی، کیشوەر تێپەڕ (عابرة القارات)ە. باشە بۆ یەک مانگ بگەڕێرەوە.

برایم: شەوکوێرمو شەوان دەستم رادەکێشن، ناتوانم.

ئیتر مام جەلال لێی تورە دەبێو ئەمیش، لۆش لۆش دەچێتەوە کۆنە هەوار.. شێنێ.

بە هۆنینەوەی راپۆرتی مامۆستا ئەنوەر، دەیەوێ خۆی دەرباز بکات. کەچی ئەنوەر لەناو شاردا، ئامادە بوو پێشمەرگەکانی لێدانی پارێزگاری سلێمانی بشارێتەوە، کە بۆ لێدانی پارێزگاری سلێمانی هاتبونە شار. بە سەیارەش گواستیانەوە بۆ مالان. بەلام برایم جەلال ئامادە نەبوو.. چاویشی پێیان بکەوێ!!

کێشەکە پەیوەندی بە سالار عەزیزەوە نییە. بۆئەوەی بگوترێ بەهۆی کۆمیتەی هەرێمەکانەوە، سالار رقی لێمە، سالاریش دەکاتە راپۆرت نووس.. کە هەر تاقەتی راپۆرت نوسینی نەبووە!

خۆم پێم سەیرە، ئەم زاتە، چ توانایەکی هەیە بۆ هەلگێرانەوەی راستیەکانو دارشتنەوەیان بەپێی دەرونە نەخۆشەکەی. توانایەکی لەڕادەبەدەر، کتێبێکی (٥٠٠) لاپەڕەیی بنوسرێ، زۆربەی هەلبەسترێ. زۆربەی هەلبەستنەکانیشی، دەیان شایەتی زیندویان ماوون. کە نوسینەکانی راست نین. هەقە ئەم جۆرە کەسانە، بخرێنە نەقاهەتگا (شوێنی سۆزی دەرونی)، چاودێری چڕی دەرونیان بکرێ، بەلکو کەمترین زیان بگەیەنن!

## (١٦)
# ململانێکانو هاوڕێیانی زیندان

ئەوکاتەی بە خەیاڵی خۆی، بەرپرسی یەکەمی کۆمەڵەیە دوای شەهید شیهابو هاوڕێکانی، چونکە بە خەیاڵ، کۆمیتەی شارەکانی دروستکردووە. ئەوکاتانەش بۆ سەرکردایەتی نەوشیروان مستەفا هێنایە دەرەوە، بەردەوام لاوازی خۆی بە هاوڕێیانی زینداندا هەڵواسیووە.

لە زینداندا، کۆمیتەی هەرێمەکان، بچوکترین بڕیارمان لەسەر ئاژاوەگێڕییەکانی نوسەر، دوانەخست. پەیوەندیمان بە هاوڕێیانی زیندان کردو ئەوانیش، زۆربەیان، لەپێشەوەدا، شیهابی شێخ نوری، فەرەیدون عەبدولقادر، ئاوات عەبدولغەفور، عومەری سەید عەلیو عەلی بچکۆل.. جوامێرانە بەدەنگمانەوە هاتنو تەنانەت شیهاب لای نازەنینی هاوسەرییو روناکی شێخ جەنابو شێخ جەنابو کەسانی تریش گوتبووی: من نەمێنم شاسوار لەباتی من. راشیانسپاردبوو، هاوڕێیانی کۆمەڵە بەقسەی کۆمیتەی هەرێمەکان بکەن. نوسەر، گەرچی لە ئاژاوەگێڕی نەدەکەوت، بەڵام لەبەردەم سوربونی کۆمیتەی هەرێمەکانو سەرکەوتنەکانی، ئیفلیج بوو. تایبەت کاتێک زانی ئازاد هەورامیو شەهید عەبدولرەزاق، لە کۆمیتەی هەرێمەکاندا، ئەندام بونو چالاکیش بون. گەرچی عەبدولرەزاق، لەترسی چارەنوسی شیهابو هاوڕێکانیو دوارۆژی کۆمەڵە، بۆچونی جیاوازیشی هەبوو! بەڵام ئاوڕ لە برایم نەدرایەوە!!

گوایە خۆی زۆر بە دڵسۆزی هاوڕێیانی زیندان دەزانێ، ناونیشانی بابەتەکەی ناو ناوە (تاقمەکەی سجنو خەتی شەهید شەهاب) ئەمە لەکاتێکدا، تا ئەو هاوڕێیانە خراونەتە زیندان، سەرکردایەتی کۆمەڵە بون، تاقم نەبون. شیهابیش وەکو سکرتێری کۆمەڵە، پێگەو رێزی هەبوو. خەتی نەبوو. کۆمیتەی هەرێمەکانیش، بێڕادە رێزمان دەگرت. ئیتر تاقمی چیو خەتی کوێ؟

ئەم هاوڕێیانە کە هاتنە دەرەوە. پێش هاتنیان بڕیارمان دابوو، بەشێک بن لە سەرکردایەتی. هەر لە شاردا بون، عەلی بچکۆلمان کردە ئامر هەرێمی کەرکوک. حەساسیەتێک، مایەی نیگەرانی قووڵ بێ، لەئارادا نەبوو. تەنها گفتوگۆ لەسەر کێشەی چونەکەیان بۆ ئێرانو نەچونە شاخیان هەبوو. ئەویش، پتر نەوشیروان مستەفا و بگرە مام جەلالیش، بەردەوام دەیانگوت: ئەگەر بچونایەتە شاخ، یەکێتی زۆر سەرکەوتوتر دەبوو. (باوکی ئاوارە- مەلا بەختیار) کە رەخنەکەشی لە ژمارە (٦)ی کۆمەڵەدا لەسەر

ڕۆشتنەکەیان گرتبوو، لەهەمان ڕوانگەوە گرتبووی، نەک پاڵنەری تری بوبێ. هەڵەش بوبێ لەکاتی بڵاوکردنەوەکە، بایی ئەوە نەبوو پوازێکی گەورەی ئایدیۆلۆژیو سیاسی بکوتێتە ڕیزەکانی کۆمەڵە. ڕونکردنەوەش لە کۆمەڵە بڵاوکرایەوە، کە نوسینەکەی باوکی ئاوارە بۆچونی خۆیەتی. بەڵام وتارەکەی باوکی ئاوارە بە مەرام گەورە دەکرا، بەوەش، توانییان ڕاستیەکانی مێژووی کۆمەڵە، هەڵەکانی کۆمەڵە، هەڵهاتنی سەرکردایەتی کۆمەڵە بەرەو ئێران، ناکۆکیە فکریەکانی کۆمەڵەو شکستی کۆمەڵە لە ئایدیۆلۆژیەتی ماویزمو پاشکۆیەتی چین، هەروەها کێشەگەلی ناو زیندانو چۆنیەتی توشکردنی کۆمەڵە لەو قۆناغە هەستیارەدا، هەمویان بە قەبەکردنی سوکە ڕەخنەکەی باوکی ئاوارە داپۆشی. لەمەشیاندا، لە کۆبونەوەکاندا، زۆرتر مام جەلال پشتیوانی هاوڕێیانی زیندانی کرد!

پێش هاتنەدەرەوەی ئەوان، کێشە لەنێوان بۆچونی نەوشیروانو ناوەندی کۆمەڵەدا هەبوو. ئەمیش تا ئەوکاتە بەو ڕادەیە نەبوو چارەسەر نەکرێ. بەڵام کە هاوڕێیانی زیندان هاتنەدەرەوە، دۆخەکەیان وا خوێندەوە کە خۆیان بدەنە پاڵ نەوشیروان-مام جەلال، سودی بۆیان زیاترە. دیارە لەناو خۆیشیاندا، لەسەر ئەمەش تەبا نەبون. بۆچونی جیاوازیان هەبوو. زۆرتر فەرەیدون عەبدولقادر جڵەوی دایە دەستی نەوشیروان. بە پاڵپشتی مام جەلال. هەڵبەتە، ناڵێم:

کۆمیتەی هەرێمەکان، یان ئەمو ئەومان، هەڵەمان نەکردووە. یان لایەنی کەم، وەکو نەوشیروان بەرنامەمان بۆ چۆنیەتی یەکخستنی توانای کۆمیتەی هەرێمەکانو هاوڕێیانی زیندان نەبوو. نەوشیروان، بە پای پیلان، داڵدەی دان. ئێمەش پلانمان نەبوو، ڕیزەکانی کۆمەڵە لە کۆمەڵە ڕاستەقینەکان پتەو بکەین. پەرە بە ڕێبازی کۆمەڵە بدەین. تێڕوانینەکانی زانستیانە بکەین. ئەوانیش هەناسەی هاوڕێیەتیان کورت بوو. یەکەمین کۆنفرانس، هەل بوو کۆمیتەی هەرێمەکانو هاوڕێیانی زیندان، لەخۆبوردوو بنو گرفتەکانیان چارەسەر بکەن. دەبوایە بە گیانی هاوڕێیانە، هاوڕێیانی زیندانمان تێبگەیاندایە کە کۆمەڵە لەبەردەم مەترسی قوتدانایە. ڕێبازی کۆمەڵە لەفەوتانایە.. هاوڕێیانی زیندانیش دەبوایە، پشویان درێژ کردباو تەقدیری تێکۆشانو دەربازکردنی کۆمەڵەیان لەسەر دەستی کۆمیتەی هەرێمەکان کردبا. کەچی هاوڕێیانی زیندان، وەکو مام جەلال-نەوشیروان کۆمیتەی هەرێمەکانیان پەراوێزخستو شەهید ئارامیشیان بچوک دەکردەوە! هەردوولا لەئاستی بەرپرسیارێتیەکەی کۆمەڵەو داکۆکی لە ڕێبازەکەی نەبوین. نەوشیروان هەلەکەی باشتر قۆزتەوە!! هەردوولاشمان باجەکەمان دا!

# ( ١٧ )
# عێراقچی، یان ساختەچی؟

ئەگەر قورقوشم بەسەر نوسەردا بتوێنیتەوە، دێوەزمەی عێراقچێتی بۆ دەردەچێ. لەکاتێکدا کێشەی نوسەر، نە عێراقچیەو نە کوردستانی، چونکە لە ئەسڵا، هەر بیروباوەڕی فەلسەفی، یان دیموکراسی نییە. بەڵکو وەکو کوردێک، لە ریزی کوردایەتیدا ماوەتەوە، بەلام بە خەسڵەتو خووڕەوشتی دەرونی خۆیەوە. تا ئێستاش بەری نەداوە. کەم نین ئەوانەی نیو سەدە پترە سیاسەت دەکەن، بەلام ئێستاش لە چەمکی زانستی سیاسەتو سەدان دەستەواژەی تیۆری تێناگەن. لەناو ئەمانەدا، هەیانە دڵسۆزانە تێکۆشاوون، هەشیانە چەشنی درەختی زڕن. نوسەر لە زڕەکەیانە. ئەگەر بە پێوەری سۆسیۆلۆژیای مەعریفە،[*] رەفتارو گفتاری ئەم زاتە بپێورێ، دڵنیام سەر لە فەیلەسوفەکانی ئەو بوارە دەشێوێ، چۆنی هەڵبسەنگێنن!

هەموو جارێک بیری لێدەکەمەوە، ئەگەر کۆمیتەی هەرێمەکان، تۆمەتی عێراقچی، مۆتەکەی ئارامو مەلا بەختیارو سالار، لە کۆمەڵەو شۆڕش دەربکەین، ئەم زاتە، دەبوایە وەکو شێت تەماشا کرابا. چونکە هەمیشە لە ئاژاوەگێڕیدایە. بەلام لە پەنای ئەو ململانێیەدا، دژی کۆمیتەی هەرێمەکانو عێراقچی..تاد، خۆی شاردۆتەوەو لەناو تەکەتولەکانیشدا، خەریکی ئاشوب بووەو بۆیشی چۆتە سەر. کێشەیەکی گەورەی تەکەتول ئەوەیە، هەلپەرست بۆی دەلوێ ئاژاوە بنێتەوەو راستیەکانیش زۆرجار دەشێوێندرێ.

لە کاتی ململانێی سیاسی-ئایدیۆلۆژیدا، رەوشی هەلپەرست، سەرهەڵدەدات. لەکاتی شەڕی ناوخۆشدا، بازرگانی شەڕو ئاغاو کوێخا چەکدارەکان دەبوژێنەوە. نوسەر، لە هەلپەرستە خەستەکانە!

لەژێر ناونیشانی کوردستانیو عێراقچی کۆمەڵەدا، لە لاپەڕە (٢٧٣)دا ئاوا دەهۆنێتەوە:

"کێشەی نێوان هەرێمەکانو کۆمیتەی شارەکان پاش گیرانی سەرکردایەتی لەوەدا نەبوو، کە کێشە بێ لەسەر کورسیو سەرکردایەتیو دەسەلات، چونکە ئەوکاتە خەڵکی بگرە چەندان لە ئەندامانی کۆمەڵەش خواخوای خۆشاردنەوەو دەست بەسەر کلاوداگرتنو خۆدوورەپەرێز راگرتن بوون".[١]

---

* سۆسیۆلۆژیای مەعریفە، لەو پەیوەندیە دەکۆڵێتەوە لەنێوان مەعریفەو بنەما کۆمەلایەتیەکاندا هەیە. بە پلەی یەکەم بایەخ بە مەعریفە (زانین)ی خەڵکی دەدات لە چوارچێوەی واقیعی ژیانی رۆژانەیاندا. د.نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد. سەرەتایەک دەربارەی سۆسیۆلۆژیای مەعریفە. چاپی ٢٠٢٠. ل(٧)

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٧٣).

کۆمیتەی هەرێمەکان، دامەزراندنی، ئەندامەکانی، بەرهەمەکانی، خەبات‌و سەرکەوتنەکانی لەمێژوودا تۆمار کراوون. بگرە هەر توێژینەوەیەک یان تێزی ماستەرو دکتۆرا لەسەر ئەو قۆناغە نوسرابێ، رۆڵی کۆمیتەی هەرێمەکان لە کۆتایی (١٩٧٥)وە بۆ سەرەتای (١٩٧٨) بەشی شێری بەردەکەوێ. داوا بکرێ نوسەر، نەک باسی دەستکەوت‌و سەرکەوتن‌و رۆڵی (کۆمیتەی شارەکان!) بە بەڵگەوە بکات، بەڵکو دەمانەوێ، بچوکترین ئاماژەی سەرکردایەتی پێشووی کۆمەڵە بە دامەزراندنی وەها کۆمیتەیەک باسبکات، کە ناوی (برایم جەلال)ی تێهاتبێ. یان نوسرابێ. یاخود باسکرابێ. واز لە (٤٥) ساڵی رابوردوو، واز لە نوسراوەکانی لەمەوبەر، واز لە توێژینەوەو تێزی لەمەوبەر دەهێنین، دەی با بفەرموێ ئێستاش قسە لەگەڵ ئەندامانی سەرکردایەتی پێشووی کۆمەڵە بکات‌و ئەوان بڵێن: بەڵێ کۆمیتەی شارەکان هەبووەو برایم جەلالیش، بەهۆی هەر شارێکی کوردستانەوە بوبێ، کرابێتە ئەندامی کۆمیتەی ناوبراو. ئێستاش قبوڵمانە.

دەشڵێ، ململانێی نێوان کۆمیتەی هەرێمەکان‌و کۆمیتەی شارەکان، لەکاتی هێرش‌و پەلاماری کۆمەڵەدا. لەسەر کورسی‌و دەسەڵات نەبووە:

"جگە لە مەرگ‌و گرتن‌و راونان‌و کوشتن، چ بەرهەمێکی تری نەبوو. بۆ کێشەی نێوانیان کێشەی بیروباوەڕی کوردستانی‌و عێراقچێتی پاشماوەی ساڵی ١٩٧١ بەدواوەی ریزەکانی کۆمەڵە بوو".[1]

شەرعی کوردانەیە.. سوپاس بۆ ئەم قسانە. ئەمەش بۆچونی ئێمەیە..

سەبارەت بە عێراقچێتی، ئەو هاوڕێیانەی سەرەتای کۆمەڵە بەناوی عێراقچییەوە، ریزەکانی کۆمەڵەیان بە دڵخوازی خۆیان جێهێشت‌و هیچ زیانێکیشیان نەگەیاندە کۆمەڵە، لە هیچ چاوپێکەوتنێکدا باسی (ئارام، سالار- من هەر هیچ) کە عێراقچی بوبن. یەک کەسیشیان باسی ناکات.

کاتێکیش، قۆناغی خەبات، هێندە سەخت بووە کە نوسەر باسی دەکات، سەرکردایەتی کۆمەڵەش کوردستانی جێهێشتبێ، کۆمیتەی هەرێمەکانیان کە دوای خۆیان دایانمەزراند، مانگێکی نەبرد، ئەمانیش یان گیران، یان هەڵهاتن، یاخود خۆیان شاردەوە. گرتنەوەی شیرازەی کۆمەڵە، جوامێری دەویست، لەو پەرش‌وبڵاوییە بیانهۆنێتەوەو بیانخاتەوە کۆڕی هونەری خەبات. ئاخر لەوکاتەدا، کە کۆمیتەی هەرێمەکانمان دامەزراندووەو دەستبەکار بوین، دەیان کادری شارەکانمان رێکخستەوە. کۆبونەوەمان پێکردن. چاپەمەنیمان هەیە. ئامادەکاریمان بۆ شۆڕش کردووەو بەرپاش کرا؛ یەک کادر، یەک شایەت، یەک نوسراو نابینیتەوە، شایەتی بدات،

---

١ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٧٣-٢٧٤).

یان دەربیخات، ئەوکاتە کۆمیتەی هەرێمەکان، وازی لە کوردستانی هێنابێ‌و ڕێبازی عێراقچی گرتبێتە بەر. خۆ ئەوکاتە، باشترین هەل بووە ئەگەر عێراقی بوینایە، هەڵەکە بقۆزینەوەو کوردستانیەکان دەربکەین‌و بانگەشەی عێراقچی بکەین. نەک بیروباوەڕی وا نەبووە، بەڵکو ژێراوژێریش بیری لێنەکراوەتەوە. بەڵام عەرەب گوتەنی (تعال فهم حجی احمد اغا).

لەسەر رقە سیاسیەکانی بەردەوام دەبێ‌و لە لاپەڕە (٢٧٤)دا دەڵێ:

"کێشەی جیاوازی بیروڕاو بۆچوون بوو، لەسەر دیاریکردنی قۆناغی کۆمەڵگای کوردی‌و باری ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و فەرهەنگی کوردستان‌و جیاوازی لەگەڵ قۆناغی کۆمەڵگای عێراقی لەو ڕوانەوەیان لێکچوونیان".[1]

کام بیروبۆچون؟ چ قۆناغێکی کۆمەڵی کوردی؟ کیها باری ئابوری؟ کامە کۆمەڵایەتی‌و فەرهەنگی کوردستان؟ چۆن جیاوازیەکی قۆناغی عێراقی‌و لێکچونیان؟! وشە و دەستەواژە هەڵڕشتن ئاسانە، چۆنیەتی سەلماندنی گرانە.

لەخۆیەوە باسی چینی کرێکاران، خەباتی نەتەوایەتی، داگیرکردن‌و پارتی پێشڕەوی یەک چینی کرێکارانی سەرانسەر، یان هی دوو نیشتمانی جیاواز دەکات. عەرەب بەم نوسینانە دەڵێ (نمطی) بەدرێژایی مێژووی خەباتی کۆمیتەی هەرێمەکان، هەتا بەرپاکردنی شۆڕش‌و پەلاماردانی ئالای شۆڕشیش، سەرکردەیەک، یان نوسەرێکی ناو کۆمەڵە، نەیوتوەو نەینوسیووە کە کوردستان‌و عێراق جیاواز نین. نەشوتراوە دۆخی چینایەتی کرێکارانی کوردستان‌و عێراق، چونیەکن. بەڵام ئەم وشەبازو لەخۆڕازییە، سەر لە خوێنەر دەشێوێنێ‌و دەشیەوێ رقەکانی بخاتە قاڵبی تیۆریەوە. جەخت دەکرێتەوە کە تاقە رستەیەک، یان لاپەڕەیەک، یان ئاخاوتنێکی ئەندامێکی کۆمیتەی هەرێمەکان بدۆزێتەوە، پشتیوانی بۆچونەکانی بکات لەسەر عێراقچێتی، ئێستاش هەقی دەدەینێ. بەڵام بەڵگەی وا نییە. دەنا لەبری ئەم هەموو رستەسازییە، بەڵگەکانی دەنوسی‌و دەیبڕییەوە.

ئەوەی جێگەی رامانێکی قووڵە، کۆمەڵە، لە دامەزراندنیەوە هەتا هەڵیشوەشایەوە، نەیتوانیبوو تێزە چینایەتی‌و نەتەوەییەکانی، هاوچەرخانەتر لە تێزی چەپە کلاسیکیەکان‌و ناسیۆنالیستە دێرینەکان، فۆرمیلا بکات. بەڵکو بۆچونە چینایەتیەکانی کۆمەڵە، لەسەر بنەمایەکی لاوازی تیۆری زانستی، یان جیاوازی روانگەی چینایەتی بۆ خەباتی رزگاریخوازی نەتەوەیەکی ژێردەستە، گەڵاڵە بکات. واتا: کۆمەڵە، هەم لە رووی تیۆرییەوە، هەم لە رووی ستراتیژی رزگاری نەتەوایەتیەوە، قووڵتر لە لایەنە چینایەتی‌و نەتەوەییەکانی پێش خۆی، بەرنامەو ستراتیژی دانەڕشتبوو.

---

١ هەمان سەرچاوە. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٧٤).

که کۆمەڵە دادەمەزرێ (٢٤) ساڵ بەسەر دامەزراندنی پارتیدا تێدەپەڕێ. (٣٠) ساڵ دوای دامەزراندنی پارتی، شۆڕش بەرپا دەکات. کەچی لەناو هەمان بازنەی دیموکراسی بۆ عێراق‌و ئۆتۆنۆمی راستەقینە بۆ کوردستان، تێدەکۆشێ. جگە لە دارشتنی پەراوێزی وتارەکان، جیاوازییەکی بنچینەیی لە تێزەکان‌و لێکدانەوەکاندا، لەلایەن کۆمەڵەوە، باسنەکراوە.

لە رەوشی سیاسیشدا، کۆمەڵە سەرەتا نەیدەویست لە هێزەکانی پێش خۆی بچێ، کەچی کەوتەوە ناو هەمان خەسڵەتەکانی شەڕی ناوخۆ. ئەو خەسڵەتە نەگریسەی شەڕی ناوخۆی بەرهەم هێنا، کۆمەڵەش نەیتوانی خەباتی نەتەوایەتی پاسیفیزم (ناچالاک.. یان موتوربەنەکراو بە روناکبیری پێشکەوتوو) تێبپەڕێنێ. ئەمە لەکاتێکدا، مشت‌ومڕە چینایەتی‌و نەتەوایەتیەکانی ئەوکاتە، لە قۆناغی ئابوری-سیاسی-ئایدیۆلۆژی سەردەمی دامەزراندنی پارتی‌و بزوتنەوەی نەتەوایەتی، تێپەڕیبوو. مەسەلە نەتەوەییەکان‌و تیۆریەکان، سەرلەنوێ مشتوماڵ دەکرانەوە. بەڵام کۆمەڵەو یەکێتی.. لە فۆرمە کلاسیکیەکەدا، گیریان خواردبوو!!

## ( ١٨ )

## ئارام‌و دژە نەزۆکەکان

لە درێژەی ئەو رستەبازییە بۆ گومراییکردنی خوێنەر لەمەڕ راستیەکان، دەیەوێ وای پیشانبدات نوسەر وەکو رابەر بەرامبەر رابەر، نامەی بۆ ئارام نوسیووە. ئەشلێ (بەئیلحاحەوە) شەهید شیهاب‌و (هەندێ لە سەرکردایەتی!) داوایان لێکردووە کە هاوکاری کۆمیتەی هەرێمەکان بکات. بڕوانن نەرجسیەتی گەیاندۆتە کوێ:

"پاش چوون بۆ ئەبوغرێب و وەرگرتنی بڕیاری هەندێ لە ئەندامانی سەرکردایەتی بەتایبەتی (شەهید شەهاب) کە بە ئیلحاحەوە داوای لێکردین لەگەڵ کۆمیتەی هەرێمەکان هاوکاری بکەین و هەموو ناکۆکیەکانی نێوانمان بخەینە لاوەو بەڵگەش، ئاڵوگۆڕی ئەو نامانەی نێوان من‌و ئارام‌و کۆمیتەی هەرێمەکانە".[1]

لەبەرامبەر دەرون ئاڵۆزێکی وادا، مەگەر پێبکەنین. ئاخر کەسێک کۆنترۆڵی سیالۆژی لەدەستنەدابێ، خۆی تا ئەو رادەیە هەڵدەکێشێ، درۆی وا بهۆنێتەوە. گوایە:

- بڕیاری لە هەندێ ئەندامی سەرکردایەتی وەرگرتووە.
- بەتایبەتی شەهید شیهاب ئیلحاحی لێکردووە.

---

١ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٧٥).

- هاوکاری کۆمیتەی هەرێمەکان بکات.
- نامەی لەگەڵ شەهید ئارام گۆڕیوەتەوە.
- ناکۆکیەکانی خستۆتە لاوە.

واوو.. لەم رابەرە!! چۆن دەریدەخات، دوو رووە، لەنێوان کۆمیتەی هەرێمەکانو هاوڕێیانی زیندان. خۆی دەڵێ: لەگەڵ هەندێ لە سەرکردایەتی دواوە. واتا: هەندێکی تری بەهەڵەبردووە. شیهاب پێیوتووە هاوکاری بکات.. کەوابێ، بۆچی نوسەر کە رابەری کۆمیتەی شارەکان بووە، شیهاب، متمانەی پێنەکردووە؟! یان هیچ بڕیارێکی پێنەداوە؟! یاخود پێی نەسپاردووە چۆن لەگەڵ کۆمیتەی هەرێمەکاندا رێکبکەوێ؟ (ئیلحاحەکە)ی شیهاب، بە رەسمیەت ناسینی کۆمیتەی هەرێمەکانە لای سکرتێری پێشووی کۆمەڵە.

دەشڵێ نامەم لەگەڵ شەهید ئارام گۆڕیوەتەوەو نامەکانیشم لە پاشکۆی کتێبەکەدا بڵاوکردۆتەوە. رەنگە نامەی بۆ شەهید ئارام نوسیبێ، رەنگە وەڵامیش درابێتەوە. بەڵام لە پاشکۆدا هیچ نامەیەکی بڵاونەکردۆتەوە، پێدەچێ بیری چوبێ؟!

لە هەموو ئەو قسانەش سەیرتر، دەنوسێ، هاوڕێیانی زیندان داوایـان لێکردووە ناکۆکیەکان بخاتە لاوە. ئەگەر هاوڕێیانی زیندان داوای وایان لێکردووە، کەواتە ئەم برادەرە شینی بۆ کێ کردووە؟ دیارە شیهابو ئارام، ژێربەژێر عێراقچی بوون!

خۆ ئەم قسانە دەیسەلمێنێ، نوسەر لە ریزەکانی کۆمەڵەدا، بەشێکی سەرەکی ئاژاوەنانەوە بووە. هاوڕێیانی زیندانیش ناسیویانە کە هۆگری کێشەو ناکۆکییە، بۆیە داوایان لێکردووە، چیکە درێژە بەو ناکۆکییانە نەدات، چونکە لە دۆخی جەزرەبەلێدانی کۆمەڵەدا، زیانی هەیە.

سەیر ئەوەیە، هەمیشە پەیام گۆڕینەوە لەنێوان شەهید ئارامو کۆمیتەی هەرێمەکانو هاوڕێیانی زیندان هەبووە. بۆ تاقە جارێکیش داوایان نەکردووە، چۆن لەگەڵ نوسەر یان (کۆمیتەی شارەکان) قسە بکەین. هەستی شەهید ئارامیش باش دەزانم بەرامبەر شەهید شیهاب، کە چەند رێزی دەگرتو بە رابەرێکی دیموکراتو راستگۆی دەزانی.. هەر راسپاردەیەکیشی بناردایە، بەقسەی دەکرد.

قەڵەمی ئاژاوە، لەناو کۆمەڵە هەڵدەگرێو سەرگوزشتەیەکی تر دەهۆنێتەوە:

"بەڵام هەر لەپاش هاتنەدەرەوەی "عەلی عەسکەریو د.خالید سەعید"و سەرکردایەتی بزووتنەوەو کارکردن بە بڕیاری هاوبەشی بەرەیی لە یەکەم هەنگاوەوە دەبوایە کۆبوونەوەی هاوبەشو دیاریکردنی ئەرکەکانو رابەرایەتی هێزی پێشمەرگەیان بکردایە، بەپێچەوانەوە کۆمیتەی هەرێمەکان نەک هەر هەڵوێستی دژایەتیان لەڕووی کارو پڕوپاگەندەشەوە بەرامبەر بزووتنەوە گرتەبەر، بەڵکو بەرامبەر هاوڕێیانی کۆمەڵەی سەر

به کۆمیتەی شارەکانیش هەمان هەڵوێستیان هەبوو".[1]

لەمەوبەر، ئاراستەی قسەکانی دژی بزوتنەوەی سۆسیالیستی بوو. بەتایبەتی کە هاتە سەر کارەساتی هەکاریو ئەو دەسەڵاتانەی لەلایەن مام جەلالەوە، پێیاندەدرا. ئێستا، بۆئەوەی کۆمیتەی هەرێمەکان بە رقە بەردەوامەکانی رەخنەئاژن بکات، دەنوسێ کە لە یەکەم هەنگاوەوە دەبوایە کاری هاوبەش بکرایە، کەچی پێچەوانەکەیان دژی بزوتنەوەو کۆمیتەی هاوبەشیش کردووە. دیسان ناچار دەبین، ئەو بۆچونە بێسەروبەرانە، کەرت کەرت بکەینو هەر کەرتێکی شیبکەینەوە. دەنوسێ، دەبوایە: کاری هاوبەشی بەرەیی بکرایە..

کێ ئەم بڕیارەی داوە. یەکێتی نیمچە بەرە بووە. کە هاتنە دەرەوە، هەتا کۆبونەوەی دۆڵی گۆستێ، دوای گەڕانەوەی مام جەلال و نەوشیروان، بزوتنەوە هێشتا بەرەسمی لەناو نیمچە بەرەی یەکێتیدا، قبوڵ نەکرابوو. لەگەڵ ئەوەشدا، سەرکردایەتی ناو وڵات بەهاوبەشیی دانرا. مەفرەزەو کەرتی هاوبەش پێکهاتن. پۆستەکان دابەشی هاوبەشی دوو لایەنە کران.. ڕاگەیاندنی عەسکەریو سیاسی هاوبەش دەردەکران..تاد. بۆئەوەی ئەم لە مێژووی یەکێتیو لە چۆنیەتی دروستبونی بزوتنەوەی سۆسیالیستو هاتنە ناو یەکێتییان، باشتر تێبگات، بە بۆچونێکی مام جەلال بۆی روندەکەمەوە، کە چەند بێخەبەر بووە لە راستیەکان. مام دەڵێ:

"ئەوان بەناوی (بزووتنەوەی سۆسیال دیموکراتی کوردستان)ەوە هاتبونە دەرەوە، بڕیاریاندابو کە ڕێکخستنەکەیان بێتە ناو یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە. ئەوە مەرجی عومەر دەبابەو عەلی عەسکەریو دکتۆر خالید بو، بۆئەوەی رەسوڵ مامەندو ساڵح یوسفیو ئەوانی تریش لەم ڕێکخستنەدا بەشدار بن.

ئەوەی راست بێت، ئێمە ئەو کارەمان پێ خۆش نەبو، چونکە ئێمە پلانمان وابو یەکێتی نیشتمانی کوردستان، وەک یەک ڕێکخراوی جەماوەری گەورە دروستبکەین، لەناویدا کۆمەڵە هەبێت وەک ڕێکخراوێکی مارکسی لینینیو ئەوەی تر خەڵکی دیموکراتو شۆڕشگێڕ بێتو بەهەمو، یەک ڕێکخستن دروست بکەینو تێکەڵاوبین.

بەڵام ئەو ڕێکخستنە تازەیە واقعێک بو، بو بە توشمانەوە، ئەو برادەرانە هاتبونە دەرێو لەناوەوەش لەگەڵ ئارامو برادەرانی کۆمەڵە ڕێکەوتبون، پەیوەندیان دروستکردبو".[2]

ئەم قسانەی مام جەلال، هەندێک واتای مێژوویی روندەکاتەوەو سەراپاشی دژی بۆچونەکانی برایم جەلالە. وەکو:

---

١ هەمان سەرچاوە. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٧٥).

٢ مام جەلال. دیداری تەمەن- لە لاوێتییەوە بۆ کۆشکی کۆماری. بەشی دووەم. ئامادەکردنی: سەلاح رەشید. چاپی یەکەم.٢٠١٧ ل(٦٥-٦٦).

**یەکەم**: کە یەکێتی دامەزراوە، ڕێکخراوێک بەناوی بزوتنەوەی سۆسیالیست لەئارادا نەبووە.

**دووەم**: دوو بۆچونیان هەبووە. عومەر دەبابەو عەلی عەسکەریو د.خالید، هاتنەناو یەکێتییان پێ باش بووە. ڕەسول مامەندو ساڵح یوسفیو ئەوانی تریش.. جیاواز بیریان کردۆتەوە.

**سێهەم**: مامو دەستەی دامەزرێنەر، دامەزراندنی بزوتنەوەیان پێ خۆش نەبوو.

**چوارەم**: مامو دامەزرێنەران ویستویانە یەکێتی وەکو ڕێکخراوی جەماوەری بێ، نەک بەرەیی یان نیمچە بەرەیی.(*)

**پێنجەم**: تەنها کۆمەڵە وەکو ڕێکخراو لەناو یەکێتی بێت.

**شەشەم**: باڵی تر نەبێتو تێکۆشەرانی تر سەربەخۆ بن.

**حەوتەم**: بزوتنەوە وەکو ئەمری واقیع بووە بەتوشیانەوە.

**هەشتەم**: ئارامو کۆمەڵە لەگەڵ بزوتنەوە ڕێکەوتوون.(+)

ئێستا ئەگەر نوسەر ئەم بۆچونەو بۆچونی تری مام جەلالی، لە کتێبی ناوبراو خوێندۆتەوە، کەواتا: قسەکانی هەر بە ڕق کردووە. خۆ ئەگەر ئەم کتێبەیشی نەخوێندۆتەوە، کەوابێ: بێئاگایە لە مێژووی یەکێتیو لە بۆچونی دامەزرێنەرو سکرتێری یەکێتی. نوسینێکیش، ئاوا بێ زانیاری نوسرابێ، هەر بۆ خەیاڵی نوسەرو هاوخەیاڵەکانی باشە.

لەکۆتایی ئەو پەرەگرافەدا، شوڵی ڕابەرایەتی لێهەڵکێشاوەو خۆی بەرامبەر ڕابەرانی بزوتنەوەش کردۆتە جەمسەری کۆمیتەی شارەکان. لەوەدەچێ کۆمیتەی شارەکان، ڕێکخراوێکی ماسۆنی بوبێ کە نە لە شارو نە لە شاخدا، ئاشکرا نەکراوونو بە نهێنی کاری خۆیان کردووە.

– گریمان لە شاردا، لەترسی بەعسو لەبەر هەژمونگەری کۆمیتەی هەرێمەکان، کۆمیتەی شارەکان، بە شاردراوەیی ماوەتەوە.

---

* ئەم بۆچونەی مام جەلال، کە یەکێتی جەماوەریی بێ، پێش هەڵوەشاندنەوەی جەلالیەکان هەمان بۆچونی هەبووە. کە ویستویەتی یەکێتیش دابمەزرێنێ، هەمان ئامانجی هەبووە. بەڵام سەرەتا بۆی نەچۆتە سەر. کە گەڕانەوە کوردستان، ویستیان لەگەڵ نەوشیروانو عەلی عەسکەریو د.خالید، حیزبێکی جەماوەریی وا دروستبکەن. بەڵام هەر بۆیان نەچووە سەر. کە نەوشیروان بە پشتیوانی مام جەلالو هاوڕێیانی زیندان، لە یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەدا زاڵبوو، لە دووەمینو سێهەمین کۆنفرانسیشدا، کۆمەڵەیان کۆنترۆڵ کرد، ئیتر زەمینە تەخت بوو، کۆمەڵە هەڵبوەشێننەوەو یەکێتی بکەنە، ئەو حیزبە جەماوەریەی سەرەتا دەیانویست یەکێتی پێ دابمەزرێنن!!

+ کە مام جەلال باسی ڕێکەوتنی ئارامو بزوتنەوە دەکات، مەبەستی ئەو ڕێکەوتنە بەربەست بووە لەبەردەمیاندا یەکێتی بکەنە حیزبی جەماوەریی!

- ئەی کە برایانی بزوتنەوە هاتونو دەردی نوسەر نوسیویەتی کۆمیتەی هەرێمەکان پروپاگەندەیان بەرامبەریان کردووە، دەی ئەوکاتە فرسەت بووە کۆمیتەی شارەکان بدەنە پاڵ بزوتنەوەو بەرگری لەخۆیان بکەن. ئەمەشیان نەکردووە.. ئەنەیسە..

- ئەی کە مام جەلال هاتەوە، بۆچی کۆمیتەی شارەکان خۆیان رانەگەیاند..؟ ئەمیش دەکەینە خاتری نوسەر.

- دوای ئەوەی نوسەر هاتبووە دەرەوە، خۆ دەیزانی ناکۆکی لەناو کۆمەڵەو نەوشیروانو مام جەلالو بزوتنەوەش، سەرەتاکەی دەرکەوتبوو، لەم کاتەدا بۆ کۆمیتەی شارەکانی قوت نەکردەوە.. بابە ئەمیش قەیناکا..

- دوای هاتنەدەرەوەی هاوڕێیانی زیندان، بۆ باسی غەدرو چەوساندنەوەی کۆمیتەی شارەکانی نەکرد؟ وەڵامی ئەمەیان رۆشنە، چونکە هەڵبەستنەکانی سەبارەت بە کۆمیتەی شارەکان راست نەبوونو دەترسا هاوڕێیانی زیندان بەدرۆی بخەنەوەو پێی بڵێن: نە کۆمیتەی شارەکانمان دروستکردووەو نە تۆشمان کردۆتە ئەندامی هیچ کۆمیتەیەک..

کە زانی کورتە فیلمی کۆمیتەی شارەکانی سوتا، دوای هاتنەدەرەوەی هاوڕێیانی زیندان، ئینجا لایداو بایدا بەلای دەرهێنانی فیلمی درێژی عیراقچیو کوردستانی. بەداخەوە تێچووی ئەم فیلمە (انتاج)ەکەی لەسەر هاوڕێیانی زیندان بوو!!

بەڵام، کاتێک رێکخراوێکی وەکو کۆمەڵە، بەبێ بنەمای فکریو ئایدیۆلۆژی، کێشەی عیراقچێتی بۆ دژایەتی ناوخۆ دروستدەکات، بە ئاراستەی پیلانگێرانیش، لەناو کۆنفرانسەکانی کۆمەڵەدا، درێژە بەم ململانێ دەستکردە دەدرێ، بێگومان، ئەم جۆرە ناکۆکیو ململانێ دەستکردە، کاریگەری نالەباری لەسەر پێگەی کۆمەڵە دەبێ. کاریگەرییەکەش، لە ناوخۆی کۆمەڵەدا، دەبێتە مایەی قووڵکردنی کێشەکان. لەدەرەوەی یەکێتیش، سوود بە دژەکانی کۆمەڵە دەگەیەنێ. لە دوا سەرەنجامیشدا، ئەو کەسانە سوود لە قووڵکردنی ئەو ناکۆکیانە دەبینن، کە خۆیان ناوەتەوە کۆمەڵە لەناو یەکێتیدا قوتبدەن. هەر واشی لێهات.

لەدوای ئاڵای شۆڕشو ئەو تاوانانەی بەرامبەری کران، ئەگەر بەشێکی سەرکردایەتی کۆمەڵەو کادرەکانی، بەرگرییان لە پاراستنی کوردستانیەتو سەربەخۆییەکەی کردبا، قسەکانیانو رەخنەکانیان دژی کۆمیتەی هەرێمەکانو ئاڵای شۆڕشیش، تا رادەیەکی باش، باوەڕی پێدەکرا. بەڵام کە هەموویان بە هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە رازی بون، کەواتا: هەموویان بەرپرسیارێتی مێژوویی هەڵوەشاندنەوەکە هەڵدەگرن. کۆی پیلانو رەخنەکانیشیان لە کۆنفرانسەکانی کۆمەڵەداو ئەو هەڵمەتەی کردیشیانە سەر ئاڵای شۆڕش.. مایەپوچ دەردەچێ!!

# رشتەی پێنجەم:

## نەخۆشی عێراقچی‌و بنکەی سوور!

١- داتاشینی بنکەی سوور!!
٢- پروپاگەندە، دەرەبەگ، ئاین
٣- کومەڵەو یاسا، بەرەو ئامۆژگاری
٤- عێراقچی زۆرەملێ!!
٥- دورەپەرەریزیی دیموکرات‌و یەکێتیی
٦- کومەڵەی زەحمەتکێشان‌و یەکێتیی
٧- سوڵتانی‌و نوسەری شەرمەزار!
٨- سوڵتانی‌و گومانی جەنەراڵ!
٩- سوڵتانی‌و جوتیارێک!
١٠- درەنگ درکاندنی تاکڕەوایەتی!!
١١- نەریتی سکرتێرەکانی کومەڵە
١٢- جەنگی عێراق-ئێران‌و یەکێتی!
١٣- قۆناغی نوێ‌و هەڵەی ستراتیژی
١٤- وەرنەچەرخان‌و رواڵەت
١٥- شەڕی ناوخۆی قۆناغی نوێ
١٦- هەڵگەڕانەوە لە هەرێمی یەک
١٧- هەرێمێک هەمیشە لە کەمین
١٨- یاخیبون‌و خۆدزینەوە!
١٩- قین لە دڵیی، یان پابەندیی؟
٢٠- تەسلیمبوونی نەوشیروان!

( ١ )

## داتاشینی بنکەی سوور!

مرۆڤ، ئەگەر قەڵەمی هەڵگرت، پێش ئەوەی پەیامی مێژوو، یان رای گەل، یاخود حیزبو هاورێکانی لەبەرچاو بگرێ، پێویستە ویژدانی خۆی بکاتە سەرچاوەی راستیەکان.. تەنانەت دژی خۆیشی. بەڵام، هەموو رستە، پەرەگراف، لاپەڕەو بەشێکی ئەم بەناو کتێبە، نەک ویژدانی نوسەر، بەڵکو بچوکترین رێز لە راستیەکانی مێژوو ناگرێو لایەنی کەمیش، رەچاوی هەستی خەڵکو یەکێتیو هاوسەنگەرەکانی ناکات. هیچ حوکمێکم لەسەر نوسەر نییە، تەنها ئەوە نەبێ، کە نەخۆشەو خۆی لەرووی دەرونیو خووڕەوشتەوە چارەسەر نەکردووە.

سەیری هەڵبەستنی نوسەر لەسەر بەناو (بنکەی سوور)ی قەراغ بکەینو بزانین چۆن دایتاشیووە:

"لەلایەکەوە ناوەندێکی بنکەی سووری شۆڕشیان لە قەرەداغ دانا بوو، کە سەرچاوەی هەموو بڕیارو فەرمانەکانی ئارامو کۆمیتەی هەرێمەکان بوو، بۆ مەفرەزەو پێشمەرگەو کادرەکانی کۆمەڵەی سەر بەو کۆمیتەیە، بەڵام لەلایەکی تریشەوە مەلا بەختیارو سالار عەزیزیان بەرامبەر "عەلی عەسکەریو د.خالید سەعید" دانابوو، بۆ سەرپەرشتی کردنی هێزی پێشمەرگەو رێکخستنەکانی یەکێتی".[١]

سالح یوسفی رەحمەتیی، شیعرێکی لە ساڵی ١٩٧٤ دا نوسیو لەلایەن تیپی مۆسیقای سلێمانیەوە کرایە سرود، بەناوی (هاوارە براینە هاوارە) منیش دەڵێم: هاوارە هاوڕێیان هاوارە. ئەم دەرون ئاڵۆزە. لە هەموو نەرێتێک چۆن گەیاندویەتیە ئەوپەڕی داشۆراویی. بۆئەوەی وا نەزانرێ غەدر لە نوسەر دەکەین، فەرموون بزانن تەنها لەو پەرەگرافەدا چەندی رستووە:

- ناوەندێکی بنکەی سووری شۆڕشیان لە قەراغ دانابوو. ئەمەیان هەڵبەستنێکی شاخدارە.. چونکە شەهید ئارام باوەڕی بە ماویزمیش نەمابوو، چ جای بە بنکەی سوور، کە لەگەڵ باری بابەتیی کوردەواری نەدەگونجا.

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٧٦).

- سەرچاوەی بڕیاری بنکەکە گوایە ئارامو کۆمیتەی هەرێمەکان بووە. ئەگەر وایە، ئەی بۆ کۆمیتەی هەرێمەکان لەناو یەکێتیدا مایەوە؟ ئەی بۆ بە دەستپێشخەری کۆمیتەی هەرێمەکان، دەستەی دامەزرێنەری سەرکردایەتی وڵات پێکهێنرا؟ ئەی بۆ کۆمیتەی هەرێمەکان بەناوی یەکێتیو شۆڕشەوە، بەیاننامەو بەلاغی عەسکەرییان دەردەکرد؟ ئەی بۆ شەهید ئارام (الاتحاد الوطني لماذا؟)ی وەرگێڕا بۆ سەر زمانی کوردی؟ ئەوەندە بەڵگە زۆرن هەڵبەستنەکانی هەڵبوەشێنینەوە، نوسینەکە دەبێتە درێژدادڕیی.

- مەلا بەختیارو سالار عەزیزیش، بەرامبەر عەلی عەسکەریو د.خالید سەعید دانرابوون.

قسەکانی سەرەوەمان بەدرۆخستنەوەی ئەم بۆچونەشە. تەنها هێندە دەڵێین: بەداخەوە، کۆمیتەی هەرێمەکان، بەرگریکردن لە کۆمەڵەیان نەگەیاندە، ڕێکەوتنێکی نوێ لەنێوان باڵەکانی یەکێتی لەناو یەکێتیدا. وەکو کۆمیتەی هەرێمەکان، لە یەک بەرگریلێکردنی کۆمەڵە پاشگەز نین. تەنها ئەو ڕەخنەیە لە کۆمیتەی هەرێمەکان دەگرم، کە هەروەکو سەرکردایەتی پێشووی کۆمەڵە، بەبێ ڕێکەوتن، لەکاتی تێکەڵاوکردنی کۆمیتەی سەرکردایەتی ناو وڵاتو دەستەی دامەزرێنەر، سەرەڕای جیاوازیی بیرکردنەوەو ڕەخنەکانمان، قبوڵمان کرد، لە چوارچێوەیەکی تەنگەبەردا لەناو یەکێتیدا بمێنینەوە!! ئەمەش کاریگەری نالەباری لەسەر ڕەوتی ڕوداوەکان هەبوو. لێکەوتەکانیشی، لە کۆنفرانسەکانی کۆمەڵەوە، بە زیانی کۆمەڵە دەرکەوتن!

لە درێژەی ئەو بۆچونە گومڕاییانەیدا، ئاوا درێژە بە هەڵبەستراوەکانی دەدات:

"لەلایەکەوە پەیڕەوی پێشمەرگەو ئۆرگانی تایبەت بە کۆمیتەی هەرێمەکان (ئاڵای شۆڕش)یان دەرکردو دەبوایە هەموو کادری سیاسیو پێشمەرگانەی کۆمەڵە، کاری پێ بکردایە کە هەر کەس بە وردی بیانخوێنێتەوە، هیچیان لە ڕێنماییو ئۆرگانی شۆڕشێکی نەتەوایەتی ڕزگاری نیشتمانی ناچێ، بگرە لە هی شۆڕشێکی چینایەتی وەک ڤێتنام....هتد دەچێ. بەڵام لەلایەکی تریشەوە لەناو سەرکردایەتیەکانی یەکێتیشدا تا گەڕانەوەی "مام جەلال"، پەیڕەوی ڕێنماییەکانی "مام جەلال"یان دەکرد".[1]

لەمەشیاندا، مێژووی نوسراوی شێواندووە. نەک مێژووی فۆلکلۆر! کە فۆلکلۆر نوسەرەکەی، یان هۆنینەوەکەی نەزانراوە. با ئەمەشی بۆ شیبکەینەوە.

١ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٧٦).

- پەیڕەوی پێشمەرگە، بە چاپکراوی لە بەرگی یەکەمی کتێبەکەی شەهید ئارامدا، هەیە، بەناوی یەکێتیەوە نوسراوە.

-ئاڵای شۆڕش.. تاقە ژمارەیەکی، ساڵێک دوای بەرپابونی شۆڕش‌و ساڵ و نیوێک دوای نوسینی پەیڕەوی پێشمەرگە، وەکو هەوڵێکی ئۆرگانیی تیۆریی، دەرکرا. ئەگەر بۆ هاوڕێیانی کۆمەڵەش دەرکرابێ، ئاساییە.. هەرچەند دەدرایە هەموو کەسێک.

-ئاڵای شۆڕش.. لەو تاقە ژمارەیەدا، شۆڤێنیەتی بەعسی قانگ داوە بەرامبەر کوردو شۆڕش.. هەموو دژایەتیەکی شۆڤێنیەت، واتا: بەرگریکردن لە کێشەی نەتەوایەتی.

-تا گەڕانەوەی مام.. پەیڕەوی لە ڕێنماییەکانی کراوە.. ئەمەیان لەگەڵ قسەکانی پێشوودا چەندی بە چەند؟

ئایا ڕێنماییەکانی مام جەلال دامەزراندنی بنکەی سوور بوو؟ ئایا ڕێنماییەکانی دژایەتی عەلی عەسکەری‌و د.خالید بوو؟

بۆئەوەی خوێنەر بۆچونی ئارام‌و کۆمیتەی هەرێمەکان لەمەڕ مارکسیزم، بنکەی سوور، بەبەڵگەوە بزانێ، بڕوانن ئارام چی دەڵێ:

"ئەبێ بە وردی‌و زۆر هۆشیارانە کار بکەین‌و ئەبێ بزانین کە ئەگەر ڕاستەوخۆ بەناوی مارکسیزم-لینینیزمەوە بچینە ناو خەڵکەوە (ردفعل)ی زۆربەی جەماهیر سەلبی ئەبێ، چونکە هێشتا ڕەفتاری مارکسیانەی ڕاستیان نەدیوە لەبەرئەوە ئەبێ پێشەکی بەکردەوەی ڕاست بە شیکردنەوەی ناوەڕۆکی بیروباوەڕی م.ل بۆیان کە بێگومان ئەم (ناوەڕۆکە)یان لا پەسەندە بچینە ناویان‌و بەو بیروباوەڕە پەروەردەیان بکەین. ئەوە تەنیا ڕێگەی ڕاستە بۆ سڕینەوەی ئەو هەستەی کە لەناو جەماهیردا دژی ئەم بیروباوەڕە چێنراوە".[1]

ئەوە بۆچونی شەهید ئارام‌و کۆمیتەی هەرێمەکان بووە. کە چەند بە وریاییەوە، هەوڵدراوە فەلسەفەی مارکسیزم-لینینزم لەناو خەڵکدا، بڵاوبکرێتەوە. ئیتر بنکەی سووری چی؟ دیسان بەداخەوە، ئەو ڕێبازە سەربەخۆییەی کۆمەڵە، نەپارێزرا. هەتا بە پیلان، کۆمەڵە لەناوبرا!

---

١ هەڵبژاردەیەک لە نوسینەکانی شەهید ئارام. ناوەندی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان-عێراق- چاپخانەی شەهید برایم عەزو. ١٩٨٠. ل(٥٥).

## (٢)
# پروپاگەندە، دەرەبەگ، ئاین

لەوەدەچێ نوسەر کاتی نوسینی ئەم بابەتانە، خۆی بە ئەوپەڕی سەرکەوتوو زانیبێ‌و هەندێک لە کۆنە قینەکانی دامرکابێتەوە، بۆیە بەئارەزووی خۆی پێی لێهەڵبڕیووە. چونکە کرابووە ئەندام پەرلەمانی عێراق (نەک چوار پارچەکەی کوردستان!) بە مۆڵیی مانگانە زیاتر لە (٣٥) ملیۆن دیناری دەستدەکەوت. ئیتر لە بەغدادی پایتەختی کێشە دیموکراسیەکانی عێراق بۆ (کوردستان-عێراق) ململانێ دروستکراوەکانی شاخ‌و ناو شۆڕشی، هەر بیر نەمابوو. مڕ مڕ، روداوەکانی هەڵگێڕاوەتەوە. بزانین چی زیاتری داتاشیووە:

"لەلایەکەوە پروپاگەندە و خوتبەو وەعزو ئیرشادی ئەو برادەرانە لە هەموو گوندەکان‌و لەناو جەماوەرو پێشمەرگە بریتی بوو، لە پێکهێنانی بنکەی سوور و ئاراستەکردنی شۆڕش بە شۆڕشی چینایەتی‌و جێبەجێکردنی هەردوو ئەرکە چینایەتی‌و نەتەوایەتیەکە رابەری پارتی پێشڕەوی چینی کرێکاران‌و دژی داگیرکەر و دەرەبەگایەتی‌و خێڵەکی‌و عەشایەرو شێخ‌و مەلاو دینە. ئەم رەفتارکردنە تەواو پێچەوانەی یاساکانی کاری بەرەیی‌و رێزگرتن لە بیروڕای رێکخراوو حزبی ترو بەشداری لە شۆڕشدا بوو".[1]

هەموو ئەوانەی ئاگاداری سەرەتاکانی شۆڕش بوون، باش دەزانن کە لەناو شۆڕشداو لەناو دێهات‌و جوتیارانی بەئەمەکدا، زۆربەی کۆبونەوەکان بەناوی یەکێتی‌و شۆڕشی نوێوە دەکران. بەڵام کادرانی کۆمەڵەش، مافی خۆیان بووە، ئەندام‌و لایەنگر بۆ کۆمەڵە رێکبخەن. خۆ کۆمەڵە خەباتی نەکردووە لەناو یەکێتیدا، هەتا ئازادی بیروڕاو رێکخستن لەخۆی زەوت بکات. ئەم کێشەیە، لەدوای هاتنەدەرەوەی هاوڕێیانی زیندان، یەکێک بوو لە خاڵە ناکۆکەکانی نێوانمان. ئەوان پشتیوانیی مام جەلالیان دەکرد، کە باڵەکانی ناو یەکێتی بەجیا بۆیان نەبێ خەڵک کۆبکەنەوە. بەندە لە کۆبونەوەیەکی سەرکردایەتی یەکێتی، دژی ئەو بۆچونە بوم. کە ئەوکاتە تازە دووەمین کۆنفرانسی کۆمەڵە تەواو بوبوو، شەهید جەمال تایەریش تازە هاتبووە دەرەوە، لەسەر ئەو دوو بۆچونە ئاڵۆزیی تێکەوت. رۆژێکیش دواخرا. هەتا کۆمەڵە کۆبوینەوە، بۆچونەکەی من سەرکەوت. کەرت‌و رێکخراوەکانی کۆمەڵەش، هەر ئەوکاتە دامەزران‌و راسپێردران چالاکیش بەناوی کۆمەڵەوە بکەن.

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٧٦-٢٧٧).

دەربارەی ئەوەی گوایە دژی دەرەبەگایەتی، خێڵەکی، عەشایەر، شێخ و مەلاو ئاین، قسە کرابێ.

بەڕاستی ئەمەیان نەپرینگانەوەی نوسەرە لە خودی خۆیشی. چ جای لە راستیەکان.

-ئاخر قەراغ، هەردوو تەریقەتی قادریو نەقشی تیابوو. ئەوپەڕی ریزیان لە کۆمەڵەو شەهید ئارام دەگرت.

-ئاخر قەراغ، راستە ئاغاو دەرەبەگی گەورەی تیا نەبوو، بەلام جوتیارانو بنەماڵەکانیان، رێزێکی بێپایانیان لە کۆمەڵەو سەرکردەو کادرو پێشمەرگەکان دەگرت.

-ئاخر کۆمەڵە، بەرگری لە نەتەوەی کوردی پێش باوەڕی چینایەتی نەخستایە، ئەی بۆچی باوەڕی بە شۆڕشی چەکداریی هەبوو؟

کام شۆڕشی چەکداریی لە دونیادا، خەباتی چینایەتی پێش خەباتی نیشتمانی-نەتەوایەتی خستووە، هەتا کۆمەڵە وای بکردایە؟

أ-شۆڕشی درێژخایەنی چین، رزگاری نیشتمان بوو.

ب-شۆڕشی ڤێتنامو لاوسو کەمبۆدیا، بۆ رزگاری نیشتمان بوو.

ج- کوبا، بۆ روخاندنی دیکتاتۆریەتی پاتیستا بوو.

د- کۆریای باکور، بۆ رزگاری کۆریا بوو.

ه- فەلەستینو ئەریتیریا، هەر بۆ رزگاری نیشتمان بوون.

ئیتر نوسەر، بە چ پێوەرێک دەیەوێ، لەناو ئەو هەموو شۆڕشی رزگارییەی، کە زۆربەشیان کۆمۆنیستەکان رابەرایەتیان دەکرد، کۆمیتەی هەرێمەکانو شەهید ئارام، بکاتە شۆڕشێک لە هیچ شۆڕشێکی جیهان نەچێنو بارگاویمان بکات بە بنکەی سوورو دژایەتی دەرەبەگو ئاینیش!

لە داخی دڵی خۆی، کە کۆمیتەی هەرێمەکان مێژوویەکی ئەوەندە شۆڕشگێڕانەی هەیەو لەقۆناغی سەختی خەباتدا، شەرەفی خۆڕاگرییو کۆڵنەدانی بەرکەوتووە؛ لەناو کوردستاندا، سەربەرزیی بەرپاکردنی شۆڕشی هەیە.. شەهید ئارامو ئازاد هەورامی، نمونەی سەرکردەی راستگۆی شۆڕشگێڕ بون. ئێمەی هاورێیانی ئەو شەهیدانەش، دەستمان لە پلەوپایە هەڵدەگرتو دەستمان لە بیروباوەڕمان بەرنەدەدا.. تا ئێستاش، لە داخی ئەم سەروەرییانەی کۆمیتەی هەرێمەکان، نوسەر، پشتئەستور بە هەڵپەرستیەکەیو هەڵبەستنەکانیو باڵی زاڵی ناو یەکێتی، ئەوپەڕی هەوڵیداوە، داخی دڵی بەو شانازییانەی

کۆمیتەی هەرێمەکان برێژێ. بێئاگا لەوەی هەموومان کەوتوینەتە دونیای جیهانگیری‌و ئینتەرنێت‌و سۆسیال-میدیاوە، بەڵگەکان لەبەردەستن‌و بەشێکی زۆری شایەتەکانیش زیندوون، گوێی نەداوەتە ئەم دیاردەو دەرکەوتانەی سەردەمەکەو بەئارەزووی قینی قەڵەمی داگرتووە.

## (٣)
## کۆمەڵەو یاسا، بەرەو ئامۆژگاری

نەخۆشیی فیزیکی، ئازاری بۆ نەخۆش هەیەو خۆی‌و کەسوکاریشی ئەزیەت دەدات. بەڵام نەخۆشیی سایکۆلۆژی، خۆی بیردەچێتەوەو هەتا بتوانێ هەموو چەشنە زیانێکی خێزانی، کۆمەڵایەتی، سیاسی‌و مادییش دەدات. نوسەر (درۆکۆ)(*) یە.

سەیرکەن لەسەر کۆمیتەی هەرێمەکان، چەند رقی پەنگخواردووی هەڵدەرێژێ‌و چەندیش درۆکۆیە. دەڵێ:

"لەراستیدا هاورێیانی کۆمیتەی هەرێمەکان لەو کاتەدا کۆمەڵە لاوێکی خوێن گەرم و چەپێکی توندڕەوی بێ خەبەر بە یاساکانی کاری بەرەیی‌و نەشارەزا بە سیاسەت‌و سەرکردایەتی کردنی هەم جەماوەرو هەم شۆڕش‌و بێ ئەزمون لە پراکتیکدا، و نەشیان دەویست ددان بەو کاڵیەی خۆیاندا بنێن‌و هەوڵدەن سوود لە ئەزمون و لانی کەمی ژیانی بەرەیی وڵاتانی تری سەرکەوتوو وەربگرن. بەڵام نەک هەر دانیان بەو ڕاستیانەدا نەدەنا، بگرە خۆیان بە سەرکردەو شارەزاو لێهاتوو و وشیارو ڕۆشنبیر دەزانی‌و گوێشیان بە ئامۆژگارییەکانی سیاسەت مەدارەکانی وەک "مام جەلال و نەوشیروان" نەدەدا".(١)

لە داخی سەرکەوتنەکانی کۆمیتەی هەرێمەکان‌و شانازییەکانی، خۆی شەرمەزار دەکات، تەنها بۆ شێواندنی ئەو مێژووە.

- کۆمیتەی هەرێمەکان لەوکاتەدا کۆمەڵە لاوێکی خوێنگەرم بوون.

---

* درۆکۆ: دەستەواژەیەکی داتاشراوی نوێمانە، هەر ئێستا لە ڕێڕەوی نوسینەکەدا لامان گەڵاڵە بوو. بەو کەسانە بوترێ کە کوێ ڕاستیەکان دەشێوێنن. لەسەر کێشی: شێرکۆ، لاوکۆ، تیشکۆ..تاد.

١ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٧٧).

ئەگەر لاو بوبین، تەمەنمان وا بوو. بەڵام بەو خوێنگەرمییە، وڵاتمان جێنەهێشت، کۆڵمان نەدا؛ بڕیاری شۆڕشکردنمان دا؛ بڕیارەکەشمان بردەسەر.

سەرکردایەتی پێشووی کۆمەڵە، کامڵ بوون. خوێنیان گەرم نەبوو. بەڵام وڵاتیان جێهێشتو بڕیاری مام جەلالیان بۆ شۆڕشکردن، جێبەجێ نەکرد.

- چەپی توندڕەوی بێخەبەر لە یاساکانی کاری بەرەیی.

چەپبوون، ئەوساو ئێستاش شانازیە. دژی هەموو جۆرە چەوساندنەوەیەکە. بۆئەوەی توندڕەو یان نەرمڕەو بوبین؟ ئەمەیان تێگەیشتنەکان بە ڕێژەیی دەیگۆڕن؛ بەڵێ لەو دۆخـەدا، بەپێی لۆژیکی راستڕەوەکان، شۆڕشکردن توندڕەویی بـووە؛ بەڵێ بەپێی ئەوانەی دەیانویست، سازش لەگەڵ حکومەتدا بکرێ، شۆڕشکردن توندڕەویی بووە؛ بەڵێ بەپێی بۆچونی ناسیۆنالیستە گۆشەگیرەکان، چەپڕەوایەتی توندڕەوایەتییە. بەڵام دوای شکستی بۆرژوازە ناسیۆنالیستەکان لە سەرانسەری کوردستاندا، چەپە خوێنگەرمەکان، لە هەر چوار بەشی کوردستاندا، فەرهەنگی هەرەسپێهێنانی شۆڕشیان، کۆتایی پێهێنا! لە مێژووی هاوچەرخدا، چەپەکانن لە فەرهەنگی سیاسیدا، دەستەواژەی هەرەسیان نەهێشتو لەبەرامبەر دۆخە ترسناکەکانیشدا، چۆکیان دانەدا. چەپەکانی هەموو بەشەکانی کوردستان، بەڵگەی ئەو راستیەن!

ئەگەر لە یاساکانی کاری بەرەیی بێخەبەرو ئەگەر بەو ئەندازەیە چەپی توندڕەو بوبین، ئەی بۆچی لە ریزەکانی یەکێتیدا ماینەوەو لەبەر چیش، لەگەڵ بزوتنەوەی سۆسیالیستیدا، سەرکردایەتی ناو وڵاتو هێزی پێشمەرگەمان دامەزراند؟

- نەشارەزا لە سیاسەتو سەرکردایەتیکردنی جەماوەرو هەم شۆڕشو بێئەزمون لە پراکتیکدا..

ئەگەر لـە سیاسـەتدا، نـەشـارەزا بوینایە، کۆمیتەی هـەرێمـەکان، کۆمـەڵـەی لە پەرشوبڵاویی‌و دۆخی شڵەژاودا، دەرباز نەدەکرد؟

ئەگەر، لە سەرکردایەتیکردنی جەماوەر، نەشارەزا بوینایە، کۆمەڵەمان لە رێکخراوێکی بچوکی لێدراوی ژێرزەمینیەوە، نەدەکردە رێکخراوێکی شۆڕشگێڕی جەماوەریی ناسراو، کە هەزاران تێکۆشەر لەدەوریا کۆببنەوە. دۆستو دوژمنیش حسابی بۆ بکات.

ئەگەر، لە پراکتیکدا بێئەزمون بوینایە.. بە پراکتیک، لەوپەڕی نەبونیی‌و پەرتەوازەییدا، بەبێ ئەوەی هێشتا مامو دەستەی دامەزرێنەر گەڕابنەوە، بەبێ ئەوەی بزوتنەوەش

هاتبنه دەرەوە، بە پراکتیک، مەفرەزەکانمان لەسەرانسەری کوردستاندا پێکەوە نەدەناو پێکیشمان نەدەبەستنەوە، بە ئاراستەی یەکێتیو شۆڕشی نوێ!

بۆ مەسەلەی بێئەزمونیش.. پراکتیک، ئەزمون دەوڵەمەند دەکات. زۆربەی سەرکردەو شۆڕشگێڕەکانی جیهان، کە سەرەتا دەستیان بە خەباتی شۆڕشگێڕانە کردووە، ئەزمونی خەباتی چەکدارییان نەبووە، بەڵام لەپراکتیکدا، سەرکەوتن، شکست، قوربانیو خۆڕاگریی.. لە قۆناغەکانی خەباتدا، لە ئەزمونی جۆراوجۆردا، قاڵو قووڵیان دەکات.

ئەزمون قارچک نییە.. بۆ تێکۆشەران هەڵتۆقێ. کڵۆ بەفری سپیش نییە، بۆیان دابکات. ئاخر:

- مستەفا بارزانی، ساڵانی (١٩٣٢-١٩٣٤) ئەزمونی شۆڕشی چی هەبوو، کە ڕاپەڕینی بەرپا کرد؟

- مام جەلال، ١٩٦١ کام ئەزمونی شۆڕشی هەبوو، کە بوو بە مام جەلالی ناوداری شۆڕشی ئەیلول؟

- چیگوارا.. چ ئەزمونێکی هەبوو، کە لە کوبادا کرایە فەرماندەو لە بۆلیڤیادا، شۆڕشی تا شەهیدبون، بەرپا کرد؟

- یاسر عەرەفات.. لە کام کۆلێژی سەربازی دەرچووبوو، یان لە شۆڕشێکی پێشتری عەرەبیدا بەشداریی کردبوو، کە ساڵی ١٩٦٥ ڕابەرایەتی مەفرەزەکانی لە فەلەستیندا کرد؟

نمونەی تر زۆرن، لەسەر ئەزمونو پراکتیک. دیارە هەن، لە دونیای سیاسەتدا بەتەمەنن. ئەزمونی سیاسییان زۆرە. لە دوو شۆڕشیشدا بەشدارییان کردووە. بەڵام لەبەرئەوەی کارامە نەبوونو ترسنۆک بوون.. سەرکەوتوو نەبونو تەنها نەخۆشی دەرونییان بۆ مایەوە. وەکو برایم جەلال. یان وەکو زۆرێک لە مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتی یەکێتی، مەگەر بە ڕێکەوت ناویان بهێنرێ.. ئەگینا بیرچونەتەوە. زۆربەشیان لە نەوەی یەکەمی خەباتی سیاسی بون!

نوسەر، پراکتیکو ئەزمون، وەکو ئەفسانەی شۆڕش سەیر دەکات. نەک وەکو پرۆسەیەک لە بۆتەی خەباتدا، بهێنرێنە دی. جگە لەو هەموو ڕاستیگەلە، مەرج نییە، لە بۆتەی پراکتیکدا قاڵو لە ئەزموندا قووڵ بێت، نەک هەڵەی بچوک، بەڵکو هەڵەی ستراتیژییش نەکرێ.

- بارزانی؛ بەئەزمونترینو بەتەمەنترین سەرۆکی کورد بوو. لە ڕاپەڕینەکانی بارزانیەکان (١٩٣٤-١٩٤٥)و لە کۆماری مەهابادو شۆڕشی ئەیلولیشدا، قاڵو قووڵ بوو، کەچی هەڵەی ستراتیژی وەکو کۆتاییپێهێنانی شۆڕشی ئەیلول دەکات.

- مام جەلال؛ ئەزموندیدەترینی ناو یەکێتی بوو، کەچی لە ناردنی هەڵمەتی هەکاریدا، هەڵەی کردو لە مفاوەزاتەکانی (١٩٨٣-١٩٨٥)دا، سەرنەکەوت. جگە لە دەیان هەورازو

نشێوی دیکەی سیاسی، پێشمەرگایەتی، شکستی ستراتیژی لەدەستدانی هەولێر-سلێمانی. پاشان سلێمانی، دوای ۳۱/ی ئاب. سەرباری هەڵەی ستراتیژی جەلالی!

- مەسعود بارزانی؛ لە زۆر روەوە، پارتیو بنەماڵەی بارزانی لە شکستو پەرتەوازەیی ۱۹۷۵ رزگار کرد، بەلام لە ۳۱/ی ئابدا، هەڵەی ستراتیژیی کرد.

- شەهید شیهاب؛ هاوتەمەنی مام جەلالو ئەزموندیدەی بزوتنەوەی چەپ، کەچی باشترین هەل بۆ چەپ، لەدوای خیانەتنامەی جەزائیرو لەکاتی گرتنی هاوڕێیانی کۆمەڵەدا، هەڵکەوت، هەردوو هەلەکەی بە هەڵەی ستراتیژیی، لەدەست دا.

- نەوشیروان مستەفا؛ بەئەزمونو خاوەن پێشینەیەکی زۆری پراکتیک بوو، هەتا لەناو یەکێتیدا بوو، تا رادەی تاوان دژی جیابونەوەکانی بزوتنەوەی سۆسیالیستو ئاڵای شۆرش بوو، کەچی خۆیشی هەڵەی ستراتیژی جیابونەوەی بزوتنەوەی گۆرانی کرد. جگە لە هەڵەی ستراتیژی شەڕی قرناقاو پشتئاشانو مفاوەزاتی ۱۹۸٤.

- شەهید ئارام؛ هەڵەی کوشندەی کرد، کە لەناوچەی قەراغدا مایەوەو حەرەسی لەگەڵ نەبوو، سەرەنجامەکەی کارەساتی شەهیدبونی خۆی بوو.

هەڵە و هەڵەی ستراتیژیش، بەشێکی دانەبڕاوی مێژووی حیزبەکانو شۆڕشەکانو سەرکردە رەمزەکانیشە. زۆرترین شکستو هەڵەکان، نەوەی یەکەمی سەرکردایەتی کوردایەتی ئەنجامی داوون!

## ( ٤ )
## ئەلتارناتیڤی هەڵوەشانەوە

بۆئەوەی تۆمەتە داتاشراوەکەی عێراقچی، بە زۆرەملێ، بچەسپێنێ، لە لاپەڕە (۲۷۸)دا شانامەی سەیرو سەمەرە دەهۆنێتەوە. وەکو:

"هیچ کام لە ئەندامانی کۆمیتەی هەرێمەکان بە ئاشکرا و بەجورئەتەوە راستی را و بۆچونەکانی خۆیان نەوت جگە لە سالار، کە بەوپەڕی سووربونو هەڵوێستەوە بیروڕای خۆی نەشاردەوەو ڕای گەیاند، کە ئەوانە خەباتیان بۆ کردنی کومەڵە بە ڕێکخراوێکی چەپی عێراقی ئەلتەرناتیڤی حزبی شیوعیە".[1]

١ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٢٧٨).

ئەگەر بە ئاشکراو بوێرانە، بۆچونی خۆمان لەناو کۆنفرانسدا، بەپێی ئەو ئاستەی هەموو ئەندامانی کۆنفرانس، ئەوکاتە هەمانبوو (کە ئاستێکی تیۆری شیاو نەبوو) ئەی بۆچی کۆنفرانس چەندین رۆژی خایاندو تیایدا، گفتوگۆی چڕ لەسەر مێژووی کۆمەڵە، ئایدیۆلۆژیەتی کۆمەڵە، رێبازی کۆمەڵە لەنێوان چینو شورەوی، ناسنامەی چینایەتی کۆمەڵە..تاد، کەوتە ئاراوە. هیچ کەسێکیش لەناو کۆنفرانسەکەدا نەیوتووە: عێراقچیم. بەڵام لەسەر ئەوەی کێشەی کورد لەو قۆناغەدا، بەشێکی خەباتی دیموکراسی عێراقە، بەڵی قسە کراوە. قسە لەوەش کراوە کۆمەڵە کوردستانی داش عێراق بێ (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان-عێراق) لەمە زیاتر باسی عێراقچێتی دوورونزیک نەکراوە. بۆئەوەی قسەکانیشی بچێتەسەرو تۆمەتەکانی باوەڕێ پێبکرێ، لە هیچ مەسەلەیەکدا سالار عەزیزی پەسەند نەکردووە، کەچی لێرەدا دەنوسێ:

"سالار، کە بەو پەڕەی سووربونو هەڵوێستەوە بیروڕای خۆی نەشاردەوەو ڕای گەیاند، کە ئەوانە خەباتیان بۆ کردنی کۆمەڵە بە ڕێکخراوێکی چەپی عێراقی ئەلتەرناتیڤی حزبی شیوعیە".[1]

هەرگیز قسەی وا نەکراوە. ئەمە بوختانێکی ناڕاستە. هەمومان سوور بوین لەسەر کوردستانیەتی کۆمەڵە.

لەمەوە دێتە سەر درێژەپێدانی تۆمەتەکانی هەتا دەیگەیەنێتە جیابونەوەی ئاڵای شۆڕشو دەشیکاتە عێراقچی.

کە ئەو مێژووە بیر دەخەمەوە. کە دۆخی ناو یەکێتیو دەرکەوتنی سەرجەم راستیەکان دەبینم. نە کۆمەڵە ماوەو نە ئاڵای شۆڕشیش. نەوشیروانیش، لە یەکێتی جیابوەوەو بزوتنەوەکەیشی نەکردە کوردستانیو هەر چوار پارچەکەی کوردستانی پێ رزگار نەکرد. بەڵکو زیاتر بەرەو قووڵایی عێراقی ئاڕاستەی دەکرد.

ئێستا، کە سەرجەم بەڵگەنامەکان، نامە دەستنوسەکان، کۆنوسی کۆبونەوە ئاشکراو نهێنییەکان، بڵاوبونەتەوە، لە هیچ بەڵگەیەکدا، نوسراوێکدا، بۆچونێکدا، بە رەسمی، یان بە شەخسی، کۆمیتەی هەرێمەکان، یان لەدوای هەرسێ کۆنفرانسەکانی کۆمەڵە، یاخود ئاڵای شۆڕش، هیچ کەسێک نە وتاری نوسیبێ، نە لێدوانی دابێ، نە گفتوگۆی لەگەڵ گروپو لایەنێکی عێراقی، لەسەر پێکەوەنانی حیزبێکی سەرانسەری عێراقیو عێراقچی، کرابێ،

---

1 سەرچاوەی پێشوو.

ئیتر، ئەگەر نوسەر نەخۆشییە دەرونیەکەی کوشندە نەبوبێو خووی شەڕفرۆشتنی بە عێراقچیەوە نەگرتبێ؟ بە چ بەڵگەیەکو لەبەر چ هۆیەکی ئاشکرا لەوبارەوە، ئێستاش پێدادەگرێ لەسەر ئەوەی کۆمیتەی هەرێمەکان، یان دواتر ئاڵای شۆڕش، بە عێراقچی ناوزەد بکات؟

گریمان، لە شۆڕشدا، لەبەر زەبروزەنگی نەوشیروانو جەلادیەکەی برایم جەلال، نەمانوێرابێ بانگی عێراقچی ئاشکرا بدەین، خۆ لەدوای راپەڕینەوە، بۆچونەکانی ئێمە دەربارەی:

- بەرپابونی راپەڕین.
- کێشەی کورد بەشێکی کێشە دیموکراسیەکانی عێراقە.
- ناڕاستیی تێزی کوردستانیەتی چوار پارچە.
- هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەو لادان لە ڕێبازی چەپ.

خۆ هەموو ئەو بۆچونانەمان هاتنەدی. دەشمانتوانی پشتئەستوور بەو بۆچونانە (ئەگەر عێراقچی بوینایە)، جوڵانەوەی هەمەلایەنەش بکەین؛ کەچی نەک ئەوانەمان نەکرد، بەڵکو کە زانیمان حکومەتی تازە دامـەزراوی کوردستان، بە ئاڕاستەی دیموکراسی، پیلانی لەسەرە، پێمان بە برینەکانی خۆماندا ناو لەگەڵ یەکێتیدا، ڕێکەوتینەوە. کەوابێ.. ئەلتارناتیڤی راستەقینەی پەیڕەوانی سەرکردایەتی زاڵی کۆمەڵە، هەڵوەشاندنەوەی بووە!

## ( ٥ )
## دورەپەرێزیی دیموکراتو یەکێتیی

کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی شۆڕشگێڕی کوردستان-ئێران، بەڵگەنامەکان دەریانخست، کە لەساڵی ١٩٦٩وە دامـەزراوە. لەدوای کارەساتی هەکاری، کە مانو نەمانی یەکێتی کەوتبووە غەرغەرەوە، یەکەمین ڕێکخراوی سیاسی، لە رۆژهەلاتی کوردستاندا، ئەمان بون بەتەنگ یەکێتیەوە هاتن. فریای مام جەلالو مەکتەبی سیاسیش بە پارەو ئازوقەو دەرمان، کەوتبون. د.جەعفەریشیان بۆ ناردبونو خزمەتێکی بێوێنەی کردبوو. هەروا

ماموستا برایم (ساعدی وەتەن دۆست) لە دەراوی گورگان ئابی ١٩٧٨ گەیشتە مام جەلال. ئەو رۆژگارە هێشتا راپەڕینی گەلانی ئێران دەستی پێنەکردبوو. ناوی ئیمام خومەینیو یارانی لەئارادا نەبوو. کۆمەڵە، کە ناومان لێنان کۆمەڵەی ئامۆزا، بەراستی شۆڕشگێڕ بون. بە سەروماڵ لەگەڵ شۆڕشەکەدا بون. یەکەمین شەهیدیشیان خانەی موعینی،(*) لەناوچەی ئالانی باشوری کوردستاندا بەخشی. بۆ مێژوو لەو دۆخە دژوارەدا، دوورونزیک، حیزبی دیموکرات پەیوەندییان بە یەکێتیەوە نەکرد. هیچ هاوکاریەکیشیان، لەو تەنگانەیەدا نەمزانیوە، بۆ ناردبین. لەسەرەتای دامەزراندنی یەکێتیەوە، شەهید قاسملو و دیموکرات، پێیان وا بوو، باشوری کوردستان دوا بەختی خۆی لە شۆڕشدا، هەتا شۆڕشی ئەیلول تاقی کردبوەوەو ئیتر هەقە چاوەڕێ بکەن، بەشەکانی تری کوردستان بەختیان تاقی بکەنەوە. د.قاسملوو، پێشبینی کردبوو، کە رژێمی شا نامێنێو راپەڕین دەبێو رۆژهەڵاتی کوردستانیش دەبێتە مەیدانی خەبات. مام جەلال ئەم تێزانەی د.قاسملووی قبوڵ نەکردبوو، گوتبووی: کوردستانی عێراق، خیانەتی لێکراوەو گەلەکەمان هیچ گوناحێکی نییەو ئامادەیە درێژە بە خەبات بداتو چاوەڕوانی دۆخی بەشەکانی تری کوردستان هەڵەیە! سەبارەت بە راپەڕینی گەلانی ئێرانو روخاندنی شا، دوربینیەکەی د.قاسملوو، راست دەرچوو. سەبارەت بە شۆڕشی باشوری کوردستانیش، بۆچونەکانی مام جەلال راست بوو.

کە شۆڕش لە باشوردا بەرپا کرا، لەلایەن یەکێتیەوە، پێشبینی نەدەکرا، راپەڕینی گەلانی ئێران، پێش روخانی سەدام، بەرپا بکرێو کە بەرپاش کرا، ئاسۆی راپەڕینەکەمان لەبەرچاو روون نەبوو. بەڵام زۆر زۆرمان پێ خۆشبوو.

کە کۆمەڵەی زەحمەتکێشانیش، بەهۆی نامەیەکی سەلاحەدینی موهتەدیەوە،(*) پەیوەندییان بە مام جەلالەوە کردبوو، یەکێتی سوسەی رێکخراوێکی شۆڕشگێڕی وای نەکردبوو، لەدژی شادا. بونی ئەمانیش، بۆ یەکێتیو کۆمەڵە مایەی دڵخۆشیەکی گەورە بوو.

---

* خانەی موعینی؛ لە خانەوادەی موعینییەکانو برای سلێمانی موعینیە. بە دەسیسەی ئێران-پارتی شەهید کرا. خانەوادەکەی هەر بە شۆڕشگێڕیتی درێژەیان بە خەبات دا. یەکەمین شەهیدی کۆمەڵەش، خانەی موعینییە. رۆژی پێشمەرگەی کۆمەڵەشیان، بەبۆنەی شەهید خانەوە ناوناوە.

* سەلاحەدینی موهتەدی، کوڕی گەورەی خانەوادە بەناوبانگەکەیانە. لە پەنجاکانەوە بۆتە دیموکراتو لە شۆڕشی ئەیلولەوە تێکەلاوی خەباتی ئاشکرا بوو. دیموکرات بووە. نوسەرو ئەدیبە. فەزڵێکی گەورەی بەسەرمانەوە هەیە. لەوساوە تا ئێستا یەکێتییە.

یەکێتیو کۆمەڵە، لە قۆناغی جیاواز جیاوازدا، پەیوەندییان بە کۆمەڵەو دیموکراتەوە هەبووە.

-قۆناغی دامەزراندن، مام جەلال پەیوەندی بە دیموکراتو شەهید قاسملووە دەکات، نە لەسەر شۆڕش بەرپاکردنو نە لەسەر کۆبونەوەی حیزبە کوردستانیەکان، رێکناکەوون، بەڵام لەدەرەوەی ولات، پەیوەندی دیموکراتو یەکێتی بەردەوام دەبێ.

-لەدوای راپەڕینی گەلانی ئێران، تەنها هێمنی شاعیر، بەلای مەکتەبی سیاسی یەکێتیدا تێدەپەڕی.(+)

هەتا ساڵێکیش، پەیوەندی دیموکراتو یەکێتی، دردۆنگ بوو. بەڵام سەفەرێکی وەفدی یەکێتی بۆ مەهاباد. کە بریتی بوون لە: نەوشیروان مستەفا، ملازم عومەر، هۆمەر شێخ موسو جەمال ئاغا.. سەردانی مەهابادیان کردبوو. لە میوانخانەی سەدەکەی مەهاباد، میوانداری کرابونو شەهید د.قاسملۆو عەبدوڵلای حەسەن زادەو مستەفای شلماشی، لەگەڵیاندا دانیشتبون؛ دانیشتنەکان، بە رۆحیەتی چارەسەرکردنی کێشەکان بەرێوەچووبوو. سەرەتایەکی باشبوو بۆ پەیوەندی هەردوولا. گەرچی د.قاسملوو دیموکرات، لەو کۆبونەوەیەشدا، بەتەواوەتی پێشنیازەکانی یەکێتییان بۆ نەهێشتنی کێشەی نێوان هەردوولا، قبوڵ نەکردبوو. بەڵام هەندێ پرەنسیپ دانرابون، هەردوولا پاراستیان. وەکو، هاوکاری یەکتر لەسەر سنورەکان، دەستوەرنەدان لە کاروباری یەکتر، نەمانی جەنگی سارد لەنێواندا..تاد.

نەوشیروان مستەفا، لە باسکردنی ئەم ناکۆکیەدا، بۆچونێکی هەیە، کە من گومانم هەیە، دیموکرات بەو هۆیەوە لەگەڵ یەکێتی سارد بوبن. یان بەربەرەکانێیان کردبێ. نەوشیروان دەڵێ:

"نێوانی مام جەلالو قاسملو و، یەکێتیو حدکا، لەسەرەتاوە بە رواڵەت باشو خۆش بو. بەڵام راستیەکەی بێ باوەڕیو گومان لەم پەیوەندییەدا هەبو. حدکا عێراقی بە پشتیوانێکی گرنگ دائەنا بۆ خۆی، نەیئەویست لەبەر خاتری یەکێتی یان هیچ رێکخراوێکی

---

+ مام هێمن.. لە بارەگای رەسول مامەند دادەبەزێ. مام منی نارد بەدوایاو میوانیی کرد. قسەی زۆر کرا. دەرکەوت ناڕازییە لە دیموکرات. مام پێی ناخۆشبوو بێ حەرەس بڕواتەوە. شەش چەکی بۆ کۆکردەوە. دوو چەکی لە من سەندو دووانیشی لە عەلی ئامەخانو دووی خۆیشی خستە سەری. بیرمە پێی گوت: «بۆ کورد جوان نیە، دوای (٣٠) ساڵ دەربەدەری، ئاوها بگەڕێتەوە«. کە رۆژی دوایی گەیشتە سەردەشت، خەڵکێکی زۆر بە پێشوازییەوە چوون. لە مەهابادو شارەکانی تریش هەروەها.

تری عێراقی، دۆستایەتی بەعس لەدەس بدا".[1]

ئەم بۆچونە بنچینەی ناکۆکیەکان نەبوو. بەڵکو بەدرێژایی سالانی خەباتی پێشمەرگایەتی، دیموکرات، بەقسەی بەعسی نەکردووەو هیچ بەڵگەیەک نە ئەوساو نە ئێستاش، کە دوای روخاندنی بەعس دەستکەوتن، نایسەلمێنن بچوکترین گومان لەسەر ئەو پەیوەندیەی دیموکرات لەگەڵ بەعسدا، دژی یەکێتی، یان هەر لایەنێکی تر بەکارهاتبێ. بەڵکو هاوکاری لایەنە سیاسیەکانیشیان دەکرد.

راستیەکەی، د.قاسملو، هەر لە شۆڕشی ئەیلولەوە، مارانگازی سەرکردایەتی شۆڕشی باشوری کوردستانە. لەسەرەتای دامەزراندنی یەکێتیشەوە، ترساوە، روداوە دڵتەزێنەکانی سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول، بە هەر هۆیەکەوە بێ، دژی تێکۆشەرانی دیموکرات چەند بارە بێتەوە. ئەم مارانگازییە، مەترسی لای دیموکرات خستبووە ئاراوە. بەلام رۆژگار دەریخست، یەکێتی روداوە دڵتەزێنەکانی شۆڕشی ئەیلولی لەناو شۆڕشدا، دووبارەنەکردۆتەوە. بەڵکو تەواوی هێزەکانی یەکێتی وەک هێزی پشتیوان چوون بەهانای خەباتی چەکداری پاشەکشەپێکراوی رۆژهەلاتی کوردستان.(*)

جگە لەو مەسەلانە، د.قاسملو، دوای ئەوەی حیزبی دیموکرات لە پاشکۆیەتی حیزبی تودەی تەپیو، دەرباز کردو رێچکەکەی بردەوە سەر شەهید پێشەوا، لەو باوەڕەدام ئومێدی زۆر بووە، خۆی وەکو رابەرێکو دیموکراتیش وەکو حیزبێک، ببنە پێشەنگی روداوەکان. بونی مام جەلالو هێزێکی وەکو یەکێتی، بۆ حیزبەکەیو بۆ خۆیشی، بە بەربەستی ئەو بەرنامەیە دەزانی. بەتایبەتی لەو دۆخەدا، پێی وا بوو، کۆمەڵەی زەحمەتکێشان، دروستکراوی یەکێتیو مام جەلالە!

لەراستیدا، کاتێک راپەڕینی گەلانی ئێران بەرپا بوو، ئەو پێشبینیەی (ئەگەر وا بوبێ) د.قاسملو و دیموکرات، بۆ ماوەی دوو ساڵ، راستو دروست دەرچوون. لەو دوو ساڵەدا، ئەستێرەی رابەرایەتی د.قاسملو، هاوکات پێگەی حیزبی دیموکرات، لە سەرکردایەتی لایەنە سیاسیەکانی بەشەکانی تری کوردستان، گەشاوەتر بوو. وەلێ لە سالانی دورودرێژی تاراوگەدا، پێم سەیرە، د.قاسملو، کە زۆر زۆر زیرەک بوو، پێشبینی

---

1 نەوشیروان مستەفا ئەمین. پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن- دیوی ناوەوەی روداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٧٩-١٩٨٣. چاپی دووەم ١٩٩٨-سلێمانی. ل(١٥٧).

* لەدوای راپەڕینەوە، بارەگاکانی دیموکرات، لە کۆیە، لە شاخی هەیبەت سولتانەوە، تۆپباران کران. ئەمە هەڵەیەکی گەورە بوو، بەبێ بڕیاری سەرکردایەتیو مەکتەبی سیاسی، دوو-سێ کەس ئەنجامیان دابوو!

نەکردبوو، بزوتنەوەیەکی هەرە بەهێزی شیعە بە رابەرایەتی ئیمام خومەینی، چارەنوسی ئێرانیان دوای شا دەکەوێتە دەستو دەسەلاتیش لە هەڵبژاردندا، دەبەنەوە. پێشبینی نەکردنی ئەم روداوە، نەک بۆ دیموکراتو د.قاسملوو، بەڵکو بۆ یەکێتیو تەواوی لایەنە چەپو دیموکراتەکانی ئێرانو ناوچەکە، دوچاری هەڵەو پەڵەی کردن! سەرەنجامەکەش دەرکەوت، کە لە دوای شۆڕشی ئەیلولەوە، یەکەمین خەباتی چەکداریی کە تەنها لەماوەی دوو ساڵدا، تەواوی رۆژهەلاتی کوردستانیان جێهێشت، ئەو بزوتنەوە رزگاریخوازە چەکدارییەی رۆژهەلات بوو. کە تا ئێستاش سەرکردایەتیو بنکەکانی پێشمەرگەی دیموکراتو کۆمەڵە، هەڵوەدای دەرەوەی رۆژهەلاتن. هەلومەرجیش هاوکاریان نییە، ئاراستەکەیان بگۆڕن!

## (٦)

## کۆمەڵەی زەحمەتکێشانو یەکێتیی

مێژووی یەکێتیو کۆمەڵەی زەحمەتکێشان، دیسان بە قۆناغی جیاوازدا تێپەڕی. بەلام یەکێتی، نەیتوانی بەتەنگەوەهاتنی کۆمەڵە، لە دوای کارەساتی هەکاری لەبیربچێتەوە. بۆیە، قەت هیچ چەشنە ساردییەک کە بوبێتە مایەی لێکترازانی قوڵ لەنێوان یەکێتیو کۆمەڵەدا، بە زانینی من روینەدا. پەیوەندی هەردوولا، چەندین قۆناغی بڕیووە. وەکو:

قۆناغی یەکەم: لەدوای کارەساتی هەکاریو پێش روخاندنی شا. بەهانای یەکێتیەوە هاتن.

قۆناغی دووەم: دوای روخاندنی شا و راگەیاندنی کۆمەڵە وەکو سازمانێکی مارکسیی کوردستان.

قۆناغی سێهەم: گرێدانی کۆمەڵە بە حیزبێکی سەرانسەری کۆمۆنیستی ئێرانەوە.

قۆناغی چوارەم: دەستپێکردنی خەباتی چەکداریی کۆمەڵە، لەناو خەباتی رزگاری رۆژهەلاتی کوردستان.

قۆناغی پێنجەم: دوای پاشەکشەی هێزە سیاسی-چەکدارییەکانی رۆژهەلات، بەرەو باشوری کوردستانو سایەی یەکێتی!

لەم قۆناغانەدا، تەنها جارێک نوسەر ئەرکی پێ سپێردراوەو بۆ رۆژهەڵاتو هاوکاری کۆمەڵەی زەحمەتکێشان نێردراوە، ئەویش بە رێکەوتێکی کارەستبار، کەوتبووە سەر دۆخی نالەباری مەریوانو لە بێ زانیاری شەهید فوئاد سوڵتانی، وایزانیووە، نوسەر تێکۆشەرێکی کۆنو نێردراوی مام جەلالە، ئیتر جێگەی بڕوایەو دەشتوانێ بۆ ئەرکی سەختیش پشتی پێ ببەستێ. نوسەر لەم بەشەدا، هێندە شەرمەزارە، بۆیە بەئەندازەی شەرمەزاریەکەی، چەند لاپەڕەیەکی هەڵبەستراوی رازاندۆتەوە. هەر ئەم چەند لاپەڕەیە، توێژینەوەی لەسەر بکرێ، بایی کتێبێک دەهێنێ. با چەند نمونەیەک لەو درۆکۆیە، شیبکەینەوەو لێکیان بدەینەوە:

"لە رۆژی ١٩٧٩/٨/٢٥ دوای کۆبونەوەی (٥) قۆڵی یەکێتی، شیوعی، حسک، حزبی دیموکرات، کۆمەڵی ئێران بڕیاردرا، هێزی هاوبەش پێکبێنن بۆ بەرگرتن بەو هێرشو پەلامارەی حکومەتی ئیسلامی کردیە سەر کوردستان، من لەلایەن مام جەلالەوە بانگکرامو پێی ڕاگەیاندم، کە لەگەڵ پێشمەرگەکاندا بڕۆم بۆ لای برادەرانی کۆمەڵەی ئامۆزا بۆ هاوکاری کردنیان".[1]

تا ئێرە ئاساییە. بەڵام رونی ناکاتەوە کە مام جەلال لەسەر بڕیاری کۆبونەوەی هاوبەشی (٥) حیزب، بۆچی نوسەری بە دابڕاویی لە هێزی هاوبەشی ئەو (٥) لایەنە، ناردۆتە مەریوان-بانە؟!

لێرەدا، ماف بە خۆم دەدەم بڵێم: هەرگیز هەق نەبوو، مام، دوای ئەوەی شکستو ناکارامەیی نوسەر، لە شەڕەکانی سەرکردایەتیو ئەرکە جۆراوجۆرەکاندا، بەتایبەتی لە قەراغ دەرکەوتبوو، لەسەر ئەو شکستەش سزای دابوو. دوای سزادانەکە، کەسێکی ئاوا بنێرێ بۆ ئەرکی سەخت. هەمیشە مام دەیگوت: هەر ئیشێکی دوور بێتەپێشەوە برایم جەلال دەنێرم، هەتا لە تەنگوچەڵەمەکانی دووربکەوینەوە. بۆیە مام خۆیو براکانیو چەند پێشمەرگەیەکی بە جیا ناردووە، چونکە کەسێکی نەگونجاو بوو. لەناو هەر هێزێک دابنرایە، تێکی دەدا. ئەگینا هەروەکو نوسەر خۆی باسی دەکات:

"بەو چوار پێنج حزبە بڕیاریاندا بوو، هێزێکی نزیک بە (١٥٠٠) چەکدار ئامادەکەن بۆ سەر شاری مەریوان و گرتنی، کە یەکێتی (٤٥٠) پێشمەرگەو حسک (٣٠٠) پێشمەرگەو شیوعی (٢٥٠) پێشمەرگەو حزبی دیموکرات (٣٥٠) پێشمەرگەو کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٠٠).

کوردستانی ئێرانیش (١٥٠) پێشمەرگە".[1]

سکرتێرو فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگە، بۆچی بڕیاردەدا (٤٥٠) پێشمەرگەی یەکێتی لەگەڵ هێزی لایەنەکانی تردا بچنە هانای رۆژهەڵات، بەڵام نوسەرو مەفرەزە بچوکەکەی، بەجیا دەنێرێ؟! لەکاتێکدا هێزەکان بۆ هەمان شار و شەڕگەکان دەنێردرێن.

## (٧)
## سوڵتانیو کەرتێکی شەرمەزار!

نوسەر لە بانە فوئاد سوڵتانی دەبینێ. یەکەمین جاریشی دەبێ، بیناسێ. ئەمە لە دۆخێکیشدا، ئیمام خومەینی هەفتەیەک پێش رۆشتنی نوسەری جەنەراڵ! فەتوای شەڕی لە کوردستاندا لە (١٩٧٩/٨/١٨)دا داوەو شاری پاوەشیان گرتوتەوە. (رەنگە ئیمام خومەینی لەبەر رۆشتنی برایم جەلال فەتوای شەڕی لە رۆژهەڵاتی کوردستاندا دابێ!!) واتا: دەوڵەتی ئێران لە سەرکەوتنو لایەنە سیاسیەکان لە شکستدا بون. دەڵێ:

"کە من چوومە شاری بانە، هێزەکانی یەکێتی بە سەرپەرشتی (بەکری حاجی سەفەر)و هی حسک بە سەرپەرشتی ئەنوەر مەجید سوڵتان لەوێ بوون، بڕیار وابوو تا ١٩٧٩/٨/٢٧ هێزەکانی شیوعیو حزبی دیموکرات بگەنو هێرش بۆ سەر مەریوان دەست پێ بکرێ، پێش ئەوەی هێزی چەمران بگاتە ئەوێ".[2]

جەنەراڵ گەیشتۆتە بانە، فوئاد سوڵتانی (رابەری یەکەمی کۆمەڵە)ش لەوێندەرە. لێرەدا پرسیاری عەسکەری دێتەئاراوە، ئەویش ئەمەیە، ئایا لە بانەدا، هێزی کۆمەڵەی لێنەبووە؟ ئەگەر لێی بووەو پلانەکەش بۆ رزگارکردنی مەریوانە، بۆچی فوئاد سوڵتانی لەگەڵ خۆیدا نەیهێناوون، هەتا هێزەکانی تر دەگەن؟ با وای دانێین، هێزی کۆمەڵەی لێنەبووە، دەی خۆ هێزی یەکێتی بە فەرماندەیی بەکری حاجی سەفەری لێبووە، ئەمانیش بۆ هەمان ئامانجی عەسکەری کۆبونەتەوە، ئەی ئەمان بۆ لەگەڵ فوئاد سوڵتانی نەکەوتونەتە رێ بۆ بانە؟ بەتایبەتی سوڵتانی لە نزیکەوە بەکری ناسیووە. ئەمانە هەموو پرسیاری عەسکەری گوماناوین، لەکاتێکدا نوسەر، لەناو ئەو هەموو هێزە، تەنها باسی ئەوە دەکا گوایە:

---

١ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٠٠).

٢ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-١١٠٢. ل(٣٠٠-٣٠١).

"ئەو کەرتە پێشمەرگەیەی، کە لەگەڵ من دابوو خەلیلو هاواری براشم لەگەڵ کاک فوئادی سوڵتانیو نزیک بە (١٠) پێشمەرگەی ئەوانیش، ئەوانیش لەسەر داوای کاک فوئاد بە سەیارە لە شاری بانەوە لە ڕۆژی ١٩٧٩/٨/٢٦ ڕێکەوتین بەرەو مەریوان بۆ کەشفێکی ناوچەکەو چۆنیەتی دابەشکردنی هێزەکان، ئێمە لە نزیک شاری مەریوان، لە دێیەک لاماندا، کە نزیکەی (٣٠) پێشمەرگەی تری کۆمەڵەی لێبوو. شەوی ٢٧/٢٦ ئابی ١٩٧٩ کاک "فوئاد" چەند کۆبونەوەیەکی لەگەڵ چەند کەسێک کرد. کە خەڵکی شاری مەریوان و ناوچەکە بوونو شارەزایی تەواویان لەسەر ناوچەکەی دەوروبەری مەریوان هەبوو".[1]

کێشەکە لێرە ئاڵۆز دەبێو ئەرکی جەنەراڵ (نوسەر)، زۆر قورسە.

لەناو ئەو هەموو هێزەی لە بانەدا بون، تەنها کەرتەکەی جەنەراڵو (١٠) پێشمەرگەی کۆمەڵە کەوتونەتەڕێ. ناشڵێ ژمارەی کەرتەکەی چەند بووە (کە هەرگیز کەرتیشی لەگەڵ نەبووە!!).

خۆیان لە ناوچەی مەریوانەوە چونەتە بانەو دوای شەوێک گەڕاونەتەوە. کەچی دەڵێ: بۆ کەشفی ناوچەکەو چۆنیەتی دابەشکردنی هێزەکان گەڕاینەوە. پرسیارێکی تری عەسکەری، ڕۆژێ پێشتر بەهەمان ڕێدا ڕۆیشتون، ڕۆژی دوایی بۆ کەشف گەڕاونەتەوە. ئەگەر بۆ کەشف هاتبن، واتا: زانیارییان نەبووە. کە زانیارییان نەبوبێ، چۆن بەو هێزە کەمەوە، هاتونەتە شوێنێک کە مەترسی هاتنی پاسدارانی هەبوبێ؟

٢٦/ی ئاب، گەیشتونەتە دێیەک. سوڵتانی چەند کۆبونەوەیەکی لەگەڵ چەند کەسێکدا کردووە. ئایا بۆ کۆبونەوە بووە؟ یان ئەم جۆرە دانیشتنانە تەنها بۆ وەرگرتنی زانیاری عەسکەرییە؟

هەتا ٨/٢٨ ماونەتەوەو چاوەڕوان بون. واتا: لەم دوو ڕۆژە، سوڵتانی، کەس نەهاتۆتە لای. زانیاری نوێی پێنەگەیشتووە. نەشیزانیووە پاسداران چییان کردووەو چی تر دەکەن؟! ئەمە لەکاتێکدا لە کۆبونەوەکەی سوڵتانیدا، دەنوسێ، ئەو کەسانەی لەگەڵیاندا کۆبونەتەوە، شارەزایی تەواویان لەسەر ناوچەکەی دەوروبەری مەریوان هەبوو.

ئەگەر شارەزاکانی تەواوی ناوچەکە، دوای (٤٨) سەعات، بچوکترین زانیارییان بۆ سوڵتانی نەهێنابێ.. هێزەکانی شیوعیو دیموکراتیش نەگەیشتبن. هێزەکانی تری یەکێتیو سۆسیالیستیش لە بانە نەجولابن، کەوابێ: دۆخی عەسکەری، زانیاری عەسکەری، بەرنامەی عەسکەری.. خراپ بووە. وەکو تریش، ئەی بۆچی لەو (٤٨) سەعاتەدا، سوڵتانی کە لە ئەسڵا بۆ کەشفی ناوچەکە هاتووە، کەشفی نەکردووە؟

---

١ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٠١).

لەم گێڕانەوەیەدا، بە شیکردنەوەی دەروونشیکاری نوسەردا دیارە، ئەیبزرکێنیو کارەساتەکەی شەهیدکردنی سولتانی، ئەستۆپاکیی ئەو ناسەلمێنن.

لە درێژەی ئەم گێڕانەوە بزرکاوەی روداوێکدا، کە تا هەتاهەتایە، نوسەر شەرمەزاری مێژوو دەکاتو بەو شەرمەزارییەش سەری پڕ سوێی رقو کینەی دێنێتەوە. ئاوا ترسنۆکیەکەی پینە دەکاتو دەیەوێ بڵێ منێکی ئازای چاونەترس، خەتام لە روداوەکەدا نییە:

"ڕۆژی ١٩٧٩/٨/٢٨ چاوەڕێ بووین، کە هێزەکانو تۆپەکانی حزبی دیموکرات بگەن، تا لە ڕۆژی ٨/٢٩دا پەلاماری مەریوان بدرێ، بەڵام ئەو ڕۆژەش هیچ دیار نەبوو، بۆ ڕۆژی ٨/٢٩ گەیشتینە ئەو بڕوایەی، کە ئەو هێزە ناگات، من بە کاک فوئادم وت: بڕواناکەم ئەو هێزە بگات، نزیکەی (٦٠) پێشمەرگەمان لەگەڵدایە با لە ڕەبایەکانو معەسکەرە بچوکەکانی دەوروبەریەوە بدەین، هەر نەبێ هەندێ چالاکی بکەین. کاک فوئاد قایل نەبوو، پێی وابوو، ئەو کارە نەخشەکەمان لێ تێک ئەدا".[1]

جەنەراڵ جەلال، لە شەڕی "دیان بیان ڤو"[*] پاشگەزبۆتەوە بۆ رزگارکردنی مەریوان؛ ستراتیژە عەسکەریەکەی بە تاکتیکی لێدەو هەڵێ، گۆڕیووە. ئەم قسانە، رەنگە نەشارەزایەک لە نوسەر باوەڕی پێ بکات. بەڵام سەدان پێشمەرگە لە قەراغو گەرمیانو بازیان، هەروا لە سەرکردایەتیو تەواوی خەڵکی شێنێ، کە سێ ساڵ بارەگای لەوێ بوو، دەیناسن کە چۆن (دونکیشۆتێک)ی لە خەیاڵدا ئازاو لە کردەوەدا هیچ لەبارانەبووە. لە هەموو ژیانی پێشمەرگایەتیدا تەقەیەک لە لولەی تفەنگی نەکراوە. لە قەراغو گەرمیاندا، جگە لە سەرو ریشو بزۆتاشینی بەدرەوشتێک لە دێیەکدا، کەروێشکێکی نەکوشتووە، ئێستا چۆنە، هێزەکان نەگەیشتون، سولتانی لە چاوەڕوانیدا بووە. دڵەڕاوکێی نەخشەکە دایگرتووە. جەنابی جەنەراڵ ویستویەتی نەخشەی تەواوی هێزە کوردستانیەکان بگۆڕێو کۆماری ئیسلامی ئێران بە تاکتیکی پارتیزانیی هەراسان بکات؟!

---

١ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٠١)

* شەڕی دیان بیان ڤو؛ دوا شەڕی ڤێتنامیەکانە بۆ پەلاماردانی کامپی سەرەکی سوپای داگیرکەری فەرەنسا (٥٠) کیلۆمەتر دورتر، نەفەقیان بۆ ناو کامپەکە لێداوەو بۆیان هاتونە دەرەوەو کامپەکەیان گرتووە. ئەم سەرکەوتنە، لە فەرهەنگی سەربازیدا، لە سەرکەوتنە دەگمەنەکانی مێژووی عەسکەریە!

## ( ٨ )
# سوڵتانیو گومانی جەنەراڵ!

دێڕ بە دێڕی هۆنینەوەکانی قسەی ئەوتویە، بزرکانی ناخیو شەرمەزاری ئۆباڵەکەی پێوە دیارە. بزانن چی هەڵدەبەستێ:

"لە رۆژی ١٩٧٩/٨/٢٨ منو کاک فوئاد و دوو لە فەرماندەی پێشمەرگەکانی خۆیان، لەماڵێک دانیشتین بۆ تاووتوێکردنی بارودۆخەکە، کاک فوئاد وتی: سبەینێ لەگەڵ من و یەک پێشمەرگە لەوێوە بەرەو جادەکە بڕۆینو بە سەیارە بگەڕێینەوە بۆ "بانە" تا بزانین هاتنی ئەو هێزە بەچی گەیشتووە. ئەو ماڵەی کە ئێمە کۆبونەوەکەمان تیاکرد، دوو کوڕی جاشیان هەبوو، لای حکومەت بوون، من گومانم پەیا کردبوو، لەوەی کە باوکی کوڕەکان هەواڵ بە کوڕەکانی ئەدا، کاک فوئاد ڕای وابوو، کە ماڵەکە زۆر کوردپەروەرو دڵسۆزنو کوڕەکانیشی لەژێرەوە پەیوەندیان بەکۆمەڵەوە هەیە".[١]

سوڵتانی، بەم ریوایەتەی نوسەر بێ، نائومێد بووە لە هاتنی هێزەکە. من خۆم دڵنیام ریوایەتەکەش ڕاست نییە. هیچ نەبێ بەکری حاجی سەفەر[+] دەناسینو لە بانە بووە. شارەکە زۆر دڵسۆزو تێکۆشەر بون. کۆمەڵەش خۆشەویست بوو. خزمەکانی بەکری حاجی سەفەر (ماڵی کاک عەبدوڵڵای ژیایی)یش لەوێ بون کە ئەرکی پێشمەرگەی یەکێتیشیان لەسەر شان بوو. ئەگەر ریوایەتی نوسەر، لەسەر دواکەوتنی هێزەکە، وەکو

---

١ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٠١)

+ بەکری حاجی سەفەر.. لە تێکۆشەرە دێرینو کۆڵنەدەرەکانی شەستەکانی کوردایەتی بوو. لە دەڤەری پێنجوین-شلێر-شارباژێر-هەڵەبجەدا، بەرپرسێکی جوامێر، سەنگینو خۆراگری قۆناغی سەختی خەباتی شۆڕشی نوێ بوو. ساڵی ١٩٧٦ پێش دەستپێکردنی شۆڕش، دابڕابوو لە ڕێکخستن، پەیوەندی بە منەوە کرد. لەوساوە، بوین بە هاوڕێی یەکدی. هەتا ئامر هەرێم بوم ١٩٧٨و دوای ئەوە لە سەرپەرشتی ناوچەکەو بەرپرسیارێتی مەڵبەندی یەک، بەردەوام یان پێکەوە بوین یاخود سەری یەکترمان دەدا. گەلێ هاوکارم بووە. لەکاتی هاتنەسەرێشماندا، دەستبەجێ گەیشتە لامانو هەتا ئێمەیان گەیاندە سەرکردایەتی، لەگەڵ هاوڕێم، دلێری سەید مەجید، وەکو سێبەرو سایەی برایەتی، لەگەڵم بون.
کافیەخانی هاوسەرییو منداڵەکانیشی جگە لەوەی ساڵی (١٩٧٦-١٩٧٨) لە زینداندا بوون. کە هاتیشە دەرەوە، نمونەی ژنی پێشمەرگەو کابانی بەئەمەک بوو بۆ هەموومان. منداڵەکانیشی، هەر لە گوێزە گوێزەی چەرمەسەریەکانی شۆڕشدا، گەورە بون.

گریمانەش ڕاست بێ، گومانم نییە بەکری حاجی سەفەر، کە سەرکردەیەکی بە مشور بوو، هەواڵی بۆ سوڵتانی دەناردو بۆی ڕوندەکردەوە بۆچی دواکەوتون. ڕێگەی بانەو مەریوانیش، سەختە و ئەوکاتەش ئازاد بووە.

پاشان، نوسەرێکی نەشارەزا.. یەکەمین جارێتی سەردانی ناوچەکەو ئەو گوندانەی کردبێ. چۆن دەبێ لەو ماڵەی لێی دابەزیون، دوو کوڕیان جاش بوبن؟ ڕەنگە ڕاست بێ. ئەی چۆن دەبێ شەهید سوڵتانی لەوێ دابەزیبێ؟ ئەی بۆ سوڵتانی گومانی لێنەکردون‌و جەنەراڵ گومانی هەبووە؟ بۆیە ئەم هەستە قووڵەی گومان دادەتاشێ؟ هەتا بڵێ، من گوناهم نییە. سوڵتانیم وریاکردۆتەوە، بەڵام بەقسەی نەکردووم.

گێڕانەوەکە دەگەیەنێتە ئەو ڕادەیە کە کەوتوتە ڕێ. هاتونەتە سەر جادە. چۆڵ بووە. کۆپتەر فڕکان فڕکانی بووە. لایانداوەتە چەمێک‌و ئاوهای دەگێڕێتەوە:

"وتیان: دوێنێ‌و پێرێش سەیارە نەبوو، جگە لە ماشێنەکانی، کە پێشمەرگەکانی حزبی دیموکرات هاتوچۆیان پێ کردووە. ئێمە دیسانەوە بەرەو سەرجادە کەوتینەڕێ، هەتاو کەوتبوو، گوێمان لە دەنگی کۆپتەر بوو، پاش تۆزێک لێمان نزیک بوونەوە، لە جادە لاماندا بۆ بەستێک چەند داربیەکی کورتەباڵای چەمی تیابوو، خۆمان دایە ژێر سێبەری دارەکان، کۆپتەرەکان تێپەڕین، بە کاک فوئادم ووت: با هەر لەم چەم‌و بەستەوە بڕۆین، نەچینە سەر جادە لەوەئەچێ ئەم کۆپتەرانە بەدوای شتدا بگەڕێن یان هێزەکە لە بانەوە، کەوتینەڕێ‌و ئەمانە بیانەوێ بپشکنن".[1]

بەپێی ئەم گێڕانەوەیە بێ. حاڵەتی عەسکەری لە تەواوی ناوچەکەدا حوکم فەرما بووە. لێرەدا، یان سوڵتانی بێرادە باوەڕی بەخۆی‌و جوتیارەکان‌و ناوچەکە هەبووە، یان نوسەر لە بواری عەسکەریدا عەبقەری بووە. ئەگینا گێڕانەوەکە دەریدەخات، نەدەبوو سوڵتانی لەسەر جادەکە بمێنێ. بەڵکو دەبوو دەستبەجێ لە دێهاتی دەوروبەری جادەکەش دوربکەوێتەوە. تێشناگەم، کۆمەڵە بۆچی سەیارەیەکی نەبووە بیداتە کەسایەتی یەکەمی خۆی؟ کە من ساڵی ١٩٨٠ بە هێزێکی (٣٠٠) کەسیەوە چوینەتە ناوچەی مەریوان، لەکاتی ڕێپێوانی خەڵکی سنە، دەزانم کۆمەڵە جۆرەها سەیارەیان هەبوو. بەهەرحاڵ، دەنوسێ:

"ئێمە بەردەوام بووین لەسەر ڕۆیشتنی خۆمان، شوێنەکە پێچاوپێچ و گردی بەرزو

---

١ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٠٢).

تەپۆلکاوی بوون، لەو ماوەیە کۆپتەرەکان (٣-٤) جار ئەگەڕانەوە بەرەو مەریوان و دیسان ئەهاتنەوە بەرەو بانە، دوای ٣ سەعات ڕێکردن نزیک بوینەوە بە پاسگایەکو بە دووربین سەیرم کرد، جووڵەی خەڵکی تیابوو، هەم لەسەربانەکەو هەم لەبەر پاسگاکەشدا، دووربینەکەم دا بە کاک فوئاد، ئەویش سەیری کردو وتی: لەوانەیە پێشمەرگەکانی حزبی دیموکرات بن لەوێ بن، ئیتر ئێمە بە ڕیز مەسافەمان وەرگرتو بە چەمەکەدا ڕووەو پاسگاکە ڕۆیشتین".[1]

کۆپتەر بەئاسمانەوە ماوە. سوڵتانی گوێی نەداوەتیو هەر بە جادەکەدا ڕۆیشتووە. ئەمە چۆن بچێتە ئەقڵ! نازانم؟

ئینجا لە نزیک پاسگایەکدا (پاسگا!!) بە دوربین سەیری کردووەو جوڵەی خەڵکی تیا بووە، هەم لە سەربانەکەو هەم لەبەر پاسگاکە. دوربینەکەی داوەتە سوڵتانیو دیویەتیو گوتویەتی: لەوانەیە پێشمەرگەکانی حیزبی دیموکرات بن!!

لەشوێنێکی ئاوهادا، کە حاڵەتی عەسکەرییە. کۆپتەر چەندین جار بەئاسمانی هەمان شوێندا هاتوچۆی کردووە. بە دووربینیش جموجوڵیان لەو ئانو کاتەدا بینیووە، ئاخر ئیتر چۆن باوەڕ بکرێ، سوڵتانی کە شۆڕەسواری ناوچەکە بووە، شارەزا بووە، سێ ڕۆژیشە هێزەکانی دیموکراتو شیوعی، کە بڕیار بووە بگەن، نەهاتون؟ ئیتر چۆنچۆنی سوڵتانی گوتویەتی: لەوانەیە هێزی دیموکرات بێ. واتا بەگومانەوە نەک بە یەقین.. کە دیموکرات بوبن. ئینجا سەرەڕاش، هاتونەتە سەر هەمان جادە، کە دوژمن هاتوچۆی قەدەغە کردووە. کۆپتەر لەئاسمانە. هەموو ئیحتیاتە عەسکەریەکەشیان ئەوە بووە کە: مەسافەیان وەرگرتووەو بە چەمەکەدا ڕوەو پاسگاکە ڕۆیشتون. بەم ریوایەتە بێ، سوڵتانی بەپێی خۆی، بەرەو خۆکوژی مەسافەی گرتووە.

## ( ٩ )
## سوڵتانیو جوتیارێك!

ئەوەی سەرەتاکانی پارتیزانیو شەڕی نابەرامبەر بزانێ، لە شوێنی وا و لە دۆخی وای عەسکەریدا، ناکرێ سوڵتانی بیری لەوە نەکردبێتەوە، پێش ئەوەی ڕەتڵەکە بکەونەڕێ،

١ هەمان سەرچاوە.

جوتیارێکی شارەزا، یان پێشمەرگەیەکی بێ چەک بنێرێ بۆ دڵنیابون لەو جموجوڵەی لەدەوروبەری پاسگاکەدا هەبووە. بەڵام جەنەراڵ دەیەوێ پاکانە بۆ تاوانەکەی بکات، بۆیە بەوشێوەیە دەیهۆنێتەوە.

وەکو ئەوە بەو شێوەیە بوبێ. سەیرەکە، یان گومانەکە لەوەدا خەست دەبێ کە دەڵێ:

"لە پێچێکدا پیاوێکمان تووش بوو، بەرەو ئێمە دەهات لە منی پرسی: "ئێوە پێشمەرگەن و هەر ئەوەندەن". منیش پێم ووت: پێشمەرگەکان زۆرن و لەدواوەن. پاشان لێم پرسی: لەم ڕێیە چی هەیە؟ چی نیە؟ وتی: والله هیچ نیە و بەپەلە لە ئێمە تێپەڕبوو ڕۆیشت".[1]

هەر لەسەر ئەم قسەیە، پێویست بوو نوسەر دادگایی بکرێ. ئاخر چۆن دەبێ، لەو شوێنەو لەو کاتە هەستیارەی عەسکەریدا، پیاوێک لە پێچێکیشدا توشیان بوبێ.. تەنها پرسیاری ئەوەی لێکردبن: "ئێوە پێشمەرگەن؟" وتبێتیشی هیچ نییە. کە وایشی وتووە، بەپەلەش تێپەڕیوەو ڕۆیشتووە. ئەم گێڕانەوەیە، ئەگەر ڕاست بێ، ساغی کردۆتەوە کە لە پاسگاکەدا پاسداری لێبووە. بەڵام گوایە، سوڵتانی.. ئینجا نوسەریش، بە ئاسایی وەریانگرتووە. ئەم ریوایەتە بۆ دراما دەشێ. لەم هەموو چون و نەچونە.. دەنوسێ:

"ئێمە لە چەمەکەدا گەیشتینە بەرامبەر پاسگاکە و دەنگیان داین لە دوورەوە وتیان: "ئیست"، ئاوڕم دایەوە، بانگی کاک فوئادم کرد، وتم: ئەمانە پاسدارن خێرا پێ هەڵگرن با بەچەمەکەدا ڕاکەین، تا دووردەکەوینەوە لێیان، ئێمە نەمانزانیبوو، ئەو کۆپتەرە کوبرایانە پاسداریان لەناو پاسگاکە دابەزاندووە".[2]

نەفرەت لەم ریوایەتە. ئەمانە دووربینیان پێبووە. سەیریان کردووە. کەچی هەتا نەچونەتە پەنای پاسگاکە، نەیانزانیووە پاسدارن. کە دەنگیان داوون، ئەوسا جەنابی جەنەراڵ زانیویەتی پاسدارن. هەر ئەوکاتەش زانیویانە کە کۆپتەرەکان پاسداریان لەو پاسگایە دابەزاندووە. ئەی ئافەرین.. جەنەراڵی خاوەن ئەزموون!! کاتەکەش عەسر بووە. واتا: ڕوناک بووە. ئاخر کۆپتەر، خۆ زەردەواڵە نەبووە نەیانبینیبێ.. لە دوور دوورەوە، کۆپتەر دیارە. نەخوازەڵڵا پاسداریشی دابەزاندبێ.. تەپوتۆزی ئەو ناوە بەرزەدەبێتەوە!!

---

١ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٠٢-٣٠٣).

٢ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٠٣).

تا ئێره، بەردەوام دەبیزرکێنیو بەسەرهاتەکە چۆنی بوێ، ئاوای دەهۆنێتەوە. بەبێئەوەی هیچ کەسێک لەوانەی لە روداوەکەدا بون، بە "شێخ عوسمان"یشەوە کە پیاوێکی سەنگین بوو، روداوەکە بەمشێوەیەی نوسەر بگێڕنەوە.

لە هەمووش ناخۆشتر، بەسەرهاتە جەرگبڕەکە دەگەیەنێتە لوتکەی ترسنۆکیی. هەر بەوشێوەیەی دەیگێڕێتەوە، لەسەر خۆی ساغی دەکاتەوە، کە تۆقیوەو تێیتەقاندوەو سوڵتانی جێهێشتووە. چونکە دەڵێ:

- کاک فوئاد هاواری کرد.. ناتوانم بڕۆم.

- زۆر هەوڵم دا بێسوود بوو. ناچار دامەزراین.

گێڕانەوەی برایم جەلالو برایمی عەلیزادە، ئاسمانو ڕێسمانی بەینە.

عەلیزادە، دەڵێ:

"سەرکردایەتی کۆمەڵە ئەوکات زۆربەیان لە شاری بانە کۆببوونەوە، بۆ دارشتنی پلانی مقاوەمەتو وتوویژ لەناو کۆمەڵە و لایەنە سیاسییەکانی دیکەشدا بۆ پێکهێنانی هاوئاهەنگی. کاک فوئاد لەلایەن کۆمەڵەوە لە وتوویژەکاندا بەشدار بوو. هەروەها خەریکی ڕێکخستنی هێزی ڕێکخراوە دیموکراتیەکانی کوردستان بوو کە لەسەر بڕیاری کۆمەڵە پێکهاتبوونو هەوڵیدەدا ئامادەیان بکات، بۆئەوەی پێ بنێنە ناو قۆناغێکی نوێوە. لە گەرمەی ئەم ئیشو کارانەدا بوو کە ڕۆژی ٣ی خەرمانان هەواڵی تیرباران کرانی بەندکراوەکانی پادگانی مەریوان کە دوویان واتە "حسێنو ئەمین" براکانی کاک فوئاد بوون، بە کاک فواد دەگات. کاک فوئاد پێیوادەبێ کە دوای ئەم ڕووداوە لەوانەیە شپرزەیو بێ بەرنامەیی بکەوێتە ناو ریزەکانی کۆمەڵە لە مەریوان. داوا دەکات کە خۆی بۆ ڕێکوپێک کردنی کارەکان سەردانێکی ناوچەی مەریوان بکاتەوە. هاوڕێیانی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە ئەوانەی ئەوکات لە شاری بانە بوون لەسەرەتاوە موافقەتی ناکەن، دواجار بەهۆی پێداگرتنی کاک فوئاد بەنابەدڵی موافقەتی دەکەن.

کاک فوئاد هاوڕێ لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی یەکێتی نیشتمانی کە کاک "برایم جەلال" بەرپرسیان بوو بەرەو مەریوان ڕێدەکەوێتو دوای ئەوەی خۆی دەگەیەنێتە ئەو بەشە لە هاوڕێیانی کۆمەڵە کە لە شاری مەریوان هاتبوونەدەرێ لە دێهاتەکانی دەوروبەری شار، بە ورەیەکی بەرزەوە ڕێکیان دەخاتەوەو پلانیان بۆ دادەڕێژێ. کاک

فوئاد دوای جێبەجێکردنی ئەو ئەرکەی بەرەو شاری بانە دەگەڕێتەوە. لە گەڕانەوەدا کاک برایم جەلال‌و شێخ عوسمانی خالیدی‌و ناسیح خالیدی‌و تەهمورس ئەکبەری کە ئەندامی ڕێکخراوی چریکە فیداییەکان بوو لەگەڵی دەبن. لەنێوان ئاواییەکانی کانیعمەت‌و بستام کە لەناوچەی سەرشیوی سەقز هەڵکەوتووە، لەگەڵ ژمارەیەک لە هێزەکانی ڕژێم دەرگیر دەبن‌و دواجاریش کۆپتەری ڕژێم دەگاتە سەریان‌و لە شەڕێکی دەستەویەخەدا کاک فوئادو تەهمورس گیانیان بەختدەکەن‌و کەسانی دیکەی کاروانەکەشیان دەرباز دەبن".[1]

لەم دامەزراندنەدا تەقە دامەزراوە.. تا ئێوارەش. تاریک، نوسەر گەڕاوەتەوە. لەدوای خۆیەوە فوئادو هاوڕێکەی بە شەهیدیی دیووە. لێرەدا دەپرسین: کوا کەرتی پێشمەرگەکان؟ کوان براکانی. کوان ئەو (٦٠) پێشمەرگەیەی پێشتر دەیویست شەڕی پارتیزانییان پێ بکات؟ تەنها باسی ئەوە دەکات کە شێخ عوسمان دیار نەماوە. گەڕاوەتەوە چەمەکە. خۆی دەڵێ: "دوای (٥) سەعات ڕۆیشتن، نەگەیشتۆتە هیچ دێیەک. لە چەمەکەدا هەر بەدەوری خۆیدا خولاوەتەوە". (بە شەوارە کەوتووە لەترسا). ئافەرین فەرماندەی کامڵ‌و بەئەزمون؟!

ئەم گێڕانەوەیە، لێوان لێوە لە زاڵبونی ترس بەسەر نوسەرو داپۆشینی تاوانی شەهیدبونی سوڵتانی.. کە پشتی بە کەرتەکەی نوسەر بەستووە، لەو ئەرکەدا. ئەوەندە ناجوامێریش بوو، نە خۆی‌و نە کەرتەکەی، تەنانەت تەرمی شەهید سوڵتانی‌و دوو شەهیدەکەی تریشیان دەرباز نەکردووە. کەچی، هێندە بێ چاووڕوویشە، لەبری ئەوەی ڕاستیی ڕوداوەکەو هەڵەکان، چ هی سوڵتانی‌و چ هی خۆی، بەئەمانەتەوە بگێڕێتەوە، هەتا ببێتە وانەی خەبات، بەڵام بۆ داپۆشینی شەرمەزاری ئۆباڵی ڕوداوەکە، هەناسەی نوسینی سوار بووەو پاساوی سەیرو سەمەرە دەهێنێتەوە. سەیر بکەن، کۆتایی ئەم هەڵبزڕکاندنە دەگەیەنێتە چی:

"من دوای دوو شەو و دوو ڕۆژ، ئەوسا گەیشتمەوە نزیک "بانە"، بەو نەشارەزاییە، گەیشتمەوە لای پێشمەرگەکانی (بەکری حاجی سەفەر) و کەرتەکەی خۆشمان بە گەڕان بەدوامدا ئەوانیش گەیشتبوونەوە لای کاک بەکر، و لەوێوە زانیم، کە چەمران پاش گرتنی پاوەو مەریوان بەرەو بانە هاتوەو ناوشار بۆردومانکراوە، خەڵکی و پێشمەرگە

---

١ بەهمەنی سەعیدی. خەبات بەرەو سەرکەوتن. (دیدارێک لەگەڵ ئیبراهیمی عەلیزادە تایبەت بە مێژووی کۆمەڵەو کوردستانی ئێران‌و بزووتنەوەی چەپ). بەرگی دووەم- چاپی سێهەم ٢٠١٢. ل(٤٥٦-٤٥٧).

هەموو لە شاردا نەماون، لە بانە بڕیاردرا دو وادەی "دوو ئاو" سەقزیان لێبگیرێ، بەڵام یەک سەعاتیش پێشمەرگە خۆی نەگرت، جگە لە ڕێڵی دوورو درێژی سوپا بەردەوام کۆپتەری کۆبرا پاسداریان لەسەر هەموو تەپۆڵکەکان و ئەم لاو ئەولای جادەکە دادەبەزاند".[1]

ئەوەی شارەزای نێوان بانە-مەریوان بێ، دەزانێ بە ڕۆشتنیش دوو شەو و دوو ڕۆژ نییە. بەو نەشارەزاییە گەیشتۆتە پێشمەرگەکانی بەکری حاجی سەفەر.. لێرەدا، چونکە دەرباز بووەو کەتنەکەی داوە، بە نەشارەزایی دەگاتە بانەو دەشگاتە پێشمەرگەکانی یەکێتی. بەڵام لە نزیک پاسگاکەدا، بە دووربینو بە پرسیارو لە بونی سوڵتانیشدا، هیلاکیش نەبون، ناتوانێ دڵنیابێ کە پاسگاکە پاسداری لێبووە.. یان نا؟

کەرتەکەشیان، گەیشتونەتە لای بەکری حاجی سەفەر.. کەرتێکی پێشمەرگە لە شەڕەکەدا بون، چۆن بێ پرسی بەرپرسەکەیان هەڵهاتوون؟ خۆ ئەگەر لەنزیکی شەڕەکەشدا بوبن، ئەی چۆنە نەچوون بەهانایانەوە؟ چونکە، لە کشانەوەیاندا، جەنەراڵ جەلالیان جێهێشتووە؟ یان ڕاستر وایە بگوترێ: جەنەراڵ جەلال، هەڵهاتوەو خۆی بەتەنها دەرباز کردووە!! بە هەر شێوەیەک لێکبدرێتەوە، ناجوامێریی نوسەر دەردەکەوێ. هەتا ماویشە، دەبێ تک تک ئارەقی شەرمەزاری ئەم تاوانە بسڕێتەوە.

کەچی، نە بای دیووەو نە باران، ئەوکاتە لەبیرمە، لە سەردانێکدا کۆمەڵەی ئێران، دوای لێکۆڵینەوە بۆیان دەرکەوتبوو، سوڵتانی پشت ئەستور بە نوسەرو پێشمەرگەکانی، ئەو ڕێگایەی گرتۆتەبەرو نەیویستووە، پێشمەرگەکانی کۆمەڵە، لە ناوچەکە دووربخاتەوە. بەڵام جەنەراڵ، کە تەقە دامەزراوە، سوڵتانی بە بریندارییی جێهێشتووە، هەتا شەهید بووە. هەر ئاوڕیشی لێنەداوەتەوە. دەشیەوێ لەکۆتایی ئەم باسەدا، بەناوی کۆمەڵەی زەحمەتکێشانەوە، خۆی بێوەی بکات. لێرەش، ڕقێک بە سالار عەزیزدا دەڕێژێ، گوایە بەهۆی ڕاپۆرتی سالارەوە، داوای کردووە:

"ناچاربووم داوا لە سەرانی کۆمەڵەی ئامۆزا بکەم کە بە ڕاپۆرتێک ڕای خۆیان لەسەر من بدەن بە (مام جەلال)، بە ڕاستیش هەرواشیان کردو ڕاپۆرتێکیاندا بە مام جەلال، کە من نە ڕامکردووەو نە کاک فوئادیشم بەجێهێشتووە، خۆشیان لێکۆڵینەوەیان کردبوو

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٠٤).

گەیشتبوونە ئەو ڕاستیەی، بە نەشارەزایی کەوتوینە کەمینەوەو ئەو دوانە شەهید ببوون".[1]

ئەم قسەیە بە ڕەهایی دوورە لە ڕاستیەوە. لە هەفتەی ڕابوردودا (٢٠٢٠/٦/١٢)، لە دانیشتنێکی دۆستانەدا، عومەری ئێلخانی زادە بۆ (سالار عەزیز، مامۆستا موحسین، ئەنوەر حسێن، پشکۆ نەجمەدینو بەندە)ی گێڕایەوە کە قسەکانی (برایم جەلال) ڕاست نینو کۆمەڵە ڕاپۆرتی وای بۆ مام جەلال نەنوسیووە.

لێرەدا، پەردەی چیرۆکی تاوان لە ڕووی نوسەردا، دادەخەین.. کە دڵنیاین ئەگەر تۆزقاڵێک ویژدانی مابێ، دەبێ هەمیشە بەم تاوانەوە بتلێتەوە!!

## (١٠)
## درەنگ درکاندنی تاکڕەوایەتی!

نوسەر ساڵی (٢٠١١) بابەتەکانی ئەم کتێبەی هەڵبەستووە. لە ساڵی (١٩٧٥)وە هەتا هەڵبەستنەکانی (٣٦) ساڵی ڕەبەق، بە ڕقو بە تەکەتولو بە بوختانکردن، دژی کۆمیتەی هەرێمەکانو لەپێشەوەدا شەهید ئارام بووە، بەردەوام بەرگری لە سکرتێری کۆمەڵەو ئەو ڕێبازانە کردووە، کە ئازادیی ناو شۆڕشیان سەرکوت کردووە؛ کۆمەڵەیان هەڵوەشاندەوە؛ چەپیان نابوت کردووە؛ تا ئەو ڕادەیە پشتیوانی لەو سیاسەتانە دەکرد، بە شانازیی دەزانی، لە زینداندا ببێتە جەلادی هاوڕێیانی ئاڵای شۆڕش. پێشتریش هەر تاوانێک کرابێ، لەتیرۆرکردنی پارتیەکانەوە، تا دیلکوشتنەکانی قڕناقاو پشتئاشان، هەتا دەگاتە شەهیدکردنی وریای وەستا وەهاب، سالاری حاجی دەروێش، سێ لاوەکەی خانەقین (عیدان، ئەکرەم، حەیدەر) دیلکوشتنەکان، تاوانو تاڵانیەکان..تاد. برایم شایەری پاساوەکانی ئەو تاوانانە بووە. هەرگیز ڕۆژێک لەرۆژان، دژی هیچ تاوانێکو هەموو تاڵانییەک، نوزەشی لێنەهاتووە. تەنانەت لەسێهەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەدا، کە بە ئاشکرا مام جەلال لە وتارەکەیدا، باسی تاوانی تاڵانیی کرد، نە نوسەرو نە ئەوانەی خۆیان بۆ پەلاماری عەسکەری بۆ سەر ئاڵای شۆڕش ئامادە کردبوو، باوەڕیان بە قسەکانی نەدەکرد. کە ئەمەی خوارەوەی بە ڕۆشنیی وت:

---

١ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٠٥).

"مام جەلال، لە هەڵسەنگاندنی هێزی پێشمەرگەی یەکێتیدا، بێهیوایی خۆی لەو هێزە خستەڕوو، بە شڕەخۆرو تالآنچی ناودێری کردن. ئەو، نموونەی شەڕی (بێتواتە) ی هێنایەوەو هەموو لێپرسراوەکانی بە دز، لەقەڵەم دان. ئەو، بە شیعرە ناودارەکەی شاعیری عەرەب، موزەفەر نەواب، ئاماژەی بەو لێپرسراوانە کردو گوتی: (هیچ کامێکتان لێ نابوێرم...)، ئەمە لەشکری هۆلاکۆیە نەک لەشکری ڕزگاریی کوردستان! من، بە چاوانی خۆم، (سەلاجەو موجەمیدە)م بەکۆڵی مەسئولەوە بینیوە! من، ئەم لەشکرەم هەیە، بۆیە ناچارم درێژە بە مفاوەزات بدەم!".[1]

ئەم گوتارەی سکرتێری گشتی، تەمومژی تیادا نەبوو. پەنجەی خستە سەر تەواوی ئەو ڕەفتارە نەشیاوانەی لەناو هێزەکەدا، بە وردیی دەیزانی. لەخۆیەوە باسی ئەوانەی نەدەکرد کە "شڕەخۆر"و "تالانچی" بوون. سکرتێری گشتی، لەخۆیەوە لەو گوتارەداو لەناو کۆنفرانسێکدا کە (١٨٧) کادری شۆڕشەکەی تیا بوو، بەبێ بەڵگە، ڕونی نەدەکردەوە کە فەرماندەکانی شەڕی "بێتواتە" بە دز ناوبردن. مام جەلال عەرەبی نایابی دەزانی، بۆیە لە گوتارەکەدا ئاماژەی بە هۆنراوەکەی (موزەفەر نەواب) دا کە بە سەرۆکەکانی عەرەب لەسەر فەلەستین دەڵێ:

ئەی حاکمەکانی عەرەب

هەر ئێستا رسواتان دەکەم

هیچکامێکتان نابوێرم

ئەی کوڕی قەحبەکان

بەم شیعرە، وتی: تەواوی فەرماندەکانی شەڕی بێتواتە، جەردە بوون. هیچیان ناپارێزم، بەشێکیشیان لەکۆنفرانسەکەدا دانیشتبون، لەبری ئەوەی بمرن، پێدەکەنین! بەڵام پێکەنینی پێش تاوان، پێکەنینەکەیان وەکو دەمامک، روخساری بۆ سەربڕینی دیموکراسی داپۆشیبون. بەڵێ، لەوکاتەدا لە ناخی خۆیاندا لە بۆسەدا بون چۆن ئاڵای شۆڕش بشکێنن!! ئیتر گوێیان نەدەدایە شکاندنی خۆیان!!

مام وتی: ئەمە لەشکری هۆلاکۆیە.. نەک لەشکری رزگاری کوردستان..

گوتیشی: بە چاوی خۆم سەلاجەو موجەمیدەم بە کوڵی مەسئولەوە بینیوە.

گوتی: من ئەم لەشکرەم هەیە، بۆیە ناچارم درێژە بە مفاوەزات بدەم.

---

١ پشکۆ نەجمەدین. ئەزمون‌و یاد. کتێبی دووەم. ئاڵای شۆڕش‌و حیکایەتی زیندان ١٩٨٣-١٩٨٨. ل(٢٨-٢٩).

ئەو گوتارەو ئەو دەستەواژانە، لەناو كۆنفرانسەكەدا، يەك زەرە كاريگەرى لەسەر كادرە گۆشكراوەكانى باڵى نەوشيروان نەبوو، كە تەنها بۆ سەرخستنى پيلانێكى ترسناك هاتبونە ناو كۆنگرە. ئەوەى پيلانيان بۆ گێڕابوو، هەر ئەوەيان ئەنجامدا. هەندێك لەوانە، هەر ئەو دزانە بون كە مام، لە گوتارەكەدا بە لەشكرى هۆلاكۆى ناو بردن. نوسەريش لەو پيلانگێڕانە بوو، كە سێهەمين كۆنفرانسى بە مەيدانى قارەمانێتى پاكتاوكردنى "خاوەن هەڵوێستەكان" دەزانىو ئەوەى لاى گرنگ بوو، تەنها رقڕشتن بوو، نەك تێكچونى كۆمەڵەو لادان لە رێبازى چەپ.. يان مەترسيەكانى تاكڕەوايەتى. كۆمەڵێك كادرى دەسكەلا بون، هێنرابون يان تاوان ئەنجام بدەن، ياوەكو بەرامبەر تاوان، بێدەنگ بن. هەميشە ملهوڕەكان بێدەنگى دەوروبەر، بە هاندەرى بڕيارى تاكڕەويتى خۆيان دەزانن! كەچى، نوسەر هەروەكو نە باى كوێستانەكانو نە بارانى گەرميانى ديبێ، تازە تازە، دواى (٣٦) ساڵ، دەيەوێ واى پيشان بدات، هەميشە بەهەڵوێست بووە. لەمبارەوە، بۆ سڕينەوەى ئەو مێژووە رەشەى، دەنوسێ:

"بە ئەزموون بۆمان دەركەوت، لەناو هەموو حزبەكانى عيراقىو كوردستانى هەر چوار پارچەكەى كوردستانيش سەرۆكو سكرتێر هەر هەمان بارزانين بە ناسيۆناليستو ئەنتەرناسيۆناليستەكانيەوە بە خێڵەكىو پێشكەوتوخوازەكانيەوە، بەبێ ئاگاو شارەزاكانيەوە".[١]

با ئەم نيمچە پەرەگرافە رونبكەينەوە:

- بە كام ئەزمون دەركەوت، تاكڕەوايەتى لەناو هەموو حيزبەكانى رۆژهەڵاتى ناوەڕاستدا هەيە؟ بە ئەزمونى جيابونەوەى جەلالى-مەلايى؟ يان بە ئەزمونى كۆمەڵەو يەكێتىو ئەو هەموو پيلانگێڕييە؟ ياخود پە ئەزمونى تەكەتولى زيندان؟ يان بەوە خۆتيان كردە جەلادى خاوەن هەڵوێستەكان؟

- كەى دەركەوت، سەرۆكو سكرتێرەكان، هەر هەمان بارزانين..؟

ئەگەر ئەمەت بۆ دەركەوتووەو باوەڕت پێى هەيە، كەوابێ دەبێ دژى جەلاليش بيت. ئەگەر ئەمەت بۆ دەركەوتبێ، كەواتا: پێويستە هەڵوێست لە سكرتێرى يەكێتىو

١ برايم جەلال. چەپكێك لە مێژووى كۆمەڵە. چاپخانەى چوارچرا. چاپى يەكەم-٢٠١١. ل(٣٢٠).

سکرتێری کۆمەڵە وەربگریو دانی پیا بنێی، کە کۆیلەی تاوانو تاڵان بووی. جەلادی سکرتێری کۆمەڵەش بووی!!

ئەگەر ئەو راستیەت بۆ دەرکەوتووە، کەوابێ سەردانی ماڵی هەموو دیلە کوژراوەکانو هاوڕێ تیربارانکراوەکان بکە، کە لەکاتی کۆیلەیەتی تۆ و کەسانی وەکو تۆدا، خاوەن کۆیلەکان کوشتیانن!

هەرگیز.. ستەمکار، ناتوانێ درێژە بە سیاسەتی ستەمکردن بدات، ئەگەر لەشکرێکی بێدەنگی چەکدار، یان کادر، یان سەدان مرۆڤی رامکراو، دەستەمۆکراو، دەستودەم بەستراو، لەدەوری ملهوڕو تاکرەودا نەبن!!

چەند دژوارە، مرۆڤ دوای ئەو هەموو گوناحە، تازە بڵێ تۆبە! چەند پێشێلکردنی پرەنسیپەکانە، کەسێک، لەناو زەلکاوی تاوان بێ؛ چاوی لە تالانی پۆشیبێ؛ شانازی بە ئەشکەنجەدانەوە کردبێ، کەچی ئێستا بیەوێ بە چەند رستەیەک، خۆی بە فریشتە پیشان بدات.

ئەو بەشداریکردنە لە پیلانی تاوانی جۆراوجۆر، تەواوی چاوپۆشینەکان لە تالانیەکان، بەردەوام رقو کینە وروژاندنو ئاشوب نانەوە، زیاتر لە سێ دەهەی خایاندبێ، هەرگیز بەم چەند پەرەگرافە، پاک ناکرێتەوە.(*) ئەمە ئەگەر ئازاری ویژدانو کاریگەری تەمەنیش بێ، بەرامبەر ئەو تاوانو تالانییانەی رابوردوی نوسەر، ناکرێ بەوشێوەیە ئۆباڵەکەی بخاتە ئەستۆی دابونەریتی سیاسی ئاسیایی، یان رۆژهەلاتیی.. ئەم جۆرە باسانە، پێویستیان بە توێژینەوەی سایکۆسۆسیۆلۆژیو تێگەیشتن لە کاریگەریەکانی کولتوری ئایینی، نەبونی گەشەکردنی سروشتی قۆناغەکان؛ رونەدانی رێنیسانسو رۆشنگەریو ئاینسازیەوە هەیە؛ نەک بە نوکە قەڵەمێک، هەڵەی سیاسی نیو سەدە لەخۆی دابماڵێو بشیەوێ وەکو کەسێکی مۆدێرن لەکۆتایی تەمەنیدا، وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەرچێت! ئەوەی ئەم نوسینە بەتاڵدەکاتەوە، ئەوەیە کە لەدوای نوسینی ئەم بەناو کتێبەشەوە، نوسەر بەهەمان مینتالیەتەوە، بە رقەوە، بە یاریکردن لەناو تەکەتولەکان، بە بوختان هەڵبەستنو رقرشتن، درێژەی بە سیاسەتی شاخ، لە شاریش داوە. چوار ساڵیش ئەندام

* دەڵێن کابرایەک هەبووە، بە فسقو فجور ژیانی بردۆتەسەر. لەپیریدا چۆتە لای مەلایەکو گوتویەتی: ئەوەی خوا پێی ناخوش بێ، لەژیانما کردومە. ئەگەرتوبە بکەم. خوای گەورە عەفوم دەکات؟ مەلاکەش، هەموو تەمەنی بە نوێژو عیبادەت بردۆتەسەر، هێشتا دڵنیا نەبووە، دەچێتە بەهەشت. لەداخا وتویەتی: «قەت ئەو خوایە ناپەرستم تۆ عەفو بکات!». ئەگەر بەو هەموو هەڵپەرستیو جەلادیو ئاژاوەیە، بە رەخنەیەک نوسەر پاکبێتەوە. نەفرەت لە رەخنە!!

پەرلەمان بووە، زیاتر لە دوو ملیار دیناری مۆلّی عێراقی بە موچە، بودجە، کرێ خانوو، پارەی حەرەس وەرگرتووە، ماڵە شەهیدێکیش سودیان لێوەرنەگرتووە. تاقە جارێکیش باسی کوردستانیەتی چوار پارچەی کوردستانی نەکردووە.

سیاسەتمەدار، کاتێک لە هەموو تەمەنیدا، شانازی بە کۆیلەیەتی خۆیەوە کردبێ، چێژی لە کۆیلەبون وەرگرتبێ، دەرونی پڕ لە رقی بە ئازاردانی جەستەیی‌و دەرونی هاوسەنگەرەکانی ئاسودە کردبێ، کەسانی ئاوا، بێگومان چەند ئازاری خەڵکانی تریان دابێ، خۆشیان، بەو ئەندازەیە، دوا ساڵانی تەمەنیان بە ئازاری دەرونی دەتلێنەوە! ئەمەشە دۆخی سزای تاوانەکانیان!! مێژوو بەئاسانی، لەم جەلادانە، خۆشنابێ!

## (١١)
## نەریتی سکرتێرەکانی کۆمەڵە

لەو باسەدا، بیری گۆشەگیری بەریندادات. دەنوسێ:

"تەنها رێکخراوێک کە بتوانم گەواهی ئەوەی بۆ بدەم، کە کاری بەکۆمەڵی سەرکردایەتی نەبوونی تاک دەسەڵاتی‌و دیکتاتۆری‌و خۆداسەپاندن تەنیا کۆمەڵە بوو، ئەویش تا شەهیدبوونی (شەهید شەهاب). لەدوای شەهیدبوونی شەهید شەهابەوە هەر لە خۆداسەپاندنی ئارام لە کۆمیتەی هەرێمەکان تا خۆداسەپاندنی (نەوشیروان لەپاش شەهید ئارام) بە سکرتێری بەزۆر داسەپاو بە سکرتێری هەڵبژێردرایەوە، بە ئەندامی سەرکردایەتی سەپێنرا و بە ئەندامی سەرکردایەتی بەناو هەڵبژێردراویەوەو شوێنەکانیان لەسەر تاپۆ کراو. سکرتێر خاوەنی بڕیاری بێ چەندوچون بوو، تا کوشتنی کۆمەڵەو حەلکردنی هەر بە یەک چەقەنەی سکرتێرەکەی".[1]

سەبارەت بە شەهید شیهاب، راستە خۆی نەسەپاندوەو بە سکرتێرێکی رەوشتبەرزی دیموکراس بەناوبانگە. گەوهەرێکی پاکی هەبووە. قەت لە هیچ شەڕێکی ناوخۆداو لە ئازاردانی هاوڕێ‌و هاوسەنگەردا، لە تاڵانی‌و تاواندا، بەشداری نەکردووە. ئەمەش شانازیەکی گەورەیە بۆ مێژووی شیهابی شێخ نوری. بەڵام کۆمەڵە، کە کەوتە کێشمەکێشەوە، زۆربەی ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵە پیلانیان لە ئاوات عەبدولغەفور

---

١ سەرچاوەی پێشوو.

گیرا و له سەرکردایەتی دوریانخستەوە. ئەمە لەکاتێکدا، بە دیسپلینی حیزبایەتی مافی خۆیان بووە، ئەگەر ئاوات هەڵەی کردبێ، لێکۆڵینەوەی لەتەکدا بکەن‌و سزایشی بدەن.

وەکو تریش، هەمیشە خەباتی چەپەکان، لە ژێرزەمیندا، رەوشتی بەرزی وەفاداری‌و رۆمانسیەتی هاوڕێیەتی بەسەریاندا زاڵدەبێ. عیبرەت لە کاتی خەباتی نهێنی‌و بێدەسەڵاتیدا وەرناگیرێ. تەنها تەختی دەسەڵات مەحەکی دەرخستنی گەوهەری هەموو سەرکردەو حیزبێکە!!

زۆر حیزبی گەورەو رابەری گەورەو تێکۆشانی پڕ لە قوربانی مێژوویی، کە جێگەی شانازی بوون، لەکاتی دەسەڵاتدا گۆڕدراون‌و هەڵگەڕاوون.

-ماوتسیتۆنگ؛ ئەو پیاوە مەزنە، دەسەڵاتی بەرەو تاکڕەوی‌و قەتڵوعامی ملیۆنەها کەسی برد. بە هاوڕێ‌و هاوسەنگەرەکانیەوە.

-ستالین؛ پیاوە پۆڵاینەکەی بۆلشەویکەکان‌و جێ متمانەکەی لینین؛ دەسەڵات هەڵیگێڕا بۆ تۆتالیتاریەت‌و دڕندەیی.. کە زۆربەی مەکتەبی سیاسی‌و سەرکردایەتی حیزبەکەی لەناوبرد.

-کیم ئیل سۆنگ؛ هێمای شانازی شۆڕشگێرانی جیهان بوو، کەچی وەکو شایەکی دەسەڵات رەها، حوکمی کردو ئێستاش نەوەکەی دیکتاتۆرن.

-پۆل پۆت؛ کۆمۆنیستی ماویی، بوو بە هێمای فاشیەت.

-حیزبە کۆمۆنیستەکان؛ سەرجەمیان لە دیموکراسی هەڵگەڕانەوەو سیستەمەکەیان کردە تۆتالیتاریی..تاد.

مەبەستمە بڵێم: لەسەر (٥) ساڵ خەباتی نهێنی کۆمەڵە، ناکرێ دوا حوکم بدرێ. کە هەموو ئەندامانی کۆمەڵە، ئەوکاتە نەدەگەیشتنە (٢٠٠) کەس! خۆ دەریشکەوت، هەندێکی سەرکردایەتی کۆمەڵە، کە هاتنە سەر حوکم، چۆن هەڵسوکەوتیان گۆڕدرا؟ چۆنیش خەڵک لێیان هەڵگەڕانەوە؟! چیشیان بەسەر یەکێتی‌و پێشمەرگەو یەکەمین ئەزموونی حوکمڕانی پەنجا ملیۆن کورد هێنا؟!!

سەیرتر لەو قسانەی، لەدوای سکرتێری کۆمەڵەوە، کاری بەکۆمەڵی سەرکردایەتی لەناو کۆمەڵەدا قوفڵ دەدات. پێشیوایە شەهید ئارام خۆی داسەپاندووە. لەمەشیاندا، بێویژدانیی دەگەیەنێتە ئەوپەڕی؛ جیاوازی شەهید ئارام لەگەڵ شەهید شیهاب ئەوەیە، کە کاتێک ئارام رابەری کۆمەڵە بوو، کۆمەڵە شۆڕشی چەکداری بەرپاکرد و نە لە خەباتی ژێرزەمینی‌و نە لە خەباتی دەسەڵاتداریێتی شاخیشدا، تاقە کەسێکی سزا نەداوە. یەک

کەسیشی زیندانیی نەکردووە. تاقە جارێ کە بڕیاری سزای توندی دابێ، ئەوەیە کە:

ئـازادی بـرای شەهید سـۆران هـەورامـی. بەئاشکرا سـۆرانـی شەهید کـردبـوو. سۆرانیش قارەمانێکی ئەفسانەیی کۆمەڵەو رابەری لێدانی پارێزگاری سلێمانی بوو لە (١٩٧٦/١٢/٢١). خۆیو سالار عەزیزو ملازم عومەر بڕیاری کوشتنیان دابوو. ئەگینا، سێ ساڵی رەبەق رابەرمان بووە، قسەیەکی زبریشی بە هاوڕێیەکی کۆمەڵە، نەووت. بەڵکو زۆر خۆشەویستیش بوو لەناو هاوڕێکانیو پێشمەرگەو جوتیاراندا. هەربۆیە، بۆتە هێمای خۆشەویستی لە مێژووماندا.

مێژوو هەڵناگێڕمەوە، لەگەڵ دانانی نەوشیروان مستەفا بووم بۆ سکرتێر، بەڵام کاتێک بەرە بەرە لایدەدا، ئیدی هەڵویستم لێوەرگرتو گەیشتە جیابونەوەش.

نوسەر، هەمیشە بە مەراییکردن بۆ نەوشیروان، خۆی دەبردە پێشەوە، هەرگیزیش لە کۆبونەوەی فراوانو کۆنفرانسەکانی کۆمەڵەدا، متەقی بەرامبەر هەڵەکانی نەوشیروان لێوە نەهاتووە. لە هەموو بۆنەیەکدا بە ناشیرینترین شێوە دەیشکاندو سوکایەتی پێدەکرد. هەر بەقسەی ئەویش، هەڵسوڕاوە. رەخنەگرتنی لە کۆمیتەی هەرێمەکانی، لەو کۆبونەوانەدا کردبووە پیشە.. کە قسەی دەکرد، دەزانرا دەکەوێتە وێزەی کۆمیتەی هەرێمەکان! یان خۆی هەڵدەکێشی!! بەشێکی کۆبونەوەکان، پێکەنین بووە بە قسەکانی.. خۆهەڵکێشانەکانی.

## ( ١٢ )
## جەنگی عێراق-ئێرانو یەکێتی!

جەنگ، رێگایەکی ماڵوێرانکەرو کوشتارگای مرۆییە. دەمێک بوو، لەنێوان عێراق-ئێراندا، لەدوای کۆتایی عوسمانیو سەفەویەکانەوە جەنگ روینەدابوو. بەڵام هەمیشە ناکۆک بون.

ئێران، شارستانیەتێکی دێرینی بەردەوامی هەبوو. واتا: ئێران بە دەگمەن لە مێژووی خۆیدا پەلامار دراوە، بەڵام بـەردەوام پەلاماری وڵاتانی تری داوە. بەتایبەتی عێراق. لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانەوە، بەریتانیا، هەردوو وڵاتەکەی لە قاڵبی بەرژەوەندی خۆیدا و هەتا جەنگی عێراق-ئێران، ئیتر لەشکرکێشی نێوانیان وەستا.

بەعس.. حیزبێکی ناسیۆنالیستی-شۆڤێنیستی عەرەبی بوو. کە هاتیشە سەر حوکم، یەکەمین دەسەڵاتی فاشستی وڵاتانی دواکەوتوی عەرەبی بو. کە بە رەگەزی ئاوێتەی عەرەبی-ئایینی پێچراو بە فەلسەفەی مۆدێرنێتە، ئایدیۆلۆژیەتو سیستەمە تۆتالیتاریەکەی دەسەپاند. یەکێک لە خەسڵەتەکانی فاشیەتو نازیەت، ئەوەیە کە بە سنوری جوگرافی-سیاسی (جیۆپۆلۆتیک)ی خۆیان رازی نابن. بۆیان بلوێ، پەلاماری سەرزەمینی دیکە دەدەن. فاشیەکانی ئیتاڵیاو نازیەکانی ئەڵمانیاو ڤلانژستەکانی ئیسپانیا، وایان کرد. بەعسی سوریاو عێراقیش، هەر وا بوون!

رۆژهەڵاتی ناوەراست، هەمیشە سەرزەمینی جەنگی وڵاتان، جەنگی ناوخۆ، کێشەگەلی مێژوویی ناوچەکەو جیهان بووە. زۆر دژوارە ناوچەیەکی جوگرافی گەورەی وەکو رۆژهەڵاتی ناوەراست، لەجیهاندا هەبێ، بوبێتە مایەی سەدان چەشن جەنگی جیهانی، ئیقلیمی، ناوخۆیی‌و کارەسات. کەچی، بەدرێژایی مێژوو، ناسیۆنالیستەکانی فارس‌و عەرەب‌و تورک، پێچەوانەکەی باسدەکەن، گوایە ئەم سەرزەمینە، زایگای پێغەمبەران‌و پیاوچاکانە. ئەمە لەکاتێکدا، پێغەمبەر مەسیحیان لە چوارمێخە کێشا. موسایان وڵات بەدەر کردو بیابان نشین بوو. پێغەمبەری ئیسلامیشیان لە مەکەوە بۆ مەدینە دەرپەراند. تەنانەت بە شەڕ، فتوحات، غەزەوات‌و ئەنفال نەبوایە، ئایینی ئیسلام وەکو ئاینێکی لۆکاڵی دورگەی عەرەبستان قەتیس دەمایەوە. بەوەشەوە، کام ئایینی دەسەڵاتخواز هەیە، بەئەندازەی دەسەڵاتی ئیسلامی، دەیان چەشن حکومەتیان هەر بەناوی ئاینەوە دانەمەزراندبێ. هەموشیان یەکتریان کوشتووە. خاکی یەکتریان داگیرکردووە. کارەساتیش لەوەدایە، رۆژهەڵاتی ناوەراست، بەو هەموو کارەسات‌و مەرگەسات‌و جەنگەڵستانەی جەنگەوە، هەرگیز پەندی لە مێژووی خۆی وەرنەگرتووە. ئامادەش نەبووە بەو رابوردووە خوێناوی‌وماڵوێرانیەدا، بە ئەقڵێکی کراوە، بچێتەوە. چونکە هێشتا هەژمونی ئەندێشەکانی سەدەکانی ناوەراست، لەناویا کاریگەرترە! هێشتا دوژمنی سەرسەختی ئاینسازی‌و رۆشنگەری‌و نوێگەرین.

بەعسی عێراق، بەردەوام کوردستانی بە داگیرکراوی هێشتۆتەوە. عەرەب‌و تاڕادەیەک دیموکراتەکانی عێراقیش، بە پاساوی ئەوەی کوردستان سەربەخۆ نییە، نە دەستەواژەی داگیرکردن (احتلال) نە کۆلۆنیالیستی (استعمار)یان قبوڵە. تەنانەت نایسەلمێنن، بە ئۆردوگا زۆرەملێکان بوترێ (مستوطنة) لەکاتێکدا، دەستەواژەی داگیرکردن بۆ خاکە، نەک بۆ خەڵک. خەڵکی بێ خاکی داگیرکراو،

داگیر ناکرێ. بەڵکو دەچەوسێنرێتەوە. یان لە مافە کولتوریەکان بێبەش دەکرێ. قەت بە خەڵکی بێ خاکی نیشتمان، یان بە کەمینەی پەڕیوەی نیشتمانەکان، ناوترێ داگیرکراو، دەوترێ ماف زەوتکراو. بەڵام بە زۆرەملێ دەرکردنو نیشتەجێکردن (ئیستیتان)ە. داگیرکردن، تەنها بۆ سنوری جوگرافیای جیاوازە. کوردستانیش نەک هەر جوگرافیایەکی جیاوازە، بەڵکو زێدی دەیان هەزار ساڵەی نەژادی کوردو نەتەوەی کودستانیشە. نەک بەعس، بەڵکو ئەوەتەی قەڵەمڕەوی ئیسلامیش، بەناوی فتوحاتەوە لەشکرکێشی ئەنفالی بۆ هێناوە، داگیرکراوە. دەسەڵاتی نەتەوە سەردەستە ستەمکارەکانی عەرەبو فارسو تورک، شۆڤێنیستیو داگیرکاریان، لە نەسەلماندنی نیشتمانی کوردەوە دەستپێدەکەن. دیارە، لەبەرامبەر گەلانی دیکەشدا، هەر داگیرکەرو ستەمکارن! بەڵام کوردستان، لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، لە خەباتو بەرەنگاریدا تایبەتمەندێتی جیاوازی هەیە. بۆیە دەیگەیەننە تاوانی جینۆساید لەگەڵ کوردا! کە بەعس بە ئایدیۆلۆژیەتێکی سیستەماتیک درێژەی بە داگیرکردنی کوردستان دا و شەڕی شۆڕشەکانی کوردستانی درێژەپێدا، جیاوازیەکەی لەگەڵ حوکمی پاشایەتیو قاسمیدا، خەسڵەتە ئایدیۆلۆژیە فاشیەکەیەتی. ئەگینا هەمویان داگیرکەری کوردستان بوون.(*)

بەعس، کاتێک کۆماری ئیسلامی ئێران-شیعەگەرا، هاتە سەر حوکم، لە روانگەی ئاساییشی نەتەوەیی بەعسەوە مەترسییان لەسەریان هەبوو، بەڵام هەموو مەترسییەک ناگاتە ئاستی داگیرکاری، ئەگەر ئەو مەترسییە لەگەڵ ئایدیۆلۆژیەتی فاشیەتی دەسەڵاتی نەتەوەیەکی دواکەوتودا، کارلێکی عەسکەریو ناسیۆنالیستیو سیاسی نەکات. لەم پلاتفۆرمەوە پێویستە سەیری سیاسەتی داگیرکاری بەعس بکرێ. هەروەها، هەر رژێمێکی تری داگیرکەری وڵاتانی دواکەوتوو! مەسەلەکە ئەوە نییە کە نوسەر دەڵێ:

"دوای رووخانی رژێمی شای ئێرانو سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی. سەدام بە هەلی زانی، کە لە پەیمانی جەزائیر پەشیمان بێتەوەو پاشگەزبێتەوە لەبەر ئەم هۆیانە:".(1)

ئەگەر مەسەلەکە تەنها مەدی ئیسلامگەرای شیعەگەرا بوایە، خۆ دەبوایە، دوای سەرکەوتنی ئیخوانیەکانی میسرو هاتنە سەر کاری ئاکپارتی ئیخوانی تورکیا، چەندین

---

* لە هەموو ئەدەبیاتی ئاڵای شۆڕشدا، کە دەیان توێژینەوەو سەدان گوتارن، دەستەواژەی فاشیەت بەکارهاتووە. نەک رەفتار فاشی.

1 سەرچاوەی پێشوو. ل(٣٢٦).

ولاتی عەرەبیو رۆژهەلاتی ناوەڕاست، هێرشی عەسکەرییان دەستپێکردبا. جەنگی (٣٠) ساڵەی پرۆتستانت-کاتولیک لەنێوان شیعە-سوننەشدا، بەرپا کرابا!

کە جەنگەکە هەڵگیرسا، بەحوکمی سروشتی حوکمڕانیی هەردوولا، ئێرانی شیعەو عێراقی بەعسی، مام جەلال لەدەرەوە بوو. تێزی نەوشیروان ئەوە بوو، کە ئەم دوو لایەنە ئاشتەوایی ناکەن. کەوابێ؛ فرسەتە ئێمەش بەتەواوی توانامانەوە، پارتی لەناوبەرین.(+) تێزی بێ پێزی وا، لەمێژووی جەنگەکانی داگیرکەرانی کوردستاندا، تەنانەت لە سەدەی ناوەڕاستیشدا، شێخو ئاغاکان، بیریان لێنەکردبوەوە. بەپێچەوانەوە، هەر جەنگێک لەنێوان عوسمانیو سەفەویەکاندا (١٥٠٢-١٧٢٢ز) قەومابێ، سەردارانی کورد، بەپێی ئاستی تێگەیشتنی ئەو سەردەمانە، هەوڵی یەکخستنی توانای کوردیان داوە! سیاسەتی راست ئەوە بوو، کە سیاسەتی ئاشتبونەوە بگیرایەتەبەر. کەچی مەخابن، شەڕی ناوخۆ، بەپێی ئەو تێزە هەتا ساڵی ١٩٨٢ خوێناویتر کرا. بەلام کە زانرا پارتیو سۆسیالیست لەناوناچن، بەرە بەرە بیرۆکەی ئاشتبونەوە لەناو یەکێتیدا، زۆرتر دوای دانوستانی (١٩٨٥) بڕیاری لێدرا. هاتەئارا.

رەوتی بەرهەڵستی ناو کۆمەڵە، هەتا یەکێتی لە بەرگریدا بوو، لە سەنگەری بەرگری بوین. بەلام کە زانیمان یەکێتی هەلی بۆ هەڵکەوتووە، ئاشتی بەدیبهێنێ، هەڵوێستمان لە شەڕی ناوخۆ وەرگرت. فەرەیدون عەبدولقادریش باش لە قۆناغەکە وردبوبوەوەو لایەنگری ئاشتی بوو. لە مەڵبەندی یەکدا، کە نەماندەویست شەڕی جود بکەین.. لەبەرئەوە بوو باوەڕمان وابوو کاتی ئاشتەوایی هاتووە. حیزبی شیوعی شەڕی نەکرد، ئێمەش پابەندی رێزگرتنی شیوعیەکان بوین. بەلام پارتی-سۆسیالیست-پاسۆک کە شەڕیان دەفرۆشت، شکاندمانن!

کەم نەتەوە هەیە بەئەندازەی سەرکردایەتی سیاسی کوردەواری، بتوانێ ناکۆکی ناوخۆیی لەبەرژەوەندی دەسەلاتخوازی، بقۆزێتەوە. بەلام کەمتر ناکۆکیو کێشەی ناو دوژمنان سود لێوەردەگرین. ئەمەش بەڵگەیەکی زیندووە کە ئەقڵی ستراتیژی کورد، زۆرتر لەناوخۆیدا گیری خواردووە. هێشتا سەرکردایەتی سیاسی کوردستان، رەهەندی بیرکردنەوەی بۆ دەرەوەی بازنەی نەتەوەکەمان، لاوازە! ئەمەش پەیوەندی بە لاوازی خەملینی پێکهاتە ناوەکیەکانی نەتەوەوە هەیە. لەپێشەوەدا، بازاڕو تەکنەلۆژیاو رۆشنگەری!

---

+ کە جەنگەکە هەلایسا، من راسپێردرام بەناوی سەرکردایەتیەوە، کۆبونەوە بە تەواوی کادرو پێشمەرگەی سەرکردایەتی بکەم. هۆمەر شێخ موس بەرێوەی دەبرد. لەتۆژەڵە کۆبوونەوەکەمان سازدا. لە قسەکانما گوتم: جەنگێکی نارەوایە، هەقوایە، سودی لێوەربگرین ماڵی کورد رێکبخەین. نەوشیروان پێی ناخۆشبوو. وتی: دەبێ پارتی لەناوبەرین.

## ( ١٣ )
## قۆناغی نوێو هەڵەی ستراتیژی

شەڕی ناوخۆ، پارتی سەرەتا لە بادینانەوە دەستیپێکرد. یەکێتی بەرگری کرد. بۆ دەڤەرەکانی دیکە تەشەنەی سەند. پارتی دەیزانی بادینان-قامشلۆ، شادەماری سیاسەتی دەرەکی یەکێتییە بۆ کۆمەکو هاوکاری. بۆیە، بەهەموو جۆرێک، رێی نەدا ئەو رێگایانە بۆ یەکێتی دەستەبەر بکرێ! بۆ سەرخستنی ئەم سیاسەتەش هۆزەکانی تورکیا گرنگترین هێزی سەرزەمینی دەستوەشێنی پارتی بوون. ئەگەر ئەم هۆزە کوردانەی باکور بۆ پشتیوانی جموجوڵەکانی پارتی نەبوایە، ئاسان نەبوو، لە بادیناندا مەفرەزەکانی پارتی بیانتوانیبا، بەردەوام دەست لە مەفرەزەکانی یەکێتی بوەشێنن. تەنانەت کارەساتی هەکاریش بەشی زۆری ئەو هۆزانە بەسەر یەکێتیان هێنا. جەخت دەکەمەوە، یەکێتی لەدەرەوەو کۆمەڵەش لە وڵات، دوای هەرەس، لەو باوەڕەدا بوین، جارێکی تر پارتی سەریشهەڵبداتەوە، وا بەهێز نابێ بتوانێ رێی شۆڕشی نوێ بگرێ. کە ئەم بیرکردنەوەیە هەڵە بوو. هاوکات، لەوەشدا بەهەڵەدا چوبوین، کە پێمانوابوو هەرەسپێهێنانی شۆڕشی ئەیلول، لەناو گەلەکەماندا، پارتی لەبەرچاوخستووەو ئەڵتەرناتیڤەکەی کۆمەڵەو یەکێتی دەبێ. ئەمەش، هەڵەیەکی سۆسیۆ-سیاسی نەوەی یەکەمی شۆڕش بوو، لە دەستەی دامەزرێنەرو هەڵەی نەوەی دووەمی کۆمەڵەش بوو، لە کۆمیتەی هەرێمەکان.

دەستەی دامەزرێنەرو نەوەی یەکەم، لەڕووی سیاسیەوە، زۆرتر بیریان لەوە دەکردەوە، کە هەرەسی شۆڕشی ئەیلول، بەگشتی هەرەسی سیاسی-عەسکەری-سایکۆلۆژی یەکجارەکی پارتیو بنەماڵەی بارزانیشە.

کۆمیتەی هەرێمەکانی نەوەی دووەمیش، وامان بیردەکردەوە کە مادام پارتی تیۆری شۆڕشگێرانەی فەرامۆشکردبوو؛ مادام شۆڕشەکە گرێی سیاسەتی ئەمریکاو ئێران درابوو؛ مادام لەڕووی ئاکارو کردەوەوە، دزیو رأووروتیی لە شۆڕشەکەدا هەبووە، کەواتا: پارتی لەدوای هەرەسەوە کۆتاییهاتووە. چونکە لەو سەردەمەدا، شۆڕشی گەلان سەرکەوتنیان بە تیۆری شۆڕشگێرانە، بەدەستهێنابوو. ڤێتنام، لاوس، کەمبۆدیا..تاد. بەبێ ئەوەی بیرمان لەوە کردبێتەوە کە کوردەواری، جیاوازیەکی هەمەلایەنەی لەگەڵ پێکهاتەی کۆمەلایەتی، سیاسی، عەقیدەیی، ئەو وڵاتانە هەیە.

نه دەستەی دامەزرێنەرو نه کۆمیتەی هەرێمەکان، توێژینەوەیەکی کۆمەڵایەتی-چینایەتی-سیاسی- بە ئامارو ئەژمارمان نەبوو، هەتا لەڕووی بابەتیەوە بسەلمێندرێ، ئایا لە کوردەواری دوای هەرەسیش، پارتیو بنەماڵەی بارزانی، ئەگەری سەرهەڵدانەوەیان هەیە یان نییە؟ ئەوەی یەکەم لەپەنجاکانەوە ئەزمونیان هەبوو. دەشیانزانی بنەماڵەی بارزانی لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە، پێگەیان لە کوردایەتیدا داکوتاوە. دوچاری شەڕی ناوخۆش (جەلالی-مەلایی) لەگەڵیاندا بوبون. کەچی، ئەو راستییە مێژوویانەیان تێکڕا لە ١٩٧٥ فەرامۆشکردو پێیانوابوو، هەرەسەکە، هەرەسی پێگەی کۆمەڵایەتیو سیاسی بنەماڵەو پێگە سیاسیەکەشیانە.

ئەوەی دووەمیش لە کۆمەڵەدا، فریوی شەوارەی تیۆریمان خواردبوو. لەو باوەڕەدا بوین، ١٩٧٥، دۆخی سەراپا وەرچەرخانە لە کوردایەتی کلاسیکیەوە، بۆ کوردایەتی فرەلایەنو سەرکەوتنی چەپەکان!

بڕیاری سیاسی رەهاو رێنوێنی تیۆری رەها، لەناو ژیانی دواکەوتوی کۆمەڵایەتیدا، کەمتر دەتوانێ ستراتیژێکی بابەتیی، بۆ خەباتی قۆناغی نوێی سیاسی، گەڵاڵە بکات. بۆچونە هەڵەکانی سەبارەت بە پێگەی کۆمەڵایەتی پارتی دەرکەوت. لەو هەلومەرجەدا کۆتایی نەهاتبوو!

دوای دامەزراندنی یەکێتی؛ دوای پێکەوەنانەوەی کۆمیتەی هەرێمەکانو هەڵنەهاتنیانو خۆئامادەکردنیان بۆ شۆڕش؛ دەرکردنی ئەو هەمگە بەیاننامەو هەڵسەنگاندنە سیاسی-تیۆریانە، لە دواسەرەنجامدا، لەناو واقیعی راستەقینەی کوردەواریو بارە چینایەتیەکەی کوردستاندا؛ راستیە چینایەتیەکانو حوکمە سیاسی-تیۆریە رەهاکان، دوای ساڵێک لە دامەزراندنی یەکێتیو بەرپاکردنی شۆڕش، چی دەرکەوتو چی رویدا؟

**یەکەم**: مەفرەزە سەرەتاییەکانی یەکێتی، بە رابەرایەتی برایم عەزوو عیزەت شەنگالیو هاوڕێکانیان، شەهیدکران.

**دووەم**: رێگەی گەیاندنی هاوکاری، چەکو تەقەمەنی، هاتوچۆی مەفرەزەکان گیرا. لەم رێگە گرتنەدا، حەسەن خۆشناو و هاوڕێکانی شەهید کران.

**سێهەم**: لەناو لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆندا، سەنگی شۆڕشی نوێ دابەزیو هەموو لایەک فشاری دەخستە سەر هەردوولا، شەڕی ناوخۆ رابگرنو ئاشتی بکەن. بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەوە کە یەکێتی زوڵمی لێکراوە.

**چوارەم**: یەک لایەنی سیاسی، بەئاشکرا، پشتیوانیی یەکێتییان نەکرد، لەو زوڵمەی لێی دەکرا.

**پێنجەم:** دەوڵەتی سوریاو لیبیا، دژی ناکۆکیو شەڕی ناوخۆ بوون، هەوڵیشیاندا، چارەسەر بکرێ.

**شەشەم:** یەکێتی، ناچار بوو، لە بڕیارە سیاسییە رەهاکانی پاشەکشە بکاتو بەدوای ئاشتەوایدا لەگەڵ پارتی بگەڕێ.

**حەوتەم:** لەناو وڵاتدا، یەکێتیو بزوتنەوە، دوو روانگەی جیاوازمان لەسەر پارتیو شەڕی ناوخۆ هەبوو.

**هەشتەم:** شەهید ئارامیش، کاتێک روداوەکان بەو ئاقارە نالەبارەدا ئاڕاستە کران، لەگەڵ پارتی-سلێمانی، رێکەوتنی (سورەبان-١٩٧٧)ی ئیمزا کرد.

ئاشتی راستەقینە نەکرا. هۆکارەکەشی پارتی بوو. شەڕ بەردەوام بوو. تا گەیشتە کارەساتی هەکاریش. ناچار یەکێتیش ناوچەی سۆرانی کۆنترۆڵ کرد.

دوای دوو ساڵ دەرکەوت، پارتی ئەو هێزە کۆمەڵایەتی-سیاسییە داڕوخاوە نەبوو، کە لەسەرەتای دامەزراندنی یەکێتیو لەدوای ١٩٧٥ دا، کۆمەڵەش وامان پێشبینی دەکرد.

دوای روخاندنی شا، دیسان یەکێتی هێرشەکانی راگەیاندنی بەرامبەر پارتی چڕتر کرد. چونکە، پارتی لەناو خەڵکدا، دۆخێکی دژواری توش بوو. ئەگەر حیزبی دیموکرات نەبوایە، لە تەواوی رۆژهەڵاتی کوردستاندا، پارتیەکان نەیاندەتوانی سەر دەربهێنن. بەڵام دیموکرات، سیاسەتی دەکردو رێگەی نەدا، خەڵک پەلاماریان بدات. زۆری نەبرد، لەسەر بەرپرسیارێتی هەڵکەندنی ناجوامێرانەی گۆڕی بارزانی، شەڕی دیموکراتەکان لەنێوان دیموکراتی باشورو دیموکراتی رۆژهەڵات قەوما. گەیشتە هاوکاری پارتی، لەگەڵ پاسداران دژی شۆڕشی رۆژهەڵات.

ئەم قۆناغە، لەدوای روخاندنی شاوە، بۆ هەردوو بەشی رۆژهەڵاتو باشوری کوردستان، سەراپا قۆناغێکی نوێ بوو:

- یەکەمین جار بوو، لە باشوردا شۆڕش هەبێو رۆژهەڵاتی کوردستانیش، نیمچە ئازاد بێو دوو هێزی سیاسی-چەکداری ئاشکرای هەبێ (دیموکراتو کۆمەڵە).
- ئێران، مەرکەزیەتی لاواز بوبوو. هێزە چەپو دیموکراتو لیبراڵەکانی ئێران، ئازاد بون.
- لە باکوری کوردستاندا، خەباتی سیاسی پەرەی سەندبوو. هێزی جیا جیای کوردستانی، دروست بوبوونو ئەدەبیاتی کوردایەتی بە نهێنی بڵاودەکرایەوە.
- لە رۆژئاوای کوردستانیشدا، تارادەیەک حکومەت چاوی لە جموجۆڵی سیاسی دەپۆشی!

- له باشوردا، یەکێتی پەرەی سەندبوو. پێشمەرگە ناوبانگی کاریگەری هەبوو. سەرکردایەتی یەکێتی-خۆی ناوزەنگ، کرابووە پایتەختی هێزە سیاسییەکان.

ئەو روداوانە، لە مێژووی دوو سەدەی کوردایەتیدا، رویاننەدابوو. لە شۆڕشی ئەیلولدا، راستە شۆڕشەکە، سەرەڕای سیاسەتی پارتی دژی لایەنە کوردستانییە شۆڕشگێڕەکان، لە هەردوو بەشی باکورو رۆژهەڵاتدا، زیانی لە پێگەی بارزانیو شۆڕشەکە دابوو، بەڵام بارزانیو شۆڕشەکەش، جێگەی ئومێدی زۆربەی کوردایەتیخوازانی بەشەکانی کوردستان بوون. هەربۆیە، یەک حیزب لە هیچ بەشێکی کوردستاندا نەبوو، سەرەڕای ئەوەی پارتی پەلاماریشی دەدان، پەیوەندی بە پارتییەوە نەبێ. بەڵام لە قۆناغی نوێی دوای روخاندنی شا، رەهەندی سیاسی لە زۆر بارەوە، لە قۆناغی شۆڕشی ئەیلولو شۆڕشی نوێش، هەتا روخاندنی شا، جیاواز بوو. وەلێ مەخابن، هێزە کوردستانییەکان تێکڕا، لەئاستی داڕشتنی بەرنامەیەکی سیاسی هاوبەشی ئەو قۆناغە نەبوین، تەنانەت لایەنی کەمی بەرنامەی هاوبەش.. نەک لایەنی دووریش. لێرەشدا دەرکەوتەوە، سەرکردایەتی تەواوی لایەنە کوردستانییەکان، لەناو کێشە ناوخۆییەکاندا، گیریان خواردبوو. ئاسۆی بیرکردنەوەیان، نەگەیشتبووە ئاستی روداوە گەورەو چارەنوسسازەکانی دەرەوەی نەتەوەی کورد.. بۆ ناوچەکە. ئەمەش، زادەی پێکهاتەی لاوازی بزوتنەوەی نەتەوایەتی.. کورد بوو، چونکە نەتەوەکەمان، لە سیاسەتی پاسیفەوە، وەرنەچەرخابوو، بۆ بزاوتی پۆزەتیڤ!

## ( ١٤ )
## وەرنەچەرخانو رواڵەت

چۆن لە سەدەی نۆزدەو هەژدەدا، هەر سەردارێکی کوردو دەڤەری هۆزێک، بە دابڕاویی لە زۆربەی سەردارو دەڤەرەکانی تر، ئەگەر خەباتیان بکردایە ناکۆکییان بەحوکمی واقیعی کوردەوارییەوە، لەبەرامبەر داگیرکەران، نەدەخستە لاوە، بەهەمان شێوە، لەبەرئەوەی لە کوردەواریدا، وەرچەرخانی ئابوری-کۆمەڵایەتی-سیاسیو سایکۆلۆژی (ئایین-مەزهەبی-ترادسیۆن) لە سەدەی بیستەمیشدا روینەدابوو. داگیرکەران، سیستەمی دەسەڵاتدارێتییان گۆڕیبوو، پاساکانیشیان گۆڕیبوو، بەڵام دۆخی کۆمەڵایەتی گۆڕانکاری بنچینەییان بەسەردا نەهاتبوو. هاتنی سەرمایەداری بێگانە، یان کۆلۆنیالیستی، زیاتر لە

سێ چارەکە سەدە، ڕواڵەتی دەسەڵاتەکانی دەگۆڕی، ناوەرۆکی کۆمەڵایەتی دەپاراست. هێندەی گۆڕانکاری دەکرد، بەرژەوەندیەکانی دابین بکات. ئەم سیاسەتە کۆلۆنیالیستیە، تەنها لەقازانجی حکومەتە بەکرێگیراو، یان پاشکۆکانیان بوو. چونکە پێداویستیە کۆمەڵایەتیەکانی شۆڕشی دیموکراسیان، پەکخست. کە گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی ڕونەدات، شۆڕشی دیموکراسیش بە چەمکە مۆدێرنەکەی هەرگیز ڕونـادات. ئەمەش هۆیەکی گرنگی مانەوەی شۆڤێنیزمی نەتەوە باڵادەستەکانی عەرەبو فارسو تورکیش بوو، دوای کۆلۆنیالیزم!

لەو چوارچێوە وەرنـەچـەرخـاوەی کۆمەڵایەتیدا، حیزبە سیاسیەکانی چلەکانی کوردستان، پاشان، حەفتاکانیش، دامەزران. کە هەلومەرجی دوای ڕوخاندنی شا، قۆناغێکی نوێی سیاسی لەڕووی بابەتیەوە هێنایەئاراوە، بەڵام لەڕووی خۆییەوە، ئاستی سیاسی-ئایدیۆلۆژی-ستراتیژی سەرجەم لایەنە کوردستانیەکان، لە ئاستی هەلومەرجی بابەتیی ڕەخساوی قۆناغە نوێیەکەدا نەبوو. بۆیە، بەهۆی نەبونی بەرنامەیەکی هاوبەشەوە، هەر لایەکی سیاسی قۆناغە نوێیەکە، لە ئاوازێکی دەخوێند. هەوڵە پچڕپچڕەکانیش نەیانتوانی کێشەکان چارەسەر بکەن. دوو دوو، یان زیاتر حیزبەکان، کە لەناو خۆیاندا دۆستایەتیان دەکرد، یان ڕێکدەکەوتن، یان لەترسی لەناوچونیان، یاخود لەبەر ناکۆکی لایەنەکانی بەرامبەریان وایان دەکرد، نەک لەبەر ئەرکە ستراتیژیە دیموکراسیەکەی نەتەوەکەمان:

- پارتیو سۆسیالیستو پاسۆک، دژی یەکێتی ڕێکەوتن.

- دیموکرات، لەبەرامبەر یەکێتیو کۆمەڵەی زەحمەتکێشان، دۆستایەتی پارتیو سۆسیالیستی دەکرد.

- یەکێتیو کۆمەڵە، لەبەرامبەر لایەنەکانی دیکەدا، هاوکاری یەکتریان دەکرد.

- پارتیو سۆسیالیست، دۆستایەتی ئێرانیان، دژی یەکێتیو عێراق مسۆگەر کرد.

- یەکێتی، سەرنەکەوت لە قایلکردنی دۆستایەتی ئێران، ناوبەناو نەبێ.

- سۆسیالیست، دژی یەکێتی، مفاوەزاتی کرد، سەرینەگرت.

- یەکێتی، شـەڕی هەموو لایەکی گـەرم کرد، مفاوزات لەگەڵ عێراق سەربخات، نەگەیشتە ڕێکەوتن.

- حیزبی شیوعی، لەناو هەموو لایەنەکاندا، دۆستایەتی دەکرد. بەڵام بە هەڵەی چەند سەرکردەیەکیان، کەوتنە بەرەی جودو شەڕی یەکێتی!

- لە دۆخی ئەنفالەکاندا، کە هەموو لایەک مەترسی لەناوچونیان هاتەئارا، ئینجا بەرەی

کوردستانی، لەژێر فشاری ئێران دامەزرا!

ئێستا، کە لەناو گێژاوی ئەو دۆخە دەرهاتوین، ئاورێکی پڕ لە رامانی سیاسی دەدەینەوە، بە دەرسوەرگرتن لەو رابوردووە ئاڵۆزو خوێناوییە، دەڕوانین.. جوان جوان دەردەکەوێ، لەو قۆناغە نوێیەدا، هێزە کوردستانیەکان لەئاستی بەرپرسیارێتی قۆناغەکەدا نەبوین! ئەمە لەکاتێکدا:

- سەرکردایەتی پارتی؛ رابەرایەتیەکەی بەدەستی نەوەی یەکەمی کوردایەتی شەستەکان بوو.

- سەرکردایەتی یەکێتی؛ رابەرایەتیەکەی بەدەست نەوەی یەکەمی کوردایەتی شەستەکان بوو.

- سەرکردایەتی حیزبی دیموکرات؛ رابەرایەتیەکەی بەدەست نەوەی یەکەمی کوردایەتی پەنجاکان بوو.

- حیزبی شیوعی؛ رابەرایەتیەکەی بەدەست نەوەی یەکەمی پەنجاکان بوو.

-سۆسیالیست؛ رابەرایەتیەکەی بەدەست نەوەی یەکەمی شەستەکان بوو.

- تەنها کۆمەڵەی زەحمەتکێشان، رابەرایەتیەکەی بەدەست نەوەی دووەمی خەباتی چەپەکان بوو.

- کۆمیتەی هەرێمەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانیش، رابەرایەتیەکەی لێسەندرابوو!

بەوشێوەیە، نەوەی یەکەمی رابەرایەتی کوردایەتی، لە قۆناغی نوێی سیاسی دوای روخاندنی شادا، سیاسەتی قووڵکردنی ناکۆکی سیاسی ناوخۆیی، بەسەر ئەرکەکانی رزگاری نەتەوایەتیدا، زاڵکردو ساڵەهایان لە هەلی سیاسی بۆ پێشکەوتنی کوردایەتی، بەو سیاسەتە لەدەست نەتەوەکەمان دا. کە ئەگەر هاتباو لایەنی کەمی هاوکاری سیاسی لەنێوان لایەنە سیاسیەکاندا، دەستەبەر کرابا، رەنگدانەوەی پۆزەتیڤی لەسەر کۆی روداوەکان، لە قۆناغەکانی تریشدا دەبوو. نەتەوەی کوردیش، لە گەلێ کارەساتی سیاسی-پێشمەرگایەتی، دەپارێزرا.

نەوەی دووەمیش، ناتوانین ئۆباڵی سیاسی لەو قۆناغەدا، لەخۆمان داماڵین. روداوەکانیش لە رێڕەوی رۆژگار دابڕین.. بمانەوێ و نەمانەوێ، هیچ نەبێ ئەگەر رەخنەشمان لەو سیاسەتە بوبێ، یان هەڵوێستی جیاوازیشمان لەو دۆخەدا دەربڕیبێ، بەلام لەدوائەنجامدا، نەوەی دووەمی سیاسی، کە لەناو سەرکردایەتی لایەنەکاندا پێگەمان هەبوو، نەمانتوانی

بڕیاری لێبڕاومان بەرامبەر ئەو سیاسەتە سەپێنراوە هەبێ. کاتێکیش ئاڵای شۆڕش بڕیاری جیابونەوەمان دا، هەم قۆناغەکە جێهێشتبوین‌و هەم تاوان بەرامبەرمان کرا و ڕێگە گیرا پارسەنگێک بەرامبەر بەو هەڵانە، دروست بکەین!

ڕەوتی زەحمەتکێشانیش، کە لە سۆسیالیست بە ئاڕاستەی چەپ جیابونەوە، ئەمانیش، جگەلەوەی دژایەتی کران، هەڵەی هەردوولامان، نەبونی لایەنی کەمی لێکتێگەیشتن بوو لەنێوانماندا. ئەگەر لەیەک گەیشتباین، ڕەنگبوو فریای بڕیاری شیاوتر لەو دۆخەدا کەوتباین. هەڵەی دوای ئەوەش، کەمتر ڕویدابا!

کە دەریشکەوت لەکوردستاندا کۆمەڵە بەلای ڕاستڕەویدا لایداوە، جگە لە ئاڵای شۆڕش، گروپ‌و ڕەوتی تریش، لە هەناوی کۆمەڵە جیابونەوەو لەدەرەوەی کۆمەڵەش، هی تر سەریانهەڵدا. بەڵام هەمویان گیرۆدەی ڕەوشی تیۆری-ئایدیۆلۆژی بون، بایەخی خەباتی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کوردیان نەدەزانی. زۆربەشیان کەوتنە ژێر کاریگەری حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاری. بەڵام لەدوائەنجامدا، سەبارەت بەم گروپانە، دەرکەوتن کە خوێندنەوەیەکی بابەتییان بۆ دۆخی کۆمەڵایەتی کوردستان لەڕووی چینایەتیەوە، لاواز بوو. نە لەناو خۆیاندا ڕێکدەکەوتن‌و نە لایەنی کەمی یەکێتی خەباتی شۆڕشگێڕانەشیان قبوڵ بوو. چارەنوسی حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاری ئێران، بەرەو چەندین جیابونەوە شکایەوە. ئەو گروپانەش، تەنها ڕەوتی کۆمۆنیستیی خۆیان ڕێکخست‌و تا ئێستاش، بەئەندازەی خۆیان لەناو ڕوداوەکاندا، بەردەوامن. باقی گروپە مارکسیستەکان، لەناوچون.

## (١٥)
## شەڕی ناوخۆی قۆناغی نوێ

ئەو هەڵە ستراتیژیەی ڕابەرایەتی نەوەی یەکەم، لەناو هەمو لایەنە سیاسیەکانی باشورو ڕۆژهەڵات، هەتا بەرپابونی جەنگی عێراق-ئێران درێژەی کێشا. هەموو لایەنەکان لەو بڕوایەدا بون، ئەم جەنگە، هەلێکی دەگمەنە بۆ بەرنامەو بڕیارە حیزبیە تەسکەکان. ناکۆکیەکان قووڵتر دەکران، کێشە سیاسیەکان تێکەڵاوی هاوکێشە نوێیەکەی جەنگ کران. ئەوەی مایەی ترسی گەورە بوو، ئەوەبوو کە: پارتی، سۆسیالیست، پاسۆک، بە دۆستایەتی حیزبی دیموکرات، دۆخەکەیان بۆ سەرکەوتن بەسەر یەکێتی، نەک لە دەڤەرەکاندا، بەڵکو

لە سەرکردایەتی یەکێتیدا، گەیاندە بەرنامەی عەسکەری هاوبەش. ئەمەیان زەنگێکی هەرە مەترسیداری قووڵکردنی شەڕی ناوخۆ بوو، لە شەڕی لۆکاڵی نێوان دوو حیزب، بۆ ئاستی باڵاتری هاوکاری سیاسی چەندین لایەنی سیاسی، دژی لایەکی سیاسی. تاڕادەیەک شەڕی ناوخۆ، لە قۆناغی نوێی دوای "شا"وە بەرزکرایەوە، بۆ شەڕێکی نوێی فراوانی ناوخۆ. لەم قۆناغەدا، لە هەردوو بەشی رۆژهەڵاتو باشوری کوردستاندا، تەنها کۆمەڵەی زەحمەتکێشان لەسەر دۆستایەتی لەگەڵ یەکێتیدا، بەردەوام بوون.

پارتی، ئەم دۆخەی بە هەل زانی بیقۆزێتەوە. بەتایبەتی لەدوای روخاندنی شا، لە هەندێک شارو دێهاتی رۆژهەڵاتی کوردستاندا، فشاریان دەخرایە سەر. کە زانییان کۆماری ئیسلامی ئێران زیاتر پشتیوانی ئەوان دەکاتو حیزبی سۆسیالیستو پاسۆکیش، داویانەتە پاڵیان، ئەمانیش نەیاندەویست هەلەکە لەدەست بدەن. دیموکراتیش هاوکاری بۆ دابینکردبون، ئیتر بە هەلێکی بێوێنەیان زانیبوو، دوای کۆنترۆڵکردنی بادینان، لە سۆرانیشدا، تەنگ بە سەرکردایەتی یەکێتی هەڵبچنن‌و گورزی لێبدەن. ئەمە لەکاتێکدا، خوێنی شەهید عەلی عەسکەری‌و د.خالید وشک نەبوبوەوە، کەچی، سۆسیالیست خۆی هاویشتە ناو پەیمانێکی مەترسیداری واوە.

سەرەتای پاییزی ١٩٨٠، ئەو دەڤەرە، ئەمبەرو ئەوبەری چەمەکە، لە گوێزێ، قەڵاتوکان، بێدەلان‌و گۆڕەشێر، لەمبەریشەوە، شێنێ، قووڵە هەرمێ، زەڵێ لەسەر شاخی سورو سەری کۆلکی‌و مامۆڵە، پشتی بێدەلانیش، هێزی شارەزوور بەسەرپەرشتی سالار عەزیز، لە شێنێ بە سەرپەرشتی بەندە، ناوچەکەمان قایم کرد.

هێزی پارتی-سۆسیالیست، بە سەپۆرتی حیزبی دیموکرات، زیاتر لە (٧٠٠) کەسیان هێنابوو. لەوکاتەدا، جاشەکانی عێراقیش لە (١٩/١٠/١٩٨٠) لوتکەی مامەندەیان گرت. یەکێتی ناچار بوین، بەشێکی هێزەکە بۆ رزگارکردنی مامەندە تەرخان بکەین. (٧) شەهید بەخشرا. مامەندە رزگار کرا. پێشمەرگەی یەکێتی، قارەمانێتیەکی بێوێنەیان لە رزگارکردنی مامەندەدا نواند. تەنها لە قۆڵەکەی من (٣) شەهیدمان هەبوو.[*] دوو پێشمەرگەی دەستەکەی خۆم بەناوی (رەزا خاوێ‌و شاخەوان) بریندار کران.

ئەم شەڕە، لەڕووی سایکۆلۆژیەوە، کاریگەری لەسەر هێزەکەی سۆسیالیست دانا. ئەوکاتە محەمەد وەتمان‌و شێخ مەنسوری حەفیدو محەمەدی حاجی شێخە هاتنەلامان‌و

---

* شەهیدان مامە رەشەی گەلاڵی، محەمەد خالید، مستەفا زۆراب لە مامەندە شەهید کران. کەسوکاری مستەفا زۆراب هاتن تەرمەکەیان بردەوە. سەرپەرشتی لە قەبر دەرهێنان‌و بەڕێکردنی جەنازەکەم کردو قسەشم بۆ ئامادەبوان کرد.

باسی کاریگەری شەڕەکەیان لەسەر هێزەکانی پارتی-سۆسیالیست کرد.

کۆمەڵەی زەحمەتکێشان بە رابەرایەتی "مینەی حوسامی" هێزێکی (٢٠٠) پێشمەرگەیی هێنایە گوندی داووداوا. بە موختارەکەدا، پەیامیان نارد بۆ هێزەکانی پارتی-سۆسیالیست، کە ئەگەر لە خاکی کوردستانی ئێرانەوە هێرشبکەنە سەر یەکێتی، لێیاندەدەین. ئەم پەیامە، هاوکاتی سەرکەوتنەکەی مامەندەو ناوبژی حیزبی شیوعیش، ڕێسا عەسکەرییەکەی گۆڕی. چەند رۆژێکی نەبرد پارتی کشانەوە. بەڵام یەکێتی، رقێکی ئەستوری لا دروست بوو.(+)

ئەم پیلانە بۆ هێرشکردنە سەر سەرکردایەتی، لای پارتیو سۆسیالیست، خرابوە ناو نانێکی گەرم. بەریدی سۆسیالیست لە دۆڵی جافایەتی، لە ڕێگەی تەتەرەکەیانەوە کە ناوی (بەکرە رەش) بوو، جەبار فەرمان لەناویاندا چاندبووی، دەیهێنا بۆ مەکتەبی سیاسی، کۆپی دەکراو رەوانەی مەکتەبی سیاسی سۆسیالیست دەکرا. بەوهۆیەوە، هەموو نهێنیەکانی مەکتەبی سیاسیو هێزی سۆسیالیست لە دۆڵی جافایەتی-سلێمانی، لای یەکێتی ئاشکرا بوو. لە نامەیەکدا، هی (ملازم تایەر- شێرکۆی شێخ عەلی) بۆ مەکتەبی سیاسیان، باسی ئەوە دەکەن کە ناردویانە بەدوای سەید کاکەو هێزی هەولێر بێن. پارتی ئاگادار بکرێتەوە هێزەکەیان لەکاتی دیاریکراودا، بهێنو لە یەک ساتوکاتدا، بێ دواکەوتن، هێزی سلێمانی لەپشت شاخی هێرۆ-توژەڵەوە هەڵبکوتنە سەر "جەلالیە خۆفرۆشەکان" پارتیو سۆسیالیستەکانیش، لە قۆڵی شێنێو خڕی ناوزەنگەوە هێرش بکەن. ئەم زانیارییەی بەهۆی بەکرە رەشەوە(*) دەستکەوت، بە وردیی لەلایەن:

مام جەلال، نەوشیروان مستەفا، فەرەیدون عەبدولقادرو مەلا بەختیارەوە، تاوتوێ کراو بە مەترسییەکی گەورە لەسەر چارەنوسی یەکێتی زانرا. دەبوو کارێک بکرێ، جارێکی دیکە، گەلەکۆمەکێ، لەسەر سەرکردایەتی رونەداتەوە. بۆیە، بڕیار درا، هێزی "حسک" لە دۆڵی جافایەتی، پاکبکرێتەوە.

لە کتێبی (هەڵۆ سوورەکانی قەندیل)دا، بەمشێوەیە باسی بڕیاری رەسمی ئەو شەڕەو رووداوەکەش دەکات:

"لە کۆتایی تەمموزی ساڵی ١٩٨٠ دا، لە کۆبونەوەیەکی (ناوەندی کۆمەڵە)و دواتریش لە

---

+ نوسەری کتێبی (چەپکێک)، لە بارەگای خۆی لە شێنێ، بە دووربین سەیری شەڕەکەی دەکرد. ڕێی نەدا، برا و پێشمەرگەکانیشی بەشداری شەڕەکە بکەن. شەو لە هاتنەخوارەوەدا، پشویەکم لە بارەگاکەی دا. کەچی لە تانەو تەشەری ترسنۆکیی، نەکەوت، توند وەلامم دایەوە!

* بەکرە رەش، ئێستاش ماوە.

مەکتەبی سیاسی (یەکێتی)دا، باس لەوە کرا، کە هێزێک رەوانە بکرێ بۆ ناوچەکانی دۆڵی جافایەتیو سنوری هەرێمی ٢ کە (جەمالی عەلی باپیر)، فەرماندەکەی بوو! تەنانەت قسە و باسێکیش لەئارادا بوو بۆ ئاڵوگۆرپێکردنیو بڕیار درا (مەلا بەختیار)، سەرکردایەتی ئەو هێزە بکاتو ئەرکەکانی جێبەجێ بکات. (مەلا بەختیار) هێزەکەی (جەمالی عەلی باپیر)ی لەگەڵدا بوو. هێزەکانی (حسک)یش لەو ناوچەیە فەرماندەکەیان (شێرکۆی شێخ عەلی) بوو. ئەو ناوچەیەش وەک هەموو شوێنەکانی تر، زۆرجار ناکۆکیو ململانێی نابەجێ روی تێدەکرد، بەڵام سەرکردایەتی (یەکێتی)، هەوڵی دەدا بە رێگەی ئاشتیو هێمنانە چارەسەریان بکات، ئیتر (جەمالی عەلی باپیر)، بۆ بەرقەرارکردنی ئاشتیو بەپیرەوەچوونی داواکەی سەرکردایەتی بە میوانی دەچێتە کانی رەشی سێکانیان! بەداخەوە لەباتی ئەوەی، کە بتوانن بە هێمنیو لەسەر پێکەوەهەڵکردن رێککەون، کەچی دەبێتە دەمەقاڵێو پێکداهەڵپژانو شەڕ، لەئەنجامدا رۆژی ١٩٨١/٨/٢٣ (شێرکۆ و جەمال) یەکتر شەهید دەکەنو ١٠ پێشمەرگەی تریش دەبنە قوربانیو تێکڕا لەهەردوولا ١٢ شەهیدو ٩ بریندار، ئاگری شەڕو ململانێکان هێندەی تر گەرم دەکەنو بەمەش شەڕە بەیاننامە دژی یەکتر دەرگای بۆ ئاوەڵا دەبێتو زمانی زبرو میل زاکێشانی چەک لەیەکتر، شوێن بە ئاشتیو زمانی هاوکاری لێژ دەکات!

(حسک) بە سەرکردایەتی (سەید کاکە)، هێزێکی ناردە دۆڵی جافەتیو لە چەند شوێنێکی جیاجیادا پەلاماری هێزەکانی یەکێتیانداو (یەکێتی)ش هێزێکی هەرێمی ٥ی قەراخی ناردە هاوکاری هێزەکەی (یەکێتی)، لە دۆڵی جافایەتیو توانیان هێزەکەی (سەید کاکە)، ناچار بکەن بگەڕێتەوە ناوچەی خۆشناوەتی! لە خۆشناوەتیو لە بەری کۆیەو لە بەستی شەرغە چەند جارێک هێزەکانی هەردوولا دەچونە سەر یەکتر و لەکوێ فرسەتیان لەیەکتر بهێنایە پەلاماری یەکتریان دەداو پێشمەرگەی یەکتریان چەک دەکرد! ئیتر ماوەیەک کاری هێزەکەی (حسک)، بوبوو بە چەک کردنی پێشمەرگەی (یەکێتی)و هێزەکانی ئێمەش وەک ئەوان هەرچیان بۆ بکرایە درێخیان نەدەکرد!

بەرە بەرە دوای خۆ رێکخستنی هێزەکان لەناو هەردوو بەرەی (جود)و بەرەی (جوقد) ا، تادەهات ململانێی دوژمنکارانە لەنێوان هێزو لایەنەکانی کوردستاندا تینی دەسەند. تا لە ساڵی ١٩٨١ەوە کار گەیشتە ئەوەی، کە لایەنەکانی (جود) گەلەکۆمەکێ لە (یەکێتی)، بکەن بەمەبەستی لاوازکردنیو تەنگ پێ هەڵچنینیو بە نیازی خۆسەپاندنی لایەنەکانی (جود) بەسەر (یەکێتی)دا! کە لەئەنجامدا ئەو شەڕو ململانێ ناوخۆیانە بە خوێنی دەیان

پێشمەرگەو فەرماندەی قارەمانی کورد تەواو بوو!".[1]

ئەو شەڕەی کە تیایدا، جەمال عەلی باپیرو شێرکۆی شێخ عەلی بونە قوربانی، کە لەراستیدا، نەخشەکە وامان دانا، کە کەسی تیا نەکوژرێ، بەڵام پەلەکردن لە جێبەجێکردنی نەخشەکە، پێش گەیشتنی ئێمە، روداوەکەی هەڵگێڕایەوە.[+]

نوسەر، چونکە لە تەواوی ئەو روداوانەشدا، وەکو کەسێکی پەراوێزخراو بوو، چەند لاپەڕەیەکی بێسەروبەری لەسەر ئەو روداوە گەورەیە نوسیووە. باسی هێزەکانو فەرماندەکانیانو سەرپەرشتی ئێمەی هەر نەکردووە!!

بۆ مێژوو، حیزبی شیوعی، لەم روداوانەدا رۆڵێکی پۆزەتیڤیان بۆ چارەسەری کێشەکە گێڕا.

## ( ١٦ )
## هەڵگەڕانەوە لە هەرێمی یەك

سنوری هەرێمی یەک، کە دەکاتە ناوچەکانی هەڵەبجە، هەورامان، سەید سادق، عەربەت، زەڕایەن، سیروان، شەمێرانو لاورانو تاوگۆزی، هەڵکەوتەیەکی سیاسیو عەسکەری زۆر گرنگ بوو، بۆ یەکێتیو شۆڕشی نوێ. بۆیە، لەسەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەوە، شانەکانی رۆشنبیری تیا دامەزراوە. لەدوای دامەزراندنی یەکێتیشەوە، پەلی بۆ هاویشتووە. هاوکات، مەفرەزەی ئەم هەرێمە، لەگەڵ دەرچونی مەفرەزەی دۆڵی جافایەتی-سلێمانی، زەنگی شۆڕشیان راگەیاند.[*]

ئەم هەرێمە، دەکەوێتە ئامێزی زنجیرە چیاکانی هەورامان، سورێن، شنروێ تا دەگاتە

١ فەرەیدون عەبدولقادر. هەڵۆ سوورەکانی قەندیل. دەزگای چاپو پەخشی سەردەم. چاپی یەکەم. سلێمانی-زستانی ٢٠١٧. ل(٣٧٦-٣٧٧).

+ نوسەری کتێبی (چەپکێک) لەمبارەوە راستیەکانی چەواشە کردووە، باسی بەندە دەکات گوایە جەمالی عەلی باپیرم تورەکردبێو پێم وتبێ: نەرمی بەرامبەر شێرکۆ. بەپێچەوانەوە، جەبار فەرمان وای پێوتبوو. کاتێک جەمال شەهید کرا، قسەیان لەگەڵ جەباردا نەبوو. پێشمەرگە دێرینەکان دەزانن چەند هاوڕێیەتیمان لەگەڵ جەمالدا خۆشبوو. کاتی خۆی ئێمە هەرێمەکەمان بۆ جەمال دروستکردو چل چەکی ئەو کەسانەی چەکمان کردن (چونکە پەیوەندییان بە رژێمەوە کردبوو) دام بە جەمال. لە یەکەمین کۆنفرانسیشدا، پشتیوانیی رەوتی ئێمەی دەکرد.

* یەکەمین جار، بەناوی کۆمیتەی هەرێمەکانەوە، بەندە بڕیارنامەی چونەدەرەوەی یەکەمین مەفرەزەی هەرێمەکەم، لەرێی شەهید وەستا ئەنوەری براگەورەی شێخ عەلیەوە، بۆ ناردن، هەتا مانگی ١٢/ی ١٩٧٦، پەیوەندی رێکخستنو کاروباری ئیدارییان پێوە دەکردین.

ناوچە سەختەکانی شەمێران، لاوران و تاوگۆزیو نزیک دەبێتەوە لە چیای زمناکۆش. سنورێکی درێژی لەگەڵ ئێراندا هەیە. بەزۆریی، جاف، هەورامی، نەورۆلی، ئێناخی، کۆکویی، کاکەیی، غەوارە، گەلالی، هارونی، شێخ سمایلی، کەڵهوڕی، کلاشی، عەمەڵە، تاوگۆزی، ئیمامی، سەتانی، نیشتەجێی سنورەکەن.

لە دەستپێکردنی شۆڕشەوە، یەکێتی لەناوچەکەدا خۆی چەسپاندو کە شەڕی ناوخۆ لە بادیناندا دژی یەکێتی گەرم کرا، یەکێتیش ئەم هەرێمەی کۆنترۆڵ کرد. پارتیەکانی بە کەمترین شەڕو خوێنڕشتن، دورخستەوە.

کۆمەڵە داینەمۆی شۆڕشەکە بوو؛ بەلام هەڵەی گەورەی کۆمەڵە لەناو یەکێتیدا ئەوە بوو، لە هەندێک شوێندا بە کەمترین کادر، زۆرترین عەشایری لە مەفرەزەکاندا کۆکردەوە (عەشایر وەکو ئەقلیەتو نەریت، نەک وەکو ئاغا و دەرەبەگ) عەشایریش، کە هێز لە دەوری خۆی دەبینیو هێزەکەی دەبێتە هێزی بالادەستی عەسکەری لەناو بزوتنەوەی چەکداریدا، زۆر کەم لەسەر رێبازی چەپ یان دیموکراسی دەمێنێتەوە. شێخ عەلی، تێکۆشەرێکی جوامێر بوو. بەلام لەسەرەتای شۆڕشەوە، یەکێتی کەمترین چەکی بۆ دابین کرد. بۆیە کەمترین هاوڕێی پێشمەرگەی لەگەڵدا بوو. کە چەکەکانی دەرەوەی ولاتیش گەیشتن، هەر بێبەش کرا. سالێکی نەخایاند، کێشەکانی نێوان کۆمەڵەو بزوتنەوە، لەم هەرێمەدا رەنگیدایەوە. سەرەتا، شەوکەتی حاجی موشیر، یەکەمین یاخیبوونی لە کۆمەڵە تۆمار کردو جیابونەوەی (خرنوک-١٩٧٧)ی قەوماند. ئەم جیابونەوەیە، بەردەوام پوازی دوبەرەکیو کێشمەکێشی لاوەکی، لەناو کۆمەڵەو هێزەکەدا، کوتا. ئاسەوارەکەی مایەوە، هەتا ئێمەش کراینە یەکەمین ئامر هەرێمی هەرێمەکە.(+)

(١٩٧٨/٤/٢١) گەیشتمە سنوری هەرێمەکە. لە شارباژێڕی سەختەوە، بەرەو رەزڵەو دۆڵی پەرخ، لەوێوە، بەرەو سورێن کەوتینەڕێ. هەرێمەکە، سێ کەرت بوون:

- کەرتی؛ حەمەی حاجی مەحمود-شەهید رەئوفی خەلیفە سەعید.
- کەرتی؛ شەوکەتی حاجی موشیر.
- کەرتی؛ هەورامان-هەڵەبجە، لە پشتی شنروێ-بناری سیروانو دامێنی گریانە بون.

-مەفرەزەی خالیدی خولە سوریشی لێبوو.. پابەندی هیچ کەرتێک نەدەبوو. لاسارو یاخی بوو. زانیمان پەیوەندی بە ئیستخباراتەوە کردبوو. کە چوین چەکی بکەین هەتا

+ پێش بەرێکەوتنی هەڵمەتی هەکاری، بە بڕیاری مەکتەبی عەسکەریو ئیمزای عەلی عەسکەری ١٩٧٨/٤/١٤ کرامە ئامر هەرێمی هەورامان.

ئێمە گەیشتینە دۆڵە سور، حەمەی حاجی سابیر ناسیاوی بوو، تومەز لەژێرەوە هەواڵی بۆ ناردبوو، ئەویش پێش گەیشتنی ئێمە خۆی کردەوە بە حکومەتدا.

حەمەی حاجی مەحمود، شێخ عەلیو حامیدی حاجی غالی، بەرەو هەکاری رۆشتبونو چارەنوسیان دیار نەبوو.

هەرێمەکە، بەناو هەرێم بوو. بارەگای نەبوو. چەکەکانی سوک، تەنها یەک ئار بی چی تیابوو. بی کەی سی نەبوو. ئامێری پەیوەندی نەبوو. هیچ داهاتێکیشی نەبوو.

کەرتەکانی، محەمەدی حاجی مەحمود (کە ئەوکاتە شەهید رەئوفی خەلیفە سەعید سەرپەرشتی دەکرد) لەگەڵ کەرتی شەوکەتی حاجی موشیر، شیرو تیریان لەیەک دەسوو. هەردوولایان داوایان لێدەکردم، لاکەی تر چەک بکەم. لەکاتێکدا، من مەفرەزەیەکم هەبوو، ئەوان دوو بەرامبەر ئێمە بوون. شەڕکەریش بوون. ئەمە جگەلەوەی شەوکەت، محەمەدی حاجی مەحمود، شەهید عەلی شیعەو حامیدی حاجی غالی، ئەندامی لیژنەی هەرێم بوون لەگەڵمدا، دەبوایە پرس بە هەمویان بکەمو لەوێش نەبوون.

## (١٧)
## هەرێمێك هەمیشە لە کەمین

هەرێمەکە، چەند بۆ شۆڕش هەڵکەوتەیەکی گرنگ بوو، بۆ حکومەتیش گرنگتر بوو. چونکە، ناوچەیەکی بەپیتو فەڕی کشتوکاڵیو لەسەر سنوری ئێران بوو. لە زنی سیروانەوە، کاریگەری لەسەر بەنداوی دەربەندیخان هەبوو. بۆیە، دوو لیوای لە هەڵەبجەو سەید سادقدا مۆڵ دابوو. یەکەمین مەفرەزە خاسەشی بۆ (نادر هەورامی)[+]

[+] کە حکومەت دەیویست سەرەتا مەفرەزە خاسەکان دروستبکات، بڕیاردرا، ئەوانەی گفتیان داوە ببنە ئامر مەفرەزە لەناوببرێن. بەپێی ئەم بڕیارە: عومەر گورچیلە، عەزیزی میرزا کەریم لەناوبران. فەرهادی مەلا رەزا، کە خیانەتی لە شەهید یاسینە رەش کردو بەگرتی داو لەسێدارە درا، ئەمیش بڕیاری کوشتنی دەرکرا. چەکی هەڵگرت.. لە بازیان کوژرا. نالە هەورامی، بەڵێنی دابوو لە هەڵەبجە مەفرەزەی خاسە دروستبکات. سوسە کرابوو کە هاتوچۆی ئوتێل هەورامان-سەرەتای جادەی گوران دەکات، بۆ لای باقی هەورامی. بەئاسانی دەکوژرا. بەلام مام عەبدولخالق هەورامی بۆی تێکەوت.. گفتی دابوو گوایە چەک هەڵنەگرێ. کە ئاسان دەکوژرا، بەهۆی مام عەبدولخالقەوە وازی لێهێنرا. کەچی چەکی هەڵگرتو جاشی خاسەی دروستکردو تاوانی زۆریشی کرد. سەرەنجام، حکومەت خۆی کوشتی!

دروستکردبوو. جار جار ساله خەیاتیش بۆ پەلامار لەگەڵ ڕەوە جاشەکانی دەهێنران. کاتێک من گەیشتم، حاکم کامەرانیش، کە لە پێشمەرگە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە بوو، لەبەر هەندێ کێشە لەگەڵ ئامر کەرتەکان. لە بیروڕای مارکسیستی، هەڵدێرا بۆ جاشایەتی.

هەرێمەکە هەمیشە، لە ئینزاری (جیم)دا بوین. چونکە گەر ڕەوە جاشەکان سوسەیان بکردینایە، دەهاتن‌و شەڕ دەقەوماو دوای نیو سەعات کۆپتەریش دەهات. لەپشتیشمانەوە، لە زەمانی شادا (پێش ڕاپەڕینی گەلانی ئێران بە ساڵ‌و نیوێک) قیادەی موەقەتەی پارتی، لە دێی دزلی بون، کە دێیەکی گەورەو خۆشی هەورامین. هەمیشە پاسگای ئێرانی لێبوو. ئەم دێیە، لە شۆڕشەکانی شێخ مەحموددا، ڕۆڵی قارەمانانەیان بە سەرداریێتی مەحمود خانی دزلی، گێڕاوە. دوای ئەوەی ئینگلیز سلێمانی داگیرکردەوە، مەحمود خانی دزلی لەشکری هێناو ڕزگاری کرد. کەچی لە شۆڕشی نوێدا، لە ڕۆژگاری نالەباری سیاسیدا، بە زۆرەملێ، کردبویانە پەناگای هێزێکی (٢٥-٣٠) کەسی‌و بەردەوام، هەتا من لەوێ بوم، دەبوایە شەوان کەمین بۆ پشتی خۆمان، بەرەو ڕووی سورێن دابنێین، چونکە لەپشتی سورێنەوە دزەیان دژمان دەکرد. بەهەمان شێوە، لە دێی (شێخ سێڵە) پشتی (کانی ژنان) ناوچەی تاوگۆزی، هێزێکی تری پارتی لێبوو، کە دێیەکی ناوچەی زەهاوی ڕۆژهەڵاتی کوردستانە. پاسگای ئێرانی نزیکی بوو. قالەی حەمەساڵح‌و عەزیزی حەمە ساڵحی برای سەرپەرشتییان دەکردن. ئەمانیش گێچەڵیان بە پێشمەرگەکانی یەکێتی دەفرۆشت. بەوشێوەیە لەپێشەوە حکومەت پەیتا پەیتا پەلاماری دەداو لەپشتیشەوە، ئەو دوو هێزەی پارتی لە هەڵی دەستوەشاندندا بوون.

هەرێمەکە، هەتا بڵێی هیلاک بووین. شەو و ڕۆژ، لە کەمین، جاروبار شەڕ. کشانەوە بۆ سورێن، کە شاخێکی قاقڕ (وشک‌و برینگ) بوو، ئەشکەوتەکانی هەزار ستون‌و سوڵتان، ئاژەڵیان تیا مۆڵدەدرا؛ هاوینان، کێچ وژەیـان دەهـات‌و پێشمەرگە نەبوو، بەژنی ئاژنی کێچ نەبێ. شەمشەمەکوێرەش بە بنمیچەکەوە، سەدانیان فرە فڕیان بوو. بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر، لەناو قووڵایی‌و تاریکی ئەشکەوتەکەدا، بەپێی سیستەمی غەریزی، بەناو یەکدا دەهاتن‌و دەفڕین‌و دەنوسان بە بەردە ڕکنەکانی ئەشکەوتەکەوە، بەبێ ئەوەی بەر یەک بکەون. پێشمەرگە، جاری وا هەبوو، بەناچاریی، بەتایبەتی لە قرچەی هاوین‌و باراندا، لەو ئەشکەوتانەدا، پشوی دەدا. پشوی خۆپاراستن لە دوژمن‌و ئاشنایەتی لەگەڵ کێچ‌و شەمشەمەکوێرە!!

ناخۆشتریش لەوانە، برسێتی بوو. بە ڕۆژ زۆر کەم دادەکەوتینە دێهاتی بناری سورێن‌و شارەزوور؛ شەوان یان خۆمان یان پێشمەرگەمان دەنارد، نان‌و جاری وا هەبوو تەماتەو

خەیار، ئەگەر هێلکەیان بهێنایە، شاگەشکە دەبوین. تەماتەو نان، ماوەیەکی کەم تێرت دەکات، برسێتی تین دەهێنێتەوە. ئیتر تا شەو، وەکو پێشینان وتویانە: برسێتی رەگی هاریی پێوەیە.. بەردەوام لەو ئەشکەوتانەدا پێشمەرگە وەڕس بون. ناکۆکیەکانی ئامر کەرتو مەفرەزەکانیش، باری دەرونیی شەکەت دەکردن. منیش زۆرجار، بە کۆبونەوەی گشتی، لەسەر بابەتی جۆراوجۆر، ئارامم دەکردنەوە.(*)

دەوروبەری (٨) مانگ بەوشێوەیە گوزەراندمان. لەو ماوەیەدا بەکری حاجی سەفەر زۆر هاوکاری دەکردم. دلێری سەید مەجید ماوەیەکی باش هاتە لامان. لەوکاتەدا، هاتنی دلێر، لەڕووی دەرونیەوە، بۆ من زۆر خۆشبوو. بەردەوامیش ئەم جوامێریەی لەگەڵمدا دەنواند، لە هەر شوێنێک بومایە!

جارێکیان لەخوار شنروێ، گەلە جاشمان بۆ هاتنو دوو کۆپتەریش گەیشتن. (١٩٧٨/٨/١٥) لەسەری شنروێشەوە قوە خاسە دابەزین. من لە چەمەکە جلم دەشت. بەپەلە فریاکەوتم. کاوە مەخموری یارمەتی دام. دامەزراین، پێشمەرگەیەک هەبوو (عومەر بەسام- هەورامی) بڕیار درابوو هەتا تەقەمان لێنەکرێ، کەس تەقە نەکات. عومەر بەسام بەرامبەر قوە خاسەکان لە بناری شنروێ بوون. کە نزیک کەوتبونەوە، غیرەت گرتبوی تەقەی دامەزراند. تازە ئاشکرای کردین. لەوبەری چەمیشەوە، خەباتی شێخ جەناب تەقەی لە کۆپتەرەکان کرد. هەردوکیان بە لاساریی تەقەیان کرد. نەک بە بڕیار، بەڵام ئەوەی باشبوو، باش دامەزرابوین. کۆپتەریش ئەگەر جوڵە جوڵ نەکەی، ناتبینێ. تا ئێوارە دورە تەقە بوو لەگەڵ جاشو جەیش، جار جار لە شنروێوە هاوەنیان تێدەگرتین. جاشەکانی نەورۆلی هاتنو گەیشتنە چەمی گریانەش. لاموایە، خاتری کۆنە هاوسەنگەرەکانی دەگرتو دەستی دەپاراست! ئێوارەکەی ئەوان کشانەوەو ئێمەش بێزیان بوین. ئێوارەکەی بەرەو ئەشکەوتی (هەزار پەز) شۆڕبوینەوەو بەو هیلاکیە.. تەنها نانو چامان هەبوو. نانو چا ئەوەی باشە قرقینەی نییە!!

عومەر بەسامم بانگ کرد، لێی بپێچمەوە گوتم: نەموت هەتا تەقەتان لێنەکرێ، تەقە مەکەن؟! بە سادەییو دڵسۆزی خۆی وتی: خۆم بە پیاو دەزانم، تەقەم لێئەکەن، تەقە

* کەسێک هەبوو ناوی حەسەنی زبە بوو. خەڵکی میری سوور بوو. شتی بیردەچووەوە. لاساریش بوو. بەردەوام ئێواران دەچووە ناو گوندەکەیان بێ چەک. هەموو جارێک تەلقینم دەدا چیمان بۆ بێنێ. گفتی دەدا. بەڵام زۆر جار بیری دەچووەوە. منیش کۆڵم نەدەداو هیچ چارم نەبوو، دەبوو تەلقینەکەم دوبارەو دە بارە بکەمەوە، بەڵکو خوایە بیری نەچێ. جارجاریش جوامێریی دەنواندو خواردنی باشی دەهێنا! چاکەی ئەم گوندەم دایەوە، مەولیدەیەکی گەورەی کارەبام بۆ دابین کردن.

ئەکەم. ماچم کردو یارمەتیشم دا. تا ئێستاش، من قەرزی ئەو روداوە دەدەمەوە بە عومەر باسام![+] ناوبەناو سەرم دەداو قەرزی ئەو تەقەیەش تەواو نابێ!

## ( ١٨ )
## یاخیبونو خۆدزینەوە!

ئەم هەموو بەسەرهاتەو دەیانی تریشمان بەسەردا هاتووە، کەچی بە چەواشەکراوی، نوسەری کتێبی (چەپکێک) لەسەر کۆی کێشەکانو هەرێمەکەو هۆکاری چونەوەی من، لە لاپەرە (٣٣٥)دا دەنوسێ:

"مەلا بەختیار کە ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی بوو، تەماحی بوو، بکرێتە ئامر هەرێم، و بەتایبەتیش بۆ هەورامان بۆ جێگاکەی "حەمەی حاجی مەحمود، مەلا بەختیار بۆ جەولەیەک لەگەڵ مەفرەزەیەکی خۆیدا چووە ناوچەکە، بۆ جێ پێ لەقکردنی حەمە، ناکۆکیو ناخۆشییان گەیشتە ئەو رادەیەی مەلا بەختیار ویستی حەمە چەککا و حەمەش ویستی مەلا بەختیار چەککا. مەلا بەختیار جێی نەبۆوە لەناوچەکە، لەبەرئەوەی هەموویان حەمەیان قبوڵ بوو، مەلا بەختیاریان قبوڵ نەبوو".[١]

ئەم گێڕانەوەیە، سەراپا چەواشەکردنی راستیەکانە، دەیەوێ خۆی لەگەڵ مندا، هاوتا بکات. راستی مەسەلەکە پێچەوانەیە.

بۆئەوەی درۆکانی؛ درۆ درۆ توێکاری بکەین، پێویستە توێ بە توێ قەتماغەی درۆکان هەڵبدەینەوە:

**یەکەم**: من لە (١٩٧٨/٤/١٤)ەوە ئامر هەرێم بوم. مانگی ١٠/ی ١٩٧٨ هاتبومەوە سەرکردایەتی. لە دۆڵە کۆکە نوسەرم لای مامو مەکتەبی سیاسیش بینی.. خۆی نەبان[*] دەکات.

**دووەم**: کاتێک کێشەی هەرێمی یەک قووڵکرا، لەڕاستیدا ئەبو شیهابو ئاسۆی شێخ نوری، بە ئاڕاستەی تەکەتولی سجن، بەبێ ئەوەی بەندە لەوێ بم، دەیانویست هەرێمەکە کۆنترۆڵ

---

[+] لەو شوێنەی لێی بوین، نالەبار بوو. کشاینەوە، خۆم لە چەمەکە بوم، کۆپتەر دەستڕێژی لێکردینو چەند گولە هاوەنێکیشیان پێوە ناین. هاتم، سەیرم کرد پێشمەرگە لەسەر کانییەک، کە لە رەبایەکانی شنرویوە دیار بوو، دانیشتون. بەپەلە هەڵمساندنو رۆیشتین. دەمزانی ئەو کانییە ئامانجێکی دیاریکراوی هاوەنی رەبایەکەیە. دوای (٥) دەقیقە سێ گوللە هاوەنیان پێوە نا. گەر لەوێ ماباین، شەلو کوتی دەکردین.

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٣٥).

[*] نەبان: بەرخو کار.. کە دایکیان لەکاتی گەڕانەوەی رانە مەڕدا، بۆ شیر خواردن نادۆزنەوە.. هەر باعەباعیانە!

بکەن‌و هانی کادرو پێشمەرگەکانی کۆمەڵەیان دژی محەمەدی حاجی مەحمود دەدا.

**سێهەم**: راستە محەمەدی حاجی مەحمود، هەڵەی دەکردو گوێی نەدەدایە رەفتارو کرداری نەگونجاو لەگەڵ پرنسیپەکانی ئەوکاتەی شۆڕش‌و کۆمەڵە.. بەڵام هەر ئەو وای نەدەکرد. زۆر بون ئەوانەی خراپتریشیان دەکرد. چاویشیان لێ دەپۆشرا. سروشتی تەکەتول وایە، چاو لە هەڵەی خراپتری هاوتەکەتول دەپۆشرێ، بەڵام هەڵەی کەمتری نەیارەکان، گەورە دەکرێ!

**چوارەم**: کاتێک، کێشەی هەرێمی یەک گەیشتە بنبەست، من سێ مانگ بوو لە سەرکردایەتی بوم‌و شەڕی لوتکەی مامەندەشمان کردبوو. بارەگام لە شێنێ بوو. کە هەرێمەکە بانگکرایە سەرەوە، من‌و هۆمەر شێخ موس کراینە لیژنەی لێکۆڵینەوە. هەوڵم دەدا، کێشەکان چارەسەر بکرێ. ئاسۆی شێخ نوری‌و ئەبو شیهابیش دەیانویست، محەمەدی حاجی مەحمود لابرێ‌و هانی کادرەکانیشیان بۆ ئەو مەبەستە دەدا. لەسەر ئەوەی من توند نەبوم، گلەییان لە من دەکرد. کە محەمەدی حاجی مەحمود زانیی لە سەرکردایەتی ماوەیەک گلەدرێتەوە، شەوێک لە چەم پەڕییەوەو چووە ناو سۆسیالیست. لەمەوە قڵیشایەوە. نەوشیروان مستەفا ئیتر ناچار بوو، کۆبونەوەیەکی فراوانی بە کادرەکانی هەرێمەکە کردو رایگەیاند، رێگە نادەین، ئەو هەرێمە بکەوێتە ژێر دەستی سۆسیالیست. ئەم کۆبونەوەیە لە مەکتەبی عەسکەری کرا، ملازم عومەریش ئامادە بوو.

**پێنجەم**: مەکتەبی سیاسی بۆ رۆژی دوای ئەوە، بە ئامادەبونی من کۆبوەوە. بڕیار درا، ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی هێزێک بۆ چارەسەری کێشەکە، بڕوات. یەک ئەندامی مەکتەبی سیاسی، ئامادە نەبوو بچێ. ئاخریی نەوشیروان رووی لە من کرد، وتی: یان دەبێ من، یاخود تۆ بچیت؟

کە وای گوت، عەلی حەوێز وتی: من ئامادەم بچم. بەتورەییەوە نەوشیروان پێی گوت: جا بچی چیت پێدەکرێ؟ کەس بەقسەت ناکات‌و بە شکاویی دێیتەوە.

من، لە سەرجەم کێشەکان‌و روداوەکان بێتاقەت بووم. نەوشیروان بەتەنها لەگەڵم دانیشت‌و پێی وتم:

تەنها تۆ لەو ناوچەیە شارەزای. ئەوانی تر هەرکەسێکیان بنێرین، دڵنیا نیم سەربکەوون. پێشمەرگەو کادر بەقسەی تۆ دەکەن. پیاوی چاک بە، با ناوچەکەمان لەدەست نەچێ. وتیشی، ئەو ناوچەیە بکەوێتە دەست سۆسیالیست، دەست لە شارباژێڕیش هەڵدەگرین‌و کاریگەرییان لەسەر سلێمانیش دەبێ. کە وای وت، وتم: ئامادەم. پێیخۆشبوو کە رازی

بوم. پاشماوەی هێزەکەی هەرێمم کۆکردەوەو کەوتینەڕێ.(*)

کە گەیشتمە سنوری هەرێمەکە، محەمەدی حاجی مەحمود، نیوەی زیاتری هەرێمەکەی بەلای خۆیدا داشکاندبوو. نایشارمەوە، ئەگەر محەمەدی حاجی مەحمود بهاتایەتەوە، کێشەکەمان چارەسەر دەکرد. نەهاتایە، لەو (٥) مانگەی لێی بوم، لە هەر شوێنێک توشی هێزە یاخییەکە بوینایە، شەڕ لەنێوانمان دەقەوما. دیار بوو ئەمەیش لە هۆکاری هاتنی منو چۆنیەتی بڕیاری مەکتەبی سیاسی تێگەیشتبوو، بۆیە هەتا هێزی ملازم تایەر، قادر جەباری، شێخ محەمەدی شاکەلیو شێروان شێروەندی نەگەیشتنە سورێن، توخنی ئەو شوێنانە نەدەکەوت، کە ئێمەی لێ بووین. لەناو ئێمەشدا، هەبوو وەکو پەیوەندی عەشاییری، پەیوەندییان هەبوو لەگەڵیاندا. هەواڵیشیان بۆ دەنارد، کە لە هێزەکانمان نزیک نەکەوێتەوە.(+) ئەوان چاکیان کرد لێمان نزیک نەدەکەوتنەوە. ئێمەش چاکترمان کرد، نەچوینە سورێن.

ئەمەی من گێڕامەوە، ئێستاش دەیان کادرو پێشمەرگەو فەرماندەی هەرێمەکە زیندوونو دەتوانن ڕاستیو ناڕاستیی سەرگوزشتەکە، باسبکەن.

## (١٩)
## قین لە دڵیی، یان پابەندیی؟

کە هەندێک بەسەرهاتی نوسینەکەی نوسەر دەخوێنمەوە، لای خۆم تەریق دەبمەوە. کەسێک چۆن دەتوانێ، ئەم هەموو سەرگوزشتە ناڕاستانە هەڵببەستێ؟! چۆن لە باسکردنی ڕاستیەکان ناترسێ؟ لە شایەتەکان سڵ ناکاتەوە؟ لە ویژدانی خۆی، چۆن ناپرسێتەوە؟

لەو باوەڕەدام، ئەم کەسانە کە پەتای نەخۆشییەکە دایاندەگرێو ڕقی دەرونیان سەردەکا، ئیتر ئاگایان لەخۆیان نامێنێ. ئەگینا، ئەگەر ئاگایان لەخۆیان بێ، چۆن دەبێ

* هاوسەرەکەشم لەسەر منالبون بوو. پێمخۆش نەبوو جێی بێڵم. بەڵام ناچار ژنم جێهێشتو چووم بۆ گێڕانەوەی هەرێمەکە!! زیلانی کچمان لەدایک بوو.. دوای چلەی.. گەڕامەوە!

+ محەمەدی حاجی مەحمود، لە ڕۆژژمێری پێشمەرگەدا باسی دەکات کە هەواڵی بۆ ڕۆشتووە، کە ئێمە پیلانمان چییە. ڕۆژێکیان کە پێشوازیمان لە تەرمەکەی مامۆستا برایم ئەحمەد دەکرد، لە پەرویزخان، پێم دەرخست کە ئەو کەسە کادری کۆمەڵایەتی یەکێتی حەمەی حاجی سابیرە!

ئەم هەمگە درۆیانە، نەک سەدان، بەڵکو هەزاران ریز بکەن‌و بە یەک ئاڕاستەش، بۆ یەک ئامانجیش، ئەویش دوژمنایەتیکردنی کۆمیتەی هەرێمەکان‌و هەوڵی شکاندنی شەهیدان ئارام‌و ئازاد هەورامی، بەندەو سالار عەزیز.

لە درێژەی هەڵبەستنەکان، دوای هەزارانی تر، لە لاپەڕە (٣٣٦)دا ئەمەی خوارەوەش ریز دەکات:

"حەمە بە تەجمیدکراوی گەڕایەوە ناوچەی شارباژێڕو شارەزووروو هەورامان، مەلا بەختیار کرا بە فەرماندەی هەرێمی یەک‌و حەمە ئیلتزامی پێوە نەکرد. پاشان بەهۆی قین لە دڵی مەلا بەختیار و سەرکێشیەکانیەوە، حەمە لە (١٩٨٠/١١/٢٩) خۆی بە حسک لە ناوچەکە ئیعلانکرد".[١]

من نەکرام بە فەرماندەی هەرێم. بەڵکو بە تـەواوی دەسەڵاتی مەکتەبی سیاسی، نێردرام بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەکە، لە بەرژەوەندی یەکێتی‌و سەقامگیرکردنەوەی هەرێمەکە. کە ئەرکەکانیشم بەجێهێنان، نامەم بۆ مەکتەبی سیاسی نوسی، بگەڕێمەوە[*] حاکم عومەر نێردرا بۆ ئامر هەرێم، منیش گەڕامەوە. ئیتر نازانم، چەواشەکردنی تەواوی ئەو راستییانە، چ چێژێک بەم دەرون نەخۆشە دەبەخشێ؟ مەگەر تەنها خۆیان وەڵامەکەی بزانن.. خۆ پاڤلۆڤ‌و فرۆیدیش نەماوون، تا لە دوو روانگەی سایکۆلۆژی جیاوازەوە، بۆمانی شیبکەنەوە!

کۆتایی بەم پەرەگرافە بەوە دێنێ کە گوایە، ئەندامی دەزگای دارایی بووەو سێ جار لێکۆڵینەوەی لەگەڵ محەمەدی حاجی مەحمود لەسەر مەسەلەی پارە کردووە.

هەتا ناوبراو لە یەکێتی بووە، نوسەر ئەندامی مەکتەبی دارایی نەبووە. بەڵکو ئەوکاتە، لەسەر شەرمەزارییەکەی لقی کەرکوک، تەجمید کراویش بوو. ئیتر نازانین، دوای ئەوەی چوبێتە ناو سۆسیالیست، نوسەر ئەوەندە ئازا بوبێ، لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کردبێ؟!

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٣٦).

* لەو ماوەیەدا ئاگام لە هاوسەرم نەبوو، منالیشی بوبوو. هاوڕێ خەجێ ناویشی نابوو (زیلان).

( ٢٠ )
## تەسلیمبوونی نەوشیروان!

هێشتا کێشەکانی هەرێمی یەکمان بەلادا نەخستبوو، پەیتا پەیتا نامەم لەسەر ڕێڕەوی ڕوداوەکان بۆ مەکتەبی سیاسی دەنوسیو لە وردو درشتم ئاگادار دەکردنەوە، بەتایبەتی نەوشیروان مستەفا. لەگەڵ کاک بەکری حاجی سەفەر، لە دێی "زەلان" بوین، نامەیەکی نەوشیروانم بۆ هات، لە پاڕەزانەوە نوسیبووی: لەگەڵ دوو پێشمەرگە هاتومو نامەوێ کەس بزانێ، دایکم لەماڵی خزمەکانم لە شارەزوور دەبینمو کاری تایبەتیم هەیە. یەکسەر هەستم بە مەترسیی کردو دەسبەجێ، فەرەیدون حەمە ساڵحم نارد بۆ پاراستنی نەوشیروانو پێمگوت: تۆ فریای بکەوە، ئێمەش دێین. کە فەرەیدون گەیشتبووە پاڕەزان، ئەو بەڕێکەوتبوو بۆ دۆڵی پەرخو لەوێشەوە بۆ گوندی قەویلە. ئەو شەوەو ڕۆژی دواتریش لێمان ون بوو.

بەیانیەکەی کە لەخەو هەڵدەستێ پشوو لەماڵی "حاجی عەلی قەویلە" دەدات. بە ڕێکەوت، مەفرەزەیەکی حسک بە فەرماندەیی شەهید خولەی حەمە تاتە، بۆ دابەشبون دەگەنە ئەوێ. نەوشیروان دەشڵەژێ. لەگەڵ ماڵەکەدا ئەم شڵەژانە دەبێتە ئەم گفتوگۆیە:

- نەوشیروان: ئەمانە کێن؟
- ژنی حاجی عەلی: هیچ نییە حسکن!
- نەوشیروان: دیارە زانیویانە لێرەم، گەر ماڵان بگەڕێن، ئەمگرنو ئەمکوژن.
- ژنی حاجی: براله.. لەوە ئەچێ جەنابت پیاوێکی گەورە بیت، هیچ مەترسە.. ئەتشارمەوەو با بێن نانی خۆیان بخۆنو ئەڕۆن.
- نەوشیروان: نەخێر پورێ.. خۆم ئاشکرا بکەم نامکوژن.. خۆیان بمدۆزنەوە ئەمکوژن.
- ژنەکە: مەردی خوا بە، ئەمانە پیاوەتی نازانن.. دەنگ مەکە..

هەرچی ژنەکەو حاجی عەلیش هەوڵی لەگەڵ دەدەن، سودی نابێ. بە شڵەژاوییەکی بێڕادەوە، نامەیەکی کورتیان بۆ دەنوسێ. حاجی نامەکە دەباتە دەرەوە.. خولەی حەمە تاتە کە نامەکە دەبینێ هی نەوشیروانە.. لەخۆشییا دەیکاتە دەستڕێژ. دێنە ژوورەوەو خۆیو فەرەح دەبەن. ژنی حاجی عەلی وتویەتی: ئێژم وا مەکە، هیچت نەژنەووت.. دە بخۆ لەوەری!

که زانیمان نەوشیروان گیراوە. یەکسەر بۆ لێکۆڵینەوە هاتم بۆ قەویلە. ئەو قسانەی باسمکردن‌و چۆنیەتی گرتنەکەی، شڵەژانەکەی، قسەو باسی ترم، بە دەنگی حاجی‌و حاجی ژن، تۆمارکرد. بە راپۆرت ناردم بۆ مەکتەبی سیاسی.

ئەم سەرکردە بەئەزمونەی نەوەی یەکەم، کە یەکێک بوو لە ئەقڵی داڕێژەری سیاسەتی یەکێتی‌و کۆمەڵە، بە خوت‌و خۆڕایی، خۆی خستبووە داوەوە. تاقە چارەی سیاسی‌و ئەخلاقی ئێمە ئەوە بوو، وا بکەین سەلامەت بی‌و دەربازی بکەین. هێزەکانمان کۆکردەوە. ناردمان هێزی قەراغیش بە فەرماندەیی مام رۆستەم هاتن. (٤٠٠) پێشمەرگە کۆبوینەوە. هێشتا لەبەر کێشەی هەرێمی یەک، هەر سەرپەرشتی کارەکانم دەکرد. سالار عەزیزیش بۆ گەشتێک هاتبووە خوارەوە. هەمومان بۆ تەگبیرو را، پێکەوە بوین. لە گێرانەوەی ئەم رووداوەشدا نوسەر هەڵیدەگێڕێتەوەو لە لاپەڕە (٣٣٩)دا دەنوسێ:

"لە رۆژی (١٩٨١/١/١٠) گەیشتمە لای کاک بەکری حاجی سەفەر فەرماندەی هەرێمی (٣)ی شارباژێڕ لە دێی "بزەنیان" هەرێمی١ و هەرێمی٣ پێشمەرگەکانی لق‌و مەفرەزەیەکی سالار عەزیز لەگەڵ مەلا بەختیارو ئاسۆی شێخ نوری‌و ئەبوشەهاب هەمویان لەوێ بوون، ئەو هێزە لەو ناوە بە دوای هێزەکەی حسکەوە بوون وەک فشارێک لەسەر حسک بۆ بەردانی نەوشیروان. بەڵام ئەو هێزە زۆرەو ئەو فشارە لەباتی ئەوەی ببنە کارتی فشار لەسەر حسک، بەپێچەوانەوە دەبووە هۆی دوورکەوتنەوەی حسک‌و بردنی نەوشیروان لەناوچەکەو چون بۆ دیوی ئێران، کە مەترسی تەسلیم کردنەوەی بە پارتی هەبوو".[1]

ئەو ماوەیە لە بزەنیان نەبوین. دوای هەڵهاتنی نەوشیروان چوینە شارباژێڕ. تەنها سالار عەزیزو بەکری حاجی سەفەرو بەندە، تەگبیرمان لەناو خۆماندا دەکردو بەرنامەمان دادەنا. لەترسی دزەکردنی قسەکانمان، کەمتر قسەمان لەگەڵ ئەوانی تردا دەکرد. لەڕاستیدا، هەر پێشمان ناخۆش بوو، بەرپرسی ترمان لەگەڵ کەوتبوون. چونکە لەکاتی وادا، پێشنیازی زۆرو موزایەدەی سیاسی، سەرلێشێوان دروستدەکات.

حسک، تازە هەنگی خۆیان لە کلۆرە دارا دۆزیبوەوە. یەکسەر گواستیانەوە بۆ سورێن. من نامەیەکم بۆ ملازم تایەرو قادر جەباری نوسی.. نوسیم: خوێن لە لوتی نەوشیروان بێت، ئەوەی بیری لێناکەنەوە، بەرامبەرتان دەیکەین. ئەمە دەقی نامەکانی نەوشیروان و تایەری عەلی والییە لەوەڵامی نامەکانی ئێمەدا بۆ بەردانی نەوشیروان:

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٣٩).

## دەقی نامەکان:[1]

### نامەی یەکەم:

**برای خۆشەویست کاک مەلا بەختیار**

**سڵاوێکی گەرم.. سڵاوم هەیە بۆ برادەران، وەزعی ئێمە باشە هیوادارم ئێوەش وەزعتان باش بێت.**

من ئەمڕۆ هاتم بۆ لای کاک تایەر عەلی والی و برادەرانی تر، بۆ باسکردنی ئەو گێروگرفتانەی کەوتۆتە ناوچەکەوە، کە بەڕاستی جەوێکی ناخۆش و نالەبارە، هیوادارم بە هەوڵی هەموومان بتوانین چارەسەری بکەین وە وەزعەکە ئاسایی بکەینەوە، زۆرم حەز ئەکرد بتانبینم و باسی ئەو مەوزوعانە بکەین، هیوادارم بەم نزیکانە یەکتری ببینین. جا کاکە گیان بۆ چارەسەرکردنی وەزعەکە تکایە ئەم داوایانە جێبەجێ بکەن:

١-واز لە هەڕەشە بهێنن و هەوڵبدەن کە ئیتر لە هیچ لایەکەوە تەقە روونەدات، وەزعەکە هێمن بکەنەوەو ئاگاداری کەرتەکانی هەرێمەکە بکەن کە شەڕ دانەمەزرێنن.

٢-ئەو برادەرانەی گیراون بەریان بدەن و بەزوویی لەگەڵ ئەو چەکانەی گیراون بیان نێرنەوە، ئەوساکە رەنگە لەگەڵ هەندێ لە مەسئولەکانی ئێرە بین و یەکتری ببینین.

ئیتر خۆشیتان

**نەوشیروان**
**١٩٨١/١/٥**

---

١ فاتح رەسول، چەند پەڕەیەک لە مێژووی خەباتی گەلی کوردستان، رووداوو بەڵگەنامە (١٩٨٠ - ١٩٨١). لاپەڕەکانی (٣٠٧-٣١٠).

## نامەی دووەم

**برای بەڕێز کاک مەلا بەختیار**
**سلاوێکی شۆڕشگێڕانەی گەرم**
**هیوام خۆشیتانە، ئێمەش باشین**

براگیان: دەربارەی شەڕی براکوژی و ئەو رووداوە ناخۆشانەی کە لەم چەند رۆژەی ئەخیردا روویدا هەموو لایەکمان پێمان ناخۆش بووە. دوور بووە لە رۆحی شۆڕشگێڕی و تەبایی.. بەتایبەت کە ئێستە جبهە هەیە، کاک نەوشیروان هاتووە بۆ مەنطیقەکەوە ئەویش هەروەها وەکو ئێمە ئەم جۆرە رووداوانەی پێناخۆشەو رای لەسەر نیە. یەکترمان دی لەگەڵ کاک نەوشیروان، وەکو دوو مەسئول کە شعور بە مەسئولیەتی تاریخی بکەین بڕیارمان دا کە هەوڵدەین شەڕی برا کوژی نەمێنێ و وەزعەکە ئاسایی بێتەوە، لەبەرئەوە تکامان وایە ئەو برادەرە پێشمەرگانەی ئێمە کە سجنن لاتان بەڵکو بۆمان بنێرنەوە، بۆئەوەی ئێمەش ئەو برادەرانەی برینداری گیراوە بۆتان بنێرینەوە. هەروەها پێویست نەبوو ئەو ئاربیجیەی ئێمە ببەن لە مزگەوتی (بیوک) بەڵکو بفەرمون ئەویش ئیعادە بکرێتەوە بۆمان، ئێمەش چەکەکەی (دۆستە دەرەتان) بۆ ئیعادە دەکەین، هەروەها بەڵکو ئەو قوەتەی هێناوتانە بۆ (بیوک) سەحبی بکەنەوە، خوا هەڵناگرێ پێشمەرگە بکوژرێت، کاک نەوشیروانیش هەر رای وایە، جەوی برایەتی و تەبایی دروست بێتەوە لە مەنتیقەکە وە بۆ خەتەواتی تر یەکتری ئەبینین و شوێنێک دانێ دێم بۆ لاتان، کاک نەوشیروان خۆشی نوسراوی بۆ نوسی وە رای هەروایە.

ئیتر حورمەت و خۆشیتان

**براتان: تاهر عەلی والی**
**١٩٨١/٦/٥**

## نامەی سێیەم:

**برایانی بەڕێز کاک سالارو کاک مەلا بەختیار**
**سلاوێکی شۆڕشگێڕانەی گەرم**
**نوسراوەکانتان کە بۆ هەڤاڵ تاهیر نوسرا بوو گەیشت و لێی حاڵی بووین.**

کاکە ئێمە وەکو وتوومانە هەمیشە ئامادەی برایەتی و تەبابین. بەڵام تا ئێستا هیچ بادرەیەکی وامان نەدیوە لە بەڕێزتان وەکو ئەڵێن ئیعادەی سقە بێتەوە، چەند جار داوای اعادەی سقە ئەکەین، بەلام هیچ ئێمە داوامان کرد کە جەولە بکەین، بەڕێزتان تۆزێک دوورتر لەئێمە جەولە بکەن تا ئەگەینە نەتیجە بەڵام ئێوە هێزەکانتان ئەهێنن بۆ سەرمان بۆ نمونە رۆژی ١٩٨١/١/٨ هێزێکی گەورەتان هاتووە دەوری زەردووی[1] کە ئێمە نیوەڕۆ لەوێ بووین برادەرە عەرەبەکەی (جیش شعبی) ئاگادار بوو لەگەڵ دەلیلەکە حەتمەن بۆی گێڕاونەوە کە ئێمە لەوێن.

ئێمە شەو لە (کەوڵۆس)[2] بووین ئێوە هێزەکانتان هێنابووە نزیک ئێمە لەگەڵ ئەوەش ئێمە دورکەوتینەوە، بۆئەوەی توشی مشاکیل نەبین لەگەڵتان، بەلام ئێوە سەعات (٦) هێزێکی ترتان ناردبووە سەرمان لە (قەویلە)وە لێیان داین و ئیجباریان کردین دیفاع لەخۆمان بکەین، بەلام ئەوە بوو هێزەکەی بەڕێزتان شکان، وە ٨ کەسیان خۆیان تەسلیم بە ئێمە کرد، ناچار ئەوێشمان بەجێهێشت و مەجبور بوین بڕۆین بەرەو جیهەتێکی تر زۆر بەداخەوە ئێوە وا تصور ئەکەن کاک نەوشیروان خۆی هاتووە بۆ لای ئێمە، ئێمە گرتومانە ئەو اسلوبە بەشتێکی بێ ئەخلاقی ئەزانین وە ممکن نییە بیکەین، وە لەئەوەڵەوە وام تصور کرد کە خۆی هاتووە، هەموو ئەزانن و پ. م محەمەد عارف ئێستا لای خۆتانە ئەزانێت لێی بپرسن کە بەچی اسلوبێک چووین بە پیریەوە، چونکە وامزانی خۆی هاتووە، لەسەر حسابی تبادلی نووسراوەکان، بەڵام پاش ئەوە پێشمەرگەکان هاتنەوە، باسیان کرد کە لەدێیەکەو ماڵەکە دەوری گیراوە وە احتراما چەکەکەیان داوەتەوە تا نەگاتە لای ئێمە، انجا ئێمە زانیمان گیراوە، ئەگینا ممکن بو

---

١ گوندێکە لەناو خاکی کوردستانی ئێران، کەوتۆتە ئەودیوی گوندی پاریزان، بنەماڵەیەکیش بەهەمان ناو هەیە.
٢ گوندێکە لەنزیک شانەدەری، ناحیەی سەیدسادق، سەر بە حەلەبجەیە، شوێنی لەدایکبون و ژیانی شاعیری نەمر قانعە.

هەر یەکسەر پاش نان خواردن بگەڕایەتەوە، ئەو شەڕە موئسفەش وە پاش ئەوەش ئەم هەموو ماساتە رووی دا نەتیجەی غەلەت وە بێ سقەی خۆتان بوو بە ئێمە.

بەهەرحاڵ کاک نەوشیروان برایەکی عەزیزی ئێمەیە وەلای ئێمە زۆر موحتەرەمە وە بەچاوی برا سەیری ئەکەین، بەڵام ئێوە هەتا ئاربیجیەکەتان نەناردەوە، خۆی چەک موهیم نییە، بەڵام ئسلوبەکە عەیب و ناخۆشە. ئێمە تۆزێک خۆمان دورئەخەینەوە بۆئەوەی نەیەنە سەرمان، هیوادارم بەڕوحی برایەتیو بناو مشکیلەکە حەل بکەن، ئێمە رازین حزبی شیوعی عێراق کە ئەندامن لەجەبهە ببن بە حەلکەری مشکلەکە، ئەوان ئەتوانن ئێمە بدۆزنەوە، بەنسبەت بەندی لاتان ئەمانەن: (انجا نازانین تەسلیم بونەتەوە یان هەر بەندن لاتان:

١-کامەران سەعید ٢-محەمەد فەتاح ٣-حەمەڕەشید هەورامی (عائیدی ١٥ بوو ئێستا پێشمەرگەی ئێمەیە ٤-ناصح پێنجوێنی ٥-حسین حاجی ئەحمەد.

هەروەها چەکەکانیان مەعلومن پێویست ناکات قائیمەی بۆ بکەین، بەنسبەت ١٥ حەق نیە ئەوەندە مصر بن لەسەر ئەوە ئیلحاح بکەن ئەو برادەرانەی خۆیان قەراریان داوە ئیش لەگەڵ ئێمە بکەن ئێمەش کاتی خۆی شوکەتی حاجی موشیر و سلێمان بیریژی بەهەرێمەوە ئیلتیحاقیان بە بەڕێزتان کرد قسەمان نەکرد. لەحاڵەتێکدا برادەرانمان چووبوون بۆ تەصفیەیان، کەوتیان لەگەڵ ئێمەن وازمان لێ هێنان.

بەڕاستی ئێمە سیقەمان نەماوە پاش ئەو هێز خستنە دوامان وە دەورگرتنی دێهاتەکان. بۆ مەوزوعی تەفاوز ئێمە حشع تحویل دەکەین ئێوەش ئەوان تەخویل بکەن، چۆن مشکلەکە حەل بکەن ئێمە رازین.

ئیتر خۆشیتان

| | | |
|---|---|---|
| براتان | براتان | براتان |
| حەمەی حاجی مەحمود | عەبدولقادر جەباری | تاهر عەلی والی |

١٩٨١/١/٩

بەم نامەیە، گوتبویان: دەبێ زۆر وریای نەوشیروان بین، پیاوخراپێک کەتنێک نەداتو یەکێتی تۆڵەیەکی توندی بکاتەوە.

حسک.. وەکو بارمتە نەوشیروانیان دانابوو. هەتا مەرجەکانیان لە ناوچەکەو لە چەکو تەقەمەنی دابین بکەن. هەرچیەکیشیان لێ داوا کردبوو، ئامادەبوو بیکات. تەنانەت نامەیان پێ نوسی، هێزەکانی یەکێتی ناوچەکە چۆڵ بکەین. بەقسەمان نەکرد. لە نامەیەکی تردا، بۆی نوسین، خۆم دەمێکە تاقەتم نەماوەو بێزارمو بەتەما بوم برۆم، پێمخۆش نییە بەدەستی کورد بکوژرێم، بەڵێنم داوە رزگارم بێ، ئیتر سەری خۆم هەڵدەگرم بۆ دەرەوەی وڵات!! چەند کەسێک رەفتاری نەشیاوی تریشیان لەگەڵ نواندبوو. هی باسکردن نییە!!

ئەوەندە رقو تۆڵەسەندنەوەو مەرام، ئاوێتەی نوسینەکانێتی، نازانرێ کام بۆچونی لێکبدرێتەوەو چ سەرەنجامێک گەلاڵە بکرێ. سەدان پێشمەرگە شایەتن، کە رۆڵی ئێمە لە فشار خستنە سەر سۆسیالیست، ناردنی شێخ کاوەو شێخ داراو جەمال ئاغا، بۆ ئازادکردنی نەوشیروان چۆن بووە. هەتا رادەی رازیبون کە ژمارەی ئەو چەکانەش بنێرین، بۆ ئازادبونی. نوسەریش دەنوسێ:

"یەکێتی (١٠٠) چەک بدا بە حسکو ئەو چەکانەی، کە لە شەڕەکانی نێوان یەکێتیو حسکدا یەکێتی گرتوونی بیانداتەوە. لە (١٩٨١/١/٢٢) یەکێتی موافەقەتی کردو جەمال ئاغاو شێخ دارا بۆ گفتوگۆ چووبوون".[1]

کەچی، ناتوانێ رقە پەنگخواردوەکەی بشارێتەوەو هەر بوختانمان بۆ هەڵدەبەستێ:

"من رام لەسەر ئەوە بوو، کە ئەو چەکانە بدرێت، گەر بەو کارە نەوشیروان بەردەن، کاک بەکری حاجی سەفەریش هەمان رای هەبوو، بەڵام (مەلا بەختیارو سالار) رایان وابوو، کە نەدرێتو مەرجەکانیشیان پەسەند نەکرێت، رای سالار وابوو، کە کۆمەڵە کۆمەڵێک سەرکردەی شەهید بووە، با ئەویش وەک هەر یەکێک لەوانە شەهید بێت".[2]

لەسەرەوە دەنوسێ یەکێتی موافەقەتی کرد. بەڵام لەخوارەوە خۆی بەدرۆدەخاتەوە!!

تەنانەت لەخۆی نەپرسیووە، بڕیاری چەک ناردنو نەناردن بەدەست سالار و بەکر و بەندە بووە. کەس هیچی نەدەکردە کڵاوەکەی ئەوەوە! کە موافەقەت کرابێ، ئێمە بوین. ئیتر چۆن (مەلا بەختیارو سالار) رایان وابوو کە نەدرێت؟

رێکەوتێکی سەیر بوو، لەوکاتەدا لەگەڵ بەکری حاجی سەفەر خەریکی کۆکردنەوەی چەکەکان بوین، لە گوندی رەزڵـە، لە ملەی سەر (مـازواو)ی پشتی پەرخەوە، تەپڵی

---

١ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٤٠).

٢ سەرچاوەی پێشوو.ل(٣٤٠).

سەرکەوتنمان گوێ لێبوو.. چەندین دەستڕێژو هاوار.. عەبە بچکۆلی پێنجوێنی پەیدا بوو. گوتی: کاک نەوشیروان رایکردووەو لە پەرخە. دەستبەجێ رۆیشتینو ئێمە هیلاکو ئەویش پەرێشان، یەکمان بینیەوە. بە روخساریا، رقێکی شاردراوەی ئەستورم دەخوێندەوە.

نوسەر، من بە فیێل ناردمە مەکتەبی سیاسیو نامەم پێدا نارد. ئەمیش لەسەر پێشنیازی مام رۆستەم، پێی وتم: ئەم برایم جەلالە شومە. بەرێی بکە، کاک نەوشیروان رزگاری دەبێ. رۆژی پێشتر نەرمینی ئێزگە تازە هاتبووە دەرەوە، پێکەوە بەرێم کردن. رۆژی دواتر نەوشیروان هەڵهات. مام رۆستەم هاواری کرد.. نەمووت.. نەمووت!

دوای دوو رۆژ، نەوشیروانو شەوکەتی حاجی موشیرو بەندە، لە گوندی پارەزان دانیشتینو گوتی: ئەوە من ئازادمو لەناو هێزەکانم. پێتان باشە چی بکەین؟ شەوکەت گوتی: با بچینە سەریان. وتی: تۆ ئەڵێی چی مەلا! من وتم: وام پێباشە، هەروەکو چۆن بەوانت وتبوو، بۆ شەڕ نەهاتوم، ئێستاش نامەیەک بنوسەو بۆیان بنێرینو تیایدا بڵێ.. لەناو هێزەکانی خۆمانمو ئێستاش دوبارەی دەکەمەوە، کە شەڕمان ناوێ.. فەرمون با کێشەکان چارەسەر بکەین. نامەکە شەوکەت بردیو گەیشتبووە دەستیان. بەڵام ئەو چەند رۆژەی پێکەوە بووین، هەستی بە تێکشکان دەکرد. هەرچەند ئێمە بێڕادە رێزمان دەگرتو دڵخۆشیمان دەدایەوە.. بە روکەش پێدەکەنی.. بەڵام ناخی وێران بوو!!

ئـەوەی لام سـەیرە، دوای ئـەم هەموو ماندووبونەو کاریگەریمان بۆ هەڵهاتنی نەوشیروان، کە بۆ مێژوو دەیڵێم:

پێنج هۆی سەرەکی هەبون، بۆ ئازادکردنی نەوشیروان. ئەگینا چارەنوسێکی نادیاری دەبوو. چ بۆ کوشتنو چ بۆ تەسلیمکردنی بە پارتی:

**یەکەم**: نامەی مەکتەبی سیاسی سۆسیالیستو هەڵوێستی د.مەحمود عوسمان بۆ نوسینی نامەکە.

**دووەم**: فشاری هێزی یەکێتیو ئامادەییمان بۆ کاردانەوەی توند بەرامبەر سۆسیالیست، بەتایبەتی بەرپرسەکانیان.

**سێهەم**: رۆڵی جوامێرانەی کاوەی شێخ لەتیف.

**چوارەم**: رۆڵی پۆزەتیڤی حیزبی شیوعی.

**پێنجەم**: پەرۆشیی دارای شێخ حەفیدو جەمال ئاغا بۆ دۆزینەوەی رێگەچارەسەرو ساردکردنەوەی فەرماندەکانی سۆسیالیست.

کەچی، نەوشیروان مستەفا لە کتێبی (پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن) لاپەرە (١٩٢-١٩٣) ی بۆ ئەو روداوەو هەڵهاتنەکەی تەرخان کردووە، بە ئاستەم باسی رۆڵی هێزەکەی

یەکێتیو هەڵوێستی ئێمە ناکات. لەکاتێکدا خۆی بە زمانی ملازم تایەر، ئەمە دەگێڕێتەوە:

"نیوەڕۆیەکیان ملازم تایەر هاتە لام. چەند سەعاتێ مایەوە قسەوباسی گشتیمان ئەکرد. پێش ئەوەی هەستێ بڕوا، وتی: (ئەو برادەرانەی ئێوە ئەوەندە هاتوچۆی ئەم ناوانەیان کردوە هەمو شتێکمان ئەزانن، هێزێکی گەورەیان لە چەمی گەڵاڵە کۆکردۆتەوە، رەنگە پەلامارمان بدەن لەبەرئەوە بڕیارمان داوە بگوێزینەوە بۆ جێگایەکی تر. سبەینێ دێن بە دواتا)".[1]

ئەم قسانەی ملازم تایەر، روون روون دیارە، کۆکردنەوەی هێزەکانو هەڕەشەکانمان، چەندی راچڵەکاندوون، تەنانەت ترساوون هەڵبکوتینە سەریان. لەڕاستیا، بیرمان لەوەش کردبوەوە. بەڵام لەترسی گیانی نەوشیروان، بڕیارەکەمان پەکخست.

سەبارەت بە چەک کۆکردنەوەش. کە نوسەر نوسیویەتی سالار و مەلا بەختیار نەیاندەویست، چەکەکان بدەن. ئێمە بڕیاری چەکەکانمان دا و کۆشماندەکردنەوە.. بەڵام نەوشیروان خۆی دەنوسێ:

"ئەم داوایەی حسکم پێ سوکایەتی زۆر گەورە بو، خۆمم لەبەرچاو کەوتبو، چونکە یەکێ بو لە نزمترین شێوەکانی (ئیبتیزاز). ئەم داوایەی ئەوان زیاتر لەوەی لە هی حیزبی سیاسی بچێ، لە هی باندی مافیا ئەچو".[2]

بە راستییش وا بوو. بەڵام چارمان نەبوو، دەبوو چەکەکان لە پێشمەرگەکان وەربگرینو بیاندەینێ. بەڵام نوسەر نەیتوانیووە، لەم باسەشدا، نوقرچی خۆی نەگرێ!!

کە لە پارەزان بوین (ئەبو شوان-قادر)و (عەلی کلاشینکۆف)ی حیزبی شیوعی، بۆ خۆشحاڵی سەلامەتی نەوشیروان هاتبونە لامان. لەناو پێشمەرگە، لەکاتی خواحافیزی، بە خوتو خۆڕایی، نەوشیروان چوو بەگژ ئەبو شواندا، کە پیاوێکی بەڕێز بوو. قسەی ناپەسەندی پێ وت، ئەویش، بە رەقی وەڵامی دایەوە. لە قسەکانیا گوتی: خۆم دەزانم چیتان لێ دەکەم. ئەویش وتی: چیت لەدەست دێت، درێغی مەکە. ئێمە هەمومان سەرزەنشتمان کرد لەسەر ئەو رەفتارە نەشیاوە!

---

١ نەوشیروان مستەفا ئەمین. پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن- دیوی ناوەوەی رووداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٧٩-١٩٨٣. چاپی دووەم ١٩٩٨-سلێمانی. ل(١٩٢).

٢ سەرچاوەی پێشوو. ل(١٩٢).

# رشتەی شەشەم:

## کۆنفرانسەکانو پیلانگێڕان

١- یەکەمین کۆنفرانسو سەرەتای پیلان
٢- دادگا و پیلان
٣- کۆنفرانس؛ پیلانو ئاستی نزم!
٤- کلکایەتی جەمسەرەکانی نێودەوڵەتی!
٥- سەرکەوتنی پاسدارانو پاشەکشە!
٦- هێزی پشتیوانو دانوستان
٧- کشانەوەی قاسملو و، هەڕەشەی شاهۆ!
٨- مام و پشتیوانو ئاڵای شۆڕش
٩- هۆمەر شێخ موسیش!
١٠- هەڵگێڕانی دووەمین کۆنفرانسیش
١١- کۆمەڵە بۆ نەکرایە حیزب؟
١٢- شۆڕشگێڕانو تاکتیکی مام!
١٣- نەوشیروانو نائومێدیی!
١٤- دانوستانی بێهودە!
١٥- یەکێتیو ناکۆکی هەڵوێست!
١٦- لەبری ستایش، سزا !
١٧- مەڵبەندە پڕ کێشەکان!!
١٨- سزا.. وەکو پاکتاو !
١٩- میکیافیلیەتی دواکەوتوو!
٢٠- رەگەزەکانی زەبروزەنگ!
٢١- زیانەکانی فرە هێزیی
٢٢- بە هەقو ناهەق دەست نەپارێزرا!

## ( ١ )
## یەکەمین کۆنفرانسو سەرەتای پیلان

کە نەوشیروان هەڵهات، پێشوازییەکی گەرمی لەلایەن کۆمەڵەو هێزی پێشمەرگەوە لێکرا. هەتا لەزینداندا بوو، کاردانەوە بەرامبەری بێڕادە خراپ بوو. گەیشتبووە رادەیەک، لە بارەگاکانی سەرکردایەتیدا، بێزاریی دژی گەیشتبووە ئاستێک، هاوڕێیانی ناوەندی بڕیاریاندابوو، کۆبونەوەی فراوان بکەنو تەگبیرێک لە کۆمەڵە بکەن. کۆبونەوەی فراوان کرابوو، ئاڕاستەی رەخنەکان ١- دژی رەفتاری نەوشیروانو ئەو هەڵە قورسەی تەسلیم بە حسک بووە. ٢- ئایا کاتی نەهاتووە، کۆمەڵە بۆ سەربەخۆیی لە یەکێتی تێبکۆشێ. ٣- بەستنی کۆنفرانس.

خاڵی یەکەم رەوا بوو. خاڵی دووەم لەجێی خۆیدا نەبوو. خاڵی سێهەمیش ئەرک بوو. من تا ئەوکاتە نەگەڕابومەوە لە هەرێمی یەک. کە نەوشیروان گەیشتبووە سەرکردایەتی، بەسەر ئەو دەنگوباسانەدا کەوتبوو. لەبری ئەوەی بە ئارامیی رەفتار لەگەڵ هەرسێ بۆچونەکەدا بکات، بەپێچەوانەوە، رقی هەستابوو.. هەموو دانیشتنەکانی بە پیلانگێڕیی دژی خۆی زانیبوو. سالار عەزیز دەستیشی لە کۆبونەوەکان نەبوو، تێوەی گلاندبوو. هەروەها مامۆستا جەعفەریش. لەڕاستیدا، فەرەیدون عەبدولقادر، رابەرایەتی کۆبونەوەکانی کردبوو. بەڵام لەبەرئەوەی نەوشیروان بتوانێ تەکەتولی زیندان، بداتە گژ سالارو جەعفەر، زوو فەرەیدونی لە کێشەکە دورخستبوەوە. فەرەیدونیش، لە مەترسی یاریەکە گەیشتبوو، لەگەڵ نەوشیروان رێکەوتبوو. ئیتر ئەو رێکەوتنە، هەتا کۆمەڵەشیان هەڵوەشاندەوە، هەڵنەوەشایەوە!!

لەوکاتەدا، ژمارەی (٩)ی کۆمەڵە دەرکرابوو. مامۆستا جەعفەر، وتارێکی تیۆری ئاسایی دژی ئۆپۆرتیۆنیست بڵاوکردبوەوە. دەستەواژەکە لە ئەدەبیاتی چەپەکانی ئێراندا، ئەوکاتە باو بوو. بۆ مێژوو دەیڵێم: وتارەکە تایبەت دژی کەس نەنوسرابوو. بەڵام ئایا لەناو کۆمەڵەدا، ئۆپۆرتیۆنیس (هەلپەرست) هەبون. بێگومان هەبونو بەرە بەرە کنەی کینە هەڵڕشتنیان دەکرد. نەوشیروان، وتارەکەی بە مەرام بردە سەر خۆی. ئەمە لەکاتێکدا، هەلپەرستی لەناو یەکێتیدا، ئەوانە بون کە دایاندەشکاندە لای نەوشیروان، بە راستو چەپ، قسەیان دەکرد. لە ماوەیەکی کورتدا، تەواوی بارەگاکانی دژی مامۆستا جەعفەر، دنە دا. لێرەدا بە گرنگی دەزانم رونیبکەمەوە کە:

لەکاتێکدا تەکەتول سەرهەڵدەدات. پلەوپایە بایەخ پەیدا دەکات. دەستکەوت زیاتر دەبێ. هەلپەرستیی تەشەنە دەسەنێ. کە تەکەتولو دەستکەوتو هەلپەرستیی ئینتەراکسیۆن دەکەن (کارلێک دەکەن) باشترین زەمینە بۆ باوەڕهێنان بە پروپاگەندەی سایکۆلۆژی دەڕەخسێ. وەی بە حاڵی ئەوەی لەوکاتانەدا، دەخرێتە بەر نەشتەری ئەو جۆرە پروپاگەندانە. نەوشیروان مستەفا لە پروپاگەندە کارامە بوو. باشیش دەیزانی کەی هەل دەقۆزێتەوەو تیرەکانی پروپاگەندە چۆن بهاوێ. کە دەشیهاویشت، دەیپێکا. لەوکاتەدا، سالار عەزیزو مامۆستا جەعفەر، کەوتنە بەر تیرەکان. منو ملازم عومەرو ئازاد هەورامی کەمتر. چونکە، نەوشیروان لەو باوەڕەدا بوو، ئەوکاتە تەنها فەرەیدونو سالار زیاتر لەو خۆیان بە شایستەی سکرتێری کۆمەڵە دەزانن. فەرەیدونی گرتەخۆیو سالاری دایە بەر نەشتەری ژەهراوی.

پێش بەستنی کۆنفرانس، ئەو کارانەی نەوشیروان چونە قاڵبی پیلانگێڕان. بە هاوکاری پلەیەکەمی فەرەیدونو پاڵپشتی پلە دووەمی تەکەتولی زیندان. دەبێ باسی بکەم کە:

یەکەم: سالار عەزیز، بەپێی قەناعەتی خۆی، داکۆکی لەسەر بۆچونەکانی دەکرد. بەڵام نەگەیشتبووە مەترسی لەسەر پێگەی نەوشیروان.

دووەم: چومە لای نەوشیروانو دەمویست نەرمی بکەمو کۆنفرانسەکە بە سازان ئەنجام بدرێ. هەستم کرد سودی نەبوو. هەلەکە باش بۆ نەوشیروان رەخسابوو.. لەدەستی نەدەدا!!

سێهەم: تەکەتولی زیندان، بەرەی خۆیانو نەوشیروانیان رێکخستبوو، بە تۆکمەیی خۆیان بۆ کۆنفرانس ئامادە کردبوو.

چوارەم: ئێمە؛ سالار، جەعفەر، ئازاد، ملازم عومەر، بەندەو دلێری سەید مەجید، بەرنامەمان نەبوو. زۆرتر پشتمان بە شانازیی کۆمیتەی هەرێمەکانو شۆڕشکردنو هەندێک پرەنسیپەوە، قایم کردبوو. پێمانوابوو، ئەو شانازییانە بەس بون، لەناو کۆنفرانسدا کاریگەریمان هەبێ. لەناویشماندا هەبوو، دوودڵ بون. هۆیەکەشی مەترسی بوو لە جیابونەوە. بەوشێوەیە، بێ بەرنامە چوینە ناو کۆنفرانس، لەبەرامبەر بەرنامەو بڕیاری بەهێزترین تەکەتول!!

بۆ خۆم، هەتا چوینە ناو کۆنفرانس، سازانم پێ باش بوو. قووڵکردنی کێشەکانم پێ خراپ بوو. چاوەڕوانیشم نەدەکرد، پیلانەکان بەو رادەیە کاریگەرییان لەناو کۆنفرانسدا هەبێ. بڕیاریشمان نەبوو هەرگیز کێشەکان قووڵ بکەین.

نوسەر، ئەو روداوانە، هەڵدەگێڕێتەوەو دەنوسێ:

"ئەوکاتەی نەوشیروان لای حسک گیرابوو، ژمارە (٦)ی کۆمەڵە زستانی ١٩٨١ لە مانگی"١"دا دەرچوو، ووتارێکی تیا نوسرابوو، بەناوی (ئۆپۆرتۆتیزم) ووتارەکە "فازیل کەریم" نوسیبووی زۆربەی مەبەستەکانی لەسەر نەوشیروان بوو. نەوشیروان ئەمەی زۆر لەلا ناخۆش بوو. من لە شێنێو ئاسۆی شێخ نوری لە زەلێ، دەورەیەکی یەک هەفتەیی پێش کۆنفرانسمان کردەوە، سیمیناری تیا ئەگیرا بۆ ئەو کادرو ئەندامانەی بۆ کۆنفرانس هاتبوون. مەلا بەختیاریش دوای دوو ڕۆژ بەو دەورەیەی ئێمەی زانی، ئەویش لە ناوزەنگ لە بارەگاکەی خۆی چەند کادرێکی کە خۆیو سالارو جەعفەر مەبەستیان بوو، کۆکردەوە".[1]

لەسەرەوە، هەندێک لەو هەڵبەستنانەم رونکردۆتەوە. باقی بۆ رقرشتنەکەش، دەڵێم:

کەسمان ئاگامان لەو خولە نەبووە، ئەگەر لە شێنێ گیرابێ. ئێستا دەیبیستم. منیش هیچ خولێکم لە ناوزەنگ نەکردۆتەوە. نەشمزانیووە سالارو جەعفەر، خولی وایان کردبێتەوە.

## ( ٢ )
## دادگا و پیلان

هێندەی پێخۆشە، پیلانەکەیان لەناو کونفرانسدا سەرکەوتووە. خۆی پێنەگیراوەو بە قەڵەمو ناخە رەشەکەی، خۆیانی خستۆتە دادگا. کە ئاوهای دەدرکێنێ:

"دوو ڕۆژ پێش کۆنفرانس، نەوشیروان جوابی بۆ ناردم پێویستی بە خۆ وونکردنێک هەبوو، کە دێتە لای ئێمە، و هاتو لە ژوورێکدا، کە جگە لە یەک پێشمەرگە دەیزانی خواردنو چای بۆ دەبرد کەس نەیزانی کە لای ئێمەیە، ئەو دوو ڕۆژە خەریکی نوسینەوەی ڕاپۆرتێک بوو، بۆ کۆنفرانس، ئاخر ڕۆژ بوو، نەوشیروان لێی پرسیم: تۆ بڵێی لەم کۆنفرانسە سەرکەوین؟ ئەو بەلایانەمان لەکۆڵ بێتەوە مەبەستی (سالارو جەعفەرو مەلا بەختیار) بوو، منیش پێموت: ئەگەر تۆ هەقت نەبێو بەزۆر نەیان خەیتەوە سەرکردایەتی بەتایبەتی مام جەلالیش لێرە نیە دڵنەواییان بکا، ئەوا دڵنیابە، کە دەرناچنو لەکۆڵ دەبنەوە.

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کومەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٤٤).

نەوشیروان وتی: من هەقم بەسەریانەوە نیەو لایەنگری هیچ لایەکیشیان ناکەم، کێ دەرچوو با دەرچێ، بەڵام ئەگەر ئەمانە دەرچنەوە من وازئەهێنم و بیر لە ڕێکخراوێکی تر دەکەمەوە دایبمەزرێنین لەگەڵمدای؟".[1]

پێشینان کە گوتویانە: کورد بدوێنە شەرعی خۆی دەکات. نازانم بۆ نەیانگتووە: درۆزن بدوێنە دادگایی خۆی دەکات!

ئەم دیالۆگە، کە لەنێوان خۆیو نەوشیروان دەیگێڕێتەوە، ئێستاش بۆ زانینی ڕاستیەکان، نرخی مێژوویی هەیە. لە شێوەی گفتوگۆ، دایدەڕێژینەوە:

-نەوشیروان: تۆ بڵێی لەم کۆنفرانسە سەرکەوینو ئەو بەلایانەمان لەکۆڵ بێتەوە. (مەبەست سالارو جەعفەرو مەلا بەختیارە)؟

-برایم جەلال: ئەگەر تۆ حەقت نەبێو بەزۆر نەیانخەیتەوە سەرکردایەتی، بەتایبەتی مام جەلالیش نیە دڵنەواییان بکا، دڵنیابە دەرناچنو لەکۆڵ دەبنەوە.

-نەوشیروان: من هەقم بەسەریانەوە نییەو لایەنگری هیچ لایەکیشیان ناکەم، کێ دەرچوو با دەرچێ، بەڵام ئەگەر ئەمانە دەرچنەوە من وازئەهێنمو بیر لە ڕێکخراوێکی تر دەکەمەوە دایمەزرێنین، لەگەڵمدای؟!

-برایم: بێ سێ و دوو وتم: لەگەڵتام.

ڕستەی (تۆ بڵێی لەم کۆنفرانسە سەرکەوین).. نیشانەی ئەوەیە کە پیلانیان هەبووە، بەڵام لەبەرامبەرەکەشیان ترساوون (کە ئێمە بوین)، سەربکەوون.

(ئەو بەلایانەمان لەکۆڵ بێتەوە).. بەڵگەی ئەوەیە دەمێکە ڕقی لێمان بووە (سالار، جەعفەر، مەلا بەختیار، ئازاد هەورامی، ملازم عومەرو دلێری سەید مەجید) فرسەتی ژاوەژاوی پێش کۆنفرانسی قۆستۆتەوە بۆ ڕشتنی ڕقەکەی.

کە برایم دەڵێ: (دڵنیابە دەرناچنو لەکۆڵ دەبنەوە).. دانی پیا دەنێ کە پیلانیان لەناو ئەندامانی کۆنفرانسدا گێڕاوەو بەڵێنیشیان پێ دراوە دەنگمان نەدرێتێ!

(من هەقم بەسەریانەوە نییە).. کوتومت ئەوە دەگەیەنێ کە نەوشیروان پیلانەکەی وا بووە، کەسمان لە هەڵبژاردن دەرنەچێ.

کە دەشڵێ: (ئەگەر ئەوانە دەرچنەوە وازئەهێنمو ڕێکخراوێکی تر دروستدەکەم).. ڕێک پەیامەکەی ئەوەیە هەمومان بە هیچ شێوەیەک نابێ دەرچین. هەتا ئەو ڕادەیە، ڕێکخراوی تر دادەمەزرێنێ.

---

١ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٤٤-٣٤٥).

ئێستا، کە ئەو دیالۆگە یان ئەو دادگاییەی پشتی پەردەی ئەو پیلانگێڕیە دەخوێنینەوە، بۆ نوسەر ئاساییە، بەڵام بۆ سکرتێری کۆمەڵە، ئەمە رۆڵی سکرتێر بووە، یان دوژمن؟

سکرتێر، لەو بارودۆخەدا، چۆن دەبێ پیلان لە هاوڕێکانی بگێڕێ؟! کە هەموو سێ مانگ بووە، لە تیاچون رزگاریان کردووە؟

نەوشیروان، روناکبیرو زمانزانو لە کەسە بەتواناکانی نەوەی یەکەم بووە، ئاوا بیری لە هاوڕێکانی کردۆتەوە. ئاخۆ، ئەوانەی لە نەوەی یەکەم بون، ئاستیان لە نەوشیروان نزمتر بووە، ئاخۆ ئەمانە، لەناو دوبەرەکیو ناکۆکی پارتیدا، کە شکست دەخۆنو دەکەونە ناو گێژاوەوە، ئاخۆ زۆربەی ئەو مەکتەبی سیاسییە، لەو دۆخەدا، چۆن لە (١٩٦٤-١٩٦٦) حیزبایەتیان کردبێ؟ لەوە بەدواوە، کە چونەتە پاڵ حکومەت، چۆنیان پیلان گێڕاوە؟! زۆر بەداخەوە، لەناو منداڵدانی ئەم حیزبەو لە ژانی ململانێو ملی یەکترشکاندنیاندا، کۆمەڵە لەدایکبووە. نەک لە بۆتەی خەباتی چینایەتیدا.. بۆیە، دەبینین، کۆمەڵە کە باسکی دەسەڵاتی ئەستوور دەبێ، سکرتێرو سەرکردایەتیەکەی، چ پیلانگێڕێکو چەندیش چێژیان لە شکاندنی هاوڕێکانیان دیووە! ئەم ئەقڵیەتەی پیلانگێڕان، نەریتی سەدەکانی ناوەڕاستە، وردە بۆرژوای کوردستان، لەبەر لاوازی چینایەتی، پەیڕەویان کردووە.

هاوڕێکانیان.. ئەوانەی لە تەنگانەدا هەڵنەهاتن. ئەوانەی شۆڕشیان بەرپاکرد. ئەوانەی کۆمەڵەیان لە هەڵدێرانەوە هەڵبڕییەوە. ئەوانەی ساڵێک زیاتر بوو، پێش هاتنەوەی مامو نەوشیروان بە سکی برسیو بەبێ چەکو بەبێ پارە، بێ پشتو پەنا، شۆڕشیان بەرپا کرد.

ئەوانیش دەبوی چەکی فەلەستینیو سوریو لیبییان بۆ کرابوەوە؛ پارەی مۆڵی لیبیاو سوریایان دەدرایە، ئەوان، کە لە پایتەختەکاندا بەناوی دەستەی دامەزرێنەرەوە، لە باشترین ئوتێلو ریستۆرانتەکاندا، کۆدەبونەوەو بەیاننامەیان دەردەکرد، کەچی هەر هێندە باسکی دەسەڵاتیان ئەستوور دەبێ، دەکەونە پیلانگێڕان!

ئەوانی نەوەی یەکەم.. بەو هەموو پشتیوانییە، هەڵەی گەورە گەورەی سیاسیو پێشمەرگایەتییان دەکرد.. بەو هەموو ئەزمونەی نەوەی یەکەم، بەبێ ئەوەی دڵنیابن، لە چارەسەرکردنی ناکۆکیەکان لەگەڵ قیادەی موەقەتەی پارتیو ماڵی بارزانی، بەرایی هێزیان ناردەوەو هەمویان کوشتن. نەوشیروانو هێزێک دوای ئەوان هاتن، تەفروتونایان کردن.. هەڵەی ترو هەڵەی تر..تاد.

ئێمەی نەوەی دووەمیش.. بە چەکی ژەنگاوی کڕدراوی پارەی باربوو. بەبێ ئەوەی ئاسۆی مانگێکی مەفرەزەکانمان لا رون بێ، ملی مانو نەمانمان لە هێزی دڕندەی فاشیەکان دەسوو.. دەچوین بەگژ مەحاڵدا.. باشترین رۆڵەی کۆمەڵەمان کردە مەشخەڵ هەڵگر، هەتا ئەوان زات بکەن، هێز بنێرنەوە. ئەوان شکانو ئێمە نەشکاین. ئەوان کشانەوەو ئێمە هێرشمان برد. بادینانیان پێ چۆڵ کرا.. ئێمە سۆرانمان کۆنترۆڵ کرد. ئەوان هاتن بۆ لای ئێمە.. ئێمە چوین ئەوانمان هێنایەوە.

کەچی.. ئەنجامەکەی.. بە پیلانگێڕان دەشکێننەوە.. سەرەتا بە پیلانی نەرمو لە یەکەمین کۆنفرانسەوە بە پیلانی توند. لە سێهەمین کۆنفرانسیشدا، کوشتنو بڕین.

باوەڕناکەم، لەدوای شۆڕشی فەرەنسا، شۆڕشی ئۆکتۆبەر، شۆڕشی رۆشنبیری (بەڵکو رەشبیری) چینو خەمیر رووچی پۆلپۆت، لەناو هیچ پارتێکی چەپدا، ئەو غەدرە لە هاوسەنگەر کرابێ، کە لە یەکەمین کۆنفرانسەوە هەتا هەڵکوتانە سەر ئاڵای شۆڕش، لە ئێمە کراوە. ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا، مەلایی کە چونە سەر جەلالی، هانایان بۆ ئێران بردو پاشان چوونە پاڵ حکومەت. یاسر عەرەفات کە چووە سەر ئەحمەد جبریل، چووە پاڵ سوریا. یەکێتی کە فشاری بۆ بزوتنەوەی سۆسیالیست برد، چونە پاڵ پارتیو ئێران.. بەڵام ئاڵای شۆڕش، سەرەڕای ئەو جەزرەبەی یەکێتی لێیدا، دوای ئازادبونیشم لە زیندان، ئامادە نەبوم بچمە پاڵ هیچ لایەک دژی یەکێتی.. ماینەوە هەتا راپەڕین.

پەیڕەوانی نەوشیروان، شانازی بە پیلانگێڕیو لەشکرکێشی بۆ سەر هاوڕێکانیان دەکەن. پاداشتیان بە (پاکانە!) نوسین دایەوە. نازانن، ئەوە پاکانە نەبوو.. ئەوە شەرمەزارکردنی مێژووی ئەوساو ئێستای خۆیان بوو. ئەقڵیەتی راستەقینەیان دەرکەوت.

ئەو پاکانە بە زەبری مەرگ سەپاندنە، پیشەی جەلادەکانە.. لە گۆڕیشدا ویژدان ئازاردانە.

ئەوە پاکانە نەبوو.. بەڵکو پاکنامە بوو.. هەتا بەدەستی ئەو رێکخراوەی تەمەنمان پێ بەخشیبوو، نەخرێنە گۆڕو لە گۆڕیشدا، هاوڕێ راستەقینەو منداڵەکانمان، گوێیان لە درۆ و دەلەسەی دوای کوشتنمان نەبێ. کە دڵنیا بوین، دوای تیربارانی نامەردانە، درۆی نامەردانەشمان بۆ هەڵدەبەسترا. بە تێکۆشەر دەتانکوشتینو بە خائین دەتانناشتین. ئەوەتا، خۆمان زیندوینو ئەو هەموو درۆیانەمان بەدەمەوە هەڵدەبەستن، جا وەرە بتانکوشتینایە.. دڵنیاین، سزای ویژدان نامەی تەزویری پێ دەنوسینو دەشتان کردین

به خۆفرۆش. لەکاتێکدا، خۆفرۆشتان ئازاد دەکرد.. بەڵام رەخنەگرو خاوەن هەڵوێستتان دەکوشت. دوای راپەڕینیش، زۆر ئاسایی بوو لاتان، فایلە قورسەکانی سەرکردەکانتان سوک دەکرد، کەچی تا ئێستاش شانازی بە لێدانو شکاندنی ئاڵای شۆڕشەوە دەکەن.

ئێستا ماوینو رووبەڕوشتان وەستاوین، سەریشمان بەرزە، فایلمان نییە. مانگانە موچەمان نەبووە. ژێر پێڵاوی تێکۆشانمان، لە زمانی ئەو جەلادانە پاکترە، کە لە زینداندا بەرتاندابونە گیانمانو هەندێکیان دەرکەوتن، چ تاوانبارو چ تاڵانکارێکن.

چۆن لەدوای راپەڕین دژی دیلکوشتنو بەبێ دادگا لەناوبردنی خەڵک بووم، بەو شێوەیە کە خۆیشم لە شۆڕشدا دەسەڵاتم هەبوو، یەک بێتاوانو تاقە دیلێکیشمان نەکوشتووە. یەک دیناری حەرامیمان نەخوارد. لەژێریشەوە، پەیوەندیمان بە موخابەراتو دوژمنانی کوردستانو یەکێتیەوە نەکرد. دوژمن، زۆر هەوڵیشی لەگەڵ دەداین. بەڵام بە دەستوەشاندنی زیاتر لە دوژمن، وەڵاممان دەدایەوە. (٢٤) ساڵ باوکو دایکو (٧) خوشکو برامان نەفی کران بۆ فەلوجە-سەگلاویە، چۆکمان دانەدا. برایەکی ئازیزم (جاسم-٢٧ ساڵ) شەهید کراو ئێستاش گۆڕەکەی نازانم.. ورەمان بەرنەدا.

کە هاتینەوە دوای راپەڕین.. بەشێک نەبوین لە بەرەی کوردستانی ئامێرو کەرەسەی کوردستان تاڵان بکەین. لە پارەی گومرگی ئامێرە تاڵانکراوەکانیش برابەش نەبوین. نەوتمان نەدزی. گومرگمان کۆنترۆڵ نەکردووە. پاکەتی جگەرەو دوگی قاچاخ بەڕێ ناکەین. ئاڵتونی کوردستان بەقاچاخ نانێرین.. ژێرزەمینەکانمان دۆلاری تیا نییە. لە نەوتەوە بۆ جەوت نادزین. پیلانیش ناگێرین. تەکەتولیش ناکەین. تەنها و تەنها، هەڵوێستی جیا و رەخنەی دڵسۆزانەمان هەیە. چۆن لە شاخدا، پاداشتی هەڵویست، پلینیۆمی تیرباران بوو. ئێستاش لە شاردا، پاداشتی دەستپاکی، پاداشتی لەهەڵوێستدا بێباکی، پاداشتی تێگەیشتن لە هاوکێشەکانو ئەرکەکان.. پاداشتی پاککردنەوەی تەعریب لە خانەقین، پاداشتی دەربەستی فەلسەفەی رۆشنگەریو دارشتنی بناغەی کولتوری مەدەنیەت.. پاداشتی فێستیڤاڵەکانی گەلاوێژو دامەزراندنی ئۆلۆمپی کوردستان، تەکەتول نەکردن لەناو ئەم هەموو تەکەتولە.. پاداشتی پاراستنی یەکێتی ناو یەکێتی، ئێستاش پیلانگێرانو دژایەتی دوور لە رەوشتی حیزبایەتی.. ئەویش بە پارەو چەکو لەسایەی شکۆی یەکێتیدا. مەدرەسەی پیلانگێران. مەدرەسەی مل شکان، تازە بۆتە نەریت لەناو یەکێتیدا زیاتر لە (٣٥) ساڵە دەسەپێنرێ!

## ( ٣ )
## کۆنفرانس؛ پیلانو ئاستی نزم!

یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵە، روداوێکی رێکخراوەییو دارشتنی بناغەی دارشتنەوەی ئایدیۆلۆژیەتی کۆمەڵە بوو. کاروبارە ئیداریەکانی کۆنفرانس:

- دۆزینەوەی شاخی (بڵفت)و تەلان تەلان دروست کردن بۆ دانیشتن.
- نوسینی لافیتەکان، کە تیایدا، مارکسیزم-لینینیزمو شانازی پێوەکردنی شەهیدانی کۆمەڵە، هی تەواوی ناوچەکان، بە چواردەوری شوێنەکەدا هەڵواسران.
- دروستکردنی دەمامک بۆ نوێنەرانی شارو دابینکردنی شوێن بۆیان، بۆئەوەی تێکەڵاوی کەس نەبن (ئێمە ئەنجاممان دان).
- خستنی ئازوقەو خواردن بۆ رۆژانی کۆنفرانس (لیژنەیەکی تر ئامادەی دەکرد).

سەرەرای دردۆنگیو دەستەگەری، بەگشتی دڵمان بە بەستنی کۆنفرانس، ئەویش لە ژیانی سەختی پێشمەرگایەتیدا، خۆشبوو. ئەگەر پیلانگێری لەئارادا نەبا و بریاری پاکتاوکردن نەدرابا، دەکرا ئاراستەی کۆنفرانس، هێمن بوایەو لە دوائاکامدا، رەخنەش لە یەکتر گیرابا، ئاسایی بوو، نەشکەیەندرایەتە شکاندنی ملی یەکتر.

دیمەنی ناو کۆنفرانس، هەر لەسەرەتاوە، نیشانی دەدا دەستەگەری کراوە. پیلانیش لەئارادایە. لەشێوەی دانیشتنی گروپ گروپدا، رەنگدانەوەی دەستەگەریەکە دەخوێندرایەوە.

کۆنفرانسەکە (٨) رۆژی خایاند. سێ رۆژی لە بناری شاخی بڵفت، کە شوێنەواری قەبرێکی لەسەر بوو بەناوی (مالیمۆس)، ناوەکە هی سەردەمی گریکەکان بوو. چونکە، گۆزە و گۆرو قاپو تەنوریش.. دەدۆزرایەوە.. نیشانەکانی ئەو سەردەمەیان پێوە بوو. بەداخەوە، کەرەسەی زۆر دەدۆزرایەوە، بەڵام هەموویان فەوتان! دوو رۆژیشی لەناو مزگەوتی گوندی کانی زەرد.. سێ رۆژیشی زینویی سەرووی خری ناو زەنگ.. پاشان نەوشیروان کردی بە بارەگای هەمیشەیی.

لە (١٨٥) ئەندام، تەنها (٥)یان ژن بوون. ئەمەش نیشانەی ئەوە بوو، کۆمەڵە، بایەخی بە خەبات بۆ یەکسانی ژن نەدابوو. بۆیە هەمیشە ژن لە سەرکردایەتیدا کەمبونو لە هیچ کۆنفرانسێکیشدا، بیریش لە هەڵبژاردنی ژن نەدەکرایەوە. باسیش کرابا، بە پێکەنینەوە وەڵام دەدرایەوە. ئەمە لەکاتێکدا لە مێژووی کۆمەڵەو یەکێتیدا، دەیان پیاوی مل ئەستور مل ئەستور کرانە مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتی، بەڵام کەمترینیان کاریگەرییان هەبوو.

ئێستاش مەگەر ناویان بنوسرێ ئینجا بزانرێ کە سەرکردایەتی بون، ئەگینا لە یادەوەریدا نین! سێ کۆنفرانسی کۆمەڵە، بیریش لە کاندیدکردنی ژن نەدەکرایەوە. لە سێهەمین کۆنگرەی یەکێتیدا، لەژێر فشارێکی زۆردا بەندە، کۆتام چەسپاندو (٦) ژن سەرکەوتن.

تەمەنبەندیو پیشەو رەگەزی ئەندامانی کۆنفرانس، بۆ مێژوو گرنگن:

- ٤٩ ئەندامی لەنێوان (٢٠-٢٤) ساڵ بون.
- ٧٤ ئەندامی لەنێوان (٢٥-٣٩) ساڵ بون.
- ١١ ئەندامی لەنێوان (٣١-٣٥) ساڵ بون.
- ٤١ ئەندامی لەنێوان (٣٦-٤٠) ساڵ بون.
- ١٠ ئەندامی بەرەو ژوری (٤٠) ساڵ بون.

لەڕوی کارو پیشەوە:

- ٤٤ ئەندامی- کرێکار.
- ١٧ ئەندامی- پیشەگەر.
- ٦٥ ئەندامی- موچەخۆری بچوکو فەرمانبەر.
- ٩ ئەندامی- پیشەگەری گەورە.
- ٥٠ ئەندامی- قوتابیو خوێندکاری زانکۆو پێشمەرگە.
- ٥ ئەندامیان ئافرەت بون.[١]

بەم تەمەنبەندییەدا دیارە کە تەنها یەک لەسەر چواری ئەندامان کرێکار بون. باقی ئەندامان، وردە بۆرژوازیو کەمێک سەروتر بون.

چەند خۆشبوو، بە سرودی ئینتەرناسیۆناڵ، کۆنفرانس کرایەوە. بەڵام چەندیش ناخۆشبوو، بڕیارەکانی کۆنفرانس، نەک رەنگدانەوەی گیانی ئینتەرناسیۆناڵ نەبوو، بەڵکو بە ئەقڵیەتی سەدەکانی ناوەڕاست، بۆ یەکترشکاندن، ئاڕاستەی کۆنفرانس کرا. ئەقڵیەتێکی پریمیتیڤی[*] پلانگێڕیی سەپێندرا.

بەرنامەی کۆنفرانس، کە لە راگەیاندنی کۆتایی یەکەمین کۆنفرانسدا بە رەسمی بڵاوکراوەتەوە. ئەم پرەنسیپانەی گرتبوەخۆی:

١ بڕوانە: راگەیاندنی کۆتایی یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان. لەژێر دروشمی (بەرەو پتەوکردنی ریزەکانی کۆمەڵەو راپەڕاندنی جەماوەری گەلەکەمان) ئاياری ١٩٨١. ل(١-٢).

* پریمیتیڤ: گەشەنەکردن لەناو پرۆسەی کولتوری. سودوەرنەگرتن لە ئامرازە کولتوریەکان. یان بەجێماو!

١) هەڵسەنگاندنی مێژووی (١١) ساڵەی کۆمەڵە. قۆناغی دامەزراندن (١٩٧٠-١٩٧٥). قۆناغی دامەزراندنی یەکێتیو بەرپاکردنی شۆرش (١٩٧٥-١٩٧٦).

٢) شیکردنەوەی باری کۆمەلایەتیو سیاسی کۆمەڵی کوردستان.

٣) دیاریکردنی ستراتیژی کۆمەڵەو دۆستو دوژمنانی، لە جیهان، عێراق، کوردستان.

٤) ناسنامەی رژێمی عێراق.. داگیرکەری سەپێنەری سیاسەتی فاشی بەرامبەر گەلی کورد.

٥) راماڵینی دەسەلاتی رژێمی سەرمایەداری دەوڵەتی بۆرژوازی بیروکراتی.

٦) بەهێزکردنی پەیوەندی هاوکاری لەگەڵ هێزە کوردستانیەکانی تردا، لەچوارچێوەی ستراتیژێکی هاوبەشدا.

٧) بەهێزکردنی یەکێتی تێکۆشان لەگەڵ هێزو تاقمە پێشکەوتنخوازەکانی ناوچەکە بەگشتی.

٨) لەگەڵ هێزو تاقمە پێشکەوتنخوازەکانی نەتەوەی عەرەبو عێراق بەتایبەتی..

پۆلێنکردنی ئامانجەکان، ئێمە فۆرمیلامان کردوەو لە دەقی راگەیاندنی کۆنفرانس هەڵمانهێنجاندوون.

بە وردبونەوە لە خاڵەکان، پرۆگرامی کۆنفرانس ساغدەبێتەوە کە چۆنچۆنی، بەپێی پیلانگێری کۆنترۆڵکردنی سیاسەتی ئەو قۆناغەی کۆمەڵە دارێژراوون. چۆن:

**یەکەم**: ناسنامەی چینایەتی کۆمەڵە، کراوەتە ئەرکی لاوەکی.

**دووەم**: لەبری روخاندنی رژێم، (چەمکی راماڵینی دەسەلاتی رژێمی سەرمایەداری دەوڵەتی) هێنراوەتە گۆرێ. (زەمینە خۆشکردنی دانوستان).

**سێهەم**: پێش باسکردنی هاوخەباتیی هێزە عێراقیەکان، باسی جەخت لە هاوکاری هێزە کوردستانیەکانی تر دەکرێ.

**چوارەم**: دیسان، پێش باسکردنی هاوخەباتیی لەگەڵ هێزە دژە رژێمی عێراق، باسی هێزو تاقمە پێشکەوتنخوازەکانی ناوچەکە بەگشتی دەکرێ.

**پێنجەم**: دوا خاڵ باسی هێزو تاقمی پێشکەوتنخوازی نەتەوەی عەرەب، ئینجا عێراق بەتایبەتی دەکرێ.

ئەم ئامانجانە، رەنگدانەوەی ناکۆکیو ململانێکان کە لەناو کۆمەڵەدا بوون، چەند مانگێک بوو، بەشێنەیی گەرم دەکرا. دوایی بە داتاشینی تۆمەتی عێراقچیو کوردستانی شکاندیانەوە. هەتا گەیاندیانە باسکردنی کێشەی کورد "یەک مەسەلەیە چوار مەسەلە

نییه.[*] بەمەش، زیرەکانە هەستی نەتەوایەتی ئەندامانی کۆمەڵەو رای گشتییان گومڕا کرد. کە لەسەر ئەو کێشانە تێکڕا، بە لاوازی مشتومڕی فکریو فەلسەفی دەکرا، بەگشتی دەرکەوت، کە ئاستی تیۆری سەرکردەکانی کۆمەڵە دوای (١١) ساڵیش لە دامەزراندن، نزمە. ئەو ئاستە تیۆریە نەبوو، کە توانای بەسەر گرفتە تیۆریەکاندا بشکێ. هەمومان وا بوین!

لەناوماندا، نەوشیروان، لە داڕشتنو لێکدانەوەدا لەهەموان باشتر بوو. بە میتۆدی زانستی وتارەکانی دەنوسی. کوردیەکی پاراوی دەزانی. بەڵام کە مشتومڕە تیۆریەکان لەناو دانیشتنەکاندا قووڵدەبون، نەک لەڕووی تیۆری مارکسیزمو چەپەوە، توانایەکی زۆری نەبوو، بەڵکو بۆ هیچ بوارێکی فەلسەفەی تریش، پێی نەبوو. خۆی کەسێکی ناسیۆنالیستی بوو. چوار ساڵ لە وڵاتی نەمسای دیموکراسیدا ژیابوو. لە زانکۆشدا، لە ماستەر وەرگیرابوو. بەڵام، لەسەر دوا باسە تیۆری-سیاسیەکانی خەباتی ناسیۆنالیستیو دیموکراسی، دوا چارەکە سەدەی بیستەم، ئەو دیالۆگو بۆڵتینانەی دەمێک بوو سەریانهەڵدابوو، هیچی نوێمان لێ نەدەبیست. بگرە، لە پەناو پەسێودا دەمانبیست، دەیگوت: کۆمۆنیزمو مارکسیزم گەڕوگول بووە. بەڵام لەڕووی فەلسەفیەوە، لەڕووی ئابوریەوە، ئایدۆلۆژیەوە، حوکمڕانیو حیزبایەتیەوە، بۆچی ئەو قەناعەتەی هەبوو؟ لەم بارانەوە هیچمان لێ نەبیست:

- نەمانزانی؛ لە روانگەی سۆسیال-دیموکراتەوە، ئەو رەخنانە دەگرێو بۆچی دەیانگرێ؟

- نەمانزانی؛ لەبەر ئۆرۆکۆمۆنیزم،[**] باوەڕی بە کۆمۆنیزم نەماوە؟

---

[*] فەرەیدون عەبدولقادر، کە لێپرسراوی دەزگای راگەیاندن بوو.. کە فیدراڵ لەچوارچێوەی عێراقدا راگەیەندرا، زنجیرەیەک سەرگوتاری کوردستانی نوێی ساڵی ١٩٩٣ نوسی، بەپێچەوانەوە دەینوسی مەسەلەی کورد چوار مەسەلەیە، یەک مەسەلە نییە!

[**] «ئۆرۆکۆمۆنیزم: یان کۆمۆنیزمی ئەوروپایی. زاراوەی کۆمۆنیزمی ئەوروپایی (Eurokommunismus) لەلایەن رۆژنامەنوسی ئیتاڵی (Fran E Barbieri)یەوە کە یەکێکە لە دەستەی نوسەرانی رۆژنامەی میلانۆیی، خرایە سەر زاران. ئەو رێبازەی (کۆمۆنیزمی ئەوروپایی)یەی کە لەلایەن (Santiago Carilo) هێنراوەتەگۆڕێ. جێ پێی خۆی قایم دەکات. چونکە زیاتر پشتی بە هاریکاری کۆمەڵگەی ئەوروپایی خۆرئاوا بەستوەو کەمتر لەگەڵ سازو ئاوازی ستراتیژی مۆسکودا رەوت دەکات».

سەرچاوە: «کۆمۆنیزمی ئەوروپایی، راستبونەوەیەک بە رووی خۆرهەڵاتو خۆرئاوادا. نوسینی: ڤۆڵگانگ لیۆنهارد. وەرگێرانی لە ئەڵمانیەوە بۆ کوردی: د.کوردۆ عەلی. بەرگی یەکەم- سلێمانی ٢٠٠٤. وەزارەتی رۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێران. ل(١٧)».

- نەمانزانی؛ باوەڕی بە قوتابخانەی فرانکفۆرتە،[+] کە لە بیستەکانەوە لە ئەڵمانیا سەریانهەڵداوە؟

- یان؛ باوەڕی بە پۆست مۆدێرنیزمە؟

- یان؛ بە راسیزمە؟ یاخود بە مۆدێراتە؟[*]

هیچی ئەو باسە تیۆریانەمان لێ نەبیست، نە لە دانیشتنەکانی کۆنفرانسدا، نە پێشترو نە پاشتریش. بەڵام هەر بابەتێکی باسکردبا، یان نوسیبا، لەسەر سیاسەتو ململانێکان، لۆژیکی گوتنو دارشتنی سفتوسۆڵ بوو. هەم لە سەرکردایەتی پێشوی کۆمەڵەو هەم لە ئەندامانی کۆمیتەی هەرێمەکان، کە لە کۆنفرانسدا بوین، لەو بارانەوە کە باسمکردن، لێوەشاوەتر بوو. ئەمە جگەلەوەی، دەسەلاتو تواناکانی یەکێتی، لە پارە، راگەیاندن، پلەو پۆست، ئۆرگانەکانی یەکێتی، کۆمەڵەو شۆڕش، لەبەردەستیا بوو. پشتیوانیی رەهای مام جەلالیشی هەبوو.

## ( ٤ )

## کلکایەتی نێودەوڵەتی!

لەو مشتومڕانەی کە بە لاوازیی دەکران، گرفتی سەربەخۆیی، یان کلکایەتی کۆمەڵە، بۆ بەناو کامپی شورەوی، یاخود چین، هاتە ئاراوە. ئەم گفتوگۆیەش، بەرژەوەندی

+ قوتابخانەی فرانکفۆرت: فێرگەیەکی فەلسەفی. فیکریو سۆسیۆلۆژیە. کاریگەری لەسەر شێوەی بیرکردنەوەی مرۆڤایەتی لەسەر ئاستی جیهان داناوە. ساڵی ١٩٢٤ لە شاری فرانکفۆرت لە زانکۆی گوێتە، پاژی لێکۆڵینەوەی سۆسیۆلۆژی دامەزرێنراوە. ناسراوترین نوێنەرەکانی ماکس هۆرکهایمەو تیۆدیۆر ئەدۆرنۆیە. هابەرماس بە وەچەی دووەم دادەنرێت. هۆرکهایمەو ئەدۆرنۆ پاش ١٩٣٣ بۆ ئەمریکا کۆچیان کرد. پێکەوە کتێبی (دیالیکتیکی رۆشنگەری)یان نووسی. ئەم فێرگەیە لەسەر بنەمای فەلسەفەی هێگڵو مارکسو لێکۆڵینەوەکانی زیگمۆند فروید دانراوە. ئەم فێرگەیە لەسەر چەمکی (تیۆری رەخنەگرانە) کاری کردووە. لە سۆنگەی نووسینەکانی هۆرکهایمە (١٨٩٥-١٩٧٣)و ئەدۆرنۆ (١٩٠٤-١٩٦٩)و هابەرماس لە سەرانسەری ئۆروپا ١٩٦٨ شۆرشی خوێندکاران بەرپا کرا.

* مۆدێرات.. واتا: اعتدال.. پێچەوانەی توندرەوایەتی چەپو راست! «چەمکی مۆدێرنێتە دەگەرێتەوە بۆ هەوڵەکانی تێگەیشتن لە ماناو بایەخی گۆرانی کۆمەلایەتی لە ئەوروپا بەشێوەیەکی دیاریکراوتریش دەگەرێتەوە بۆ ئەو کاریگەریانەی کە پیشەسازی بوون، شارنشینو زیاتر پشت بە گەشەپێدانو پێشکەوتن دەبەستێت. مۆدێرنێتە دژی نەریتە«. سەرچاوە: «مۆدێرنیزم- پرۆژەی چەمکە فکریو فەلسەفیەکان- دەزگای ئایدیا. ٢٠١٨. ل(٢٢٠)».

سیاسیو ئەرکی خەباتی پێشمەرگایەتی حوکمی تیا کرد، نەک باسی تیۆریو ئایدیۆلۆژی کە ئەوکاتە لەئارادا بون.

کۆمەڵە، بڕیاری دا کلکایەتی ڕەتبکاتەوە. ئەمە لەکاتێکدا، کۆمەڵە، بەبێ تێگەیشتنی قووڵ، لەو سەردەمەشدا مام جەلالیان بە سکرتێر هەڵبژاردوەو دواتر شیهابی شێخ نوری، کاری سکرتێری کردووە (٥) ساڵی ڕەبەق، بەبێ لایەنی کەمی شارەزایی لە قووڵبونەوەی کێشەکانی ناو چینو شۆڕشی ڕۆشنبیری، کۆمەڵەیان کردبووە پاشکۆی چینو سیاسەتی "سەرۆک ماوتسیتۆنگ". ئەمە لەکاتێکدا، پێش دامەزراندنی کۆمەڵە، چین لەناو خۆیدا، دوچاری سەدان کێشەی فەلسەفیو ئایدیۆلۆژیو.. ئابوریش بووبوو. سەرۆکپەرستییان گەیاندبووە رادەیەکی ترسناک!

ئەوەی یەکەمی کوردایەتیو کۆمەڵە، دوای تاقیکردنەوەیەکی زۆری سیاسی، بینینی دونیا، ئەزمونی شکستو هاوخەباتیی لەگەڵ فەلەستینیەکاندا.. چەپەکانی لوبنانو دەوڵەتانی عەرەبیدا.. ئەو سیاسەتە هەڵدێرەی کلکایەتییان بۆ چین گرتەبەر. ئەمە لەکاتێکدا، لەناو تەواوی فەلەستینیەکاندا، جگە لە (مونیر شەفیق)ی ئەوسا (پێش ئەوەی ببێتە ئیسلامگەرا) ڕەوتێکی لاوازی مارکسیستی فەلەستینیو (وحدة القاعدە- قیادەی مەرکەزی) هیچ لایەکی تر، پاشکۆی چین نەبونو لەبەر خاتری چینیش، نەدەچون بەگژ ڕۆژهەڵاتی ئۆروپادا. لەدوای حەفتاکانیش، فەلەستینیەکان، بەتەواوی لە کلکایەتی چین، دوورکەوتنەوە. مایەوە تەنها هەندێک لە چەپەکانی ئێران. بەتایبەتی حیزبی ڕەنجبەرانی ماویستی، ئەمانیش دوای شۆڕشی گەلانی ئێران، لەهەموو ئێراندا هەزار کەسیان نەبوو!

سەیرەکە ئەوەیە لەو سەردەمەداو لە گەرمەی ناکۆکیەکانی چینو شورەویدا، حیزبە پرۆ شورەوییەکان، ناوبەناو کۆبونەوەی ئینتەرناسیۆنالیزمیان دەبەست. بەڵام چین، نەک ئەم کۆبونەوانەی نەدەکرد، بەڵکو پەیوەندی بەهێزی لەگەڵ دیکتاتۆرەکانی سودان، شیللی، پاکستاندا هەبوو!! سەرکردایەتی کۆمەڵە، هیچی ئەو روداوانەیان نەدەبینی، لەسەر سیاسەتی پاشکۆیەتی چین بەردەوام بون.(+)

+ خۆمان شاردبوەوە. بلاوکرایەوە کە چین کۆشکێکی کۆماری شاهانەی بە مەرمەڕ بۆ سەرۆکی سودان جەعفەر نومەیری، بەبەلاش دروستکردووە. شەهید ئارام گوتی: ئەی ئافەرین سەرۆک ماو.. بکوژی کۆمۆنیستەکان پاداشت دەکات!

با ئەو دەقە وەکو خۆی بنوسینەوە، هەتا هەڵە زەقەکەی دەربخەین:

"پارێزگاری سەربەخۆیی ئایدیۆلۆجیو سیاسی کۆمەڵە لە کلکایەتیو رەدوکەوتنی ئیتجاهە جۆراوجۆرەکانی ناو بزوتنەوەی کۆمۆنیستی جیهان لەلایەک، و پێویستی پتەوکردنی پەیوەندی ئینتەرناسیونالیستی پرۆلیتاریو هاوخەباتیو دۆستایەتی لەگەڵ وڵاتانی سۆشیالیستیو جوڵانەوە کرێکاریو رزگاری خوازیەکانی گەلاندا لەلایەکی ترەوە، بەشێکی تری کارەکانی کۆنفرانس بو".[1]

ئەم دەقە، ئاستی لاوازیی تێگەیشتنی کۆنفرانس، لە کێشمەکێشەکانی کامپە بەناو سۆسیالیستەکانی ئەوکاتە دەردەخات. وەکو:

- پارێزگاری سەربەخۆیی ئایدیۆلۆژیو سیاسی کۆمەڵە.. ئەمەیان دروستە.. بەڵام

- کام ئیتجاهە جۆراوجۆرەکانی بزوتنەوەی کۆمۆنیستی؟ لەکاتێکدا بزوتنەوەی بابەتی کۆمۆنیستی، بە چەمکە زانستیەکەی نەمابوو. ئەوەی هەبوون، وڵاتانی رۆژهەڵاتی ئۆروپاو چینو مانەندەکانیان بوون. حیزبەکانیش، لەناو ئەو دوو جەمسەرەدا دابەشبوبوون.

- کام پێویستی پتەوکردنی پەیوەندی ئینتەرناسیۆنالیستی پرۆلیتاری؟

ئەم جۆرە پەیوەندییە، بەناو ئینتەرناسیۆنالیستیەوە لەو سەردەمەدا، بونی نەبووە. باشترین بەڵگەش ئەوەیە کە نە ساڵانی (١٩٧٠-١٩٧٥) سەرکردایەتی دامەزرێنەر یەک هەنگاوی ئینتەرناسیۆنالیستییان نابوو. کۆمیتەی هەرێمەکانو دوای ئەوەش سەرکردایەتیەکانی تریش، لەمبارەوە دەستەپاچە بوون. تەنها پەیوەندی مام جەلال لەگەڵ فەلەستینیەکاندا هەبوو. ئەویش بەناوی کۆمەڵەوە نەیکردبوو.

لەڕاستیدا، پاشەکشەی بزوتنەوەی کۆمۆنیستیو ئەوەی ناوی ئینتەرناسیۆنالیزم بوو، دەرکەوتبوو. هەردوو لای ناکۆکی ناو کۆنگرە:

- جەمسەری چوار پارچەی کوردستان.. لە ئەرکە ستراتیژیەکانی سەردەمەکە، کە دیموکراسیو مافی مرۆڤ و ئازادییە مەدەنیەکان بوون، تەرحیان نەبوو. بەڵکو تێگەیشتنی لاوازیان هەبوو.

- جەمسەری چەپی مارکسیستیش، تێگەیشتنی نوێیان بۆ ئەرکە دیموکراسیەکانی

---

١ راگەیاندنی کۆتایی یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان. لەژێر دروشمی (بەرەو پتەوکردنی ریزەکانی کۆمەڵەو راپەڕاندنی جەماوەری گەلەکەمان) ئایاری ١٩٨١. ل(٥).

چەپو چەپی سەردەمەکە نەبوو. زۆرتر چەپی کلاسیک بوین، بەڵام بە ئاستی تیۆری نزمەوە!

بڕیارەکانیش، دوای گفتوگۆیەکی پڕ لە حەماسەتو حەساسیەت، بە زۆرینەی دەنگ، کە زۆرینەی ئەو تەکەتولە بوو، ئۆرگانەکانو توانای کۆمەڵەی لەبەردەستدا بوو، بە پیلانو بەرنامەو بڕیاری پێشوەختیشەوە، هاتبونە ناو کۆنفرانس، دەنگ دەدراو ئاڕاستەی دەنگدانو بڕیارەکانیش، دژی چەپەکان دەکرا!!

باری دەرونیی ئەندامانو جەمسەرەکانی کۆنفرانس، ڕۆژ بە ڕۆژ، پتر دەئاڵۆزا. ڕقەبەرایەتی جێگەی هاوڕێیەتیو دژایەتی شوێنی خۆشەویستی دەگرتەوە. کە گەیشتە سەر مشتومڕە تیۆریەکان، بەڵگەو لۆژیکو ئاماژە تیۆریەکان گوێیان لێنەدەگیرا. سەرکردەی جەمسەری دژە چەپ، چییان گوتباو دەستیان هەڵبڕیبا، لای گۆشکراوەکان دەیخوارد. بەوشێوەیە، کاتێک گەیشتینە ڕۆژی هەڵبژاردن، سیناریۆی لیستەکان، کەسەکانو دەنگەکان، بەپێی بڕیاری جەمسەرەکان، دیاریکرابوون. بەڵکو نەوشیروان ڕۆژی دەنگدان بڵاویکردبوەوە، ئەگەر ڕەوتی چەپ دەربچن، وازئەهێنێ. بەم قسەیە، هەموو ئەوانەی تا بیستنی ئەو بڕیارەی نەوشیروان، ویستبویان بە ویژدان، دەنگ بدەن.. خۆیان ساغکردەوە دەنگ بە ڕەوتی ڕەخنەگر نەدەن! واتا: ئازادی ویژدانی لێ زەوت کردن!

بە بڵاوکردنەوەی ئەو قسەیە، دوا تیری ژاراوی گیرایە سنگی سەرکردە ماندوەکانو ئومێدی دەرچونیان کۆتاییهات. زۆریش هەوڵدرابوو منو ملازم عومەریش دەرنەچین، بەڵام تەنها هێندەیان کار کردبووە سەر کۆنگرە، دەنگی کەمترمان هێنا. تا ئەو ڕادەیە، د.کەمال خۆشناو، کە شەوی بەستنی کۆنفرانس، ڕایگەیاند کۆمەڵەیەو هێنراشە ناو کۆنگرە، دەنگی لە ئێمە زیاتر هێنا. ڕێزی زۆرم بۆ د.کەمال خۆشناو هەبوو. قسەی من لەسەر ژیانی حیزبایەتیە.. د.کەمال، لەژیانیا لە یەک کۆبونەوەی کۆمەڵەدا بەشداری نەکردبوو. کەچی هەر بۆئەوەی ڕەخنەگرەکان لە سیاسەتی چەوت، دەرنەچن، ژمارەی ئەندامانی ئەندامانی سەرکردایەتیش کەم دانرابوو، هەتا تەنها ئەو ناوانە دەرچن کە لە لیستەکەیاندا بوو. د.کەمال بەوشێوەیە دەرچێندرا.

( ٥ )

## سەرکەوتنی پاسدارانو پاشەکشە!

شۆڕشی چەکداریی، ستراتیژێکی نەگۆڕی دوو سەدەی کورد بووە. باقی شێوەکانی خەبات، فەرامۆش کرابوون. کە ڕاپەڕینی گەلانی ئێران سەرکەوت، ڕۆژهەلاتی کوردستان، باشتر لە دۆخی جەنگی دووەمی جیهان، کەوتە دەستی گەلەکەمان. پادگانەکان چەککران. خەڵک بەزۆری چەکدار بون. بەتایبەتی ئەندامانی دیموکراتو کۆمەڵە. بزوتنەوەیەکی چەکداریی خۆڕسکی، پێش ئەوەی داخوازییە سیاسی-دیموکراتیەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان گەلاڵە بکرێو بدرێ بە حکومەت، سەریهەڵدابوو. ئیدارەی شارەکانیش کەوتبوە دەستی دیموکراتو کۆمەڵەو خەڵکی ناودار! بەرە بەرە، حکومەتی ئێران خۆی گرتو پاسداران پێکهاتو دەستوری هەمیشەیی ویلایەتی فەقیە لەراپرسیدا پەسەند کرا. هەنگاو هەنگاو ئازادیەکانی تاران، شارەکانی تری گەلانی جیاوازی ئێران، کۆنترۆڵ کران. تەنها کوردستان بە کۆنترۆڵنەکراویی مایەوە. بایکوتی هەڵبژاردنیشیان کرد. دۆخێک هاتەپێشەوە کورد، دیسان لە (٢٢/ی ڕێبەندانی ١٩٧٩) ڕاپەڕینیان کردو ئەرتەشو پاسگاو پادگانو ساواکی شایان تەفروتونا کرد. بە بەخشینی بیست شەهید، پادگانی مەهاباد گیرا. دوای هەشت ڕۆژ، دیموکراتو کۆمەڵەو مامۆستا شێخ عیزەدین، هەر لە مەهابادا، کاروباریان ڕێکخستو داخوازی کوردیان لە (٨) مادەدا گەلاڵە کرد.

لێرەوە، بۆ یەکەمین جار لەدوای کۆماری مەهابادەوە، دانیشتنی ڕەسمی لەنێوان نوێنەرانی کوردستانو دەوڵەتی مەرکەزی ئێران دوای (٣٣) ساڵ دەرگای دەکرێتەوە. بۆ ئەم دانیشتنە، بڕیارنامەی هاوبەش لە (٨) داخوازیدا، ئامادە دەکرێو دەدرێتە حکومەتی کاتیی دوای ڕوخاندنی شا. دوای مشتومڕێکی زۆر، فشاری ڕای خەڵکو کۆڕو کۆبونەوەی زیاتر، داخوازیەکان زیاد کراوە بۆ (٢٦) ئامانج. (قطعنامەی بیستوشەش مادەیی).

بەداخەوە، ڕەوتی ڕوداوەکان بەرەو ئاڵۆزی پەرەیان سەند. ئیدی میللەت، زیاتر هانای بۆ بەرەنگاری چەکداری برد. دیموکراتو کۆمەڵەش، سیاسەتێکی جیاوازیان لە خەڵکەکە پیشان نەدا. واتا:

هەمان دۆخی ساڵی ١٩٥٨ی عێراقو عەبدولکەریم قاسم، بە جیاوازی ئەوەی، کورد دوای (٣) ساڵ دژی قاسم دەستی دایە چەک، بەلام لە ڕۆژهەلاتی کوردستاندا

دژی کۆماری ئیسلامی، بە چەند مانگێک. ئەمەش خێراییەکی پێوانەییە لە چۆنیەتی چارەسەرکردنی کێشەی سیاسی گەلێک، دوو سەدە زیاتری خایاندووە. دوا سەرەنجام، بە لای خەباتی چەکدارییدا شکایەوە، ئەمەش رەچاونەکردنی باری بابەتی ئێران بوو.. کە حکومەتو تەوژمی شیعە، لەوپەڕی بەهێزیدا بون. بەرهەڵستی هەردوو "ئەبەلقودرەت"یان دەکرد. سەدان هەزار پاسداریان چەکدار دەکرد. کورد، لەناو گەلانی ئێراندا، تاقە نەتەوە بوو، سەنگەری چەکداریی گرتبوو. ئەمە لەکاتێکدا گەلانی تری ئێران، هاودۆخی کورد بوون. تەنانەت موجاهدینو چریکی ئەکسەریەتو حیزبی تودەش، لەگەڵ دەوڵەتدا بوون. گروپەکانی ئۆپۆزسیۆن، بە ژمارە کەمو کاریگەرییەکی ئەوتۆیان دژی حکومەتەکە نەبوو. هێزە کوردستانیەکان، نە کۆمەڵە لەگەڵ چەپەکانو نە دیموکرات لەگەڵ دیموکراتەکانی ئێران، نە بەرەی سیاسی، نە رێکەوتن، نە پەیمانی دووقۆڵیی، لەنێوانیاندا نەبوو. ئەمەش ئەوەی دەگەیاند، کە کورد بەتەنها دەچوو بەگژ حکومەتێکی هەرە بەهێزدا.

کورتیەکەی.. کێشەکە لەوەدا بوو، بەهیچ چەشنێک هەلومەرجی بابەتیی سەرانسەری ئێران، بۆ شۆڕشی چەکداریی، ساز نەبوو. هەلومەرجی بابەتیش چەمکەکەی دیارە، ئەویش ئەوەیە کە حکومەت توانای چارەسەرکردنی قەیرانە ئابوریو سیاسیەکانی نەمابێو گەلانیش چیکە بە حکومەتەکە رازی نەبن. ئەمە لەئێراندا، لەو دۆخەدا، روونەدابوو.

دوای شەڕو شۆڕو روداوەکانی شاری سنە، کە شەڕی سەنگەربەندی شارەکە کرا. ئەمەش، شەڕێکی شۆڕشگێرانەی نابەرامبەر بوو. بەڵکو لە نەریتی شۆڕشگێرانەی کرێکارانو گەلاندا، سەدەیەک زیاتر بوو، وازی لێهێنرابوو. دوای دوو سەد قوربانی، هەیئەتێکی باڵای دەوڵەت، کە نیشانەی بایەخی سیاسیو دانوستاندن بوو، هاتنە سنە.(*) بەڵام چارەسەری سیاسی نەهاتەگۆڕێ.

نەک ئێستا، ئەوکاتەش بەندە، بۆ دۆخی ئەوکاتەی ئێران، کە تازە شا روخابوو، جەماوەری شیعەو دژە رژێمی شا، خرۆشابون، راپرسی لەسەر دەستور دەکراو

---

* هەیئەتەکە بریتی بون لە: تاڵەقانی سەرۆک، رەفسنجانی، خامنەیی، سەدری حاجی سەید جوادی، عیزەتوڵڵای سەحابی، سادق قوتب زادە، بەنی سەدر، داریوش فروهەر. وەفدی کوردستانیش بریتی بوون لە: شێخ عیزەدینی حوسێنی، د.جەعفەر شەفیعی، شوعەیب زەکەریایی، فوئاد مەجید سوڵتانی، یەحیا سادق وەزیری، مەلا محەمەد رەبیعی، شێخ جەلالی حوسێنی، یوسف ئەردەلان، عەبدوڵڵای حەسەن زادەو غەنی بلوریان.

سەرۆک کۆمارو پەرلەمان هەڵدەبژێردران، رام وا بوو، کە بۆ شۆڕشی چەکداریی، دۆخەکە لەبار نەبوو. بەتایبەتی، نە دیموکراتو نە کۆمەڵە، یەک دۆستی ستراتیژییان بۆ پشتیوانیی شۆڕشەکە، دابین نەکردبوو (بەلام کە شۆڕشیان کرد پشتیوانیان بوین). تەواوی ولاتانی دونیا، زلهێزەکان لەپێشەوە، بۆڕبۆڕێنیان بۆ پەیوەندی پێوەکردنی دیپلۆماسیو ئابوری لەسەر ئێرانی دوای شا، دەکرد. تەنانەت گەیشتە رادەیەک ئەمریکاو دەوڵەتان، جگە لە میسر، ئامادە نەبون داڵدەی شا بدەن. شۆڕشی چەکداریی، لە دۆخێکی وادا، گەرچی وەکو نەریتی لەمێژینەی نەتەوەی کورد، هەروەکو هەموو شۆڕشێکی چەکداریی تر، جۆشو خرۆشێک دێنێتەئاراوە، بەلام جۆشوخرۆشەکە، مەرج نیە بەرگەی هێرشی بەربلاوی عەسکەریی بگرێ. بەتایبەتی، هێرشی پاسدارانو سیاسەتی کۆماری ئیسلامی، بە تەوژمی، ئیسلامگەرا-شیعەگەرا، بێرادە جەماوەری لە دەوردا ئالابون. نەک هێرش بۆ سەر کوردستان، بۆ بەرگری لەبەرامبەر جەنگی عێراقیشدا، سەدان هەزار پاسدار، گیانیان بۆ ئێرانو کۆمارەکەیان بە فەتوای ئیمام خومەینی بەخت دەکرد. شۆڕشی رزگاریخوازانەی کوردستانیش، بەتەواوی توانای هەردوو هێزە سەرەکییەکە (دیموکراتو کۆمەڵە)و (سازمانی خەبات)و (توانای جەماوەری مامۆستا شێخ عیزەدین)یش، هاوکات بە پشتیوانیی هێزی یەکێتیش، نەتوانرا یەک شارۆچکەی رۆژهەلات بپارێزرێ. لە تەواوی سالانی جەنگی عێراق-ئێرانیشدا، تەرازووی هێز بەلای هێزی پێشمەرگەدا نەشکایەوە. بەڵکو پێشمەرگە شکان.

راستە، پارتی ئەوکاتە لەگەڵ ئێرانو پاسداراندا بوونو سیاسەتێکی دژە کوردایەتی رۆژهەلاتیان هەبوو، بەلام یەکێتی لە شۆڕشدا بوو. سنورەکانی بۆ هێزی پێشمەرگەی رۆژهەلات ئاواڵە بون، هەتا ساڵەها دوای راپەڕینی (١٩٩١)یش، سنورەکانی یەکێتی بۆ رۆژهەلات دانەخران. پارتی کە لەبادینانو لە سنوری تورکیاو سوریادا، بالادەست بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، هێزەکانی رۆژهەلات نەیاندەتوانی، دەڤەرێک، لە دەڤەرە هەرە سەختەکانیش بپارێزن. ئەمە لەکاتێکدا یەکێتی پشتیوانیشیان بوو.

ئەم راستییە، فەرامۆشکردنی خەباتو گیانی گیانفیدایی ئەو هەموو قارەمانانەی ژنانو پیاوانی رۆژهەلات، لە سالانی خەباتی بەرەنگاری چەکداریدا نییە. بەڵکو جەختکردنەوەیە لەوەی دۆخی بابەتیی، وەکو چەمکی سیاسی-عەسکەری، کە بۆ بەرپاکردنی شۆڕش پێویستە بخەملێ، لەسالانی ١٩٨٠-١٩٨٢ لە ئێراندا نەخەملیبوو.

هەردوو هێزە سەرەکیەکەی رۆژهەڵات دەزانن، خۆشم یەکێک بوم لە فەرماندەکان، بەشداریی پشتیوانیی رێپێوانی خەڵکی سنە لە مەریوان کردوەو هاوبەشی هێزی پشتیوانیش بوم لە گوندی (ساوان)ی لای (داوداوا). گەرچی، لە هەناردنی هێزی پشتیواندا، بۆچونی جیاوازیشم هەبوو. سووریش ئاگادار بوم، ژێربەژێر دانوستاندن لەگەڵ حکومەتی عێراقدا هەیە. بۆچونی ئێستام لەسەر هەلومەرجی بابەتییو شۆڕشی چەکدارییو سەردەمەکەیە(*)

ئەو روداوانە، کە توێژینەوەی زیاتری دەوێ، هەتا هەمەلایەنە، خوێندنەوەیان بۆ بکرێ. تا ئێستاش، یان لە روانگەی حکومەتی ئێرانەوە، بۆچونەکانی حکومەت لەسەر روداوەکان خراوەتەڕوو. یان لە روانگەی حیزبە کوردستانیەکانیەوە، تێزەکانی حکومەت رەتکراوەتەوە. روداوەکان زۆریان بەبەرەوە ماوە، توێژینەوەیان بۆ ئەو دۆخەی شۆڕشی تیادا بەرپا کرا، لەسەر بکرێ.

نوسەر وەکو هەموو بابەتەکانی تر، دەستی کورتە لە توێژینەوە. تەنها هێندەی لەسەر ئەو روداوانە نوسیووە، هەتا لە خوێنەری بگەیەنێ، ئەویش لەناو روداوەکاندا بووە. دیقەتی بدەن لە لاپەڕە (٣٦٨)دا چەند بێ پێز دەنوسێ:

"سەبارەت بە سەرنەگرتنی هەوڵو تەقەلای "مام جەلال"و پاشان هاتوچۆی نوێنەرانی شۆڕشی کوردستانی ئێران لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران، دروستبوونی ناکۆکی نێوان هەردوو باڵی میانڕەو و توندڕەوانی سەرانی کۆماری ئیسلامیو شکستی میانڕەوەکان زاڵبوونی دەسەڵاتی توندڕەوەکان کۆماری ئیسلامی هێرشێکی توند و بەربڵاوی کردە سەر کوردستانو بەخێرایی پێشڕەوی دەکردو هێزەکانی کوردیو ئێرانی ئۆپۆزسیۆنیش بەتایبەتی حزبی دیموکراتو کۆمەڵەی ئامۆزا. لە پاشەکشەیەکی خێرادا بوون ڕووەو سنوری هەردوو پارچەکەی کوردستان".[1]

ئەم چەشنە نوسینە، تەنانەت بۆ هەواڵی رۆژنامەش، کاڵوکرچە.

---

* هەر ئەم بۆچونانەم بوو، لە ئەنفالەکاندا ١٩٨٩ هانی دام کتێبی (شۆڕشی کوردستانو گۆڕانکاریەکانی سەردەم) بنوسم.. کە تیایدا، یەکەمین نوسەری پێشمەرگەم لەدوای جەنگی سارد، ستراتیژی خەباتی چەکداریی بۆ رزگاری گەلانی ژێردەستە، وەکو ستراتیژ، رەتدەکەمەوەو جەخت لە خەباتی پەرلەمانیو مەدەنیو راپەڕین دەکەمەوە. بەناوی راپەڕینی بەردەوام.

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٦٨).

## ( ٦ )

## هێزی پشتیوانو دانوستان

هێرشی پاسداران، له ئەیلولی ١٩٨٢وه فراوان بوو. سەرانسەری رۆژهەلاتی کوردستانی گرتەوه. لەسەراپای سەنگەرەکاندا، به بەرەنگاریی‌و قوربانیی، هێزەکانی دیموکراتو کۆمەڵە، له دەوروبەری ورمێوه هەتا پاوه، دوای سێ مانگ، پاشەکشەیان کرد. دیاره، تەرازووی هێز، بێراده نابەرامبەر بوو. دەوڵەت هەموو توانایەکی زەمینی‌و ئاسمانی خستە مەیدانەکانی شەڕو هێرش؛ هێزەکانی رۆژهەلاتیش، هێزەکانیان زۆر کەمتر بوون؛ به چەکی تەکتیکی؛ ژمارەیەکی کەم چەکی قورسی مامناوەنجی؛ به کەمترین پسپۆڕی عەسکەریش، بەرگرییان دەکرد.

که هێرش کرا، ستادی هاوبەشی عەسکەری، لەنێوان هێزەکانی رۆژهەلاتدا نەبوو. دیموکراتو کۆمەڵە، ناکۆکو دڕدۆنگ بوون. شەڕی راگەیاندنیش لەنێوانیاندا پێشتر سەریهەڵدابوو. ئەمە لەکاتێکدا، که دانوستانەکان نەگەیشتنە ئاکام، دەبوایە هێزەکانی رۆژهەلات، بیر له ستراتیژو تاکتیکی بەرەنگاریی بکەنەوه. هەڵەی گەورەی عەسکەرییش، لەوەوە دەستپێکرد، سەرەتا شەڕی بەرەیی فراوان کرا. تاڕادەیەک بەرگری له شارەکانیش دەکرا. شەڕی بەرەییش، لەو نابەرامبەرییەی هێزەکانو باڵادەستیەی دەوڵەتدا، ئەنجامەکەی دیاره، لەقازانجی دەوڵەتدایە. راستتر وابوو، تەنها دوو شێوازی شەڕ تێکەڵاو بکرایە:

**یەکەمیان**: شەڕی پارتیزانی‌و تەکتیکی.

**دووەمیشیان**: شەڕی بزوت (الحرب المتحركة).

هاوکات، خەباتی جەماوەری مەدەنییش، فەرامۆش نەکرایە.

شەڕی پارتیزانی، به مەفرەزەی بەردەوام دەکرێ. لەهەموو شوێنێکدا. تەنانەت ناوبەناو لەناو شارەکانیشدا.

شەڕی بزوتیش، به هێزی (٥٠-١٠٠) پێشمەرگەیی دەکرێ. ئەمیش، شوێن‌و کاتی شەڕ، هەر دەبێ پێشمەرگه هەڵیبژێرێ. لەکاتی ناچارییشدا، بەرگری دەکرێ.

بونی بارەگای قەبە، له شوێنی زانراودا، له مەودای چەکی قورسی سوپادا، بۆ ئەو جۆره شەڕانەی سەپێنرایە سەر رۆژهەلات، هەڵە بوو. بۆیە، که هێزەکان کەوتنە شەڕی بەرەیی فراوانەوه، دوای ماوەیەکی کەمی پێوانەیی عەسکەری، دوچاری شپرزەیی

هاتن. ئەم ڕێسا عەسکەرییانە، بۆ نوسەر، کە نایزانێ، لێی ناگیرێ، بەڵام نوسینەکەی کە هەروەکو هەواڵیش نوسیووە، هەڵەی زۆر تیایە. وەکو:

"حزبی دیموکراتو کۆمەڵەش نوێنەریان هاتە توژەڵە بۆ بارەگای هاوینەی مام جەلال لە مانگی (١٩٨٢/٩) بە فەرمی داوای یارمەتیان لە یەکێتیو حزبی شیوعی کرد. حزبی شیوعی لەڕێگەی سکرتێریانەوە (عەزیز محەمەد) وەلامیان دانەوە کە ناتوانن بڕیار بدەن دەبێ دراسەی بکەن. (د.قاسملو) وتی: تا ئێوارە دراسەی دەکەن ئێمە هەموو شوێنەکانمان دەگیرێ؟

. مام جەلالو نەوشیروان وەک نوێنەری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانو کۆمەڵە ئامادەییان دەربڕی بوو بە ناردنی هێز بۆ هاوکاری حزبی دیموکرات، تەنانەت "مام جەلال" وتبوی: ئامادەین شۆڕشەکەی خۆمان لەم دیو ڕاگرینو هەموو هێزمان بنێرینە لاتان بۆ پشتیوانی کردنتان".[1]

ئەم هەواڵ نوسینە، هەمووی لە کتێبەکەی نەوشیروان مستەفا (پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن.ل٢٦٤) دزیووە ، بەلام بە کلکو گوێ کراویی داڕشتۆتەوە.

نەوشیروان، زۆر جوانو بە پوختی ڕوداوە چارەنوسسازەکەی ئەو دۆخەی داڕشتووە. نوسەر بێسەروبەر لاسایی کردۆتەوە. چ نەوشیروانو چ نوسەر، بە ڕق لەم ڕوداوەشدا، بایانداوەتە سەر ئێمەو بەوە تاوانبارمان دەکەن، گوایە دڵی پێشمەرگەمان سارد کردۆتەوە. ئەو تۆتەمانە، پێویستیان بە ڕونکردنەوەیە. لە دەقێکی نەوشیروانەوە دەچمە ناو بابەتەکە:

"ئەم بڕیارەی یەکێتی، کە منیش تیا بەشدار بوم، زۆرتر شتێکی (عاطیفي) بو تا لێکدانەوەی سیاسیو هەڵسەنگاندنی ڕوداوەکان. هێزەکانی حدکا تێک شکا بون. هەر ناوچەیەکیان لێ ئەگیرا بەیەکجاری چۆڵیان ئەکرد. پێشمەرگەیان تێدا نەئەهێشتەوە بۆ درێژەدان بە شەڕی پارتیزانی. یەکێتی بەم کارە نەیتوانی حدکا هەڵبسێنێتەوە، بەلام ئێرانی لەخۆی وروژاندو، ئەو (ئاشتیە لەرزۆک)ەی لەنێوان پارتیو یەکێتیدا بو سەرلەنوێ تێکچووەوە. یەکێتی کەوتە ناو مەترسیەکی گەورەترەوە لەو مەترسیەی هەڕەشەی لە حدکا ئەکرد. مەترسی شەڕ لە ٣ مەیدانی جیاوازدا: عێراق کە شەڕی لەگەڵ ڕانەگیرابو. ئێران کە لەبەر خاتری حدکا شەڕی لەگەڵ دەس پێکرابو. جود بە سەرکردایەتی پارتی

---

١ هەمان سەرچاوە.. ل(٣٦٨-٣٦٩).

که لەژێر گوشاری ئێراندا خەریکی خۆسازدان بو بۆ پەلاماردانی یەکێتی».[1]

با ئەو بۆچونە، کە بە ویژدانەوە دارێژراوە، شیبکەینەوە:

أ- بڕیارێکی چارەنوسساز دراوە، وەکو نەوشیروان دەنوسێ: زۆرتر شتێکی (عاطیفي) بووە. ئێمەش دەڵێین:

چارەنوسی شۆڕشێک، چۆن دەشێ بە عاتیفی بدرێ‌و لەئەنجامدا، شۆڕشەکە بخرێتە ناو سێ هێزو سێ پیلانی ترسناکەوە؟!

ب- هێزەکانی حدکا (حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران) تێکشکابون. هەر ناوچەیەکیان لێ ئەگیرا، بەیەکجاریی چۆڵیان ئەکرد. ئێمەش دەڵێین:

حیزبێک، بەوشێوەیە تێکشکابێ‌و ناوچەکانیان لێ گیرابێ، ناوچەکانیشیان لە ورمێ‌وە هەتا سابڵاغ، سەردەشت، شنۆ، خانە، نەغەدە، بانە، سەقز، بۆکان، میاندوا و، سنە، کامێران، مەریوان‌و پاوە، هەزاران گوندو سەدان هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەی شاخ، دەشت، لێرەوار، هەزاران گردو تەپۆلکە..تاد. تازە بە (٢٥٠٠) پێشمەرگەی یەکێتی، چۆن هێزی ورە روخاوی وا، لەسەر سنورێکی تەسکی، کونەمشک، دەشتی مردوان، داوداوا، چەکۆ، سێپتان، خدراوا، کاولانە، ئاڵی مران..تاد. زنجیرە شاخی مەروان، دەڤەری دەوروبەری نۆکان‌و بێدەلان..تاد، کە هەمووی نەیدەکردە (٥٠) کیلۆمەتری چوارگۆشە، چۆن دەپارێزرا؟

ج- وا پاشەکشەیان دەکرد، تەنانەت پێشمەرگەشیان لەناوچەکاندا نەئەهێشتەوە بۆ درێژەدان بە شەڕی پارتیزانی؛ ئێمەش دەڵێین:

هێزێک بەوشێوەیە شپرزە کرابێ، نەتوانێ مەفرەزەی پارتیزانیش لەناوچەکاندا جێبهێڵێ، ئەم دۆخە نزیکە لە هەرەسی عەسکەری. هێزێکیش لە دۆخی هەرەسی عەسکەرییدا بێ، بە کردنەوەی شەڕی بەرەیی، لەلایەن یەکێتییەوە، لە ناوچەیەکی بەرتەسکی دیاریکراودا، هەڵناسێتەوە. تاقە سودی شەڕەکە ئەوەبوو، سەرکردەو ئێزگەی دیموکرات، بەسەلامەتی رزگاریان بوو!!

د- یەکێتی بەم کارە نەیتوانی حدکا هەڵسێنێتەوە، بەڵام ئێرانی لەخۆی وروژاندو، ئەو ئاشتیە لەرزۆکەی لەنێوان پارتی‌و یەکێتیدا بو، سەرلەنوی تێکچوەوە. ئێمەش دەڵێین:

کەوابێ.. کە مام جەلال‌و نەوشیروان‌و ملازم عومەر، بڕیاری ناردنی هێزی پشتیوانییان داوە، زانیارییان لەسەر دۆخی راستەقینەی شەڕگەکانی دیموکرات زۆر کەم بووە، بۆیە

---

١ نەوشیروان مستەفا ئەمین. پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن- دیوی ناوەوەی رووداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٧٩-١٩٨٣. چاپی دووەم ١٩٩٨-سلێمانی. ل(٢٦٧).

لەوباوەڕەدا بوون، دیموکراتیان پێ هەڵدەستێتەوە. بەڵام نەک ئەمەیان پێ نەهاتوتەدی، بەڵکو لەپاڵیا، لەگەڵ پارتیش تێکچون. بەرەیەکی گەورەشیان دژی یەکێتی بە پشتیوانیی ئێران پێکهێنا.

ه- یەکێتی کەوتە ناو مەترسیەکی گەورەترەوە، لەو مەترسیەی هەڕەشەی لە حدکا ئەکرد. مەترسی لە سێ مەیدانی جیاوازدا: عێراق کە شەڕی لەگەڵ رانەگیرابوو. ئێران کە لەبەر خاتری حدکا شەڕی لەگەڵ دەستپێکرابوو. جود بە سەرکردایەتی پارتی کە لەژێر گوشاری ئێراندا خەریکی خۆسازدان بوو بۆ پەلاماردانی یەکێتی. ئێمەش دەڵێین:

کورد دەڵێ: بۆ ریش چوو، سمێڵیشی نایە بانی. چارەنوسی یەکێتی لەبەر بڕیارێکی (عاطفي) خراوەتە ناو سێگۆشەی بەرمۆدەی دوو دەوڵەتو سێ لایەنی کوردستانی: عێراق، ئێران، پارتی، سۆسیالیستو پاسۆکو حشع..جود.

ئەو رۆژەی بیستم بڕیاری ناردنی هێزەکە بۆ ئەو شەڕە دراوە. نامەیەکم بۆ مەکتەبی سیاسی نوسیو تیایدا نوسیم: "بڕیارێکی وا پێویستی بە کۆبونەوەیەکی سەرکردایەتی بەپەلەیە. ئێمە نەک دیموکراتمان پێ هەڵناسێتەوە. بەڵکو خۆشمان ئەشکێین. شەڕەکە ناچارمان دەکات بەلاوازیی مفاوەزات لەگەڵ بەعسدا بکەین. تکایە با کۆبونەوەی سەرکردایەتی بکەین".(*)

سەرەڕای ئەو هەڵوێستە جیاوازەم، نامەشم بۆ نەوشیروان نوسی: "شەڕەکەم پێ خراپەو زەرەری گەورەی لێدەکەین. بەڵام مانو نەمانی منیش لەگەڵ پێشمەرگەیە. دەمەوێ بڕۆمە شەڕەکەوە". نەوشیروانیش نامەیەکی بۆ مام جەلال نوسی، ناوەڕۆکەکەی ئەمەیە:

"مەلا بەختیار، خۆت دەزانی رەخنەی لە بڕیاری شەڕکردنمان لەگەڵ ئێران هەیە. بەڵام داوایشی کردووە بێتە شەڕەکە. وا دێتە لاتان". هەر ئەوکاتەش پرۆژەی مەڵبەندەکانو تیپەکانی نوسی.. مام پەسەندی کرد.

ئەو بەیانیە کە کەوتمەڕێ، ئاواتی شێخ جەناب لەماڵمان بوو. خواحافیزیم لەخۆیو روناکی هاوسەرم کرد. کە گەیشتمە دێی "ساوان"(+) دێیەک بوو، پار بارەگای پاسۆکی

* نامەکەم تەنها پیشانی سالار عەزیز دا. مام جەلال نامەکەی ناردبوو بۆ نەوشیروان. ئیتر کردیانە پروپاگەندە لەسەرم کە دژی هاوخەباتیی بەشەکانی کوردستانمو دڵی پێشمەرگە سارد دەکەمەوە. نەوشیروان لە هەموو مەجلیسێکدا، ئەو قسانەی دەکرد. نامەکەشمی پیشاندەدان.

+ ساوان: ئەو لقە دارەیە کە کابان وەکو تەنافی ناو ژوور، لەنێوان دوو کوڵەگەی ژوردا هەڵیدەواسێ، بۆ جلوبەرگو شتی ناوماڵ هەڵواسین.

لێبوو. بارەگایەکی بچوک، تەنگەبەر، دوو ژوری لێبوو. هەر ژورێکی بە هەزار حاڵ جێگەی (٤) کەس دەبوەوە. حەمەی حەمە باقیش لەوێ بوو. ئەمیش وەکو فەرماندە قسەی دەکرد!

مام، ورەی بەرز بوو. تیپ تیپ دەهاتن و بۆ لای ملازم عومەر، کە فەرماندەی تەواوی هێزەکان بوو، دەنێردران بۆ شەڕگەکە. ڕۆژانەش، شەهیدو بریندار بەلای ئێمەدا دەهێنرانەوە. دۆخێکی ئاوێتە لە کۆمەڵێک هەستو هەڵوێست بوو:

- لەلایەکەوە سەربەرزییەکی گەورە بوو. بەڵام بە بڕیاری (عاطفي).

- لە هەمان کاتدا، مەترسییەکی گەورەتر لەسەر یەکێتی، دەرکەوتبوو!!

- خەمی شەهیدو برینداریش، دڵتەنگی دەکردین.

- پێشمەرگە، کە بەشێکیان دەگەڕانەوە، شەکەتیو شکان بە روخساریانەوە هاواری دەکرد.

- دیموکرات، بڕیاری پاشەکشەی سەرانسەرییان دابوو. دەتگوت سەردەمی کۆماری کوردستان، بە کوشتن و ماڵوێرانیەکی زیاتر، دوبارە دەبێتەوە!

شکانی پیشمەرگە، ناخۆشترین دۆخی شۆڕشە. پێشمەرگە، پێش ئەوەی بشکێ، ورەبەرز. دەم بە پێکەنین. دەربەستی بڕیارەکانی سەرووی خۆیانن. بەڵێنی جوان جوان بۆ جێبەجێکردنی نەخشەی شەڕ دەدەن. بەڵام کاتێک تەرازووی هێز لەبەرژەوەندی دوژمن، لە مەیدانی شەڕدا دەشکێتەوە. هەمان هێزی پێشمەرگە، سەراپا دەگۆڕدرێ. وەڕس دەبن. گوێ نادەنە بڕیار. لەبەرخۆیانەوە ناڕەزایی دەردەبڕن. بەڵکو جنێویش دەدەن. هیچ فەرماندەیەک خۆی ناکاتە خاوەنی شکستەکە. لەکاتی سەرکەوتنیشدا، پێشمەرگە ورەی بەرز. روو لە پێکەنین. شانازی بەخۆکردن. کەمێکیش خۆهەڵکێشان!

(٧)

## کشانەوەی قاسملو و، هەڕەشەی شاهۆ!

شەڕ، لە سەرکەوتن و شکستدا، ڕێکەوتی سەیری تیایە. ڕێکەوتەکان، پێشتر مەگەر لەخەودا بینرابن، دەنا باوەڕنەکردە نیە!

زۆرجار لە مێژوودا، سەرداروسەرکردە گەورەکان، بە دیل گیراوون. یان بە برینداریی لەشەڕدا جێماوون. میری بەدرخان، دوای شەڕی قارەمانانە، خۆی تەسلیم کردۆتە عوسمانیەکان و نەفییان کردووە بۆ یۆنان. عوبێدوڵڵای نەهری، ئەو سەرکردە هەڵکەوتووە، دوو جار خۆی ڕادەستی عوسمانیەکان کردووە. شێخ سەعیدی پیران و هاوڕێکانی، هەر لە شەڕدا گیراوون. شێخ مەحمود، بە برینداریی لەپاڵ بەردەقارەماندا، لە بازیان گیرا. قازی محەمەد، گەلەکەی جێنەهێشت و خۆی ڕادەستی فەرماندەی عەسکەری داگیرکەری پایتەختی کۆمارەکەی کرد و لەسێدارەیان دا. کاسترۆ، لە خەوداو لە شۆڕشدا، دەگیرێ. چیگوارا، بە برینداریی لە بۆلیڤیا دەگیرێ. میرزا کوچخانی سەرداری شۆڕشی جەنگەڵستانی باکوری ئێران، دەشکێ و بەتەنها دەمێنێتەوەو لەناو بەفردا ڕەقهەڵدێ. چان کای چیک، سەرۆکی کۆمینتانگ، پارتیزانەکانی چین دەیگرن. مۆسۆلۆنی، بە جلی سەربازیی ئەڵمانی، پارتیزانەکان دەیگرن و لەسێدارەی دەدەن..تاد.

عەسرێکیان، لەگەڵ مام جەلال لە دێی "ساوان" وەستابوین. پێشمەرگە بە دووربین، سێ کەسیان بینی، جیهازی کۆڵەپشتیان پێبوو. منیش سەیرم کردن، وابوو. مام وتی: مەفرەزەیەک ببەو بزانە کێن. ترساین بەرایی هێزێکی پاسدار بن و بۆ چاودێریی هاتبن. یان دزەیان کردبێ و دەستڕێژ بکەن. بەپەلەو بە پەرێز ڕۆشتم. نزیک کەوتمەوە، دەبینم، د. قاسملوە لەگەڵ دوو پێشمەرگە. سەیر بوو لام! ڕێزێکی زۆرم گرت. پێشمەرگەیەکم بەپەلە ناردە لای مام، پێی ڕابگەیەنێ، د. قاسملوە. مام، بەپیریەوە هات. لەئامێزی هاوڕێیەتی گرت و بێڕادە، میهرەبانیی لەگەڵ نواند. د.قاسملو، جلی خاکی پێشمەرگانەی لەبەردا بوو. جامانەی بەستبوو. خەم و خۆڕاگریی لە ڕوخساریا، بەدی دەکرا. سەیرە! ئەفسەری گەورەی حکومەتەکان کە دەشکێن، نابوت دەبن. بەڵام سەرکردەی سیاسی کە لەشەڕدا دەشکێ، خۆشەویست دەبێ.

لەکاتی تەنگانەدا، رابەری وەکو مام جەلال کەم هەیە. گەورەترین خەمو پەژارە، بە نوکتەو ورەبەرزی دەرەوێنێتەوە. یەکسەر ناردی مەرێکیان کڕیو، شەو هەردوو رابەر، لە ژورە بچوکو تەنگەبەرەکەی "پاسوک"دا، کە مام کردبوویە ژوری ستادی عەمەلیات، بەدیار چرایەکەوە، دانیشتنو منیش لەخزمەتیاندا بوم. حەمەی حەمە باقیش لەوێ بوو. نەدەرۆشت!!

گفتوگۆیەکی زۆر کرا. مام بۆ دکتۆری باسدەکرد، ئەمە خەباتو شۆڕشە. شکستو سەرکەوتنە. باسی ئەزمونی خۆی بۆ دەکرد، کە بەشی زۆری ژیانی پێشمەرگایەتی، لە شەستەکانەوە، بە شکستو کارەسات بردۆتەسەر. شیعری مامۆستا برایمی بۆ خوێندەوە:

**دواتیری کەوان**[1]

**دوا تیری کەوانی خۆت بهاوێژە، هەلە دوژمن**
**دوا سەرکەوتنی تۆیە و دوا نوچی گەلە، دوژمن**
**شەوی ترساندنت، سامی نەماوە، تاریک و ڕوونە**
**بە ئاسۆی ئەرخەوانیدا، هەتاو لەودیو کەلە، دوژمن**

**چ گەوجی هەژبەسەر، کەی خۆر بە هێلەک پێشی گیراوە**
**وە یاخۆ، چەرخی مێژوو کەی، بە بەردی ئێوە وەستاوە!**
**هەموو پێشکەوتنێکی تۆ، بەرەو چاڵی نەمان ئەتبا**
**هەموو سەرکەوتنێکیشت، بە وێنەی بڵقی سەر ئاوە**

د. قاسملوو.. ئارام قسەی دەکرد. لۆژیکی لەدەست نەدابوو. بەڵام ناخیشی لێوانلێو بوو لە نەهامەتیی شکست. بیرمە وتی:

- نەماندەویست بیگەیەنینە شەڕ لەگەڵ رژێم، بەڵام ملهوڕیی کاربەدەستان، سیاسەتی توندڕەوییان لەکوردستاندا، بەهێزکرد.

- ناچاردەبین درێژە بە شەڕی دیفاع بدەین. ئەمەش بەبێ هاوکاریی عەسکەریی عێراق ناکرێ.. ناچاریان کردین، ئەم هاوکارییە وەربگرین..

---

١ شیعری (دوا تیری کەوان)ی مامۆستا برایم ئەحمەد. زیندانی ئەبو غریب- ١٩٤٩.

- له هەموویشی ناخۆشتر، دیموکرات زۆرمان خزمەت بە پارتیو ئیدریسو مەسعود کرد.. دیموکرات نەبوایە.. لەکاتی قیامدا، خەڵک چاوی دەردەهێنان.. کەچی چاکەیان ئاوها داینەوە.

مام جەلالیش هەر دڵی خۆش دەکرد. من.. تەنها پرسیارێکم لە دکتۆر کردو پرسیم: دکتۆر، یەکێتی هەموو هێزی خۆی بۆ پشتیوانیتان هێناوە. ئەگەر یەکێتی لێی بقەومێو هێرش بۆ سەرکردایەتیمان بکرێ، داوای هاوکاریی عەسکەرییتان لێ بکەین، هاوکاریمان دەکەن؟

لەوەلامدا، بێ پێچو پەنا، بەراشکاویەکەی خۆی، فەرمووی: نەخێر شتی وا قەت ناکەین.

گوتم: ئەوە نییە، ئێمە کردومانە.

گوتی: ئاخر ئێوە یەکێتینو ئێمەش دیموکراتین. جیاوازین.

مام فەرموی: راست دەکات مەلا بەختیار.. دیموکرات وەکو یەکێتی، هاوخەباتیی هێزە کوردستانیەکانی نەکردۆتە ستراتیژێکی خۆی..

ئەم قسەیەی مام، پەیوەندی بە دیالۆگی سەرەتاکانی دامەزراندنی یەکێتیو دیموکراتەوە، لەدەرەوە هەبوو. کە دیموکرات بەرنامەی هاوبەشی هێزە کوردستانیەکانیان رەتکردبوەوە.

هەر لەوکاتەدا، رۆژێکیان دەبینم، کەسێکی بێ چەک، ئارامو کز کز، دێتەلامان. نزیک کەوتەوە، ناسیمەوە (سەروان شاهۆ)یە. بەپیریەوە چومو ئەمیشم لەئامێز گرت. پێکەنیم. وتی: دەزانم بۆ پێدەکەنیت. دەستی بەرزکردەوەو گوتی: هەمووقسەکانت راست دەرچوون. ئێستا دانی پیا دەنێم. سەرگوزشتەی قسەکانیشم ئەمەی خوارەوەیە:

دوای روخانی شا، هاوینی ۱۹۷۹، بۆ سەرپەرشتی ناوچەی هەورامانو هەڵەبجە، گەیشتمە شوشمێو نەوسودو سەر روباری سیروان. هەمووی ساڵێک بەسەر کارەساتی هەکاری تێپەڕیبوو. لەخوار (شوشمێ-نەوسوود)وە، چەمی سیروانو ئەشکەوتی هەزار پەزە.. کە ساڵی ۱۹۷۸ پێشمەرگەکانم کۆکردەوەو باسی کارەساتی هەکاریم بۆ کردن. ئێستا ئێران روخاوەو رۆژهەڵاتی کوردستان خرۆشاوە. ئێمەش، کە جاران دەبوایە بۆسە بۆ پارتی دابنێین لە دزلیەوە پەلامارمان نەدەن. ئێستا، خۆمان، لە رۆژهەڵاتی ئازاددا، دوای پارتی دەکەوین. چەرخی سیاسەت، هەندێک جار، ئاوها وەردەگەڕێ! لە

نەوسوود بوین، بیستمان (عەبدولوەهاب ئەتروشی) لە پاوەیەو بەتەمایە هێز بۆ پارتی دروست بکات. ناوبراو، لەناوچەی هەڵەبجەو هەوراماندا، ئامر هێز بووەو خەڵکەکە لێی نارەزا بون. ئێمەش بەپەلە چوینە ناو پاوە. پێش ئێمە بە دوو-سێ سەعات، عەبدولوەهاب خۆی تەسلیم بە عێراق کردبوو. هیلاک بوین لە چێشتخانەیەک لاماندا، نانێک بخۆینو برۆین. پاوەش، یەکەمین جارم بوو ببینم. ئەوکاتە، بێخزمەت بوو، بەڵام بەهەشتێک بوو، لەناو باخی دار گوێزو درەختی جۆراوجۆر. هەر لە ناوەندی شارەکە، ئاوی کانیاوەکان، شەقامەکانیان تەڕ دەکرد. زۆربەی شوێنی هەتاوی بەرنەدەکەوت. ئەتگوت سەیرانگایە. خواخوامان بوو، تا ئێوارە دایکوتینو ئەو هەوا سازگارە هەڵمژین. بەڵکو حەمامێکیش بکەینو بگەڕێینەوە. (١٠٠) پێشمەرگەیەک دەبوین. خەڵک لێمان کۆدەبونەوەو ڕێزێکی زۆرو موحیبەتێکی زۆرتریان لێدەباری. لەپڕ: مەفرەزەیەک پێشمەرگەی دیموکرات پەیدا بونو هاتنەلام.

- فەرموو.. سەروان شاهۆ لە ژاندرمری داوات دەکات.
- وتم: سەروان شاهۆ کێیە؟
- وتیان: فەرماندارى شارەکەیە.
- وتم: نانێک دەخۆینو دێین.
- وتیان: نەخێر.. وەرن.. دوایی نان بخۆن.
- وتم: برسیمانە.. و پشوویەک دەدەین.
- وتیان: وەرن زۆرتان پێناچێ!

پێشمەرگەکان زانییان خەریکە تورە دەبم. مەفرەزەکەیان دوورخستەوەو تێیانگەیاندن، کە کێم! کە زانییان کێم.. بێدەنگ رۆیشتن. دوای نانخواردن.. چوینە خزمەتی فەرماندار. سەروان شاهۆ هەستا لەبەرمان، بەڵام چای بۆ داوا نەکردینو گوتی:

- بۆچی هاتونەتە ناو شار..؟ قەدەغەیە بەچەکەوە.
- گوتمان: ئیشمان هەبوو، پشوویەک ئەدەینو ئەڕۆین.
- گوتی: بەبێ بەرگە نابێ بەوشێوەیە بێن.
- گوتمان: تازە هاتوین.
- گوتی: هاتون عەبدولوەهاب ئەتروشی بکوژن.. دیموکرات رێی تاوانی وا نادات.

- گوتمان: تازە ئەو رۆیشتووە.. ئەگینا نەهاتوین پرس بە تۆ بکەین.. بیگرین.. بیکوژین..
- گوتی: تکایە زوو برۆن‌و شار جێبهێڵن.
- گوتمان: پەلەی چیتە.. دەڕۆین.
- گوتی: با تەلەفۆن نەکەم.. ئەلیکۆپتەرتان بۆ بێت. (کەمێک تورە بووم).
- گوتمان: لە دەشتی شارەزوور لە هەلیکۆپتەر ناترسین.. چ جای بۆ ئێرە..
- گوتی: ئێوە تا کەی شەڕی براکوژی دەکەن؟
- گوتمان: شەڕمان نەکردووە.. شەڕمان پێدەفرۆشرێ.. بەرگری دەکەین.
- گوتی: کوردی عێراق هەر فێری شەڕی براکوژین.
- گوتمان: دڵنیابە قیادەی موەقەتە شەڕی ئێوەش دەکات.
- گوتی: لەگەڵ دیموکرات پێیان ناکری شەڕ بکەن، بە یەک رۆژ تەواویان دەکەین.
- گوتمان: دەتانبینینەوە.. پەشیمان دەبنەوە!

کەمە کەمە.. قسەمان ئارام بوو. خواحافیزیەکەی، وەکو پێشوازییەکەی، سارد نەبوو! هەتا ئێوارەش لە پاوەی رەنگیندا ماینەوە.

دوای سێ ساڵ لەو روداوە.. ئیتر کە بەوشێوەیە بینیمەوە، بێ چەک، تێکشکاو، دڵشکاو، پەیتا پەیتا دەیووت: بەڕاستیی، هەر ئێوە پارتیتان دەناسی. منیش ئەوپەڕی رێزم گرت‌و بردمە لای مام جەلال. راپۆرتێکی زارەکیی باسکردو گوتی: لە هەموو قوڵەکان پێشمەرگە خۆی ناگرێ. بەبێ پرس‌و بڕیار، هەڵدێن. لەوساوە، سەروان شاهۆ، دۆستمە. کە لە پاریس دەیبینم، ئەو سەرگوزشتەیە، دەگێڕینەوە!

## (٨)
## مام و پشتیوان‌و ئاڵای شۆڕش

دۆخی ئێران بەگشتی‌و رۆژهەڵاتی کوردستان بەتایبەتی، مام جەلالی خستبووە نێوان دوڕیانێکی سیاسی، هەردوکی چارەنوسی یەکێتییان پێوە بەسترابوو.

رێیەکیان: ئێرانی دوای شا و کردنەوەی دەروازەیەکی ئیقلیمی گەورە بۆ یەکێتی‌و شۆڕشی نوێ.

ڕێیەکەی تریش: بیروباوەڕی یەکێتی بوو، کە لە دامەزراندنیەوە، پێگەیەکی لەسەر هاوخەباتیی بەشەکانی کوردستان، ڕاگیرابوو.

دەروازەی ئێران؛ ئەگەری دەروازەی سیاسی، دیپلۆماسی، هێنانی هاوکاریو هاتوچۆ بوو.

ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش؛ پەیوەندی بە بیروباوەڕو هەڵوێستی نەتەوایەتیەوە بوو.

مامو یەکێتی، نەیدەتوانی دەستبەرداری هیچیان ببن. بەڵام، دۆخی سیاسی هەندێک جار، دوڕیانەکەی تەنگەبەر دەکرد، دەبوایە یەکێتی ناچار بێ یەکێکیان هەڵبژێرێ. سروشتی مام جەلالیش، لە ستراتیژو تاکتیکدا وا بوو، کاتێک دەستی بە گوریسی بڕیارێکەوە دەگرت، دەزوەکانی تری لەگەڵ نەیارو دژەکان، نەدەپساند. هەرگیز تاکتیکی فەرامۆش نەدەکرد. گەرچی سوریش دەیزانی، ستراتیژ گرنگترە. کە بڕیاری ستراتیژیی دەدا، ماوەیەک، بە گوڕو گەرمیی، تەواوی توانای خۆیو یەکێتی بۆ تەرخان دەکرد. کە بیشیزانیایە، گرتنەبەری تاکتیکیش پێویستە، بێ سێو دوو بڕیاری دەداو گوێی نەدەدایە ئەو ڕەخنانەی لەسەر ستراتیژ دەگیرێ! بۆیە، چەند دۆستەکان ڕێزیان دەگرت، لە هەمانکاتدا، دوژمنەکانیشی نەیاندەتوانی بەتەواوەتی فەرامۆشی بکەن. هەمیشە دەیزانی، پاشەکەوتی تاکتیک بۆ گۆڕینی بڕیار، بپارێزێ.

لە شەستەکانەوە، لە زەمانی شاوە مام جەلاڵ، دەوڵەتی ئێران، سیاسەتو سیستەمی ئێران، لایەنە سیاسیەکانو کولتوری ئێران شارەزا بوو. ئەوکاتەش، لەکاتێکدا مام دیموکراتو دژ بە کۆلۆنیالیزم بوو، بەڵام کە قاسم بەڵێنەکانی جێبەجێ نەدەکردو ئەگەری بەرپابوونی خەباتی چەکداری لەئارادا بوو، ئیتر لەدوای (١٩٥٩)وە بایەخی ئێرانی زانیووە، کە شۆڕش بەرپا دەکرێ!

کەم کەس هەیە لەناو کورددا، زانیبێتی، لەساڵی (١٩٥٩)وە، پارتی لەگەڵ ئێراندا، بە نهێنی پەیوەندییان هەبووە. مێژوو جارێ ئەم لاپەڕە ژێربەژێرەی هەڵنەداوەتەوە. پەیوەندییەکەش عومەر دەبابە، یەکەمین جار لە کەرکوک ڕێکیخستووە.

"سەرئەنجام لە شاری کەرکوک چاوم بە عومەر دەبابە کەوت، لەپاشان ئەو بەرەو بەغداو منیش بەرەو تاران کەوتینەڕێ کە زۆر زوو لەوێشەوە بڕۆمەوە بەغدا، پاش تەسلیمی ڕاپۆرتی هەوەڵین هەنگاو کە بوو بە مایەی خۆشحاڵی پاکروانو سەرهەنگ

پاشایی، مەسەلەکە لەگەڵ (شا)ش باسکرا. پاشان گەڕامەوە بۆ بەغداو چاوەڕوان بووم تا رابیت یا بەرپرسی حیزبی لە بەغدا چ وەڵامێکم بۆ دێنێ".[1]

ئەمە یەکەمین دیدارە. ساڵی ١٩٥٩ دوو ساڵ پێش شۆڕشی ئەیلول. ئەم دیدارانە بەردەوام دەبێو دەڵێ:

"لە چاوپێکەوتنی دووایی راگەیەنرا کە دوو کەس بەناوی عومەر دەبابەو عەلی عەسکەری کە لە ئەندامانی کۆمیتەی سیاسیو لە کەسانی ناسراو و ئازاو بەجەرگی حیزبی بوون ناودێر کراون".[2]

بەم قسانە، پارتی بەرەسمی بڕیاری داوە، پەیوەندی لەتەک ئێراندا ببەستێ. ئەمیش بەرنامەیەک بووە بۆ خۆئامادەکردنی شۆڕش!

لەدوای ئەم دیدارانەوە، خۆسازدان بۆ شۆڕش، پشتئەستوور بووە بە ئێرانی شا! ئەمەش لەم پەرەگرافەدا، بەجوانیی دەردەکەوێ:

"لەو سەفەرە بۆ باکوری عێراق نەمتوانی چاوم بە مەلامستەفا بکەوێ، بەڵام لەگەڵ بەرپرسانی حیزبی قەرارم دا کە بەرە بەرە لە دەوڵەتی عێراق ویستی خۆیان بخوازنو بە هەڕەشەو گوڕەشە دەست بدەنە چەک. لەم سەفەرەدا بوو کە بۆ دووەمین جار چاوم بە برایم ئەحمەد سکرتێری گشتی حیزبو جەلال تاڵەبانیو بەرپرسانی دیکەی کۆمیتەی سیاسی کەوتو لەگەڵ ئەو کەسانەی کە پێشتر ناسیاویم نەبوو، ناسیاو بوومو زۆرمان پێکەوە قسە کرد. دووپاتم لەسەر ئەوە کرد کە ئەگەر لە قۆناخی هەوەڵی راپەڕیندا بتوانن راستیو دروستی خۆیان نیشان بدەن هیوایان بە وەرگرتنی چەکو تەقەمەنیو یارمەتی دیکە هەبێ. دەنا دەوڵەتی ئێران کارێکتان بۆ ناکات، لەسەر ئەو باوەڕەم ئەو بەڵێنانەی نوێنەرانی ئێوە بە منو پاشان لە تاران بە بەرپرسانی ساواکیان داوە رێزی لێ بگیرێو بۆ ئەنجامدانی تێبکۆشرێ".[3]

پرۆسەکە بەمشێوەیە بووە. سەرەتا یەکتر بینین. دوای ئەوە سەردانی تاران (عەلی عەسکەریو عومەر دەبابە) ئینجا ئامادەسازی بۆ شۆڕشو هێنانی هاوکاری عەسکەری!

---

١ عیسا پژمان. نهێنییەکانی بەستنی پەیمانی ١٩٧٥ـی ئەلجەزایر (لە ئارشیفی تەواو نهێنی ساواک). وەرگێڕانی: ناسر ئیبراهیمی. بنکەی چاپەمەنی رۆژ-سوید١٩٩٧. ل(٦٢).

٢ سەرچاوەی پێشوو. سوید١٩٩٧. ل(٦٤).

٣ سەرچاوەی پێشوو. سوید١٩٩٧. ل(٦٥-٦٦).

ئەو بڕیارانە، بەرە بەرە جێبەجێ کراوون. هەموشی بەئاگاداری شای ئێران. گەیشتۆتە ئەوەی کە:

"لە روانگەی کۆنترۆڵو کۆکردنەوەی ئاگاداریو راگەیاندنی نیازی پێشمەرگەکانو بیروڕای بەرپرسانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق، پێویست بوو کە کەسایەتیەکی سەربازی بەرپرسی ئەو کارانە بەئەستووە بگرێ، ئەوە بوو لەنێو ئەفسەرانی ساواکدا سەهەنگ ئیرج منصور کە خۆی کوردو لەپاشان دەرەجەی سەرتیپی وەرگرت، بووە بەرپرسی ئەوکارە، کە چەند ساڵ لەمەوبەر مرد. بەگوێرەی قەرارومەدار بڕیاردرا یەک دەستگای بێسیمی قەوی بۆ پێوەندی کردنی سەرانی پارتی لەگەڵ تاران لە بنکەی ئەوان دابمەزرێ، ئەم دەزگا بێ سیمە لەگەڵ بەرپرسو یاریدەدەرێو لەگەڵ کەلوپەلی پێویست ئامادە کراو بەرێکرا بۆ ناوچە. کاروانی بەڵێن درا و زۆر بەنهێنی لەگەڵ مندا بە نێو کوردستانی ئێراندا لەرێگای سەردەشتەوە بەرەو بنکەی حیزب بەڕێ کرا".[1]

کەوابێ.. لەسەر ئاستی (شا-ساواک-ئەرتەش) بەئاگاداریو بڕیاری بارزانی، پەیوەندیەکە، لە سیاسیەوە، بۆ یارمەتی عەسکەریو پەیوەندی لاسلکی، براوەتەپێش.

دیداری لەگەڵ بارزانیدا، ئاوا دەگێڕێتەوە:

"ئیتر پێویست بوو چاوم بە مەلامستەفا بکەوێو هەرچی زوتر خۆم بگەیەنمەوە بەغدا تا پیاوەکانی ئەمنی عێراق هەست بە شتێ نەکەن. جا ئەوە بوو لەگەڵ عومەر دەبابە فەرماندەی تازەی یەکێ لە هێزە پێشمەرگەکانو چەند کەسی دیکە لە پێشمەرگەکان چوینە بەرزاییەکی شیرین جێگای دانشتنی مەلا مستەفا. تەواوی ئەو قسەوباسانەی لەنێوان منو هاورێکانی ئەو و بیروڕا و ویستی دەوڵەتی ئێرانم بۆ گێڕایەوەو داوام لێکرد کە لە بارودۆخێکی ئاوادا نەک هەر دەبێ پیاوانە کار بکا، بەڵکو دەبێ نیەت باشی خۆیو راستی هاوکارانی بە دەوڵەتی ئێران نیشان بدا و ئەوان لەو کارە پەشیمان نەکاتەوە. بە زاراوی خۆی قەولی مەردانەی دا. هەندێ دراو کە لەگەڵ خۆم بردبووم پێم دا".[2]

لە درێژەی هەوڵەکانی، گەیاندویەتیە تەوقیعی بارزانی، لەسەر پەڕەیەکی قورئان.. بەم چەشنە:

"لەو سەفەرەدا بۆ دڵنیایی خۆم بە بیانووی شای ئێران، لە مەلامستەفام ویست بۆ دڵنیایی شاو بەرپرسانی سەرەوەی ئێران پشتی قورئانم بۆ مۆر بکاو سوێندی وەفاداریم سەبارەت

---

١ سەرچاوەی پێشوو. ل(٦٧-٦٨).

٢ سەرچاوەی پێشوو. سوید١٩٩٧. ل(٦٨).

به شاو دەوڵەتی ئێران بۆ بخوا. مەلا مستەفا وتی: من مەردم، بەڵێنی کە داومە سەد قات پتر لە بەڵگەو سەنەد جێگای دڵنیایە، هەرچەند ئەگەر پێت وایە باشە ئەوەش دەکەم، منیش بێ یەکو دوو قورئانێکم پێ بوو لە کیفەکەم دەرم هێناو شتێکم لەم بوارەدا نووسی کە باسم کردو پێمدا تا ئیمزای بکا. لە گەڕانەوەم بۆ تاران دام بە پاکرەوان تا بیدا بە شا".[1]

ئەم قسانە، بۆیە جێگەی باوەڕن. ساڵی ١٩٧٨، لە خڕی ناوزەنگ بوین. مام جەلال دەیویست، د.مەحمود عوسمان بهێنێتە ناو یەکێتی، نەکا بچێتە پاڵ سۆسیالیست. د.مەحمودیش پیاوێکی زۆر وریا، ئازا لە دەربڕینی بیروڕا. پێی داگرت، کە مام جەلال بەیاننامەیەک لەسەر دوو کێشەی مێژوویی دەربکات، کێشەی جەلالی‌و مەلایی-کێشەی یەکەمین جار پەیوەندیکردن بەئێرانەوە. ئەوسا بڕیاری کۆتایی بۆ هاتنە ناو یەکێتی دەدات. مام جەلالیش بەیاننامەی نوسی‌و بڵاوکردەوە. تیایدا، دانی بە دوو ڕاستیدا نا:

یەکەم: جەلالی.. جیابونەوەیەکی هەڵە بوو.

دووەم: باڵی مەکتەبی سیاسی (برایم ئەحمەد، مام جەلال، عومەر دەبابە، عەلی عەسکەری‌و زەبیحی) یەکەمین جار لەگەڵ ساواکی شادا، پەیوەندییان بەست!

نەوشیروان مستەفا، بەمشێوەیە باسی ئەو بەیاننامەیە دەکات:

"هەرچەندە لەو لێقەومانەدا وەختی "تقییم"و هەڵسەنگاندنی رابوردو نەبو، بەڵام ئەوەندەی دوبارە کردەوە وتمان باشە مادەم خۆت خاوەنی بیرەکەی خۆت بینوسە. پێ‌ئەچو پێشتر بیرە بنەڕەتییەکانی لەمێشکی خۆیدا ئامادەکردبێ، لەماوەیەکی کورتدا نامیلکەیەکی ئامادە کرد، لەژێر ناوی: "تاقیکردنەوەی رابوردو و خەباتی ئەمڕۆی گەلەکەمان"دا. باسە سەرەکییەکانی بریتیبوون لە:

پێشەکییەک لەژێر ناونیشانی: با سود لە تاقیکردنەوەکانی رابوردومان وەربگرین بۆ یەکخستنی ریزەکانی گەلەکەمان‌و بەهێزکردن‌و سەرخستنی خەباتی ئەمڕۆ و ئایندەی.

باسەکانی بەگوێرەی ماوەکانی دابەش کرد بۆ چەند قۆناغێ: ماوەی ١٩٥٨-١٩٦١. ماوەی ١٩٦١-کۆتایی ساڵی ١٩٦٤: کەرتبونی پارتی‌و شۆڕش. ماوەی ١٩٦٥-١٩٧٠. ماوەی پاش دەرچونی بەیانی ١١ی ئازاری ١٩٧٠-١٩٧٥وە تێکچونی شۆڕش. ماوەی پاش تێکچونی شۆڕشی ئەیلول".[2]

---

١ سەرچاوەی پێشوو. سوید١٩٩٧.. ل(٧٠).

٢ نەوشیروان مستەفا ئەمین. لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ. دیوی ناوەوەی روداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٧٥-١٩٧٨. چاپی دووەم. سلێمانی-١٩٩٧. ل(٣٣٩).

ئەم بەیاننامەیە بڵاوکرایەوە. گەیەندرایە هەرێمەکانو لقەکان. بەڵام د.مەحمود، کارەکەی بە مام جەلال کردو دوایی بەقسەشی نەکرد، هەر چووە پاڵ سۆسیالیست.(*)

وەکو تر، مام جەلال توانایەکی سەرسورهێنەری هەبوو، لە قەناعەتپێکردنی موخابەراتی وڵاتان. لەگەڵ موخابەراتی: عێراق، ئێران، تورکیا، سوریا، ئەمریکا، بەریتانیاو فەرەنسا دیومە. بەشێوەیەک کاری تێدەکردن، دەبونە هاوڕێی. سودیشی لەم پەیوەندیو هاوڕێیەتیە، زۆر بینیووە!

کە جەلالیەکان بەرامبەر مەلاییەکان، لەڕووی عەسکەرییەوە خۆیان ناگرن، لەخۆڕا خۆیان ناکەنە ئێرانو هێزەکەیان لە هەمەدان کۆناکرێتەوەو خۆیشیان لە تاران، بە رێکەوت نابنە میوانی ساواک!

دوای سەرکەوتنی راپەڕینی گەلانی ئێرانو سەرکەوتنی کۆماری ئیسلامی، ئێران ئێرانێکی تر بوو، لە هەموو بارێکەوە. چ سیستەمو چ ئۆپۆزسیۆن. لە زەمانی شادا، لەکاتێکدا تەنها سازمانێکی بچوکی ئینقلابی حیزبی تودە، پەیوەندی بە مام جەلالەوە دەکەن، دەیانقۆزێتەوە. چ جای بۆ دوای روخاندنی شا، کە هێزی گەورەو بچوکی چەپو شۆڕشگێڕ پەیدا دەبن، بێگومان مام لەگەڵیاندا پەیوەندی بەتین دەکات. لە هەمانکاتدا، نەشیدەزانی کۆمارێکی نوێو سیستەمێکی نوێش دێتە سەر کار، یەکێتیش گەمارۆ درابوو، نەدەکرا پەیوەندییان پێوە نەکات. سەرەتا ئەوەی ئامانجی ستراتیژی مامو یەکێتی بوو، روخانی شا بوو. ئیتر ئەم سیاسەتە، بەرامبەر دوڕیانە چارەنوسسازەکە، بەرپرسیارێتیەکی قورس بوو. کە مام جەلال بە لێوەشاوەیی خۆی، کایەکانی دەجوڵاند:

١- لەلایەکەوە پەیوەندیکردن بە هێزە سیاسیەکانی رۆژهەڵاتو ئێرانەوە.

٢- لە هەمانکاتدا، پیرۆزبایی لە ئیمام خومەینیو هەناردنی وەفد بۆ تارانو داوای پەیوەندی سیاسی.

٣- کۆبونەوە لەگەڵ حیزبە سیاسیەکانو هەوڵی رێکخستنیانو دارشتنی پرۆژەی دانوستاندن.

٤- نامە ناردن بۆ کاربەدەستانی حکومەتو داوای رەزامەندییان بۆ دانوستاندنو مافی کورد.

---

* بەیاننامەکە، دەبرێتە هەرێمی قەراغ. شەهید ئازاد کۆیاندەکاتەوە، باسی بەیانەکە بکات. مام رۆستەم دەڵێ: بەیانەکە چییە؟ دەڵێن لەسەر جەلالیو مەلاییە؟ ئەویش ئەڵێ: نایەم بۆ کۆبونەوەکە. ئەڵێن بۆ؟ ئەڵێ: خۆم مەلایی بوم ئەزانم خراپ بون. شەڕی جەلالیشم کردووە، لەپاڵ حکومەت بون!

مام له دۆستایەتی ئێران نائومێد بوو. دەستیان بەسەر چەکو هاوکاریەکانی یەکێتیدا گرت. ئیتر ماوەیەک بەتەواوەتی بەلای هێزە کوردستانیەکاندا دایشکاند. بەلام دەزووەکەی لەگەڵ ئێراندا هەر بەدەستەوە هێشتبوو. بەردەوامیش هەوڵی دەدا لەگەڵیاندا چاکی بکاتەوە، بە نهێنیی نوێنەری یەکێتی لە تاراندا، دەهێشتەوە. نەوشیروان مستەفا لەمبارەوە راستگۆیانە نوسیویەتی:

"لە ماوەی ٣ ساڵی رابوردودا چەند هەوڵمان دابوو دەممان بگا بە ئیمام خومەینیو سکالای خۆمانی لەلا بکەین. کاربەدەستانی ئێرانی رێگەیان لێئەگرتین. لەوکاتەدا ئێمە هیچ پەیوەندییەکمان لەگەڵ ئێران نەمابو. هیچ هیوایەکیشمان بە یارمەتیو پشتیوانی ئێران بۆ یەکێتی یان بۆ موعارەضەی عێراقی نەبو. بەڵکو گەیشتبوینە ئەو باوەڕەی ئێران لە یارمەتیدانی موعارەضەدا بۆ روخاندنی رژێمی بەعس نەک هەر جیددی نیەو بەس، بەڵکو ئەیەوێ عێراق بە دارو بەرد و، شیعەو سوننەو، کوردو عەرەبو، موعارەضەو رژێمیەوە.. وردوخاش، یا هیچ نەبێ لاواز و زەلیل بکا».[1]

واتا:

- ئیمام خومەینی نەیبینیونو سکالایان نەگەیشتۆتە دەستی.
- پەیوەندی بە ئێرانەوە نەماوە.
- هیواشیان بۆ یارمەتی ئێران بۆ یەکێتیو موعارەزەی عێراقی بڕیووە.
- ئێران.. ئەیەوێ عێراق، بە شیعەو سوننەو کوردیشەوە، عەرەبو موعارەزەو رژێمەوە.. وردوخاش بێ.

ئەم بۆچونە، ئەوکاتە، سیاسەتی یەکێتی لە سیاسەتی ناوبژییەوە، گۆڕی بۆ سیاسەتی دژایەتی. یەکێتیش لەباشوری کوردستاندا تەنها مابوەوە. سەرەڕای بیروڕای جیاواز، هەر ئەم سیاسەتە سەپێنرا. ئەم سیاسەتەش، دوا سەرەنجامەکەی دیار بوو، ئەویش دانوستاندن لەتەک رژێمی فاشی عێراقدا!!!

مام جەلال لەوسەریەوە دەهاتەوە، کە ئەو سیاسەتە لەگەڵ رژێم سەردەکێشی بۆ دانوستان. بەڵکو، لە گەرمەی شەڕکردن لەگەڵ ئێران، لەرێی د.قاسملووە (پێنج سەد هەزار دینار)و (١١٠) تفەنگی مانهوت.. کە تفەنگێکی بێکەڵکی لە دەبۆدا شاردراوەی عێراق بوو، نێردرا بۆ یەکێتی. کەچی مام جەلال لە چاوپێکەوتنێدا ئاوا وەڵامدەداتەوە:

---

١ نەوشیروان مستەفا ئەمین. پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن- دیوی ناوەوەی روداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٧٩-١٩٨٣. چاپی دووەم ١٩٩٨-سلێمانی. ل(٢٦٤).

"لەپاشاندا لێپرسراوانی ئاڵای شۆڕش کە جیابونەوەو بۆئەوەی خۆیان لە ئێران نزیک بخەنەوە، هێرشێکی گەورەیان کردەسەرمان کە گوایە تەنها منو نەوشیروانو مولازم عومەر بە ئارەزوی خۆمان، بڕیاری هاوکاری حیزبی دیموکراتو کوردی ئێرانمانداوە".[1]

بۆئەوەی تەنها مامو نەوشیروانو ملازم عومەر بڕیاریان دابوو، ئەمەیان گومان هەڵناگرێ. ئەوەشیان راستە یەکێتی هەر لەسەرەتاوە ئامانجی بوو هاوکاری بەشەکانی کوردستان بکات. پێشتریش ئاماژەمان بۆ بۆچونی نەوشیروان کردووە، کە ئەو شەڕە، یەکێتی خستە ناو چ سێگۆشەیەکی ئیقلیمیو کوردستانیەوە. سەرەنجامیش، ئەو سیاسەتە یەکێتی خستە دۆخێکی نەخوازراو. دانوستانێکی بێهودە، بەلام..

سەبارەت بەوەی کە: ئاڵای شۆڕش کە جیابونەوەو بۆ ئەوەی خۆیان لە ئێران نزیک بخەنەوە، بەم بیانوەش هێرشی گەورەیان کردە سەرمان..

مام لە بەدبەختیی یەکێتی، جەنابت لە مەزارگایو ئێمەش زیندوو..

ئەوە نەوشیروان بوو، بە پەسەندی جەنابیشت، پەلاماری ئاڵای شۆڕشی داو گەورەترین تاوانی دژی ئازادی بەرامبەرمان ئەنجام دا. ئێمە هاتینو دەمانویست، وەکو رەوتێک لەناو یەکێتیدا، بمێنینەوە. گوتتان باشە. پاشان هەڵتانکوتایە سەرمان.. ئەویش لەناو قووڵایی هێزەکانی یەکێتی، نەک لەسەر سنور.

مام.. روحت شاد!

من، لە گۆڕی ئازادی یەکێتیدا بووم. تا ئەوکاتە، وشەیەکیشم لەگەڵ ئێران باس نەکردبوو. ئامادەش نەبوم، نە خۆمو نە هاوڕێکانمان، بچینە ئێرانو بچینە ناو جود، دژی یەکێتی. یەکێتیش ئەم راستییەی باش دەزانی. بەلام بڕیارتان دابوو، راستگۆیەتی ئێمە، بە پەیمان شکێنی وەلام بدەنەوە. کردیشتان.

مام!

هەڵوێستی منو هاوڕێیانی تر، سەبارەت بەو شەڕە دژی ئێران، شاردراوە نەبووە، هەتا ئێران نەیزانیبێو پێویستی بەوە بوبێ، هاوڕێیانی ئاڵای شۆڕش بۆ کاربەدەستانی ئێرانی باسبکەن. یەکێتی لە ئێزگەدا، لە چەندین وتاردا، بەناوی (مەسەلەی کورد یەک

---

1 مام جەلال. دیداری تەمەن- لە لاوێتیەوە بۆ کۆشکی کۆماری. ئامادەکردنی: سەلاح رەشید. ل(139).

مەسەلەیە یان چەند مەسەلەیەکە) بڵاوتان کردەوەو تیایدا هێرشی فکریو سیاسیو پروپاگەندەی دەرونیتان دەکردە سەرمان. هەتا زەمینەی پەلاماردانی عەسکەریی دژمان خۆشبکەن. ئیتر کەی وایە، گوایە لای ئێران زمانتان لێ درابێ؟[*]

مام!

دەزانم، لە پەرۆشیتەوە، بۆ جیانەبونەوەمان لەکاتی چاوپێکەوتنەکەدا توڕە بووی. دەشزانم، دوای ئەوەش جوامێریی خۆت نواند. بەڵام مام.. باش دەتزانی، کە لەکاتی جیابونەوەدا، ناکۆکیەکان جۆش دەخۆن. لە ڕێڕەوی ئاسایی دەترازێن. خۆ ئەوەی یەکێتیو کۆمەڵە، بە هێرشی ڕاگەیاندن کردی بە ئاڵای شۆڕش، کەمتر نەبوو لە هێرشی عەسکەریی؛ سروشتی جیابونەوە وایە.. پەیوەندیەکان لەگرێژنە دەردەچن.

بیرمانە..

- چیمان بە پارتی- قیادە موەقەتە دەووت؟ نوێترین جنێومان بۆ داتاشین.
- چیمان بە بزوتنەوەی سۆسیالیست نەووت؟ کام ناووناتورە ما، بۆیان هەڵنەبەستری؟
- چیمان بە حیزبی شیوعی نەکردو نەووت..؟

خۆ یەکێتی، لای سوریا، لیبیا، ئێرانو عێراق، لەکاتێکدا لە ناکۆکیو شەڕدا بوین، ستایشی نەیارەکانی نەدەکرد؟

کولتوری شەڕی ناوخۆ، بەهۆی پێشێلکردنی ئازادی بیروڕاوە، کولتورێکی جوامێرانە نەبووەو کۆمەڵێک دیاردەی دزێو دزێو لەناو شۆڕشەکانی ئەیلولو شۆڕشی نوێ، زادەی دوبەرەکیو شەڕی ناوخۆن. هیچ لایەکی چەکدار ناتوانێ، لە داڕشتنی ئەو کولتورەدا خۆی بێبەری بکات. تەنها ئاڵای شۆڕش لەناو کۆمەڵەو زەحمەتکێشان لەناو سۆسیالیست لە قووڵکردنی شەڕی ناوخۆدا، بەشدار نین؛ لە داڕشتنی ئەو کولتورە دزێوە. دەستیشیان نەچووە خوێنی هاوسەنگەرەکانیان.[+]

---

* تەموزی ١٩٨٥ بە ڕەزامەندی مامو نەوشیروان، سەردانی سالار عەزیزو مامۆستا جەعفەرم لە تاران کرد. لەوێ، نوێنەری نهێنیی یەکێتی (هادی غولام خانەقینی)یەو تێکۆشەرێکی وشیارو بەهرەمەندیشە. بینیم، ئاڵای شۆڕش بوو. باسی دوا بڕیارم بۆ کرد لەناو یەکێتی. وتی: من هەوڵەکانم بۆ یەکێتی ڕابگرم؟ وتم: نەخێر. گەرمتری بکە. وتی: بۆ؟ وتم: چونکە ئەمەیان پەیوەندی بە نەتەوەکەمانەوە هەیەو نامانەوێ یەکێتی بێ پشتو ڕێکەوتنێکی لاواز لەگەڵ عێراق مۆر بکات.

+ ئاڵای شۆڕش، کە لەناو زەحمەتکێشان هاتینەدەرەوە. هەتا (٢١) ڕۆژ، دورکەوتنەوەمان دواخست. هەتا بەیاننامەیەکی دۆستانەمان بۆ لێکدابڕان بەهەردوولامان نوسی. ئەمە یەکەمین ئەزمونی ئارام ئارام، جیاکردنەوەی دوو ڕەوت بوو!

## ( ٩ )

# هۆمەر شێخ موسیش!

پروپاگەندە، بۆ داپۆشینی زەبروزەنگو تاوان، ئەوەندە بە بڵاویی‌و ڕێکخراوی، دژی ئاڵای شۆڕش‌و بەندە، کراوە. تەنانەت تێکۆشەرە هەرە باشەکانی یەکێتی، کە زیاتر لە (٤٠) ساڵ، لەناو کولتوری سیاسی سەرکەوتوو؛ لەسایەی سیستەمێکی دیموکراسی ڕاستەقینەدا، پەروەردە بوون، یەکێک لەو سەرکردانە، کە تەمەنی خۆی لەسەر کوردایەتی هەر چوار بەشەکەی کوردستان‌و دیموکراسی دانا (ئەویش هۆمەر شێخ موس)ە، ئەمیش کەوتۆتە ژێر کاریگەری پروپاگەندەکە، بەمشێوەیەی خوارەوە کاریگەرییەکە لە بۆچونیا ڕەنگیداوەتەوە:

"ئەوان لەساڵی ١٩٨٤ جیابونەوە، کارێکی ئاساییە، بەڵام دەستیان بە دیعایەی زۆر ناشیرین کرد بەرامبەر بە مام جەلال‌و سەرکردایەتی‌و مەکتەبی سیاسی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان‌و کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان. هەروەها دەستیان لەگەڵ حزبی شیوعی عێراق‌و پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق تێکەڵاو کردو زیانێکی گەورەیان بە یەکێتی گەیاند".[1]

ڕەنگە لەناو کورددا کەم خوێنەوارو تێگەیشتوی وەکو هۆمەر هەبێ. جوامێرێکی سەرڕاستە. کێشەی ئەم کەسانە کە لەدەرەوە ژیاوون‌و گەورە بوون، ئەوەیە، تاراوگە بەچەشنێ فشار بۆ ڕۆحیان دەبات، زیاتر لە خەڵکی وڵات، شەیدای کوردستان‌و کوردایەتی دەبن. شەیدابیەکەش، هەندێک جار، دەچێتە قاڵبی ڕۆمانسی. جاران، بەهەموو بڕیارێکی ڕەسمی ناو شۆڕش بڕوایان دەکرد. لەم ڕوانگەیەوە، کەمتر لە کێشە ناوخۆییەکانی هێزە سیاسیەکان قووڵدەبنەوەو زۆرجار، لەدورەوە، حوکم لەسەر ڕوداوەکان دەدەن. ئەگینا، کاکە هۆمەر، کە لە شەستەکانەوە، قاڵبوی جیابونەوەی ناو پارتی دیموکراتی کوردستان‌و پارتەکانی ڕۆژئاواو باکورو ڕۆژهەڵاتیشە، هەموو ئەو لایەنانە لەنزیکەوە دەناسێ. هاوڕێی سەرکردەکانیانە. باش شارەزایە کە لەکاتی دووبەرەکیدا، ناکۆکیەکان توند دەبن. هێرشکردنە سەر یەکدی، زۆرجار، لەبارستایی ناکۆکیەکان فراوانتر دەبن. ئیتر لە بەختی ئاڵای شۆڕش‌و دۆستایەتی (٤٨) ساڵەی خۆی‌و خۆم، ئەمیش کەمەندکێشی کێشەکان، لەڕوانگەی نەوشیروان مستەفاوە بووە.

---

١ پشکۆیەک لە خۆڵەمێشدا.. بەشێکی گرنگ لە ژیاننامەی هۆمەر شێخ مووس. نەوزاد عەلی ئەحمەد ئامادەی کردووە. ل(١٦٧).

بەڕێزی.. لەسەر کێشەیەکی تایبەتی، کە دەبوایە (١٢) ملیۆن دۆلاری بە فێڵ نێردراو، بۆ بانکێکی بەریتانی، لەڕێی کۆمپانیایەکەوە وەربگرێ.. ئاستەنگی تێکەوتبوو، سەری نەگرتبوو. لەسەر ئەم کێشەیە، لەلایەن مەکتەبی سیاسیو کۆمەڵەوە، تەنانەتماڵی مام جەلالیشەوە، پروپاگەندەیەکی زۆر دژی کرا. لەمبارەوە، چونکە خۆی دوچاری پروپاگەندە بووە، ئاوا دەڵێ:

"بەلام بەداخەوە ئەو برادەرانەی کە رقیان لێم بوو بەجۆرێکی تر دیعایەیان بۆ هەڵبەستم. کە دەیانزانی من لەناو هێزی پێشمەرگەو لەناو خەڵکو کادرە پێشکەوتووەکاندا زۆر خۆشەویستم. ئەو کارەیان کرد تا پێگەی من لاواز بکەن".[1]

کەوابێ.. مەکۆی پروپاگەندە، ئەم بەڕێزەشی گرتوتەوە. بەبێئەوەی خەتاباریش بێ. دەبوایە، ئەم روداوەی خۆی، کە پێش پەلاماردانی ئالای شۆڕشیش بووە، لەبیری بێت، کە پروپاگەندەی ناڕاست، چۆنو بە چ هاندەرێک دەکرێ؟ لەگەڵ هەموو ئەم راستیانەشدا، هۆمەر شێخ موس، چاکەیەکی گەورەی لەسەرم هەیە.. ئەویش ئەوەیە، لەکاتی گرتنو بڕیاری تیربارانکردنماندا، هەڵوێستێکی جوامێرانەی هەبوو.. تەنانەت هۆکارێکی وازهێنانەکەی لە یەکێتی، خۆیو د.فوئاد حسێنیش، گرتنی ئێمە بووە. ئەم هەڵوێستە، رەخنەکانی ترم بیردەباتەوە. تا ئێستاش کاکە هۆمەر بەهەڵوێستەو ئالایەکی شەکاوەی کوردایەتیە لەتاراوگەدا!

## ( ١٠ )
## هەڵگێڕانی دووەمین کۆنفرانسیش

یەکەمین کۆنفرانس، داڕشتنی بناغەی پەیڕەو و پرۆگرامی نوێ، هەروا یەکەمین هەڵبژاردنی سەرکردایەتی کۆمەڵە، لە دۆخێکی دژواری رێکخراوەییدا بوو؛ کە سەرەنجامی پەنگخواردنی کێشەگەلی سەرەتای کۆمەڵە، هەڵوێستی هاوڕێیانی زیندان، کۆمیتەی هەرێمەکان، داڕشتنی گەلاڵەی ستراتیژیو ئایدیۆلۆژیەتی کۆمەڵە، هاتەدی.

پێشتر، ململانێی دەرون رێکخراوەیی هەبوو. بەلام ئەو ململانێیانە، کە ئاوێتەی پلەوپایە، هێزی چەکدار، دەسەلاتخوازیو دەستەگەری کرا، ئاڕاستەکەی لە ئاڕاستەی سیاسیو

١ سەرچاوەی پێشوو. ل(١٧٤).

ڕێکخراوەییەوە، بەرەو گیانی عەسکەرتاریو دەستەبەرکردنی پلەوپایە گۆڕدرا. گیانی عەسکەرتاریو پلەوپایەش، لەناو شۆڕشی ڕزگاری گەلێکی دواکەوتووی ژێردەستە، پرەنسیپەکان کەمبایەخ دەکاتو هەڵپەو هەلپەرستی تەشەنەدەسەنێ. لە باسی یەکەمین کۆنفرانسدا، بۆچونی خۆمان لەمەڕ بەرنامەو بڕیارو پەیکەرەی کۆمەڵە، ڕونکردەوە. لە دووەمین کۆنفرانسدا، بەشێکی بەرچاوی ململانێکانی یەکەمین کۆنفرانس پاشەکشەیان کردبوو. بەتایبەتی نەوشیروانو هاوڕێیانی زیندان، بالآدەست بوبوون. بەڵام نوسەر لە خووە ڕقاویەکەی واز ناهێنێو دووەمین کۆنفرانسیش، هەروەکو یەکەمین کۆنفرانس وێنا دەکات. چۆن لە یەکەمین کۆنفرانسدا، تەنها کرابوەوە داردەست، کە هاتە سەر هەڵبژاردنی سەرکردایەتی، خۆی کاندید کردو پشتیان تێکرد. لە دوەمین کۆنفرانسیشدا، دەرسی وەرنەگرت. کەوتەوە جرتوفرتی فیتوفات. هەر سودی نەبوو. خۆی کاندید کردەوەو دیسان کایەیەکی دۆڕاو بوو!

لە کتێبی (چەپکێک)دا، داخی دۆڕاندنی لەم کۆنفرانسەشدا، بە ڕشتنەوەی ڕقە دێرینەکەی دادەمرکێنێتەوە. لەمبارەوە چەندین خاڵی خەیاڵی ئاوها ڕیزدەکات:

"پەرەسەندنی کێشەی ناو کۆمەڵەو بەئاشکرا بەرهەڵستکردنی بیری پارتی پێشڕەوی چینی کرێکارانی کوردستانو کوردستانی بوونی کۆمەڵە".[1]

بێگومان لەناو کۆنفرانسدا مشتومڕ کراوە. ناکۆکییش هەبووە. بەڵام ئەو کێشەیە، وا مەترسیدار نەبووە کە باسی دەکات. کۆنفرانس (٢٢٢) کەس بەشدار بون. دروشمەکەی: (بەرەو گەشەپێدانی کۆمەڵەو یەکخستنی هێزە ڕزگاریخوازەکانی گەلەکەمان، لەپێناوی سەرکەوتنی شۆڕشی ڕزگاری نیشتمانیی کوردستان).

دروشمێکی ڕێکخراوەیی ئاساییو سیاسی ناو شۆڕش بوو. لە ڕاپۆرتی سکرتێری کۆمەڵەدا، ئەم باسانەی کردبووە بنچینە:

**یەکەم**: سیاسەتی ناوخۆو پەیوەندییە نیشتمانیەکان.

**دووەم**: پرۆگرامو پەیڕەوی ناوخۆ.

**سێیەم**: جێگەو پێگەی هێزە سیاسیەکانی کوردستان.

**چوارەم**: مەسەلەی دانوستان لەگەڵ حکومەت.

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٧٢).

ئەو باسانەش لەناو کۆنفرانسدا، دیالۆگیان لەسەر دەکرا. بەڵام قسەی توند، یان قووڵکردنی ناکۆکیەکانی لێنەکەوتەوە. بەڵکو بۆ دۆزینەوەی چارەسەریش دەگەڕاین:

"ئێمە بۆ دۆزینەوەی ڕێگە چارەیەک پەنامان بردە بەر بەستنی کونفرانس، سەرەتا ڕێگە و شوێنی ڕێکوپێک بۆ کۆنفرانس و بۆ هەڵبژاردنی نوێنەرەکانی هێزی پێشمەرگە، دانرا! (مەلا بەختیار)یش ڕۆیشت بۆ ناو شاری هەولێر، کە کۆمیتەی ڕێکخستنی ناوخۆی شارەکان ئامادە بکاتو نوێنەرەکانیان بنێرن".[1]

کە بەوشێویە خۆمان بۆ کۆنفرانس ئامادەکردبێ، کەوابێ: ناکۆکیو گرفتە سیاسیو ئایدیۆلۆژیەکان، بۆ سەر کۆنفرانس مەترسی گەورە نەبون. دەرچونی سەرکردایەتی لەو کۆنفرانسەشدا، جۆرێک لە ئارامی ناو کۆنفرانس دەگەیەنێ: ١- نەوشیروان مستەفا. ٢- فەرەیدون عەبدولقادر. ٣- جەمال تایەر. ٤- ملازم عومەر. ٥- عەلی بچکۆل. ٦- کەمال خۆشناو. ٧- مەلا بەختیار.

لە هاوڕێیانی زیندان، کە لە تەکەتولی زیندان مابونەوە، تەنها عەلی بچکۆل دەرچوو. فەرەیدون لەگەڵ نەوشیروان کەوتبوو. جەمال تایەرو کەمال خۆشناو بێلایەن بوون. مەلا بەختیارو ملازم عومەر، لە کۆمیتەی هەرێمەکان. سالار عەزیز خۆی کاندید نەکرد. ئازاد هەورامیش (٩٥) دەنگی هێنا. لەگەڵ ئەرسەلان بایز (٧٠) دەنگ دەرنەچون! واتا: لە دەرنەچوەکان، یەک کۆمیتەی هەرێمەکانو یەکێکیش زیندان![*]

لەم کۆنفرانسەشدا، تەواوی کۆنفرانس بایەخێکی ئەوتۆی بە فەلسەفەو ئایدیۆلۆژیەت، لەو سەردەمەدا نەدا. ئەندامانی کۆنفرانس، بە سەرکردایەتیشەوە، بێئاگا بوین لەوەی مشتومڕێکی فراوان لەسەر مارکسیزم هەیە. بەتایبەتی لەسەر لینینیزم. بەبێ ڕەچاوکردنی گۆڕانکاریە ئایدیۆلۆژیەکان، ناکۆکیەکان، ململانێو سەرهەڵدانی ڕەوتی ڕەخنەگرانە لەسەر لینینیزم، کۆنفرانس، بە ڕواڵەتیش بێ، پابەندی کۆمەڵەی بە لینینیزمیش، دوپاتکردەوە.

لەوەش زیاتر، هەر لەسەر ئەندێشەی کلاسیکی مارکسیزم، بەتایبەتی لینینیزمو ماویزم، جەخت لەسەر:

---

١ فەرەیدون عەبدولقادر. هەڵۆ سوورەکانی قەندیل. دەزگای چاپو پەخشی سەردەم. چاپی یەکەم. سلێمانی-زستانی ٢٠١٧. ل(٤٣٢).

* نەوشیروان بەرپرسی هەولێر (کۆسرەت ڕەسول عەلی)ی لەناو کۆنفرانسدا بانگ کردبوو. وتبووی: دەنگ نەدەن بە مەلا بەختیار. ئەویش جوامێرانە وەڵامی دابوەوە کە مەلا بەختیار، شایەنێتیو خزمەتی هەولێری زۆر کردووە! شەوی گەڕانەوەیان بۆ هەولێر، هاتە ژورەکەمو پێی ڕاگەیاندم: نەوشیروان هەرچەند گوتویەتی دەنگت نەدەینێ. بەڵام لە (١٢) کەس (١٩) کەس بوین، هەمومان دەنگمان دایتێ.

"کرێکاران‌و جوتیاران بناغەی هاوپەیمانیەتێکی فراوانتر بونیات بنێن، کە تیایدا بۆرژوای بچوکی شارەکان‌و توێژی پێشکەوتوانخوازی بۆرژوازی نیشتمانیان لەگەڵدا بێت".[1]

## ( ١١ )
## کۆمەڵە بۆ نەکرایە حیزب؟

لەم کۆنفرانسەدا، ئەوەی دەبوو لەڕووی سیاسیەوە بکرێ، نەمانکرد. ئەویش ئەوەبوو، بیرمان لەوە بکردایەتەوە، کۆمەڵە وەکو حیزبێک رابگەیەنین. لە هەمانکاتدا، پرۆژەمان هەبێ بۆ یەکێتی لەرێکخراوێکی نیمچە بەرەوە، بۆ بەرەی سیاسی بگۆڕین. بەشێکی ناکۆکی‌و ململانێکانی هەناوی کۆمەڵە، کە لەلایەکەوە بە عێراقچی چەواشە دەکرێ‌و لەلایەکی دیکەوە، بە کوردستانی دادەپۆشرێ. ململانێ بوو لەسەر ناسنامەی چینایەتی‌و پاراستنی سەربەخۆیی کۆمەڵە، لەناو یەکێتیدا، وەکو دەستەبەرێک بۆ هەر ئەگەرێکی سیاسی‌و پەیکەرەی یەکێتی. رەوتی رەخنەگری ئەوکاتە، پێشبینیمان دەکرد، کۆمەڵە وردە وردە ناسنامە چینایەتی-ئایدیۆلۆژیەکەی کاڵبکرێتەوە، لە دوائەنجامدا، لەناو یەکێتیشدا بتوێنرێتەوە. هەروەکو، لەسەرەتاوە ویستراوە یەکێتی وەکو حیزبێکی جەماوەری فراوان دابمەزرێ. لە زمانی فەرەیدون عەبدولقادرەوە، بۆچونی مام جەلال تەمومژی تیا نییە، کە کۆمەڵە پەراوێز بخرێ.. دەڵێ:

"با سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانیی لە ناوەوەی وڵات دەست بەکار بن بەناوی یەکێتییەوە کاربکەن زۆرترین‌و فراوانترین بەشی کۆمەڵانی خەڵکی لەدەوری کۆبکەنەوە.

-ئەی کۆمەڵە؟

-کۆمەڵە با داینەمۆ بێت، بەڵام ئاشکرای مەکەن هەر بەناوی یەکێتییەوە کارە ئاشکراکان ئەنجام بدەن".[2]

رێکخراوێک ئاشکرا نەکرێ، هەزار جار داینەمۆ بێت، خەباتەکەی هەر دەڕژێتە جۆگەلەی رێکخستنە ئاشکراکەو شۆڕشە چەکداریەکە.

١ د.ئەحمەد حەمەئەمین.رەوتی چەپ لە باشوری کوردستان. رێکخراوی ئورووپای کۆمەڵە. ل(٢٠٦).

٢ فەرەیدون عەبدولقادر. بیرەوەریەکانم لەگەڵ خاڵە شیهاب‌و هاوڕێکانی. لە بڵاوکراوەکانی رۆژنامەی کوردستانی نوێ. چاپخانەی شەهید (ئازاد هەورامی) چاپی یەکەم ٢٠١١. ل(٣٩-٤٠).

سالار عەزیز.. نامیلکەی (چەند سەرنجێکی رەخنەگرانە دەربارەی نامیلکەی پارتی پێشڕەوی چینی کرێکارانی کوردستانی-١٩٨٢/٢/١٥) لەناو بۆچونە چینایەتیە جیاوازەکانو ئاراستە ناکۆکەکاندا نوسی. گفتوگۆ لەسەر چارەنوسی چینایەتی کۆمەڵەو رێبازە ئایدیۆلۆژیەکەی، سەرەتای زەنگێکی بەرهەڵستی بوو، کە رەوتی راسترەوی کۆمەڵە باش تێیدەگەیشتنو مام جەلالیش، مەترسییەکانی زایەڵەی ئەو زەنگەی، لەسەر پێکهاتەی نیمچە بەرەیی یەکێتی پێشبینی هەست پێ دەکرد. بۆیە، سەرەڕای ئەوەی تێزە سیاسیەکانی رەوتی رەخنەگرانە، ئەوکاتە کە دەمانگوت کێشەی کورد لەو قۆناغەدا، بەشێکی کێشە سیاسی-دیموکراسیەکانی عێراق بوو، هاوکات رەتکردنەوەی تێزی مەسەلەی کورد یەک مەسەلەیە لەو قۆناغەدا، ئەم دوو تێزە، کوتومت مام جەلال باوەڕی پێی بوو. تەنانەت لەناو کوردایەتیدا، خۆیو برایم ئەحمەد لە پەنجاکانەوە تیۆرسێنی هەردوو تێزەکە بون، بەلام زەنگی سەربەخۆیی کۆمەڵەو تێکۆشان لەپێناوی پارتی چینایەتی کرێکاریو رەنجدەرانی راستەقینە، کە رەوتی رەخنەگر پەیڕەویمان دەکرد، مام جەلالی وا لێدەکرد، لە رووی بابەتیەوە بچێتە سەنگەری باڵی نەوشیروانو کۆمەڵە.. چونکە دەیزانی، لە دوائاکامدا، ئەو باڵە لەسەری ماڵە! دیاریشە لای مام جەلال.. باڵێکی دەستەمۆکراو بۆ ئایندە، کە یەکێتی وەکو حیزب لێبکا، دەستەبەر بوون. نەک رەوتێکی سرکی رەخنەگر، کە روانگەیان کۆمەڵەیەکە، ببێتە پارتی پێشڕەوی چینایەتی. لەناو یان لەدەرەوەی یەکێتی! بەگشتی ئەم بۆچونانەش، پەیوەستن بە هەمان بۆچونەوە کە مام جەلالو نەوشیروان لە دامەزراندنی یەکێتیەوە، کە یەکێتی بکەنە حیزبێکی جەماوەریی فراوان، باوەڕیان پێی بوو! هەر بۆ سەپاندنی ئەو بەرنامەش گەڕابونەوە!

لەناو ئەو لێکترازانە خوێناویەی هێزەکانی کوردستاندا، دوای (٦) ساڵ لە بەرپابونی شۆڕشو (٧) ساڵ لە دامەزراندنی یەکێتی، سێ حیزب لە کوردستاندا، بە رەهایی لە یەکێتی دوور بون: ١- پارتی دیموکراتی کوردستان. ٢- پارتی سۆسیالیستی کوردستان. ٣- پاسوک. ئەمانە حیزب بوون. لەگەڵ حیزبی شیوعی (جود)یان دروستکرد. بیریان لە تێکشکاندنی یەکێتی دەکردەوە، بەلام هەرگیز پەرەپێدانی یەکێتییان بەرەو بەرەیەکی فراوان، لایان هەر باس نەبوو. لە دوائەنجامیشدا، دوای جود، لەسەر ئاستی کوردستان، یەکێتی نەکرایە بەرەی یەکێتی کوردستانی، بەڵکو بەرەی کوردستانی دروستکرا، کە یەکێتیش وەکو ئەوان، ئەندام بوو. واتا: فەلسەفەی گەشەسەندنی یەکێتی کە لەسەر سێ پێگە بونیات نرابوو: ١- حیزبێکی پێشڕەو لەناو یەکێتی دروست دەبێ کە کۆمەڵەیە. ٢- لەشکری

شۆڕشگێڕ پێکەوەدەنرێ، کە هێزی پێشمەرگەیە. ٣- بەرەی نیشتمانی فراوان دێتەدی.. بە گەشەپێدانی باڵەکانی یەکێتیو لایەنەکانی دەرەوەی یەکێتیش. ئەم سێ ئامانجە لەو دۆخەدا، هەرسێکی شکستی خوارد! ئەوساو تا ئێستاش، هێزەکانی پێشمەرگەی لایەنەکان، نەکرانە لەشکری شۆڕشگێڕی یەکگرتوو. کۆمەڵەش نەک بەرەو پارتی پێشڕەوی سەربەخۆ پەرەی پێ نەدرا، بەڵکو کە یەکێتی لە نیمچە بەرەوە، نەکرایە بەرە، هەلومەرجی ئەنفالیش خوڵقا، راسترەوەکانی کۆمەڵە، باشترین هەلی سیاسی-دەروونییان چنگ کەوت، کۆمەڵە بتوێننەوە، هەتا یەکێتییەکی بەهێز لەناو بەرەی جوددا بپارێزن. نەک یەکێتییەکی ناکۆکی فرە باڵا!

وەکو گوتم: لەسەر پێکهاتەی یەکێتی کە بەرەو بەرەی کوردستانی گەشەبکاتو کۆمەڵەش ببێتە داینەمۆی پێشڕەوە سەربەخۆکەی. گومانی قووڵم لە پێش دووەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەوە، لا پەیدا بوو. بۆیە وتارێکم بەناونیشانی (هەلومەرجی تایبەتیو پەرەپێدانی خەباتمان) بەناوی (بەختیار)ەوە نوسی. ناوەڕۆکی وتارەکە، گومان بوو لە پەرەسەندنی یەکێتی بەرەو بەرەی کوردستانیو داکۆکیش بوو لە گەشەکردنی کۆمەڵە بەرەو پارتی پێشڕەو. لە بەشێکی وتارەکەدا نوسیومە:

"کۆمەڵە ناوکو کاکڵەی حیزبی پێشڕەوە. ئەڵقەی ناوەندی خەباتیشی لەدایکبونی حیزبی پێشڕەوە.. کە هێشتا نەهاتۆتە دی بۆ سەرکردایەتی کردنی بزوتنەوەی گەلەکەمان. ی.ن.ک هەیەو کۆمەڵەی تیایە. بەڵام هێشتا نەبوە بە بەرەی نیشتمانی هەمو چینەکانی گەلو چینەکانی گەل بەتەواوەتی لەژێر ئاڵایەکدا کۆنەبونەتەوە. هێزی پێشمەرگەی دڵسۆزو ئازاو تاقیکراوەمان هەیە، بەڵام هێشتا نەبوە بەو لەشکرە شۆڕشگێڕەی کە گەرەکمانە. خەباتی ئینتەرناسیۆنالیستیو ناوکۆیی گەلانمان گەلێ پێ گرنگن. بەڵام بەداخەوە هێشتا ئەم ئاواتەشمان وەک پێویستە بۆ نەهاتۆتەدی".[1]

لەو پەرەگرافەدا، مەبەستمە بڵێم: دوای حەوت ساڵ لە خەباتی سیاسی-یەکێتیو شەش ساڵ لە بەرپاکردنی شۆڕش، لایەکی سیاسی لە یەکێتی جیابۆتەوەو بەشێکی هێزەکەشیان بردووە، ئیتر فەلسەفەی پەرەپێدانی یەکێتی بەرەو بەرەی نیشتمانی فراوان، دژوارە. بۆیە کۆمەڵە دەبێ وریای چارەنوسی رێکخراوەیی خۆی بێ. لەسەر ئەو ریتمە، بەپێی دۆخی ئەوکاتەی کۆمەڵە لەناو یەکێتیدا، ئاوا درێژەی دەدەمێ:

"ئەمە ناوەڕۆکی جیاکەرەوەمانە وەک رێکخراوێکی (م.ل) لە لایەنە وردە بۆرژواو

---

١ کۆمەڵە. (گۆڤاری کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان). ژمارە (١) خولی (٢) کانونی دووەم ١٩٨٢- ریبەندانی ١٣٦٠. بەختیار. ل(٤٢).

چین‌و دەستەوتاقمەکانی دیکە.. ئەم ناوەڕۆکە بنچینەییە ئەوەمان لێدەخوازێ کە کاری شۆڕشگێڕانەی بێ پێچو پەنای چینایەتیمان چ لە خەباتی نیشتمانیمانداو چ لە خەباتی بردنەوەی گرەوی ڕێبازی کرێکاراندا ئەنجام بدەین. بەبێ ئەوەی ڕێگە بدەین لەدەرەوەو لەناوەوەی ڕێکخراوەکەماندا هیچ هۆیەکی گەورەو بچوک لەو ڕووەوەو بیرچونی ئەرکو فرمانەکانی سەرشان ساردمان کاتەوە".[1]

مام جەلال، نەک تەنها لەڕووی سیاسیەوە بەتوانا بوو، بەڵکو لەهەموو ڕویەکەوە، زیرەکیەکەی دەگمەن بوو. یەکسەر لە مەبەستە شاردراوەکانی ئەم وتارەم تێگەیشتبوو. زانیبووی گومانم لەسەر فەلسەفەی یەکێتی پەیداکردووە، کە لە دامەزراندنەوە، دەویستێ بکرێتە حیزبێکی پانوپۆڕی فراوان. بۆیە لە دانیشتنێکدا، مام، فەرەیدون، حەمەتۆفیقو بەندە، لەماڵی فەرەیدون، ڕەخنەی لێگرتم لەسەر وتارەکە. کە گوایە پەلەم کردووەو جارێ پرۆسەی پەرەپێدانی یەکێتی زۆری ماوە. منیش وتم: ئەوە بۆچونی خۆمە. مام ڕوی گرژ کردو منیش بێتاقەت بوم.

ململانێکە، بە دوو هێڵی ناتەریب، لەناو کۆمەڵە بەردەوام بوو. لەسەر هەمان ڕێچکە، وتارێکی دیکەم، بەم ناونیشانە (کۆمەڵەو ململانێ چینایەتیەکانی کۆمەڵ) نوسی. ئەم نوسینانە ڕەتکردنەوەی ئەو تێزە بێ پێزە بوو، کە نەیارانی کۆمەڵەو فەلسەفەکەی، بڵاویان دەکردەوە. تێزەکانیش لە دەوری ئەوە دەسوڕایەوە کۆمەڵە لەقاڵبی ڕێکخراوێکی مەحفەلی بدەن. لەوەڵامیاندا وتومە:

"ئینجا بایان دایە سەر ئەوەی کە بونی کۆمەڵە باشە و پێویستە، بەڵام تەنها بۆ کۆکردنەوەی رۆشنبیرە مارکسیست-لینینیستەکان‌و بەس. نەک بۆ سەرکردایەتی کردنی بزوتنەوەی گەلەکەمان. چونکە (گوایە) سەرکردایەتی کردنی ئەم بزوتنەوەیە، حیزبێکی جەماهیری گەورەی گەرەکەو بۆ دروستکردنی ئەم حیزبەش میکانیکانە داوای فەرزی نەیاراتیان دەکرد.. بەبێ ئەوەی ناکۆکیە چینایەتیەکانی کۆمەڵ لەبەرچاو بگرن‌و ئەو ڕاستیە زانستیە پەیڕەو بکەن کە نەیارەکانی بزوتنەوەی گەلەکەمان.. ڕەنگدانەوەی ناکۆکیە چینایەتیە بابەتیەکانی هەناوی کۆمەڵەو ئەم ناکۆکیە چینیایەتیانەش بەئارەزوی بای ڕۆژگاری سیاسەت‌و بەرژەوەندی چەند کەسانی چینێک لە چینەکانی کۆمەڵ، فەرز ناکرێ‌و حیزبی جەماهیری دروست ناکرێ".[2]

١ سەرچاوەی پێشوو. ل(٤٤).

٢ کۆمەڵە. (گۆڤاری کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان). ژمارە (٣) خولی (٢) مارتی ١٩٨٢- نەورۆزی ١٣٦٠. بەختیار. ل(٤٢).

تەواوی دەقی هەردوو وتارەکە، لە پاشکۆی کتێبەکەدا، بۆ مێژوو بڵاودەکرێتەوە. هەتا خوێنەر، بە هۆشی ئێستاو دوای چل ساڵ لەو ململانێیانە، بابەتەکان بەراورد بکاتو سەرەنجامەکان لێکبداتەوە، ئینجا، بەپێی زەمانو زەمینەی گەشەکردنی روداوەکان، حوکمیان لەسەر بدات. حوکمێکی لۆژیکی، نەک حوکمی نەخۆشی سایکۆلۆژی!!

بەداخەوە، ئەو ململانێیە، بۆ پاراستنی ئایدیۆلۆژیەتی کۆمەڵە، لەبەرامبەر پیلانی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەدا، لەبەر گەلێ هۆکار، سەرینەگرت. سەرەنجام، هەر ئەو پیلانە سەریگرت، کە کۆمەڵە لەناو یەکێتیدا، بەناوی حیزبی جەماوەری فراوانەوە، بتوێندرێتەوە. بەمەش هاوکێشە سیاسیەکان، بێبەش کرا لە رێکخراوێکی چەپ، کە لەتوانادا بوو، بپارێزرێو پەرەی گونجاوی لە قۆناغە جیاوازەکاندا پێ بدرێ. یەکێتیش لەناو کێشە ناوخۆییەکانی، پەنگ نەخواتو خۆی نەخواتەوە.

## ( ١٢ )
## شۆڕشگێڕانو تاکتیکی مام!

لەدوای دووەمین کۆنفرانسو دروستکردنی بەرەی جود، وەکو بەراورد، لەڕووی ژمارەو سەنگی سیاسیشەوە، کۆمەڵە کاریگەرتر بوو. هێڵی گشتی، جگە لە پلەوپۆست پێبەخشین، ئەویش بەهۆی سکرتێری یەکێتیەوە، سەنگی سیاسیو روانگەی ئایدیۆلۆژییان نەبوو. تەنانەت ئۆرگانیشیان نەبوو. پاشماوەی بزووتنەوەی سۆسیالیستیش، تەنها عومەر دەبابە، وەکو سیاسەتمەداری ناوداری کوردستان لەگەڵیاندا مایەوە. باقی کادرەکانیان نەناسراو بون. بۆیە مام بەردەوام نامەی دەنوسی، خەڵکی بەتواناتریان بێنە دەرەوە، هەتا لەبەرامبەر حیزبی سۆسیالیستدا بەهێزیان بکات. لە راستیا، مام جەلال هێڵی گشتی هی خۆی بون. پاشماوەی بزوتنەوەی سۆسیالیستیشی دەستەمۆ کردبوو. بەم دوو رێکخراوە، مام هەوڵدەدا هاوکێشەکان هاوسەنگ بکات.. بەڵام لەناو یەکێتیدا. چونکە هێڵی گشتی هێڵ نادیارو پاشماوەی بزوتنەوەیەکی لاوازیش، ئەو پارسەنگەیان پێ دروستنەدەکرا. ئیتر لەو ماوەیەدا تێکۆشەران: حاکم عومەر، جەمال ئاغا، عەلی حەوێز، مامۆستا نازم، د.پێشەواو شێخ عەلی تاڵەبانی، لە هەرە ناودارەکانیان بون یەک دوای یەک هاتنەدەرەوە. د.خدر هەورامیشیان لەگەڵدا بوو. هاوزەمانی بەستنی دووەمین کۆنفرانسی کۆمەڵە، بزوتنەوەو هێڵی گشتیش، بە سەرپەرشتی

مام جەلال یەکیانگرتەوە. چۆن نەوشیروان مستەفا بەبێ پرسی مام جەلال یەکەمین کۆنفرانسی سازدا. مامیش بەبێ پرسی نەوشیروان مستەفا، کۆنگرەی شۆڕشگێڕانی سازداو خۆیشی بێ ڕەزامەندی کۆمەڵە، کردە سکرتێر. ئەمەش هێزی ئیحتیاتی مام جەلال بوو، بۆ هەر ئەگەرێکی نەخوازراو.. چونکە لەناو کۆمەڵەدا ڕەوتی خاوەن هەڵوێست باسی سەربەخۆیی کۆمەڵەو پارتی پێشڕەویان دەکرد. نەوشیروانیش، هەندێک جار، کە دەیبینی کۆمەڵە بەهێزترە، سەرکێشی لە ڕێنوێنی مام جەلال دەکرد. ئەمەجگە لەناکۆکییە کۆنەکانیش مام جەلالی دەترساند!

ئەوکاتە، بەرپرسی مەڵبەندی یەکی سلێمانی بوم، بارەگاکەمان لە حاجی مامەند بوو. زۆرتر خەریکی ئەوە بوم ئۆرگانەکانی مەڵبەندەکە دابمەزرێ و چالاکیی بکرێ.. یەکێتیش لە شەڕی ناوخۆ دووربخەینەوە. لامان سەیر بوو (مام جەلال) ببێتە سکرتێری شۆڕشگێڕان. چونکە، بەپێی ڕێسا دەبوایە بێلایەن بێ، هەتا سکرتێری گشتی یەکێتی بێ. بروسکەیەکیشم بۆ کرد هۆی ئەو بڕیارەی ڕونبکاتەوە. وەڵامی نەدایەوە. نەشمدەزانی، کۆمەڵە دوابڕیاری لەوبارەوە چی دەبێ. نوسەر لەلاپەڕە (٣٧٧)دا لەخۆڕا ئەو باسەی ئاوا نوسیووە:

"مام جەلال بۆ قوت کردنەوەی هێزێکی بە قەبارە زل و بەتوانا لەبەرامبەر کۆمەڵەدا، هەوڵێکی زۆری بۆ پشتیوانی و پشتگیری کردنیاندا تاڕادەی ناوزەدکردن و بەشداریکردنی لە هەڵبژاردنی سەرکردایەتیەکەیدا بە سکرتێری شۆڕشگێڕان، کۆمەڵە ئەو کارەی بە باشە و بە ئیجابی دانا، چونکە لە هەوی ساری ئەرکەکاندا لەباتی سێ فلیقانە بوو، بە دوو فلیقانە واتە هەر لەم (م.س)وە تا بچوکترین ئۆرگانی ناو یەکێتی بە هەموو دەزگاکانیەوە لەباتی ئەوەی لە (٣) کەس (کۆمەڵە، بزووتنەوە، هێڵی گشتی) پێکبێ، لە دوو کەس پێکدەهات واتە (کۆمەڵەو شۆڕشگێڕ)ێک، کە بە ڕاستی تاڕادەیەک هەلی دەسەڵات گرتنەدەست لەبەردەم هەڵپەرستان کەم بۆوە".[1]

ئەم بۆچونە، ڕستە ڕیزکردنە. بەڵکو سەردەرنەکردنە لە ناکۆکیو ململانێکان.

هەر ڕێکخراوێک، تەواوی ململانێکانی لە بۆتەی پلەو پۆست دابەشکردندا، قەتیس بکات، بەبێ ڕۆشنکردنی ڕێبازی چینایەتی-ئایدیۆلۆژی، هاوکات پرەنسیپی یەکێتی-ململانێی، لە چوارچێوەی نیمچەبەرەی وەکو یەکێتیدا، تایبەت لەناو دۆخی کۆمەڵایەتی پڕ لە کێشەی سیاسیدا، وردە وردە ئەو ڕێکخراوە پێگەکانی لەدەستدەدات. کۆمەڵە، هەتا بنچینە کۆمەڵایەتیەکانی زیاتر فەرامۆش دەکرد، هەڵوێستە ئایدۆلۆژیەکانیشی لاوازتر دەبوو! ئیتر هەڵپەی پۆستو هەڵپەرستی زاڵدەبوو بەسەریا.

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٧٧).

کۆمەڵە، لە روانگەی فەلسەفەی چینایەتی جیاوازەوە، سەیری ناو یەکێتی نەدەکرد. تەنانەت یەکێتی ناو یەکێتیشی بە رەهایی بەسەر ململانێی ئایدیۆلۆژی-سیاسیدا زاڵدەکرد، بەمەش ناسنامە چینایەتی‌و جیاوازیە ئایدیۆلۆژییەکەی (بەپێی هاوکێشەکانی ئەو سەردەمە) بەرە بەرە مردار دەکردەوە. ئەگینا گەر کۆمەڵە، لە سەرویانەوە سکرتێرەکەی، لەناو خەباتی رزگاری نەتەوایەتیدا، باوەڕی بە فەلسەفەی چینایەتیش لەناو هاوکێشەکاندا هەبوایە، باشترین هەل بوو، کە مام جەلال کرایە سکرتێری شۆڕشگێڕان، پێ دابگرێ لەسەر گۆڕینی پێکهاتەو پەیرەوی ناوخۆی یەکێتی. بەو کارە، رەنگبوو یەکێتیش گەشە بکات. کۆمەڵەش پەرە بسەنێ، متمانەیەکیش لەناو لایەنەکانی دەرەوەی یەکێتیدا بێتە پێشەوە. بەڵام، لەبەرئەوەی لەڕووی بابەتییەوە، لەبنچینەدا سکرتێرو پەیڕەوانی، هەر باوەڕیان بە سەربەخۆیی کۆمەڵە نەبوو، نەشیاندەویست قەوارەی یەکێتی هەتا دەیکەن بە حیزبێکی جەماوەری فراوان، هەروەکو لەسەرەتای دامەزراندندا ویستبویان، بگۆڕن، بۆیە لایان ئاسایی بوو، مام جەلال ماوەیەک سکرتێری شۆڕشگێڕانیش بێت! ئەمەش دەیسەلماند کە باڵی راستڕەوی کۆمەڵە، لە رێبازی چەپ هەتا دەهات، دادەشۆرا!

مام، کە یەکێتی دادەمەزرێنێ، ویستویەتی باڵەکانی ناو یەکێتی تەنها خزمەتی یەکێتی لەدەرەوەو لەناو شۆڕشدا بکەن. لەمبارەوە نەیشاردۆتەوە فەلسەفەکەی ئەمەی خوارەوە بووە:

"وا بڕیاردرا لەناو شارەکاندا کۆمەڵەو بزوتنەوەو خەتی گشتی، سەربەستن لە کاری رێکخراوی خۆیانداو لەدەرەوەی شارەکان، یان لەناو هێزی پێشمەرگەو لادێکاندا رێکخستن بەناوی یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە دەبێت‌و لقو لیژنەکان هی یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەبێت‌و هەمو کەسێکی تێیدا دەبێت‌و بەپێی لێوەشاوەیی‌و توانا کارەکان دابەشبکرێت".[1]

ئەم دەقە، تەمومژی تیا نییە، کە لە شامدا، ناکرێ مام جەلال کە جارێ نەگەڕاوەتەوە کوردستان، بڵێ: هەموو چالاکییەک بەناوی یەکێتییەوە بێ. بە شارەکانیشەوە. گرنگ شۆڕشەکەو خەباتە چەکداریەکە بووە. لەم خەباتە ئاشکرایەدا، پێشمەرگەو شۆڕش بەناوی یەکێتی دەبێ.. مام جەلالیش سکرتێرو فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگەیە. سەرەنجام، کۆمەڵە بە هەنگاو لەناو یەکێتیدا دەتاسێ. هەتا دەیتوێننەوە!! کوشتن، یان

١ مام جەلال. دیداری تەمەن- لە لاوێتییەوە بۆ کۆشکی کۆماری. ئامادەکردنی: سەلاح رەشید. ل(٧٩).

تاساندنی جیاوازییە بنچینەییەکان، بەناوی یەکێتییەوە، یەکەمین گورزی کوشندەیە بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی رەهای یەکێتیو مام جەلال، هەتا بتوانن، لە دۆخێکی گونجاودا کۆمەڵە بتوێننەوە. شۆرشگێڕانیش دەستەبەر کرابون.

کوشتنی جیاوازیەکان، لەدەرەوەی یەکێتی، بە زەبروزەنگ نەچووەسەر. بەڵام تاساندنی جیاوازیەکانی ناو یەکێتی، لەنێوان کۆمەڵە-بزوتنەوە-هێڵی گشتیدا، بە بەرنامەو بەشێنەیی، بۆیان چووەسەر.

ئەگەر هەبوبن لەناو کۆمەڵەدا، ئاگایان لەو سیاسەتە نەبوبێ، یان لە نەزانینەوە، دژایەتی رەوتی رەخنەگرانەی ناو کۆمەڵەیان کردبێ، یاخود لەبەر بەغالەتو رقەوە، کەوتبنە بەرەی سکرتێری کۆمەڵە، گومانمان نییە کە نەوشیروان سیاسەتی مام جەلال باش شارەزا بووە. خۆیشی کە گەڕاوەتەوە، کوتومت بەپێی ئەو رێبازە گەڕاوەتەوە کە یەکێتی بسەپێنرێو کۆمەڵە پەراوێز بخرێ.. هەتا هەڵیدەوەشێننەوە، وەکو هەڵیشیانوەشاندەوە. ئەوەتا، لەم گفتوگۆیەی مام جەلالو نەوشیرواندا، ئەم راستییە بێ تەمومژ، دیارە:

"هەر کە گەیشتمە ناو کوردستانی عێراق، برادەران هاتبونە سەر سێ سنورەکە، نەوشیروان لەپێشەوە هات بەرەو پیرم، لێم پرسی وەزع چۆنە؟ کەمێک رۆیشتین، رێگاکە هەوراز بو و هەردوکمان تەنگەنەفەس بوبوین، بۆیە گوتی: "دوایی تەفسیلاتت بۆ باس دەکەم".

گوتی: "ئێمەو برادەرانی ناوەوە هەر ناومان یەکە، ناومان یەکێتی نیشتمانییە ئەگینا، نە بیروبۆچونمان، نە تەفکیرمان، نە هەڵسوکەوتمان یەکە، برادەرەکان لە شکستیدانو لە لافاوی تەسلیم بونەوەدا بون، خەڵک تاقم بە تاقم تەسلیم دەبونەوە، ئەگەر لە شکستدا نەبوینایە، من پێشنیازمدەکرد، بگەڕێینەوەو بۆ خۆیانی بەجێ بهێڵین، چۆنیان دەستپێکردوە با واش بیبەن بەڕێوە! چونکە ئەوە ئەوەنەبو کە ئێمە ویستمان".[1]

با دیقەتی دێڕ بە دێڕی ئەو فەرمایشتانەی نەوشیروان، لەوکاتەدا، بدەین:

**یەکەم:** "ئێمەو برادەرانی ناوەوە هەر ناومان یەکە، ناومان یەکێتیشی نیشتمانیی کوردستان".

سەرنج بدرێ.. دەڵێ: ئەو برادەرانە. واتا: کۆمەڵەو بزوتنەوەو هەموو ئەوانەی شۆڕشمان کردووە. نەک بەتەنها بزوتنەوەی سۆسیالیست.

---

١ سەرچاوەی پێشوو. ل(٧٦-٧٧).

**دووەم:** "نە بیروبۆچونمان، نە تەفکیرمان، نە هەڵسوکەوتمان یەکە".

سەرنج بدرێ.. بۆچون.. بۆچونی سیاسی. تەفکیر، تەفکیری ئایدیۆلۆژی.. هەڵسوکەوت، رەفتارە.. واتا کۆمەڵەو بزوتنەوە، پێکەوە، لەگەڵ دەستەی دامەزرێنەردا ناکۆکن.

**سێهەم:** "برادەرەکان لە شکستدانو لە لافاوی تەسلیمبونەوەدا بون، خەڵک تاقم تاقم تەسلیم دەبونەوە".

سەرنج بدرێتەوە.. دیسان بە کۆ حوکمدانە. نەک بە یەک لایەن. هەمووومان لەشکستداین. بە لافاویش تەسلیم دەبونەوە. ئەمەیان زۆر دورە لە راستیەوە. تێکڕا، ناگاتە (١٥) پێشمەرگەی کۆمەڵە تەسلیم بوبنەوە. بزوتنەوە بەڵێ، بە سەدانیان دەڕۆیشتنەوە.

**چوارەم:** "ئەگەر لە شکستدا نەبوینایە، من پێشنیازمدەکرد بگەڕێینەوەو بۆ خۆیانی بەجێ بهێڵین".

سەرنج بدرێ.. دەڵێ: "بۆ خۆیانی جێ بهێڵین" هیچ جیاوازیەک لەنێوان بزوتنەوەو کۆمەڵەدا ناکات.

**پێنجەمیش:** "چۆنیان دەستپێکردووە با واش بیبەن بەڕێوە! ئەوە نەبو کە ئێمە ویستمان!".

سەرنج.. ئەوەی لە وڵات کراوە، ئەوە نەبووە کە ئەوان لەدەرەوە ویستویانە. ئاشکراشە چییان ویستووە. تەنها یەکێتیو هێزی یەکێتیو پروپاگەندەکردن بۆ یەکێتییان، لەسەر حسابی کۆمەڵەو بزوتنەوە ویستووە.

ئەم دیالۆگە، رەنگدانەوەی سەرومڕ، جۆرایەتی بیرکردنەوەی مام جەلالو نەوشیروان (هەروا دەستەی دامەزرێنەریشە لەدەرەوەی وڵاتدا) بۆ دۆخی سیاسی-کۆمەڵایەتی، دوای هەرەس. دیارە خوێندنەوەیان بۆ جیاوازیەکان، بۆ ناکۆکیەکان، بۆ ململانێکان، تەنها هێندە بووە چۆن جڵەوی رابەرایەتی کوردایەتی لە بنەماڵەی بارزانیو پارتی بسەننو بیخەنە دەستی یەکێتی. تەنها ئەو ناکۆکیانەیان لەو دۆخەدا، بینیووە. لەسەر بنەمای ئەو ناکۆکیە سیاسیەش، نەک چینایەتیو ئایدیۆلۆژی، پەیکەرەو بەرنامەی یەکێتیان دارشتووە. هەتا خەونە دێرینەکەی ناو پارتیو سەردەمی جەلالی-مەلایی، بەدی بهێنن کە رابەرایەتی کوردایەتی بگرنەدەست.

ئێمە ناڵێین، ئەمە خەونێکی نارەوایە.. بەڵام مەترسی ئەم بۆچونە ئەوکاتەو دوای ئەوکاتەش لەسەر کۆمەڵە.. لەسەر پێگەی ئایدیۆلۆژیو لێکدانەوەی چینایەتی کۆمەڵە، چی بووە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە، سەری گلۆڵە ئاڵۆزەکەی ستراتیژی قۆناغ بە قۆناغی

یەکێتی، لە شامەوە، هەتا هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەو ناشتنی لەناو مەزارگای رازاوەی یەکێتیدا، دەردەخات.

مەترسیدارترین سیاسەت، لە کوشتنی بنەمای جیاوازیەکانەوە دەستپێدەکات. کاتێک جیاوازییە بنەڕەتیەکان، دەتاسێنرێ.. ئیدی بەتەواوی رۆحی جیاوازیەکان دەکوژرێ.. ئیتر مەترسیە گەورەکان لەسەر جیهانبینییە جیاوازەکان دەبنە مۆتەکەی دەسەڵاتو دەسەپێنرێن. لێرەشەوە، لە کوشتنی ئەم جیاوازیانەشەوە، ئازادیو دیموکراسی بە رادەیەکی کەمیش.. کۆتاییان دێ!

## ( ١٣ )
## نەوشیروانو نائومێدیی!

نەوشیروان، یەکێک لە سیفاتەکانی ئەوەبوو، لە هەر دۆخێکدا قەناعەتی چۆن بوبێ، راستیەکان وەکو خۆی دەگێڕێتەوە. قەناعەتی دژەکانیشی، چۆنی بوێ، هەڵدەگێڕێتەوە. جگە لەو بۆچونانەی مام جەلال دەیانگێڕێتەوە، خۆیشی راشکاوانە، باسی هەڵوێستە سەرەتاییەکانی دەکاتو لەسەر کۆمەڵە دەڵێ:

"ئەو چەند ساڵە من دور بوم لە کاری کۆمەڵە. ئێوە ماندو بونو فیداکاریتان کردوە. نامەوێ من بێمە سەر حازری. چی بە من بکرێ بۆ پشتیوانیتان دریخی ناکەم، بەڵام ئەمەوێ لەدەرەوەی کۆمەڵە بم. من ئەندامی "دەستەی دامەزرێنەر"م، خۆم بە رۆتینی ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتیم وەکو هەڤاڵەکانی تر. چاکتر وایە ئەو جێگایەی بۆ منی تەرخان ئەکەن بیدەن بە برادەرێکی تر. سەرباری ئەمانەش لێتان ناشارمەوە: من باوەڕم بە کۆمۆنیزم نیە".

راستییەکەشی ئەوەبو: توشی «خیبة أمل» بوبوم لێ یان، ئەمویست بێ ئەوەی دڵیان بشکێنم، تێکەڵاوی کاری ناو کۆمەڵە نەبم، جگە لەوەش کەسانی وەکو کاک خالیدو عەلی عەسکەری رەئیان وابو بەهەمومان رێکخستنێکی تازە بەگوێرەی پێویستیەکانی شۆڕشەکە دابمەزرێنین، جێگەی بزوتنەوەو کۆمەڵەو خەتی گشتی بگرێتەوە.(١)

ئەم قسانە، پێویستە لە فۆرمی سۆزو گێڕانەوەی سەرپێیی دەربهاوێنو بگەڕێینەوە بۆ رەگەزە راستەقینەکانی بۆچونەکان. بۆ چۆنیەتی تێگەیشتن لە جیاوازیە ئایدیۆلۆژیەکان

١ نەوشیروان مستەفا ئەمین. لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ. ل(١٧٢).

بگەڕێین. سیاسەتمەدارێک (٧) ساڵ لە کۆمەڵە دوور بوبێ؛ لەو (٧) ساڵەدا، یەک دانە جاریش پەیوەندی پێوە نەکرابێ؛ خۆیشی نامەی بۆ کۆمەڵە نەنوسیبێ؛ کە یەکێتیش دادەمەزرێ، مام جەلال وەکو کەسایەتیەکی بێلایەن پەیوەندی پێوە دەکاتو لە دەستەی دامەزرێنەریشدا، بەهۆی تێکۆشانی دێرینو تواناو هاوڕێیەتیەوە، دادەنرێ؛ دوای (٧) ساڵ، دەگەڕێتەوە وڵاتەکەی، شۆڕشێکی نوێ لەسەر داروپەردوی هەرەس، بەرپا کراوە. تا ئەوکاتە، لەدەرەوەی وڵاتەوە، دەستەی دامەزرێنەر، یەک چەکیان بۆ نەناردون. بە پشت بەخۆبەستنو ئیرادەی شۆڕشگێڕانە، شۆڕشیان بەرپا کردووە. هاوڕێیانی کۆمەڵە لە زینداندا، زۆربەیان نمونەی قارەمانێتی (کەم بژیو کەڵ بژی) بوون. کەسوکاری پێشمەرگەکان، راپێچی زیندان کراوون. لەبری ئەوەی شانازی بە رێکخستنێکەوە بکات، کە حەوت ساڵ، ئاگایشی لێی نەبووە. لەو حەوت ساڵەدا، خەریکی ژیانی خۆیو خۆشیی ژیانی بووە. کەچی لە یەکەمین دیدارەکاندا جەنابی پێی وایە:

- توشی (خيبة أمل) واتە نائومێدی بووم لێیان.
- ئەمویست بێ ئەوەی دڵیان بشکێنم، تێکەڵاوی کاری کۆمەڵە نەبم.
- خالیدو عەلی عەسکەری رەئیان وا بو بەهەمومان رێکخستنێکی تازە بەگوێرەی شۆڕشەکە دابمەزرێنین، جێگەی بزووتنەوەو کۆمەڵەو خەتی گشتی بگرێتەوە.
- بۆچی توشی (خيبة أمل) بووە؟
- ئایا ئەم بۆچونەی راست بووە؟
- ئایا ئێمە وڵاتمان جێهێشتو هەڵهاتین بۆ سوریاو لەوێوە، دەستیان گرتوینو هێناویانینەتەوە؟
- ئایا بەرنامەی بەرپاکردنی شۆڕشمان تێکداوە؟
- ئایا شیرازەی پساوی کۆمەڵەمان نەگرتۆتەوەو یەکەمین شانەکانی یەکێتیمان دروستنەکردووە؟
- ئایا کە دەستەی دامەزرێنەر لەدوای چەندین هەوڵی ناردنەوەی مەفرەزەکان لە قامیشلووە بۆ بادینان، شکستیان خوارد، ئێمە ئیتر کۆڵمان دا و دەستمان لە شۆڕش بەردا؟

ئەم بۆچونە، بۆچونێکی نەهلستییە (پوچگەرایی) بێبڕواییە بە گۆڕانکاریو ململانێی کۆڕی خەبات. لەم بۆچونە پوچگەراییەشەوە حوکم لەسەر پێگەی کۆمەڵەو دواڕۆژی یەکێتی دەدات، هەر لەم روانگەشەوە، دێتە ناو کۆمەڵە. ئەم بۆچونەش زۆر درەنگ

ئاشکرا دەکات.. ساڵەهای ساڵ بۆچونە پوچگەراییەکەی دەشاریتەوە. سروشتیشی لەو بابەتەیە کە قینی هەڵدەگرت، قینەکەی دەرنەدەبڕی، هەتا بۆی هەڵدەکەوت بە هێز و دەسەڵاتی رەهاوە، قینەکە هەڵبڕێژێ!!

مام جەلال‌و نەوشیروان، لە یەکەمین رۆژی گەڕانەوەیان، بەوشێوەیە، لەو هەموو خێڵە چەکدارەو لەو بێسەروبەرییەی هێزەکان نائومێد بوبن‌و بەناچاریی مابنەوە، ئەی کۆمیتەی هەرێمەکان چی بوونایەو چیمان بکردایە، کە لە یەکەمین مانگی ٨/ی ١٩٧٦وە، توشی ئەو دۆخە چاوەڕواننەکراوە بوین؟ ئایا، ئێمەش توشی (خيبة أمل) بوینایەو هەڵبهاتینایە، یان بەرگەمان بگرتایە؟ هەڵهاتن لەتورکیاوە ئاسان بووە.. هەروەکو زۆر کەس دەڕۆیشتن. بەڵام چۆن لەدوای رۆشتنی سەرکردایەتی کۆمەڵە بۆ ئێران، کۆمیتەی هەرێمەکان خۆمان گرت تا شۆڕشمان کرد، هەر بەوشێوەیە، لەدوای ئەوەی بزوتنەوەی سۆسیالیست، گەوهەری شۆڕشەکەیان کردە، بزوتنەوەیەکی چەکداری پان‌وپۆڕ، کۆمیتەی هەرێمەکان زۆرمان پێناخۆش بوو، بەڵام کۆڵمان نەداو بەردەوام بوین. بەداخەوە، دوای گەڕانەوەی مام جەلال-نەوشیروان بەچاوی خۆشیان لێشاوی خۆبەدەستەوەدانیان بینی، کەچی هەر پشتیوانی بزوتنەوەیان پتر کرد. ئەمەش پەیوەندی بە بەرنامەکەیانەوە لەسەرەتای دامەزراندنی یەکێتیەوە، بۆ کردنی یەکێتی بە حیزبێکی جەماوەریی، هەبوو. هەر دوای گەڕانەوەی مام جەلال-نەوشیروان، قسەشیان تیا کردبوو.

ئینجا نەوشیروان نەشیویستووە، دڵمان بشکێنێ‌و هەوڵیشی داوە تێکەڵاوی کۆمەڵە نەبێ. عوزر لە قەباحەت خراپتر. رۆژگار دەریخست، مەسەلەکە دڵشکاندن نەبووە. بەڵکو بەرنامەیەک لەئارا بووە.. ئەویش بەرنامەی بەتاڵکردنی گەوهەری کۆمەڵە بووە لە بۆچونە چەپ‌و چینایەتیەکەی.. هەتا بەبێ کاردانەوەو هەڵوێستی جیابونەوە، بتوانن هەڵیبوەشێننەوە!

سەد مەخابن، شەهید ئارام دەستبەجێ نەهات بۆ بادینان‌و دۆخەکەی بەچاوی خۆی نەدی. ئەگینا، نە کۆمەڵە روومان لە نەوشیروان دەنا بەو (خيبة أمل)ەوە، بێتە ناو کۆمەڵەو نوێنەرایەتی کۆمەڵە بە ناخی پوچگەراییەوە بکات. نە چارەنوسی کۆمەڵەش بەوە دەگەیشت، هاورێیەک خۆمان رزوومان لێنابێ بێتە ناو کۆمەڵە، کەچی سەرەنجام پەلامارمان بداتەوە. بەناوی پاراستنی شۆڕش‌و کۆمەڵەوە، تاوانیش بەرامبەرمان بکات. ئەو شۆڕشەی ساڵانی (١٩٨٨-١٩٨٩) نەوشیروان سەدان کەسی پاڵپێوەنا خۆیان تەسلیم بکەنەوەو دەشیویست ئاشبەتاڵی پێ بکات. یان ئەو کۆمەڵەیەی بەئاشکرا پیلانی لێگێڕاو لەناو یەکێتیدا، هەڵیوەشاندەوە.

له هەموو ئەو باسانە سەیرو سەمەرەتر، دوا برگەی قسەکانێتی کە دەفەرموێ.. ویستومانە لەگەڵ د.خالیدو عەلی عەسکەری، ڕێکخستنێکی تازە بەگوێرەی شۆڕشەکە دروست بکەین.. جێگەی کۆمەڵەو خەتی گشتیو بزوتنەوە بگرێتەوە..

لەبری ئەو شەهیدە قارەمانانە، یان وەکو شوێنگرەوەی ئەو شەهیدانە، ماف بە خۆم نادەم قسە بکەم، بەڵام دوای نەمانی کۆمەڵەش، بۆم هەیە بپرسم:

ئەرێ.. بەڕێزم! تۆ کە کۆمەڵە نەبووی.. هێشتا کۆمیتەی هەرێمەکان تەکلیفیشیان لێنەکردبووی ببیتە نوێنەرێکی کۆمەڵە، بە چ حەقێکەوە، لەگەڵ ئەو شەهیدانە، کە خۆیان رابەری بزوتنەوە بون، قسەوباست لەسەر ڕێکخستنێکی ئاوها کردووە، کۆمەڵەش قوتبدەن؟

ئەم قسانە، تەنها یەک راستی دەسەلمێنێ، ئەویش ئەوەیە کە نوسەری ئەو چەند دێڕەو مام جەلال، بەو باوەڕە یەکێتییان دامەزراندووەو بڕیاری شۆڕشیان داوە، کە خۆیان بە خاوەنی کۆمەڵەش زانیووە. چۆنیان بوێ لەکاتی خۆیدا وا لە کۆمەڵە بکەن. بەڵێ بەو خەیاڵە گەڕاونەتەوە. پێش کۆمیتەی هەرێمەکان، حسابیان بۆ سەرکردایەتی پێشووی کۆمەڵەش نەکردووە!! بەڵام کە بۆچونی کۆمیتەی هەرێمەکانو شەهید ئارامیان بۆ پاراستنی کۆمەڵە زانیووە، ناچار بوون، بەرنامەکەیان دوابخەن، هەتا دۆخی گونجاو بۆ بەرنامەکەیان ڕێکدەخەن.

بەش بە حاڵی خۆم، لام سەیر نییە، نەوشیروان وتبێتی باوەڕم بە کۆمۆنیزم نەماوە. یان بە مارکسیزم، یان بە چەپگەراش، ئەمەیان دەچێتە خانەی ئازادی باوەڕەوە. بەڵام ناهەقیەکەی لەوەدا بوو، بەو بێباوەڕییەی بە فەلسەفەکە، پێچەوانەی باوەڕی خۆی، قبوڵی کردوە ببێتە سکرتێری کۆمەڵە. ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی خۆیو مام جەلال، بە ستراتیژێکی جیاواز گەڕاونەتەوە.. ستراتیژێک لەگەڵ ئەوسای ڕێبازی چینایەتی کۆمەڵە، نەدەگونجا. باوەڕی بە فەلسەفەی کۆمەڵە نەبوبێو قبوڵیشی کردبێ هەتا کۆمەڵە هەڵدەوەشێنێتەوە، ببێتە سکرتێری.. کەوابێ: هەموو ئەو ساڵانە بەپێی پیلان هاتۆتە ناو کۆمەڵە، کۆنفرانسەکانی کۆمەڵەشی هەر بەپێی ئەو پیلانە سازداوە، پشوودرێژییەکەی تەنها بۆ ئەوە بووە هەلی دەستبکەوێ، ستراتیژی پیلانەکە بەدەست بهێنێ، ئەویش هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەیە.. کە کردی!!

قەناعەتێکی تریشی لەسەر سەرکردایەتی کۆمەڵە هەبووە، ئاماژەپێکردنی بە گرنگ دەزانم:

"سەرانی کۆمەڵە گەنجی خوێنگەرمو توندڕەو بون، خۆیان بە نوێنەری بیری پرولیتاریاو بزوتنەوەیان بە نوێنەری بیری بورجوازی ئەزانی. لە کتێبە مارکسیەکان دا خوێندبویانەوە. کە شۆڕش بە سەرکردایەتی بورجوازی سەرناکەوێ لەبەرئەوە ئەبێ پرولیتاریا سەرکردایەتی بکا. نەیان ئەشاردەوە کە ئەبێ سەرکردایەتی شۆڕشەکە بە دەس ئەوانەوە بێ".[1]

با شیبانبکەینەوەو ئەم نەوە دووەمەی گەنجو خوێنگەرم، بە نەوەی یەکەمی ئەزموندیدە بەراورد بکەین:

- گەنجی خوێنگەرمو توندڕەو.

- خۆیان بە نوێنەری پرۆلیتاریاو بزوتنەوەیان بە نوێنەری بۆرژوازی ئەزانی.

- لە کتێبە مارکسیەکاندا خوێندبویانەوە کە شۆڕش بە سەرکردایەتی بۆرژوایی سەرناکەوێ.

- نەیانئەشاردەوە کە ئەبێ سەرکردایەتی شۆڕشەکە بەدەست ئەوانەوە بێ.

راستە تەمەنمان زۆر نەبوو، بەڵام تەمەنمان خوار هەژدە ساڵیش نەبوو. شەهید ئارام (٣٠) ساڵ. سالار عەزیز (٢٨) ساڵ. مەلا بەختیار (٢٥) ساڵ. ئازاد هەورامی (٢٣) ساڵ.

با ئەو تەمەنانە بەراورد بکەین بە تەمەنی زۆربەی سەرکردەکانی شۆڕشی ئەیلولو پارتی:

- مام جەلال ساڵی ١٩٥٥ دەبێتە مەکتەبی سیاسی، تەمەنی (٢٢) ساڵ دەبێ.

- عەلی عەسکەری ساڵی ١٩٥٩ دەبێتە سەرکردایەتی، تەمەنی (٢١) ساڵ دەبێ.

- نەوشیروان مستەفا ساڵی ١٩٦٧ دەبێتە یەدەگی کومیتەی ناوەند، تەمەنی (٢٣) ساڵ دەبێ.(*)

لەناو پارتی-قیادە موەقەتە.. بارزانی، سامی عەبدولرەحمان، عەلی عەبدوڵڵا و نوری شاوەیسی لێدەربکرێ، لە مەسعود بارزانیەوە هەتا دوا ئەندامی مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتیان، تەمەنیان (٢٥-٣٠) ساڵ بووە.

لە بابەتەکانی تردا وتومەو کورتەیەکی تریشی لەسەر دەڕۆم. ئایا فەلسەفەو فەلسەفەی سیاسی، تەنها تەمەنو ئەزمونە؟ یان پرۆژەو داهێنانی سیاسیە بۆ قۆناغێک؟ ئینجا چۆنیەتی جێبەجێکردنی پرۆژەکەیە بە دیاریکردنی رێبازی راستو دەربەستبوونێکی

---

١ نەوشیروان مستەفا ئەمین. لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ. ل(١٧١).

* لە (١٥) ساڵیدا، وتاری نوسیووە.

راستگۆیانەشە. هەندێ جار، تەمەن‌و تاقیکردنەوە، بەتایبەتی شکستخواردن، لەبری سودبەخشین، کێشەی نێوان دوو نەوە دەتەقێنێتەوە. نەوەی کۆن، هەر بە مینتالیەتیەتی کۆن، لێیدەخورێ، نەوەی نویش، بە ئەقڵیەتی هاوچەرخ، دێتە مەیدان.

ئێمەی نەوەی دووەم، گوناحمان نییە، نەوەی یەکەمی کوردایەتی، نە هەلومەرج یارمەتی داوون‌و نە خۆیشیان لەئاستی قۆناغەکانی کوردایەتی بوون. شکستیان خواردووە. ئەنجامی سیاسەتەکانیان، گەیشتۆتە ئەو دۆخەی (١٩٧٥-١٩٧٨) دوای (٣٠) ساڵ لە دامەزراندنی پارتی‌و (١٤) ساڵ شۆڕشی ئەیلول، لەگەڵ نەوەی دووەمی سیاسەتدا یەکسان بنەوە. واتا: نەوەی یەکەمی شکستخواردووی پارتی-شۆڕشی ئەیلول-جەلالی-مەلایی، لەگەڵ نەوەی دووەمی شۆڕشی نوێ-شۆڕشی گوڵان هاوتا بونەتەوە. ئاسەوار رابوردویان، هەڵە و شکست بەسەریا زاڵە!

سەربەرزیی بوو، نەوەی یەکەم، نەک سەربەخۆیی، بەڵکو تەنها، دوو حیزبیان هەرەس پێ نەهێنایە. کە سەرکردایەتی نەوەی یەکەم، دوو حیزبیان هەڵوەشاندبێ (هەردوو باڵی پارتی).

- باڵی مەکتەبی سیاسی-جەلالی- ساڵی ١٩٧٠.
- باڵی بارزانی-پارتی- ساڵی ١٩٧٥.

ئیتر رەخنەی چی لە نەوەی دووەم لەسەر کەمئەزمونی‌و تەمەنی کەم دەگرن؟ هەردوو ئەو حیزبەیان، هەڵوەشاندەوەو هەڵوەدای هەندەران بوبوون.

لە دوای ١٩٧٦یشەوە، کە یەکێتی‌و پارتی دامەزراوون. شۆڕشی نوێ-گوڵان، بەرپا کرا، نە رابوردوی نەوەی دووەم‌و نە بە بڕیاری نەوەی دووەم، شەڕی ناوخۆ هەڵنەگیرسا. بەڵکو، بەهۆی نەوەی یەکەم‌و پێشینەی (جەلالی-مەلایی)و چارەسەرنەکردنی ناکۆکیە سیاسیەکانی دوای هەرەس، دیسان، شەڕی ناوخۆ سەپێنرایەوە.

نەوەی دووەم، لە شۆڕشی نوێدا، پشووی شۆڕشگێڕانەی درێژ بوو. بەرچاویشی رۆشنتر بوو. رقی رابوردوشی نەبوو. بەڵام هەناسەی سیاسی‌و عەسکەری نەوەی یەکەم، کورت بوو. رقی رابوردوشی هەبوو! شەڕی سیاسی‌و شەڕی ناوخۆش، هەر نەوەی یەکەم هەڵیانگیرساندن!!

ئەگەر کۆمەڵەکان، خۆیان بە نوێنەری پرۆلیتاریا زانیبێ‌و پێیان وا بوبێ، بۆرژوازی ناتوانێ سەرکردایەتی شۆڕشی رزگاری بکات.. بە ویژدان، ناهەقمان بووە؟ دوور نا..

هەر مێژووی شۆڕشی ئەیلولو هەرەس.. ئەو قسانەمان ناسەلمێنێ. ئەگەر وا نییە.. ئەگەر بۆرژوازی، وەکو پەنجاکانو شەستەکان، هەر پێشڕەوی کوردایەتین، ئەی کۆمەڵە ساڵی ۱۹۷۰و یەکێتی ۱۹۷۵، بۆ دامەزران؟

سەبارەت بەوەی لە روانگەی پرۆلیتاریاشەوە، ویستومانە سەرکردایەتی شۆڕش بکەین. ئاخۆ.. حیزب هەبێ، بەتایبەتی چەپ، تێنەکۆشێ سەرکردایەتی شۆڕش بکات؟

خۆ کۆمەڵە کە بە نۆرەی خۆی شۆڕشی بەرپاکردووە، هەر ناوی بزوتنەوەی سۆسیالیستی نەبیستبوو. ئیتر بۆ بیشارێتەوە کە سەرکردایەتی شۆڕش بکات؟

سەیرە.. کە یەکێتی دادەمەزرێ، کۆمەڵە دەبێتە ئەندامی یەکێتی. بەڵام بزوتنەوە، بەپێی قسەی مام جەلال:

"بۆ یەکەمجار لەوێدا دو پێشنیاز باس کرا و قبوڵکرا، لەوانە قبوڵکردنی بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستانی لەناو ریزی یەکێتیدا، هەروەها دانانی سکرتێری گشتی بۆ یەکێتیو فەرماندەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان. من بە سکرتێری گشتیو عەلی عەسکەری بە فەرماندەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان هەڵبژێراین".[1]

دوای ساڵێکو دوو مانگ لە دامەزراندنی یەکێتی، بزوتنەوە قبوڵ دەکرێ. دەی "کاکە نەوە!" دەیەوێ کۆمیتەی هەرێمەکان، زیاتر لە ساڵێک لە خەڵوەتدا بمێنێتەوەو باسی سەرکردایەتی شۆڕش نەکات.. هەتا بزوتنەوە لە یەکێتیدا قبوڵ دەکرێن!! بەڵکو بە هاوتایی شۆڕش بکەن!! بە مەرجێ هەر نەشزانرابێ بزوتنەوە دروست بووە!

رەخنەگرتن، دوای ساڵەها لە روداو، قورسترە لە رەخنەگرتنی دەستبەجێی روداو. چونکە دوای ساڵەها، نوسەر یان رەخنەگر، دەبێ زەمانو زەمینەی روداو، چۆنیەتی روداو، کاریگەری رێڕەوی روداو، تەواوی بەشدارانی روداو، هەموو لەبەرچاو بگرێ. لەکاتێکدا، رەخنەی دەستبەجێی روداو، دۆخی روداوەکە دیارە. گەرچی لەوکاتەشدا، روانگەی رەخنەکان لە روانگەیەکەوە بۆ روانگەیەکی جیاواز، دەگۆڕدرێ. تەنانەت ئەوانەی لەناو روداوەکانن، لەگەڵ ئەوانەی لەدەرەوەی روداوەکانن، وەکو یەک رەخنە ناگرن. وەکو یەکیش روداوەکە نابینن.

روداوێکیش، لایەنێک، یان چەند کەسایەتیەک، کاری ناڕەوا، یان تاوانیان لەناویا ئەنجامدابێ، کەمتر بۆچونەکانیان بەهەند وەردەگیرێ. چونکە کەمجار لەمێژوودا، تاوانبار، راستگۆیانە دان بە تاوانەکانیدا دەنێ.

---

١ مام جەلال. دیداری تەمەن- لە لاوێتیەوە بۆ کۆشکی کۆماری. ئامادەکردنی: سەلاح رەشید. ل(٧٨).

نەوشیروان، هەر لەسەرەتاوە، بە باوەڕنەبونی پێشوەخت، بە کۆمەڵەو مارکسیزمو چەپ، گەڕاوەتەوە. کە گەڕاوەتەوە، کێشەکەلی ناو شۆڕشی دیووە، هەر زوو ویستویەتی هەڵەی لایەنەکانی کێشەکە (کۆمەڵەو بزوتنەوە) وەکو یەک تەماشا بکاتو دادگایی بکاتو چۆنیەتی حوکمدانەکەش، لە باوەڕی خۆیەوە، بکاتە پاڵپشتی ئەو بۆچونانەی پێشوەخت هەیبووە، لەسەر کۆمەڵەو مارکسیزم.

دوای ئەوەی دەبێتە (نەوشیروان مستەفا ئەمین)ی سکرتێری کۆمەڵە، ئەم زاتە بیری دەچێتەوە (٧) دانە ساڵ، لە خەمو پەژارەی کوردایەتیو کۆمەڵەدا دوور بووە. لە شۆڕشی ئەیلولدا، وتارێکیشی دژی بەعس نەنوسیووە. چونکە پارەی کەسوکاری لەڕێی عێراقەوە بۆ ڕۆشتووە. باشترین بەڵگەش، کە دژی عێراق لەو ماوەیەدا نەجولاوە، ئەوەیە کە پاسپۆرتەکەی لەڕێی سەفارەتەوە گۆڕیووە. سەفارەتیش پاسپۆرت بۆ دوژمنەکانی ناگۆڕێ!

هەلومەرج دەگۆڕدرێ، مام جەلال پەیوەندی پێوە دەکات، لە شەو و ڕۆژێکدا دەبێتە ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی، واتا: ئەگەر مام جەلال هاوڕێی نەباو بانگهێشتی نەکردبا بۆ دامەزراندنی یەکێتی، کۆمەڵە پەیوەندییان پێوە نەدەکرد.(*) بەڵگەش ئەوەیە، ئەو ساڵانەی لەدەرەوەدا بووە، کۆمەڵە بۆ یەک جاریش پەیوەندی پێوە نەکردبوو. پەیوەندیشی پێوە نەکرابا، ئەوپەڕەکەی بڕوانامەی دکتۆرای هێنابا. ڕەنگبوو دوای ڕاپەڕین، وەکو سەدان خاوەن بڕوانامەی دیکە، هاتبایەتەوە. یان وەکو جەمال نەبەز هەر نەگەڕابایەتەوە. بەڵام کە دەکرێتە دەستەی دامەزرێنەرو پاشان سکرتێری کۆمەڵە، بەرە بەرە ڕابوردوی بیردەچێتەوە. ئەو ڕابوردوەی جەلالی، کە کۆمەڵە لە دامەزراندنەوە ڕەتیکردەوە. ڕابوردوی گۆڤاری ڕزگاری، کە هەرگیز کۆمەڵە، شانازییان بە ڕەوتی ڕۆژنامەکەو گوتارە پیاهەڵدانەکانی بەعسو، قووڵکردنی شەڕی جەلالی-مەلایی نەدەکرد. تەنانەت لەدوای ڕاپەڕین، خۆیشی چاپی نەکردەوە. بەڵکو وتاربژێری وتارەکانیشی نەکرد، کە لە گۆڤاری ڕزگاریدا، بڵاوی کردبونەوە. چونکە دەیزانی زادەی شەڕی ناوخۆی پاڵ حکومەتی بەعسن. بەڵکو زۆربەی وتارەکان ڕووی خوێندنەوەیان نەبووە!

* ئازاد خۆشناو بۆی گێڕاوینەتەوە کە: مام جەلال سەرەتا ناتوانێت قەناعەتی پێ بکات. ئازاد خۆشناو چۆتە لایو بڕوای پێبهێنێ! بەمیش ڕازی نەبووە. هەتا دیسان مام جەلال قەناعەتی پێکردووە!

## ( ١٤ )

# دانوستانی بێهودە!

لە هەر بەشێکی کوردستاندا، کە شۆڕش بەرپاکرا، هەتا راپەڕینی گەلانی دیکەی ئەو وڵاتانەی کوردستانیان لەناودا دابەشکراوە، بەرپانەکرێ، دانوستان رەتناکرێتەوە. بۆ؟

چونکە سروشتی خەباتی چەکداریی کوردستانی گەمارۆدراو، وایە، لە کوردستانەوە بەتەنها حکومەت مەحاڵە بڕوخێندرێ. کە حکومەت نەڕوخێ‌و راپەڕینی گەلانیش بەرپانەکرێ، دۆخی ئەوتۆ دێتەپێشەوە، دانوستان رەتناکرێتەوە. بەتایبەتی ستراتیژی هێزە کوردستانیەکان، لە وڵاتانی داگیرکەری کوردستاندا، ستراتیژێکی نەزۆکە.. ئەویش دیموکراسی بۆ ئەو وڵاتانەو کوردستانی ئۆتۆنۆم. تا ئێستا ترۆتسکی راستی گوتووە کە: بۆرژوازی وڵاتانی دواکەوتوو، ناتوانن دیموکراسی بەدی بهێنن. سەدەیەکە ئەو بۆچونە راست‌و دروستە! دانوستانیش لەسەر بنەمای دیموکراسی بۆ عێراق، ئینجا ئۆتۆنۆمی بێتەدی، لە بنچینەدا، ستراتیژێکی هەڵە بووە. چونکە ئۆتۆنۆمیەکە گرێدراوی دیموکراسی بەدیهێنانە لەناو وڵاتانی داگیرکەر، وڵاتی داگیرکەریش، خۆیان شۆڕشی دیموکراسیان نەکردبێ، چۆن لەسەر داخوازی کورد، یان لەژێر فشاری شۆڕشی کوردستاندا، دەبنە دیموکراسی؟

لە سەدەی نۆزدەهەمەوە، راپەڕینی چەکدارانە نییە، سەردارانی کورد، بە دڵخواز، یان بە ناچاریی، پەنایان بۆ دانوستان نەبردبێ. بەدرێژایی ئەو مێژووەش خەباتی رزگاری کوردستان، لە هیچ دانوستانێکدا، لە قەڵەمڕەوی عوسمانیەوە، هەتا دەگاتە قاجاری، مەلیکی، کۆماری‌و ناسیونالیستی، لە دانوستانەکاندا نەک مافی سیاسی کوردستانیان، لە قوناغە جیاوازەکانی کوردایەتیدا، نەسەلماندووە، بەڵکو ئەگەر غەدریان لە سەردارانی کورد نەکردبێ، لە باشترین حاڵەتدا، لەگەڵ بەڵێنەکانیان راستگۆ نەبون. تەواوی دانوستانەکان بۆ مانۆڕی فێڵکردن بووە لەگەڵ کورد!

لە سەدەی نۆزدەهەمدا، سەرداری هەڵکەوتوو، شێخ عوبێدوڵڵای نەهری، بۆ گفتوگۆ، سەردانی ئەستەنبوڵی کرد. پێشوازییەکی شاهانەیان لێکرد.. بەڵام هیچیان بۆ نەکردو دەستبەسەر هێشتیانەوە، هەتا بە پاسپۆرتی ئەرمەنیەک، لەڕێی دەریاوە، هەڵهات‌و گەیشتە ورمێ‌و پاشان هەکاری.

"لەئەنجامی ئەم هەولانەو لەژێر فشاری زلهێزەکان بۆ سەر بابیعالی دەسەلاتدارانی عوسمانی بڕیاری دەستگیرکردنی شێخ عوبێدوڵلایان دەرکرد، و لە تەموزی ۱۸۸۱دا توانیان ناچاری خۆبەدەستەوەدانی بکەن‌و گواستیانەوە بۆ ئەستەمبوڵ. لەوێ لەسەر ئاستی فەرمی‌و میللیدا وەک میوانێکی ئازیز پێشوازی لێ کرا، بەلام زۆری پێنەچوو بۆی روون بۆوە کە ئەو دەست بەسەرە".(1)

لە رۆژهەلاتی کوردستاندا، سمکۆی شکاک، سەرەڕای هەڵەی جۆراوجۆر، بەتایبەتی بە فێڵ کوشتنی (مار شەمعون)ی رابەری ئەرمەنەکان، بەلام راپەڕینەکەی حکومەتی شای هێنابووە گیروگاز. داوای گفتوگۆیان لێکردو تێکەوت؛ بەبێ مشور چووە شوێنی دانیشتنەکە، وەکو خووی هەمیشەیی عەجەم، خۆی‌و هاورێکانیان شەهید کردن.

لە باشوری کوردستاندا، چەندین جار شێخ مەحمود لەگەڵ ئینگلیزو حکومەتی پاشایەتی کەوتە دانوستاندن، لە دوائاکامدا، تەنها بەوە قایل بوون هەندێک مافی کولتوری بە کورد بدەن‌و خۆیشی دەستبەسەر لە گوندی پیران-داری کەلی دانیشێ‌و هەقی بەسەر سیاسەتەوە نەمێنێ. بە ناچاریی شێخ رازی بوو. بەلام کە راپەڕینی ۱۹۳۰/ی بەردەرکی سەرا بەرپا بوو، شێر لە بێشە دەرئەپەڕی‌و لە خانەقینەوە هەتا زاخۆ، داوای سەربەخۆیی کوردستانی کردەوە. لەمەشیاندا سەرنەکەوت‌و دوورخرایەوە بۆ تاراوگە. بەلام حکومەتی عێراق، وەکو شای ئێران، غەدری کوشتنیان دژی شێخ ئەنجام نەدا.. گەرچی چەندین جار شێخ دانوستانیشی لە بەغدادو شوێنی جیا جیادا، لەگەڵدا کردون.

لە کۆتایی جەنگی دووەمی جیهاندا، دوای لەدەستدانی هەل، کۆماری مەهاباد راگەیەندرا. کە جەنگ راگیرا و پەیمانی ئەتڵەسی ۱۹٤٥ مۆر کرا، شورەوی بەرژەوەندی نێودەوڵەتی، بەتایبەتی لە رۆژهەلاتی ئۆروپادا کردە ستراتیژی سەردەمەکەو پشتی کردە شۆڕشەکانی: یۆنان، ئیسپانیا، ئازەربایجان‌و کوردستان. ستالین، لەو دۆخەدا دەریخست، سیاسەکی پراگماتیکیە(*) نەک ئینتەرناسیۆنالیستی. لەوساوە دەبوایە کۆمۆنیستەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست لەو سیاسەتە تێبگەن، بەلام بەهۆی پاشکۆیەتی‌و شانازی پێوەکردنی سەرکەوتنی لەشکری سوور، بەسەر نازیزمدا، نەک کۆمۆنیستەکانی

---

١ د.سەعدی عوسمان هەروتی. بزاڤی رزگاریخوازی نیشتیمانی لە کوردستانی رۆژهەلاتدا (۱۸۸۰-۱۹۳۹ز). هەولێر-۲۰۰۷. بلاوکراوەی کۆری زانیاری کوردستان. ژمارە (۳۰). ل(۲٥).

د.کمال مظهر. دراسات في تاريخ ايران. (ص(۲۳۹-۲٤۰).

* پراگماتیک.. فەلسەفەیەکی سیاسییە، پشت بە قازانجی مادی‌و دەسەلاتداریتی دەبەستێ، بەس!!

رۆژهەڵاتی ناوەڕاستو دونیا، بەڵکو هێزە کوردستانیەکانی هەر چوار بەشەکەی کوردستانیش، گەوهەری هەڵگەڕاوەی سیاسەتی ستالین-شورەوی، فەرامۆش کردو بۆربۆڕێنیان بوو، هەتا شورەویش روخا، شورەوی رازی بکەن. ئەمە لەکاتێکدا، چەپو بیرمەندانی رۆژئاوا، لەکۆتایی پەنجاکانەوە لە ستالینو شورەوی تێگەیشتنو لە شەستەکانیشەوە زۆرترین حیزبی مارکسستی لە رۆژئاوادا، هەڵوێستیان دژی شورەوی وەرگرت. تەنانەت پیاچونەوەش بە فەلسەفەی کۆمۆنیزم دەستپێکرد. بەتایبەتی دژایەتی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریاو نەبوونی دیموکراسی لە رۆژهەڵاتی ئۆروپا، درانە بەر رەخنەی فەلسەفی.

سەرکردەکانی کورد، هەمیشە کوشتەی ئەوەن حکومەتە گەورەکان، رازی بکەن. یان ببینن. هەر حکومەتێک بوبێ! ئەمە بەشێکی سایکۆلۆژیەتی سیاسی سەرکردەکانی کوردستانە، بەبێ گوێدان بە سیاسەتی ئەو حکومەتانە بەرامبەر کورد خۆیشی!

پێشەوا قازی، پێشتر کە کۆمار بەهێز دەبێو شورەوی پشتیوانی دەکات، سەردانی تارانی کردبوو، بە ئەقڵێکی سیاسی گەورە، لەگەڵ کاربەدەستانی تاراندا، گفتوگۆی کردبوو. ئێستاش هۆکاری ئەو دیدارە، چی بووەو بۆچی دیدارەکە هیچی لێ سەوز نەبوو، هێشتا بنجو بنەوانی ئەو گفتوگۆیە، کە لەوکاتەدا زۆریش گرنگ بوو، سەرۆک کۆماری کوردستان کاربەدەستانی ئێران ببینێ، وەکو پێویستە توێژینەوەی لەسەر نەنوسراوە. کە پێموایە، شورەوی، یان ئەمریکاو بەریتانیا، دەیانتوانی چارەسەرێک بۆ ئەو کێشەیە بۆ کوردستانو ئازەربایجان، لەسەر ئاستی سیستەمو دەستوردا، بدۆزنەوە. بەتایبەتی چارەنوسی ئێران لەو دۆخەدا، بەدەستیانەوە بوو! بێگومان رەنگدانەوەی پۆزەتیڤی بۆ سەرانسەری ئێرانیش، جێدەهێشت. بەڵام لەو هەلومەرجەدا، زلهێزەکان تەنها کێشەگەلی گەورەیان مەبەست بوو، نەک بچوکتر. نەیاندەزانی، هێشتنەوەی ئەو کێشانە بە چارەسەرنەکراوی، دەبنە ماکی سەرهەڵدانەوەی کێشەی جۆراوجۆری بەردەوام، تەنانەت سەلەفییە توندڕەوەکانیش لە سییەکانەوە سودیان لێوەرگرت!! لە ئیسپانیاش، شەڕی ئەهلی بەرپا بوو. ئازەربایجان، ئێستاش هەڵنەسایەوە. کوردستانیش بە داگیرو دابەشکراوی مایەوە. تەواوی ئەم کێشانەش، نابڕێنەوەو سەریشهەڵدەدەنەوە!

ئەوەی لە کۆماری مەهابادا، هێشتا تیشکی لێکدانەوەی هەمەلایەنەی نەخراوەتەسەر، ئەوەیە، کە بۆچی پێشەواو دیموکرات، بەوە رازی بون، جەنگی دووەم تەواو دەبوو، لە کۆنگرەکانی یاڵتاو تاراندا، بڕیاری کشانەوەی هێزەکانی هاوپەیمان لە ئێران درابوو،

بۆچی بەبێ دەستەبەر، بەبێ ڕێکەوتن، کۆماری کوردستانو ئازەربایجان ڕازی بوون، لەو کۆتاییەی جەنگو لەکاتێکدا ڕێکەوتننامەی نێودەوڵەتیش مۆرکرابوو، بۆ چۆڵکردنی ئێران، کەچی بەقسەی شورەوی، کۆمارەکانیان ڕاگەیاند؟! ئەم بڕیارە لەو دۆخەدا، بەبێ دەستبەرو پەیمانی شورەوی بۆ پاراستنی کۆمارەکان، نیشانەی ئەوەیە، پێشەوا و پیشەوەر، مەترسیەکانی بڕیارەکانی کۆنگرەکانی (یالتا-ڕوسیا)و (تاران)یان لەبەرچاو نەگرتووە. کە ئەو کۆنگرانە بە ئامادەبوونی سەرۆکی زلهێزەکانیش سازدرابوون! تەنانەت هاوکاریو یارمەتیەکانی شورەوی بۆ هەردوو کۆمار، کەمبایەخ بووە. ئەمە لەکاتێکدا شورەوی لە ڕووی تەکنەلۆژیای جەنگەوە وڵاتێکی زەبەلاح بوو، لەشکری سوور، ئەڵمانیای نازی تێکوپێک شکاندبوو. داستانی ستالینگرادو گرتنی بەرلینو کوشتنی هیتلەری تۆمار کردبوو.

ستالین توانی، ڕۆژهەڵاتی ئۆروپا، بە بەشێکی ئەڵمانیاو بەرلینی پایتەختیشەوە، بخاتە ژێر هەژمونی شورەویەوە، تۆ بڵێی نەیتوانیبێ، یارمەتی کۆمار بدات.. یان هیچ نەبێ، پێشەواو هاوڕێکانی لە مردنو خەڵکی ئازەربایجان و کوردستانیش لە مەینەتی ئەرتەشی شا، بپارێزێ؟!

ئەو ڕوداوانە دەریدەخەن، کە زلهێزو ڕابەرە گەورەکان، بەرژەوەندیان چی بخوازێ، لەکاتی جەنگو ئاشتیدا، هەر ئەو بڕیارانە دەدەن. نە وڵاتانی سۆسیالیستیو نە سەرمایەداری، لەبەرامبەر بەرژەوەندیاندا، گوێ نادەنە سۆسیالیزمو دیموکراسیو مافی چارەنوسی گەلان. شورەوی لە جەنگی دوەمدا، کۆماری کوردستانو ئازەربایجانی فرۆشتو گوێی نەدایە سۆسیالیزمو مافی گەلان. ئەمریکاش لە شۆڕشی ئەیلولدا، بۆ بەرژەوەندی خۆیانو ئێران لەکەنداودا، هەمان سیاسەتی پەیڕەو کرد، گوێی نەدایە دیموکراسیو مافی گەلان! سەرکردایەتی سیاسی کوردایەتیش، تا ئێستاش، لەبەرامبەر داگیرکەراندا، هەر عەوداڵی پەیوەندین بە زلهێزەکان.. گەرچی هێشتا، دەستەبەری نێودەوڵەتیش بۆ مافی چارەنوسی کوردستان، لەئارادا نییە!

باشوری کوردستان، لە شۆڕشی ئەیلولدا، کانگای دانوستانە لەگەڵ حکومەتە یەک لەدوای یەکەکانی عێراق. لە زەمانی مەلیکەوە هەتا ئێستای کازمیش. جگە لە بەیاننامەی ٢٩/ی حوزەیرانی ١٩٦٧، کە هەندێک مافی کولتوریو ئیداری بۆ کورد سەلماندبوو، بەیاننامەی ئازاری ١٩٧٠ گرنگترین بەیاننامەی مێژووی کوردایەتیو داگیرکەرانی سەرانسەری کوردستانە. بەیاننامەکە نەگەیشتە مۆرکردنی ڕێکەوتن، بەڵام ڕوداوێکی

گەورە بوو، نەک لەڕووی داننان بە مافە سیاسیو کولتوریەکانی کوردستان، بەڵکو کێشەی کوردی، لە کێشەیەکی ناوخۆییەوە هەڵبڕی بۆ کێشەیەکی بالاتر، کە شورەویو گەلێ وڵاتی تر، پشتیوانییان دەکرد. سەرەڕای ئەم راستیەش، گەرچی پارتی بیانوی دەدا بەدەستەوە بۆ شەڕپێفرۆشتنەوەی عێراق بە کورد، بەڵام لەگەوهەردا، رژێمی بەعس، سروشتە ناسیۆنالیستیە-شۆڤێنیستیەکەی، رێگەی نەدا بەیاننامەکە وەکو لە مەتنەکەیدا هاتبوو، دوای چوار ساڵ بگاتە رێکەوتنی ئۆتۆنۆمی.

هەر رژێمێکی ناسیۆنالیستی، کە نەتوانێ چەشنی رۆژئاوا، دەوڵەتی نەتەوە-دیموکراتی دروست بکات، مەحاڵە بتوانێ کێشەی نەتەوایەتی چارەسەر بکات. چونکە، چارەسەرەکردنی کێشەی نەتەوایەتی، یان جیابونەوەیە لە دەوڵەتی داگیرکەر، یاخود چارەسەری دیموکراسییە لەناو هەمان دەوڵەتدا.(*)

رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، سەراپا بۆ دەوڵەتی نەتەوە-دیموکراتی وەرنەچەرخاوون. رەگەزەکانی حوکمڕانییان، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا چەقی بەستووە. ئەم چەقبەستنە، لەڕووی فەلسەفەی سیاسییەوە، بەربەستە لەبەردەم بونیاتنانی سیستەمی دیموکراسی. کە تا ئێستا، حکومەتە ناسیۆنالیستە پریمیتیڤەکانی (سود نەبینین لە گەشەی کولتوری) عەرەبو تورکو فارس، ئەو بەربەستە دژە دیموکراسیەیان نەشکاندووە. بۆیە، سەرەڕای ئەوەی عێراق، کانگای دانوستانە لەگەڵ راپەڕینەکانی کوردستان، بەڵام هەمویان ناکام بوون. تائێستاش کە دەستوری هەمیشەیش هەیە، مەترسی ماوە!!

حکومەتەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، کە نەک بەربەستەکانی بەردەم دیموکراسی لانابەن، بەڵکو سفتو سۆڵتریشی دەکەن؛ ئەو حکومەتانە سیاسەتی حوکمڕانی گرێی ئاینو مەزهەب دەدەن؛ بەناوی پیرۆزییەکانیشەوە، بە زەبروزەنگ دەیسەپێنن. بەڵێ.. مەترسیەکی ئێجگار گەورەیە، لەوە قووڵنەبینەوە کە رەگەزەکانی توندوتیژی، تا رادەی فاشیزمی کۆمەڵایەتی-سیاسی، تەنها ئەوکاتانە هەستی پێناکرێ، کە دەسەڵاتەکان زەبروزەنگ دەگەیەننە چلەپۆپەی دڕندەیی. هەرگیز نەخێر. زەبروزەنگی دڕندەیی، لە کولتور، نەریت، کۆهەست، رەفتارو سایکۆلۆژیەتیشدا رۆچووە. تەنانەت، بەئاسانی، پێش

---

* لە کەنەدا کێشەی کبکیەکانو لە بەریتانیا کێشەی ئیرلەندیو سکۆتلەندەیەکان، دەیان ساڵ بە چارەسەرنەکرای، دوای سەرکەوتنی دیموکراسیش، ماوەتەوە. بەڵام مافە دیموکراسیە-مەدەنیەکانی ئەو سێ گەلە، لەدەستوردا، دەستەبەرە. ئازادیشیان بۆ ریفراندۆم هەیە. بزوتنەوەی نەتەوایەتی بەهێزی مافە دیموکراسیو ئابوریەکانەوە، لەو وڵاتانە لاواز بووە، بۆیە لەکاتی ریفراندۆمدا، رێژەی دەنگی پێویست بۆ سەربەخۆیی ناهێنن.

هاتنه سەر حوکم، ئەندێشەی دڕندەیی، ڤایرۆس ئاسای ڕیشەکێشنەکراوی فاشیەت دەگواسترێتەوە ناو ئایدیۆلۆژیا، ئایدیا، فەلسەفەی دەسەڵاتو یاساش.[*] هەڵەیەکی گەورەیە وابزانرێ تەنها لە وڵاتە سەرمایەدارە پێشکەوتوەکاندا فاشیزم سەرهەڵدەدات. گوایە لە وڵاتانی دواکەوتودا، بە تایبەتمەندی جیاوازەوە، فاشیەت سەرهەڵنادات. ئەمەیان دوور لە لۆژیکی ئەقڵو هاوکێشە کۆمەڵایەتیە دواکەوتوەکەی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، کە ئاینو مەزهەب، لە تەواوی جومگە کۆمەڵایەتیو سیاسیو کولتوریەکانیدا، بنجی داکوتاوە. بۆیە، سیستەمەکان کە نەبنە دیموکراسی، بەڵام لەکاتی مەترسی بۆ سەر دەسەڵاتەکانیان، بەئاسانی دەبنە فاشیستی. فاشیەتێکیش، زۆرجار دەخرێتە قاڵبی پیرۆزیەکانەوە. مەترسی ئەم فاشیانە، لەم پیرۆزاندنەدایە. هەموو پیرۆزییەکی ڕەهای سیاسی، سەرەتایە بۆ فاشییەت!

## ( ١٥ )
## یەکێتیو ناکۆکی هەڵوێست!

لەناو ئەو ڕیزەوەدا، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، لەساڵی ١٩٧٧وە، لەناو مەنگەنەی سیاسەتێکی ناکۆکو نەکۆکدا، سەبارەت بە دانوستان بڕیاری داوە.

لە ساڵی ١٩٧٧وە، دوای ساڵێک لە بەرپابونی شۆڕش، گەرچی یەکێتی لە دامەزراندنەوە، دروشمی ڕوخاندنی بەعسی بەرزکردۆتەوە، گفتیشی بە سوریاو لیبیا بۆ ڕوخاندنی ڕژێم، دابوو. بەڵام لەم قۆناغەدا، گەرچی سەدان چەکداری خێڵەکی، کە بە هەڵە لە سەرەتای دەستپێکردنی شۆڕشەوە، بە پاساوی فشاری چەکداری لەپێناو دانوستانێکی نیوەچڵی بۆ مافێکی کەم، هەڵخرێنرابوون (تعبئة)، بە گەڕانەوەی مام جەلالو کۆبونەوەکانی سەرکردایەتیو ڕێکخستنەوەی ئۆرگانەکانی یەکێتی، حکومەت، مانۆڕی دانوستانی هێنایەپێشەوە؛ یەکێک لە ئامانجەکانی ئەم مانۆڕەی دانوستانی حکومەت، لەو دۆخەدا، بۆ ئەوە بووە کە یەکێتی لەبەرچاوی سوریا–لیبیا–فەلەستینیەکان بخات. چونکە یەکێتی گفتی پێی دابوون، تا ڕوخاندنی بەعس، شۆڕشی عیراقی هەڵگیرساو لە چیاکانی

* لە خولی کادراندا (١٩٨١) بابەتم لەسەر فاشیزمی ڕۆژهەڵاتی پێشکەش کردووە. ساڵی ١٩٨٥یش، توێژینەوەیەکم لەسەر فاشیەتی وڵاتانی دواکەوتوو نوسی. کە یەکێتی هاتنە سەرمان لە تەکیە، فەوتاندیان. هەروەها، لە سێهەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەشدا، باسی فاشیەتی دواکەوتوو کرا. لە تەواوی نوسینەکانم (١٩٨٥-١٩٩٣) ڕژێمی عیراقم هەمیشە بە فاشی وڵاتانی دواکەوتوو زانیووە. لە (٢٠١٥/١٠/٢٥) لەبەرلین کۆڕم لەسەر فاشییەت هەبوو!

کوردستانەوە، بەردەوام دەبێ. بۆ مێژوو، مام جەلال دژی دانوستان بوو. رایشی وا بوو، بەعس مافی کورد نادات. بەڵام لەم دۆخەدا، لەژێر فشاری بزوتنەوەی سۆسیالیست، کە هەمویان، ئەوانەی لەدەرەوە بونو ئەوانەشیان لەناو شارەکاندا مابونەوە (ساڵح یوسفی، عەلی هەژار، کاردۆ گەلاڵی) لایەنگری بێ ئەملاوئەولای دانوستان بون. بەڵکو ئەوکاتە مەترسی لەسەر یەکێتی ناو یەکێتی هەبوو.

مام جەلال، لەگەڵ گەڕانەوەی، باوەڕی شۆڕشگێڕانەو پشووی درێژی هەبوو. هەوڵی دەدا، بزوتنەوە تێبگەیەنێ، کە دانوستان سودی نییە.. بەڵکو هاوخەباتیی لەگەڵ لایەنە سیاسیەکانی عێراقو ناوچەکە، دوای چەندین ساڵ، دێتە بەر. بەڵام بزوتنەوە، باوەڕیان بەو تێزانە نەبوو. بەردەوام دژی ئەو بۆچونانە دەدوان. تەنانەت پێشیان ناخۆش بوو، مام جەلال چەند هاوڕێیەکی سازمانی ئینقلابی لەگەڵ خۆی هێنابوەوە! هەر لەسەرەتاوە، سەرەتاکانی بێمتمانەیی بە مام جەلال، لای زۆربەی بزوتنەوە، هەستی پێدەکرا. ئەم بێمتمانەییە لەناو روداوەکاندا، هەتا دەهات، پتر پەرەی دەسەند.

بە ناوبژی (شێخ محەمەد لۆلان) یەکێتی عەلی عەسکەری ناردە بەغداد. سەدامیشی دیبوو. بەڵام بە گەڕانەوەی لە چارەسەری سیاسی نائومێد دەبێ. هەتا رادەیەکیش، پرسی دانوستان لەوە بەدوا، پاشەکشە دەکات.

ئەم دۆخە، لەنێوان دوو بۆچونی رەتکردنەوەی دانوستانو بەردەوامیی شۆڕش، هەتا دوای کارەساتی هەکاری بەردەوام بووە. بە شێوازێک، مام جەلال، هەمزە ئاغای قایل کردبوو، وەکو تاکتیک، لەگەڵ کاربەدەستانی عێراق، سەبارەت بە دانوستان قسە بکات. قسەی کردبوو، هاتیشە لای مام جەلال. ئەم هاتنە، تا رادەیەک بزوتنەوەی سۆسیالیستی دابین کردەوە. لەو ماوەیە، مامو مەکتەبی سیاسی هاتنە خڕی ناوزەنگ. هەلێکی باش بوو، ئۆرگانەکانی یەکێتی دابمەزرێن. هەوڵەکەی هەمزە ئاغا، هیچی لێ سەوز نەبوو. بەڵام بۆ مام جەلال گرنگیەکی دیاری هەبوو. لەناو خەڵکو پێشمەرگە، دەرکەوت، حکومەت تەنها لەڕێی مام جەلالەوە ئامادەیە دانوستان بکات. بوژانەوەیەکی کورتخایەن بوو. دیسان ناکۆکی بزوتنەوەو یەکێتی سەریهەڵدایەوە. قووڵتریش.

زۆری نەخایاند، سۆسیالیست دانوستانی لەگەڵ رژێم رێکخستو د.مەحمود عوسمان، چووە بەغداد.(+) ئەمیش بەهەمان ئەنجامەکەی عەلی عەسکەری گەڕایەوە. واتا:

+ شێخ مەنسوری حەفید، پیاوێکی دەستپاکو دڵسۆزی کوردستان بوو. قسەی زۆر خۆشە. کە سۆسیالیست مفاوەزاتی کرد. هاتەلامانو گوتی: ئێمە دەڕزێینەوە، خەمتان نەبێ گیپەی گەرم گەرمتان، بەردەوام بۆ دەنێرین!!

سۆسیالیست دوو جار فشاری دانوستانیان بەکارهێنا؛ جارێکیان، لەناو یەکێتیو جارێکیشیان دوای جیابونەوە، هەردوو جارەکە هیچی لێ سەوز نەبوو.

خەبات بەردەوام بوو. سۆسیالیست پاڵی دایە پارتی. یەکێتیش، پشتئەستور بە خۆی، درێژەی بە خەبات دا. جارێکی تریش (شێخ محەمەدی شێخ عەبدولکەریمو مەلا دەرگەڵەیی) هەر بەناوی گفتوگۆوە هاتن.(*) ئەم هەوڵەش فت!

دیسان، شەڕ و کێشە.. شەڕ دژی رژێمو کێشە لەگەڵ پارتی، سۆسیالیست، پاسۆکو ساغ نەبونەوەی سیاسەتی حیزبی شیوعی، لەنێوان لایەنەکاندا. ناوبەناو لەڕێی حیزبی دیموکراتەوە، هەوڵێک دەدرا. مامۆستا مەلا عەبدوڵلای حەسەن زادە پەیامی دەهێنا.(+) ئەمیش هەر سودی نەبوو.

دوای بزوتنەوە، نەوشیروانو فەرەیدون، هەتا رادەیەک زۆربەی سەرکردایەتیش، پشتیوانییان لە دانوستان دەکرد. بەتایبەتی ملازم عومەر، هەوڵی سەرخستنی دانوستانی دەدا. لەگەڵ ئەوەشدا ملازم عومەر، سەرکردەیەکی خۆڕاگرو پشوودرێژیش بوو. لەم خولەشدا، مام جەلال، باوەڕی بە ئەنجامی دانوستان لەگەڵ بەعس نەبوو. بەڵام فشارەکە فراوان بوو، مام جەلال لە کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسیدا، وتبوی: دژم.. بەڵام بەقسەی زۆرینەش دەکەم.

لەسەر دانوستان، چۆنیەتی بیرکردنەوەی مام جەلالو نەوشیروان، پێویستە رونبکرێتەوە. ئەمەش پەیوەندی بە کەسایەتی سیاسییانەوە هەیە.

لەسەردەمی جەلالیدا، نەوشیروان پێش مام جەلال، بۆ هەڵوەشاندنەوەی باڵی مەکتەبی سیاسی لۆبی کردبوو. سەرەتا مام دەیویست یەکێتیی وەکو حیزبی "کۆمپێنتاگ"ی چین، بمێنێ، کە چەپەکان لەناویدا چالاک بون. بەڵام بۆی نەچووە سەر. کە کۆمەڵەش دادەمەزرێ، نەوشیروان دەڵێ: مام جەلالی تیا بێ، من نایکەم. کە دەشچێتە دەرەوەی

---

* لە شێنێ، من پێشوازیم لێدەکردن. گەیاندمنە لای مام جەلال. یەکەم قسەیان ئەوە بوو، گوتیان: ویستمان نەیەین. مام گوتی: بۆ؟ گوتیان: بیستمان مەلا بەختیار کەمینمان بۆ دادەنێو دژی گفتوگۆیە. تا ئەوکاتە، نەیاندەزانی من مەلا بەختیارم. مام پێکەنیو گوتی: ئەوە مەلا بەختیارە، ناردومانە بۆ پێشوازیتان. پێکەنینو یەکترمان ناسی!

+ ساڵی ١٩٨٢ بەرپرسی مەڵبەندی یەکی سلێمانی بوم. بە جیهازی راکاڵ هەفتانە، لەگەڵ مام، یان نەوشیروان، یاخود ملازم عومەر راستەوخۆ قسەمان دەکرد. رۆژێکیان ئاسۆی شێخ نوریو رەفعەتی مەلاو حەمە فەرەج لام دانیشتبون. ئەندام مەڵبەند بوون. نەوشیروان لە قسەکانیا گوتی: گێلە پیاویان ناردبوو، بەڵام هیچی تازەی پێ نەبوو. برادەران تێنەگەیشتن. وتیان مەبەستی چی بوو؟ وتم: مەبەستی ناردنی مەلا عەبدوڵلای حەسەن زادەیە بۆ دانوستان، کە (گێلە پیاو)ی عەزیز نەسینی وەرگێڕاوە.

وڵات، هەتا مانگی ٥/ی ١٩٧٥، پەیوەندی بە مام جەلالەوە ناکات.. بەم پێشینەیەوە، ئەم دوو سەرکردەیە یەکیانگرتۆتەوە!

نەوشیروان، کەسایەتیەکی بە قابیلیەت بوو. توانایەکی زیاتری لە هەمووموان (جگە لە مام) بۆ لێکدانەوەی روداوەکانو نوسین هەبوو. لە نوسیندا، لە مام کوردی باشتر دەنوسیو مامیش عەرەبیەکەی لەو باشتر بوو. بەڵام سێ گرێ لە کەسایەتی نەوشیرواندا هەبوو:

**یەکەم**: نەخۆشییەکی فیزیکی-سایکۆلۆژی هەبوو، بە دەستی خۆی نەبوو، هەرکاتێک فشاری عەسکەری، یان سیاسی، یان هەر کێشەیەکی تری لەسەر دەبوو، رەشبینیی دایدەگرتو نائومێدیی بەسەریا زاڵ دەبوو. دەیان جار ئەم حاڵەتەمان لێ دیووە. یان لە ژورەکەی نەدەهاتەدەرەوە، یاوەکو بایکۆتی کۆبونەوەکانی دەکرد.. یاخود بڕیاری دەدا، واز بهێنێو شۆڕش جێبهێڵێ.

**دووەم**: بەهۆی تواناکەیەوە، کەمترین گوێی لە ئەندامانی سەرکردایەتی دەگرت. بەڵکو لە کۆبونەوەکاندا، بەرامبەر زۆریان (نەک هەمویان!) رووشکێن بوو. لە هەر گفتوگۆیەکیش بهاتایەتەپێش، ئەگەر بواریشی بدایە رای جیاواز بدرێ، لە دوائەنجامدا، بۆچونی خۆی دەسەپاند. پێشتر لۆبیشی بۆ بۆچونەکانی دەکرد!

**سێهەم**: لە تەنگانەدا ئازا نەبوو. چەند جارێک لێی قەوماوە، لاوازییەکی سەیری پیشانداوە. ساڵی ١٩٧٧ لە چنگیان، جاشیان بۆ هاتووە، لاواز بووە. دوای هەڵهاتنی لای سۆسیالیست، دیسان لە چنگیان، جاش هێرشیان کرد، خۆمی لەگەڵ بوومو شایەتیشم زۆرن، لاواز بوو. هەتا ناردمان بۆ دێی (باراو) خۆمان چوینە پیری شەڕەکە لە نودێ، بۆ رزگارکردنی وەهابو کەرتەکەی. لە شەڕی سەرکردایەتیشدا، شەڕ لە شێنێ بوو، ئەو لە ناوزەنگ لاواز بوو.

مام جەلال، بەقابیلیەتترینی ناو یەکێتی بوو. هیلاکیی نەدەزانی. کۆڵدان بەلایا گوزەری نەدەکرد. بەردەوامیش، پێچەوانەی نەوشیروان، گەشبین بوو. لە تەنگانەدا، بێزادە ورەی بەرز بوو. لەو ساڵانەی لەگەڵیدا بوم، ترسم لێ نەبینیوە. لە کاتی شەڕی شێنێدا، بە سوپای عێراقو ئێران گەمارۆ درابووین، مام مایەی شانازی بوو.. ئەوەندە ورەی بەرزو، ورەی پێشمەرگەشی هێندە بەرزتر دەکرد. دەتگوت لە شایداین. بەڵام مام جەلالیش، هەندێک خەسڵەتی هەبوو، هەتا کۆچی دوایی کرد، وازی لێنەهێنا:

**یەکەم**: تورە دەبوو. لە تورەبوندا، بریاری هەڵەی دەدا.

**دووەم**: بێزادە متمانەی بە نەوشیروان هەبوو، هەرچییەکی لا باس بکردایە، دەیکردە بۆچونی خۆی‌و دەیسەپاند.

**سێهەم**: لە بریارداندا لەسەر مەسەلە چارەنوسسازەکانیش، زۆر جار، بۆچونی خۆی بە تورەبون تێدەپەراند.

**چوارەم**: لەکاتی ناکۆکی‌و شەردا سەرەتا بەشی ئاشتی تیا نەدەهێشتەوەو هەموو شێوازێکی عەسکەری‌و سیاسی‌و پروپاگەندەی بۆ شکاندنی بەرامبەرەکان، دەگرتەبەر!

**پێنجەم**: دەرکی سیاسی زۆر بەهێز بوو، لە کۆبونەوەدا، لایەنی سیاسی، یان هەڤالانی سەرکردایەتی، رستەیەکیان گوتبا، لە باقی مەبەستیان تێدەگەیشت. کەمجارم دیووە، لە مشتومردا لاواز بێ. لە دانوستانی (١٩٨٣-١٩٨٤) لەگەڵ سەدامدا، بێوێنە ئازا بوو![*] لەم کۆبونەوانەشدا، کەمتر گوێی دەگرت.. زۆرتر قسەی دەکرد.

ئەم دوو کەسایەتیە، بیرکردنەوەیان، سروشتیان، قابلیەت‌و باری دەرونیشیان، لە هەموو قۆناغەکانی شۆرش‌و راپەرین‌و حوکمرانیدا، بە خەسڵەتی جیاوازەوە، کاریگەری قووڵیان لەسەر یەکێتی‌و روداوەکان هەبوو. گەلێ جار، نەوشیروان پێشتر، مام جەلالی گۆش دەکرد، پاشان کۆبونەوەکانیان بەرێوەدەبرد.

سەرەرای ناکۆکی‌و جیاوازییان، لە هاتنەوەیانەوە لە شام، هەتا مفاوەزاتی ١٩٨٤-١٩٨٥، لەژێر چەتری یەک ستراتیژدا، بەشی زۆری بریارەکان، روداوەکان، سەرکەوتن‌و ژێرکەوتنەکان، ئەم دوو سەرکردەیە لێیان بەرپرسیارن. لەدوای دانوستانەوە (١٩٨٣-١٩٨٥) لەسەر چۆنیەتی رێکەوتن لەگەڵ بەعس، ناکۆکی قووڵ کەوتە نێوانیانەوە.

ئەوەی بۆ زۆربەمان مایەی سەرنج بوو، هەمیشە مام جەلال پێی وا بوو، دانوستان لەگەڵ بەعس سودی نابێ. کەچی لە دوائاکامدا دەشچووە ژێر بار. لای خۆم وام لێکدەدایەوە کە کێشەکانی ناو یەکێتی لەلایەک، لەلایەکی ترەوە، شەر و ناکۆکی یەکێتی لەتەک لایەنەکانی تر، مام جەلالیان ناچار دەکرد، سەرەرای بێباوەری بە دانوستان لەتەک بەعسدا، بشچێتە ژێر بار! هەموو جارێکیش هەڵسەنگاندنی مام جەلال، لە دوا ئاکامدا، لەمەر بێهودەیی دانوستان راست دەردەچوو.

---

* بە سەدامی وت: بۆ دیموکراسی عێراق‌و ئۆتۆنۆمی راستەقینە هاتوین. بماندەنێ رێکدەکەوین، نەماندەنێ دەچینەوە شاخ، چیمان دژتان کردووە، بەردەوام دەبین. پێشی وت: قبوڵی ناکەین پیمان بڵێن، دێنەوە ریزی نیشتمانی.. هەویەی نیشتمانیی بەخوێنی شەهیدەکانی ئێمە مۆردەکرێ!

لەکاتی کۆڕەوەکەی دوای راپەڕین (١٩٩١) مام جەلال بە سانایی، دوای رەزامەندی سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی، چووە بەغداد. ئەمە لەکاتی تراژیدیای کۆچدا، دونیای دەهەژاند. دەوڵەتانی جیهان، سەریان سوڕما لەو سەفەرە کوتوپڕە.(*) دوای ئەوە، بەرەی کوردستانی درێژەی بە دانوستانەکە دا، مەسعود بارزانیش چووە بەغدادو (٤٨) رۆژیش مایەوە. کە لە بەغداد گەڕایەوە. وەکو ئالای شۆڕش (منو کاردۆو بابەکر دڕەیی) لە شەقڵاوە سەرمان دا. یەکەمین پرسیارم ئەوەبوو: کاک مەسعود (٤٨) رۆژ زۆر نەبوو، لە بەغداد مایتەوە؟ ئەمە حکومەت بە لاوازیی دەزانێ. بەمشێوەیە وەڵامی دامەوە، گوتی:

"مەلا بەختیار.. پارتی لەگەڵ پەلەکردن نەبوین لە راپەڕین. پێشمان باش نەبوو، هێزی پێشمەرگە بێنە ناو شارەکان. یەکێتی پەلەیان کرد. ئەوەتانێ، گەلەکەمان شکان. حیزبەکان شکاین. تەنانەت (٦٠٠) بارزانی جێی باوەڕیشم لەگەڵ خۆم هێنابوو، ئەوانیش زۆربەیان جێیانهێشتین. باوەڕیشم بەوە نەماوە جارێکی تر بچینەوە ناو ئێرانو بۆ بەرگەی عبور، چاوەڕێ بین. بۆیە بەهەرشێوەیەک بووە، رێکەوتنم لەگەڵ حکومەت پێ باشترە". ئەم سیاسەتەش، بەو رادە نەرمیەش لە دانوستاندا، لەگەڵ بەعسدا سودی نەبوو. بەعس هەر بەعسی فاشی بوو. بۆیە دانوستانەکە زیانی کێشەی کوردی تیا بوو. بە ناکامیش کۆتاییهات.

* شەوی کۆڕەوەکە، مام جەلال گەیشتە سلێمانی. لە ماڵی شێخ سالاری حەفید"بووە. کە زانی بەرەنگاری ناکرێ، بڕیاری دابوو شەڕی ناو شار لەگەڵ سوپای عێراق بکرێ. نەیتوانیبوو فەرماندەیەک لەناو کۆڕەوەکەو شکستەکەدا، بکاتە فەرماندەی ئەو شەڕە، من ئالای شۆڕش بوم. ناردبوی بەدوای ئاواتی شێخ جەنابدا، سەری بدەم بۆ ئەوەی فەرماندەیی بەرەنگاریم لە شاردا پێ بسپێرێ. هەتا درەنگانی (ئاواتی شێخ جەناب) بەدوامدا گەڕابوو. نیوەشەو لەماڵی نیانی خوشکی پەیدای کردم. پێی وتم: مام جەلال عەودالتە. بۆ کارێکی گرنگ دەیەوێ سەری بدەی. دەستبەجێ چووم. پێش گەیشتنی من بە چارەکە سەعاتێک، بە ئەزمەڕدا سەرکەوتبوو. هەزاران سەیارەش رێچکەیان بەستبوو، فریای نەدەکەوتم. سەلاح چاو شینم بینی لە ماڵەکە، وتی: زۆر چاوەڕێی کرد.. نائومێد بوو، ئیتر رۆشت. پێم وت: ئاگاداری بکە درەنگ زانیومەو هاتوم. دوای دوو رۆژ، لە گۆخلان بوم، مام (٢٠٠) مەترێک دوور بوو. ملازم عومەری ناردبوو، گوتبووی: من سەری بدەم یان سەرم دەدات؟ سەرم دا، ئەحمەد بامەڕنی لێبوو. بەتەنها دانیشت لەگەڵم. نامەیەکی دامێو گوتی بیخوێنەوە، ئینجا قسە دەکەین. نامەی بەرزان تکریتی بوو. ناوەڕۆکەکەیم بیرە، بە عەرەبی نوسیبوی: (الآن و لیس غداً، زوروا بغداد. الوضع السياسي ملائم. سيد الرئيس يقبل حتى الفدرالية). لە نامەکەدا لوتفێکی زۆریشی بۆ مام نواندبوو. مام وتی: ئەڵێی چی؟ ئەوکاتە برنارد کۆشنەر بە فرۆکە سەیری کۆڕەوەکەی کردبوو. دونیا هاتبووە دەنگ. منیش وتم: تکایە مام جەلال نەچێتە بەغداد. چاوەڕێ بکە. وتی: مەلا بەختیار، دەترسم گەلەکەمان وەکو ئەرمەنەکانی زەمانی عوسمانی لێبێ. نەگەڕێینەوە ولاتی خۆمان. بەیانیەکەی گەیشتە بەغدادو دەستی خستبووە کەمەری سەدام.. هەتا کورد پێی ناخۆشبێ، رەنگدانەوەی سەفەرەکە خراپ بوو لە میدیاکانی جیهاندا!!

نوسەر تەواوی ئەو راستیانە لەمەڕ دانوستان، بەتایبەتی دانوستانی یەکێتیو رژێمی بەعس، دیسان بە گواستنەوەی لە کتێبی (پەنجەکان یەکتر ئەشکێنن- نەوشیروان مستەفا ئەمین) کوتومت نەقڵ کردووە، لەمەشیاندا ئەمانەتی نوسینی زانستی رەچاو نەکردووە. ئاماژەی بە نووسەر نەکردووە.

ئەم چەشنە نوسینانە، وەکو کولاج وان. لێکدانەوەیان تیادا نییە. بەرەنجام نادەن بەدەستەوە. گێڕانەوەیەکی بێچێژی روداوەکانە. تەنانەت لە گێڕانەوەشدا، یان لە گواستنەوەی باسەکانیشدا، بە نائەمینی، بۆچونەکان دەگوازێتەوە. بیر لەوە ناکاتەوە، خوێنەری وشیاری مێژووی نوێ، دەگەڕێتەوە سەر سەرچاوە راستەقینەکە. کە لەراستیدا، نەوشیروان زۆر جوانی نوسیووە. نوسەریش تێکیداوە.

نەوشیروان مستەفا، بەجوانیی باسی یەکەمین دانیشتنیش لەنێوان وەفدی موخابەراتی عێراقو خۆیو مام جەلال، کردووە. تەنانەت ناڕاستەوخۆ، شێوەی ئاخاوتنی مام جەلالی رەخنە لێگرتووە کە دەڵێ:

"مام جەلال بەگەرمی بەخێرهاتنی کردن. سوپاسی د.قاسملۆی کرد. بۆ هەوڵو تەقەلاکانی. ئامادەیی دەربڕی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان بە رێگای سیاسی. بەدرێژی باسی سیاسەتی چەوتی بەعسی کرد بەرامبەر گەلی عێراق بەگشتیو، گەلی کورد بەتایبەتی. ئۆباڵی هەمو روداوەکانی عێراقی خستە ئەستۆی بەعس. خواستەکانی بزوتنەوەی کوردی بۆ رونکردنەوەو، داوای لێ کردن کە ئەگەر بەتەمای گفتوگۆیەکی راستەقینەو سەرکەوتو بن پێویستە هەمو لایەنەکان بەشدار بن. مام جەلال لە قسەکانیدا توندوتیژ بو.

ئەبو ئەحمەدیش ئۆباڵی هەمو روداوەکانی خستە سەر کورد. وتی ئەگەر ئەتانەوێ گفتوگۆ سەرکەوتو بێ سەرۆک ئەڵێ: (ئەبێ چارەی بنەڕەتی هەمو گیروگرفتەکان بکرێو، رێککەوتنێکی ستراتیجی بێ نەک تاکتیکی، با مام جەلال زیاد تەکتەکە نەکا!).

(تەکتەکە): وشەی بە عەرەبی کراوی (تاکتیک)ە. مەبەستی لە تەکتەکە فروفێڵ بو. لای صەددامو سەرانی بەعس وا باو بو: مام جەلال، ستراتیج ئەکا بەقوربانی تاکتیکو، زۆرتر تاکتیکزانە وەک لەوەی شارەزای کاری ستراتیجی بێ. مام جەلال لەم قسەیە توندتر بو، وتی: (ئێمەی فەقیر لەم شاخو داخە چوزانین تەکتەکە چیە؟ صەددام حسێن خۆی خوای تەکتەکەیە!) [1]

---

١ نەوشیروان مستەفا ئەمین. پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن- دیوی ناوەوەی روداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٧٩-١٩٨٣. چاپی دووەم ١٩٩٨-سلێمانی. ل(٢٧٠).

گواستنەوەی گفتوگۆکان، بەو شێوە دارشتنە، ئەوەی شارەزای نوسینی نەوشیروان بێ، دەزانێ ناڕاستەوخۆ رەخنەگرتنە لە تەرحەکان. مام جەلال کەسایەتی یەکەمی یەکێتی بوو. لە بنچینەدا نەدەبوو خۆی بۆ ئەو دانیشتنە لە گۆڕەشێر، لە ١٣/ی تشرینی یەکەمی ١٩٨٢، بەناوبژی د.قاسملو کراوە، ئامادە بێ؛ کە ئامادەش بووە، شێوەی رەخنەکانی لە حکومەت، بەو توندییە کابرای موخابەراتی لەترسی سەدامو بۆئەوەی ماستاویش بۆ سەدام بکات، ناچار کردووە، وەلامی بداتەوە. گەیاندویەتیە ئەوەی بەناوی سەدامەوە بڵێ: با مام جەلال تەکتیکی زیاد نەکات. بەڵێ، مام جەلالیش توند وەلامی داوەتەوە. بەلام لە دوائاکامدا، ئەو شێوازە لە گفتوگۆ، لەقازانجی وەفدی حکومەتە.

لەبەرئەوەی لە هیچ دانوستانێکدا، لەبەر بێسەلیقەیی‌و رەچاونەکردنی ئەتەکێت،(+) بەشداریی پێ نەدەکرا، بۆیە وەکو کەسێکی ئاسایی قسەکانی نەوشیروانی بە خواروخێچی دزیوەو گرنگی ئەو جۆرە قسانەشی لەنێوان بەرپرسە موخابەراتەکەو مام جەلالدا، نەزانیووە.

## (١٦)
## لەبری ستایش، سزا !

دروستکردنی چوار مەڵبەندی یەکێتی (١و٢و٣و٤) بۆ سلێمانی، کەرکوک، رانیەو دەوروبەری، هەولێر، لەخۆیەوە سەریهەڵنەدا. دوو هۆی سەرەکی لەپشتەوە بوو:

**یەکەم**: کە یەکێتی خۆی کردە هێزی پشتیوان، مەترسی گەورە لەسەر سەرکردایەتی پەیدا بوو، یا عێراق پەلاماری بدات، نەکا ئێران داگیری بکات. یان ئێران داگیری بکات، پێش ئەوەی عێراق هێرشی بۆ بکا.

**دووەم**: هەرێمەکان‌و ناوچە رزگارکراوەکان، فراوان بوبوون. سەرەتای زوڵمکردن لە خەڵکو نارەزایی دەستیپێکردبوو. پارەو سەرانەسەندنیش خەریکبوو دەبووە دیاردە! هەرێمەکانیش، بە عەسکەری هەڵهاتوو، هەلاوسابوون.

+ نمونەیەک لە بێئەتەکێتیی نوسەر؛ ئێوارەیەکیان لەلایەن د.مەحمودو قادر جەباریەوە بۆ شام داوەت کرابوین. شفتەیان هێنا. وەجبەی یەکەم بەر نوسەر نەکەوت: دەنگی بەرزکردەوە: (ئەی بەشی من؟) نەوشیروان لێی تورە بوو، پێی وت: سەر سوالکەر، پەلەی چیتە؟ کە بۆیان هێنا، گوێیشی نەدایەو لە ئێمەش زیاتری خوارد. مامۆستا جەعفەریش لە داوەتەکە بوو!

لێدانی خەڵک، بێگاری، وەکو خویەکی شەڕی هەندێک سەرکردە، بەرپرسی عەسکەریو سیاسیو ئیداری لێهاتبوو. زەبروزەنگیان بە ئەشکەنجەدانی جوتیارو فیرار تاقیدەکردەوە. وەکو کۆیلە سەیری خەڵکیان دەکرد.(*) لەدوای بەرپابونی جەنگی عێراق-ئێران، تەمەڵیی ناو بارەگاو خواردنو خواردنەوەش، پەرەی دەسەند. ئەو دیاردە دزێوانە دەگەیشتنە مەکتەبی سیاسی. کۆی ئەو مەترسیو روداوانە، وایان کرد، پەیکەرەی یەکێتیو شۆڕش دەستکاری بکرێو بگونجێندرێ لەگەڵ ئاڵوگۆڕو زاڵبون بەسەر کێشەکاندا. نەوشیروان مستەفا، ئەندازیاری دارشتنەوەی پەیکەرە نوێیەکە بوو. بیرمە، نامەیەکی بۆ مام جەلال، کە سەرپەرشتی هێزی پشتیوانی لە دێی ساوان دەکرد، بۆ ئەو گۆڕانکاریانە نوسیبوو، کە لە تەنگانەدا، بیری باشتر کار دەکات. پرۆژەی نوێی پەیکەرەکەی یەکێتیشی بۆ ناردبوو. مام جەلالیش دابەشی کردە سەر ئەندامانی سەرکردایەتی. بیریشمە، تەنها لەسەر بچوککردنەوەی هەرێمەکان تێبینیم هەبوو. پاساویشم ئەوە بوو کە:

شۆڕش پەرەی سەندووە. جەنگ بەردەوامە. هێزی پێشمەرگە فراوانتر بووە.. پێویست ناکات، هەرێمەکان بچوک بکرێنەوە بۆ تیپ. نەوشیروان ملازم عومەری ناردە لام، قەناعەتم پێ بکات، لەسەر رای خۆم سوور بوم. تاقیکردنەوە دەریخست، بۆچونەکەی نەوشیروان دروست بوو. دوای دامەزراندنی تیپەکان، دینامیکیەتی عەسکەری کاراتر بوون. کێبرکێی باشتریش کەوتە نێوانیان بۆ چالاکی. تاقە زیان لەم تیپانە ئەوە بوو، سەرتیپەکان، لە تەکەتولی نەوشیروان دانران. کە شەڕی ناوخۆش بەردەوام بوو. بەشێکی سەرتیپەکان بە ئاراستەی تەکەتول، کەوتنە وێزەی ئەوانەی هەڵوێستیان جودا بوو. تاک تاکیان، زەبروزەنگی وایان دەنواند، بۆ نوسین ناشێن!! چونکە هەندێک لەو کەسانە، نەماوون!

کە دانرام بۆ مەڵبەندی یەک، دیسان نەمدەویست قبوڵی بکەم. هەر لەسەر تەکلیفی مام جەلالو نەوشیروان قبوڵم کرد. بە راشکاویش گوتیان: هەر هەڤاڵێکی تر بنێرین، دڵنیا نین سەربکەوێ.

---

* لەژیانی پێشمەرگایەتیدا، هەرگیز دەستم لە یەک جوتیارو لە هیچ کەسێک بەرزنەکردۆتەوە. هەتا بەرپرسی مەڵبەندی یەکیش بووم، ئەندامی هیچ لایەکی سیاسیم لەسەر بیروباوەڕ زیندانی نەکردووە.

ڕۆژێکی سەختی ڕێبەندان (٢٠) پێشمەرگەیەک کەوتینەڕێ. دوو ئێستر بار. جیهازێکی ڕاکاڵ. موچەی دوو مانگی پێشمەرگەمان پێ بوو. بە دێهاتی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، کە هێندە هاتوچۆمان کردبوو، شارەزای بوین. لە کانی زەردەوە بۆ بەنوخەڵەف، بێوران، ئەشکان، بیوژێ تا بە سەختی گەیشتینە تاژان،(+) بلکیان، لەوێوە بۆ سورەبان. لەوێشەوە بۆ پارەزان. بارەگای سالار عەزیز، شێخ عەلی، حەمەی فەرەج‌و بەکری حاجی سەفەری لێبوو. ئێوارەکەی دڵگیری هاوسەری سالار، خواردنی بۆ کردبوین. بەیانیەکەی، بە هەورازە بەرزەکەی سازانان پشتی چالاوا(*) سەرکەوتین. ئەمە ناوەڕاستی زنجیرە شاخێکە لە گوندی (قولەگیسکان)ەوە دەستپێدەکات، هەتا دەگاتە شارباژێڕی تەخت. بە شاخی گەڵی‌و سیەریشەوە دەنوسێ. شارباژێڕی سەخت‌و تەخت، لە دێهاتی بەرزنجە جیادەکاتەوە. شوێنێکی هەتا بڵێی خۆشە. دژوارە. بنارەکانی دێهات‌و پڕ کانیاوون. شاخ‌و لوتکەکانیان.. ڕک، قوچ، کوور و چرستانە. ئیتر لەپشتی چنارەوە، بۆ کانی مێ، چاڵە گەورەی قاسم، دێمە درو، سەرکوک، سەرگوڵان، کونە گورگ، نەمامە ڕەقەڵ، بەنگەنەی پارەزان‌و کانی گوێزە سور.. هەتا دەگەیتە پشتی گوێزە ڕەش.. زنجیرەی بەردە سپلەتان، بەردە کونتێ، بۆ پشتی دۆڵپەموو، قوتەی قۆجان، یان مەروان شا.(+)

ئەو دێهاتانە: پارەزان، دۆڵپەموو، چنارە، گوێزە ڕەش، زەلان، هەولۆ، هەرمێلە، دۆڵە توو. قولەگیسکان، گوێزە کوێرە، دۆسەدەرە، ڕەزڵە.. لە بەرکێویشدا: هەر چوار گوندی گوڵان، سەر چوار دۆڵ، ئارووزەر، دەرمیانە، قەڵاتێ.. ئەم دێهاتانە، هەتا دەگاتە تەواوی شارباژێڕ، گورگەیەر، عازەبان، شوکێ، نۆدێ، سیتەک، هۆگەرێنە، بناویلە، شارستێنە، وەڵانە، ئالاسیاو، کانی زرکە، کانی سارد، گەرەدێ، هەرمن، کاژاو، گێڵەرە..

---

+ تاژان: دێیەکی خۆشی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو. هاشمی کەریمی، بەرپرسی بانەی دیموکراتی لێبوو. نیوەڕۆیەک لای ئەو بووم. پیاوێکی جوامێرو کوردپەروەر. یەکێتیشی خۆشدەویست.

* دوو برا لای منو سالار عەزیز بوون. عومەرو عوسمان. دوانە بوون‌و کوت‌ومت لەیەک ئەچون. کە گەیشتینە سورەبان، عوسمان‌و چەند پێشمەرگەیەکم لەگەڵ ئێسترەکان نارد بۆ پارەزان. ئێمەش بە دوو تراکتورەوە بەڕێ کەوتین. دەبوایە عوسمان دوای ئێمە بگات. کە گەیشتم سەیر دەکەم عوسمان لەسەر بانێکە پێشوازیمان لێدەکات. منیش وتم: عوسمان! ئەوە چۆنە زووتر گەیشتن؟! پێکەنی.. تومەز عومەرە، عوسمان نییە!!

+ حاجی مامەندو خانووە قورەکان‌و دەورووبەری، دەبوایە لەڕێی ئالپارێزەوە بچنە سەیدسادق‌و سلێمانی. هیمەتمان بۆ کردن، لە چیای سیەرەوە جادەیان بۆ لێدرا، بەلای باراو، دەچنە شارباژێڕ.. سلێمانی. ڕێگاکە یەک سەعات کورت بوو بۆیان!

تاد، دێهاتی دەوروبەری چوارتا، کونجرین، موبرە، مامە خەلان، تا دەگاتە قرگە، کە وەکو کاروانسەرای پێشمەرگە بوو، بەڕاستی یەکێتی قەرزاریانە. لە شارباژێڕ، چنگیان، هەقە ناو بنریَ (پایتەختی خزمەت!!). هێندەی خزمەتی پێشمەرگەیان کردووە، هەرگیز خەڵکی شار (١٥) ساڵی ڕەبەق بەرگەی دابەشبونی شەو و ڕۆژی پێشمەرگە ناگرن!!

مەڵبەندمان لە حاجی مامەند دامەزراند. بەردەوام کەرتەکانی ١٥/ی شارباژێڕ، لەم دێهاتە گەشتیان دەکرد. مەگەر تەنها خەڵکی گوندەکانی کوردستان بزانن، پێشمەرگە چەند ئەرکیان لەسەریان قورس بوو.

لەبەرامبەر (١٥) ساڵ خزمەتو مەینەت، سەرباری ڕاگواستنو ئەنفالو کیمیاباران. شەڕی ناوبەناوی جەیشو جاش، شەڕی ناوخۆ..تاد. حکومەتی کوردستان، جگە لە جادەوبان، بنکەی تەندروستیو خوێندنگا، هەروا دامەزراندنی بەشێکی جوتیاران، گۆڕانکاری گەورەی لە پاداشتی ئەو هەموو خزمەتو مەینەتە، لەژیانیاندا نەهاتۆتەدی. زۆربەی دێهاتیش، جوتیاران خۆیان ئاوەدانیان کردونەتەوە. بۆیە حکومەت، پێش خەڵکی تری کوردستان، ئێستاش قەرزارباری جوتیارانە. هەتا دوا کێشەیان چارەسەر نەکریَو جیاوازی شارو دێهات، کەم نەکرێتەوە. پیشەسازی کشتوکاڵو سامانی ئاژەڵ نەبرێتە دێهات، حکومەت، هەر قەرزاری ئەو خەڵکەیە. ئەمە جگە لەوەی هێشتا قەرەبووی زیانە مادیەکانیشیان نەکراوەتەوە، لە ڕاگواستنو ئەنفالو کیمیاباراندا.

## (١٧)
## مەڵبەندە پڕ کێشەکان!

سنوری مەڵبەندی یەک، لەولاشەوە سنوری مەڵبەندی چوار-بالیسان. پڕ کێشەترین دوو مەڵبەندی کوردستان بوون. نەک تەنها لەبەر هەڵکەوتە جوگرافی-عەسکەریەکەی، بەڵکو لەبەر بوونی هێزەکانی 'جود'یش. کە تا ئەوساش لە جەنگی سارددا بوین. جارجاریش شەڕی گەرم!

کە گەیشتمە سنوری مەڵبەندەکە، سیاسەتێکم داڕشت، لەگەڵ هەموو لایەنەکانی جود (جگە لە سۆسیالیست کە ڕێکەوتن نەبوو لەنێوانمان) ئارام بوین. تەنانەت سەردانی بارەگای پارتیشم لە دێی چنارە کرد. مامۆستا جوامێر، کە کادری کۆمەڵایەتی بوو، لەویَ بوو، ڕامسپارد ڕێزیان بگریَو پێویستیەکانیان دابین بکات. حیزبی شیوعی پێش ئێمە بە دوو

هەفتە هاتبوونە حاجی مامەند. هاوبارەگا بوین. بەڵام دۆخی سیاسی کوردستان، ئەوسا لەسەر لێواری تەقینەوە بوو. سۆسیالیست هەوڵی دەدا دۆخەکە تێکبچێ. حیزبی شیوعی لەم سنورە راستگۆیانە بێلایەن بوون. ئێمەش رێزمان دەگرتن. کاریگەرییان لەسەر رووداوەکانو خەڵک زۆر کەمبوو. سەیارەی دیکە، بێ رازیبونی ئێمە، قاڵبی سەهۆڵیشی بۆ نەدەهێنان. هێزەکەیان کەم بوو، بۆ شەڕیش کەمتر خۆیان لێدەدا. من زۆرم رێز دەگرتن. بەتایبەتی کچێکی سەلام عادلی شەهیدی لێبوو.. (د.ئیمان) عەرەبی تریش، بەخزمەتیش بوون.

کە سوکە شەڕ لە مەڵبەندی چوار رویدا. لە مەڵبەندی یەکێتیش، دۆخەکە ئاڵۆزا. لێک دڕدۆنگ بوین. کەوتینە خۆمان. زانیاریشمان پەیتا پەیتا بۆ دەهات، کە پارتی-سۆسیالیست-پاسۆک، کەوتونەتە ئامادەباشیوشوێنە گرنگەکانی بەرکێو، جادەی کۆبانیان هەتا نزیکی چوارتایان گرتبوو. حاڵەتی ئامادەباشی شەڕیان وەرگرتبوو! لەبەرامبەردا، بروسکەمان کرد، تیپەکانی مەڵبەند کۆبکەینەوە. یەکەم پلانمان قایمکردنی دێهاتی دەوروبــەری مەڵبەندو دابەشکردنی هێزەکانی بەردەستمان بوو، لە شوێنە گرنگەکان. لە شەوو رۆژێکدا، ئەنجامماندا.

دەوروبەری قووڵە گیسکان، دۆسەدەرە، رەزڵە، گوێزە کوێرمان گرت. قفڵی حاجی مامەند، شاخی "قەڵاتوری یان دۆڵمۆکان" بوو، لەپشتیشەوە "دار مـازواو"ی سەروی دۆڵی پەرخو پشتی رەزڵەی قفڵ دەدا. ئەمانەمان، هەتا دەگاتە هەواری "سازنان" یان قەڵای "کچێو قەڵای کوڕێ"مان.. بە پێشمەرگە تەنیو بە هۆکی تۆکی، سات بە سات راستەوخۆ پەیوەندییان بە خۆمەوە دەکرد. باشترینو قارەمانترین فەرماندەو پێشمەرگەی هەورامان، شارەزوور، شارباژێڕ، سلێمانیو بەرزنجە، بە رۆحیەتێکی بەرز بەرز، لەگەڵ هێزێکی میوانی مەڵبەندی دوو، بە فەرماندەیی مستەفا چاو رەش، هێنرابونو دەوروبەری گردەکانی جادەی کوبانیانمان پێ گرتبوون.(+)

کە ئامادەباشیی عەسکەریمان تەواو کرد. ناوچەکانمان لەرووی عەسکەرییەوە قفڵ دا. پێویستیەکانی شەڕو تەقەمەنیو ئازوقەمان دابەشکرد، دوای دڵنیابون لە هەموو پێویستیەکانی بەرگری، یان هێرشی بەرگری، فەرمانمان بۆ هات، دەستبەکار بینو

+ فەرماندە ئازاکان: مەحمودی حاجی فەرەج، عومەری قالە گولباخ، مەحمود گەرمیانی، ئەحمەد شاتوانی، غەفور دەرەشیشی، مامۆستا شاهۆ، دلێر جاف، فەرەیدون حەمەسالح، هاوڕێ کامەران، جەمالی حەمەی خواکەرەم، حەمەمینی خەجێ، هێمن سەراوی، کەمال شێخە، حەمەعەلی بەرزنجی، وەهابی سەرتیپ، شۆرش ئیسماعیل، دانای حەمەی تەیب، عەلی چوارتایی، کاکەبرا بەرزنجی، ئاوات قارەمانی، هەروەها مستەفا چاورەشو ئامر کەرتەکانی هەرێمی دوو.

ناوچەکە پاک بکەینەوە. ئینجا، یەک هەفتە، لەسەر بەرپرسیاریتی خۆم، سەرەڕای ئەوەی جاروبار هێزەکانی جود، سەنگەرەکانیان هاوەن باران دەکردین، خۆمان لەناو سەنگەرەکاندا گرت. حیزبی شیوعیو مەلا محەمەدی شارەزووری(*)و پیاوماقووڵانم دەنارد، شەڕەکە رونەدات. بەڵام بەریدی پارتیمان دەگرتو دەیاننوسی:

"مەلا بەختیار دەپارێتەوە، هێرش نەکەینە سەریان، بەڵام ئەمجارەیان جاشە جەلالیەکان دەکەینەوە بە بەکرەجۆدا". هەر دانم بەخۆمدا دەگرت. هێزەکانیشمان ئۆقرەیان لێبڕا بوو، چاوەڕێی فەرمانی هێرش بوون. رێی شارەزووریشمان تەنیبو، سۆسیالیستو حەمەی حاجی مەحمود نەیاندەتوانی بگەنە هێزەکانی جود. واتا:

-لەگەڵ حیزبی شیوعی رێکەوتبوینو بێلایەنی خۆیان راستگۆیانە راگەیاند.

-سێ بەشی هێزی سۆسیالیستمان گیر دابوو، ئەوانەی مابونەوە لە جود، بەرگەیان نەدەگرتین.

شەوێکیان بۆردومانی پێشمەرگەکانی شارباژێڕو مەڵبەندی دویان کردین. بریندارمان دا. بەمە، هاندەرو هۆکارەکانی بڕیاری هێرشی بەرگری، ئامادەبوو. بە کاکە حەمەی فەرەجم وت: خۆت بۆ بڕیاری هێرش ئامادە بکە. خۆم لەسەر شاخی هەواری سازنان (قەڵای کوڕێ) ناردمان بۆ هاوکاریو سەلامەتی، سالار عەزیزو بەکری حاجی سەفەرو م.پشکۆو شێخ عەلیش، هاتنەلامان.. جیهازە راکاڵەکەم دامەزراندبوو.(+) سەعات ١٠/ی شەو بە کاکە حەمەی فەرەجم گوت: نهێنی هێرشە بەرگرییەکە، لەسەر جیهاز، بە زمانی خۆت بە هەموو فەرماندەکان، رابگەیەنە. نەخشەکەمان وا بوو، جادەی کوبانیان، بەرەبەیان دەستپێک بێ. کاکە حەمەش، وەکو پیاوێکی جوامێر و ئەزموندیدە، فەرمانەکانی جێبەجێ کرد. لە یەکەمین هەڵمەتدا، هێزی هاوبەشی پارتی-سۆسیالیست، لە تەواوی سەنگەرەکانیان دوو سەعاتی نەبرد، هەڵکەندران.

قۆناغی یەکەمی هێرشی بەرگری، بەسەرکەوتویی، بە بەخشینی شەهیدێک، سەرکەوت.

---

* مەلا محەمەدی شارەزووری؛ مەلایەکی زیرەکو تێگەیشتوو بوو. نێوانمان زۆر خۆشبوو. پێش سەرهەڵدانی سەلەفیەکان، ئەم جیاواز لە سیاسەتدا بیری لە ئیسلامو ئیسلامگەرا دەکردەوە. رەخنەی لە هەندێک نەریتی کۆن کۆن هەبوو. پەرستنی دارو شەخسو هەندێک نەریتی رەتدەکردەوە. تا بڵێی، دژی شەڕی ناوخۆ بوو. بۆیە بۆ ئارامکردنەوەی دۆخەکە، چەند جارێک لەنێوان لایەنە سیاسیەکاندا، هاتوچۆی دەکردو سەری مەڵبەندی دەدا. قسەی باشی دەکرد. من زۆرم رێز دەگرت. حکومەت سەرنگونی کرد.

+ لەسەر جیهازی راکاڵەکە (هاوژین مەنمی)مان دانابوو، بڵندی هاوسەریشی هاوکاری دەکرد. دەنگی هاوژین.. وەکو ژنێک، کاریگەری رۆحی باشی لەسەر مەعنەویاتی پێشمەرگە هەبوو. راکاڵەکەمان ژمارە (١) بوو. کاکە حەمەی فەرەج کە پەیوەندی دەکرد، دەیووت: خوشکە یەک.. خوشکە یەک!

هەر لەوێ، ڕاگەیاندراوە عەسکەریەکەیم بەناوی (سەرکەوتنی قۆناغی یەکەمی هێرشی بەرگری) نوسیو دوای سەعاتێک لە ئێزگە خوێندرایەوە. ورەی پێشمەرگەی سەرانسەری کوردستان، دوای شکستی مەڵبەندی چوار، فڕیی! بەمەبەستیش ناوی ڕاگەیاندنەکەم نا (قۆناغی یەکەمی هێرشی بەرگری) هەتا لەڕووی دەرونیەوە، لەلایەکەوە دەمویست خەڵک تێبگات، بەرگریمان لەخۆمان کردووە.. دەستپێشخەر نەبوین بۆ شەڕ. لەلایەکی تریشەوە هێزەکانی جود، بخەینە دڵەڕاوکێی (قۆناغی دووەمی هێرش). لەشەڕیشدا، کە هێزێکی شکاو، بۆ لای باقی هێزەکانیان پاشەکشە دەکەن، کاریگەریی نالەبار دەکەنە سەر ورەی تەواوی هێزەکەیان. هەر واشبوو!

نیوەڕۆ، لە جیهازەکانەوە گوێمان لێبوو، هێزەکانی جود، لە بناری شاخەکانی "تالیەر"و "لەرێ"و دێهاتی ئاروزەر دەوروبەریان، شپرزە بوبون. دەشیانوت: خاڵە عەفان[*] خۆی نەگرت لە کۆبانیان قوچاندی.

جیهازەکانی تیپەکانی یەکێتیش، بەدەنگی دلێرانە، قسەیان دەکردو بە ورەبەرزییەوە پیرۆزباییان لەیەک دەکرد.

هەل بوو، (قۆناغی دووەمی هێرشی بەرگری) پێش نیوەڕۆ دەستپێبکرێ.. لەسەر جیهازەکە، نهێنی قۆناغی دووەمم گەیاندە ویستگەکان.. لە تەواوی قۆڵەکان. هەتا ئێوارە، هەڵمەتی پێشمەرگە، گەیشتە بناری تالیەر. دێهات هەموو رزگار کران. کە تاریک داهات، جود، لە تەواوی ناوچەکە شکان.[+] ڕاگەیاندنی دووەمی سەرکەوتنەکەم نوسیو ئەمیش لە ئێزگەدا، خوێنرایەوە. ورەی خەڵکو پێشمەرگەی یەکێتی لەهەموو تیپەکاندا، هێندەی تر فڕی. جیهازی مەڵبەند فریا نەدەکەوت، بروسکەکانی پیرۆزبایی وەربگرێ. لە مام جەلالەوە، بۆ ملازم عومەر، مەڵبەندەکان، سەرتیپەکان.. کەرتو ڕێکخراوەکانی کۆمەڵە.. تەنها نەوشیروان مستەفا پیرۆزبایی لێنەکردین. پێشم سەیر بوو![*]

---

[*] خاڵە عەفان: نازناوی شەهید عوسمانی قالە منەوەر بوو. دژی شەڕی ناوخۆ بوو خۆی لێنەدەدا. لەگەڵ حکومەت دریغیی نەکرد. مەخابن، لە شەڕی ناوخۆشدا شەهید کرا.

[+] بە دووربین سەیرم دەکرد. شەڕ لای قەلاتی بەردەوام بوو. پێشمەرگە بێباک بوبوون. دەمبینی بەپێوە دەوەستان. بە وەهابم وت، کە لەو قۆڵە بوو، با پێشمەرگە وریابنو بەپێوە نەوەستن. پێشمەرگە کە سەردەکەوێ، ئیتر گوێ ناداتە وریایی. قسەکەم تەواو نەکرد.. پێشمەرگەیەک لەوانەی وەستابوون.. شەهید کرا.

[*] لەم سەرکەوتنە و لە شکانی جود دڵنیابوم. بەلام شەڕەکەم هەر پێ خراپ بوو. پێش هێرشەکان (جەمالی حەمەی خواکەرەم)م بانگ کرد. کە ئازا و شارەزای ناوچەکە بوو. پێمگوت: نیوەی تیپەکەت ببە بۆ سەر «پردیساڵیاوە» کە لە دامێنی تالیەر بوو، جود کە دەشکێن، شەو دێنە ئەوێو لەسەر چەمەکە پشوودەدەن.

لەم شەڕەدا، تەنها فەرماندەیەک، جەلالی عەلی ورگەو چەند خزمێکی بە دیلی کردە قوربانی داپۆشینی ترسنۆکی خۆی لە شـەڕدا. کە زۆرم پێناخۆشبوو. کەچی خۆی شانازی پێوە دەکرد.(+)

دوای ئەم سەرکەوتنە، نەوشیروان هەلەکەی لەبار زانیبوو، هێزی کۆکردبوەوەو پەلاماری قڕناقاو پشتئاشان بدات. لێرەوە، هاوکێشەکان، لای نەوشیروان‌و پەیڕەوانی، گۆڕانی بەسەردا دێت‌و ڕێکەوتنی نێوانمان لەگەڵ شیوعیەکان کرایە بیانوو، لەبری ستایش‌و سوپاس.. بەرنامەی سزادانیان دژم داڕشتبوو!

## ( ١٨ )
## سزاو پاکتاو!

سەرکەوتنەکانی مەڵبەندی یەک، یەکەمین سەرکەوتن بوو لەمێژووی یەکێتیدا، بەرەی جود، لەناوچەیەکی فراواندا، بە سەدان چەکدارەوە، بشکێن. ئەمە لەکاتێکدا بڕیاریاندابوو بمانکەنەوە بە "بەکرەجۆ"دا، بەلام بە قارەمانێتی پێشمەرگەو لێبوردەیی فەرماندەکانیان‌و پشوودرێژیمان لە مەڵبەند، کە بڕوامان بە خەڵک هێنا، نامانەوێ شەڕ بکەین. کە شەڕی بەرگریشمان کرد، زۆربـە پشتیوانییان کردین. نەخشەکەشمان کە بە دوو قۆناغ، لە هێرشی بەرگریدا دامانڕشتبوو، ڕێک وەک بڕیاردرابوو، سەریگرت.

هەم لەڕووی عەسکەریەوە، هەم لەڕووی سیاسیەوە کە حیزبی شیوعیمان بێلایەن کردبوو، هەم لەناو خەڵکدا، بۆ یەکێتی سەرکەوتنێکی گەورە بوو. بروسکەی پیرۆزباییەکان هەر وایان دەگەیاند. بۆیە چاوەڕێی پاداشت‌و ستایش بوم، لە مەڵبەندەکەو فەرماندەکان‌و

---

کە مەفرەزەکان چەکەکانیان دادەنێن.. لێیان ڕاپەڕە، بڵێ: «مەلا بەختیار ڕاستی لەگەڵ دەکردن، نەیدەویست شەڕتان بکات. فەرموون لەبەردەستمانن.. دەتوانین خراپتان بەسەر بێنین. بەلام بڕۆن.. با ببێتە دەرس بۆتان». ڕێک چۆنم ڕاسپاردبوو، ڕوداوەکە کوت‌ومت وا ڕوویدا.

+ ساڵی ١٩٩٢ لە سوید بوم. لە تۆڵەی کوشتنی ئەو دیلانە، بۆسە لەخواری چوارتا نرابوەوە. بە ڕێکەوت ئاواتی شێخ جەناب‌و حەمەسەعیدی ئەندازیارو چەند پێشمەرگەیەک، بەوێدا تێدەپەڕن. دەکەونە بۆسەکەوە، حەمەسەعید گەلالی کە یەکێک لە باشترین ئەندازیارەکانی کارەبای سلێمانی‌و کوڕی حسێن ئاغای گەلالی (برای مارف ئاغاو ئازادو شەریف ئاغای گەلالی) بەبێ گوناح شەهید کرا. لە تەلەفۆن بە دارۆی شێخ نوری‌و ئاواتم گوت: ئەوە لە تۆڵەی جەلالی عەلی ورگەو هاوسەنگەرەکانی بووە. ئەگەر ئەو کارە ترسنۆکیەی دیلکوشتن نەبوایە، ئەم کارەساتەش بۆو جوانەمەرگە ڕوینەدەدا.. کە زۆر هاوڕێ‌و خۆشەویستم بوو.

خۆیشم بکرێ. تومەز، رقی خەوتومان لە ناخی نەوشیروان‌و پەیڕەوانی، بێدار کردووە. دەیانگێڕایەوە، بە بیستنی هەواڵی سەرکەوتنەکان، نەوشیروان نەک پێی خۆش نەبووە، بەڵکو پێیشی بێتاقەت بووە. بۆیە، بەپەلە هێزی بۆ هەڵکوتانە سەر جود لە قڕناقاو پشتئاشان، هەڵخراندووە (تعبئة) بە رێکەوتێکی خراپ، رۆژی ١/ی ئایاری ١٩٨٢، شەوەکەی هێرشەکە لەچەندین قۆڵەوە براوەتە سەر جودو شکستێکی چاوەڕواننەکراویان بەسەردا هێناوون. کە سەرەنجام بڕیاری دیلکوشتنیش، لەو شەڕەدا، خەریکبوو دەکرایە نەریت‌و شانازی.

لەم شەڕەوە نەوشیروان، دوای سەرکەوتنی لە هەردوو کۆنفرانسی کۆمەڵەدا، ئەو جۆرە سەرکەوتنەی کردە شانۆی هەڵگێڕانەوەی هاوکێشەکان. ئەویش نەک هەر بە سیاسی، بەڵکو بە عەسکەریش. پێشتر باسم کردووە، زۆری هەوڵدا بەقسەی بکەم‌و لە شیوعیەکان بدەم. نەمکرد. حیزبی شیوعی لە هەڵهاتنەکەشیاندا، رۆڵێکی دۆستانەیان گێڕا. بەڵام لە قڕناقاو پشتئاشان، زۆرترین دیلی شیوعیەکان کوژران. زۆریش هەوڵیدا، منیش بە قەولی خۆی 'پەڕوباڵ'یان بکەم. نەمکردو نەمکرد. دوو هەفتەیەکی پێچوو، هەر بە جیهاز، هێزی یەکێتی‌و رێکخستنەکان، لەوپەڕی شانازی پێوەکردنی سەرکەوتنەکانی مەڵبەندی یەکەوە، هەڵگێڕایەوە بۆ ناڕەزایی‌و رەخنەگرتن.. تەنها لە من. لەکاتێکدا هەموو ئەندامانی مەڵبەند، بە کۆمەڵەو سۆسیالیست‌و هێڵی گشتیەوە، شەڕنەکردنیان لەتەک حیزبی شیوعی، پێ پەسەند بوو. دۆخەکەیان لە رووی سایکۆلۆژیەوە بەجۆرێ گۆڕی، مایەی سەرسووڕمان بوو. کە بەداخەوە تەکەتولی زیندان، لەسەر ئەم کارە چاکەی ئێمە، پشتیوانی بڕیارە خراپەکانی نەوشیروانیان دەکرد. ئەوان پێیان دادەگرت سزا بدرێم. مەرامەکەش ئاشکرا بوو، کە دەیانویست خۆیان لەناو کۆمەڵەدا زاڵبکەن. سیاسەتیان وا بوو، دوای تێکشکاندنی ئێمە، گوایە نەوشیروان کۆمەڵەیان رادەست دەکات. یان کوردستان جێدێڵێ. بەڵام سیاسەتەکەیان هەر خەیاڵ بوو!

هیچ هەڵەیەکم نەکردبوو، تەنها ئەوە نەبێ، کە شەڕمان لەگەڵ حیزبی شیوعی نەکرد؛ نەوشیروانیش ئەو هەموو دیلەی لێ کوشتبون، بۆی قوت نەدەچوو، ئەو بە دیلکوژو منیش بە ئاشتیخواز بچمە مێژوو! بۆیە هەڵمەتێکی پروپاگەندەی فراوانی دژم ورووژاند. بە فرسەتیشی زانی، زوو کۆبونەوەیەکی سەرکردایەتی تەموزی ١٩٨٢ رێکبخات. لە کۆبونەوەکەدا لە گوندی خەتێ، کە لەو کۆبونەوەیەدا، دروشمی ئۆتۆنۆمی، پشتئەستور بە جەنگی عێراق-ئێران، گۆڕدرا بە مافی چارەی خۆنوسین. لە کۆبونەوەکەدا، بە روخساریا دیار بوو کە هەموو گیانی نوقمی رقی شەخسی بوبوو. لۆبی کردبوو، لە بەرپرسی مەڵبەند لاببرێم. لەبەرئەوەی ژن‌و کوڕە عەرەبم نەکوشتبوو. لەبەرئەوەی باوەڕم بەوە

نەبوو، تێکۆشەرانی ئەو حیزبە، لە ناوەڕاستو خوارووی عێراقەوە هانایان بۆ کوردستان هێنابوو، بەدەستی کورد بکوژرێن.(*)

ئەوەی لام سەیر بوو، سور دەمزانی مام جەلال هەڵوێستەکەی ئێمەی پێ دروست بوو. دەشیتوانی بەرگری لە هەڵوێستەکە بکات. بەلام نەیکرد. ئەمەیان، لە مام جەلال چاوەڕوان نەبووم. زۆرجار مام، بێرادە ڕەچاوی بۆچونەکانی نەوشیروانی دەکرد. هەتا ڕادەیەک دەشیزانی نەوشیروان هەڵەیە، بەلام هەر نەیدەویست زویری بکات. بە ناخێکی بریندارەوە گەڕامەوە. ئیتر تێگەیشتم، بیری ڕاستڕەوێتی نەوشیروان نەک کۆمەڵە، بەڵکو یەکێتیشی کۆنترۆڵ کردووە. نەوشیروانیش تێگەیشت، بەو بڕیارە ناڕەوایە، نێوانمان تەواو تێکچوو. لەگەڕانەوەدا، خواحافیزیم لێنەکرد. هەتا مفاوەزاتی ١٩٨٣-١٩٨٤، پەیوەندیمان پسا.

دوای شەڕی قڕناقاو پشتئاشان، دانوستان لەگەڵ ڕژێم زەمینەی ڕەخسا. یەکێتی ئامانجی بوو، لەدوای ئەو شەڕانە بیسەلمێنێ، کە هێزی بالادەستو بەهێزترین نوێنەری کوردە. لە دانیشتنەکەدا، سەرۆکی وەفدی حکومەت وتبووی: حکومەت نازانێ چ لایەکتان نوێنەری کوردە؟ هەموتان هێزتان هەیە. ناوچەتان بەدەستەوەیەو بە جیاش داوای دانوستان دەکەن. ئەم بۆچونە، گەرچی بەعس لە ڕوانگەی دوژمنەوە کردبووی، بەلام قسەیەک بوو، نەوشیروان حسابی لەسەر کردبوو.

ئەو ڕووداوانە، بەو هەموو گرنگییەوە، کە لە چەندین ڕوەوە هاوکێشەکانی گۆڕی. نوسەری کتێبی (چەپکێک) بە مەرام، ڕوداوەکانی ئەوەندە بچوک کردۆتەوە، هەر دەڵێی باسی شەڕە گەڕەک دەکاتو دەنوسێ:

"بارودۆخی ئەو ناوچەیە ڕووی لە شەڕێکی ئاڵۆزکردو سەرکردایەتی جود فەرمانی بۆ حسکو پاسۆکو پارتیو شیوعی دەرکرد، کە بە هەموو هێزەکانیان لە ناوچەی سلێمانی پەلاماری مەڵبەندی یەکی یەکێتی بدەن، بەلام (بەهادین نوری) کە لێپرسراوی ناوچەی سلێمانی حزبی شیوعی بوو، نامەی بۆ مەڵبەند نارد بوو، کە ئێمە ئامادەی شەڕکردن نینو ئامادەین ڕێکەوتنێکی ناوچەییتان لەگەڵدا بکەین، مەلا بەختیارو مەڵبەندی یەکیش بە هەلیان زانیبوو، کە حزبی شیوعی تەریک کەن لەو شەڕە و ڕێکەوتنیان لەگەڵدا مۆر کردبوو. ئەم ڕێکەوتنەی مەڵبەندی یەک لەگەڵ شیوعیەکان هەلایەکی گەورەی لە مەڵبەندی (٤)ی یەکێتیو بەرەی جودی ناوچەی هەولێرو سەرکردایەتی جودا نایەوە،

(*) مانگێک بەر لە شەڕەکە، کچی شەهید سەلام عادل هاتبوو. د.ئیمانو هاوسەری د.دلشاد. پێکەوە خزمەتی نەخۆشیان دەکرد. هیچیان نەبوو. ناردم پێویستیی ناوماڵیان بۆ هێنان. دەمانچەیەکی سمسی خۆیشمم پێشکەش کرد. ئیتر چۆنیان بکوژم؟! بە پارەی ئەو دەمانچەیە، دوای ڕوداوەکان، خۆیان گەیاندبووە سوریا!

گوایە لە مەڵبەندی (٤) شیوعیەکان دەچنە سەر مەڵبەند، کەچی مەڵبەندی یەک لەگەڵ شیوعیەکاندا ڕێک دەکەون".[١]

دەقی ئەم نوسینە بکرێتە پێوەر، دەبێ لەسەر ئەوەی شەڕی شیوعیەکانمان نەکرد پاداشت بکرێین. چونکە هێزەکانی جود بە یەکگرتویی، دوای هەفتەیەک چونە سەر مەڵبەندی چوار، سەرکەوتن. بەڵام لە مەڵبەندی یەک، شیوعیەکانمان بێلایەن کرد. سۆسیالیستمان بەگیر هێنا. باقیەکەیمان تێک شکاند. ئەگەر ئەو سیاسەتەمان بەکارنەهێنایەو هەموو هێزەکانی جود، لە دیوی ڕەزڵە و دۆڵی پەرخەوە، لەپشتەوە، پەلاماریان دابایەن، شیوعیەکانو لایەنەکانی تریش لە شەڕگەکانی تر، پێکەوە هێرشیان بۆ هێنابایەن، چ دەستەبەرێکی عەسکەری هەبوو، سەرنەکەوون؟

ئەوەی لەنێوان منو حیزبی شیوعی، لە مەڵبەندی یەکدا کرا، ڕەوشتی بەرزی سیاسی بوو. متمانە بوو، حیزبی شیوعی دەیانزانی، پەیمان شکێن نیم. چونکە چاودێرییان کردبوین، ڕەفتارو کرداریان دیبوین، کە چەند باشین لەگەڵ خەڵکدا. ئەشیانزانی لەناو کۆمەڵەو یەکێتیشدا، لەناو ڕوداوەکاندا، خاوەن هەڵوێستی جیا بوین. هەردوولاشمان، نەکەوتینە دوای بڕیارەکانی سەرکردایەتی هەردوو لایەن.

حیزبی شیوعی، هەڵەیەکی ستراتیژیی کرد، کە نەیتوانی لە شەڕی ناوخۆدا بێلایەنی خۆی بپارێزێ. یەکێتیش، هەڵەی کرد، کە شەڕەکەی گەیاندە دیلکوشتنی قڕناقاو پشتئاشان. شەڕ ڕویدا. جود لە ١٩٨٣/٤/٢٥ بارەگای مەڵبەندیان گرت. بەڵام هەر باش بوو نەگەیشتە دیلکوشتن. چەند بۆ یەکێتی شەرەفێکی گەورە بوو، دیلەکانی بپاراستایەو ڕێزی بگرتنایەو بۆی ڕون بکردنایە، کە هەوڵی زۆر لەگەڵ حیزبی شیوعی درا، نەبێتە بەشێکی شەڕ. بەڵام سودی نەبوو. ئەشتوانرا، شەڕنەکردنی مەڵبەندی یەک لەگەڵ شیوعیەکان، وەکو بەڵگە بهێننەوە، کە تەواوی یەکێتی نەیویستووە لەگەڵ حیزبی شیوعی بکەوێتە شەڕ. نەک ئەمەیان نەکرد. بەڵکو دوای کوشتنی دیلەکانیان، دژی ئەو ڕێکەوتنەش لە مەڵبەندی یەک لێدوانیان دا. لە ئێزگە وتیان سەرمان پانکردونەتەوە، ماوەتەوە پەڕوباڵەکانیان. بەم سیاسەتە شەڕەنگێزییە، یەکێتی کارتی شەڕی بەرگری سوتاند. وەکو هێزێکی شەڕخواز چووە ناو لایەنە سیاسیەکانی دەرەوەش!!

ئێستا دوای (٣٨) ساڵ لەو ڕوداوە خوێناویانە، با مێژوونوسەکانو ئەوانەی خەریکی ماستەرو دکتۆرا نوسینن، بەبەڵگەوە، بەراوردی بکەنو دەریبخەن، کە کام سیاسەت ڕاست بوو. سیاسەتی دیلکوشتنی قڕناقاو پشتئاشان، یان ئاشتیەکەی مەڵبەندی یەکی سلێمانی؟!

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٨٥-٣٨٦).

جگەلەوەی قسەکانی نوسەر، بێسەروبەرن. لە هەموی ناخۆشتر، روداوی وای داتاشیووە، باوەڕناکەم خۆی بەو نوسینەدا چوبێتەوە، ئەگینا، بەئاسانی دەیزانی، داتاشینەکەی کەس باوەڕی پێناکات. دیقەت بدەن چی دەنوسێ:

"شەڕ لە مەڵبەندی چواری یەکێتی لە دۆڵی بالیسان هەڵگیرسا، بەرەی جود بە هەموو هێزەکانی دەشتی هەولێرو شکاوەکانی ناوچەی سلێمانیش لە رۆژی (١٩٨٣/٤/٢٥) هێرشیان بردە سەر بارەگای مەڵبەندی چواری یەکێتی گیرا و هەموو هێزەکەیان پاشەکشەیان کرد بۆ پشتی دەرەشێرو دەرەدارو دەرەزیوە".(١)

خوێنەر!

شەڕ لە مەڵبەندی یەک ١٩٨٣/٣/١٩ دەستپێیکرد. دوو رۆژی خایاند. بە دوو رۆژیش، کشانەوە.

دوای شەش رۆژ، جود لە (١٩٨٣/٣/٢٥) دا هێرشی کردەوە سەر مەڵبەندی چوار. مەودای نێوان بالیسانو حاجی مامەند، لەوکاتەدا، بە پێ، شەو و رۆژ، بەبێ ئەوەی هێزی یەکێتی لەپێشیاندا بن، لایەنی کەم شەویش نەخەوتنایە (٥) رۆژی دەویست بگەن. کەچی نوسەر، شێواندنی راستیەکان، وایان سەر لە خۆیشی شێواندووە، دەنوسێ: "هێزەکانی دەشتی هەولێرو شکاوەکانی سلێمانی، ١٩٨٣/٣/٢٥ هێرشیان بردە سەر بارەگای مەڵبەندی چوار!!".(٢)

سەدان کەس ماوون. کە پارتیو سۆسیالیست، راونران بۆ مەریوان. حیزبی شیوعیش، دوای (٣بۆ٤) رۆژ، بە ئاگاداری من، حاجی مامەندیان جێهێشت، نیوەیان چونە سورێنو نیوەشیان گەیشتنە قەراغ. حەمەی فەرەجمان نارد، لە قەراغیش لەگەڵیاندا رێکەوتنی دیوانەی دوای دوو هەفتە مۆرکرد. شەڕ رونـەدات. باقیەکەی بۆ ویژدانی خوێنەر دەمێنێتەوە!!

لەبەرامبەر ئەو سیاسەتەدا، یەکێتی سیاسەتێکی دووفاقی گرتەبەر. لەدەرەوەی وڵات ئەیانووت، سیاسەتی مەڵبەندی یەک بەرامبەر شیوعیەکان، سیاسەتی یەکێتی بوو. لەناو وڵاتیش دەستیان کرد بە سزا و پاکتاو، لەسەر ئەوەی لایەنی کەم نەمانهێشت خوێنی (٥٠) تێکۆشەری ژنو پیاوی کوردو عەرەب، لە هەردوولا، بڕژێ. دوایی لە ناشتنەکەیاندا درۆ بکەینو بڵێین: براکوژی خراپە! نەک ئێستا کە (٣٨) ساڵ بەسەر شەڕەکاندا تێپەڕیووە. بەڵکو دوای ساڵێکیش، یەکێتی شەڕی قرناقاوپشتئاشانی دیزە بەدەرخۆنە

---

١ هەمان سەرچاوە. ل(٣٨٦).

٢ مەلا ئەحمەدی بانیخێڵانی لە کتێبی (یادەوەرییەکانم)دا، لاپەرە (٤٤٧-٤٤٨) پێچەوانەی بۆچونی نوسەر جەختدەکاتەوە کە، هێزەکانی شیوعی لە مەڵبەندی یەک، بەقسەی سەرکردایەتیان نەکردووە، بچن بەهانایانەوە.

کرد. قەت یادی نەکراوەتەوە. نەوشیروان تەنها ئەوەندە ئیشی بەو شەڕانە هەبوو، کە رقە سایکۆلۆژیەکەی ناخی، لەناو دەسەڵاتی سیاسیو عەسکەریدا، بەجۆرێک بنج دابکوتێ، کەس نەتوانێ، ئیتر لەبەرامبەر زەبروزەنگەکەی، سەری ناڕەزایی بەرزبکاتەوە!!

## (١٩)
## ماکیاڤیلیەتی دواکەوتوو ! (*)

سەردارانی کوردستان، لە گرتنەبەری شێوازی چەشناوچەشن، بۆ گەیشتن بە مەرامە تایبەتیو گشتیەکانیان، بەشێوەیەکی دواکەوتوانە، بەڵکو بە لافلێدانی شۆڕشگێڕانەو دیموکراسیانەش، دوای (٥٠٠) ساڵ لە گۆڕانکاری، میکیاڤیلییان تێپەڕاندووە، کەچی، (بازرگانە شۆڕشگێڕەکان)و (هەلپەرستە هەڵپەچیەکان) نیو سەدە زیاترە، نەک لایەنی چاکە، بەڵکو تاوانو تالانی ئەم سەردارانەش، دەکەنە دەستکەوتی مێژوویی!

مەریوانی وریا قانع، جوانی لەسەر ماکیاڤیلی نووسیووەو دەڵێ: ماکیاڤیلی بەنیشتمان کەرامەتێکی تایبەت دەبەخشێت و پاراستنی ئەم کەرامەتەش لەپێش پاراستنی هەموو شتێکی دیکەوە دادەنێت. بەڵام ئەم نرخە گەورەیەی نیشتمان لای ئەم فەیلەسووفە سیاسییە لەخۆیەوە نایەت، واتە شتێکی خۆبەخۆو خۆڕسک نییە. ئەوەی لای ماکیاڤیلی بەنیشتمان ئەم نرخە گەورەیە دەبەخشێت چەند شتێکە، لەپێش هەموومانەوە ئازادییە. نیشتمان لای ماکیاڤیلی کاتێک دەبێت بەنیشتمان، کاتێک دەبێت بە بەهایەک لەبەهاکانی دیکە گرنگتر، کە بتوانێت ئازادیی دەستەبەر بکات و بیپارێزێت، تا ئەو شوێنەی بەرگریکردن لەنیشتمان یەکسانبێت بەبەرگریکردن لەئازادیی[٢].

---

* نیکۆلۆ ماکیاڤیلی: (١٤٦٩-١٥٢٧) مێژوونوسو سیاسەتمەدارێکی ئیتاڵییە. بیرمەندی سەردەمی رینیسانسو دارێژەری تیۆری جۆرێکە لە فەلسەفەی سیاسەت. ئەم بیرمەندە، زۆر دڵسۆزی ئیتاڵیا بوو. دەیویست، بە رێگەیەک لەو رێگا سیاسیانەی لەگەڵ بارودۆخی تێکچووی میرنشینەکانی ئیتالیا، دەگونجا، رێبازی دەربازی ئیتاڵیا دارێژێ. زۆربەی نوسینەکانی کاریگەرییان لەسەر بیری سیاسی داناوە. تەنها ئەو قەولە زۆر دەوترێتەوە کە وتویەتی: «ئامانج پاساوی ئامراز دەدات- الغاية تبرر الوسيلة). ئەمە لەکاتێکدا، ماکیاڤیلی خاوەنی چەندین کتێبی سیاسیو ئەدەبیشە. دیارترینیان کتێبی (میر)ە کە لەلایەن چیرۆکنوس (حسێن عارف)ەوە کراوە بەکوردی. هەروەها ئەو کتێبە جارێکی تریش راستەوخۆ لە زمانی ئیتاڵیەوە وەرگێڕدراوە بۆ کوردی. لەسەردەمی کۆماری فلۆرەنسا سەرۆک پەرلەمانو (جمهوری) بووە. باشترین کتێبی (محاورات)ە.

٢ بڕوانە، مەریوان وریا قانع. سایتی روانگەو رەخنە - ٢٠٢٠/٨/٤.

ئێمە کە توانیمان ڕێکەوتنی یەکترنەکوشتن لەگەڵ (بەهادین نوریو مەلا عەلی) مۆر بکەین، ئەو سەرکەوتنە سیاسییەیان بەجۆرێک هەڵگێڕایەوە خەریکبوو بە خائینیش لەقەڵەممان بدەن. کەچی نوسەر باسی گفتوگۆیەکی مێژوویی، دوای (٣) ڕۆژ لە خوێن ژەنینی بناری قەندیل بە قوربانیو دیلەکان، ئاوا دەگێڕێتەوە:

"ڕۆژی (١٩٨٣/٥/٣) نیوەڕۆ لەناو ژووری قوتابخانەکەی خانەقا، لە دانیشتنی نێوان نەوشیروانو مەڵبەندی سێو نێوان کەریم ئەحمەدو مەلا ئەحمەدو قادر ڕەشید، نەوشیروان پێی وتن: سێ نامەمان بۆ ناردن، دووان بە بروسکە و نامەیەک بە دەستی کە مەڵبەندی سێ بۆی ناردن، ڕۆژی (١٩٨٣/٤/٢٧)، کە ئێمە شەڕمان لەگەڵ حزبی شیوعی نیە تکامان وایە وەک ناتوانن لە ناوبژێکردندا سەرکەوتوو بن لە شەڕدا بەشداری مەکەنو ئێمە شەڕمان ناوێ، بەڵام ئێوە نە وەڵامی نامەکانمانتان دایەوەو نە بێلایەن بوون، بەپێچەوانەوە هەر لە ڕێگەماندا لە قەڵاتوکانەوە هێزەکەتان داینە بەر دەستڕێژو هاوەن".[1]

ئەم گفتوگۆیە، لە درامایەکدا تێهەڵبکێشرێ، دەبێتە نایابترین دیالۆگ، یان مەنەلۆگی سیاسی-عەسکەری. بۆ خوێندنەوەی سیاسەتی میکیافیلی سەردارانی کورد.

جارێ کەریم ئەحمەد، لە مێژووی سیاسی خۆیدا، بچوکترین تاوانی نەبوو. مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی مام جەلالیش بووە. زیاتر لە نیو سەدە، لە تێکۆشاندا بووە.. بە هەموو نەهامەتیەکانیەوە. ئاشکرایە کۆمەڵە ڕێبازی شیوعیەکانمان قبوڵ نەبووە، بەڵام قبوڵنەکردنی ڕێباز، کە دەگاتە شەڕو دیلکوشتنو سەرکردە گرتن، ئیدی لافلێدانی ئازادی هەڵدەگەڕێتەوە بۆ هیچگەرایی!

هەردوولا، لافی چەپمان لێدەدا.. ئەوان کۆمۆنیستو کۆمەڵەش مارکسی. کەچی، چونکە ڕەگەکانمان لە کولتورو نەریتی دواکەوتوی کوردەواریدا، ڕۆچووبوو، هەر لەسەر ئەو ڕەگە، بڕیارەکانمان دەڕوا. بۆیە، کێشەکانمان بایی ئەوە نەبوون لەساڵی (١٩٨١)وە، هەتا ساڵی (١٩٨٦) یەکتر بکوژین. ئیتر چۆن باوەڕ بە (بەختیار عەلی) نەکرێ کە دەنوسێ:

"چۆن مارکسیزمی خۆرهەڵاتی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆو فەلسەفی بە مارکسەوە نەبوو، تەنیا فۆرمێکی ئایدیۆلۆژی مارکسیزم بوو کە بارکرابوو بە ڕۆحی ململانێ

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٨٩-٣٩٠).

ئەم گفتوگۆیە، نوسەر لە کتێبی (یادەوەرییەکانم)ی مەلا ئەحمەدی بانیخێڵانی ل(٤٤١) دزیویەتی.. بەبێ ئاماژەپێکردن.

سیاسییە لۆکاڵیەکان. لیبرالیەتی خۆرهەڵاتیش هەمان شێوە کارێکی بە مەرجە بنەڕەتیو فەلسەفییەکانی لیبرالیەتەوە نییە. بەڵکو قاوغە دەرەکیەکەیەتی، کاژە بێسودەکەیەتی کە بێ پرسیار وەرگیراوەو کراوە بە کلێشەیەکی موقەدەس".[1]

مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی، من پۆلی یەکەمی سەرەتایی بووم، لە (١٩٥٩) یادی هاتنە سەر کاری عەبدولکەریم قاسم کرا، لە کامپی بانینی دەربەندیخان، کە پێیاندەووت: (تەیارەخانە). هەزاران کەس کۆکرابونەوەو دژی کۆلۆنیالیزمو کۆنەپەرستی، وتاری خوێندەوە. جوامێرێکی کۆڵنەدەر.. بە دیلیی دەگیرێ. خۆی ئاوها باسی گرتنەکەی دەکات:

"دوای ماوەیەک گوێم لە غەڵبەغەڵبێک بوو، لەناو کۆمەڵە دارێکی نزیک ئەو شوێنەی من لێی دانیشتبووم بە کیلۆمەترێک. کەمێک لێیان نزیک بوومەوە زانیم پێشمەرگەن گوێم لێ بوو سێو چوار جار یەک دوانێکیان یەکتریان بانگ دەکرد. ناوی (حاجیو ملازم عەلی)م بیست. ئێمەش بەو ناوانە دوو هاوڕێمان هەبوو لە بنکەی (لێوژە) ملازم عەلی لێپرسراوی سەربازیو حاجی جەمالیش لێپرسراوی سیاسی بوو. ڕۆژی یەکی ئایار کە شەڕەکە دەستی پێ کرد، بروسکەمان بۆ ناردن کە بێنە پشت ئاشان، بەڵام کە تا پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە نەهاتن، شەڕ کەوتە ئەو قوڵەوە کە دەبوو ئەوان پیایدا بێن. ئێوارەی هەمان ڕۆژ بروسکەیەکی ترمان بۆ ناردن کە بەرەو (ئێنێ) بۆ لای برادەرانی پارتی بڕۆن. ئیتر من گەیشتمە قەناعەت کە ئەوانە هاوڕێیانی لێوژەنو ڕووداوی شەوی ڕابردووی ئێمەش نازانن‌و ناشزانن کە چەکدارانی یەکێتی ڕێگای (ئێنێ)یان گرتووەو تووشی شەڕ دەبن. ئیتر کەوتمە باری دوودڵیو نیگەرانییەوە. بەڵام کە چەند جارێکی تر گوێم لە ناوی (حاجیو ملازم عەلی) بوو بڕیارم دا نزیکتر ببمەوەو دەنگیان بدەم بزانم کێن. چوومە ناویانەوەو هیچ ئاگایان لەخۆیان نەبوو، تێم خوڕین ئێوە پێشمەرگەی کێن؟ گوتیان یەکێتی ئیتر من تا ئەژنۆم وشک بوو، گوتیان ئەی تۆ کێی؟ گوتم پێشمەرگەی حزبی شیوعیم. داوایان کرد چەکەکەم فڕێ بدەم. منیش گوتم فەرموون. چەکەکەیان لێ سەندمو دەستیان لە کوڵە پشتییەکەم دا کە زانیان هیچی تیا نییە، وازیان هێنا. گوتیان ئەی هاوڕێیانی ترتان کوان؟ گوتم نازانم چونکە شەو دایاننانە بەر دەستڕێژو پەرت بڵاو بووینەوە. ئیتر هەریەکە لەلایەکەوە پرسیاری لێدەکردم".[2]

---

١ بەختیار عەلی. ڕەخنە لە ئەقڵی فاشستی. ل(١٣).

٢ ئەحمەد بانیخێلانی. یادەوەرییەکانم. چاپی دووەم- سلێمانی-٢٠١٤. ل(٤٣٨).

مەلا ئەحمەد، کاریگەری هەبوو بۆ چونە پاڵ جودو تەنانەت بۆ شەڕیش، بەڵام دیسان، بە دیلگرتنی، یەکێتی کردە دوژمنی مێژوویەک لە خەبات. خەباتی حیزبی شیوعی!
بڕوانن، میکیافیلیەتو هەلپەرستی، لەم دیدارەدا دەگاتە چ ئاستێکی ترسناک. پێیان دەڵێ:
أ- سێ نامەمان بۆ ناردن. دوان بە بروسکەو نامەیەک بە دەستیی.
ب- ئێمە شەڕمان لەگەڵ حزبی شیوعی نییە تکامان وایە وەک ناتوانن لە ناوبژیکردندا بن لەشەڕدا بەشداری مەکەن.
ج- ئێوە نە وەڵامی نامەتان دایەوەو نە بێلایەن بوون.
د- لە قەڵاتوکانەوە هێزەکەتان داینە بەر دەستڕێژو هاوەن.
دیالۆگێکی سەیرە. نەوشیروان، وەکو عەسکەریەکی وشکو برینگ، وەکو جەنەراڵێکی سەرکەوتوی شەڕ، سەرکردە دیلەکان دادگایی دەکات. بەبێ ئەوەی بە خۆیشی بزانێ، دیالۆگەکە سەراپا پێچەوانەی ئەو بڕیارانەیە، کە دژی مەڵبەندی یەک، لەسەر ڕێکەوتن لەگەڵ شیوعیەکانو شەڕنەکردنمان، دایانو سزاشیان داین!
ئەگەر نامەو بروسکەتان ناردووە؛ ئەگەر نەتانویستووە شەڕ لەگەڵ شیوعی بکەن؛ ئەگەر ویستوتانە ناوبژیکەر بن؛ ئەگەر هەوڵتان داوە بێلایەن بن؛ ئەگەر هەموو ڕێگاکانتان گرتۆتەبەر کە حیزبی شیوعی نەگلێتە شەڕ.. خۆ لە مەڵبەندی یەکدا، بە کەمترین هەوڵ، بەڵام بە بەڵێنێکی ڕاستگۆیانە، شەڕی یەکدیمان نەکرد. دەی بۆچی نەوشیروان مستەفا، بۆ خۆی حەڵاڵ بێ هەموو ڕێگایەک بگرێتە بەر، شیوعیەکان لە شەڕ دووربخاتەوەو بێلایەنیان بکات، بەڵام کە ئێمە هەمان کارمان کردووە، بۆ ئێمە حەرام بێ؟!
ئەو سیاسەتە، سەرومڕ، میکیافیلیەتێکی دواکەوتووە. میکیافیلیەتێک دژبەرەکەی ئاشکرایە. هەلپەرستیەکی زەقە. یاریەکی بێلەزەتە، بۆ داپۆشینی تاوانەکان!!
لە بنچینەشدا، ئەو قسانەی نەوشیروان، ناکۆکە لەگەڵ بڕیاری ڕاگەیەندراوی یەکێتی، کە پێش شەڕەکە، نەک لە ئێزگەدا پروپاگەندەی بۆ دەکرا، بەڵکو کە هێزەکانی یەکێتیی، لە زەڵێ کۆکرابونەوەو سکرتێری یەکێتی وتاری جۆشدانی بۆ خوێندنەوە، بە دیکۆمێنت ماوە، جەخت دەکاتەوە، لە تەحریفیەکان بدەن. ڕەحمیان پێ مەکەن. ئەی دروشمی (تۆڵە بەسەبرە، ئەمما بەزەبرە) خۆ شیوعیەکانی لێ هاوێر[*] نەکران.

---

* هاوێر: جیاکردنەوەی کارو بەرخ، لە دایکیان. کچە نۆبەرەی پەخشانی شێخ جەلالو ئەرسەلان بایزی هاوسەری بوو. پەخشان، هەفتەیەک دوای لەدایکبون ناردیانەوە بۆ شار. لەوکاتەدا پەخشان وتی: کاک مەلا بەختیار، ناوێکی خۆشمان بۆ بدۆزەرەوە، ئەو لێکجیاکردنەوەیە (هاوێر) بوو.. ناووم نا (هاوێر). ناوگیر بوو.

پێشمەرگەو فەرماندەکان، بەو گیانە گۆشکراوەوە، هەڵمەتیان بردە سەر شیوعیەکان، بۆیە، بەئاسانی نهێنی (پەرێزتان پاک بێ)ی دیلکوشتنەکەی نەوشیروانیان، جێبەجێ دەکرد.

ئەوساو ئێستاش، بیرم دەکردەوە، دوای دوو سەدە، هێزە سیاسی-چەکدار-ئایدیۆلۆژستەکانی کوردستان‌و عێراق، لەدوای شەڕی ناوخۆی میرو دەرەبەگە کوردەکان، لە سەدەی هەژدەهەم‌و نۆزدەهەم، بەو چەشنە دڕندانەیە یەکترمان دەکوشت، ئاخۆ، دوو سەدە لەمەوبەر، بۆ ناهەقی میرو دەرەبەگێکی نەخوێنەوار بگرین، کرابنە داردەستی رۆم‌و عەجەم؟! هەمان رۆحی سەدەکانی ناوەڕاستە.. لە بەرگی نوێخوازی‌و کۆمەڵەی مارکسیدا!!

زۆربەی کۆمەڵی دەرەبەگایەتی یەکتریان کوشتووە؟ کەمیان لەم جیهانەدا پەلاماری یەکتریان نەداوە؟ ئیتر بۆ لۆمەی کورد دەکرێ؟ ئەوەی سەدەکانی ناوەڕاست، قۆناغی مێژووییەو دەبوایە شەڕی دەسەڵاتی میرایەتی روبدات. بەڵام لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا، لەکاتێکدا سێ چارەکە سەدە بەسەر دامەزراندنی ئەزمونی حیزبایەتی تێدەپەڕێ، هەر حیزبێکیش، گوایە رێبازی ئایدیۆلۆژی مۆدێرنی هەبوو، کەچی شەڕی ناوخۆ دەگەیەندرێتە دیلکوشتن. ئەم روداوانە، لەم سەردەمەدا، زیاتر لە سەدەکانی ناوەڕاست، پێویستی بە توێژینەوەیە. دیسان پێویستە بۆ کاریگەریەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بگەڕێینەوە. بنج‌و بنەوانی ئەو ئەندێشە ترسناکەی توندوتیژی دیاری بکەین. هەڵەیەکی کوشندەیە، دیاردەی شەڕی ناوخۆ، کە دەگاتە زەبروزەنگی دیلکوشتن، بە روداوێکی راگوزەری کوت‌وپڕ سەیر بکرێ. ئێستاش لە رۆژئاوا، لەسەر مێژووی کۆنیان دەنوسن. رۆژئاوا کە نەک قۆناغی مۆدێرنێتە، بەڵکو خەیاڵی پۆست مۆدێرنەش دایگرتون. کەچی هێشتا، وازیان لە ئاسەوارەکانی سەدەکانی ناوەڕاست نەهێناوە. بەڵام کورد، ئەم جۆرە روداوانە دەکاتە پارووی سۆزو نۆشی سەرکردەکانی دەکات! حیزبە سیاسیەکان، لەبری ئەوەی دەرس‌و پەند، لە هۆکارە راستەقینەکانی زەبروزەنگ وەربگرن، کەچی شانازی بە هۆکارەکانەوە دەکەن!

کوردەواری، لەڕووی ریفۆرمەوە بە رواڵەت گۆڕاوە. وەکوتر، رەگەزە راستەقینەکانی دواکەوتن، کە لەمێژوودا چاوگی زەبروزەنگە، لە کوردەواریدا، لە سەدەی ناوەڕاستدایەو هەڵنەکێشراوە. ئەم رەگەزە هەڵنەکێشراوانەی سەدەکانی ناوەڕاست، پەلوپۆی لەناو کولتورو نەریت‌و کەلەپورماندا، لەم سەردەمەشدا، لەبەر دوو هۆی بنچینەیی پارێزراوەو دەپارێزرێ:

**یەکەمیان:** مانەوەی هەژمونگەری ئایینی-مەزهەبی، کولتوری توندوتیژی سەدەکانی ناوەڕاست، دەقاودەق دەپارێزرێ‌و قۆناغ بە قۆناغ دوای قۆناغیش، دەخرێتە قاڵبی نوێی شەرع‌و شەریعەتەوە.

**دووەمیان:** هێزە کۆمەڵایەتیە دەسەڵاتدارەکان (خێڵ، عەشیرەت، پیاوانی ئایینی) یان هێزە سیاسیەکان، یاخود حکومەتەکان، لە نەبونی شۆڕشی دیموکراسی ڕاستەقینەدا، بەردەوام شەرعیەتی (سیاسی-یاسایی-ئایدیۆلۆژی) لەرێگەی هێزو بەهۆی سەپاندنی زەبروزەنگەوە، دەدەنە دەسەڵات. تاڕادەیەک، دەتوانین جەخت بکەینەوە کە زەبروزەنگی دەسەڵاتپارێزی، لە رۆژئاواشدا بە ڕێژە پارێزراوە!

رۆبرت ئۆدی،(*) لەمبارەو، زۆر جوانی نوسیوە کە لەسەر زەبروزەنگ دەنوسێ:

"لە تەواوی قۆناغە سەرەکیەکانی مێژووی بەشەریەتدا، هەندێک خەڵک زەبرزەنگیان بۆ بەدیهێنانی زۆرێک لە مەرامەکانیان بەکارهێناوە. سەرەڕای ئەوەش، بەشەر هانایان بۆ پاساوی رەوشت لە زۆر کاتدا بردووە کە زەبروزەنگیان تیادا بەکارهێناوە".[1]

دیارە نیتشە، لەخۆڕا چەمکی ئاسایش‌و سەقامگیری تەنها لە ڕوانگەی مەتریالیستیەوە لێکنەداوەتەوە، بەڵکو لە ڕوانگەیەکی قووڵتری فەلسەفیەوە، کە بەڵگەی دۆزینەوەی ئاستەنگی بوونی ئاکاری مرۆییە، کە زەبروزەنگ وەکو بەرجەستەی زیانی ئاستە جیاوازەکان هەڕەشەی لێدەکات.[2]

بەندە، لەساڵی ١٩٧٦وە، نەک هەر ئاگام لە روداوەکانە، بەڵکو لەناو زۆربەی روداوەکانیشدا بوم. ئەو کولتوری زەبروزەنگەی لایەن‌و هێزە سیاسیە-عەسکەریەکان، بەکارمان هێناو پاساوی ئایدیۆلۆژیمان بۆ دەهێنایەوە، گومانم نییە رەگو ریشەی بۆ رابوردوی دێرین دەگەڕێتەوە. ئەو رەگو ریشەیە، لە قۆناغی جیاواز و بە کولتوری جیاوازو عەقیدەی جیاوازیش، دەپارێزرێ‌و لە بەرگی چەشناوچەشنیشدا دەسەپێنرێ. ئەو رەگە دێرینەیە، ئاوێتەی هەژمونگەری سایکۆلۆژیەتی جەلالی-مەلایی، بووە.. ئیدی پێکەوە، گیانێکی شەڕەنگێزی‌و زەبروزەنگی خوێنڕشتنیان بەرهەمهێناوە. درێژەی

* رۆبرت ئۆدی: مامۆستای فەلسەفەیە لە زانکۆی رۆتردام.

١ فیتوریو بوفتشي-العنف- مختارات فلسفية. ترجمة: ياسر قنصوه. المركز القومي للترجمة. ٢٠١٧. ص(٢١٧).

٢ پێشەکی هەمان سەرچاوە. ل(٨٠).

کاریگەری ئەو رەگە دێرینەیە، تا ئێستاش، لە شۆڕشی نوێوە، بۆ راپەڕین، بۆ حکومەت‌و پەرلەمان، بۆ دوو ئیدارەیی، بۆ یەکگرتنەوەی حکومەتی هەرێم، لە شەڕی ناوخۆداو لە پەلکێشکردنی سوپای وڵاتانی داگیرکەری کوردستاندا، لەپشتی جۆرەها بەرگ‌و رەنگدا، درێژەی پێدراوە.

## ( ٢٠ )
## رەگەزەکانی زەبروزەنگ!

نەریت‌و کولتوری کوردەواری، هێندەی پەرژینی پاراستنی پەروەردەی رابوردووە، چارەکێکی ئەوە، بواری تیا نییە بۆ وەرگرتنی کولتوری نوێ.. نوێ بە چەمکە نوێگەریەکەی، سەردەمی شۆڕشی دیموکراسی، بە چەمک‌و رەهەندە سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و کولتوریەکەیەوە.

خۆم بێبەری ناکەم لە روداوگەلێک، وەکو یەکێک لە نەوەی دووەم. منیش لە کارلێکا (تفاعل) بووم لەناو روداوەکان. لەکوێ هەڵەم کردبێ، جگەلەوەی خۆم بەرە بەرە رەخنەیان لێدەگرم، رەخنەشم لێبگیرێ، دەیسەلمێنم. بەڵام ئێستا کە باسمان لە زەبروزەنگ‌و دیلکوشتنە، شانازی دەکەم کە تاقە دیلێکم لەژیانی پێشمەرگایەتیدا نەکوشتووە. زەبروزەنگیشم بەرامبەر هاوڵاتی بەکارنەهێناوە. مێژوونوس‌و نوسەران، دەتوانن لە راستی‌و ناڕاستی ئەم قسانەم، لێکۆڵینەوە بکەن. بەڵکو بەقسەی سەروی خۆشم نەکردووە، دیلی لایەکان بکوژم. بەپێچەوانەوە ئازادم کردون. دیلم کردۆتە پێشمەرگە لە دەستەی خۆمدا، وەکو (شەهید حەمە پشتەیی-قیادەی موەقەتە).

شەهید ریباز، لە دڵسۆزیی خۆی‌و نەفرەتکردنی لە شەڕی ناوخۆ، لە کتێبی (قەندیل بەغدای هەژاند)دا، پەرۆشیی هانیداوە، ئەم دەقەم لەسەر بنوسێ:

"کاک مەلا بەختیار رێککەوتن نامەیەکی لەگەڵ کاک بەهادین نوری لێپرسراوی هێزەکانی حزبی شیوعی عێراقی لە ناوچەی سلێمانی مۆر کردبوو، بەگوێرەی ئەو رێکەوتننامەیە هێزەکانی حزبی شیوعی عێراقی خۆیان لەشەڕی ناوچەی سلێمانی دوور گرت. لەکاتێکدا هێزەکانی ح.ش.ع لە هەولێر زۆر بەگەرمی پیلانیان دادەڕشت بۆ گرتنی مەڵبەندی چواری ی.ن.ک. ئەوەی لێرەدا جێگای سەرنج راکێشانە کاک مەلا بەختیار

پاش ئەوەی لە ی.ن.ک جیابۆوە دەیان بڵاوکراوەی نووسی دژی شەڕی براکوژی، حزبە سیاسیەکانی دەکوتا بێ هەواڵ لەوەی کە خۆی رۆڵێکی کاریگەری هەبوو لە زۆربەی شەڕەکان بەتایبەتی شەڕی کانی سوور، ناوچەی هەورامان، مەڵبەندی یەک، بۆیە هەقە بڵێین: پاش لێزمەو باران کەپەنگ بۆچی..!؟".[1]

شەڕی "کانی سوور[*]- لە دەشتی کۆیەو دەکەوێتە بناری شاخی خان قووڵ" بە تۆمارکراوی (دەنگو رەنگ)ی خەڵکی گوندەکەم لایە، کە باسی دەکەن، چۆن مەفرەزەیەکی پارتی ئێمەیان خستە کەمینەوەو چۆنچۆنیش، بۆ بەیانیەکەی قالە فەرەج، هاتبووە گوندەکەو گوتبووی: "ئەمجارە مەلا بەختیار لەدەستمان دەرچوو، بەلام دەبێ سەری مەلا بەختیار بەرمەوە بۆ ئیستخبارات".

شەڕی کانی ژنان-تاوگۆزی-هەڵەبجەش، حەمەی حەمەسەعیدو مامۆستا پشکۆ لەسەریان نوسیووەو راستیی روداوەکەیان وەکو خۆی، باسکردووە. پشکۆ نەجمەدین ئاوەها، بەشێکی شەڕی کانی ژنان دەگێڕێتەوە:

"گوندمان بەجێ هێشت، عەزیز و دیلەکانی هاوڕێی‌و جەستەی ئەنگێوراوی حەمە ئاواتمان لەگەڵ خۆ هەڵگرت‌و گەڕاینەوە گوندی کانی سالار. لەو شەڕەدا، هیچ دیلێک نەکوژرا، بەڵکو پێچەوانەی بۆچوونی هەندێ کەس (بەتایبەت موحەمەدی حاجی مەحمود، بڕوانە رۆژژمێری پێشمەرگەیەک!) کە ئەو، ئەوکات لە سەفەری (هەکاری) بووەو رووداوەکەی لە دەمی خەڵک وەرگرتووەتەوەو بەهەڵە دایڕشتۆتەوە. دیلەکان، بێجگە لە عەزیز، هەموویان رۆژی دواتر ئازاد کران‌و بریندارەکانیشیان تەسلیم بە کەسوکاریان کرانەوە".[2]

حەمەی حەمەسەعیدیش، وردەکاری شەڕەکە، بەمشێوەیەی خوارەوە دەنوسێ:

"ئێوارە عەزیز پێی وتین سبەینێ میوانی ئێمە بن‌و بچین بۆ دارو شەخسەکەی (بەڕوێن) لەوێ حەیوان دەکرین‌و دەیخۆین. ئەمە لەژێرەوە نامەیەکی بۆ قادری برای نووسیوە کە

---

١ ریباز. قەندیل بەغدای هەژاند. بەشی یەکەم‌و دووەم. سلێمانی- ٢٠٠٨. چاپی دووەم. لە زنجیرە بڵاوکراوەکانی بنکەی رۆشنبیری شەهید. ژمارە(٢٠). ل(٢٦٠).

* لە کانی سوور کە هەوڵی کوشتنیان داین. نامیق تەقتەقی، گیانی خۆی بەختکردو خۆی دایە بەر دەستڕێژی پارتیەکان لەناو ژوورەکەدا، یەکسەر شەهید بوو. لەهەمان تەقەکردندا، ئەحمەد سماقە، یەک سەڵیە گوللە بەر دەمی کەوت‌و لایەکی روومەتی هەڵدڕی. نامیق‌و ئەحمەد، دوو لە باشترین پێشمەرگەکانی کۆمەڵە بوون. نمونەی ئازایەتی‌و رەفتارو کرداری رەنجدەران بوون.

٢ پشکۆ نەجمەدین. ئەزموون‌و یاد- کتێبی یەکەم. فڕین لە شەودا (١٩٧٨-١٩٨٣). چاپی پێنجەم-٢٠١٩. ل(٧٧).

ئەمە بەشێک لە دەقی ناوەڕۆکەکەیەتی (ئێوارە گەیشتینە کانی ژنان جەلالیەکان هەژدە کەسن‌و لەگەڵ ئەحمەد (گرّیانە)یی لیّرەن. میوانم کردوون بۆ سبەینی نیوەڕۆ ئەیانهێنم بۆ دارو شەخسەکەی بەڕوێن ئێوەش وەرن، ئەگەر خۆشت نەهاتی جەماعەت لەگەڵ حەسە کۆرپەدا بنێرە بۆ لامـان). ئێمە لەکاتی گەڕانەوەی بێچەکەکەی ئەواندا ئەم نامەیەمان پێگرت. ئیتر لەناوەڕۆکی نامەکەدا نیازو مەرامی میوانەکەی سبەینی ئاشکرایە.

عەلی شامارو کاک ئەحمەد بانگیان کردم پێیان وتم تۆ بڕۆ بۆ (گەڕاو)و (لاوران) ئاگاداری مەلا بەختیار بکە".[1]

هەروەها دەنوسێ:

"بڕیار بوو هەرکات مەلا بەختیار بەدەنگی بەرز بانگ بکات کاوە، ئێمە گوێمان لە دەنگەکە دەبێت هەرکەسەو چەکدارەکەی تەنیشتی چەک بکات. سەرەتا کە بە دەنگی بەرز بانگی کرد کاوە، کوڕێک بەناوی (کاوە مەخمووری) کە بەرپرسی دەستەکەی خۆی بوو وتی: بەڵێ، مەلا دووبارەی کردەوە کاوە. ئێمە عەزیزمان چەک کرد لەگەڵ کوڕێکی تر بەناوی عەبدول ڕەحمان پاسەوانی عەزیزو خەڵکی سەرشاتە بوو، لەولاوە لەو شوێنەدا کە پێشمەرگەی هەردوولامان تێکەڵ بوون، بڕیارە مەحمود چەکیان بکا، بوو بە تەقە، عەزیز لە لای مندا بوو بە دەنگی بەرز هاواری ئەکرد، کەس تەقە نەکات من گیراوم با کەس نەکوژرێت. بەڵام تەقە نەوەستاو مـاوەی پێنج دەقیقەی خایاند. دوای تەواوبوونی تەقە عەزیزمان برد بۆ لای مەلا بەختیار، مەلا لەسەر سەنێرگەیەک وەستابوو، عەزیز کلاشینکۆفێکی یەکلاق‌و دەمانچەیەکی حەوت تیری پێبوو. وتمان: ئەوە عەزیزە و ئەوەش چەک‌و دەمانچەکەی. لەوساتەدا یەکێک لەلاوە هاتوو لەبەردەستی مـەلادا بەقۆناغی چەکەکەی کێشای بە بناگوێی عەزیزدا، مەلا زۆری پێناخۆش بوو. بۆیە توڕە بوو لەو هەڤاڵەو پێی ووت بۆ کاری ترسنۆکانە ئەکەیت پاڵێکی پێوەنا لەسەر سەنێرگەکە کەوتەخوارەوەو هەردوو لاقیان شکاند".[2]

پێش کارەساتی هەکاری، بەڵکو دوای شەهیدکردنی برایم عەزۆو هاوڕێکانی‌و حەمەغەفور ئاغجەلەری، بەش بەحاڵی خۆم لایەنگری چارەسەرکردنی کێشەی نێوان یەکێتی‌و قیادە موەقەتە بوم. بە نامەی شەهید عەلی عەسکەری، لەگەڵ ڕەسول مامەندو عەلی کۆ، وەکو وەفدێکی دەسەڵات پێدراوی یەکێتی، دەچوین بۆ لای

---

١ حەمەی حەمە سەعید. دەنگی خاک. بیرەوەری ١٩٧٦-١٩٩١. بەرگی یەکەم. چاپی یەکەم-٢٠١٦. ل(١٥٧).
٢ هەمان سەرچاوە. ل(١٥٩).

هـەردوولا. فازل جەلال (عـادل)ی قیادە موقەتەشمان لەگەڵ بوو. نەوشیروان بە دروستی دەیگێڕێتەوە:

"لە گوندەکە هەواڵی میوانەکانم پرسی. منیشیان برد بۆ لای ئەوان. جگە لە فاضیل جەلال «عادل»ی قیادە موقەتە، من کەسیانم نەناسی. بەخێرهاتنم کردنو لێم پرسین: «ئێوە کێن؟» زۆریـان پێ ناخۆش بو، بە تورەییەوە ئەوانیش لە منیان پرسی: «تۆ کێی؟». وتم: «من فڵانم بەڵام ئێوە کێنو بۆچی هاتونەتە ئێرە بەبێ ئاگاداری ئێمە؟». مەلا بەختیار هەڵی دایە وتی: «من مەلا بەختیارم نوێنەری کۆمەڵەم، ئەوە کاک رەسوڵ مامەندە نوێنەری بزوتنەوەیە، ئەوە کاک عەلی کۆیە سەربەخۆیە، ئەوەش فاضیل جەلالە نوێنەری ق م». وتم: «بۆچی ئەچن بۆ سوریا و چ کارێکتان لەوێ هەیە». وتیان: «ئەچین بۆ سوریا مام جەلال ئەبینینو، کێشەی ئێوەو قیادە موقەتە چارەسەر ئەکەین». منیش پێم وتن: «ئەگەر ئەتانەوێ کێشەی ئێمە و ق م چارەسەر بکەن پێویستە لێرەوە دەس پێ بکەن. هەر دولای کێشەکە لەم ناوەداین. ئەگەر ئەشتانەوێ مام جەلال ببینن. ئەوە پێویست ناکا بچن بۆ سوریا چونکە ئەمڕۆ ئەگاتە ئێرە».[1]

هەمان روداو، مام جەلالیش بەمشێوەیە دەیگێڕێتەوە:

"نەوشیروان مستەفا و کۆمەڵێک بـرادەرانـی تر، هاتبونە سـەر سنور. لە دێیەکی سەر سنوری کوردستانی تورکیا توشم بو بە توشی رەسول مامەند و مەلا بەختیارو هەندێ برادەری ترەوە کە هاتبون بۆ ناوبژی لەنێوان یەکێتیو پارتیو چارەسەریی ئەو گیروگرفتە، ئـەوان نەیان دەزانـی مەسەلەکان چیە و چ گۆڕانێک رویـداوە، ئیتر من مەسەلەکانم بۆ گێڕانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هاتنو هەوڵەکە درا، بەڵێ یەکتر دیتراو رێکەوتنمان دوبارەکردەوە کە جارێکی تر کەس شەڕی ئەوەی تر نەکات، هەرکەس ئازادبێ و پێکەوە دۆستو هاوکاربن".[2]

ئێستا، گومان لەسەر ئەوە نامێنێ کە لەناو وڵاتدا، سـەرەڕای ئەوەی هاوڕێکانیان شەهید کردبوین. هەر پەرۆشی چارەسەر بوین. لەدەرەوەی وڵاتیش تا ماوەیەک وابوو!

لەو دیدارەدا، یەکەمین جارم بوو مام جەلال ببینم. مام لە باسکردنی یەکەمین دیداری لەگەڵ مەلا مستەفا لە مۆسکۆ، دەڵێ: بورامەوە لەخۆشیا. بەڵام من زۆرم شانازی پێوە دەکرد. پەرۆشبوم، لەنزیکەوە گوێم لە قسەکانی بێ. دیدارێکی مێژوویی بوو. هەرگیز

١ نەوشیروان مستەفا ئەمین. لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ. ل(١٦٦).

٢ مام جەلال. دیداری تەمەن- لە لاوێتیەوە بۆ کۆشکی کۆماری. ئامادەکردنی: سەلاح رەشید. ل(٧٦).

بیرم ناچێتەوە. لە پرسیارکردندا، یەکەم دیالۆگمان ئەمەی خوارەوە بوو:

مام: تۆ کۆمەڵەی؟

من: بەڵێ.

مام: لەکەیەوە؟

من: لە دامەزراندنەوە.. چومە شانەی رۆشنبیری.

مام: مەوالیدی چەندی؟

من: ١٩٥٢ – خەڵکی خانەقینم.

مام: پێش کۆمەڵە سیاسەتت نەکردووە؟

من: نەخێر..

مام: ئارام هاتووە؟

من: نەخێر.. منی ناردووە، خۆیشی دێت.

مام: چۆن ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵەیت‌و بۆ ناوبژیی هاتوی؟

من: شەڕێکی خراپە.. خەڵک پێیان ناخۆشە.

مام: سودی نییە. منیش زۆرم هەوڵدا.

ئەم گفتوگۆیە.. پێش شەهیدکردنی حەسەن خۆشناو و هاورێ شەهیدەکانیتی.

کە گەیشتینە دۆڵی گۆستێ.. شەهیدان: د.خالید، سەعدی گچکە، شێخ حوسێنی ئێزیدی‌و سەید کاکەی لێبوون.

سەید کاکە.. لەوێ گێڕایەوە، کە لەگەڵ ئیدریس بارزانی دانیشتووەو پێی گوتووە: بچن لە هەکاری چەک هەڵبگرن، رێگە مەدەن، جەلالیەکان چەک‌و هاوکاری بگەیەننە کوردستان. سەیدیش پێی وتووە: ئێمە پێمان نەکرا، بۆ رێ لەوان بگرین شۆڕش بکەن. ئیدریسیش وتویەتی: "شۆڕشمان پێ نەکرێ.. پێمان تێکدەدرێ". لەگەڵ ئەوەشدا، سەید کاکەو شەهید سەعدی، ئازایانەو راشکاونە، لەگەڵ مام دەدوان‌و دژی شەڕی ناوخۆ، هەڵوێستیان هەبوو. تەنانەت لەگەڵ ئەوەش نەبوون، دژی ئێران‌و شا قسە بکرێ. پێکیشەوە بوین بە وەفد بۆ لای قیادە موەقەتە.. جەوهەر نامیق‌و سەربەست بێداوی‌و ملازم عەلی (ئێستا فەریقە)و یونس رۆژبەیانی نوێنەری پارتی بون، لە دێی (دەریاسور) دوو جار دانیشتین. بەداخەوە رێک نەکەوتین. جەوهەر نامیق سەرۆکی وەفدەکەیان بوو. رەقیش بوو. سەعدی‌و سەید کاکە، جوامێرانە بەرگرییان لە یەکێتی‌و مام جەلالیش دەکرد.

سەعدی.. نەرم بوو. پێدەکەنی. بەڵام قسە لەڕوو بوو. بوێر و باوەڕی بە باوەڕەکانی خۆی هەبوو.

سەید کاکە.. زۆرتر لە سەعدی قسەی دەکرد. نوکتەو سەرگوزشتەی زۆری دەهێنایەوە. بەتەنها رشتەی مرواریییەک بوو بۆ خۆی.

جەوهەر نامیق.. ریشی بەردابوەوە. هەموو رێزیان دەگرت. جار جار ئاماژەی بە قسەکانی سامی عەبدولرەحمانی دەکرد، وەکو مەرجەعێکی سیاسی.

ملازم عەلیو یونس رۆژبەیانیو سەربەست بێداویش، رووخۆش. پاک. ئاشتەوایییان پێ خۆشبوو.

کە گفتوگۆکانی ئەو کۆبونەوانە، بە ئەندێشەی دوایساڵەها کێشەی شەڕی ناوخۆ، تاوتوێ دەکەم، ئێستا کە رقی دونیام لە شەڕی ناوخۆ، تەنانەت لە قەبەکردنی ناکۆکی لاوەکی نێوان هێزەکانیشە، بۆ مێژوو دەیڵێم لەو کۆبونەوانەدا، بەڕاستی پارتی-قیادە موەقەتە، نەیاندەویست ئاشتەوایی بکەن. سور بوون لەسەر بۆچونەکانی خۆیان. دیاریش بوو، بەهیچ چەشنێک، بوونی یەکێتی لە برادۆستو بادینان قبوڵ ناکەن. بەردەوامیش، لە قسەکانیاندا دەگەڕانەوە بۆ شەڕی جەلالی-مەلایی. تەنانەت ئەتەکێتیش لە قسەکانی جەوهەر نامیقدا، کەم بوو. هەر دەیگوت: جەلالی وایان کردو جەلالی وای کرد. شەهید سەعدی رەخنەی لێگرت.. وتی: بەوشێوەیە قسە بکەی، ئێمەش کە هەموو تەمەنمان داوەتە شۆڕشی ئەیلولو پارتی، ناچار دەبین وەکو تۆ قسە بکەین.

لەو کۆبونەوانە ئەزمونم کەمبوو. تەمەنیشم کەمتر بوو. بۆیە، کەمترین قسەم دەکردو زۆرترین گوێم دەگرت. کە گەڕاینەوە بۆ لای مام جەلال.. بۆچونەکانمان بۆ گێڕایەوە. وتی: دەمزانی وا دەبێ، بەڵام باشتر کە خۆتان گوێتان لە بۆچونەکانیان بوو. ئێمە هەر پێداگریمان لەسەر ئاشتەوایی دەکرد. هەتا گەڕاینەوە خوارەوە. نامەمان بۆ هات کە حەسەن خۆشناو و هاوڕێکانی شەهید کراوون.[*] بڕیاری مەکتەبی سیاسی درابوو، دەست بکرێتەوەو بەرگری لە یەکێتی بکرێ. لەگەڵ سەید کاکەو سەعدی گچکەو قادر عەزیز، منو عەلی ساڵحو شەهیدان: سەید کەریم، رێباز، شاخەوان، فاروقو محەمەد عەجەم، کۆبوینەوە. تەنها منو هاوڕێیانی کۆمەڵە ئامادەبوین، بڕیارەکە جێبەجێ بکەین.

* لە گوندی کانی بی، بەهاوکاری خەڵکی گوندی باویان- ناوچەی راشیدان-هەکاری، لە(١٩٧٧/١٠/١٣) لەبوسەیەکدا شەهید کران، کە ئەمانە بوون: ١-حەسەن خۆشناو. ٢- باهیر ئەحمەد (میردێ). ٣- کەمال محەمەد حسێن (ماوەت). ٤- نەجات نورەدین (کەرکوک). ٥- عەلی کوێخا هۆمەر (باوزێ). ٦- خدر ئەحمەد (قەلادزێ). ٧- عەبدولمەلیک بەرزنجی (توزخورماتو). دوو کوردی سوریاش (عەزیز چەرکەسو خالید حسێن).

ئەوان كوتیان: دەستمان بە شەڕی ناوخۆوە سوتاوە، قەت نایکەین. ئەم دوودلییە لەناو بزوتنەوە، بۆ بڕیاردان کە بەرگری لە یەکێتی بکرێ، هەتا جیابونەوەیان بەردەوام بوو. کە جیابونەوە، چونە پاڵ پارتی. کەچی بەئاسانی بڕیاری شەڕکردنیان لەگەڵ یەکێتی دا! ئەمیش، هۆکارێکی بۆ ئەو ناکۆکی سیاسی-سایکۆلۆژیەی جەلالی-مەلایی دەگەڕایەوە.

## ( ٢١ )

## زیانەکانی فرە هێزیی

خەسڵەتێکی زیانبەخشی شۆڕشی فرە هێزیی، ئەگەری روودانی شەڕی ناوخۆیە. جەماوەر ئەوەندە شەڕی ناوخۆی پێناخۆشە، ناوی ناوە (براکوژی). لەکاتێکدا، براکوژی لە ئەدەبیاتی سیاسیو خەباتی چینایەتیو شەڕی ناوخۆ (الحرب الاهلية) وەکو دەستەواژە بەکارنایەت.[+] بەڵام ئەزمونی جەرگبڕاوی شەڕەناوخۆکان. کوردی ناچار کردووە ناوی بنێ شەڕی براکوژی.

هێزێک چەک هەڵبگرێ، لەبەرامبەر هێزی تردا، ئەگەر دەستپێشخەری شەڕیش نەکات، بەڵام کە شەڕی پێفرۆشرا، یان دەبێ ئاڵای سپی سەرشۆڕیی بەرزبکاتەوە، یاخود بەرگری بکات.

لۆژیکی شەڕ وایە. شەڕ، لە ڕیڕەوی خۆیدا، ئەحکامی تایبەتی دروستدەکات. هێزی چەکداری ئایدیۆلۆژستی لەدونیادا نەبووە، کە پەلاماردرابێ، تەواوی هێزەکە ئاڵای خۆبەدەستەوەدانی شەکاندبێتەوە. هەن بۆچونی وایان هەیە، بەڵام جگەلەوەی بۆچونەکان خۆدزینەوەیە لە ئەرکی خەبات، وازهێنانیشە لە پرەنسیپی.. بەرەنگاری پیرۆز. بەڵێ بەرەنگاری پیرۆزە، نەک پەلاماردان.

---

+ نیکوس کازانتزاکی، یەکێک لە گرنگترین رۆمانەکانی ناوناوە (الاخوة الاعداء) بەڵام (عەبدولکەریم شێخانی) هەر لەبەر نەفرەتی لە شەڕی ناوخۆ بە (براکوژی) بەجوانی وەریگێڕاوە. وەرگێڕانە راستەکەی (برایانی دوژمن)ە. لەم رۆمانەدا نوسەر، وێنەیەکی نایابی سەرلێشێواوی فەلسەفیو رۆحی ئەو سەردەمەی رەوتە سیاسیەکانی یۆنان دەکێشێ. وەکو نوسەریش، پێیوایە، دەشێ لەهەموو فەلسەفەکان، بە ئایینی مەسیحیشەوە، مارکسیەت، سود وەربگیرێ!

ڕۆمانسیەت، یان سۆزی پەتیی، لە گەرمەی شەڕو پێکدادانەکاندا، خۆی لەبەردەم هێرشی پەلاماردەردا ناگرێ. هەمان سەید کاکەو سەدان پێشمەرگەی بزوتنەوە، کە باوەڕیان بە شەڕی ناوخۆ نەبوو، لە هێرشەکانی هەکاریدا ناچار بون بەرگری بکەن. شەهید سەعدیش لەوێ با، زیاتریشی بەرگری دەکرد. خۆ عەلی عەسکەری هەتا کورد حەزبکات، دژی شەڕی ناوخۆ بوو. خۆیشی رادەستی پارتی کرد، بەڵکو تێیانبگەیەنێ، بۆ شەڕکردنیان نەهاتوون. بەڵام سودی نەبوو. شەهیدیشیان کرد.(*)

تا ئێستا، کۆمەڵناسی کوردەواری، لە توێژینەوەدا لاوازە. لەو باوەڕەدام، رشتەی مرواری، لە زۆربەی ئەو باسانەی لەسەر کۆمەڵناسی کوردەواری نوسراوون، باشتر لە هەموو بارێکەوە کوردەوارییان ناساندووە. بەبێ ئەوەی عەلائەدین سەجادی، گوێی دابێتە نەریتو کاریگەری ئاین. هەرچی بیستووەو تۆمار کردووە، بێ ئارایش، کردویەتیە شاکاری کوردەوار ناسی.

جگە لە ناوهێنانی هۆزو خێڵەکانی باکووری کوردستان، جگەلەوەی نوسیومانە "میت" هانی داوون، توێژینەوەیەک لەسەر هۆز بە هۆز، خێڵ بە خێڵ، لەمەڕ: خو و رەوشتیان، نەریتیان، پێکهاتەی دەرونییان، کەلەپورو فۆلکلۆریان، پەیکەرەی عەشایرییان، رادەی کاریگەری پارتی لەسەریانو رێژەی رقیان لە یەکێتی. تا ئێستاش بنچو بنەوانی ئەوانە نازانین. لەکاتێکدا، لە زانکۆو ناوەندە زانستیە مرۆییەکاندا، بەردەوام عەودالی کاریگەری میتۆلۆژیا (ئەفسانەناسی)ن. لەناو هەندێک هۆزی ئەفیریقیاو ئەمریکای لاتین. هەر لەم رێیەوە، سەرەتاکانی پشکوتنی ئەندێشەی مرۆڤایەتییان دەستنیشان کردووە. تا دەگاتە داستانناسیو چۆنیەتی سازدانی تەقسەکان. کە سەرەتاکانی هێماکانیان بەرجەستە کردووەو هەستی رێسای کۆمەڵایەتی-رەوشتییان، هێناوەتەئاراوە. رەگو ریشە دەستنیشانکردن، گەلێ گرنگە. هەر هێزو سیستەمێک پرۆژەی رۆشنبیری ستراتیژی بۆ بنچو بناوانی زانینی مێژووی کۆمەڵایەتی، نەبێو نەزانێ، بێگومان لە بۆچونە ئابوری-سیاسیو چینایەتیەکانیدا، لە دەستنیشانکردنی پێکهاتەی سایکۆلۆژی کۆمەڵایەتیدا، ستراتیژی سیاسیو رێبازی ئایدیۆلۆژیەکەی لەسەر بنەمایەکی فشۆڵ دادەڕێژێو سەرئەنجام دەشکێ.

نەبونێ ئەو توێژینەوانە، لەسەر نەریتی دێر زەمانی کوردەوارییو گەڵاڵەکردنی بەرنامەی چارەسەرکردنیان، خۆی لەخۆیدا، هێشتنەوەی رەگەزەکانی زەبروزەنگیە، لە کۆهەستی کوردەواریدا.

---

* عەلی عەسکەری، وەکو شەهید قازی محەمەدی بەسەردا هات. قازی خۆی رادەست کرد، گەلەکەی بپارێزێ. نە خۆیو نە گەلەکەشی پێ پارێزرا. شەهید عەلیش، نە خۆیو نە هێزەکەشی پێ پارێزرا!

لـەم سۆنگەیەوە، خوێندنەوەی ئاینەکان، بەتایبەتی ئیسلامی، کە چۆن رەگـەزە دێرینەکانی زەبروزەنگ، لە بۆتەی فەلسەفەی ئایدیالیستیدا، بەسەر یەکدا دەشێلێ، نەک لە دوائاکامدا، چارەسەری ناکات، بەڵکو سەرلەنوێ، دوای شێلانی، هەمان زەبروزەنگ، لە بەرگی پیرۆزییدا حەڵاڵ دەکات؛ تا رادەی جینۆسایدو رەشەکوژیو ئەنفالی جۆراوجۆر.. هەتا ئێستاش.

نەک، هێزی دینیو دونیایی چەکدار، کە پەیڕەوی لە زەبروزەنگ، بە رەوا و ناڕەوا دەکەن، بەڵکو دیاردەی تالانیو دەرکەوتەی جاشایەتیش پەیوەندییان بەوەوە هەیە، هێشتا رەگەزە چەقبەستوەکانی سەدەکانی ناوەڕاست، بەڵکو پێشتریش، لە نەریتماندا ماوە.

کە جاشایەتی دەبێتە دیاردە، دیاردە لەسەر چ رەگەزێک دروست دەبن؟ هیچ جیاوازیەک لەنێوان جاشایەتی سوارەی حەمیدیە لەسەرەتای سەدەی بیستەمداو چونەپاڵ خەلیفە خوێنڕێژەکانی مێژووی قەڵەمڕەوی سەدەکانی ناوەڕاستی ئومەویو عەباسیەکاندا، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا نابینم. ئەوانەی لەسەردەمی ئومەوی، یان عەباسی، یاخود سەفەوی، بە هەر پاساوێک چەکیان بۆ هەڵگرتبنو تالانو بڕۆیان بۆ کردبن، شەڕیان لەگەڵ هاونەژادەکانی خۆیانو ئەقوامی تردا، بۆ ئەو قەڵەمڕەوانە کردبێ، لە بەرگی ئاینو مەزهەبدا هەر خۆفرۆشیی بووە. سوارەی حەمیدیەش بەهەمان خوو رەوشتەوە، ئەرمەنیەکانیان قڕ دەکرد. جاشەکانی کۆتایی سەدەی بیستەمیش لەسەر هەمان رێچکەی خۆفرۆشیو تالانی، لە نەتەوەکەیان هەڵگەڕاونەتەوەو چونەتە پاڵ داگیرکەران. ئەگەر، بنەوانەکانی خۆفرۆشی، لەو رابوردووە دێرینەوە هەڵنەگیرابێ، ئاخر:

چ نەتەوەیەک لەسەر ئەرز هەیە (١٠) هەزار پێشمەرگەو (٥٠٠) هەزار جاشی بوبێ؟!

ئەمە رەگـەزی گولی کۆمەڵایەتیە. هەر ئەم رەگـەزانـەش، چاوگەی کوێرەوەریو سەرکوێرییە. چۆن دابونەریتی پێش ئیسلام، وەکو (رەدوکەوتن، کەوش، رەشبەڵەک، کەلەپورو فۆلکلۆر..تاد) هی پێش ئیسلام، لە کوردەواریدا ماون. بەهەمان شێوە، رەگەزە ئابوری، کۆمەڵایەتی، نەریتگەریەکانی خۆفرۆشیو زەبروزەنگیش، ماوون. مانەوەی ئەم رەگەزانەشە، لە بواری سیاسەتیشدا و لەناو حیزبەکانیشدا، ئێستاش بڕیاری سەرکردە (سـەر+کردە) ئەگەر (سـەری نەکردە)ش بێ، زۆرینەی چەکدار، وەکو مێگەل، دوای

دەکەوون. هەتا رادەیەک، سەدان سەرەک جاشیش دروست دەبن.(*) ئەمە جگەلەوەی بەناوی تەریقەتیشەوە، سەدان بەڵکو هەزاران کۆیلەی رۆحی، دوای شێخی دواکەوتوی وا دەکەوون، تەنها بۆ کۆیلەکردنی پڕۆ تەریقەتەکە، شێخە، ئەگینا فڕی بەسەر شێخایەتیەوە، تەنانەت بەسەر ئاینیشەوە نییە!!

لەناو ئەو گەوهەرە کۆمەڵایەتیو کولتورە وەرنەچەرخاوەدا، تا ئێستاش، حیزب دروست دەبێ. ئایدیۆلۆژیەت بە پاساوی سیاسەتی ریالیستی گەڵاڵە دەکرێ. سەرکردە دەکرێتە رەمزی نەتەوەو حیزب، تا ئەو رادەیە، کادری کۆیلە لە خشتەی بڕیاری زەبروزەنگ دەدەنو تاوانیشیان پێ دەکەنە ئەرکی حیزبیو حیزبایەتی! بە شەڕی خوێناوی ناوخۆشەوە!!

لەناو کۆمەڵێکی وادا، فرە هێزیی سەرچاوەی کارەساتە. نەک "پلورالیزم"ی سیاسیو هزری. بەڵکو یەک قۆناغ لە مێژووی شۆڕشی نوێی کوردستان، یان هاوزا فەلەستینیەکەمان، بە هێزە دونیاییو دینیەکانیشەوە، نادۆزرێتەوە، فرە هێزیی لایەنە سیاسیەکان، سەرچاوەی کارەساتی شەڕی ناوخۆ نەبوبن. ئەم فرە هێزییە، تەنها لە دۆخێکدا مەترسیان لەسەر دەسەڵاتی هێزەکانی تر نەبێو مەترسی نەکەوێتە سەر ناوچەکانی نفوزی هێزی تر. وەکو باوەڕ، باوەڕیان بە ئازادی سیاسی هەیە، بەڵام هەر دۆخێکی تر بخوڵقێ، هێزێکیان مەترسی بخاتە سەر هێزێکی تریان، یان چەند هێزێکیان، باڵادەستیان، یان پارسەنگی دەسەڵاتیان بخاتە مەترسیەوە، بەئاسانی پەنا دەبەنەوە بەر زەبروزەنگ.. چونکە زەمینەی دەستکارینەکراوی زەبروزەنگ، بۆ هەڵگەڕانەوەی چەکداریی سازە. لە ماوەیەکی کەمیشدا، هەر هێزێک خواستبێتی، یان بخوازێ، بە هێزی چەکدارو پروپاگەندەی سیالۆژی (سیاسی-سایکۆلۆژی) دەتوانێ هێز دابڕێو ناوچەیەکیش پاوان بکات، شەڕی ناوخۆش حەڵاڵ بکات. چونکە، ئەندێشەی هێزی کوشتن، هێزی سەرکوتکردن، هێزی لەناوبردنی ئازادیو جیاوازیە تەندروستەکان، بەردەوام ئامادەیی کۆمەڵایەتی-کۆنەپەرستیان هەیە!

---

* -١٩٨٤

١٩٨٥) کاتێک حکومەت دەرگای جاشی سوکی کردەوە، بۆ دژایەتی ئێران، زۆربەی ئاغاو سەرە خێڵەکان، تەنانەت کوڵکە کوێخای وا ریزیان بۆ جاشایەتی دەبەست، بۆ جاشایەتی نەبێ، کەس بەقسەی نەدەکردن. لەماوەیەکی کەمدا، سەدان هەزار چەکداریان دروستکرد.

( ٢٢ )

## به هەق‌و ناهەق دەست نەپارێزرا!

شەڕی رزگارکردنی بێتواتە، لەدوای شەڕی شومی قڕناقاو پشتئاشان، یەکێک لە شەڕە هەرە سەرکەوتوەکانی شۆڕشی نوێ بوو. تا رادەیەک، ئازاری شەڕی ناوخۆی لەناو خەڵکدا بیر بردەوە.

یەکێتی، کە بارەگاکانی سەرکردایەتی لەدەستدابوو. مەڵبەندەکانی دروستکردبوو. جارێ دڵنیانەبوبوو لە سەرهەڵدانەوەی دانوستان. بەڵام نەدەکرا، بارەگای سکرتێری گشتی‌و مەکتەبی سیاسی، لە گوێزە گوێزەدا بێ. حکومەتیش، لەو کاتەدا کەمفرسەت بوو، دەیانویست لەڕێی جاشەکانەوە، تەنگی زیاتر بە یەکێتی هەڵبچنن‌و هێزی بۆ داچێنن، هەتا ناچار بکرێ، دانوستانێکی لاوازی کەم دەستکەوت، لەگەڵ حکومەتدا بکات. مام جەلال گەیشتبووە بۆتێ‌و گەشتێکی دۆڵی بالیسانیشی کردبوو. ئەنوەر بەگ، کە خۆی بە میری میرانی ناوچەکە دەزانی، مەلایەکی ناردبووە لای‌و هەڕەشەی کردبوو، ئەگەر مام جەلال دەڤەرەکە چۆڵ نەکات، هێرشی دەکاتە سەر.

مام جەلال لەکاتی وادا، بێڕادە ئازا بوو. قسەی لە هیچ دەسەلاتدار و هێزدارێک نەدەخواردەوە. بۆ توند وەڵامدانەوە، وەزیرو گزیری نەدەزانی. بە تەلەفون، لە تاراندا گوێم لێبووە، بە وەزیری بەرگری ئێرانی وتووە: تۆ درۆزنی.. چونکە گفتی دابوو فرۆکە بۆ گەیاندنی چەکەکانی یەکێتی بۆ سنە فەراهەم بکات، نەیکردبوو. لە دانوستانی ١٩٨٤یش، توند وەڵامی هەڕەشەی تاریق عەزیزی دایەوە. عیزەت دوری لە کۆبونەوەیەکدا قسەی سەدامی هێنایەوە، وتی ئەمە لای ئێمە یاسایە. مام پێی ووت: لای ئێوە یاسایە، ئێمە تەنها دەستورێک گەل هەڵیبژێرێ، بە یاسای دەزانین!

مام بە مەلاکەی گوتبوو: هەرچیەک وەڵامی ئەنوەر بەگ بدەمەوە، پێی رادەگەیەنی؟ وتبوی: بەڵێ قوربان. مام وتبووی: پاچکم بە پاشی ئەنوەر بەگ، ئەگەر بهێڵم لە بێتواتەش دانیشێ. بەڵام پیاو بێ کە بۆی دەڕۆین، هەڵنەیەت. مەلاکە وتبووی: قوربان قسەی وا چۆن دەگەیەندرێ؟! بەهەرحاڵ..

مام، دۆخەکەی باش لێکدابوەوە. جاشەکان لەگەڵ حکومەتدا، ویستبویان هەر نەخشەیەکی یەکێتی هەیە، پەکی بخەن. لە چوارقوڕنەوە (١٩٨٣/١٠/١٤) رژێم هێرشی کردە سەر مێرگەسەرو گرتیان. ئەنوەرو جاشەکانیشی دوو رۆژ دواتر (١٩٨٣/١٠/١٦)

پەلاماری شاخی نوسەکیان داو تیپی ٩٣/ی دانای ئەحمەد مەجیدو تیپی ٩٩/ی عەبدوڵڵای مام عەلی، لاوازییان نواندو لەهەردوو قوڵ شکان. بەمەش، بەگشتی دێهاتە هەرە باشەکانی ناوچەکەیان کەوتە ژێردەست. بەم شکستەی ئەو دوو تیپە، کە مام جەلالی زۆر تورە کرد، مەترسی زیاتر کەوتە سەر یەکێتیو هاوکێشە عەسکەریەکەی سەروبەندی دانوستان. مام، هەموو توانای یەکێتیو کۆمەڵەی خستە کارو زانیاری وردی لەسەر کۆی دێهاتو هێزەکانی بێتواتە، کۆکردەوە. ناوچەکەش زۆر سەخت بوو. زنجیرە شاخی: (هەورێ، شیرێ، ماکۆک) شاخی هەرە سەخت بوون؛ پێویست بوو، هێرشیان بکرێتە سەرو بگیرێن، دەنا بە شەڕی پارتیزانیو دوراودور تەقەو گڕی ئاڕ بی جی هاویشتن، سودی نەبوو.

- مەڵبەندی چوار، بە فەرماندەیی شەوکەتی حاجی موشیر شاخی هەورێو دێهاتەکانی دامێنیان پێ سپێردرابوون.

- مەڵبەندی سێ، فەرماندەیی حەسەن کوێستانی، بۆ شاخی شیرێو دێهاتی دەوروبەریان بۆ دیاریکردبوون.

- مام جەلال، بۆ شاخی ماکۆک کە ئەڕوانێتە سەر دۆڵی شاورێو دۆڵە رەقە، فەرماندەکان: (عەلی نەبی، مامە ریشە، حەمە رەشو بەشێکی هێزەکانی سوارئاغا).

شەوی (٢١/٢٠)ی١٠/١٩٨٣، کەرنەڤاڵی هێرشی هێزەکان دەستپێکردو هەڕەشەو گوڕەشەکانی جاشایەتی، لەبەرامبەر ورەی پێشمەرگایەتی، وەکو بڵقی زەلکاوێکی بۆگەن، هەڵتۆقینو جاشەکان تۆقین. ئەم سەرکەوتنە بۆ یەکێتیو مام جلالو فەرماندەکان، وەکو شانازییەک لەمێژوودا، تۆمارکرا. بەڵام (٥) مانگ پێشتر، شەڕی شومی قرناقاو پشتئاشان، بۆ یەکجاریش یەکێتی، وەکو شانازی یادی نەکردەوە!! ئەمەیە جیاوازی شەڕ دژی داگیرکەرو خراپی شەڕی ناوخۆ.

ناوچەی خۆشناوەتی، ئاکۆیەتی، سنوری دوو مەڵبەندی سێو چوار، ئازاد کران. ورەی خەڵک بەرزبویەوە. پیاوانی رژێمیش، داتەپین.(*)

بەپێی ئەو لێکدانەوەیەی سەرەوە، کە باسی زەبروزەنگو تالانیمان کرد، با بزانین، ئەم سەرکەوتنە شکۆمەندە؛ ئەم قارەمانێتیە دەگمەنە؛ ئەم گۆڕینەی هاوکێشەی عەسکەرییە؛

---

* عەقید ئیحسان (ئەبو عودەی) سەرۆک موخابەراتی (مەنتیقەی شیمال) بوو. لە مفاوەزاتەکە، بە ملازم عومەری وتبوو: سودگ سەویتوو بەگ؟ بەگ لە زمانی عەرەبیدا واتا: مێشولە. مەبەستی ئەنوەر بەگ کرایە مێشولە، ئەوکاتە لە کەرکوک دایاننابوو!

با بزانین، بە رەفتاری جوانو خزمەتی خەڵکەکە، سەرکەوتنەکە لە ویژدانی خەڵکەکەشدا، جێگیر کراوە؟ یان بەپێچەوانەوە، رەفتارو کرداری دزێوی وا نوێندراوە، نرخیان بۆ سەرکەوتنەکەش نەهێشت. با بزانین، چی لە دیلەکانو چیش لە دەستکەوتەکان کراوە؟ نوسەری کتێبی (چەپکێک) کە هەمیشە پاساوتاش بووە بۆ تاوانو تالانی، لەبەرامبەر تاوانو تالانی شەڕی بێتواتەدا، ویژدانی جوڵاوەو لەژێر ناونیشانی (دوو رەفتاری ناپەسەند)دا دەنوسێ:

"١- کوشتنی بەناحەق و دیل.

٢- تاڵانو دزی لەخۆ و خەڵکی.

بۆ یەکەم جاربو پێشمەرگەی یەکێتی پەلاماری رەبایا یان جاش بداو تەسلیمبوەکان کە دەستیان بەرزکردبێتەوە واتە دیل، بیان کوژن، بە ڕاستی لە گوندی (نێوە)کە، کەوتبوە قوڵی یەکەمی شەڕەکە (شەوکەتی حاجی موشیر) فەرماندەیی دەکرد، قەسابخانەیان دانا، شەڕکەرو ناشەڕکەرو خۆڕاگرو خۆتەسلیم کەریان بەیەکەوە کوشت تەنیا لەو دێیە (٤٠) چەکداری تیا کوژرا، ئەو دێیە پێش هاتنی سوپای ڕژێمو بە زۆر چەک پێهەڵگرتنیان لەلایەن (ئەنوەر بەگ)ەوە، جێگای حەوانەوەو نوستنو خواردنی پێشمەرگە بوو، جێگای بڕوای پێشمەرگە بون بەدرێژایی شۆڕش نانەرو یارمەتی دەری شۆڕش بون. کەچی بەوجۆرە بە ناحەق قڕیان تێخستنو هەرچی کەلوپەلو ماڵی پەزمەنە کراوی چەند ساڵەی ژیانیشیان هەبوو نەما. واتە بە سەروماڵو داروبەردەوە ئەنفالکران. لە هەندێ گوندی تریش ئەو کارە ڕوویدا بەڵام بەو جۆرە سەرومڕ نەبوو."[1]

با جارێ کورتەیەک لەسەر دیلکوشتن بڵێین: لەناو شۆڕشدا جار جارە دیلکوشتن هەبووە. بەڵام نوسەر بەمەبەست، دیلکوشتنەکانی قڕناقاو پشتائاشانو عەبدوڵڵا سوور، باس ناکات. کە لەراستیدا، ئەو دیلکوشتنانە، بە گروپ گروپ، دەرگای کردەوە لە بێتواتەشدا خراپتر ئەنجامبدرێ.

نوسەر دەڵێ: شەوکەتی حاجی موشیر قەسابخانەی داناوە لە دێی (نێوە).. دەشڵێ: دێیەکی بەخزمەتو دڵسۆز بوون، کەچی بەناحەق قڕیان تێخستون..تاد.

سەیری ئەم دەستەواژانە بکرێ.. قڕتێخستن، قەسابخانە، (٤٠) کەس کوژراوون..

ئەوەی من زانیم، بەشێک لەوانە، یەکێتیش بوون. ئینجا، ئەم قەسابخانەو قڕتێخستنە، ئایا سزای بەدواوە هات؟ نەخێر. یەک فەرمانەدەش، لەسەر دیلکوشتن، لە گوڵ کاڵتری پێ نەوترا.

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٩٧-٣٩٨).

نوسەر، لێرەدا ویژدانی جوڵاوەو راستیەکان زیاتر دەدرکێنێ. دەنوسێ:

"تاڵانکردنو دزین: ئەمەشیان بەو ئاشکراییو بەو فراوانیە هێشتا لەناو یەکێتیدا ڕووی نەدابو. لە هەندێ شوێن هەندێ فەرماندەی مەفرەزە یان کەرت یان تیپ جاروبار و بە کەمی لە شەڕەکاندا ئەگەر چەکیان دەستکەوتایە، هەندێ چەکیان لادەداو لە ناردنی هەواڵی چالاکیەکان، باسی ئەو چەکانەیان نەدەکرد، بۆ مەسرەفی پێشمەرگەکان دەیانفرۆشتنەوە. بەڵام ئەمجارەو لەم شەڕەدا، نەک هەر چەکیان حەشاردا، بەڵکو:

- دەیان فەرشی ماڵانیان دزیو ئاودیویان کرد.
- دەیان دەرگای ماڵی چۆڵیان شکاندو بە نرخو بێ نرخیان بردنو ئاودیویان کرد.
- دەیان مریشکو کەڵەشێریان کوشتو سەربڕی.
- دەیان سەر مەڕو بزنو گاو مانگاو گوێرەکەیان بردو سەربڕیو ئاودیویان کرد".[1]

هەر لە زمانی مام جەلالەوە، کە باسی شەڕەکەی کردووە، ئەم قسانەش وتراوە:

"مام جەلال، لە هەڵسەنگاندنی هێزی پێشمەرگەی یەکێتیدا، بێهیوایی خۆی لەو هێزە خستەڕوو، بە شرەخۆرو تالانچی ناودێری کردن. ئەو، نموونەی شەڕی (بێتواتە) ی هێنایەوەو هەموو لێپرسراوەکانی بە دز، لەقەڵەم دان. ئەو، بە شیعرە ناودارەکەی شاعیری عەرەب، موزەفەر نەواب، ئاماژەی بەو لێپرسراوانە کردو گوتی: (هیچ کامێکتان لێ نابوێرم...)، ئەمە لەشکری هۆلاکۆیە نەک لەشکری ڕزگاریی کوردستان! من، بە چاوانی خۆم، (سەلاجەو موجەمیدە)م بەکۆڵی مەسئولەوە بینیوە! من، ئەم لەشکرەم هەیە، بۆیە ناچارم درێژە بە مفاوەزات بدەم!".[2]

لەوە زیاتر چی بڵێم: کە نوسەر خۆی نوسیویەتی. هەر خۆیشی دەنوسێ:

"بە رای من ئەو شەڕە گەوهەری پێشمەرگەو لێپرسراوی دەروون پیسو دزو گەندەڵو شرەخۆری دەرخست. لێ نەپێچانەوە لێکۆڵینەوە نەکردن لەو کەسانەو سزادانیان، دواتریش دەستخۆشی سەرکەوتن لێکردنیان، بووە هۆی دروستبوونی ڕەفتاری ناجوامێرانە، لەوێوە نەریتی ڕاو و ڕوتو شرەخۆریو دزیو گەندەڵی دەستی پێکرد".[3]

لێرەدا، زۆر گرنگە جومگە جومگە، هەندێک لەو بۆچونانەی نوسەر، بنوسینەوە:

- دەرون پیسیو دزو گەندەڵیو شرەخۆری پێشمەرگەی دەرخست؟

---

١ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٩٨).

٢ پشکۆ نەجمەدین. ئەزموونو یاد. کتێبی دووەم. ل(٢٨-٢٩).

٣ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٣٩٨).

- لێنەپێچانەوەو لێکۆڵینەوە نەکردن لەو کەسانەو سزانەدانیان.
- دەستخۆشی سەرکەوتن لێکردنیان.
- دروستبونی رەفتاری ناجوامێرانە.
- نەریتی شڕەخۆریو راوڕووتو دزیو گەندەڵی دەستپێکردووە.

دەک دەستت خۆشبێ. نیوەی ئەو قسانەشت راست بن. ئێمەی رەوتی رەخنەگریش، پێش دروستبونی ئالای شۆڕش، ئەو قسانەمان دەکرد. کەچی بەرپەرچ دەدراینەوە. بەڵکو تاوانباریش دەکراین. بەشێک لەو فەرماندانەیشان هێنایە سەرمان، کە نوسەر پێیاندەڵێ: ناجوامێر، دز، گەندەڵ، شڕەخۆر.. بەڵێ بۆیە سزا نەدەدران، بۆیە لێکۆڵینەوەشیان لەگەڵدا نەدەکردن، هەتا لە شەڕی ناوخۆدا بەردەوام بن. هەتا ئازادیەکانیان پێ سەرکوت بکەن. هەتا بەشێوەیەک دڕیان بکەن، سڵ لە هەڵکوتانە سەر هاوسەنگەرەکانیشیان نەکەنەوە.

سەرکردەی بیرو باوەڕی شۆڕشگێڕانە، کە رەفتاری دزیو دیلکوژی ئەنجامبداو سزا نەدرا، ئیتر ئەو رەفتارە، تەشەنە دەسەنێ. دەشبێتە خوویەکی شەڕ، بەڵکو بە مایەی شانازیش دەزانرێ. بۆیە، لادان لە رەوشتی شۆڕشگێڕانە، هەر لەسەرەتاوە دەبێ چارەسەر بکرێ.. نەک رێ بدرێ تەشەنە بسەنێ!! کە تەشەنەی سەند، لە گرێژنە دەردەچێ.

ئەوە نوسەری کتێبی (چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە)و دەیان نوسەری تری وەکو وی بوو، کە شانامەیان بەناوی کوردستانیبونەوە، بۆ بەرگریکردن، لەو پەروەردە سیاسیە دەکرد، کە لەشکری ئازادیخوازی کوردستانیان دەردی مام جەلال گوتبوی: کردە لەشکری هۆلاکۆ!! تازە.. هەموو تاوانەکان کران. هەموو تالانیەکان بران. هەموو ناجوامێرییەکان ئەنجامدران.. نوسەریش کرایە جەلادی هاوسەنگەران، تازە بەتازە، نوسەر، دانی پیا دەنێ، تاوانو تالان.. بۆتە خووی زۆربەیان.. هەتا دوای راپەڕینیش.[+] ئەو رەخنانەمان لەساڵی (١٩٨٠)وە هەبوو. بەڵام گوێی لێنەدەگیرا. هەتا شۆڕشەکەو یەکێتیەکەیان وا لێکرد.

---

[+] ئالای شۆڕش، لەدوای راپەڕین، لەناو بەرەی کوردستانیدا نەبوو. بۆیە، پشکی لە داهاتی تالانکراوی کوردستان نەبووە. جگە لە ئالای شۆڕش، حیزبی شیوعیو زەحمەتکێشانیش، بەشدار بوون لە تاوانی تالانکردنی کوردستان. هەتا بەرەی کوردستانیش هەڵوەشایەوە، چاودێری دارایی لەسەر پشکی حیزبەکانی بەرەی کوردستانی نەبوو. تەنانەت لە کۆنگرەکانیشیاندا، راپۆرتی داراییان لەسەر چۆنیەتی سەرفکردنی داهاتی گومرگەکان، دیزەبەدەرخۆنە دەکرد!! لەراستیدا، راپۆرتی دارایی لای سەرکردایەتی حیزبە کوردستانیەکان، هەر بایەخی نییە. قەواعیدی حیزبەکانیش بە نەبونی شەفافیەتی دارایی خۆشەکراوون.

لەکاتی ئەنفالەکاندا، عەلی بچکۆل، کە تێکۆشەرێکی پاکی سالانی خەباتو شۆڕش بوو، گەرچی لەناو شۆڕشدا، بەرامبەر تاوانو تالان، بێهەلوێست بوو. بەلکو زۆرجار بەرگری لە سیاسەتەکانی نەوشیروانیش دەکرد. بەلام کە ئەنفالەکان رویدا، ئازایانە لە رۆژنامەی "بەرەی کوردستانی"دا دەنوسی:

"لەم ئاوارەییو پەناهەندەییەدا، لە شکستی ئەمجارەو چەندەمین شکستی شۆڕشی کوردستان دا، پێویستە هەموومان بەووردی بەخۆماندا بچینەوە، تیشک بخەینە سەر کونجو کەلەبەرەکان، با چیتر جەماوەر چەواشە نەکەین، فێلیان لێ نەکەین با جورئەتمان هەبێ قەتماغەی برینەکان هەلدەینەوەو گۆشتە مردووەکان ببڕینو زامەکان هەتوان بکەین.

شانازی یە بۆ رۆژنامەی بەرەی کوردستانی کە دەست پێشکەری کرد لە ئاوالەکردنی لاپەڕەکانی خۆی بۆ یاداشت کردنی کەموکوڕی بزوتنەوەکەمان، بۆ خۆناسینو بەخۆداچوونەوە، بۆ راست گۆیی لەگەل جەماوەر. ئەگەر ئەم راست گۆییە ئەمڕۆش بەری نەبێت ئەوا بێگومان دەبێتە دەرسو پەند بۆ نەوەکانی داهاتووی گەلەکەمان.

نووسینەکانی ناو ئەم رۆژنامەیە جێگای لێ وردبونەوەو دیراسەکردنێکی قوولە بۆ دەست نیشان کردنی هۆکارە خۆییو بابەتیەکان. منیش دەمەوێ تیشک بخەمە سەر لایەنی رابوردووی پەیوەندی شۆڕش لەگەل جەماوەر.

حزبو رێکخراوەکانی کوردستان لەو سەردەمانەی شۆڕشی کوردستان بەهێز و دەسەلاتدار بوو لە ناوچە بەرفراوانە ئازادکراوەکان لەگەل جەماوەر دیموکراتی نەبوون. راست گۆو، دەست پاکو داوێن پاک نەبوون، هەرگیز رێگامان بە خەلک نەداوە رەخنە بگرن، گلەییمان لێ بکەن.

دوێنێ ئەوکاتەی دەسەلاتدار بووین بەلام نەبووبووین بە دەولەت کەچی بەهەموو شێوەیەک جوتیارانو هەژارانمان چەوساندۆتەوە جۆرەها فڕوفێلمان لێ کردوون، درۆمان لەگەل کردوون، بە قسەی لوسو زمانی درێژ قەلو مریشکو گیسکو بەرخمان پێ سەربڕیون، بە ناهەق لە کارو کاسبیمان کردوون، سوکایەتیمان پێ کردوون، چاومان بڕیبووە ناموسیان. هەر بەهۆی ئێمەوە خانوویان سوتاوەو دەربەدەر بوون، رەز و باغو بێستانیان سوتاوە. یان لە ناوچەکان دەسەلاتدار بووین، مالیاتی خەلک، رەزو

باغو بێستان، زەوی خەڵکمان تالان کردووەو دەستمان بەسەرداگرتووەو داومانە بە کەسوکاری خۆمان. جۆرەها تومەتی ناڕەوامان بۆ خەڵک دروست کردوە. تا مەرامەکانی خۆمان جێبەجێ بکەین.

چەندان خەڵک، لە شۆڕشەکانی کوردستان دا، بەم شۆڕشەوە دەوڵەمەند بوونو بون بە بازرگانی شەڕ. هەڵسوکەوتو معامەلەیان لەگەڵ خەڵک وەکو ئاغاکانی جاران بوو. رۆح زل، بە سوک سەیرکردنی خەڵک، قێز لێ کردنیان، گوێ پێنەدانیان، تەنانەت کردنیان بە مەقاش بۆ جێبەجێکردنی مەرامە شۆڕشگێڕەکان". [1]

مێژوو، هەموو ئەوانە دەهێنێتە گۆ، کە ویژدانی خۆیان نەدۆڕاندووە. هەموو ئەو رەخنانە، کە عەلی بچکۆل باسی کردون، لە سالانی (١٩٨٠)وە، رەوتی رەخنەگری ئالای شۆڕش، راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ، باسمان کردوون. بەڵام، نەوشیروان، بەجۆرێک، کاریگەری دەرونی هەبوو.. بە نەخشەش، زیرەکانە گەمەی بە ئاڕاستەکان دەکرد.. وای لە سەرکردەو کادرەکانی کۆمەڵە کردبوو، بەشی زۆریان بدەنە پاڵیو پاڵ بە رەخنەگرەکانەوە بنێن. لەگەڵ ئەوەشدا، دونیای سیاسەت، دۆخی ویژدان راچەنینی تێدایە، وەکو ئەمەی کاکە عەلی بچکۆل. [*]

لە راپەڕیندا، نەک ماڵو دە ماڵ، بەڵکو هەموو کوردستان تالان کرا. یەک فەرمانگەی حکومەت نەما، ئامێرەکانی تالانو ئاودیوی بازاڕی رەشی سنورەکان نەکرێن. نەک پارەی فرۆشراوی ئامێرەکان، بەڵکو پارەی گومرگی ئامێرەکانیش، لەناو لایەنەکاندا برابەش دەکرا. واتا: دوو جار دزی دەکرا. دزینی ئامێرو دزی داهاتی گومرگیش. ئاوەکە لەوساوە رژاوە.. تازە بەم حیزبانە، پاک ناکرێتەوە!! [+]

نەتەوەیەکی سەیرین.. دەهەیەک هێز پەروەردە بکرێ.. کە هەمان هێز بۆی دەلوێ، تالانی بکاتبەرگەی مانگێک ناگرێ. ئەم ئەزمونە، لەسەرەتای راپەڕینی رۆژهەلاتی کوردستاندا، بۆ تالانی، سەریهەڵدا. بەڵام، پاشان، دیموکراتو کۆمەڵە، کۆنترۆڵیان کردو دیاردەکە بنەبڕ کرا.

---

١ عەلی بچکۆل. سەختەڕێ لە چەمی ڕەزانەوە تا ترۆپک. چاپی یەکەم. سلێمانی ٢٠١٨. ل(٣٢٠-٣٢١).

* کە نەوشیروان ئەمری گرتنی عەلی بچکۆلی دەرکرد.. ماڵم لە ورمێ بوو. سەرەڕای ئەوەی، ئەم یەکێک بوو لەوانەی بڕیاری کوشتنی دابوین. بەندە تێلم بۆ کرد، بێتە ماڵی ئێمەو خەمی هیچیشی نەبێ. خۆی نەک نەهات، بەڵکو زەبروزەنگی نەوشیروانی بەجوانی بۆ دەرکەوتبوو. ئێرانی بەرەو پاکستان جێهێشت.

+ ئەوەی لە هەمووی ناخۆشتر بوو، حیزبی شیوعیو زەحمەتکێشانیش، لەو تالانیەی ئامێرەکانو گومرگەکان، بەشدار بوون. ئەمەش بەشێکی خەباتی چەپەکانی، خستە ژێر بەرپرسیارێتی نالەبارەوە!

(P.K.K) ئەزمونێکی دەگمەنە، لە رووی دیسپلینی عەسکەریو پشوودرێژی شۆڕشگێڕانە.. هاوکات، دەستپاکی. تا ئێستا، نەمانبیستووە لە گوندێک، شارێک، شەڕێک، گەریلاکان تالانیان کردبێ. لەرۆژئاواشدا، دەنگوباسی تالانکردن نییە. ئومێدەوارین ئەم ئاکارە، هەتا سەر بپارێزنو رێگە نەدەن، خووی شڕەخۆری لەناو ئەوانیشدا، تەشەنە بسەنێ. بەڕاستی تاقیکردنەوەی تالانی هێزەکانی بەرەی کوردستانی، لەدوای راپەڕینەوە، مایەی نەنگییە. هیچ لایەنێکی بەرەی کوردستانی بێبەری نەبوون لە تالانی. بە چەپەکانیشەوە. ئەنجامەکەشمان بینی.. کە پارتی-یەکێتی، زۆرترین باجی ئەو رەفتارو کردارەیان داوە. بەردەوامیشە.. خراپتریش بەڕێوەیە!!

# رشتەی حەوتەم:

## ئاڵای شۆڕشو جیابونەوەکانی تر!

## ( ١ )
# هەمیشە جیابونەوە هەبووە!

لە مێژووی سیاسی هاوچەرخدا، لەناو حیزبە سیاسیەکان، لە سەدەی رابوردوەوە، لەسەر رێبازو هەڵوێستی جیاواز لەکوردستاندا، هیچ لایەک نادۆزرێتەوە، بەئەندازەی ئاڵای شۆڕش، غەدری لێکرابێ‌و بە کەمترین بەرگری، هێرشی کرابێتە سەر.

حیزبێکی گەورەی وەکو یەکێتی؛ بە هەزاران پێشمەرگە؛ بە دەزگایەکی راگەیاندنی گەورە؛ بە رابەرو جێگرەکەی؛ بە زۆربەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی‌و سەکرتایەتیەکەی؛ بە زۆربەی فەرماندەکانی؛ ئەندامەکانی، کادرەکانی‌و دۆستەکانی.. بە عەسکەری، سیاسی، راگەیاندن، پروپاگەندە، زیندان، ئەشکەنجەدان، راونان، بوختان‌و رق هەڵڕشتن.. پەلاماری ئاڵای شۆڕش درا.

ئاڵای شۆڕش.. مەفرەزەیەکی جیانەکردەوە. دەزگای چاپ‌و چاپەمەنی نەبوو. پشتیوانی نەبوو. بارەگای نەبوو، رەوتێکی تازە فۆرمیلەکراوی نهێنی بوو. هێشتا تازە هەناسەی سەرهەڵدانی دابوو.. کۆبونەوەیەکی ئازادی نەکردبوو.. کەوتە بەر پەلاماردان. وەکو نێچیرێک، کەوتبێتە ناو رەوێک پڵنگ، وینجڕ ونجریان کرد. ئەو پەلاماردانەو هەڵمەتی راگەیاندنە، قەبارەی ترسی یەکێتی، بەتایبەتی کۆمەڵەی، بەرامبەر ململانێی ئایدیۆلۆژی‌و سیاسی‌و کاریگەری خاوەن هەڵوێستەکان بەرامبەریان دەرخست. دەریانخست، کە ئەوەندە هەڵەیان هەیە، ئەوەندە پرنسیپەکانی ئازادییان پێشێل کردووەو رەفتاری ئەوەندە نەشیاویان نواندووە، تەنانەت یەک مانگ ئازادی بیروباوەڕیان تەحەمول نەدەکرد!! لەگەڵ ئەوەشدا، بەحسابی یەکێتی، ئاڵای شۆڕش تەفروتونا کراوە.. هەتا ساڵی (١٩٩١)یش، هەڵمەتی راگەیاندنیان بە فراوانی، یان ناوبەناو، لەسەری رانەگرت. هەوڵێکی بێسنوریشیان دا، بەتەواوەتی سەرکردە، رێباز، هەڵوێست‌و رەخنەکانی نابوت بکەن؛ بەڵام مێژوو، زوو وەڵامی بوختانەکانی دایەوەو دەرکەوت، لە هیچ هەڵوێستێک، هزرێک، سیاسەتێک‌و رەخنەیەک، ئاڵای شۆڕش بەهەڵە نەچوبوو. بەڵکو راستڕەوەکانی ناو کۆمەڵە، لەدوای ئەوەی هەموو رێگەیەکیان گرتەبەر:

- سەرنەکەوتنی دانوستان‌و دەستپێکردنەوەی شۆڕش.
- شکستی لە تێکشکاندنی پارتی، سۆسیالیست، پاسۆک‌و حیزبی شیوعی، دوای قرناقاو پشتئاشان.

- پەلاماردانی ڕەوتی ڕەخنەگرو پێشێلکردنی ئازادی مینبەر.
- بردنی پاسدار بۆ سەر کەرکوکو هەڵەبجە.
- پاشەکشە لە تێزی یەک مەسەلەیی کێشەی کورد.. نەک چوار مەسەلە!!
- بادانەوە بۆ لای ئۆپۆزسیۆنی عێراقو ڕەهەندی شۆڕشی عێراق.
- گرێدانەوەی کێشەی کوردستانی عێراق، بە کێشە دیموکراسیەکانی عێراقەوە.
- دروستکردنەوەی پەیوەندی لەگەڵ ئێران، سوریا.. پاشان ئەمریکاو سۆسیال-دیموکراتو ڕۆژئاوا..
- نائومێدبون لە پەرەپێدانی یەکێتی، لە نیمچە بەرەوە، بەرەو بەرەی نیشتمانی.
- دروستنەبونی لەشکری یەکگرتوی کوردستان.
- کۆمەڵە، نەک نەکرایە پارتی پێشڕەو، بەڵکو کرایە پاشڕەوی یەکێتی.. ئاکام، لەناو یەکێتیدا، هەڵوەشێندرایەوە!
- ناکۆکی ناو یەکێتی تەشەنەی سەند، گەیشتە ڕادەی لێکترازانی مام جەلال-نەوشیروان.. لەسەر دانوستان، یان چاوەڕێی گۆڕانکاری گەورە.

یەکێتی، لە سەرجەم ئەو بۆچونە جیاوازانەی لە یەکەمین کۆنفرانسەوە، هەتا سێهەمین کۆنفرانس هەمانبوو. تەنها لە پەلاماردانی ئازادی ئاڵای شۆڕش، لەڕووی عەسکەریەوە سەرکەوت. ئەویش لە نیەتپاکیی ئاڵای شۆڕشەوە بوو، کە چوینە قووڵایی هێزەکانیان، نەک بۆ سەر سنوور، یان شاخێکی دورەدەست.

ئەوەتەی کوردایەتی لە قۆناغی خەباتی سەرەک هۆزو شێخەکانەوە، بۆ ڕێکخراوی سیاسی گواستراوەتەوە، جیابونەوە لەناو هێزە سیاسیەکان ڕویداوە. واتا: یەکەمین ڕێکخراوی سیاسی دوچاری جیابونەوە بوو، ساڵی ١٩١٨، سەدو دوو ساڵ لەمەوبەر (کۆمەڵەی ژیاندنەوەی کوردستان) بوو. بە سەرۆکایەتی عەبدولقادر شەمزینی، کوڕە گەورەی شێخ عوبێدوڵلای نەهری:

"عەبدولقادر شەمزینی بەو پێیەی سەرۆکی کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد بوو سەرۆکایەتی ئەو شاندەی دەکرد کە خەریکی دانوستان بوو، ڕۆژنامە تورکیەکان بەوە تاوانباریان کرد، لەلایەک سەرۆکی ئەنجومەنی حکومەت بوو، لەلایەکی تر سەرۆکی کۆمەڵەیەکی کوردی بوو! لە وەرامی ئەوانە عەبدولقادر ڕایگەیاند کە ئەو سەربەخۆیی بۆ تورکیاو ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان دەوێت (١٧٦ : ٦٨). ئەم ڕاگەیاندنە لای ئەندامەکانی تری کۆمەڵەی ژیانەوە زۆر گران هات، کە بەگەرمی بۆ سەربەخۆیی کوردستان کاریان دەکرد. بەتایبەتی

بەدرخانیەکان کە توێژێکی رۆشنبیرو ناسیۆنالیستی ئەو پێواژۆکە بوون. بەم جۆرە گفتوگۆ لەنێوان هەوادارانی ئۆتونۆمیو داواکارانی سەربەخۆیی، بووە سۆنگەی کەرت بوونی کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان(٣٢٥ : ٧٨). ئەمەش بە یەکەم کەرت بوون دادەنرێ لە بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردی لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم".[1]

لێرەدا، مێژوو تەنها یەکەمین جیابونەوە تۆمار ناکات، کە نوسەر (کامەران مەنتک) بەجوانیی دەستنیشانی کردووە. جگە لە جیابونەوە، یەکەمین جاریش، داخوازی ئۆتۆنۆمی دێتە ناو ئەدەبیاتی کوردایەتیەوە؛ کە پێش ئەمە، هەموو راپەڕینە چەکداریەکانی کوردستان، بە راپەڕینەکانی شێخ عوبێدوڵلای نەهری باوکی عەبدولقادریشەوە، داوای سەربەخۆیی سەرانسەری کوردستانیان کـردووە. کەوابێ: بەهۆی حیزبە شیوعیەکانی وڵاتانی داگیرکەری کوردستانەوە، لە سییەکانەوە، ئۆتۆنۆمی نەبۆتە بەرنامەی لایەنە سیاسیەکان، بەڵکو پێشتر بووە. پارتیش لەناوەڕاستی چلەکانەوە کردیە ستراتیژ، لە چوارچێوەی عێراقێکی دیموکراتدا. ئەمەش پەیوەندی بە کۆتاییهاتنی قۆناغی دامەزراندنەوەی عێراق، تورکیا، سوریاو ئێرانەوە هەیە، دوای جەنگی یەکەم. لەناو ئەم وڵاتانەدا، بە پشتیوانیی بەریتانیاو فەرەنسا، کورد لە رووی ئابوری، سیاسی، دەستوریو نیشتمانیەوە، لەقاڵب درا. هەتا ئێستاش ئەو قاڵبە سەپێنراوە نەشکێندراوە.

دوای یەکەمین جیابونەوەی باڵی عەبدولقادری ئۆتۆنۆمی خـوازو بەدرخانییە سەربەخۆخوازەکان، لە جەنگی یەکەمەوە بۆ دووەم، لە هەر بەشێکی کوردستاندا، چەندین رێکخراو دامـەزران: کۆمەڵەی هیڤی، خۆیبون، کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی، هیوا، (ژ.ک)، شۆڕش، رزگاری، لقی حیزبە شیوعیەکان، پاشان پارتی لە هەر بەشێکی کوردستان. ئەم رێکخراوانە، یان دوچـاری جیابونەوە بـوون، یاخود لەژێر فشاری روداوەکانو سەرکردەکاندا، هەڵوەشێنراوونو ئاوێتە کراوون. تەنانەت لەناو پارتیشدا، چ لە رۆژهەڵات چ لە باکور چ لە باشور چ لە رۆژهەڵاتدا، جیابونەوە روویانداوەو حیزبی تر لە حیزبی دایک، لەدایکبون. لەناو ئەو هەموو جیابونەوانەدا، تەنها باڵی هەمزە، بە بڕیاری بارزانیو بەهێزێکەوە جێبەجێکردنی بە سەرپەرشتی مام جەلال، بارەگای باڵی هەمزە عەبدوڵلا-شیهابی شێخ نوری، دەستی بەسەردا گیرا. ئەگینا، جیابونەوە چەکداریەکەی باڵی شۆڕشگێڕی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران (سلێمانی موعینی- ئیسماعیلی

---

١ کامەران ئەحمەد محەمەد ئەمین (کامەران مەنتک). کوردستان لەنێوان ململانێی نێودەوڵەتییو ناوچەییدا ١٨٩٠-١٩٣٢). دەزگای چاپو پەخشی سەردەم. سلێمانی-٢٠٠٠. چاپی یەکەم. ل(٢٣٧).

شەریف زادە، مەلا ئاوارە) لەناو خودی حیزبەکە، تەنها مشتومڕی سیاسی دروستکرد. پاشان، ئێران بە هاوکاری پارتی لەناوی بردن.

"هەر لە گەلاوێژی ئەو ساڵەدا پێنج کەس لە پێشمەرگەکان لەناوچەی پیرانشار لە گوندی بندرەی دەکەونە بەر هێرشی دوژمن، دوای ئەوەی ۹ کەس لە دوژمن دەکوژن، پەنا دەبەنە گوندی (ئـالان)ی کوردستانی عێراق کە لەژێر حوکمی شۆڕشدا بووە. بەداخەوە دوایی هێرشیان دەکەنە سەرو لە ئاکامدا یەکیان لێ دەکوژرێ‌و ئەوانی دیکەش کە یەکیان برینداریش بووە، تەحویلی ئێران دەدەنەوەو ئیعدام دەکرێن".[١]

"ئەوکات دوو گیروگرفتی گەورە ڕوو لە حیزب دەکەن، یەکیان تەحویل دانەوەو کوشتنی هێندێک لە کادرو پێشمەرگەکانی حیزب لەلایەن بەرپرسانی شۆڕش لە هێندێک ناوچەدا بە ساواکو ژاندارمی ئێران بوو کە شوێنەواری زۆر خراپی لەسەر ورەی باقی هاوڕێیان دانا و لەراستیدا بوو بەهۆی ئەوەی کە ماوەیەک واز لە هەوڵدانو تێکۆشان بێنن‌و بڕستی تێکۆشانیان لێ بڕێن‌و هیچیان بەتەمای سەری خۆیان نەبوون".[٢]

عەبدوڵلای حەسەن زادە دەڵێ:

"گەورەترین دروشم (مرگ بر سازشکار) بوو کە مەبەستیان حیزبی دیموکراتی کوردستان بوو. یان ماوەیەک هەردوو حیزب دیموکراتی کوردستانی عێراقو ئێرانیان تێکدەخستو دەیانگوت "دیموکراتو قیادە، ڕەنجی کوردیان بە با دا". چونکە ئێمە لە مەسەلەی ماددەی ۸دا (ناچمە نێو وردەکارییەکانی کە چۆن بوو؟ چۆن نەبوو؟) دواتر دکتۆر قاسملوو لە میتینگێکدا گوتی بەدەر لەوەی ئێمە ڕامان بەرانبەر بە قیادە موەقەت چییە. (ئەوکات بە پارتی دیموکراتی کوردستانیان دەگوت "قیادە موقت". ڕێبەرایەتییەکی کاتییان پێکهێنابوو) مادەی ۸ شتێکی لاوەکییەو ۷ مادەکەی دیکە باسی کێشەکانی کوردی ئێران دەکات. بەلام ئەو باسی کوردی عێراق دەکات کارێکی بێ‌جێیە. لەسەر ئەوە لەعنەتی تەواوی دونیامان بۆ هات. کەوابێت ئێمە هیچ نەما نەیکەین بۆئەوەی تووشی شەڕ نەبین‌و میللەتی کورد تووشی مەرگو ماڵوێرانی نەبێت".[٣]

---

١ جەلیل گادانی. (٥٠ ساڵ خەبات) کورتە مێژوویەکی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران. بەرگی یەکەم. ل(١٣٦).

٢ هەمان سەرچاوە. ل(١٤١).

٣ عەبدوڵلا حەسەن زادە-سکرتێری پێشووی حیزبی دیموکراتی کوردستان. ئەفشینی مدریسی-(لەرۆژهەلاتەوە ٤). ٢٠١٩. ل(١٠٢-١٠٣).

ئەو سیاسەتە نیازپاکیەی دیموکرات، کە رابەریکی هەڵکەوتوی وەکو د.قاسملوو بەرنامەکەی داڕشتبوو، لەناو گەلێکی دواکەوتودا، کە کولتورەکەیو نەریتەکەی نوقمی ئەندیشەکانی سەدەکانی ناوەڕاستە، نەیتوانی دیموکرات لە شەڕی پارتی لەناو کولتوری زەبروزەنگو دۆخی ئیقلیمیدا، بپارێزێ. تەنانەت لە شەڕی ناوخۆی رۆژهەڵاتی کوردستانیشی نەپاراستن. ئەم کولتورو نەریتە، کە هەمیشە جۆشی شەڕەنگێزی دەخواتو کانگای زەبروزەنگە، بەردەوام هەڕەشە لە هەموو بیروباوەڕو سیاسەتێکی ئاقڵمەندانە دەکات، کە رابەر، یان گروپێکی سیاسی، هێنابێتیە ئارای هاوکێشەکان. هەتا ئەوکاتەی چەک بەدەستی هێزە چەکدارەکانی کوردستانەوە هەبێ، بەهۆی نەریتو کولتورو کاریگەری مەزهەبو موقەدەساتەوە، ئەگەری شەڕی ناوخۆ، یەکێک لە ئەگەرە هەرە بەهێزەکانە. ئالای شۆڕش روداوزەدەی گوێپێنەدان بوو، بەو نەریتو کولتورە!!

## (٢)
## کولتوری چەكو ناکۆکی سیاسی

پارتی، بە هەردوو باڵەکەیەوە (مەلایی-جەلالی) فێرگەیەکی زۆر خراپیان لەناو کوردایەتیدا داهێنا، ئەویش فێرگە، یان کولتوری بەکارهێنانی چەک بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکی سیاسی. ساڵانی (١٩٦٤-١٩٧٠) ساڵانی شومی کوردایەتین. پارتی دەبێتە دوو پارتی. هەردوو پارتی هێزی هەیە. ناگەنە چارەسەر. پەنا بۆ هێزی چەکداری دەبەن. بۆ سەرکەوتنی هێزی چەکداری لایەک بۆ سەر لایەکی تر، سەرەتا پەنا بۆ ئێرانی شا دەبەن. پاشان، هەردوولا، بەناوی رێکەوتنی لامەرکەزیەوە، دانوستان لەگەڵ رژێمی عێراقدا دەکەن. لە دوائاکامدا، جەلالی، کە لە ئێرانیشدا بوون، دێنە لای حکومەتو چوار ساڵی رەبەق، هەردوولایان، لەپاڵ عێراقو ئێران، کوردکوژی دەستپێدەکەن. کە بێگومان، ئەوکاتە، لەبەرئەوەی دوژمنی داگیرکەر، رژێمی عێراق بوو، هێزی مەلایی کە لە شاخدا بوون، سۆزی خەڵکیان زۆرتر لەگەڵدا بوو. سەرەنجامە کۆتاییەکەشی، حکومەتی عێراق هەر لەگەڵ پارتی-شاخ رێکەوت. جەلالییش کارێکی باشیان کرد، خۆیان لەناو حیزبی دایکدا هەڵوەشاندەوەو رێکەوتنەوە. دیارە بارزانیش بڕیارێکی مێژوویی دا، خۆی کردە دەستەبەری ئەو یەکگرتنەوەیە!

له شەستەکانەوە حیزبایەتی، خرایە ژێر هەژمونگەری هێزی چەکدار. بەپێچەوانەی شۆڕشە شۆڕشگێڕەکانی جیهانەوە، کە سیاسەت لولەی تفەنگەکانی ئاڕاستەدەکرد. لەکوردستاندا، لولەی تفەنگ سیاسەتی ئاڕاستەدەکرد. تا ئێستاش!

(١٩٦٤-١٩٧٠) قۆناغی زاڵکردنی هێزی چەکدارە، بەسەر حیزبایەتیدا. لەم قۆناغەوە، دیاردەکانی یەکدی کوشتن، بازرگانی شەڕ، هەلپەرستیی، دەمکوتکردنو پێشێلکردنی ئازادیەکان، سەریهەڵدا. لە شۆڕشی نوێدا، ئەو دیاردانە بەحوکمی فرە هێزیی، زۆر خراپتر تەشەنەیان سەند. هەمیشە پێنج هێزی چەکدار، لە شۆڕشی نوێدا هەبوون:

١- هێزی پێشمەرگەی یەکێتی؛ لە ناوچەکانی سۆران.

٢- هێزی پێشمەرگەی پارتی؛ لە دەڤەرەکانی بادینان.

٣- هێزی پێشمەرگەی سۆسیالیست؛ لە هەولێرو پاشان شارەزوور-سورێن.

٤- هێزی پێشمەرگەی حیزبی شیوعی؛ کەمتر بون. هەتا شەڕی قڕناقاو پشتئاشان، لە هەموو ناوچەکان هەبون. دوایی تەنها لە بادینان.

٥- هێزی پێشمەرگەی پاسۆک؛ کەم بوون. بەڵام چارەنوسیان بە سۆسیالیستو پارتیەوە بەستبوو.

ئەم پێنج هێزە، بۆئەوەی زاڵبن، سەرکردایەتی باڵادەستی حیزبە سیاسیەکانیان بەردەوام: پاساویان بۆ تاوانو تاڵانیەکانیان دەهێنایەوە؛ سەربەستیان کردبون لە چۆنیەتی حوکمڕانیی ستەمکارانە لە ناوچە پاوانکراوەکاندا؛ هاوڵاتی بچوکترین مافی مەدەنی لە ناوچە ئازادکراوەکاندا نەبوو؛ شوراکانیش کە دامەزران، کاروباری لۆجستیان دەکرد؛ لەوانەش خراپتر، لایەنە سیاسیەکان بە قسەی هێزە چەکدارەکانیان دەکرد. بێتاوانیان بەبێ دادگایی دەکوشتو بە خۆفرۆش دەدرایە قەڵەم. سەرانە سەندن ئاسایی بوو. هەموو ئەو رەفتارانەش، پاساوی سیاسیو ئایدیۆلۆژییان بۆ دادەتاشرا.

ئەگەر مێژوونوسێک، ئەدەبیاتی هەموو لایەنەکان، لە قۆناغی شەڕی ناوخۆدا کۆبکاتەوەو بەراوردیان بکات، بەئاسانی بۆی ساغ دەبێتەوە کە: شەڕە جنێوی ناوخۆ؛ بوختان هەڵبەستنی ناوخۆ؛ بە خۆفرۆش زانینی هێزەکانی ناوخۆ؛ پاشکۆیی لایەنەکان بۆ دەوڵەتانی ئیقلیمی؛ هەروا، نابوتکردنو شکاندنی کەسایەتی سەرکردایەتیی لایەنەکان لە شەڕی ناوخۆدا.. کرابووە کولتوری سیاسی لایەنە شەڕەنگێزەکان. تا ئێستاش نەبڕاوەتەوە!

کام سەرکردەی گەورە، کام رەمزی گەورە، کام قارەمانی گەورە، کام تێکۆشەری گەورە.. لەناو هەموو لایەنەکاندا هەیە، بوختانی بۆ نەکرابێ. ناوی نەزڕابێ. تۆمەتی بۆ هەڵنەبەسترابێ؟![+]

دوپاتی دەکەمەوە، چاودێری سیاسی نەبومو لەناو روداوەکانیشدا رۆڵم هەبووە. لەو ساڵانەشدا، فریشتە نەبوم. لەدوای روданی شەهیدکردنی حەسەن خۆشناوەوە، ئیتر باوەڕم بە جێبەجێکردنی بڕیارەکانی سەرکردایەتی بۆ دەست کردنەوەو بەرگریکردن، هەبوو. بەڵام لەپێش مفاوەزاتی ١٩٨٣وە، کە ئیتر یەکێتی لە شاخو شارەکاندا لە شەڕی ناوخۆدا باڵادەست بوو، دەرفەتی ئاشتەوایی هاتەگۆڕێ، وردە وردە، گەیشتمە ئەو باوەڕە، شەڕی ناوخۆ کۆتایی بێت. لەسەر بنەمای ئەم باوەڕەش، هەوڵم دا شەڕی ناوخۆ لە سنوری مەڵبەندی یەکدا رونەدات. بۆیە لەگەڵ شیوعیەکانیش رێکەوتین. لەدوای دانوستانی ١٩٨٤یشەوە، ئامادە نەبووم هیچ بەرپرسیارێتیەک قبوڵ بکەم. تەنانەت نەدەچوومە کۆبونەوەکانی سەرکردایەتیش، چونکە گەیشتمە ئەو باوەڕە، کۆبونەوەکان، پێشوەخت بڕیارەکانی ئامادە دەکرێنو دیالۆگ، نرخی نەماوە!

کێشەی ئاڵای شۆڕش، لەناو ئەو زەمینەو زەمانەدا، دەبێ هەڵبسەنگێندرێ؛ کە بەو کولتورە داڕزاوە؛ بەو ئەقڵیەتە شەڕەنگێزییە؛ بەو ئاراستە سەربازییە؛ دوای (٢١) ساڵ لە تاقیکردنەوەی تاڵی شەڕی ناوخۆ (١٩٦٤-١٩٨٥) بچوکترین پەندی سیاسیو عەسکەری وەرنەگیرابوو، بە هێزێکی سەدان کەسی گۆشکراو بۆ کوشتنی هاوڕێو هاوسەنگەر، هەڵکوتێنرایە سەر تاقە ماڵی ئاڵای شۆڕش.. ماڵی مەلا بەختیار. دەسەلاتیشیان پێ درابوو، گەورەو بچوک بکوژن!!

ئەگەر ئەم کردەوەیە، زادەی ئەوپەڕی رقو زاڵبونی کولتوری ئازادی سەرکوتکردنی شەڕی ناوخۆ نەبوو، خۆ ماڵەکەی بەندە لە تەکیە بوو، چوار دەورمان بە هێزی یەکێتی

---

+ بزوتنەوەی گۆڕان، لە زەمانو زەمینەیەکی نیمچە لیبرالی سیاسیدا، بەتایبەتی لە دەڤەری سەوز، جیابونەوەو هەڵسوڕاوانیان ئاراستە دەکرد، لاسارانە دژی هەموو لایەنەکانو سەرکردەکانو بەها سیاسیەکانیش، هەڵدەسوڕان. ململانێیان لە رەوتی ئازادی ترازاند. بەڵام ئەم کولتورە سیاسیە داهێنراوی گۆڕان نەبوو. لەناو شۆڕشو دوای راپەڕینیش، دیاردەکە هەبوو. گۆڕان پەرەی بەو کولتورە، بە ئاراستەی لیبرالیزمی رقو سایکولۆژیەتی بەرامبەر شکاندن دا. سەرەنجام لە یەکەمین کۆنفرانسیاندا، بۆیان دەرکەوت، هەڵسوڕاوانیان بەچەشنی لاسار کردووە، ئاسان نیە جڵەویان بگیرێتەوە! سەرەنجامی ئەو سیاسەتە، بەها سیاسیو حیزبیو دەسەلاتەکان، لەبەرچاو خران.

تەنرابوو. زانیاری تەواویشیان هەبوو لەسەر ژمارەی حەرەسەکانمان.. چەکەکانمان.. تەنانەت لەسەر نیازیشمان، ئیتر چ پێویستی دەکرد، سەدان پێشمەرگە لەسەرمان خڕ بکەنەوەو بڕیاریش بدەن، لێمان بدەن.. ئەگەر یەک کەس بەهەڵە، یان بە مەرام، فیشەکێکی لەدەست دەرچوبا، بەدڵنیاییەوە، بە ماڵو منداڵیشەوە (بەندەو عیماد ئەحمەدو دلێری سەید مەجیدو ئاسۆ عەلی)یان دەکوشت. هەر بەڕاستی (لولەی تفەنگەکان!) خوێنیان لێدادەچۆڕا. خوێنی بەناهەق ڕژاوی دیلو تێکۆشەرو خاوەن هەڵوێستەکان.

## (٣)
## ناکۆکی ئایدیۆلۆژی

نوسەر، هەتا دەخرێتە قەبر، واز لە ڕەگی گولیی عێراقچێتی ناهێنێ. سەیرکەن چی دەهۆنێتەوە:

"ئالای شۆڕش یان ئاش یا بەرەی عێراقچیەتی لەناو کۆمەڵەدا هەر لە سەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەوە سەریهەڵدابوو بە ماکو خۆرکەی ڕێگر لە گەشەکردنو بەهێزبوونی کۆمەڵەو بنەمای ناکۆکی........ دور لە هەموو سەرەتایەکانی کاری سیاسیو......... هەست بە بەرپرسیارێتی بەرامبەر نەتەوەو نیشتمان. هەر لە ١٩٧٢وە یەک دووانێک لە باڵی عێراقچێتی ناو کۆمەڵە بەپێچەوانەی هاوڕێیەکانی تریان کە زۆر بە مەبدەئیانە لە کۆمەڵە کشانەوە. ئەمانە دەستیان لە کۆمەڵە هەڵنەگرت تا ساڵی ١٩٧٥و ئالاکەی عێراقچێتیان بە کۆمیتەی هەرێمەکان سپاردو کۆمیتەی هەرێمەکانیش بە دزیو بە ئاشکرا ئەمانیش کەوتنە کنەکردن لەناو کۆمەڵەو یەکێتی بەشێوەیەکی دوور لە هەموو مورالێکی سیاسی"[1]

ئەمەیە ڕۆژگاری سیاسی. کەسێک، بوبێتە ئەندام پەرلەمانی عێراق. قبوڵێتی هەرێمی باشوری کوردستان لە دەستوری عێراقدا، بەشێک بێ لە عێراق. موچەی عێراق بە مۆڵیی وکو ئەندام پەرلەمان وەردەگرێ. کەچی کە دێتە سەر ڕقی دێرینە، واز لە ڕەگی گولی عێراقچیو کوردستانی بە مەرام دروستکراو، ناهێنێ.

جارێ ئەوانەی پێیاندەڵێ.. لەسەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەوە بوونە خۆرکەی ڕێگر لە گەشەکردنو بەهێزبوونی کۆمەڵەو بنەماکانی ناکۆکی.

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٤٤٦).

کۆمەڵە.. جگە لە مەحفەلێکی خوێنەواری تێکۆشەری راستگۆ، کە کەسیان خیانەتیان لە کوردو کۆمەڵە نەکرد، کەسیان نەبونە بەعسیو جاش. کەسیشیان فایلی نەگیرا. هەلپەرستیش نەبوونو لەژیانی سیاسیشیاندا ئوباڵی هیچ تاوانو تالانیەکیان ناکەوێتە ئەستۆ. دوای کارەساتو روداوە دڵتەزێنەکان هەڵوێستیان دەرنەبڕیوە. پێشوەخت بۆچونیان بە راشکاوی باسکردووە. ئیتر بۆ گوایە خۆرکە بوبن لە گەشەکردنی کۆمەڵە!

هەتا ئازاری ١٩٧٥، کۆمەڵە، بەئاشکرا، لەناو هیچ هاوکێشەیەکی سیاسیدا، لەناو هیچ روداوێکدا، پێگەو جێگەی دیار نەبوو. یەک هەڵوێستی ئاشکرای نەبوو. لەتەواوی ساڵی ١٩٧٤-١٩٧٥دا، تەنها نامەیەکی ناوخۆی هەبوو، بۆ شانەکانی. ئەویش، فەوتێنرا. چونکە، لەکاتی هەرەسدا، سەرکردایەتی کۆمەڵە، کوتومت پێچەوانەی ناوەرۆکی ئەو نامە ناوخۆییە هەڵوێستیان وەرگرتو بەرەنگارییان نەکرد!

پاشان.. هەمومان ئەو تێکۆشەرانە دەناسین، کە کەسانی سەنگینو بەهەڵوێست بوون، ئیتر بۆ بە خۆرکە ناویان دەبات؟ رقەکەی هێندە ئەستورە، واز لەوانیش ناهێنێ. بە بیانوی عێراقچی! سەیر ئەوەیە، خۆیشی دەنوسێ: "مەبدەئیانە کشانەوە". کەوابوبن ئیتر بۆچی بە خۆرکەیان دەزانی.. جەناب!

کۆمیتەی هەرێمەکان، دوور بون لە مۆراڵی سیاسی (وەکو نوسەر نوسیویەتی؟) ئاخۆ مۆراڵی سیاسی بە چی تێگەیشتبێ؟*

مۆراڵی سیاسی.. درۆنەکردنە. بوختان هەڵنەبەستنە. رق هەڵنەگرتنە. ئازادی زەوت نەکردنە. لەسەر بیروباوەڕ ئەشکەنجەنەدانە. رەتکردنەوەی جەلادیەتی تێکۆشەرانە.. لە دزیو درۆزنیی دورکەوتنە.. کە بەداخەوە، بەشێکی ئەو مۆرالانە، لە نوسەرو هاوهەلپەرستەکانی هەبوو.

---

* هاوینی ١٩٩٤ دوای یەکگرتنەوەمان لەگەڵ یەکێتی، وەکو مەکتەبی رێکخراوە دیموکراتیەکان سەردانی دهۆکمان کرد. حەسەن کوێستانی بەرپرسی مەڵبەند بوو. ئەندامانی مەکتەب: هاوار حاجی، مەلا قادر، مامۆستا رێبوار، ئازاد خالید، جوتیار نوری و خۆم، شەو داوەتی کوێستانی بوین. لێم پرسی: کە بەڵگەنامەکانت ساغدەکردەوە، قسەی زۆرتان لەسەر ئالای شۆڕش کردبوو، کە گوایە بەشێکیان پەیوەندیان بە حکومەتی عێراقەوە هەیە. ئایە لەناو بەڵگەکاندا، هیچتان دەستکەوت؟ گوتی: هەڤالان بۆ مێژوو دەیڵێم: نەک بەڵگەمان لەسەر سەرکردایەتی ئالای شۆڕش دەستنەکەوت، بەڵکو حکومەت، وەکو مام جەلال و نەوشیروان، رقی لە مەلا بەختیار بووە. بە مەترسیداریان لەسەر بەعس زانیوە.

گوناحێکی گەورەیە، کەسێک بەشێکی ئەو مۆراڵە دزێوو دزێوەی هەبێ، بوێرێ بە شەهید ئارامو شەهید ئازاد هەورامی بڵێ.. دوور لە مۆراڵی سیاسی. با دیقەت بدەین شەهید ئارام لەسەر کوردستانیبوونی چی نوسیووە:

"بزوتنەوەی رزگاری خوازانەی گەلی کوردستان کە بزوتنەوەی گەلێکی دابەش کراو و نیشتمان لەت لەت کراو و ماف پێ شێل کراوە، بزوتنەوەیەکی عادیلانەی ناوەرۆک پێشکەوتنخوازەو بەشێکی لە جیاکردنەوە نەهاتوی بزوتنەوەی رزگاری خوازانەی گەلانی جیهانە کە لەم سەردەمەدا بەشێکە و پاڵ پشتێکی قایمو پتەوی شۆڕشی سوشیالیستی جیهانە".[1]

لەوە جوانتر کوردستانیبونی کۆمەڵە نانوسرێ کە لە وتاری "خەباتی ئالای شۆڕش"دا، شەهید ئارام نەخشاندویەتی. رابەرێک، کوردستانی نەبوبێ.. نانوسێ: "بزوتنەوەی رزگاری خوازی گەلی کوردستان کە بزوتنەوەی گەلێکی دابەشکراو و نیشتمان لەت لەت کراو و ماف پێشێل کراوە". زۆر بە جوانیی خەباتەکەی بەستوتەوە بە خەباتی گەلانی جیهانو بەشێکیش بووە لای لە شۆڕشی سۆسیالیستی. ناشڵێ ولاتان، یان کامپی سۆسیالیست.. دەڵێ.. شۆڕشی سۆشیالیستی. وەکو ناسیۆنالیستە گۆشەگیرەکان.. نەشیوتووە: فاشیەت بۆ عێراقو ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان!

هەروەها.. بە رەوانییو بیرێکی باوەڕ بە دوارۆژ، نانوسێ:

"(ئالای شۆڕش) لەپێناوی بەهێزکردنی (ی.ن.ک) تێ دەکۆشێو هەوڵی بێ سنور ئەدات بۆ چەسپاندنی خەباتی رێکخراوە شۆڕشگێڕە پێشکەوتن خوازەکانی کوردستانو دەرخستنی بیری چەوتی تاکە حیزبو راهێنانی جەماوەری گەل بە دروستی بەرەی یەکگرتوو و هەوڵدان بۆ گەشەپێدانی (ی.ن.ک) بەرەو بەرەی راستەقینەی شۆڕشگێڕ. لە هەمان کاتیشدا دەست نیشان کردنی کەموکورییەکانی (ی.ن.ک) بە نیازی گەشەپێدانی و زیاتر پتەوکردنی ریزەکانی لەخەباتدا دژی سوڵتەی فاشیستی بەعسو دژی ئیمپریالیزمو زایۆنیزمو کۆنەپەرستی ناوخۆو دەرەوە".[2]

ئەو بۆچونانەی شەهید ئارام، تەنها لەبەرئەوە ئاماژە پێناکەم، نوسینەکەی نوسەر کاریگەرە.. نەخێر. تەنها بۆ ئەوەیە، ئەوانەی ئەم نوسینەی بەندە دەخوێننەوە، بزانن، ئەم نوسەرە چەند رقاوییەو چەندیش راستیەکانی مێژوو هەڵدەگێڕێتەوە.

---

١ هەڵبژاردەیەک لە نوسینەکانی شەهید ئارام. ناوەندی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان-عێراق- چاپخانەی شەهید برایم عەزو. ١٩٨٠. ل(٦٤).

٢ سەرچاوەی پێشوو. ١٩٨٠. ل(٦٧).

باسی کنەکردن لەناو ڕێکخستندا دەکات. ئەمە ئەگەر نوسەرێکی بێلایەنی تێوەنەگلاو بە شەڕی ناوخۆ، جیابونەوە، یەکتر کوشتن‌و دروستکردنی ڕێکخراوی نهێنی، بینوسیایە، هیچ وەڵامم نەدەدایەوە، ئاخر نوسەرێک، لە ساڵی ١٩٦٤وە، هەتا بیناقاقای نوقمی جیابونەوەو بە نهێنیی ڕێکخراو دروستکردن بوبێ.. هەمیشە پاساوی بۆ شەڕی ناوخۆ هێنابێتەوە، بە چ ڕوییەک شتی وا دەنوسێ!

- ئایا جەلالیەکان.. باڵی مەکتەبی سیاسیان، لەناو پارتی‌و دژی بارزانی وەکو سەرۆکی پارتی لەساڵی ١٩٦٤ وە، دروست نەکرد؟ ئایا لەکاتێکدا بارزانی لە ڕوسیا بوو، هەر برایم ئەحمەدو مام جەلال‌و عومەر دەبابەو عەلی عەسکەری، بە سەرۆکی پارتی هەڵیاندەبژارد؟ دوایی خۆشیان لێی هەڵگەڕانەوە!

- لەناو جەلالیدا، ئایا ڕەوتی چەپ، لە بەکرەجۆ (١٩٦٨)وە، کنەی دەستەگەری‌و ڕەخنگرتنی، نەکرد؟

- کە جەلالی-مەکتەبی سیاسی، لەگەڵ پارتی دایک، یەکیگرتەوە، ئایا ١٩٧٠/٦/١٠، لەهەمانکاتدا، کۆمەڵە بە نهێنی لە بەغداد دانامەزرێ‌و (٥) ساڵیش خەباتی ژێرزەمینی دژی پارتی-بارزانی، زیاتر لە حکومەتیش ناکات؟ ئەوەی زیاتر لە (٢٥) ساڵ مۆراڵی بەرامبەر شەڕی ناوخۆ، تاوان‌و تالانی نەبوبێ.. بەڵکو بەرگریشی لێکردبێ، ئیتر دوورونزیک مافی بەسەر مۆراڵەوە نەماوە!

پێم سەیرە، سیاسییەک، سیاسەتی کردبێتە پیشەو لەناو جیابونەوەکانیشدا، پێشابێتەوە، باسی کنەکردن‌و مۆراڵ بکات؟

## ( ٤ )

## فریشتەی ئاشوبستان!

نوسەر، خۆی کردۆتە فریشتەو بەسەر ئاشوبستانی شەڕی ناوخۆو دیلکوشتن‌و تالانی‌و تاواندا، دوای ئەوەی دەستی لە بنی هەمانەی کۆمەڵە، بەبۆگەنی دەردەهێنێ.. دەیەوێ، ئەو دەستە بۆگەنەی بە مێژووی پاکو پڕ هەڵوێستی ئێمەدا بسڕێتەوە! کەسێک دەتوانێ ببێتە ڕەخنەگرو گەواهیدەری ڕوداوەکان کە خۆی ناخی ڕەش نەبێ‌و خووی لە تاوان‌و بەرگری لە تاوان، نوقمی زەلیلی نەبوبێ!

لەناو یەکێتیەکو شۆڕشێکی چەکداریدا، کە لە شەڕی ناوخۆدایە، کە تاوانی قڕناقاو پشتئاشانو ئەو دیلکوشتنانەی کردووە، کە نوسەر خۆی لە شەڕی بێتواتە پێیاندەڵێ: "دیلکوشتن، قڕ تێخستنو دزی کرایە خوو"!!، کاتێک ململانێیی ئایدیۆلۆژی-سیاسی-رێکخراوەیی قووڵ دەبێ، ئازادی بیرورِا دەربڕین نامێنێ، لەناو سێهەمین کۆنفرانسدا، کادر بەر شەق دەدرێو دادگای پشکنینی ئەندێشە بۆ هەڵوێستی جیاواز دادەنرێ.. ئیتر چۆن رێکخراو بە ئاشکرا دادەمەزرێ؟! ئاخۆ نوسەر باسی وڵاتانی رۆژئاوا دەکات، یان باسی رێکخراوی هێزو و بازوی چەکدار؟

سەیر ئەوەیە، هەروەکو باسی سویسرا بکات، کە دەنوسێ:

"پروپاگەندەی ناڕاست بۆ کۆمەڵەو یەکێتی زۆر بە فراوانی بە دەمی لە کۆڕ و کۆبونەوەکانو لەناو تیپەکانی پێشمەرگەو کادرانو رابەرە سیاسیەکان".[1]

ئەم زاتە، نازانێ بوختانەکانیشی برازێنێتەوە. ئاخر ئالای شۆڕش هەتا سەرەتای مانگی ٩/ی ١٩٨٥، نهێنی بوو. ئیتر چۆن بە فراوانی کۆڕو کۆبونەوەیان کردووەو پروپاگەندەیان لەناو پێشمەرگەو کادرو رابەرە سیاسیەکاندا، بەستووە؟

لە درێژەی بوختانەکەدا دەڵێ:

"باوەش گرتنەوە بۆ ئەو کەسانەی کە لەسەر بێ ئیلتیزامی محاسەبە دەکران یان هەڵەیەکی کوشندەیان کردبوو، یان تاقەتیان چوو بوو، دەشیان کردنەوە بە دوژمنی یەکێتیو کۆمەڵە".[2]

خۆزگە ناوی (٣) کەسی دەهێنا کە لەناو یەکێتیو کۆمەڵەدا، سزا درابنو ئێمە داڵدەمان دابن. راستیەکەی ئەوەیە، دەرگای بەرەڵاییو کوشتنو تاڵانی وا کرابوەوە. بۆیە مام جەلال ئەیووت: ئەمە لەشکری هۆلاکۆیە. نوسەر پێشتر دەنوسێ: تاڵانیو دزیو راو روتو دیلکوشتن.. تەشەنەی لەناو یەکێتی سەندووە. ئێمەش، رەخنەمان لەو دیاردانە هەبوو. ئیتر چۆن ئەوانەمان وەردەگرت؟!

ئەوەش کە دەنوسێ:

"هەوڵدان بۆ توندوتیژکردنی شەڕەکانی نێوان یەکێتیو جودو پاشان خۆنزیککردنەوە لە جود قەناعەت پێهێنانیان، کە یەکێتی پاش دانوستاندن هەڵدەوەرێن یا لە ساحەکە نامێنن لەگەڵیان رێک مەکەون. لەدوای رێکەوتن ئەم راستیانە ئاشکرا بوو".[3]

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٤٤٦).

٢ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٤٤٧).

٣ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٤٤٧).

ئەمەیان شاخی هەڵبەستنەکەی زۆر تیژە. ئاخر کەس نییە نەزانێ ئاڵای شۆڕش لایەنگری ئاشتبونەوەی گشتی بوو. هەر باوەڕیشی بە شەڕی ناوخۆ، لەدوای باڵادەستی یەکێتی لە شەڕدا، نەمابوو. پاشان، ئاڵای شۆڕش جیابونەوەی دواخست، هەتا یەکێتی بە لاوازیی لەگەڵ حکومەت ڕێک نەکەوێ. حکومەتیش، کەلێنی جیابونەوە دژی یەکێتی نەقۆزێتەوە. ئیتر چۆن پێمان وا بووە، دوای دانوستان یەکێتی هەڵدەوەرێ؟

یان دەڵێ:

"هەرچی زانیاریەکیان لەسەر یەکێتیو کۆمەڵەو بڕیارە نهێنیەکانی سەرکردایەتی کۆمەڵەو یەکێتی هەبوو، بەتایبەتی ئەوانەی دژ بە ئێران یا سوریا یا لیبیا یا فەلەستینیەکان هەبوو بە زیادەڕۆیشەوە دەیاندا بە ئێرانو سوریاو لیبیاو فەلەستینیەکان".[1]

تا ئێستاش، دەیان نهێنی یەکێتیو مام جەلالو نەوشیروانم لایە. نەمدرکاندونو نەمنوسیون!

کە لە گۆڕی ئازادی یەکێتی[*] ئازاد بوم، چەند مانگێک لە ورمێ-زێوێ، دەژیام. حاجی حاجی برایم، هەوڵی دا سەردانێکی کاک مەسعود بارزانی بکەم. گوتم: بەو مەرجە ئامادەم سەردانەکە بکەم: یەکەم: هیچ نهێنیەکی یەکێتیم لێنەپرسن. دووەمیش: لە پرسگە دانانیشم.. کاک مەسعود گوتبووی: "دەزانین مەلا بەختیار کێیە، هیچی لێناپرسین". ڕۆژێکی بۆ دیدار بۆ تەرخان کردبوم. لە سەعات ١١/وە هەتا ٣/ی عەسر پێکەوە بوین.

یەکەمین جارم بوو ببیبنم. هەر لەو دیدارەدا، عەلی عەبدوڵلا، فەرەنسۆ حەریری، د.جەرجیس، نێچیرڤان بارزانیشم بینی. بۆ مێژوو دەیڵێم: دووروونزیک، باسی یەکێتی لەنێوانماندا نەهاتەئاراوە. قسەوباسەکانمان لەسەر داگیرکردنی کوەیتو کاردانەوەی ئەمەریکاو هاوپەیمانان بوو. من، لە سەرگوتاری (ئاڵای شۆڕش)دا- ژمارە (٤)ی ئابی ١٩٩٠، کە عێراق کوەیتی داگیرکرد، جەختم کردۆتەوە کە لە عێراق دەدرێ. لەسەر ئەم گوتارەو دۆخەکە زۆرتر پرسیاری لێدەکردم. منیش چەند مانگێک پێش لێدانی عێراق بوو، بە ڕاشکاوی ڕای خۆم وتو جەختم دەکردەوە، کە لە عێراق دەدرێو لە کوەیت دەردەکرێتو ڕاپەڕینیش بەرپا دەبێ. پەیتا پەیتا دەمووت: باشترین دۆخی سیاسی بۆ کورد دەرەخسێ بۆ ڕاپەڕینو ڕزگاری. دەشمگوت: هەقە واز لە ئۆتۆنۆمی بهێنینو

---

١ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٤٤٧-٤٤٨).

* کە لە زیندانی یەکێتی ئازاد کرام. لە بەیاننامەیەکدا زیندانەکەم ناونابوو (گۆڕی ئازادی).

فیدراڵیەت داوا بکەین.(+) کاک مەسعود، دوودڵ بوو لە لێدانی. متمانەشی بە ئەمەریکا نەبوو. وتیشی: ئێمە شۆڕشگێڕی (تحت الطلب)نین، کەی ئەمەریکا داوا بکات، بەقسەی بکەین. دیار بوو، داخی ڕێکەوتننامەی جەزائیرو پشتتێکردنە شۆڕشی ئەیلولی بیرنەچوبوو. لە ژمارەیەکی خەباتدا، دەستەواژەی (تحت الطلب) دوای ئەو دیدارە، خرابووە ڕستەوە. ناهەقیشی نەبوو.

هەندێک نهێنی هەبوو، پەیوەندی بە مۆراڵی بەرزی سیاسیەوە هەیە (نەک بێمۆراڵی هەلپەرستی). پێم سەیرە، نوسەر بەوشێوەیە تاوانبارمان دەکات. ئەوپەڕەکەی قسە لەسەر دانوستانو شەڕی عێراق-ئێران کرابێ.. هاوڕێیانی ئاڵای شۆڕش دژی سازش قسەیان کردبێ. ئەمەش ئاساییە، یەکێتی ئەوکاتە پەلاماری دابوین. هاوڕێیانمان بریندار بون. بێگومان ڕەخنەیان لەسەر یەکێتی دەبێ. نوسەر، لە مۆراڵی دڵڕەشیو دەرون دڕدۆنگیەوە، سەیری هەموو کەسێک دەکات.(*)

---

+ لە سەرگوتارێکی ئاڵای شۆڕشیش (ژمارە «٤»ی ئابی ١٩٩٠)، (ئاکامەکانی جەنگ و ئەرکەکانمان) لەبەشێکی وتارەکەمدا نووسیوومە:

لەمەدوا ڕووداوەکان بەهەر لایەکدا بکەون زەمینەی پەرەسەندنەوەی خەبات دەڕەخسێتەوەو لەسەر ئەو زەمینەیەش ئۆپۆزسیۆنی چەپ و بورژوایی و ڕاستیش دەکەونەوە پەرەپێدانی چالاکیان، ئۆپۆزسیۆنی غەیرە چەپ، بەلایەنی کەمەوە خاوەن بەرنامەی سیاسی هاوبەشن، بەڵام ئۆپۆزسیۆنی چەپ ئەوەشی نییە، لەبەرئەوەی یەکخستنی ڕێکخستنی نوو، یان چەند لایەکی چەپ جارێ چۆنایەتیە چینایەتیەکەی تیۆریزە نەکراوە، هەروەها (پواز) ی هەلپەرستی جۆراوجۆریش لەپشتی پەردەوە دەگوترێ، بۆیە ناکرێ بەم زووانە مژدەی سەرکەوتنی بەناوی پێشڕەوی کرێکارانەوە بدرێ بەکرێکاران، هەتا گەڵاڵەکردنی چۆنایەتیە تیۆریەکە، بۆ قۆستنەوەی هەموو جۆرە گریمانێکی سیاسی، پێویستە لەهەنووکەوە مارکس و چەپەکان بکەونە

بیرلێکردنی یەکێتییەکی سیاسی لەسەر بۆچوونە هاوبەشەکانیان بەتایبەتی لەسەر: ڕوخاندنی ڕژێم و کۆمارێکی دیموکراسی شۆڕشگێڕو دابینکردنی ئازادی بێ مەرج و دابینکردنی مافە سیاسی و پیشەییەکانی کرێکاران و زەحمەتکێشان، دیارە هەموو ئەوانە لەعێراق و لەکوردستانی عێراقیشدا، گەر هات و هەلێکی سیاسی باشیش هەڵکەوت کوردستانی عێراق لەدژی ئیمپریالیزم و لە قازانجی پێشخستنی خەباتی شۆڕشگێڕانە جیابێتەوە، ئەوا دەبێ دژی هەموو جۆرە کۆسمۆپۆلەتیک بین لەم پێناوەدا، نابێ لەبەر هیچ بیانوویەکی سیاسی و تیۆری هەلی سەربەخۆیی کوردستان لەکیس گەلی چەوساوەی کورد بدرێ.)

دەقی تەواوی ئەم سەروتارەی ژمارە ٤ی ئابی ١٩٩٠ی ئاڵای شۆڕش. لە پاشەنگی ئەم کتێبەدا بڵاوکراوەتەوە.

* کە لای یەکێتی ئازاد کرام. ئیتلاعاتی ئێران دوای (٥) ڕۆژ داوەتیان کردم بۆ کرماشان. سەلاحی شێخ سدیقم لەگەڵ خۆم بۆ شایەتی برد. لێیان پرسیم: مام جەلال لە مفاوەزات چۆن بوو؟ وتم: سەرکردەی ئازای وام نەدیوە. وتیان: ئەی(دانای ئەحمەد مەجید) چۆن کەسێکە؟ (ئەوکاتە بەرپرسی یەکێتی بوو لە کرماشان) وتم: تێکۆشەرەو کەسوکاری هەمووی لەسەر شۆڕش زیندان کراون. وتیان: ئەگەر بۆچونت وایە لەسەر یەکێتی بۆ جیابویتەوە؟ وتم: لەبەر بیروباوەڕی جیاواز. پێم بێ مۆراڵیی بوو زەمی یەکێتی بکەم.. کە (٥) ڕۆژیش بوو ئازادیان کردبوم! ئەمە لەکاتێکدا ئەوکاتە، بێ پارە بووم. ئێرانیش ئامادە بوون دوو شوقەو سەیارەو مانگانەی مۆڵیشم بۆ دابین بکەن. نەمویست!!

## ( ٥ )
## سیاسی مراهق‌و کامڵ!!

جاری وا هەیە کە بابەتەکانی نوسەر دەخوێنمەوە، بەزەییم بەو هەموو هەڵەکردنەیدا دێتەوە. تەنانەت نازانێ، هۆنینەوەکانیشی جوان بهۆنێتەوە. تەزبیح فرۆش بوایەو دەنکەکانی بهۆنیایەتەوە، کەس لێی نەدەکڕی.. هێندەی خواروخێچ دەهۆنیەوە!

لە بەشێکی دوا دیدارەکانمان لەگەڵ مام جەلال‌و نەوشیروان مستەفادا، دەڵێ:

"لە رۆژی (١٩٨٥/٤/١) سەرکردایەتی یەکێتی‌و کۆمەڵە ناردیان بەدوایاو هاتە یاخسەمەر مام جەلال‌و نەوشیروان داوایان لێکرد، خۆیان ئاشکراکەن، گەر رێکخراو یا حزبن با بێن بین بە باڵێک لەناو یەکێتیدا، مەلا بەختیار وتبووی ئێمە چەند تاقمێکین‌و هێشتا لەسەر بەرنامەیەکی یەکگرتوو رێک نەکەوتوین، دەرۆمەوە کۆبونەوەیەکی خۆمان دەکەین‌و خۆمان لەسەر بەرنامەیەک رێکدەخەین ئەوسا دێینەوە لاتان".[١]

جارێ.. (١٩٨٥/٤/١) رۆژێکی شومە لە مێژووی یەکێتیدا. ئەو رۆژەیە، نەوشیروان مستەفا توانی یەکێتیی بخاتە ژێر گەورەترین بەرپرسیارێتی مێژوویییەوە. بەرپرسیارێتیەک، هەر مێژوونوسێکی بێلایەن؛ بەڵگەکان، نوسینەکان، بۆچون‌و رەخنەکان هەڵبسەنگێنێ‌و بەراوردیان بکات، دەزانێ لایەنی کەم، یەکێتی لە دۆخێکی دژواری سیاسیدا، کە هەموو هەوڵە سیاسیەکانی لەمەڕ دانوستان‌و رێکەوتن لەگەڵ لایەنەکاندا، شکستی خواردبوو، بۆچونەکانی ئێمە، سەبارەت بە هەڵەکان کە کرابون، بەو شەڕەی لەگەڵ ئێرانیش بە (عاطفە) بڕیاری لێدرابوو، بەو دانوستانە نەزۆکەشەوە..تاد، بەوەی سەدام لە سەرۆکی فاشیەکانەوە کرایە (حەکەم) زۆربەی بۆچونەکانمان راست دەرچوون، کەچی، لە سێهەمین کۆنفرانسدا، لەبری ئەوەی بە ئارامیی هەڵسەنگاندن بۆ هەڵەکان بکرایەو رەخنەیان لێ بگیرایە.. بەڵام کوت‌ومت پێچەوانەکەیان پەیڕەو کرد. هەر لەناو کۆنفرانسدا، دادگای پشکنینی بیری رەخنەگران‌و بیری ئازادیان داناو گیانی میلیتاریستیانە سەپێنرا. کەشی ناو کۆنفرانس وەکو دادگاکانی پشکنینی سەردەمی ئاینسازی کاسۆلیکەکانی لێهاتبوو! وایاندەزانی، تاقە رێگە لەبەردەمیاندا دەمکوتکردنی رەخنەگران‌و سەرکوتکردنی ئازادی بیرورایە. وتارەکەی رۆژی پێشووی مام جەلالیان بیرچوەوە کە زۆربەیانی بە دزو بە لەشکری

١ سەرچاوەی پێشوو. ل(٤٤٨).

هۆلاکۆ لەقەڵەمدا. بۆیە، لەدوای کۆنفرانسەوە، هەڵمەتێکی راگەیاندنی بێوێنەیان بۆ خولقاندنی کەشی خەفەقانی سیاسی دژمان دەستپێکرد. سەرەڕای ئەوەش، پشووی شۆڕشگێڕانەمان درێژ دەکردو بە وریاییەوە هەڵوێستمان بەرامبەر هەڵمەتەکە دەردەبڕی، نەکا دۆخەکە لە گرێژنە دەربچێو رژێم سودی لێببینێ. بەداخەوە، ئەم پشوودرێژیو پەرۆشیە، لەو دۆخە نالەبارەی یەکێتی تێیکەوتبوو، بە نیمچە کودەتای عەسکەری وەڵامدرایەوە. بەحسابی خۆیان، بە پەلاماردانی ئاڵای شۆڕش، دەسەڵاتی رەهایان دەسەپێنن‌و گرەوەکە دەبەنەوە.

راستە، توانییان پیلانە عەسکەریەکە لە بێباکی ئێمەدا سەربخەن. بەڵام ئەوساو ئێستاش، ئەو رێگایە، رێگایەکی دژە دیموکراسییە. هەرگیز یەک مێژوونوسی بێلایەن، نابینینەوە بەو پاساوە بێ بنەمایانە باوەڕ بکات، کە ئەوسا یەکێتی دژی ئاڵای شۆڕش دایدەتاشین. ئەو سەرکەوتنە عەسکەریەش، هەروەکو سەرکەوتنی قرناقاوپشتئاشان‌و کوشتنی دیلەکان، مایەی شەرمەزاریە.

بەدڵنیاییەوە، ئەو سیاسەتە هەر ئەوکاتە، لەناو خۆیاندا رەنگێکی خراپی دایەوەو چەندین ئەندامی سەرکردایەتی بەهەڵوێست دژی وەستان (د.پێشەوا. حاکم عومەر) هەروا، یەکێتی شۆڕشگێڕان هەر پرسیان پێ نەکرابوو. جگەلەوەی ملازم عومەرو ئازاد هەورامی، توند دژی بڕیارەکە بوون. هۆمەر شێخ موس، هەڵوێستی جوامێرانەی هەبوو. لەناو پێشمەرگەو رێکخستنەکانیشدا، خراپ رەنگی رشت. هەموو لایەنە سیاسیەکانیش دژی بوون.

دەزانم، هەن وا بیردەکەنەوە کە سیاسەت زۆرجار سەرکەوتن چارەنوسەکەی دیاری دەکات. ئێستاش بەو دیوەدا سەیری روداوەکە دەکەم، کە سەرکەوتنی عەسکەری پەتی، کە دادەبڕێ لە فەلسەفەی دیموکراسی، لە رەهەندی ستراتیژیدا، زیانی زۆرترە. هەربۆیە دەبینین، ئێستا لە ئەمریکاو رۆژئـاوادا، پەیکەری رەمـزە کۆلۆنیالیستی‌و عەسکەریە داگیرکەرەکان، وردوخاش دەکرێن.

من هیچ گومانم نییە، سەرکەوتنی راپەڕین‌و دوای راپەڕینیش، سەرەنجامی راست‌و دروستی ئەو سیاسەتە نەبوو کە پەیڕەو کرا، بەڵکو بەهۆی داگیرکردنی کوەیت‌و گۆڕانکاریە ئیقلیمی‌و عێراقیەکەوە بوو، کە هاتنەپێشەوە. ئەگینا دڵنیام کە چارەنوسی یەکێتی، بە رێکەوتنی مفاوەزاتێکی لەرزۆک لەسەر دەستی نەوشیروان‌و هاوڕێ سازشخوازەکانی، تەواو دەبوو. هەروەکو چۆن، پێش داگیرکردنی کوەیت خەریکی ئەو مفاوەزاتە بوون. مام

جەلالیش دژی بوو! موکەڕەم تاڵەبانیو شێخ ڕەئوفی هەنجیرەو جۆرەها پەیام بە نەرمیی دەنێردرا، بەڵام حکومەت تەنها بە زارەکیی وەڵامی دەدایەوە.

ئەوەی ڕۆڵی چارەنوسسازی لەو دۆخەدا، لەو هەموو هەڵەو هەڵدێرەدا، گێڕا، سیاسەتە دژە دیموکراسیەکەی هاتنە سەر ئاڵای شۆڕشو بڕیارە زیانبەخشەکانی تر نەبوو، بەڵکو هەڵەی ستراتیژی حکومەتی عێراق بوو، بە داگیرکردنی کوەیتو گۆڕانکاریەکانی دوای ئەو، کە هاتنەپێشەوە. بەداخەوە، تا ئێستاش هەن پێیانوایە ئەندازیاریی نەوشیروان بوو، نەخشەی بۆ ڕاپەڕینەکە داڕشتبوو. کە کۆڕەوەکەش ڕوویدا، ئەوەی نەوشیروان بە مام جەلالو سەرکردایەتی یەکێتی دەووت، هیچ دوژمنێک زاتی نەکردووە، ئەو (جنێوانە!!) بدات. کە خۆم لە کوردستانو لەندەنیش لێمبیستووەو قسەکانیش لەم قۆناغەدا جاریٚ هی نوسینو گێڕانەوە نین!!

بەپێی گێڕانەوەکەی نوسەر، لای مام جەلالو نەوشیروان وتومانە: دەمانەوێ ببینە باڵێکی ناو یەکێتی.. کۆبونەوە دەکەینو دێینەوە لاتان..

ئەم قسانە ڕاستن. کە ڕۆشتیشین بۆ قەراغ، لە کۆبونەوەی فراواندا هەر ئەم قسانەم گێڕایەوە. بەڵام یەکێتی قبوڵی نەکرد. مادام قبوڵیشیان نەکرد، دەبوایە هەر لەو کۆبونەوەیەدا ڕەتمان بدەنەوە. نەک بە زارەکیی بڵێن باشە و بەکردەوە هەڵبکوتنە سەرمان. ئەوە بێ بەڵێنیی بوو. بەڵکو ماهیەتی سەرکوتکەرانەی ئازادییش بوو!! بڵێین چی، یەکێتی هیچ دەرسێکی لە مێژووی زیانەکانی بەکارهێنانی چەک لە کێشە ناوخۆییەکاندا، لە ١٩٦٤وە، وەرنەگرت!

پاساوی نوسەرو ئەوانەی ئەو بڕیارانەیان دا، چییە، ئەم قسانەی خوارەوەیە:

"بەڵام کە ڕۆیشت لەباتی خۆڕێکخستنو گەڕانەوە، کەوتە هەڵپەی پەیوەندی بە تیپەکانەوە. مەلا بەختیار لەڕاستیدا سیاسیەکی موراهق بوو، ناوی خۆی بیستبۆوە، هەموو ئەوانەی کە هاوڕێی بوون یا خۆشیان ئەویست، ئەو وای دەزانی تا تەوقی سەریان عێراقچین خۆی بە میراتگرو جێنشینی ئارام دەزانی، خۆشەویستی خەڵکی بۆ ئارام بۆ سودی خۆی بەکاردەهێنا، کە چووە قەرەداغ، وا ڕۆیشت وەک ئارام بنەو بارەگای بنکەی سوور لەوێ دادەنیو لەوێوە پەلاماری سەرگەڵوو یاخسەمەر دەدا".[1]

ئەگەر، بەتەمای جیابونەوەی عەسکەری بوینایە، هەرگیز بەپێی خۆمانو بە دڵخوازی خۆشمان، لە شارباژێڕەوە نەدەچوینە گوندی تەکیەی قەراغ، کە لە تەنیشتمانەوە بارەگای مەڵبەندی یەک لە گوندی دەلوجە بوو. ئەمە یەک، دووەم: قەت پەیوەندیمان بە یەک

---

١ سەرچاوەی پێشوو. ل(٤٤٨).

تیپیشەوە، یان یەک فەرماندەی عەسکەریەوە نەکردووە، بۆ جیابونەوە. لە زیندانیش هیچ بەڵگەیەک لەوبارەوە نەخرایەڕوو.

که دەشڵێ: مەلا بەختیار سیاسیەکی مراهق بوو.. گەردنی ئازاد بێ. بەڵام:

ئەوکاتەی نەخشەمان هەبوو لە پاریزگاری سلێمانی لە تۆڵەی شەهید شیهابو هاوڕێکانی بدەین، نوسەر ئامادە نەبوو هاوکاریمان بکات، ئەوکاتە ئەم قسانەی کردبا.. هەتا بە مراهقی تیا نەچین. چالاکیەکە نۆ ساڵیش پێش هەڵکوتانە سەرمان بوو لە تەکیە؟!

نوسەر.. دیارە خۆی بە کامڵ دەزانێ.. ئاوها ئێمە بە مراهق لەقەڵەم دەدا. نازانین ئەو کامڵیەی بۆ کەی هەڵگرتبوو؟ کاتێک ئێمەی (مراهق!!) کۆمیتەی هەرێمەکانمان دروستکرد..؟ نوسەر دەیگوت: هاوڕێیانمان لە زیندانن.. نابێ جارێ چالاکیی بکەین‌و با چاوەڕوان بین هەتا چارەنوسیان دەزانرێ!

ئەوکاتەی شۆڕشمان دەستپێکردو نوسەر هەر باوەڕی بەوە نەبوو، سێ مانگیش خۆمان بگرین، کامڵییەکەی بۆ کەی هەڵگرتبوو؟

ئەوکاتەی هەرێمی قەراغمان لە مەفرەزەیەکی بچوکەوە دروستکردو گەیاندمانە هەرێمی گەورەی گەرمیان‌و قەراغ‌و بازیان.. نوسەر وەکو کامڵێک کرایە بەرپرسی لق، بۆچی بەسەرشۆڕیی جانتای کامڵیی پێچایەوەو بە کامڵی قوچاندی‌و بە کامڵیش، دەیووت شەوکوێرم، ناگەڕێمەوە قەراغ!

ئەوکاتەی دوو جار شێنێ کەوتە بەر هێرشی دوژمن، ساڵی ۱۹۷۸و ۱۹۸۰.. نوسەری کامڵ، بارەگاکەی لە شێنێ بوو، ئێمەی مراهق سەرپەرشتی شەڕەکەمان دەکرد، جەنابی کامڵیەکەی بۆ کام هێرش هەڵگرتبوو؟

ئەوکاتەی ڕێپێوانی سنە بەرەو مەریوان دەستپێکردو ئێمە لە قەڵای مەریوان بوین‌و شەهید (عەلی خڕە)ی ئێناخی لەتەنیشتمان شەهید بوو، هەتا کۆمەڵەی زەحمەتکێشان هێزی نەنارد بۆ گۆڕینمان، سەنگەرەکەمان جێنەهێشت، چونکە (مراهق!!) بوین. بەڵام..

نوسەری کامڵ.. لە یەکەم تەقەدا، هەر لەپشتی مەریوان، شەهید فوئاد سوڵتانی‌و دوو شەهیدی تری جێهێشت‌و خۆی‌و کەرتە کامڵەکەی.. قوچانیان.. کامڵییەکەی بۆ دادی نەدا؟

ئەوکاتەی ساڵی ۱۹۸۱، سلێمان بیرێژی‌و (۸۰) کەس یاخی بوبون، سەرکردایەتی ئێمەی (مراهق)ی نارد بۆ پاک کردنەوەی ناوچەکە، نوسەری کامڵیان بۆ نەنارد؟

ئەوکاتەی بە تەکەتولی خۆیو زیندان، محەمەدی حاجی مەحمودیان راونا، چووە پاڵ سۆسیالیستو هەرێمی یەک کەوتە مەترسیەوە، مەکتەبی سیاسی ئێمەی (مراهق!)ی نارد، ئەی بۆ ئەوی کامڵی نەنارد؟

بەندە شانازی دەکەم، نوسەر بە (مراهق)م بزانێ، بەڵام ئەو مێژووەم هەیە.. بەس نییە، وەکو نوسەر کامڵ نەبوم؛ بەس نییە لە قەراغ هەڵنەهاتوم؛ بەس نییە مەیتی فوئاد سوڵتانیو هاورێکانیم لەناو خەڵتانی خوێن جێنەهێشتووە؛ بەس نییە، هەرێمی قەراغ، لەبەر ترسنۆکیی قانگو قاویان نەداووم. بەس نییە (مراهق)یش بوبین، سەرکردایەتی وەکو درۆزنێک سزای نەداووین!!

## ( ٦ )
## بنکەی سوور یان درۆی رەش؟!

بنکەی سووری.. هەروەکو عێراقچێتیەکەی لێکردووە. باسی دەکاتو نایبڕێتەوە. کە لە تەواوی ئەدەبیاتی شەهید ئارامدا، لە یەک نوسینو کۆبونەوەدا نوسەر، بچوکترین بەڵگەی بنکەی سووری بەدەستەوە نییە، کەچی دەشیەوێ، کۆمیتەی هەرێمەکان، بە دامەزراندنی بنکەی سوور، لە قەراغ تاوانبار بکات.

باسکردنی هەر روداوێکی مێژوویی، بەبێ بەڵگەنامەو شایەتی زیندوو، وەکو قسەی منداڵان وایە، لێنەگیراوە. نوسەر، خویەکی شیرییەو پێی تەرک ناکرێ بە پیریی.

ئەوەی ئەوکاتە، شەهید ئارام درکی پێکردبوو، نوسەر ئێستاش، دوای (٤٢) ساڵ لە شەهیدبونی، ئەقڵی پێی ناشکێ. ئارام، پێشبینی کردبوو، کۆمەڵە هەڕەشەی لەناوبردنی لەسەرە. هەڵوێستی سەرەتاییشی بۆ بەرگریلێکردنی دەربڕیبوو؛ بەڵام شەهیدکردنی خەملینی هەڵوێستەکەی راگرت. سەبارەت بە خەباتی پێشمەرگە، وەکو شۆڕشگێڕێکی خاوەن تیۆری زانستی، ئارام ئاوا دەدوێ:

"رێبازی شۆڕشگێرانەی راستی شۆڕشی کوردستان جارێکی تریش ئەو راستیەی سەلماندوە کە ئەگەر گەلێکی بچوک وەکو گەلی کوردستان زاتی خەبات کردنی هەبێتو بە رێگای تیۆرییە زانستییە شۆڕشگێڕەکانی چینە زەحمەت کێشەکاندا بڕواتو ریزەکانی خۆی یەکبخاتو پشت بە هێزو توانای گەل ببەستێت ئەتوانێ سەرکەوتن مسۆگەر بکاتو

دوژمنەکەی هەرچەندە بەهێزیش بێت لە دەریای شۆڕشگێرانەی گەلدا نقوم بکاتو بیخنکێنێو بە تەواوی مافە رەواکانی خۆی بکات".[1]

لەسەر یەکێتیو دواڕۆژی یەکێتیو کۆمەڵەش، ئەمە بۆچونی ئارامی شەهیدە:

"یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان تێ ئەکۆشێ بۆ کۆکردنەوەو رێکخستنی هێزە شۆڕشگێڕە نیشتمان پەروەرە دیموکرات خوازەکان لە چوارچێوەی شێوە بەرەیەکی نیشتمانی دیموکراتیدا بەجۆرێک کە هەموو هێزو تەیارە پێشکەوتنخوازو نیشتمان پەروەرەکان خەباتیان بە توندوتۆڵی یەکخەن. واتە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان حیزبێک نیەو جێی حزبی پێشڕەو ناگرێتەوە، بەڵکو لەپێناوی یەکگرتنی هێزە نیشتمان پەروەرەکانو لەناوبردنی دەستەگەریو دووبەرەکیدا دروست بوەو ئەو هێزانەی تا ئێستا لە چوارچێوەکەیدا کۆبونەتەوە لەسەر ئەم بنچینەیە یەکیان گرتوە بۆ خەبات کردن بە رێبازێکی پێشکەوتنخوازانەی دژ بە ئیمپریالیزمو زایۆنیزمو کۆنەپەرستیداو شان بەشانی هێزە شۆڕشگێڕەکانی سەرانسەری عێراق لەپێناوی عێراقێکی دیموکراتیدا کە کوردستان لە چوارچێوەیدا بە ئۆتۆنۆمی راستەقینە شاد بێ".[2]

جەختکردنەوە لەوەی یەکێتی: حیزبێک نییەو جێی حیزبی پێشڕەو ناگرێتەوە.. جەختکردنەوەیە لە رێبازی سەربەخۆی کۆمەڵە، بەرەو حیزب. پەرەپێدانی یەکێتیشە بەرەو بەرەیەکی فراوان.. نەک تواندنەوەی باڵەکان لە بۆتەیدا و کردنی بە ئەڵتەرناتیڤی حیزبی پێشڕەو! ئەگەر راستڕەوەکان بیانهێشتایە کۆمەڵە لەسەر ئەم رێبازە بەردەوام بوایەو پەیوەندی ئۆرگانیکی کۆمەڵەی، لەناو یەکێتیدا، هەتا کۆمەڵە دەکرایە حیزب، بپاراستایە؛ لە رێڕەوی خەباتیشدا، خۆی لە کێشەگەلی رێی خەبات لابدایە، نە دۆخی یەکێتی بەم دۆخەی دەگەیشت؛ نە کۆمەڵەش هەڵدەوەشایەوە؛ نە شەڕی ناوخۆش هەتاساڵی (١٩٨٦-١٩٨٧) درێژەی دەکێشا. کەسێک هێندە کۆمەڵەی خۆشویستبێ، ئەگەر بۆ خۆهەڵکێشانو بازرگانی نوسین نەبێ، ئەی بۆ کە کۆمەڵە هەڵوەشێندرایەوە، هەڵوێستی نەبوو. تەنانەت رەخنەیەکی ئاشکراشی نەگرت! ئەمە لەکاتێکدا لەدەرەوەی وڵاتیش بوو.. شمشێری کوشتنیش نەخرابووە ملیو هەڕەشەی کوشتنیشی لێنەکرابوو. کەچی نەیوێرابوو، بەیاننامەیەک دژی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە دەربکات.

١ هەڵبژاردەیەک لە نوسینەکانی شەهید ئارام. ناوەندی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان-عێراق- چاپخانەی شەهید برایم عەزۆ. ١٩٨٠. ل(٦٢-٦٣).

٢ سەرچاوەی پێشوو. ل(٤٩).

سەبارەت بە شۆڕشی نوێ، کۆمیتەی هەرێمەکان بەناوی لیژنەی سەرکردایەتی دەستەی چەکدارەکانەوە (سەرەتای تەموزی ١٩٧٦) لە رەهەندی ستراتیژیەوە دەیڕوانیە مێژووی کوردایەتی، نەک شۆڕشی نوێی، لەو مێژووە دانەبڕیبوو، بەڵکو بە رۆشنیی شۆڕشی نوێ بە درێژەپێدەری مێژووی شۆڕشەکانی کوردستانن، وەکو ئەڵقەیەکی تری خەبات سەیر دەکات. بڕوانن:

"ئەوەتا ئەمڕۆ ئەو تاکە ڕێیەی لەبەردەممانایە ئەیگرین‌و لەسەری ئەڕۆین ڕێگای خەباتی شۆڕشگێڕانەی راستەقینەیە ئەو تاکە ڕێگایەی کە ئەمانگەیەنێتە ئامانج. هەرچەندە وەکو ئاشکرایە خەباتی شۆڕشگێڕانەی گەلەکەمان ئێستا یەکەمین هەنگاوی نانێت بەڵکو ئەم هەنگاوانەی وا ئەیانێین بەرەو پێشەوە ئەڵقەیەکن لە زنجیرەیەک کە سالانی دوورودرێژی تری پێشوی خەباتی گەلەکەمان و گەشەکردن‌و بەرەوپێش چونی بزوتنەوەی نیشتمانی رزگاری کوردستان هەر لەکۆنەوە تا ئەمڕۆ بەشێکی گرنگ‌و پڕ شانازیی زنجیرەی مێژووی خەباتمانەو لەئێستاشەوە بەم هەنگاوە نوێیانەمان ئەڵقەکانی دوارۆژ دائەڕێژین‌و پێکیانەوە ئەبەستینەوەو دوارۆژو چارەنوسی گەلی کوردستانی ئەخەینە دەست".[1]

دیقەت لەو دیقەتە بدرێ، کە کۆمیتەی هەرێمەکان، چۆن بە دانەبڕاویی سەیری شۆڕشی نوێ لە شۆڕشەکانی تری مێژوومان دەکات. بەڵکو بە ئەڵقەیەکی تری هەمان خەباتی رزگاریخوازی دەزانێ. ئەم تێگەیشتنە، بەرزڕاگرتنی قوربانیەکانی نەتەوەی کوردە، بەدرێژایی مێژوو. نەک دامەزراندنی بنکەی سووری بێ مێژوو لەکوردستاندا، یان دروستکردنی حیزبی عێراقی کرێکاری سەرانسەری!!

## (٧)
## نەوشیروان‌و سەردانی زیندان

باڵی راستڕەو، دوای پەلاماردانی ئالای شۆڕش، بە رەهایی نەک لەناو کۆمەڵەدا، بەڵکو لەناو یەکێتیشدا خۆی بە زاڵ دەزانی؛ لەدوای ئەم روداوە، نەوشیروان وەکو سکرتێرو فەرماندەی هێزی پێشمەرگەی دوبارە (مکرر) بڕیاری دەدا. پێش ئەم روداوە، کە پنتی

١ هەڵبژاردەیەک لە نوسینەکانی شەهید ئارام. ناوەندی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان-عێراق- چاپخانەی شەهید برایم عەزۆ. ١٩٨٠. ل(٣٨).

وەرچەرخان بوو، سەبارەت بە زاڵبونی نەوشیروان، ناکۆکی نێوان مام جەلال-نەوشیروان لە کۆتا ساڵی جەلالیەکانەوە، بۆ دامەزراندنی کۆمەڵەش هەبوو. لە کۆتا ساڵەکەدا، نەوشیروان زۆر بەتوندی دژی عەلی عەسکەری‌و عومەر دەبابەو برایم ئەحمەدیش بوو.. پێی لەسەر هەڵوەشاندنەوەی باڵی مەکتەبی سیاسی-جەلالی دادەگرت. مام وا نەبوو. لە دامەزراندنی کۆمەڵەشدا نەوشیروان، تەنانەت مام جەلالیشی نەک بە سکرتێر بەڵکو بە ئەندامی کۆمەڵەش قبوڵ نەبوو. لە ساڵانی ژیانی هەندەرانیشدا، پەیوەندییان بەیەکجاریی پسا. لەمبارەوە، فوئاد قەرەداغی کە دامەزرێنەرێکی کۆمەڵە بووە، بگرە ساڵێک جێگری سکرتێری کۆمەڵەش بوو، لەسەر نەوشیروان، ئەم بۆچونە دەردەبڕێ:

"نەوشیروان مستەفا ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵەی مارکسی-لینینی کوردستان نەبوو. ساڵەکانی سەرەتای کارکردنی کۆمەڵە، ئەندامی کۆمەڵە نەبوو. هەتا شەهیدبونی ئارامیش هیچ بەرپرسیارێتیەکیشی لەنێو کۆمەڵە نەبووە".(١)

لەناو شۆڕشیشدا، مام‌و نەوشیروان بەردەوام گرفت‌و ناکۆکییان هەبوو. روانینیان لەسەر بەڕێوەبردنی شۆڕش، هاوپەیمانی یەکێتی، رەفتارو کرداری فەرماندەکان.. راووڕووت، هەتا دەگاتە دانوستان لەگەڵ رژێمدا، جیاوازیی بیرکردنەوەیان هەبوو. ئەوەی کە مام جەلال لەدوای شەڕی بێتواتە، گەیشتە ئەو بڕوایەی لەشکری یەکێتی، رزگاریخواز نییە، بەڵکو لەشکری هۆلاکۆیە.. کە دەیگوت: کەسیان لێ نابوێرم.. هەمویان دزن (ئەمە لەناو سێیەمین کۆنفرانسدا وتی) ئەمە رەنگدانەوەی دوو روانگەو دوو پراکتیکی جیاوازی نێوان نەوشیروان‌و مام بوو.. کە لە کۆنفرانسدا بەرەو روو پێی وتنەوە. قسەکان چەند گرنگ بوون، بەتایبەتی لەو شوێنەدا، زیاتر لەو قسەیە، بێدەنگیی نەوشیروان‌و هەندێک لە سەرکردەکانی کۆمەڵە بوون، کە لە کۆنفرانسدا، مات مات، گوێیان لە وتارە توندەکەی مام دەگرت‌و نەیاندەبردە سەر خۆیشیان. مام جەلالیش مەبەستی بووە لەناو کۆنفرانسەکەدا، پەیامێک بگەیەنێتە نەوشیروان‌و ئەوانەی چوبونە سەر رێگاکەی، بە رونی پێیانبڵێ، لە بەرەی خۆتان قاچتان زۆرتر رامەکێشن. ئەگینا، ماهیەتتان دەردەخەم. مام، باش باش دەیزانی، ئەو رەفتارانە هەمووی لەلایەن عەسکەریەکانی سەر بە نەوشیروانەوە ئەنجامدەدران بۆیە راستەوخۆ رووبەڕوو پێی رشتن!!

لە کۆنفرانسەکەدا، هەرچیەکیان پێ بگوترایە، گوێیان نەدەدایە، ئەوەی لایان گرنگ بوو، دادگاییکردنی خاوەن هەڵوێستەکان بوو. چش لەوەی دەکرانە دز و جەردە یان نا؟

---

١ گۆڤاری سڤیل. فوئاد قەراغی: دەربارەی دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسی لینینی. ل(١٦).

دەبنە لەشکری هۆلاکۆ.. یان مام رووبەڕوو کەسیانی نەبوارد لە دزیو پیاوکوژی!

هەڵەی (ئالای شۆڕش) هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانی ململانێو ناکۆکیەکانەوە، لەبارەی ناکۆکی مام جەلال-نەوشیروانەوە، ئەوەبوو کە:

بە جیاوازی بیرکردنەوەو ناکۆکیەکانمان دەزانی. بەرپەرچی نەوشیروانمان دەدایەوە. بەڵام هەوڵمان نەدەدا دۆستایەتی مام دەستەبەر بکەین.[*] هیچ نەبێ بایی ئەوە کە هەردووکیان نەخەینە بەرەیەکەوە دژی رەوتی رەخنەگرتن. دەمانتوانی لەسەر هەندێک خاڵی هاوبەش مام جەلال تێبگەیەنین. گەرچی رەنگبوو ئەمەش لە دوائاکامدا سودی نەبوبێ. چونکە مام جەلال سەربەخۆیی کۆمەڵە، لە رەهەندی گۆڕانکاریو ئەگەری کردنی یەکێتی بە حیزبی جەماوەری فراوان، قبوڵ نەبوو.

لەسەر دانوستان، هەمیشە نەوشیروان داکۆکی لێ دەکرد؛ لەبەرامبەردا، مام جەلال یان دژ، یاخود خۆپارێز (تحفظ)ی دەنواند. کە بیزانیبا، رەتکردنەوەی دانوستان کێشەکان قووڵ دەکاتەوە، دژ دەبوو، بەڵام بەقسەی زۆرینەی دەکرد.[+]

تا ئێستا، رابەرو سیاسەتمەداری وەکو مام جەلال، هەڵنەکەوتووە بتوانێ چەندین خەسڵەت، پێکەوە لەخۆیدا کۆبکاتەوە. وەکو:

---

* هاورێیانی ئالای شۆڕش دەزانن، من هەمیشە دەمگوت: ململانێ لەگەڵ هەردووکیان پێکەوە، هەڵەیە!

+ تەنها زیندانێک لە کوردستاندا، دوای ئەنفالەکانو تێکشکانی پێشمەرگە مابوو، ئەویش ئەو زیندانە بوو، بۆ منیان لە تەنگی توژەڵەدا، دروستکردبوو. رۆژێکیان ملازم عومەر هەواڵی ناردبوو، کە ئەگەر پێمخۆشبێ، نەوشیروان دەیەوێ بمبینێ. رێک ئەو رۆژە بوو، کە لە ئەرمەنستان بومەلەرزە (٥٠٠) هەزار کەسی کوشتبوو. شەوی دوایی هاتن بەدوامداو بردیانمە قاسمە رەش. نەوشیروان، کۆسرەتو ملازم عومەر دانیشتبون. دوای چا خواردنەوە، ئیزنی لەوان خواستو بەتەنها لەگەڵم دانیشت. وتی: تۆ فکرت سافە.. دۆخەکە چۆن دەبینی؟ منیش بە راشکاوی پێم وت: تکایە بەتەنها بە رەسمی بڵاوە بە شۆڕشەکە مەکەن، ئەگەر چوار مەفرەزەشتان لەخوارەوە مابێ.. گرنگە. وتی: چ سودێکی هەیە؟ خۆت دەزانیت، من دەمێکە وتومە شۆڕشەکەمان، هەر بەقەد ئەو مشکانەی بنمیچەکان کاریگەرییان لەسەر حکومەت هەیە. منیش وتم: سەدام کەتنێکی بەدەستەوەیە. وتی: چۆن؟ وتم: لەبەرئەوەی یەک ملیۆن سەربازی هەیە، بۆ نیوەی تەسریح ناکات؟ پاشان مەلیکی سعودیەو ئەمیری کوەیت هاتونەتە بەغداد، بەڵێننامەی دەستێوەرنەدانی عەسکەرییان لەگەڵدا مۆر کردووە. ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کەتنێکی بەدەستەوەیە، یان دژی ئیسرائیل، یاخود دژی وڵاتێکی کەنداو.. کە رەنگە پەلاماری کوەیت بدات. وتی: هەرگیز جارێکی تر خۆی توشی شەڕ ناکاتەوە. وتم: سروشتی رژێمە فاشیەکان وایە، بەردەوام خاکی تریان ئەوێو بەردەوامیش جەنگ بەرپا دەکەن. وتی: ئەمە خۆشباوەڕییە. وتی: لەسەر مام جەلال وەستاووم.. کۆتایی بەم چەکدارانە دێنینو دەچینە دەرەوە رۆژنامە بە زمانی عەرەبیو کوردی دەردەکەین. وتم: تکایە شتی وا مەکەن. وتی: ئێوە دژی رێکەوتن بون، رێکەوتن باشبوو یان ئەم کارەساتانە؟ وتم: بەعس، قەت مافی کوردی نەدەدا.. لەکۆتاییدا وتی: تازە سەدام کوڕەکانیشی حوکمی عێراق دەکەن. بەڵام ئێمە وەکو مەلا مستەفا ئازا نین، بڕیاری کۆتاییهێنان بە شۆڕشەکە بدەین. ئیزنم خواستو گەڕامەوە زیندان!

١) كەی هەستی بکردایە، ناکۆکیەکان مەترسی لەسەر یەکێتیو شۆڕش دروستدەکەن، پشووی لە گفتوگۆ درێژ دەکردو رای خۆی نەدەسەپاند.

٢) کەی بیزانیبا، سوور بێ لەسەر بۆچونەکانی، گرفتی ناوەختی لێناکەوێتەوە، بە توڕەبونەوە، بۆچونەکانی دەسەپاند.

٣) دەیتوانی، لە یەک چرکەساتدا، توڕە بێو دوای ئەوە، ئارامیش بێتەوە.

٤) کە تەکتیکی دەگۆڕی، بیری لای تاکتیکی پێشووی نەدەما. زۆرجار، کە بڕیاریشی دەگۆڕی، بڕیارەکانی پێشووی، بۆ تێپەڕاندنی بڕیارە نوێیەکەی، نەدەکردە کۆسپ.

٥) ستراتیژی نەدەگۆڕی، بەڵام کەی ویستبای، کۆکتێلێک تاکتیک، لەبەردەستیا بوون، بەپێی ئانو کاتی سیاسەت، لێی هەڵدەبژاردن.

٦) پێش ئەوەی بهاتایە بۆ کۆبونەوە، راپۆرتەکانی دەخوێندەوە. پرسیاری دەکرد. راوێژی هەبوو. زانیاریەکانی کۆدەکردەوە. بەڵام هەندێ جاریش، خێرا، بەبێ خەمڵاندنی بڕیار، بڕیاری دەدا.

٧) رێزی ژنی زۆر دەگرتو باوەڕیشی بە یەکسانیی هەبوو، بەڵام بە قۆناغ.

٨) رێزی لە ئەندامانی سەرکردایەتی دەگرت. پێویستیەکانی بۆ دابین دەکردن. ئەرکیشی پێ دەسپاردین. بەڵام بۆ بڕیاری سیاسی گرنگ گرنگ، تەنها گوێی لەو ئەندامانە دەگرت، کە توانایان هەبوو. لەدوای دووەمین کۆنگرەشەوە، بۆچونی وا بوو، زۆربەی سەرکردایەتی شایستە نین. بۆیە، درەنگ درەنگ کۆبونەوەی سەرکردایەتی دەکرد. دەیووت: ئەم سەرکردانە.. سو دیان لە کۆبونەوەدا نییە. هەندێکیان گوناحە سەرکردایەتی یەکێتین. بە تەکەتول بونەتە سەرکردایەتی! دەشیگوت: قەت یەکێتی سەرکردایەتی وا لاوازی نەبووە.(+)

لە دانوستانی (١٩٨٣-١٩٨٤) ناکۆکی مامو نەوشیروان، لەسەر رێکەوتنو رێکنەکەوتن، قووڵتر بوو. نەوشیروان لایەنگری رێکەوتن بوو، گەرچی حکومەت هەموو داخوازیەکانیش قبوڵ نەکات.(*) ئەیووت:

لەسەر فەیلی بۆچی شەڕ بکەین؟ کەی خۆیان بە کورد زانیی، ئەوسا شەڕیان لەسەر بکەین. بۆ کەرکوکو خانەقینیش، هەمیشە نەگەتیڤ بوو. گاڵتەی بە هەولێریش دەکردو

+ ئاخۆ بۆ چوارەمین کۆنگرەو سەرکردایەتی ئێستا، دەبێ چی گوتبا؟!

* لە بەغداد، دوای جیابونەوەی گۆران لێمپرسی: کەی گومانت لە نەوشیروان بەرامبەر بە خۆت پەیدا کرد؟ گوتی: دوای دانوستانی ١٩٨٥ خاڵێکی رەشم لەسەر دانابوو. چونکە پێی وا بوو من نەمهێشتووە دانوستانەکە سەربگرێ. وتم: ئەو ماوە زۆرە بۆ پشووت لەگەڵیا درێژ بوو؟ گوتی: لەبەر دۆخی کوردستانو یەکێتیو شەڕی ناوخۆ، نەدەکرا توند بم لەگەڵیا!

بادینیشی بە نەتەوەیەکی تر دەزانی. کورتیەکەی ئەوەی حکومەت ناوی نابوو (منطقة الحكم الذاتي) بە چاکسازیەوە، قبوڵی بوو.

مام دژی ئەوە بوو.. پێی وابوو، جەنگی عێراق-ئێران بوەستێ، حکومەت وەکو بەیاننامەی ئازار رەفتارمان لەگەڵدا دەکات. هەڵدەکوتێتە سەرمان. هەلەکەشمان لەدەست دەچێ. تەنانەت ئەشترسا یەکێتی لەپاڵ حکومەت بمێنێتەوەو هێزەکانی تر، لە شاخدا ببنەوە نوێنەری شۆڕش‌و کوردستان. (مام مارانگازی جەلالی بوو!!) لە مفاوەزاتدا، بەردەوام دەیگوت: تاقیکردنەوەی شەستەکان دوبارە ناکەینەوە، رێکیش بکەوین، جارێکی تر شاخەکان بەرنادەین. تەنانەت ئەم قسەیەی بە سەدامیش گوت! خۆم لەوێ دانیشتبوم. پێشیگوت: جارێکی تر رێگە نادەین وەکو ساڵی ١٩٧٠مـان لێ بکەن. چەکەکانمان لێبسەننەوە!

نەوشیروان، باوەڕی بە هەلەکانی جەنگ نەمابوو. دەیووت: دوای (٤-٥) ساڵ جەنگ، هیچمان نەکردووە، تازە نایکەین. باشترین کار ئەوەیە دانوستان سەربخەین!!

بۆ چۆنیەتی لەناوبردنی پارتی، لە گەرمەی دانوستاندا، هەندێ بۆچونی ترسناکی هەبوو. هەڵیدەگرم بۆ هەلی تر!

ئەم ناکۆکیانە بەردەوام بون. هەتا هەڵیانکوتایە سەر ئاڵای شۆڕش، لەوەبەدوا زاڵبونی نەوشیروان، ئیتر پتر تەشەنەی سەند. گەیشتە ئاستی زاڵبونی ئەقڵیەتی میللیتاریستی لەناو کۆمەڵەو یەکێتیدا. ئیتر لەمە بەدواوە، لەناو شۆڕش‌و یەکێتی‌و کۆمەڵەشدا، فەرماندە عەسکەریەکان، کرانە خاوەن بڕیاری رەها!!

ئێوارەیەکیان ١٩٨٦، لە زیندانی هەڵەدن بووم. زستانێکی سەخت بوو. وتیان میوانت دێ. وامزانی کەسوکارن. لۆکسیان هێنایە ژورەوە. زۆپاکەیان گەرم کرد. کاتژمێر ٨/ی ئێوارە، زنجیری دەرگا، زڕ زڕ، دەنگی کردنەوەی دەرگا هات.(+) نەوشیروان بە قەمسەڵەیەکو بێچەکو چەکدار، هاتەژورەوەو ئەم گفتوگۆیەمان هاتەپێش:

نەوشیروان: پێمناخۆشە بەم شێوەیە یەکتر دەبینین.

مەلا بەختیار: (بێدەنگ بوم).

نەوشیروان: خەتای خۆت بوو، خۆت بەستەوە بە سالارو حاجی مەمۆ، ئەمە ئەنجامەکەیەتی. (ئینجا هۆنراوەکەی ئەحمەد هەری خوێندەوە):

بەدەستی خۆت کە جامت خستە سەر لێوت غەشیمانە
گەر ژەهریشی تێدا بێ، گوناهی خۆتە بیزانە

+ کلیلی دەرگاکەیان دەدام‌و بە زنجیریش دەیانبەست!

هەڵە یاخود گوناهت کرد، لەکاتێکدا کە بێهۆشی
سزا و تاڵاوی هەرچیبێ، دەبێ وەک بادە بینۆشی
مەلا بەختیار: هیوادارم شۆڕشەکە سەرکەوێ.. ڤیروسیا لە ئێمە.
نەوشیروان: ئەزانی بۆچی هاتومەتە لات؟
مەلا بەختیار: نەخێر.
نەوشیروان: نەچووە بچێ. ئێستاش ئەگەر بڕیار بدەیت لەگەڵ من بیت.. هەموو شتەکان هەر ئێستا دەگۆڕم.
مەلا بەختیار: چۆن؟
نەوشیروان: خۆت ئەزانی، من مام جەلالم قبوڵ نییە. ئێوە پشتگریتان دەکرد. ئەگینا زوو دەرمدەپەڕاند!
مەلا بەختیار: ئێ؟!
نەوشیروان: مام جەلال سەفەری کردووە، ئەگەر تۆ لەگەڵم ڕێک بکەوی.. بروسکەی بۆ دەکەین، نەیەتەوە، ئیتر وتەبێژی ڕەسمیی یەکێتی بیت لەدەرەوەو نەگەڕێتەوە.
مەلا بەختیار: من چی بکەم؟
(دەفتەرێکی بچوکو قەڵەمێکی خستە بەردەستم) وتی:
بەڵێنم بۆ بنوسە لەگەڵم دەبیت، لە هەر بڕیارێک بیدەم. شۆڕشەکە دەکەوێتە بەردەستی منو تۆو فەرەیدون. یەکسەر پێکەوە دەچینە بارەگاکەی منو دوای هەفتەیەک، دەتکەمە مەسئولی مەکتەبی عەسکەری.
مەلا بەختیار: کاک نەوشیروان.. کە ئازاد بومو بەرپرسی گەورەش بوم، پێم خۆشبووە، لەگەڵ مام جەلال کێشەتان نەبێ. ئێستاش هەر وام پێباشە.. بۆیە ببورە من بەڵێنی وا نادەم.
نەوشیروان: بیری لێ بکەوە.. تا چەند ڕۆژێکی تریش، ڕازی بویت دێمەوە لات.
مەلا بەختیار: قەت شتی وا ناکەم.
ئەم ڕەتکردنەوەیە سێ ساڵو نیوی تر، منی لە زیندان هێشتەوە. بیستیشم.. کە مام سەفەری بۆ تاران کردووە، ئاگاداریان کردبوو، کە پیلانێک بۆ دورخستنەوەی هەیە. گەڕابوەوە بۆ هەرزنە..(+) لەسەر زێ. چاوی بە نەوشیروانو کەسانی تر کەوتبوو. توانیبوی کێشەکە ئارام بکاتەوە. بەڵام ژیلەمۆی ئەم ڕقە، خامۆش نەکرابوو. لە ئەنفالەکانیشدا، مام لەدەرەوە بوو. نەوشیروان کەوتبووە وێزەی هاوسەرو دۆستەکانی مام جەلالو ئەوپەڕی هەوڵیشی دابوو، دانوستان، پێچەوانەی ویستی مام جەلال سەربخات.

---

+ ئەوکاتە وام بیست د.کەریم ئاگاداری کردووە کە فریای خۆی بکەوێ!

لەوکاتەودا، کە من دەمزانی بەقسەنەکردنی نەوشیروان چەندم لەسەر دەکەوێ.. لە زیندانیش ئامادە نەبوم بچمە پاڵی دژی مام.. کەچی نوسەرو هەلپەرستەکانی تر، دەهۆڵی ئەوەیان دەکوتا، گوایە، بڕیاری پلینۆمیان سەپاندووەو مەلا بەختیار، دانی بە تاوانەکانیا ناوەو لە سیاسەتدا، کۆتاییهاتووە. بەو دۆخە هەرە نالەبارەش، ئامادە نەبوم پرەنسیپەکانی خۆم لەدەست بدەم. بەڵام نوسەرو هاومەرامەکانی، بەردەوام لەنێوان مامو نەوشیرواندا. خەریکی هەڵبەزو دابەز بون!!

## (٨)
## نەوشیروانو مام.. ناکۆکی بەردەوام

ئەم ناکۆکیەی هەردوو لوتکە، تا ئێستا بنجو بنەوانی لێکنەدراوەتەوە. هەموو ئەوانەی راستیەکان لە من کەمتر نازانن، هەتا نەوشیروان مابوو، لەبەر هەر هۆیەک بوبێ، نە لە نوسینو نە لە چاوپێکەوتنەکانیاندا، باسیان نەکردووە. تەنانەت دوای جیابونەوەی بزوتنەوەی گۆڕانیش، هەتا لە دووەمین کۆنگرەی یەکێتی، مام جەلال، هەندێ راستی سەبارەت بە نەوشیروان نەدرکاند، تەلیسمی نەوشیروان زۆربەی سەرکردەکانی یەکێتی بەرنەدابوو. بە رای من، بویستریێو نەویستریێ، مێژوو بازنادات بەسەر ئەو کێشە قوولانەی ساڵەها لە شاخو پاشان دوای راپەڕین، تا دەگاتە جیابونەوەی گۆڕان، ئەو ناکۆکییە، سیناریۆی جۆراوجۆری هەیە، دڵنیام وردو درشتی دەنوسرێتەوە.(*)

هەروەکو لە شاخدا، هەڵویستمان جیاواز بوو، لە شاریشدا، بەردەوام بۆچونی ناکۆکمان لەگەڵ نەوشیرواندا هەبووە. بە وریاییەوە، لە بڕیارو بۆچونەکانی دەمڕوانی. دەمزانی کینەی دەرونی چ کاریگەریەکی لەسەر بڕیارەکانی هەیە. رقی هەڵبگرتایە، دانەدەمرکایەوە!!

کە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان کرا. ئەنجامەکەی بۆ یەکێتی چاوەڕوان نەکراو بوو. پارتیو مەسعود بارزانی رێژەیەک دەنگیان لە یەکێتیو مام جەلال، زیاتر هێنا.(+)

* هەندێک لە بەرپرسەکانی یەکێتی، بەڵگەی جۆراوجۆریان لای نەوشیروان هەبوو.. چ لە شاخو چ لە شار.. بۆیە توخنی رەخنەلێگرتنی نەدەکەوتن. ئێستاش ئەو ترسە بەرینەداوون!

+ ئەوکاتە لیستی زەحمەتکێشان هاولیستی یەکێتی بوو. مام بانگی کردم، وتی: ئەنجامەکان چۆن دەبینی؟ وتم: پارتیو مەسعود بارزانی دەنگی زیاتر دێنن. وتی: بۆ؟ وتم: یەکەم.. هەموو ئەوانەی سەر بە حکومەتن دەنگ بە پارتی دەدەن. پاشان، ئێوە، هەولێرتان پەراوێز خستووە. هەولێر تەنها بە کاک کۆسرەت لەم هەڵبژاردنەدا ناچێ بەڕێوە. بەرپرسە کەمناوەکان کاریگەرییان کەمە. بۆیە فریا بکەوون.. خۆتو نەوشیروان تەرکیز بکەنە ناو هەولێرو دەوروبەری. وایشی کرد. هەفتەی کۆتایی هەڵمەتی هەڵبژاردن، لەهەولێر بوون.

لەئەنجامی هەڵبژاردنەکان، یەکێتی هەڵچوو. سلێمانی ئەو کاتەی ئەنجامەکان بەگشتی زانران، هێشتا بە رەسمی حاکمەکان دوابڕیاریان ڕانەگەیاندبوو، سلێمانی بۆنی شەڕی ئەهلی لێدەهات. هەتا مام جەلال بە سیاسەتی خۆی، سەرەنجامەکەی (٥٠ بە ٥٠) سەلماندن! لەراستیدا، پەنجا بە پەنجاکەش نەبوو. بەهۆی حاکمەکانەوە، پارتی کەوتە ژێر فشار؛ لە هەمانکاتدا، هیچ لایەکی تریش دەرنەچووبوو. بە کاریگەری ئەمریکاو دۆستەکان، چارەسەری بۆ دەستەبەر کرا. هەر ئەو کاتەی سلێمانی وەکو بورکانی تورەی پێش خرۆشانی لێهاتبوو، سەردانی نەوشیروانم کرد. ملازم عومەرو هاوڕێ خەجێ لەوێ بون. بارەگاکەی نزیکی یانەی وەرزشی سلێمانی بوو (خانوەکەی باوکی حەمە تۆفیق). بێڕادە توورە بوو. قسەی زبرو پڕ لە رەقی، بەرامبەر مام جەلال دەکرد (هی نوسین نین). رووی کردە منو گوتی:

-خوا.. تۆ و سالار بگرێ، ئەگینا مام جەلالم دەردەپەڕاند.

منیش وەڵامم دایەوە: خوا تۆ بگرێ، کە یەکێتیت وا لێکرد، خەڵک زۆرتر متمانە بە پارتی بکات. هەمومانت تێکوپێک دا. کۆمەڵەت هەڵوەشاندەوە. ئێستا نۆرەی مام جەلالە (دیسان قسەکانی هی گێڕانەوە نین!!).

هێشتا لە مشتومڕدا بوین، فیکو فاک، هۆڕنی سەیارە، هاتو هاوار، لەسەر شەقام بەرزدەبویەوە. هاتنە ژورەوە، گوتیان: پەنجا بە پەنجا ڕاگەیەندرا. هەواڵەکە، تورەبونەکەی نەهێشت. هەر ئەوکاتە، لە قسەکانو هەڵوێستەکانی نەوشیروان دژی مام، رامام. ئاسۆ تاریک دەهاتە بەرچاوم!

نەوشیروانم نەبینیەوە، هەتا یەکگرتنەوەی پەیڕەو یەکگرتن (ئاڵای شۆڕش)(*) لەگەڵ یەکێتیدا. دەستبەجێ چومە شام بۆ لای مام. لەگەڵ خۆیدا بۆ چەندین کۆبونەوەی دەبردم. هەر لەماڵی خۆی دایبەزاندمو نەیهێشت بچمە ئوتێل. لەوێوە، چوم بۆ لەندەن بۆ بینینی نەوشیروان. رۆژێکی لەگەڵ بومو باسی یەکگرتنەوەکەم لەگەڵ یەکێتی بۆ کرد. بە ساردیی پێشوازی لە یەکگرتنەکە کرد. وتیشی: "ئەم قسانە بۆ جەلال باشە. من هەقم بەسەر هیچەوە نەماوە. خۆشم بە یەکێتی نازانم". دیسان داباریێنێکی خراپتر لەوانەی پێشوو، داباریە سەر مام جەلال (هی گێڕانەوە نین!!).

بە حسابی خۆم، بۆ هەڵدانەوەی لاپەڕەیەکی نوێو دڵنیابون، سەری نەوشیروانم دا. بەڵام ئەو، سەراپا بۆچونەکانی لەسەر یەکێتیو یەکگرتنەوەکەو دۆخەکە، جیاواز بوو.

---

* بە تەلەفۆنی تایبەتی لەگەڵ مام جەلال، لەگەڵ هێرۆی هاوسەری، لە شام قسەم کرد. پێمگوت: بەبێ پرسی تۆ لە یەکێتی جیابومەوە. وا بێ پرسی جەنابیشت دێمەوە. پێکەنیو گوتی: وەرە سەرم بدە!

زۆریش نێگەتیڤ بوو. ئیتر من، سیاسەتی خۆم لەناو تەکەتولەکانی یەکێتی، ساغکردەوە. کە تەنها لەگەڵ مام سیاسەت بکەم![+]

گەڕامەوە سوید. سەلاحەدینی موهتەدی تەشریفی هێنایە لام. پرسیاری سەرەکی لەسەر دیدارەکەی منو نەوشیروان بوو. منیش چیم بیست، نیوەیم بۆ گێڕایەوە. هاتمەوە دیمەشق.. بۆ گەڕانەوە. هەر میوانی مام بوم. هەواڵی دیدارەکەی منو نەوشیروانو سەردانی هاوڕێیانی ئاڵای شۆڕشی پرسی، لەدەرەوە.[*] هەندێکم لە بۆچونەکانی نەوشیروان بۆ گێڕایەوە. وتی: دەزانم. منیش لای کەسی تر باسم نەکردبوو. زانیم، لەگەڵ سەلاحەدینی موهتەدی قسەی کردووەو بەئەمانەتەوە بۆی گێڕاوەتەوە. مام لێی پرسیم:

بە رای تۆ، نەوشیروان لەو قسانە مەبەستی چییە؟

بەبێ شاردنەوە، پێموت: نەوشیروان، هیچی لەگەڵ تۆ نەماوە. لە کاتێکی گونجاودا، لەیەکێتیش جیادەبێتەوە. ئەگەر کودەتا نەکات.

مام قسەکانی سەلماندم. وتی: ئافەریم. دەمێکە ئەم قسانە دەکات. وتیشی: من نەبومایە پێش راپەڕین لەگەڵ عێراقیش رێک دەکەوتو حەیای دەبردین. ملازم عومەریشی بۆ ئەو مەبەستە ناردە لام بۆ سوریا.

ئەمەیە رۆژگاری سیاسەت. ئەمەشە هەڵبەزو دابەزی سیاسەتی سیاسەتمەدارانی کوردستان، لەسەر بنەمای نەخۆشی سایکولۆژیو رق. ئەوەتانێ دوای جیابونەوە، یەکدەگرینەوە. هەر نەوشیروان، بە پاساوی بەرگری لە یەکێتی، کە گەورەترین تاوانی بەرامبەر ئەنجام داین. ئەوەتانێ، نە یەکگرتنەوەی ئاڵای شۆڕشی پێخۆش بوو. نە خۆشی لەناو یەکێتیدا مایەوە. لە یەکێتیش جیادەبێتەوە.

[+] کە گەڕامەوە، شەماڵ عەبدولوەفاو شەهید رزگار، لە بارەگای زەحمەتکێشان هاتنەلام. بەئاشکرا گوتیان: پێمانخۆشە لەگەڵ نەوشیروان بیت دژی دزەکان.. رونیان کردەوە دۆخی کێشمەکێشمەکانی یەکێتی لە چ ئاستێکدایە. بیستبوشیان چومەتە لای نەوشیروانو زۆریان پێخۆشبوو. منیش وتم: بێلایەن دەبمو باوەڕم بە تەکەتول نییە!

[*] کە لەوێ بوم، بەڕێز ئۆجەلان تێلی بۆ مام کردو گوتی بیستومە مەلا بەختیار هاتووە، پێمخۆشە ببینم. مام داوەتی کردو هات. سێ کەسی لەگەڵدا بوو. لە نیوەڕۆوە هەتا عەسر دانیشتین. لەوێدا پێموت: یان وەرەوە، یان بڕۆ وڵاتێکی ئەمین. سوریا ناهێڵێ، تا سەر لێرە بیت. نەچووە ئەقڵی. کە رۆشت، مام گوتی: بەختیار رات چییە بەرامبەری؟ گوتم: خوا رەحم بە خۆیو کورد بکات. چاوەڕوانی خراپم هەیە. مام گوتی: ئافەریم. کە گەڕاشمەوە، لەسەر زێ، شەهید حەسەن کوێستانی هات بەپیرمەوە. پرسیاری ئۆجەلانی کرد. هەمان وەڵامم دایەوە. کە گەیشتیشم، هاوڕێیانی ئاڵای شۆڕشیش، هەمان پرسیاریان لێکردمەوە، لەسەر ئۆجەلان.. هەر بە نیگەرانیەوە، لەسەر چارەنوسی خۆیو کورد.. وەڵامم دانەوە!

## (٩)
# سکاڵای دەرکردنی مام جەلال

هەتا بزوتنەوەی گۆڕان جیاکرایەوە، من گومانم لەوە نەبوو کە جیادەبنەوە. نە لە نوسینی سکاڵاش دژی مام لەگەڵ زۆربەی سەرکردایەتی تەوقیعم کرد. نە لەو ساڵانەشدا، یەک قسەی هیچ هەڤاڵێکم بۆ مام جەلال (کە ئەوکاتە دانیشتنەکان بە زەمکردنی مام جەلال گەرم دەکرا!) دەگێڕایەوە. هەتا خۆمی لێ بەرمە پێشەوە!! کە زۆربەی سەرکردایەتی سکاڵاکەشیان نوسی، شەو درەنگ، دلێری سەید مەجید داوای کرد پێکەوە بیگەیەنینە مام جەلال. هەتا دووی شەو لەگەڵی بوین. دڵی خۆشبوو کە من تەوقیعم نەکردبوو. بە هەلم زانی. پێمگوت:

مام جەلال، ئەوانە زۆربەیان هاوڕێی تەمەنی سیاسەتی تۆن. نە کەمیان کردووەو نە درەنگ هاتون. داوام وایە، نەرم بیت. ڕێگای دیالۆگ بگرە بەر. کام ڕەخنەیان ڕاستە، بیسەلمێنە. کامەیان ناڕاستە، پێیان بسەلمێنە. بەو شەوە نەوەستاین، هێزومان لە خەو بێدار کردەوە. تورە بوو. ئەمیشمان ئارام کردەوە. وتیشمان، دەبێ بەردەوام لای مام جەلال بیت. ئارامی بکەیتەوە. بەڵێنی دا. دوایی چوینە لای سەلاحەدینی موهتەدی.. هاوڕێی نزیکی گوێلێگیراوی مام، چواری بەیانی. تەکلیفمان لێکرد، ڕۆژ بێتەوە، بچێتە لای مامو هێوری بکاتەوە.

نیوەڕۆی دواتر، سەرێکی نەوشیروانم دا. لەوەئەچوو، هەموو هەوڵەکانمی لە دەمی دلێری سەید مەجیدەوە بیستبێ. سوپاسی کردم. منیش پێمووت:

کە ئێمە داوای چاکسازیمان دەکرد، تۆ هاتیتە سەرمان. ئێستا تۆ داوای دەکەی، پشتیوانیت دەکەم. پێکەنیو گوتی: ڕاستە. دوایی لای برادەرەکانیشی باسی کردبوو!(+) هەر ئەو رۆژە، بە نەوشیروانم گوت: دڵنیابە لەژێرەوە ئەو برادەرانەی سکاڵایان تەوقیع کردووە، هەندێکیان بایدەدەنەوە بۆ لای مام جەلال، وتی: مام جەلال ئەوەندە داخی کردۆتە دڵیان، کەس شتی وا ناکات. هەمان ڕۆژ، چەندین کەس لەوانە، وەکو پێشبینیم کرد، بایاندایەوەو لەگەڵ مام جەلال، لەسەر پلەوپایەو پارەی مۆڵ ڕێک کەوتن! دوایش پۆستی چەور چەوریان وەرگرت!

شەهید حەسەن کوێستانی، لە دوای ڕاپەڕینی کوردستان، لەلایەن نەوشیروان مستەفاوە کرابوە بەرپرسی لێکۆڵینەوە لە بەڵگەنامەکانی دەزگاکانی بەعس. هەر نەوشیروان ڕایسپاردبوو هەر بەڵگەیەکی دەست دەکەوێ لەسەر من، یان ئاڵای شۆڕش جیایبکاتەوەو بیداتە خۆی.

---

+ ئاسۆ عەلی بۆی گێڕامەوە.

## (١٠)
# پلینیۆمی دیسپۆزەتیڤ[*]

١٩٨٥/١٢/١٠ دوای دوو مانگو هەشت رۆژ لە گرتنمان، سیناریۆی پلینیۆم بۆ بڕیاردان لە چارەنوسمان سازدرا. (٦٠) ئەندامیان هێنابوو. بەرنامەی پلینیۆم:

"سەبارەت بەو تاوانە گەورەیەی کە مەلا بەختیار، وەک ئەندامێکی سەرکردایەتی کۆمەڵە کردویەتیو ویستویەتی پلانی هەڵتەکاندنی کۆمەڵەو یەکێتی جێبەجێ بکا. حوکمی گولله باران کردنی بەسەردا بدرێ."[1]

ئەمە، بەپێی قسەی نوسەر، بەندی یەکەمی پرۆگرامی پلینیۆمەکەیە. لەسەر ئەم خاڵانە نامەوێ بەدرێژیی بدوێم. بەکورتی رونیدەکەمەوە.

جگەلەوەی ململانێمان کردووە. ئاخر لەکوێ پلانی هەڵتەکاندنی کۆمەڵەو یەکێتیمان هەبووە؟ ئێمە داوامـان دەکـرد، وەک مینبەرێکی نـاو یەکێتی بمێنینەوە. ئیتر چۆن هەڵیدەتەکێنین؟! ئەگەر ئەمە پلانێکی پلینیۆم بوبێ؛ ئیتر لامان نامۆ نەبێ، ئەو کادرانەی کۆمەڵە، چۆن بڕیاریان لە چارەنوسی ئێمە دابێو چۆنچۆنیش، ساڵی ١٩٨٩، کۆمەڵەیان هەڵوەشاندەوە.

(٦٠) کـادر، لەناو پلینیۆمی کۆمەڵە، بەحساب کـادرە سـەرکردەو هۆشیارەکانی رێکخراوەکە بون. بەشێکیان نوسەر، فەرماندە، تێکۆشەری شـارو شـاخ.. ئەمانە، لە ماوەیەکی کەمدا، کاس کرابنو کەوتبنە ژێر کاریگەری سایکۆلۆژی سکرتێرو چەند سەرکردەیەکیانەوە، بۆ پەسەندکردنی بڕیارێک کە تەنها لە فاشیەکان دەوەشێتەوە. نـەک لە هێزێکی نیشتمانی-مارکسی!! دیـارە، هەمان ئـەو کـادرانـەو زیاتریشیان، لە کۆبونەوەی فراوانی کۆمەڵەدا تا ئەو رادەیە دەستەمۆ کراوون، بە سانایی کۆمەڵەیان پێ هەڵوەشاندونەتەوە. نەوشیروان، لە ماوەی زاڵبونیدا لەناو کۆمەڵە، مێشکی داشۆریونو لە هەڵوێست دایماڵیون. چۆنی ویستووە، وای بڕیار پێ داوون. ئەندامانی پلینیۆمەکە، بە ئیرادەی خۆیان بیریان نەکردۆتەوەو بڕیاریشیان بە ئیرادەیەکی وشیارانە نەداوە. بەڵکو لەبری ئەوان، هێزی دیسپۆزەتیڤ، واتا هێزێکی پشتی ئیرادەی ئەندامانی پلینیۆم لەبری هەمویان، بڕیارەکەی داوەو ئینجا بڕیارەکەی پێ داوون!

---

[*] دیسپۆزەتیڤ: ئەو هێزە دیارە نادیارەیە، کە زمانی ئاخاوتنو جۆری بڕیاردان، بۆ کەسانی دیکە، دیاریدەکەن.

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٤٥١).

نوسەر، ئاوا باسی بڕیاری دووەم دەکات:

"سەبارەت بە ڕابوردووی و ماندوبوونیو تێکۆشانی لە کۆمەڵەو یەکێتیشدا حوکمی هەڵواسینی سیاسی (اعدامی سیاسی) بدرێت واتە نەکوژرێ بەڵکو ماوەیەکی زۆر بە بەندی بمێنێتەوەو پاشان لە کۆمەڵەو یەکێتیو شۆڕش دەربکرێ، چونکە ئەگەر گوللەباران بکرێ ڕەنگە پێچەوانە تەفسیری بۆ بکرێو بە قارەمان ناوببرێ، ئەوانەی لەگەڵ ڕای یەکەم بوون زۆرینەی هەرەزۆری ئەندامان بوون.و ئەوانەی کە لەگەڵ ڕای دووەم بوونو پێشنیاری نەوشیروان خۆیو چەند کەسێکی تر بوون، کە نامەوێناویان بڵێم".[1]

کەوابێ، ئەم خاڵە، دوو بەشی هەیە؛ بەشێکیان: کوشتنی سیاسیمانە. بەشەکەی دووەمیشیان: کوشتنی فیزیکیمانە. زۆرینەش لەگەڵ کوشتنی فیزیکیمان بوون. بەڵێ زۆربەی پلینیۆم لەگەڵ کوشتنی فیزیکی بووە!!

ئێستا ئیتر، دوا پەردەی شانۆگەریەکە، بە تراژیدیا تەواو دەکرێ. بڕیارەکان، هەردوکیان، بە رونیی، یەک زەڕە جیاوازییان لەگەڵ بڕیاری حکومەتە فاشیەکان، نییە!!

زۆربەی ئەوانەی لەو پلینیۆمەدا بون، ماوون. بەشێکیان لە هاوڕێیانی زیندان بوون. جێی خۆیەتی بپرسین: بەعس بۆچی؟ شیهابو جەعفەرو ئەنوەری لەسێدارە دا؟ دیارە لەبەر دروستکردنی ڕێکخستنی نهێنیو سەردانی مام جەلالو خۆئامادەکردن، بۆ شۆڕش. کەچی بەعس، بەهەموو جەبەروتی خۆیەوە، هەتا نەیسەلماندبوو لەسەر ئەو سێ سەرکردەیە، کە هەرسێ تۆمەتەکەیان، لەسەرە. بڕیاری لە سێدارەدانی نەدابوون. (١١) مانگ زیاتریش دادگاییەکەیان درێژەی کێشا، هەتا حەیسیاتی (وردەکاری) تۆمەتەکەیانو بڕگەکانی لەسێدارەدانیان، ئامادەکران.

بەڵام پلینیۆمی کۆمەڵە، دوو ڕۆژی خایاند. لێکۆڵینەوەش لەگەڵ ئێمەدا، هەفتەیەکی نەبرد. نە خۆیان پارێزەریان بۆ دانایینو نە ڕێگەشیان دا پارێزەرمان هەبێ. لەگەڵ ئەوەی بەعس فاشستیە، ئێستاش بە گوناحی دەزانم نەک کۆمەڵە، تەنانەت خراپترین حیزبی کوردستانی، بە بەعس بەراورد بکەم.. بەڵام دادگاکەی بەعس، بە ڕواڵەتیش بێ، لەڕووی ئسوڵی محاکەماتەوە، باشتر بووە. پلینیۆمی "مارکسیستەکان" کوتومت پۆلپۆتیو ستالینی بووە. ئەوە پۆلپۆتو ستالین بوون، زۆربەی مەکتەبی سیاسیو ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی حیزبەکەیان، لە ڕوسیاو کەمبۆدیا، بەبێ دادگاو بە بڕیاری سەرپێیی، دەکوشت. بۆخارین، ئەندامی مەکتەبی سیاسی حیزبی کۆمۆنیستی ڕوسی،

---

١ سەرچاوەی پێشوو. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٤٥١).

که ستالین له هەموو رویەکەوە بەتواناتر بووە، له نامەیەکدا بۆ ژنەکەی دەنوسی: تاقە خەفەتم ئەوەیە بەناوی خزمەتی حکومەتی پرۆلیتاریاوە، دەمکوژم. لەکاتێکدا خۆم له بکوژەکانم زۆر به دڵسۆزتری پرۆلیتاریا دەزانم!

شانۆگەری ئەم پلینیۆمە، سیناریۆیەکی سایکۆلۆژی ترسناکیان بۆ داڕشتبوو. نەوشیروان، وەکو سکرتێر هەڵوێستی وەرنەگرتووە. بەڵکو وەکو ریمۆند کۆنترۆڵی رۆبۆتەکانی ناو کۆنفرانس، کارئەکتەرەکانی شانۆی پلینیۆمەکەی، دواندووە. هەروەکو تیمێک، لێویان جولاندبێ‌و به دۆبلاج دەنگەکەیان لەپشتی پەردەوە تۆمار کرابوو.

لەو شانۆگەرییەی پلینیۆمی سەرگەڵودا، حاڵەتی دەرونی کارئەکتەرەکان، بەچەشنێک بەرجەستە کرابوو، سنوری نێوان بکوژو قوربانیەکان، یەکسان کرابوو به تاوان. واتا: ئەندامانی پلینیۆم، خۆیان قوربانی سیاسەتی رقڕشتنی نەوشیروان بون. کەچی به شانۆگەری پەیڕەوی ناوخۆ، لەگەل تاوانباری یەکەم یەکسان کرابوون.. که سکرتێری کۆمەڵە بوو. چەند، تاوانێکی گەورەیە.. قوربانی بکرێتە تاوانبارو تاوانباریش به بڕیاری دەستەجەمعی قوربانیەکان، خۆی بکاتە نمونەی پارێزەری رێبازی کۆمەڵە! ئەمە، ئەو ساتەکاتانەیە که ئیتر تەواوی حەقیقەتەکان، دەکرێنە رموزنی یەکێک له خراپترین روداوەکانی مێژووی هاورێیەتی.. مێژوویەک، تیایدا، مێژوو ئەتک دەکرێ‌و بیروباوەڕ دەکرێتە کاڵایەکی دارزاوی ناکۆکیەکانی ناو کولتورێک.. نزیک دەخرێتەوە له ئاگری فاشیەت! ئائەمەیە پلنیۆمێک، دیسپۆزەتیڤ لەبری هەمووان بڕیار دەدات!

وەکو تر، له پەیڕەوی ناوخۆی کۆمەڵە: سەرنج راکێشان، سرکردن، هەڵپەساردنی ئەندامێتی، سزای چەند مانگە، دەرکردنی یەکجارەکی (طرد) هەیە، بەڵام، کوشتنی سیاسی‌و جەستەیی تیادا نییە. تەنانەت قسەشیان له گۆڕینی بەندو برگەکانی پەیڕەوی ناوخۆ نەکردبوو، هەتا بەوپێیە سزای کوشتنی تیادا پەسەند بکەن‌و بڕیارمان لەسەر بدەن. با پانۆرامایەک لەسەر روداوەکانی جیابونەوە، بکەینە نمونە:

پێش جیابونەوەی ئاڵای شۆڕش

- ئەگەر سزای جیابونەوە، کوشتنی سیاسی‌و جەستەییە، ئەی بۆ که بزوتنەوەی سۆسیالیست جیاکرایەوە، پلینیۆم نەگیراو له کۆبونەوەی سەرکردایەتیشدا، بڕیاری کوشتنی سیاسی‌و جەستەیی لەسەریان نەدرا؟ با دوریش کەوتبنەوە، بەڵام سزاکە لەرووی مەعنەویەوە، هەر کاریگەری دەبوو.. بەپێی لۆژیکی پلینیۆمەکە!!

- ئەی بۆ پارتی گەل-سامی عەبدولرەحمان، لە پارتی جیابونەوە، تەنها سزای سیاسی-حیزبی دران؟ نە لە پلینیۆمو نە لە کۆنگرەدا، بڕیاری لەناوبردنیان نەدرا؟

- ئەی بۆ، بەدرێژایی مێژووی حیزبی شیوعی عێراق، زیاتر لە (١٠) جیابونەوە لەناویاندا رویداوە، کۆمیتەی ناوەندییان، یان لە پلینیۆمو کۆنفرانسەکانیاندا، بڕیاری کوشتنی سیاسیو جەستەییان نەدان؟

- ئەی بۆ لەناو فەلەستینیەکاندا، جۆرج حەبەش، ئەحمەد جبریل، نایف حەواتمە، ئەبو نزال، لە رێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستینو فەتح، جیادەبونەوە، بڕیاری کوشتنیان نەدەدرا؟

- ئەی بۆ مەنشفیکەکان بە بڕیاری لینین، (٦) دانە مانگ، مونازەرەی تیۆریان لە رۆژنامەی پراڤدا لەگەڵ بۆلشەویکەکان کرد، پاشان راپرسییان ئەنجام دا، ئینجا بەبێ کوشتنی کەس، لێک جیابونەوە؟

- بۆ ترۆتسکی، چەندین جار دەستەگەری کردو دژی لینینو حیزبەکەش بوو، لینین رێزی دەگرت، لەدوای شۆڕشی ئۆکتۆبەریش، لەشکری سوری دامەزراند. بەڵام ستالین، بە تەور کوشتی؟!

دوای جیابونەوەی ئالای شۆڕش

- ئەردۆگان، لە پارتی دایکە ئیسلامیەکەی جودابویەوە، نەجمەدین ئەربەکان، نە بڕیاری کوشتنی دا و نە بە خائینیشی زانی.. لە هەڵبژاردنیش بردیەوە.

- عەلی باباجانو داوود ئۆغلۆ، پار، دەستەگەرییان کردو لەراگیاندنەکاندا، توند دژی ئەردۆگان دەدوان، جیاش بونەوە، ئەردۆگان بەو هەموو دەسەڵاتەی هەیەتی، پلینیۆمی کوشتنی سیاسیو جەستەیی بۆ ساز نەکردن.

- حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، لە شەستەکان جارێکو هەشتاکان جارێکی دیکەو، کۆتایی نەوەدەکانیش سێهەمین جار، جیابونەوە کەوتە ناویان، نە لەسەردەمی قاسملوو، نە لەدوای ئەوەش، پلینیۆمی کوشتنی سیاسیو جەستەییان نەبەست، دژی (لادەرەکان!!).

- کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران، لەناو حیزبی کۆمۆنیست جیابونەوە؛ لەناو کۆمەڵە چوار جیابونەوە رویدا، چەکداریشن، سەنگەر بە سەنگەر دراوسێنو پلینیۆمی کوشتنی یەکترییان سازنەدا.

- نەوشیروان مستەفاو چەندین مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتی یەکێتی، جیابوونەوە. یەکێتی پلینیۆمی بۆ نەبەستنو بڕیاری کوشتنی نەدان.(*) بەڵکو (١٠) ملیۆن دۆلارو کۆشکو تەلاریشی لە جوانترین شوێنی سلێمانیدا، پێدان. یەکێتی کۆنگرەشی بەست، هەر بڕیاری کوشتنی نەدان. بەهەمانشێوە جیابوونەوەی هاوپەیمانی دیموکراسیش.

لەناو ئەو هێزە سیاسییە چەکدارانەدا، کە مارکسستی، ناسیۆنالیستی، دیموکراسیو ئیسلامیشیان تیابوو، سەرکردەی بەتواناو ناودارییان هەبوو، دەسەلاتی عەسکەری، ئیستخباراتی، ڕاگەیاندنو دارایی زەبەلاحیشیان لەبەردەستدا بوو؛ هەیانە لە دەسەلاتو هەشیانە لە ئۆپۆزسیۆنی چەکداریدا بون، پێش جیابونەوەو دوای جیابونەوەی ئاڵای شۆڕش. کەچی هیچیان، پلینیۆمی وەکو نەوشیروانو کۆمەڵەیان لەکاتی جیابونەوەکاندا نەبەستو بڕیاری یەکتر کوشتنیشیان نەدا. هۆیەکەی ڕونە.. ئەویش سروشتی نەوشیروانو ئایدیۆلۆژیەتی توندوتیژیو سایکۆلۆژیەتی ڕقو کینەیەتی. لەکاتێکدا باڵی ڕاستڕەوی هەلپەرستەکان، باڵادەست بوبوون!

پلینیۆمی کۆمەڵە، شانۆگەریەکی مەسخەرەو مەسخی سیاسی بوو، بە کینەی نەوشیروانو ئەقڵیەتی تۆڵەسەندنەوەی تەکەتولی زیندان، لە کۆمیتەی هەرێمەکان؛ بڕیاریان دا پلینیۆمەکە، درێژەپێدانی کولتوری چەکداری شەستەکان بێ، بۆ پێشێلکردنی ئازادی سیاسی لەناو بزوتنەوەی سیاسی-چەکداری کوردستاندا. ئەو کولتورەی جەلالیو مەلایی بناغەکەیان داڕشتو لە شۆڕشی نوێشدا، لە دەستپێکردنەوەی شۆڕشدا، لە بادینانەوە سەپێنرایەوە. هەتا ئەنفالەکانیش، درێژەی کێشا. لەدوای ڕاپەڕینیش (١٩٩٣-١٩٩٤) سەریهەڵدایەوە.(+)

---

* لە کۆبونەوەیەکی مەکتەبی سیاسیدا، پێش جیابونەوەی، تەرخان کرا بۆ لێکدانەوەی ئەگەری جیابونەوەی بزوتنەوەی گۆڕان، من گوتم: ئەوان جیادەبنەوە. ململانێی فکریو سیاسی بکەینو نەهێڵین کاریگەری زۆرتر دابنێن. رووم کردە مام جەلالو گوتم: مام، ئەمرم پێ بکەیت چایچیەکی نەوشیروان چەک بکەم، نایکەم. لەگەڵ بەکارهێنانی هێزیش نیم. ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی، کە دواتر بوو بە گۆڕان، وتی: هەقە مام جەلال ئەمر بکات، بە هێز بچینە سەریانو تەفروتونایان بکەین. من بەرپەرچم دایەوە. دوای ماوەیەک خۆیشی لەبەرئەوەی مام جەلال لەکۆبونەوەیەکدا لێی تورە بوو، بوو بە گۆڕان!

+ ١٩٩٤ کە شەڕی ناوخۆ سەریهەڵدایەوە، من دژی بوم. بەرپرسیاریتی ڕوونەدانی شەڕم لەناو هەولێر گرتەئەستۆ، لەگەڵ شەهید سەعد عەبدوڵلای پارتی. ئەو کاتەش، دەیانووت: مەلا بەختیار شۆڕشگێڕێتیەکەی جارانی نەماوە. چەندین شەڕمان لەناو کۆڵانو شەقامەکانی هەولێر، دامرکاندەوە. ژیانیشمان دەکەوتە مەترسیەوە. بە چاوی خۆشم تالانکردنی دەزگاکانی حکومەتم دەبینی. سەرکردەی دزەکانو بکوژەکان، ئێستا لە مەکتەبی سیاسی پارتیو یەکێتی، ئەندامن!!

ئەگەر بڕیارەکانی ئەم پلینیۆمە راستو رەوا بون. کەوابێ.. پەلامارەکانی بارزانیش لە ١٩٦٤وە بۆ سەر باڵی مەکتەبی سیاسی، راستو دروست بووە. ئەمانی مارکسی بڕیاری وا بدەن، ئەی مەلا مستەفای لوتکەی بنەماڵە بۆ بڕیاری وا نەدات؟

لەبەرئەوەی دامەزرێنەرانی یەکێتی، مارانگازی شەڕەنگێزی جەلالیو مەلایی بونو ساڵانی (١٩٦٤-١٩٦٦-١٩٧٠) لە رووی عەسکەریو سیاسیەوە تێکشکابوون، بۆیە، لە باری سایکۆلۆژیەوە، بێزادە لەبەرامبەر ناکۆکییە فکریەکاندا، هەستیار بوبون. لە هەموو ئانو کاتێکدا، تەنها بەکارهێنانی هێزیان بە دەستەبەری خۆیان زانیووە.

بزوتنەوەی سۆسیالیست جیابونەوە، سەرکردایەتی یەکێتی کۆبوەوە. گفتوگۆ لەسەر بڕیاری عەسکەری بەرامبەریان کرا. مام جەلال بۆچونی وا بوو، لە رووی عەسکەریەوە، لە هەر شوێنێک مەترسییان لەسەر پەیدا کردین، لێیان بدەین. سالار عەزیز، پێش هەموو کەسێک وتی: من لەگەڵ چارەسەری عەسکەری نیم. مام جەلال پێی ناخۆشبوو. وتی: بەتەمای لەشکرەکەی تۆ شەڕیان ناکەین. بەم وەڵامە، خۆسازدان بۆ شەڕ لە بەرنامە دانرا. من وتم: تەنها شەڕی بەرگری رەوایە. با ئێمە دەشتپێشخەری نەکەین. سالار عەزیز، بێباکانە جەختی کردەوە، کە پێویستە زوو چارەسەری سیاسی بدۆزینەوە! وتیشی ئامادەم.. ئێستا بچم بۆ گفتوگۆ لەگەڵیاندا.

لەم پلینیۆمەدا، نەوشیروان دوا پوازی خۆی بۆ زاڵکردنی گیانی نوزە لێبڕینی ئازادی بیروڕا کوتا. تەنها یەک تێکۆشەر بەهەڵوێست بوو دژی بڕیارەکە (عەبدوڵڵا تۆفیق) کە هەڵوێستەکەی، دڵنیام، تا هەتایە سەربەرزی کردووە.

د.ئەرسەلان بایز، لەسەر عەبدوڵڵا تۆفیق،(*) پێش دڵنیابون، لە هەڵوێستو خزمەتەکانی بەندە، دەڵێ:

"تەنها یەک کەس بڕیارەکەی واژۆ نەکرد، ئەویش "عەبدوڵڵا تۆفیق" بوو، گوتی من واژۆی ناکەم، چونکە مەلا بەختیار پیاوێکی ماندووەو تێکۆشەرە، لەبەرئەوە حەق نییە

---

* یەکەم جار، شەوی رۆشتنی د.ئەرسەلان بایز و ئاوات عەبدولغەفور، ناوەڕاستی مانگی ٩/ی١٩٧٥، لەسەر شەقامی برایم پاشای سلێمانی بینیم. پێیاندادەگرت، هەردوکیان بڕۆنە لای هاوڕێیانی سەرکردایەتی-شام. منیش، لاوێکی خانەقینی نەشارەزا، سور بوم لەسەر مانەوەو درێژەپێدانی خەبات. دوای هاتنەدەرەوەی د.ئەرسەلان (چل) ساڵە، هاوڕێین. پێم سەیرە، لەو هەموو ساڵانەدا، بۆی دەرنەکەوتبێ، بێوەفا نیم.. پێش سەردانی د.ئەرسەلان، سەردانی کاکە عەبدوڵڵام کردووە. سەیارەی نەبوو بۆم دابین کرد. کتێبی (کۆبەندی چەند بابەتێک)م پێشکەش کردو نوسیم.. هەڵوێستەکەی نەخشی مێژووە. کاکە ئەرسەلان.. بێ زانیاری هەق نەبوو.. بە بێوەفامان بزانێ. هیچ نەبێ دەیتوانی پرسیار لەخۆم بکات!

بیکوژین.. بەڵام دواتر مام جەلال گوتی ئەو بڕیارەتان بە من بسپێرن من جێبەجێی دەکەم.. بۆیە مام جەلال کێشەکەی کرد بە هی خۆیو مەلا بەختیاری لای خۆی زیندانی کرد، ئەمەشی بۆ ئەوە بوو جێبەجێی نەکات!

بەڵام مەلا بەختیار پیاوێکی بێ وەفایە بەرامبەر "عەبدوڵڵا توفیق"، چونکە دەبوو تاجی ئاڵتوونی لەسەری "عەبدوڵڵا توفیق" بنێت، چونکە کە سەردانی خۆیو ماڵەوەیان دەکەم دەبینم خۆیو منداڵەکانی زۆر بێنازنو هەمیشە هەست بەوە دەکەم کە کاک مەلا بەختیار لەبەرامبەریان چەند بێ وەفایە!".[1]

ئەم پەلەکردنە لە حوکمدان، لەسەر منو لەسەر وەفاداریو بێوەفایی، لەکاتێکدایە، لەناو یەکێتیدا، لەلایەن زۆر سەرکردەوە، بێوەفایی راستەقینە، دەرکەوتبوو، چارەنوسی یەکێتیش، بەهۆی ئەو بێوەفایانە، کەوتبووە مەترسیەوە، کەچی د.ئەرسەلان، ئەو بێوەفایانەو چارەنوسی یەکێتی، فەرامۆش دەکات. بەڵام وەفاکانی من دەکاتە بێوەفایی!

## (١١)
## پاکانە.. یان درۆتاش؟

نوسەر، بەشانازییەوە (٨) لاپەڕەی لەسەر چۆنیەتی سەرپەرشتی لێکۆڵینەوەی لەگەڵماندا نوسیووە. نازانێ، ئەم روداوە لەمێژوویاندا رەش رەشە.. هەتا هەتاشە، مایەی نەفرەتیشە. کەسێکی هێندە بێ گەوهەر، هێندە ساڵانی خەباتی یەک سەرکەوتنو یەک جوامێریی تیا نەبوبێ، هەتا شانازی پێوە بکات. بەڵکو ئۆباڵی شەهیدبونی رابەرێکی وەکو فوئاد سوڵتانیو شەهید ئەکرەمو شەهید خەبات لە قەراغ، لە ئەستۆی بێ. لە یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەدا، لەسەری سەلمێنرابێ کە ئۆباڵی ئەو شەهیدانەی لەئەستۆیە.. لە کۆبونەوەی رەسمی ناوەندی کۆمەڵەدا، بڕیاری بۆ بدرێ کە ئەگەر بەردەوام بێ لەسەر خۆهەڵکێشان، سزا دەدرێ. کەسێکی ئاوها.. نەک بە شانازی دەزانێ بکرێتە جەلاد لەگەڵ ئەو تێکۆشەرانەی مێژوویەکی پاکو بەهەڵوێست بوون، بەڵکو سەرگوزشتەی جەلادییەکەش بۆ دامرکاندنەوەی رقە سایکۆلۆژیەکەی بە درۆ دادەڕێژێو بڵێ:

---

١ ژیانو خەباتی سیاسی د.ئەرسەلان بایز لە چاوپێکەوتنێکی مێژوویدا. چاوپێکەوتن: ئیسماعیل کوردە. چاپی یەکەم: ٢٠١٩. ل(١٤٠-١٤١).

"ڕۆژی (١٩٨٥/١٢/١٥) چوومە لایو بەپێچەوانەوە بڕیاری پلینیۆمم پێ ڕاگەیاند لەگەڵ بیستنی وشەی گوللە بارانکردن، دەستی گرت بە چاویەوەو بە گریانەوە وتی: کەواتە (زیلان بێ باوک ئەبێ)؟ ئینجا وتی: (ئەی ئەگەر هەموو شتەکان بڵێم؟ پێم وت: سبەینێ وەڵامت ئەدەمەوە".[1]

ئەم باسە، سەراپا درۆیە.. نە گریاوومو نە باسی (زیلان)م لای نوسەری درۆتاش کردووە. دەشڵێم: بەداخەوە دەبوایە ئەوکاتە هەر بەڕاستی بۆ زیلانو لاڤە، بگریامایە. گریان، هەندێک ڕاستگۆیەتی ناخی مرۆڤە. بەڵکو ئەوانەی پێیانوایە نەگریان جوامێرییە، ئەمانە، دەچنە ریزی فاشیەکان. ئەوەی گریان لە هەستیا نیە، یان گریان لە ناخیا دەکوژێ، ئەم کەسانە دەبێ گومان لە ڕەوشتو سایکۆلۆژیەتی بکرێ.. کە کەسێکی ئاسایی بێ!

لە قۆناغی یەکەمی لێکۆڵینەوەدا: د.خەسرەو، حەمە تۆفیق، قادری حاجی عەلی، هاتن. قۆناغی دووەم.. ئەوان جوامێر بونو پێیان شەرم بوو، لێکۆڵینەوە لەگەڵ من بکەن. بۆیە کشانەوە. لەو بەینەدا، هاوڕێیەکی خۆم هاتە لامو پێی ڕاگەیاندم، کە نەوشیروان خەریکی تەزویرکردنی نامەیەکە بەناوی منەوە، گوایە، پەیوەندیمان بە موخابەراتی عێراقەوە هەیە. وتیشی: ئەگەر دڵنیا نەبێ لەوەی ئاڵای شۆڕش مەترسی نەماوە لەسەریان، بەو تۆمەتە دەتکوژن. وتیشی: نەوشیروان وتویەتی: نامێڵین وەکو (عەبدولخالق مەحجوب) ببێتە شەهیدی کۆمۆنیستەکان.

باوەڕم بەو قسەیە کرد. چونکە نەوشیروان لە بوختان هەڵبەستنو پروپاگەندە هاوتای کەمە. لەدوای ڕاپەڕینیش، چەندین نامە بەناوی هەندێک سەرکردەی لایەنەکانی نەیار، تەزویر دەکراو دەکرانە پیاوی ڕژێم. جارێ کاتی نییە باسی بکەم!

من.. کەوتمە دۆخێکەوە، دڵنیا بوم، ئەوەی نەشێ بۆم هەڵدەبەستن. چونکە، کۆمەڵەو یەکێتی کەوتبونە دۆخێکەوە، لەسەر چز بوون بۆ هەموو ئەگەرێکی سیاسی. هەتا ڕادەی تاوان!

ناخۆشترین مردن، مردنێکە، هاوسەنگەری ڕابوردووت، وەک خائین لەناوت بەرن. هاوسەنگەرێک، لەو دۆخەدا، وایان بەسەر خۆیان هێنابوو، لە هیچ نەدەپرینگانەوە. هێزی چەکدار وایە، کاتێک تێزەکانی شکست دێنن، لە بیروباوەڕیش هەڵگەڕابنەوە، ئیتر بەربەستی ئەنجامدانی تاوان، لەناویاندا، هەرەسدێنێ. لەهیچ ناپرینگێنەوە.

ئەوانەی مام جەلال پێیدەووتن: لەشکری هۆلاکۆ. شیعری موزەفەر نەوابی بۆ

---

١ برایم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپخانەی چوارچرا. چاپی یەکەم-٢٠١١. ل(٤٥٢).

دەهێنانەوە کە بە حاکمەکانی عەرەبی دەووت (يا أولاد القحبة لا أستثني منكم أحداً) مام جەلال دەیـووت: لەشکرەکە هەمووی خەریکی دزییە، پیاو کوژییە. پەیتا پەیتا دەیووت: ئاگری فاشیەت هەڵکراوە، هەمومان دەسوتێنێ. بەداخەوە، بە هەڵەی خوم، لەبەر پەرۆشیم، بۆئەوەی نەچینە ناو ئێرانو نەچینە ناو جودو، بۆئەوەی شەڕی ناوخو قووڵتر نەبێ، پێم بە جەرگی خۆمدا ناو بەپێی خۆم چومە قەراغ. دەرکەوت؛ جگە لە مام جەلالو سەرکردەکانی یەکێتی شۆڕشگێڕان، هەرچی وەفا هەبوو نەیانمابوو.. بەرامبەر ئەو مێژووە هاوبەشەو هاورێیەتیو برایەتی!

بە هەڵەی خۆم، خۆمو هاوڕێکانم خستە ناو ئاگرە هەڵکراوەکەی فاشیەت، کە مەشخەڵەکەی بەدەست نەوشیروانەوە بوو. دڵسۆزییو پەرۆشیمان، وا بەرچاوی گرتبومو زهنی تەنیبوم، تەنانەت بیرم لەوەش نەدەکردەوە کە، سکرتێری یەکێتی، بە دەمی خۆیو لە کۆنفرانسی رەسمیی یەکێتیدا، دەڵێ: لەشکرەکەمان لەشکری رزگاری نییە. لەشکری هۆلاکۆیە. لە کۆبونەوەکاندا دەیووت: ئاگری فاشیەت هەڵکراوە.. نەیکوژێنینەوە، هەمومان دەسوتێنێ.

لەئاست ئەو هەموو قسە ترسناکانە، لەبەر دڵسۆزی قیروسیام کردو چومە قەراغ، بەئومێدی ئەوەی رێگەچارەسەرێک بدۆزینەوە. لەگەڵ خۆمدا دەمووت:

قەت باوەڕ ناکەم مام جەلالو نەوشیروان، بیگەیەننە ئەو رادەیـە، بێنەسەرمان. چەندم لەخۆم رادەبینی هەوڵبدەم کێشەکان چارەسەر بکەم.. لە مێژووی هاوبەشو رۆژگاری سەخت بەڕێکردنیشم رادەبینی، تاوانی وا، بەرامبەرمان نەکرێ. لەناخی خومدا، هاوکێشەکەم وا لێکدەدایەوە:

ئێمە مادام لە رووی عەسکەریەوە جیانابینەوە؛ مادام دەچینە قوڵایی هێزەکانی یەکێتی؛ مادام لەگەڵ مامو نەوشیروان دانیشتوینو بەڵێنیان داوە؛ ئەگەر بڕیاری مانەوە بدەین لەناو یەکێتی، قبوڵیانە.. ئەمووت:

ئیتر بۆچی هەڵدەکوتنە سەرمان؟ دڵنیاش بوم بچوکترین بەڵگەیشیان بەدەستەوە نییە، بڕیاری خراپمان لەسەر بدەن. چونکە ئێمە دژی جیابونەوەی عەسکەری بوین. بەڵگەنامەکانیش لەکۆتایی کتێبەکەدا، بڵاودەکەمەوە. کە دەستوخەتی ئەوسای خۆمن دژی جیابونەوە!

بەڵێ.. لەبەرئەوەی نەمانکوژنو بە خائینیش نەمانناسێن. پێمان بە جەرگی جەرگبڕینی خۆماندا ناو ئەو نامەیەمان نوسی. بەڵێ هەر سێکیشمان ئیمزامان کرد. بەڵام ئایا، ئەمە لە ترسنۆکیەوە بوو؟ ئایا لەبەر گیانی خۆمان، خۆمان دایە دەستەوە؟

من نامەوێ باسی مێژووی سەرکردەو سەرداره گیراوەکانی جیهانو کوردستان بکەم، کە لە شەڕدا بە دیلیی گیراوون. ئەمەیان مێژوو هەمووی تۆمار کردووە. ئایا ئەوانە لەترسی گیانی خۆیان، تەسلیم نەبوون. یان بۆ خزمەتی کێشەکە گیانی خۆیان پاراست.

هەموو هاوڕێیانی کۆمەڵە، کە حوکم دران، بەشێوەی جۆراوجۆر، دانیان پیادا نابوو کە کۆمەڵەن. تیاشیاندا بوو، هەموو ئەوانەی ناسیبونی، بەگرتی دان.

ئەوانەی دانیان پیادا نەنابوو کە کۆمەڵەن، ئازاد کران. وەکو: د.جەمیل، موراد، شاخەوان عەباس، حەمەی عەتییە.. عیماد ئەحمەد.. تاد.

بەعس.. فاشی بوو. داگیرکەرو دوژمن بوو. هاوڕێیانی زیندانیش، بەو شێوەیە خۆیان دەرباز کردبوو.. کە کردیان.

بۆ ئێمە.. دۆخەکە.. جیاواز بوو. لە شەڕ لەگەڵ بەعس، ئەوە بوین کە هەبوین. دەیان داستانو سەدان پێشمەرگە شایەتن. ئازا یان ترسنۆک بوین؟ بڕواننە شەهید شاخەوان چۆن لەکاتی دەستڕێژی کۆپتەردا، کە مردن وەکو مۆتەکە لەسەرمان بوو، چۆن باسی شەڕی "هەورێ" دەکات:

"کۆپتەرەکان لەکاتی خولانەوەیاندا ئێمەشیان بینیو، تەقەیان لێکردینو ئێمەش وەڵاممان دانەوە، ئیتر ژمارەی کۆپتەرەکان زیادی کرد، یەکەم جار بوو من رامی کۆپتەر ببینم کە بەرگێکی شینی لەبەردا بوو خەریکی تەقەکردن بوو، ئێمەش بە کلاشینکۆفو برنەوەوە تەقەمان لێ کردنەوە منو نەریمان لە دەوری بەردێکی گەورە تەقەمان بەرامبەر رامییەکە دەکرد، لەتەک ئێمەوەش مەلا بەختیار هاواری کرد (گوللەی فاشیەکان کارمان تێناکا".[1]

شەڕی شێنێ.. کە نوسەرو نەوشیروانو زۆرێک لەوانەی لە پلینیۆمەکەدا، بڕیاری کوشتنیان داوین، خۆیان لە قەرەی شەڕەکە نەدا، محەمەد وەتمان ئاوا باسی گرنگترین شەرگەی کاتی هێرشەکە دەکات:

"قۆڵی بەردەمی شێنێو سەری رەزان کە لە شاخی سونێیە پێشمەرگەکانی هەرێمی ٧ی باڵەک لێی بوون، کاک مەلا بەختیار سەرپەرشتی ئەم بەشەی ئەوێی دەکرد".[2]

هەروەها.. شایەتحاڵێکی تریش، ئاوها رۆڵمان دەگێڕێتەوە:

---

١ شاخەوان عەباس. سەفەری کوردایەتی بیرەوەریەکانی شارو شاخ ١٩٧٤-١٩٨٠. چاپی دووەم. ٢٠١٢. ئەکادیمیای هۆشیاریو پێگەیاندنی کادران. ل(١٠٧).

٢ گۆڤاری چیا. ژمارە (٢) ئایاری ٢٠٠٧.

"كات دەمەو ئێوارە بوو، كاك مەلا بەختیار فەرمانیدا، كە ئێمەش بچینە لای كاك ئەحمەد مەولود.. كە چووین لەسەر حاڵی خۆمان زۆر بەزەییمان بەو پێشمەرگانەش دەهاتەوە.. كە لەگەڵمان بوون، هەڵدەپەڕین لەناو بەفر، شوێنی وشكمان دەدان بوو، لەهەموو لایەكیش بە چەكی قورس‌و سووك گوللەباران بوو، كە كاك مەلا بەختیار باری ئەوانی چاوپێكەوت وتی هەستن بگەڕێنەوە ئەو شەڕە بەو شێوەیە ناكرێت ئا لەوێ باشترین پێشمەرگەی دڵسۆزم بینی، ئەویش شەهید ئەحمەد مەولود بوو وتی: ڕاستە جەنابت ئەندامی سەركردایەتیت، بەڵام فەرماندەی هەرێمی ئێمە كاك زیرۆ ئەحمەد ڕێوییە تاكو ئەو فەرمانم پێ نەكات ناگەڕێمەوە.. ئەگەر هەر هەمووشمان لەسەرماندا ڕەق بینەوە، كاك بەختیار وتی: دەباشە با هێرشێك بكەین.. هەموومان هێرشمان كرد.. دوژمن بەو هەموو توانایەی كە هەیبوو.. شكاو دوو لاشەی سەربازی لەدوای بەجێماو دوو كلاشینكۆفمان دەستكەوتبوو، توانیمان ئەو ڕۆژە مەترسی دوژمن لەخۆمان دووربخەینەوە.. هەموومان هاتینەوە گوندی شێنێ".(1)

مەرگ لە شەڕی دوژمن، شانازییە. بەڵام دۆخی زیندانی ئێمە، لەڕووی دەرونیەوە، سەراپا جیاواز بوو. ناچار بڕیارێكی خراپمان هەڵبژارد.. بەڵام ماین، هەتا ڕاستیەكان چەواشە نەكرێن.

دوای ئازادبونم لە گۆڕی ئازادی یەكێتی، دەستبەجێ پەیوەندیم بە ئاڵای شۆڕشەوە كرد. یەك زەڕەش، حسابم بۆ ئەو پاشگەزبونەوەیە نەكرد كە نوسیمان. ئاڵای شۆڕشمان لە ڕێكخراوێكی پڕ لە كێشەوە، ڕێكخستەوەو كۆبونەوەی فراوانمان بۆ ڕێكخستو كەوتینەوە چالاكی‌و هەڵوێست دەربڕین لەسەر ڕوداوەكان. لە كۆبونەوەیەكی فراوانی ئاڵای شۆڕش، لە (زێوێ)دا، هاوڕێیانی ئاڵای شۆڕش گوتیان: جاری تۆ مەیەرەوە. عیماد ئەحمەدیش بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ كردم، كە نەگەڕێمەوە. بەڵام من سوور بوم لەسەر گەڕانەوە. دەمووت: ئەگەر نەگەمەوە شارەكان، پروپاگەندەم بۆ دەكەن، كە بەڵگەیان لەسەر گرتوم. قبوڵم نەكردو گەڕاینەوەو ئەوەندەی توانیمان ئەركەكانمان جێبەجێ دەكردو..

بەرەو شەڕی كەركوكیش بە (٥٠) پێشمەرگەوە چوین. لە چەمچەماڵ، دوچاری

---

١ ڕێباز. قەندیل بەغدای هەژاند. بەشی یەكەم‌و دووەم. سلێمانی- ٢٠٠٨. چاپی دووەم. لە زنجیرە بڵاوكراوەكانی بنكەی ڕۆشنبیری شەهید. ژمارە(٢٠). ل(١٤٣-١٤٤).

هێزە شکاوەکان بوین. هەزاران پێشمەرگە.. قەڵەمی ئەژنۆیان شکابوو.. بە تالانیەوە هەڵدەهاتن(*) تالانی کەرکوک.. قودس‌و دڵی کوردستان!!

هاتمەوەو کەوتیشینە چالاکی. کاریگەری سیاسی‌و فکریشمان لە ماوەیەکی کورتدا دەرکەوت. یەکێتی، کە کەوتنەوە رووبەڕووبونەوەی دۆخی نەخوازراوی شەڕ، لەلایەن کۆسرەت رەسوڵەوە، پەیوەندیم پێوە کرا، بۆ یەککگرتنەوە. مەکتەبی سیاسی یەکێتیش لەو کۆبونەوەدا باسیان کردبوو. بە گرنگیەوە ئامادە بون، لەگەڵ ئەو ئالای شۆڕشەدا یەکبگرنەوە کە بەحسابی پلینیۆمەکەی کۆمەڵە، لە رووی سیاسیەوە، کۆتاییان پێ هێنابوین. بەڵام بینیبویان، لە کۆڕەکانی: شەقڵاوە، هەولێر، سلێمانی، راپەڕین، هەڵەبجە، کەلار..تاد، هەزاران کەس ئامادە دەبون‌و بۆچونە سەنگین‌و کاریگەرەکانیشیان دەبیستین. لەناو چەپەکاندا، کاریگەرترین رێکخراو بوین. هیچ رێکخراوێکی تری چەپ، چارەکی ئەو خەڵکەی پێ کۆنەدەکرایەوە، کە ئالای شۆڕش لە کۆڕەکاندا کۆیدەکردنەوە.(+) یەکەمین کۆڕم بەناوی (دیموکراسی دوای جەنگی سارد) پێشکەش کرد. پێشوازییەکی بێوێنەی لێکرا. وێنەو ڤیدیۆکەی ماوە!

ئامادەبونی هەزاران کەس لە کۆڕەکانمانداو ئەو دیالۆگە ئازادو مەدەنیەی دەکران، رەتکردنەوەی خەڵک بوو، بۆ ئەو غەدرە گەورەیەی بەرامبەرمان کرا. بەهۆی ئێمەشەوە، بە لۆژیکی سیاسی‌و ئەرکەکانی سەرخستنی ئەزمونێکی تازە بونیات نراوی دیموکراسی:

١- کۆڕی ئازادو کراوە، یەکەمین جار کرا.

٢- دیبەیتی ئازادو کراوە، یەکەمین جار کرا.

٣- شکستهێنانی بەرەی کوردستانیمان، لە نامیلکەیەکدا، یەکەمین جار باسکردو داوای هەڵبژاردنمان کرد. بەناوی (حوکمی بەرەی کوردستانی یان دیموکراسی؟).

---

* ملازم عومەرم بینی. هێزەکە شکابون. وتی: هیچ فەرماندەیەک ئامادە نییە لە بازیانیش هێڵی بەرگری دابنێ. تۆ ئامادەی هێزەکان بخەینە بەردەستت. وتم: بروسکە بکەن، مام جەلال‌و کاک مەسعود رازی بن، دەیکەم. بروسکەی کرد. وەڵام هاتەوە کە رازین. وتم: دەچم ئەمشەو دەیانبینم‌و سبەینێ دێمەوە بازیان. لە گەڕانەوەدا، سەیرێکی دەربەندی بازیانم کرد. رائید دارای لێبوو. وتم: ئەمشەو دێم‌و شەڕگەکە وەردەگرم. بەخۆشحالیەوە وەریگرت. چوم بۆ مەسیف، مام‌و مەسعود ببینم. لای دوکان مام گەیشت. گەڕامەوە. شەو هەمووی هەرەسی هێنا! کۆڕەو دەستیپێکرد! ناچار، ئێمەش بەرەو سنور رۆیشتین!!

+ لە کۆڕی سلێمانیدا.. هۆڵی رۆشنبیری‌و دەرەوەش جمەی دەهات. خالید دلێر هاتەلام.. وتی: ئەمە هێزی چەپە، بە ئێوە دەکرێ سەرکردایەتی بکەن. هەوڵێکی زۆریشمان دا، چەپمان پێ یەک نەدەخرا!! کۆڕەکە، لەلایەن هاوڕێیان (نەخشین‌و هاوڕێ محەمەد کەریم)ەوە بەڕێوەدەبرا.

٤- داواشمان نەکرد بچینە ناو بەرەی کوردستانیو نەبوینە بەشێک، لە تاوانییو تالانیی لەکوردستاندا.

٥- لە هەڵبژاردنیشدا.. بە کۆنەقین هەڵوێستمان وەرنەگرتو پشتیوانیی ئەو رادە دیموکراسیەمان کرد، کە لە دەڤەری سەوزدا، هەبوو. بەمەش، لەپێناوی خزمەتکردن بە دیموکراسی پێمان نا بە جەرگی ئازاردراومان!

کە یەکیشمان گرتەوە لەگەڵ یەکێتیدا، لە ئاهەنگی یەکگرتنەوەکەدا، ناو یاریگای سلێمانیو دەرەوەش، بۆ پیشوازی لێکردنی جێگە نەما. دۆستو دوژمن تێگەیشتن کە مێژووی خەباتو فیداکاریمان، بە پلینیۆمی کۆمەڵە نەسڕاوەتەوە![*]

کە لە گفتوگۆشدا لەگەڵ یەکێتیدا، وەکو ئالای شۆڕشو مەکتەبی سیاسی یەکێتی (بەندەو عیماد.. بەس) کۆدەبوینەوە. سەرەنجام، بە بەیاننامەی هاوبەش، راگەیاندنەکەمان راگەیاندو لە رۆژنامەی کوردستانی نوێدا، بڵاوکرایەوە.[+] ئەوانەی لە پلینیۆمەکەشدا، بڕیاری کوشتنیان داین، چەند کەسێکیان نەبێ، پێیان ناخۆشبوو.. بەڵام دیسان لەترسی پلەوپایەیان، تەنها خۆیان دەخواردەوە!

لە دووەمین کۆنگرەی یەکێتیشدا، دوای یەکگرتنەوەکە، نوسەر خۆی هەڵبژارد دەرنەچوو. ئەو جەنەراڵەی هاتیشە سەرمان، بە تەسکیە دەرچێندرا. بەندە، بە هەڵبژاردنو لە قۆناغی یەکەمی تەتەڵەکردنی دەنگەکانیشدا، لە نیوە زیاتر دەنگمان هێنا.[**] لە سێهەمین کۆنگرەشدا، ئەوانەی پێشمان دەکەوتن، دووسەد دەنگیان بۆ تەزویر کرا. بەندە پێنجەمین دەنگم بە حەلاڵی هێنا. سەرەڕای ئەوەی تەکەتولەکان نەشیاندەویست دەربچین!

---

* ئەو کۆبونەوە فراوانە بە پێشنیازی من کرا. هاوڕێیانی خۆم، دەیانزانی پێشوازیەکە، گەرم دەبێ، بە مام جەلالیان وتبوو.. تەنها جۆت وتار پێشکەش بکە. بەڵام کە هاتینە بەردەم خەڵکەکە، خەڵک بە جۆشو خرۆشیان وەڵامیان دانەوە!

+ بڕوانە: رۆژنامەی کوردستانی نوێ. «ژمارە (٤٤٤)- ١٩٩٣/٧/٢٥ یەک شەممە». بەیاننامەی یەکگرتنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان-زەحمەتکێشان- پەیڕەو یەکگرتن.

** مام جەلال، ئازاد جوندیانیو جوتیار نوری، لەناو کۆنگرە ناردە لام. رایسپاردبوو، ئەگەر لە قۆناغی یەکەمی تەتەڵەکردنی دەنگەکان، لە نیوە زیاترم نەهێنا، بۆ قۆناغی دووەم، خۆم هەڵبژێرمەوە. وەڵامم دایەوە. لەقۆناغی یەکەمدا دڵنیام دەردەچم. ئەگەر دەرنەچووم، بڕیاری کۆنگرەم قبوڵەو خۆم هەڵنابژێرمەوە. رێک وا بوو. لە نیوە زیاتری دەنگەکانم هێنا. ئەوانەی مام جەلال، لە ئالای شۆڕشو هی تریش، چاوەڕوانی دەکرد، دەنگی زۆرتر بهێنن، نیوەی دەنگەکانیشیان نەهێنا.

## ( ١٢ )
# هەڵەکان، شکستەکان، ئەنجامەکان

هەڵەی بنچینەیی، لە مێژووی هەموو هێزێکی سیاسیدا، بە سەرکەوتنی عەسکەری، یان بە سەرکوتکردنی ئـازادی بیرورا، بەشێوەیەکی کاتیی، دەچێتە سـەر. بـەڵام لە دوا سەرەنجامدا، ئەو هەڵە بنچینەییانە، لە شادەمارەکانی سیاسیو رێکخراوەییدا، ڤایرۆسەکانی دەمێننەوەو قۆناغ بە قۆناغی سیاسیش، کاریگەرتر دەبن. لەشاخدا، ئەو هەڵانە دادەپۆشرێن. بەڵام لە شارو لەناو پرۆسەی دیموکراسیدا زیانی خراپ دەگەیەنن. بەتایبەتی لەم سەردەمەی سۆسیال-میدیادا.

یەکێتی.. بۆ ساڵەهای دوای خیانەتنامەی جەزائیرو هەرەسی شۆڕشی ئەیلول، کالا بەقەد باڵای دۆخەکە بوو. کۆمەڵەش، داینەمۆی یەکێتی بوو. بەمەش، بۆ دۆخی تایبەتی دوای هەرەس، یەکێتی بە تایبەتمەندیەکانی خۆیەوە، لەناو خۆیدا، بۆ باڵەکانی پەیوەندیەکی ئۆرگانیکی هێنایە گۆڕی خەبات. ئەم پەیوەندییە ئۆرگانیکییە، لە خراپترین دۆخی سیاسیو لەوپەڕی نەبونییدا، کاریگەری بەرچاوی لەناو خەڵکو کوردایەتیدا هەبوو. نەک تەنها بەرگەی هێرشەکانی رژێمی گرت، بەڵکو لە زیندانەکانیشدا، نمونەی رێکخراوی خۆڕاگری قۆناغەکە بوو. کارەساتی هەکاریشی تێپەڕاند.

هەتا روخاندنی رژێمی شای ئێران، یەکێتی دژی رژێمو لە کارەساتی هەکاریشدا، تایبەتمەندیتی خۆیو سەنگی رێکخراوەیی پاراست. بەڵام لەدوای روخاندنی شاوە، دۆخێکی سیاسی نوێ هاتەپێشەوە، یەکێتی لەناو خۆیدا، کێشەکانی قووڵتر بونو لەدەرەوەی خۆیشیدا، نەیارەکانی کاریگەرتر دژی وەستان. بەرە بەرە، لە ساڵی ١٩٧٩وە، رێڕەوی یەکێتیو کۆمەڵە، ئەو پەیوەندییە ئۆرگانیکیەی سەرەتای دامەزراندنی، وەکو پێکهاتەیەکی نیمچە بەرەی سیاسی، لەدەست دەدا. لەناو خۆیدا، لەبری هەنگاوهەڵگرتنی زیاتر بۆ گەشەپێدانی یەکێتی، لە نیمچە بـەرەوە، بەرەو بەرەی راستەقینە، لە چارەسەرکردنی ئەقڵانی ناکۆکیەکاندا، لەگەڵ پارتیو سۆسیالیستو پاسۆک، گەیشتە بنبەست. حیزبی شیوعیش متمانەیان بە یەکێتی، لاوازتر بوو. ئەم دۆخە، باڵەکانی ناو یەکێتی، لە کرانەوەوە گۆڕی بۆ گرژیی ناوخۆیی. بۆ هەستیاریی بەرامبەر بیری جیاواز! لەدوا سەرەنجامیشدا بۆ سەرکوتکردن!!

کێشەی گەورەی یەکێتی، ئەوە بووە، هەمیشە لەدەرەوەی چوارچێوەی خۆیدا، نەیارەکان، یان ئۆپۆزسیۆنی دەخستە دەرەوەی بازنەی نیشتمانی-دیموکراسیەوە. بۆیە، بەردەوام تفەنگەکانی دژی نەیارەکانی گەرمو گەرمتر دەکران.

بەردەوام، ئۆپۆزسیۆنی یەکێتی، لەسەر کەلی شەیتان دادەنرانو کارگەی تۆمەت هەڵبەستن دوا جۆری تۆمەتو جنێوی سیاسی بۆ هەڵدەبەستن. بۆیە هەموو کاتێک هێزی یەکێتی ئاسان بوو سەنگەر لە نەیارەکانی یەکێتی بگرێ. لەناو پەروەردەیەکی سیاسی-ئایدیۆلۆژی وادا، بێگومان، نەیار نەفرەتلێکراوە. کوشتنیشیان حەڵاڵ دەکرا. ئیتر سیاسەتی یەکێتی، بەردەوام دژی نەیارەکانی شەڕەنگێزانە بوو. بۆیە ئاسانترین بڕیار بۆ یەکێتی، ئەوە بووە بڕیاری شەڕ دژی هەر لایەک ویستبێتی، بدات. ئەم چەشنە رۆحی شەڕەنگێزیە، رەنگدانەوەی رۆحیەتە قووڵە دەستکارینەکراوەکەی شەڕەنگێزی، تا رادەی دڕندایەتی، ناخی چەپێنراوی لەمێژینەی کوردەواریە. ناخی کوردەواری، جۆشەنی زەبروزەنگی دەستکارینەکراوی سەدەکانی ناوەڕاستە. بە رواڵەت، قۆناغی وا هەیە، ئایدیۆلۆژیەتی خوازراو، یان لافلێدانی دیموکراسی، یان پەیمانی نوێگەری، ئەو ناخە چەپێندراوە، دادەپۆشێ. بەڵام رووداوێکی بەسە، رواڵەتە داپۆشراوەکە هەڵبداتەوەو ناخە داپۆشراوەکەی زەبروزەنگ، دڕندە دڕندە، بێتەوە کایەی ململانێکان.. سەرکردایەتیو کادرەکانی کۆمەڵە، دوای هەژمونگەری سێهەمین کۆنگرەی نەوشیروان، نوێنەرەوەی سەرهەڵدانەوەی ئەو ناخە چەپێنراوە بوون، کە بە بەرنامە، بە هێزی عەسکەری، بە توانای راگەیاندن، بە دەستەمۆکردنی پلەو پۆست، بە داهۆڵکردنی کادرە هەلپەرستەکان، توانییان، دوا وزەی بیری جیاواز، لەناو کورەی پلینیۆمدا، بسوتێنن.

دوو ئاراستەی ناکۆک، بە رەگو ریشەی ناکۆکیەکانی سەردەمی شۆڕشی ئەیلولەوە، کەوتنە بەرامبەر؛ کەمترین بیر لە چارەسەری سیاسی دەکرایەوە، زۆرتر سیاسەتی پاکتاوی عەسکەری زاڵبوو.

ئەم دوو ئاراستەیە.. یەکێتی بەتەنها. لەبەرامبەردا پارتی-سۆسیالیست-پاسۆک، پێکەوە. وا کەوتنەوە کە:

یەکێتی دەیویست، بە مۆدێلی نوێ خۆی بنوێنێو کاژی قۆناغی جەلالی لەخۆی دابماڵێ. کۆتاییهێنان بە شۆڕشی ئەیلولیش بکاتە پلاتفۆرمی سیاسەتی قۆناغەکە، هەتا زۆرترین لایەن، لە بەرەی خۆیدا کۆبکاتەوە.

پارتیش.. کێشەی شکستی جەلالیەکانی لەپاڵ حکومەت زەق دەکردەوەو بەهۆی ئەو دۆخەی شەڕی ناوخۆوە، سەرباری هەڵەکانی یەکێتی، لایەنەکانی سۆسیالیستو پاسوکی لەخۆی نزیک دەخستەوە؛ شیوعیەکانیشی کەمەندکێش کردە لای خۆیان. بەمەش کاریگەری سیاسەتی جەلالیەکان، زیانی زیاتر بوو لە کاریگەری شکستی شۆڕشی ئەیلول!

لەم ململانێیەدا، یەکێتی نەیتوانی، هەرەسپێهێنانی شۆڕشی ئەیلول بکاتە قۆناغی وەرچەرخان بۆ شکستپێهێنانی پارتی، وەکو هێزێکی سەرەکی.

پارتیش نەیتوانی، بە تۆمەتی جەلالیەت، یەکێتی تێکبشکێنێ. بەڵام توانی، بەرەی لایەنە سیاسیەکان لەدەوری پارتی بەهێز بکات. د.مەحمود و لیژنە ئامادەکاریەکەشی چوونەپاڵیان!

سەرەنجام، یەکێتی تەنها باڵەکانی ناو یەکێتی بۆ مایەوە. ئەمەش مام جەلالو نەوشیروانی تەواو دڕدۆنگ کرد. بەهەموو نرخێک هەوڵیان دەدا، یەکێتی لەناو خۆیدا، هەتا رادەی تاساندنی ئازادی لەناو یەکێتیدا، بپارێزن. ئازادی ئەدەبو شیعرم مەبەست نییە! ئازادی ئایدیۆلۆژیو سەربەخۆیی بیرکردنەوە دەڵێم!!

ئەم کێشەگەلە سیاسی-سایکۆلۆژییە هەستیارانەی کە رەگوریشەیان بۆ ناوەڕاستی شەستەکان شۆڕدەبوەوە، بە شەڕی عەسکەریو ساردی سیاسی، هەتا کیمیابارانو ئەنفالەکان، بەردەوام بوو. بەمەش دەرکەوت، ناکۆکیە خۆییەکان، هەتا هەڵکەوتنی دۆخی بابەتیی سەروبەندی ئەنفال، کە مەترسی لەناوچونی هەموو لایەنەکانی خوڵقاند، تا ئەوکاتە بە سەرکردایەتی سیاسی کوردستان، کێشە ناوخۆییەکانی هێزە ناوخۆییەکان چارەسەر نەکران. بەڵام کە کیمیابارانو ئەنفال، هاوکات ترسی راگیرانی جەنگی عێراق-ئێران، هاتەپێشەوە، ئەو حەلە، لەسەر داروپەردووی کارەساتەکان، بیر لە چارەسەری سیاسی کرایەوە. واتا: شەقی زەمانە یەکیخستن، نەک هۆشی نەتەوەیی باڵا رێکیخستبن!!

پەیوەند بە دۆخی ناوخۆی یەکێتی، ئەو گرژییەی باسمان کرد، کە لەناویا دروست بوو، نائومێدییەکی زۆری لەناو یەکێتیدا، کە یەکێتی بکرێتە بەرەی فراوان، دروست کرد. بەڵکو یەکێتی دەستبەرداری ئەوەش بوو، بکرێتە بەرەی کوردستانی. بۆیە، وەکو یەکێتی، چونە ناو بەرەی کوردستانی.(*) بە چونە ناو بەرەی کوردستانی، فەلسەفەی سیاسی یەکێتی، کە لەسەرەتاوە لەپێناویا دامەزرا، ئەویش پەرەپێدانێتی بەرەو بەرەی فراوان، کۆتایی هات. هاوکات دروستکردنی لەشکری شۆڕشگێڕیش تەواو بوو. ئەو ئامانجەش

* ئەوکاتە ئالای شۆرش لەدەرەوەی پرۆسەکە بوو!

که کۆمەڵە بکرێتە حیزبی پێشڕەو، لە سێهەمین کۆنفرانسدا، هەناسەی لێبڕا. تەنها هێندەی مابوو، کۆمەڵە بنێژرێ!

ئەو هەموو پاشەکشەیە، هەتا رادەی شکستی فەلسەفەی دامەزراندنی یەکێتی لە بەدیهێنانی ئاواتەکانی، هێدی هێدی، متمانەی خەڵکی وەکو سەرەتاکانی دامەزراندنی یەکێتیو بەرپابونی شۆڕش، کەمدەکردەوە. پەیوەندییە ئۆرگانیکیەکەی باڵەکانی یەکێتیش، کاریگەری نەما. هەتا گەیاندیانە هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەو ناشتنی لەسەر سنوری دوو بەشی کوردستان.. ئیتر مەسەلەی کورد لە یەک مەسەلەوە، کرایەوە چوار مەسەلە!! چونە سەر پەندەکەی پێشینان: کورد بە بادانەوە ماوە!!

## (١٣)
## راپەڕین.. هەڵەی پتر !

راپەڕین.. دۆخی وەرچەرخانی کوردستان بوو، لە خەباتی شاخەوە بۆ شارو شارستانی. یەکەمین روداوی سیاسیشە (٢٩) ساڵە بەردەوامە. تاڕادەیەک، بۆ ماوەیەک هێز خراوەتە خزمەت دەسەڵاتی سیاسی. نەک دەسەڵاتی سیاسی، بخرێتە خزمەت هێزی چەکدار. وەکو هەمیشە لە شاخدا، بەتایبەتی لەدوای ١٩٦٤وە، وای لێکراوە.

ئەم هەلە، بە قووڵکردنی رێساکانی حوکمڕانی مەدەنی، بەرە بەرە، رەنگبوو، دۆخی ئاڵۆزی ناو یەکێتی، ئارام بکاتەوە. بەتایبەتی ئەگەر یەکێتی، جیاکاری لە دەسەڵاتی یاساڕێژیو تەنفیزیو دادوەریدا کردبا! بەرپرسەکانی خستەبایەتە ناو پەرلەمانو حکومەتیشی بۆ کارزان تەرخان کردبا. سەپاندنی دەسەڵاتی حیزبی بەسەر هەر سێ دەسەڵاتە تەشریعیو تەنفیزیو دادوەری، مەترسیدارترین هەڵە بوو، کە یەکێتیو پارتی، ئەنجامیاندا!!

هەلێکی گەورە بوو، یەکێتی بتوانێ هەڵە سیاسیەکانی شاخ لە شاردا، بە داڕشتنی بەرنامەیەکی سیاسی-مەدەنی-دادپەروەری، بگۆڕێ. بەو ئومێدەش ئاڵای شۆڕش، شوراکان، دەیان نوسەرو تێکۆشەر، لەدەوری یەکێتی کۆبونەوە. بەڵام رۆژگاری سیاسی دەریانخست، کە نەمانی کۆمەڵەو کۆتاییهاتنی خەونەکانی یەکێتی، کە ببێتە بەرەیەکی سیاسی فراوان، کێشەی ستراکچەری بۆ یەکێتی قووڵکردەوە، (لە هەمانکاتدا،

بەهێزبونی پارتیو پاوانکردنی هەولێر-بادینان) خراپ بەڕیوەبردنی دەسەلاتو خۆرکەی دەستەگەری لەناو یەکێتیدا، درێژەدانی هەمان هەڵە بنچینەییەکانی شاخی یەکێتی بوو، کە ماوەیەک بە سەرکەوتنی عەسکەریو سەرکوتکردنی ئازادیەکانی سنوری دەسەلاتی یەکێتی، داپۆشرابوو. بەلام، ئەم جۆرە داپۆشینەی هەڵە بنچینەییەکانو سەرکەوتنە عەسکەریەکان کاتییە. لەبنەوە، زیانی هەڵە بنچینەییەکان، وەکو ماکی برینێکی قوولْ، کاریگەرییەکانی هەر تەشەنە دەسەنن. هەتا دوا زیانی خۆیان دەگەیەنن!!

مانەوەی هەڵە بنچینەییەکانی شاخو لەدەستدانی هەلی سیاسی-شار، بۆ پیاچونەوە بە هەڵەکانو دارشتنی سیاسەتێکی دیموکراسی-مەدەنی-دادپەروەر لە شاردا، هەڵەی کۆنو نوێی لەسەریەک کەڵەکە کردو پەنگیان خواردەوە. لە یەکەمین کۆنگرەی یەکێتی دوای راپەڕین، روەو خەباتی یاساییو مەدەنی، ناکۆکیو هەڵە بنچینەییەکانی شاخو شار، خەریکبوو لە سالی یەکەمی راپەڕیندا بتەقێنەوەو یەکێتی لەبەریەک هەڵوەشێتەوە! بەلام بە سازانی کاتیی تەکەتولەکان لەناو خۆیاندا، دەرگا کرایەوە بۆ هەڵبژاردنی نوێنەرانی تەکەتولو جەمسەرەکانی ناکۆکیەکانی ناو یەکێتی. بەلام ئەم سازانەی تەکەتولەکان بەشێوەیەکی کاتیی، تەنها کێشەکانی ناو یەکێتی سڕ کرد. بناغەشی دانا، گیانی دەستەگەریو پێشێلکردنی دیسپلینو پرەنسیپەکان، خراپتر لە دۆخی جیابونەوەی سۆسیالیستو ئالای شۆڕش، سەرهەڵبدات. بە قووڵبونی کێشە ناوخۆییەکانی یەکێتی، چارەیەک لەبەردەم مام جەلال-نەوشیروان نەما، هەردوکیان جلەویان بۆ تەکەتولەکان شل کرد. لەمەشەوە نەوشیروان بە پەرێزەوە چووە سەر کەلی جیابونەوە، هەتا هەلی جیابونەوەی بۆ هەڵکەوت. هەوڵیشیان دا کێشەکانی ناو یەکێتی، ماوەیەک هەڵپەسێرن، لەبەر هەڵبژاردنو پێکەوەنانی حکومەتو پەرلەمان، بەلام ئەمەش چارەسەری کێشەکانی ناو یەکێتی نەکرد. تا گەیشتنە ئەو رادەیە، تەنانەت لە یەک هەڵبژاردنیشدا، یەکێتی لە کوردستاندا، بەسەر پارتیدا سەرنەکەوت، لەسەر بنچینەی هەڵەکانی شاخ، هەڵەی جۆراوجۆریش لەشاردا هەڵچنران:

- مانەوەی سیستەمی حوکمڕانی دواکەوتوو.
- مشەخۆریو بیرۆکراسیەت.
- فرە لەشکرییو بەخێوکردنی بازرگانی شەڕ.
- سزانەدانی گەندەڵکارانو بەرزکردنەوەی پلەکانیان.

- دانەنانی کەسانی شایستە لەشوێنی شایستە.

- بنبڕنەکردنی دەستەگەریو سازدانی کۆنگرەی بە سازانی تەکەتولەکان.

- ڕێگەدان بە هێزی چەکداری تایبەتو بەکارهێنانی فشاری عەسکەری، بۆ دەستکەوتی دەستەگەری حیزبیو حوکمڕانیو پەرلەمان!

- تالانکردنی موڵکی گشتیو تاپۆکردنی دەیان هەزار دۆنم زەوی، بە ناڕەوا لەسەر بەرپرسەکان.

- زاڵکردنی گیانی هۆزایەتی بەسەر ئەرکی مەدەنی.

- ڕێ دان بە توندوتیژی دژی ژنانو پەراوێزخستنی ژنان.

- بێبایەخ کردنی پێگەی کرێکارانو ڕەنجدەران.

- خزمەت نەکردنی کەمئەندامانو دانەڕشتنی بەرنامەی بوژانەوەی گوزەرانیان.

- لاوازی خوێندنی هاوچەرخو پاشکۆیی زانکۆکان بۆ دەسەلاتی حیزبیو حوکمڕانی!

- پەرە پێنەدانی ژێرخانی ئابوریو پەراوێزخستنی ئابوری کشتوکاڵ.

- نەگۆڕینی سیستەمی حوکمڕانیو نەنوسینی دەستوری هەمیشەیی.

ئەو ئەرکانە، ئەرکە دیموکراسیەکانی پارتە سۆسیال-دیموکراتەکانن. مەخابن، یەکێتی لە بەدیهێنانیان، ستراتیژێکی جیاوازی لە ستراتیژی لایەنەکانی تر، نەبوو. بەڵکو لە هەندێ ڕووەوە لە لایەنەکانی تریش دواکەوت!

ئێستا لە (٣٠) ساڵی دوای ڕاپەڕین نزیک دەکەوینەوە. گەیشتینە سەردەمی سۆسیال-میدیا. یەکێتی لەناو بازنەیەکی داخراودا، لە سێ دەهەی ڕابوردودا، نەهێنرایە دەرەوە. ئەمە بەڵگەی ئەوەیە، یەکێتی کەوتۆتە خۆخواردنەوە. لەبری پێگەی نەیار خواردن. دوا کۆنگرە، جگە لە باسکردنی پلەو پۆست، نە ڕاپۆرتی سیاسی هەڵسەنگێندراو، نە بە یەک ڕستەش قسە لە بەرنامەی یەکێتی کرا. ئەوەی لەهەموو کۆنگرەکان یەکێتیدا ڕووی نەدا، لەچوارەمین کۆنگرەدا ڕوویدا. ئەویش ئەوەیە کە لەسەر ڕێژەی دوا هەڵبژاردنی پەرلەمانی عیراق، ڕێژەی ئەندامانی کۆنگرە دیاریکران و سەرکردایەتی یەکێتیش بۆ مەڵبەندەکان هەڵبژێردران. کە ئەمە لەپارتە هەرە لیبراڵەکانی دونیادا ڕووی نەداوە. لەوەش سەیرتر، لیستی دەنگدان ئامادەکرابوو، مەرج دانرابوو کە ئەندامانی کۆنگرە دەبێ (٥٠+١) دەنگ بدەن. واتا ناکرێ هیچ ئەندامێکی کۆنگرە بە لەنیوەی کەمتری کاندیدەکان، هەڵبژێرێت. لەمەشدا، ڕێسایەکی سەرسوڕهێنەر دانرابوو، ئەندامانی کۆنگرە، ناچارکرابوون، مەڵبەند مەڵبەند، دەنگ بەکاندیدەکان بدەن. لەوەشدا ئەندامانی کۆنگرە، ئازادی لێ زەوتکراو ناچارکراوە،

دەنگ بەنیوەی ئەو کاندیدانە بدات کە لە لیستی مەڵبەندەکاندا خۆیان کاندید کردبوو. واتا ئەندامانی کۆنگرە، بیەوێ و نەیەوێ، دەبێ دەنگ بەنیوەی کاندیدەکان و مەڵبەندەکان بدات. بەمەش سەرپشکی بۆ هەڵبژاردنی کاندید زەوتکرابوو. بەپێی ئەم ڕێسایەبێ دەبوایە هەر کاندیدێک نیوەی کەمتری دەنگی کۆنگرە بهێنێ، دەرنەچێ. کەچی کەمترین ئەندامی سەرکردایەتی نیوەی دەنگەکانی کۆنگرەیان هێناو کراشنە ئەندامی سەرکردایەتی!!

چالاکی هەموو لایەنێکی سیاسی، لەناو گۆڕانکاریەکاندا، لەبەر ڕۆشنایی بەرنامەی گۆڕدراوی حیزبەکان دەکرێ. بەرنامەی حیزبێکیش، لەناو ئەم هەموو گۆڕانکاریانەی جیهان، ئیقلیم، چینەکان، زهنیەتی ڕای گشتی، سۆسیال-میدیاو گۆڕانکاریە کۆمەلایەتیەکاندا نەگۆڕدرێ، مەحاڵە هیچ حیزبێک بتوانێ، باشتر لە ڕابوردوو، کاریگەری لەسەر ڕای گشتی دابنێ.

شانازیەکانی ڕابوردوو، هەر دوو-سێ ساڵێک بڕ دەکات! سەرەنجام گۆڕانکاری هەمەلایەنە بەردەوامە. یەکێتیش،بەرنامەکەی، پێکهاتەکەی، دینامیکیەتەکەی، لە ئاستی سەردەمە نوێکە نەگۆڕدرا. بەڵکو کێشەکانی بەسەریدا زاڵن! ساڵەهایە لەناو خۆیدا، خۆی دەکرۆژێ!

یەکێتی، بەهۆی هەڵە بنچینەییەکانی شاخو شار، لەناو بازنە داخراوەکەیدا، قەتیس مایەوە. بۆیە ساڵەهایە، هێندەی ڕەخنە لەسەر یەکێتی هەیە، زۆر کەمتر ستایش دەکرێ. ئەم دۆخەی یەکێتی تێکەوتووە، بە پروپاگەندە، میدیا، سایتی ساختەو قەبەکردنی کێشە سیاسیەکانی نەیارانی، دەربازی نابێ. بەڵکو زیانی زۆرتر دەکات.. خەریکە مایەی شانازییەکانی شاخیش لەدەستدەدات!! ئەگەر، یەکێتیی فریای چارەسەرکردنی هەڵە بنچینەییەکانی لە: هزر، فەلسەفە، پێکهاتە، بەرنامەی گۆڕانکاریو داپەروەری کۆمەلایەتی نەکەوێ، بەخێراییەکی پێوانەیی، دۆخی لەناوخۆیداو لەناو جەماوەرداو لەناوچەکەشدا، خراپتر دادەتەپێ! ئەگەر دوچاری ڕوداوی نەخوازراویش نەبێتەوە!!

حیزب لەسەر بنچینەی چاک کردنی هەڵە بنچینەییەکانی کۆنو نوێ، دەگۆڕدرێو پێشدەکەوێ. نەک بە قووڵکردنی کێشەی لاوەکیو گەوجاندنی سیاسی. گۆڕانکاری لەسەردەمێکی وەکو ئێستای جیهانگیری، لە گەوهەردا دەبێ بێتەدی. نەک لە ڕواڵەتدا. گەوهەریش، بەرنامەی حیزبو کاریگەرییە لە گۆڕانکاری کۆمەلایەتیو پرۆسەی سیاسیدا.

ئەگەر لە شاخدا، گەوجاندنی خەڵک، لەسەرکوتکردنی ئازادیدا ساڵەهای خایاندبێ، لە شاردا گومڕاییو گەوجاندن، مانگێکیش بڕ ناکات. ڕەوتی ڕەخنەگری بەهەڵوێستی ناو یەکێتی، باجی شاخو شارمان داوە. بەڵام هەڵوێستمان نەدۆڕاندووە. یەکێتی وریای چارەنوسی خۆی نەبێ، بواری پینەوپەڕۆی کەمی لەبەردەمدا ماوە. چۆن لە شاخدا، شانازیکردن بە شکاندنی بیروڕای ئازاد، یەکێتی لە مەیدانەکەدا تەریک هێشتەوەو لەناو خۆیشیدا، فەلسەفەی سەرەتاکانی دامەزراندنی لەدەست دا؛ لە شاریشدا، کە فەلسەفەی حوکمڕانی دیموکراسی-دادپەروەر لەدەست بدات، مەترسیدارە. گەلێ مەترسیداریشە! چونکە میللەت لەدەست دەدا!!!

لە سەردەمی مام جەلالدا، خۆی سەرۆکی عیراق و سەرۆک وەزیرانی کوردستانیشمان هەبوو (د. بەرهەم) بە حوکمی چارەسەرنەکردنی کێشە ناوخۆییەکانی نەبوونی حوکمڕانی دادپـەروەر، یەکێتی نیوەی دەنگەکانی لەدەست دا. لـەدوای مام جەلال، ئەگەر لەسەر سیاسەتی نەگونجاو لەگەڵ گیانی سەردەمەکە، یەکێتی بەردەوام بێ، هەڵدەدێرێ.

لە سەردەمی کۆرۆنادا، خەریکە، هەموو ئەو سیاسەتانەی لەسەر بنەمای سەرکەوتنی عەسکەریو داگیرکاریو نادادپەروەری، بەدی هێنراون، ئەوەتا، کۆی ئەو سیاسەتانە بۆ دەوڵەتە گەورەکان هەرەس دێنن. ڕاسیزم پاشەکشە دەکات، پۆپۆلیزم، لاواز دەبێ، چەپی دیموکراسی گەشە دەکات، چەپیش، نەک حوکمڕانی ڕاستڕەوی ئێستای قبوڵ نییە.. بەڵکو پەیکەرە مێژووییەکانی هێمای سەرکەوتنی ناسیونالیستی ڕۆژئاواییش، لە گۆڕەپانەکاندا، خەریکە وردو خاش دەکەن.

ئەمە حوکمی مـێژووە، کە دادگـای مێژوویی سـەرلـەنوێ دادەنێـتـەوە؛ سـەری سەرکەوتووەکانی کۆلۆنیالیزم شـۆڕ دەکـاتو دەروازەی خەباتی نوێی سیاسیو ئایدیۆلۆژیش، بۆ نەوەی ئێستاو ئایندە.. دەخاتە سەر پشت! بۆیە یەکێتی، کە لەقوناغی دوای ڕاپەڕینیشدا، بەرە بەرە لاواز دەبێ، لەم قۆناغەی پۆست کۆرۆناش، بەقووڵی بەخۆیدا نەچێتەوەو هەڵە بنچینەییەکانی پێکهاتەو سیاسەت و کردەوە زیانبەخشەکانی ڕاست نەکاتەوە، بێگومان زۆر خێراتر لەساڵانی ڕابردوو، پاشەکشە دەکات. بەدووری نازانم دۆخی یەکێتی بەم چەشنەی ئێستای بەردەوام بێ، بگاتە دۆخێک نائومێدی سیاسی بەسەر ئەندامان و دەنگدەرانیدا زاڵ بێ! ئەمەش مەترسیدارترین دۆخی سیاسییە!!

لەو دۆخە سیاسی-حیزبیەدا، با کەمێک بچینە دەرەوەی یەکێتیو ئەڵتەرناتیفەکانیش، شەنوکەوێک بکەین!

( ١٤ )

## گۆڕان؛ باری نەڕەخساوی بابەتیی

بزوتنەوەی سۆسیالیستو ئاڵای شۆڕش لەناو یەکێتی، زەحمەتکێشان لەناو حیزبی سۆسیالیستدا، لە کۆڕی خەباتی چەکداریدا، جیابونەوە:

- جیابونەوەی سۆسیالیست، شەڕی ناوخۆی لێکەوتەوەو بەرەی پارتی بەهێزکرد.

- جیابونەوەی ئاڵای شۆڕش، شەڕی لێنەکەوتەوەو هەوڵماندا، لە شەڕی ناوخۆدا بێلایەن بین، دەرکەوت، ئازادی بۆ بێلایەنیش نەبوو!

-زەحمەتکێشان، دوای ململانێی ئایدیۆلۆژی-سیاسی، لە سۆسیالیست جیابونەوە. رووبەڕووی سیاسەتی سەرکوتکردن بونەوە. بەڵام جەزرەبەی توندیان بەرنەکەوت. واتا: سۆسیالیست لە یەکێتی لە چارەسەری کێشەی جیابونەوە، نەرمتر بوون.

دوای راپەڕین، ئاسەواری کێشە چارەسەرنەکراوەکانی ناو شاخی یەکێتی، لە یەکەمین کۆنگرەوە، لە جیابونەوە نزیکخرایەوە. بەڵام بە سازانێکی کاتیی تێپەڕی. ئەم سازانە، دەرگای کردەوە سەرکردایەتیەکی لاواز لەناو یەکێتیدا، هەڵبژێردرا. گرفتەکانی ئەم سەرکردایەتیە لاوازە، لەژێر کاریگەری کێشە چارەسەرنەکراوەکانی شاخو پاشان، ئەرکە نوێکانی شاردا، لە شادەمارەکانی یەکێتیدا، تەشەنەیان سەند. ساڵ بە ساڵ، رەنگی ناکۆکیەکانیان مەترسیدارتر دەکرد.

لەدوای راپەڕینەوە، روداوی سیاسی نوێ، شێوازی حوکمڕانی، کارئەکتەری دەسەڵاتداری تازە، هاتنە سەر شانۆی سیاسیو کەوتنە ناو ناکۆکیە کۆنو نوێکانی یەکێتی.

لەم قۆناغەدا، کێشەی نێوان سکرتێری گشتیو جێگرەکەی، زەقتر دەرکەوت. رەوتی دەستەگەری برەوی پێ درا. سێ دەستە، خەریکی دەستەگەری بوون. مام جەلال، لەسەروی دەسەڵات، ئیدارەی دەدان.

- دەستەی یەکەم.. مەڵبەندی سلێمانی.

- دەستەی دووەم.. هاوپێناوەکانی نەوشیروان. بەڵام هەموو ئەوانەی شاخ لەگەڵیدا نەمانەوە.

- دەستەی سێهەم.. لەبەرامبەر ئەواندا سەریهەڵدا، تەکەتولی سەرۆک وەزیران (کۆسرەت رەسول).

دەستەگەری یەکەم. عومەری سەید عەلی، لە مەڵبەندی سلێمانی، لە پاشماوەی تەکەتولی زیندانو رەوتێکی سەرهەڵداوی دوای راپەڕین، خۆیان دەنواند. چالاکیش بونو مام جەلال بە هەموو توانایەکەوە پشتیوانی دەکردن. بەڵام بەهۆی چەندین کادری بەرجەستەی پەیڕەوانی سیاسەتی نەوشیروان، ئەم دەستەیە، دەستەمۆ کرابوون، لەپاڵ مام جەلالداو بە پشتیوانی مام جەلالیش، کاری خۆیان دەکرد، هەتا لە هەڵبژاردنی مەڵبەندەکاندا پێش جیابونەوەی گۆڕان، ئاشکرا بوون.

دەستەگەری دووەم.. نەوشیروانو ئەوانەی لەژێر کاریگەریدا بوون، بیروڕایان دەگۆڕیەوە. پەیوەندی ویژدانییان هەبوو. بەرە بەرە، پەرەی سەند بۆ رەوتی سیاسیو رێکخراو لەدەرەوە بەناوی چاک. بەشی زۆری پەیڕەوەکانی لە شاخ، لێی هەڵگەڕانەوە! بەڵام لە شاردا زۆرتری لی ئالان! ئەم دەستەیەو دەستەی یەکەم، لەڕووی بابەتییەوە هاوئامانج بون. سەرەنجام، بەهۆی خراپ ئیدارەدانی یەکێتی و تەشەنەسەندنی گەندەڵی و زیاتربوونی نارەزاییەکانەوە، نەوشیروان بەزیرەکی خۆیەوە، دەستەی دووەمی قوتدا.

دەستەگەری سێهەم. سەرۆک وەزیران (کۆسرەت رەسوڵ عەلی)، بە پێگەی خۆی لە دوو ئاراستەدا.. حکومەتو هەولێر، کاریگەر بوو. تەنانەت ماوەیەک لە دەستەگەری نەوشیروانیش کاریگەرتر بوو.

ئەم سێ ئاراستەیە، لەنێوان یەکەمینو دووەمین کۆنگرەی یەکێتیدا، لە جموجۆڵی نیمچە رێکخستنی جیاجیا، لەناو یەکێتیدا نیمچە سەربەست بوون. هەر سێ ئاراستەکەش، بە ناوبانگی یەکێتی، هێزی یەکێتی، داهاتی یەکێتیو راگەیاندنی یەکێتی، خەریکی جموجۆڵ بوون. لە لوتکەدا مام جەلالیان قبوڵ بوو، لە دامێنیشدا تەکەتولی خۆیان بەهێزدەکرد.

مام جەلال.. لەبەرامبەر تەکەتولو ململانێدا، پشووی درێژ بوو. بەڵکو کاتێک سەری جەمسەرەکان، هێز و پارەو پێگەی رێکخستنیان دروستکرد. مام بواری بۆ دەرەخساندنو دنەشی دەدان، بەبێ لێپێچینەوە، درێژە بە تەکەتول بدەن. پێی وابوو، هەتا ناکۆک بن، ناچار دەبن هانا بۆ سکرتێری گشتی ببەن. بەڵام وەکو سکرتێر، شادەمارەکانی توند گرت. وەکو:

١- داهاتی رەسمی یەکێتی کۆنترۆڵ کرد.

٢- هێزی رەسمی یەکێتی گرتەدەست.

٣- راگەیاندنی رەسمی یەکێتی، ئاراستە دەکرد.

٤- دەزگای زانیاری یەکێتی، قفڵ دا.

٥- دوو لیوای پێشمەرگەی تایبەت بەخۆی مەشق پێکردو دەوروبەری خۆی بە هێز تەنی.

لەسەر بنەمای ئەو پێنج ئۆرگانە، لەو باوەڕەدا بوو بڕبڕەی پشتی یەکێتی، بە تۆکمەیی گرتووە. ئیتر بواری دا لەناو ڕێکخستندا، دەستەگەریەکان هەڵبەزنو دابەزن!!

ئەو سیاسەتە، سیاسەتی گرتنی جومگە سەرەکیەکان بە تۆکمەییو سەربەستکردنی تەکەتولەکان، باشتر بوو لەوەی ئازادیەکان سەرکوت بکرێ.. بەلام تەنها بۆ ماوەیەک.. نەک بەردەوام.. بەڵکو بەردەوامی دەستەگەری گەیەندرایە جەمسەرگەری ئاشکرا. تەنها مابوی بەرەسمی جەمسەرەکان، سەکۆکانیان رابگەیەنن.

ئەم جەمسەرانە، لەدوای راپەڕینو یەکەمین کۆنگرەوە، تەماحی کۆنترۆڵکردنی سەرکردایەتی یەکێتییان هەبوو. هەر لەناو کۆنگرەکەدا، نەوشیروان مستەفا، کێشەو ناکۆکیەکانی لەبەرامبەر مام جەلالدا، قووڵ کردو پێی وابوو، دەتوانێ زۆرینەی کۆنگرەکە، بەحوکمی زۆرینەی ئەندامی کۆمەڵەی هەڵوەشاوە، لە کۆنگرەکەدا، بجوڵێنێ. بۆئەوەی ئەمەشی بۆ بچێتە سەر، پێش کۆنگرە پلینیۆمێکی نارەسمی، بۆ کادرەکانی کۆمەڵە، کە دەهاتنە ناو کۆنگرە، سازداو هەوڵیشی دا لەناو کۆنگرەدا چۆنی بوێ، هەڵیان بسوڕێنێ. وای دەزانی وەکو سەردەمی شاخ، کاریزماکەی کۆمەڵەی ماوە!

رۆژانی کۆنگرە، دەرکەوت نەوشیروان نەیتوانی، وەکو کۆنفرانسەکانی کۆمەڵە، جڵەوی بڕیارەکانی بەدەستەوە بێ. هەوڵەکانی پێش پلینیۆمە فراوانەکەی کۆمەڵەش، نەیتوانیبوو خواستی نەوشیروان بەدی بهێنێ. لەبەر چەند هۆیەک:

**یەکەم:** کۆمەڵە بە رەسمی هەڵوەشێندرابوو. نەوشیروانیش بە بەرپرسیاری یەکەمی هەڵوەشاندنەکە دەزانرا. بۆیە، چیکە ئاراستەی کادرو بەرژەوەندیان لای نەوشیروان نەمابوون!

**دووەم:** راپەڕین، ئاسۆی قۆناغێکی نوێو دەرگای بۆ دەسەلاتی حوکمڕانی کردبووەوە. کادرو فەرماندەکانیش، لەشاخدا ماندوو ماندوو هاتبونە شار. چاویان لە گوزەرانو ژیانی سیاسی-کۆمەلایەتی شار بوو. هەلەکەیان دەقۆزتەوە!! تەنها دەسەلاتیش بەرژەوەندیەکانی دابین دەکردن! دەسەلاتیش لای مام جەلال بوو.

**سێهەم:** سەدان هەزار کادرو ئەندام هاتبونە ریزی یەکێتی، نەوشیروانیش، تا بەستنی کۆنگرە، تەنها شانازیەکانی شۆڕشی هەبوو، هێشتا لە حوکمڕانیداو لە هەڵبژاردندا، توانای دەرنەکەوتبوو. بۆیە، کاریگەریەکانی لەڕووی دەرونیەوە، لە بازنەیەکی تەسکدا مابوەوە. دەزگای راگەیاندنو ئۆرگانی دوای راپەڕینیشی نەکەوتبووە بەردەست، هەتا وەکو شاخ،

هەستو هەلویستی زۆرینەی بخاتە ژیر هەژمونکەریەوەو کاریکەری سایکولوژیان لەسەر دابنی!!

**چوارەم:** ئەندامانی مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتی یەکیتیی، لە شاخدا مەفرەزەو تیپو دەیان گوندیان هەلدەسوراند.. کە هاتنەوە شار، دەیان هەزار هەلسوراو، لە دەوری رەمزەکانی یەکیتی، کوبونەوە، بەتایبەتی لە هەولیر-سلیمانی-راپەرین- هەلەبجەو گەرمیاندا.

**پینجەم:** هیزی پیشمەرگە، لە سی-چوار هەزارەوە، بو دەیان هەزار پەرەی سەندبوو، دابەشیش بوبوون بەسەر دەڤەرەکانو بەرپرسەکان. تەنانەت پلەوپایە بەخشینیش، بەدەست نەوشیروانەوە لەناو هیزەکەدا، نەمابوو.

**شەشەم:** مام جەلال، وەکو رەمزی یەکیتیو دیپلوماسیو کاندیدی یەکەم بو سەروکایەتی هەریم، بەرامبەر مەسعود بارزانی لەناو یەکیتیدا، مونافسی نەبوو. ئەمەش کاریگەری مەعنەویو سیاسی زوری هەبوو.

**حەوتەم:** ناکوکیو ململانیی یەکیتی-پارتی، لە سەروبەندی هەلبژاردندا، گەرموگور بوو. هیزی جەماوەری پارتیو مەسعود بارزانی، بو یەکیتی چاوەروانەکراو بوو.. بویە مەترسییان لە ئەنجامی هەلبژاردن پەیداکردبوو.

کوی ئەو راستیانە هاوکات سەرهەلدانی تویژی بەرژەوەندخوازی دوای راپەرین، کە بەشیکیان هەر لە تالانکردنی کەرەسەی دەزگاکان لەراپەریندا، مر بوبوون، وایان کرد نەوشیروان، تەنها لە سەرەتای کونگرەدا، مشتومریکی گەرمی خستە ناو کونگرە. بەلام وردە وردە، کاریگەریەکەی کەمی دەکردو زورینە لەگەل هیمنکردنی دوخی کونگرە بوون. سەرەنجامی کونگرەکەش، بەپیی بەرنامەی نەوشیروان نەشکایەوە. بویە بە بیتاقەتیی گەرایەوەو ملازم عومەری لەگەل بوو هەتا سلیمانی. ئەو شیعرەی نالی وتوتەوە کە دەلی:

نالی مەبە عاجز ئەمە دەورە نە جەورە
ساقی کەرەمی یەک بەیەکە و نوبە بە نوبە

چەند جاریک ئەم شیعرەی لەناو سەیارەکەدا لەبەر خویەوە وتوتەوە. نەوشیروان یەکیک لە شارەزا باشەکانی شیعری کلاسیکی کوردی بوو. شیعرەکەش، نالی مەبەستیتی کە روژگار دەوران دەورانە.. هەروەکو پیشینان وتویانە: ئاش بە نورە دەگەری. ئەو سەرکەوتنانەی نورەی نەوشیروان بوو لەشاخدا، بەدەستی هینابون. لە شاردا، کە کومەلە نەمابوو، مەیدانی یەکیتی بو مام جەلال تەخت بوو.. بویە نورەی مام بوو. بەلام،

رقی نەوشیروان بەرامبەر مام جەلال، دوو بەرامبەر شاخ، ئەستوور بوو! هەتا گەیشتە نووسینی سکالایەکی هاوبەشی زۆربەی سەرکردایەتی و کادرەکانی یەکێتی بۆ مام جەلال.. داوایان لێکردبوو، ئیتر تەمەنی گەیشتوتە (٧٠) ساڵ، وازبهێنێ، بەڵام بەهۆی هەڵگەڕانەوەی بەشێکی ئەم سکالانووسانە و چوونیان بۆ لای مام، مام جەلالیش پشووی درێژ کردوو چارەسەری دۆزییەوە. ئەم سکالایە لە (٢٠٠٦)دا سەری نەگرت. بەڵام دوو تەکەتوولەکەی یەکەم و دووەمی نەوشیروان و عومەری سەید عەلی، یەکخستەوە.

ئیتر، لەم "نۆبە بە نۆبە"یەی نالیەوە، نەوشیروان نەخشەی کێشاوە، نۆبەی بێتەوە. لەناو یەکێتیدا تا توانیویەتی کێلاویەتی. کە دڵنیا بوو، دوای هەڵبژاردنی مەڵبەندەکان (٢٠٠٨) ناتوانێ نۆبەی بێتەوە بۆ کۆنترۆڵکردنی یەکێتی، هەروەکو چۆن کۆمەڵەی کۆنترۆڵ کرد. ئیتر بڕیاری دا لە یەکێتی جیابێتەوە، تەوقیتی جیابونەوەکە، لەناو یەکێتیدا وەکو جیاوازی ڕێبازی سیاسی، بۆی گونجاو بوو. بەڵام لەسەر ئاستی کوردستان، هەلومەرجی بابەتیی بۆ بزوتنەوەیەکی پۆپۆلیستی وەکو بزوتنەوەی گۆڕان، نەڕەخسابوو. چونکە:

- قەیرانی دارایی نەبوو.
- موچەی مانگانە دەدرا.
- ئاوەدانی لە هەموو شارو شارۆچکەکان هەبوو.
- پرۆژەکان هەتا دەهات، زیاتر دەکرا.
- پێگەی هەرێم، لە جیهانو ناوچەکەو عێراقدا، بەهێز بوو.
- کاریگەری گۆڕان، زۆرتر لە سلێمانیو دەڤەری سەوزدا بوو!
- گەندەڵییش چەشنی ئێستا تەشەنەی نەسەندبوو!!

بێگومان بزوتنەوەی گۆڕان، بەشێکی ڕەخنەکانیان دروست بوو. دیاردەی گەندەڵی هەتا دەهات تەشەنەی دەسەند. بەڵام شێوازی ڕەخنەکانی گۆڕان لەناو یەکێتیدا، مام جەلالی دەترساند کە کێشەکان قووڵتر بکات. کەچی یەکێتی نەک لە قووڵتربونی کێشەکان ڕزگاری نەبوو، بەڵکو دوچاری جیابونەوەش بوو. سەرکردەی ماندووی یەکێتی چوونە ریزیان، هەروەها ڕێژەیەکی باشی ئەندامو کادری یەکێتیش، کە ئەوکاتە بە (٢٣٪) خەمڵێندران. (٢٥) کورسیشیان هێنا. بەرنامەی گۆڕانکاریان مایەی قبوڵکردنی بەشێکی خەڵک بوو. بەڵام ئەو ڕاستیەش ڕۆشن بوو کە، ئەگەر نەوشیروان مستەفا، لە ڕابەرایەتی بزوتنەوەکەدا نەبا، هەرگیز ئەو سەرکەوتنەی لە هەڵمەتی هەڵبژاردندا بەدەست نەدەهێنا. بەڵکو ئەگەر نەوشیروان بڕیاری جیابونەوەکەی نەدابا، بزوتنەوەی گۆڕان بەو فۆرمو بەو تەوژمەو بەو هەڵمەتە فراوانەی ڕاگەیاندن، هەر ڕوی نەدەدا.

نەوشیروان، شێوەو شێوازی سیاسیو هەڵمەتی دەرونی جیاوازی، لە دامەزراندنی گۆڕاندا لەچاو مێژووی سیاسەتی نەوشیروان گرتەبەر. وەکو:

**یەکەم:** پشووی درێژ کرد و (١٨) ساڵی رەبەق، لە ١٩٩١ وە بۆ ٢٠٠٩، ململانێی کرد. بۆئەوەی بشتوانێ، کێشە لەخۆی دووربخاتەوە. ساڵانێکی زۆر، لە کوردستان دوردەکەوتەوە. لەو ساڵانەدا، نەرم نەرم، تۆوی جیابونەوەی دەوەشاندو رقێکی سیاسی-حیزبی بێڕادەی پەرە پێدا!

**دووەم:** خۆی لە جیاکردنەوەی هێز دوورخستەوە. چونکە دڵنیابوو بەهێز دەرەقەتی یەکێتی-پارتی نایەت.. مام جەلالیشی دەناسی، چاوی لە هەموو ململانێیەک دەپۆشی، بەڵام جیاکردنەوەی هێز هێڵی سوور بوو لای.(*)

**سێهەم:** جیاکردنەوەی نەخستە قاڵبی فۆرمی حیزبایەتی کلاسیکیەوە. بەڵکو بە ئاڕاستەی ناو جەماوەر، فەلسەفە سیاسیەکەی دارشت.

**چوارەم:** بزوتنەوەی گۆڕانی، لە فۆرمیلایەکی نوێدا رێکخست. وزەی نارەزایی جەماوەری ئاڕاستەی دەکرد. بەبێ ئەوەی لەبەرامبەردا هیچ بەڵێنی بدات. واتا: زۆرتر ئەرکی دەسپاردو قسەی لە مافی هەڵسوڕاوانی بزوتنەوەکە نەدەکرد.

**پێنجەم:** متمانەی لەناو هەڵسوڕاوانی گۆڕاندا، بۆ پشت بەخۆبەستن لەسەرەتاوە دروستکرد. بەڵام کە ململانێکان پەلوپۆی سیاسیو جەماوەریو راگەیاندنیان هاویشت، کە زانی راگەیاندنەکەیان، خەریکبوو، کێشەکان لە گرێژنە دەترازێنن.. ئیتر هەستی بە مەترسیەکان کرد. سەرەتا رۆژنامەی (رۆژنامە)ی داخست.. پاشان تەلەفزیۆنی (K.N.N) یشیان داخست.

**شەشەم:** لە ١٧/ی شوباتدا، گەورەترین تاقیکردنەوەی گۆڕان، سەرەڕای کاریگەری یەک مانگ، لەسەر شەقامی سیاسی، بەڵام درکی پێکرد، ئامانجەکانی ناهێنێتەدی.. رایگرتو دوای ١٧/ی شوبات، نەچووە ژێر باری خۆپیشاندانی گەورەی تری واوە!!

بەرەنجامێکی چڕی ئەزمونی بزوتنەوەی گۆڕان، پێماندەڵێ:

---

* لە ١٧/ی شوباتدا، پارتی هێزی هێنایە سەر گۆڕان. لەناو مەکتەبی سیاسیدا، یەکەمین کەس دژی هەڵوێستم دەربڕی. دوو کەس لەگەڵم نەبوون. لەسەر ئەم هەڵوێستە نەوشیروان محەمەد توفیقی راسپاردبوو، سوپاسم بکات، سوپاس. بەڵام دڵنیام، ئەگەر ١٧/ی شوبات سەری بگرتایە، هەر نەوشیروان خۆپیشاندەرانی دەنارده سەر ماڵەکەم. خەڵکیشی تەرخان کردبوو، بەچەکەوە هەڵبکوتنە سەر ماڵومناڵم. ناوی ئەو کەسەش دەزانم بەخۆیو مەفرەزەیەک چەکدارەوە، ساز بون بێنە سەرم! کە ئەم رەگەزە لە بیرکردنەوەی نەوشیروانو هاوڕێ نزیکەکانی دەبینم، مەترسی گەورەم لە ئۆپۆزسیۆنی کورد هەیە. مەترسی زیندووکردنەوەی گیانی زەبروزەنگو دڕندەیی. هەر واشی لێدێ.. ئەگەر بویان هەڵبکەوێ!

ئەوەی لە مێژووی یەکێتیو کۆمەڵەدا، بەرامبەر جیابونەوەی حیزبایەتی، نەوشیروانو پەیڕەوانی بە تاوانێکیان زانی، لایان ئاسان بوو، پەلاماری ئاڵای شۆڕش بدەن. بڕیاری کوشتنی جەستەییو سیاسیش بدەن. شەڕی سۆسیالیست بکەن، لە پاسۆکو حیزبی شیوعیش بدەن.

خۆیو هاوبیرەکانی، نەک لەناو یەکێتیدا جیابونەوە، بەڵکو لە حکومەتیش جیابونەوە. پەرلەمانیشیان تەنها بۆ نابوتکردنی حکومەتو دەسەڵاتی سیاسی ویست. لەم سیاسەتەشدا، سەرنەکەوتن. ئیدی بایاندایەوە، سەرەتا لەژێر فشاری ناوخۆی گۆڕاندا، ویستیان یەکێتی بۆ دوژمنایەتی پارتی، رابکێشنە لای خۆیان. ئەمەیان بۆ مەیسەر نەبوو. گەڕانەوە سەر رەچەڵەکی راستەقینەیان، بە تاکتیک لەگەڵ پارتیدا رێکەوتن.. بەڵکو بتوانن لەناو حکومەتدا، بەرە لەژێر قاچی یەکێتیدا راکێشن. لەمەشیاندا، ئامانجیان نەهێنایەدی. سەرەنجام رێژەی دەنگەکانیان هاتە سەر نیوە. لەم کابینەیەدا، ئارامتر بوون.. هاوشانی یەکێتیو پارتی.. لەکاتێکیشدا.. حکومەت لە قەیرانی داراییدایە. نارەزایی جەماوەر، دەیان بەرامبەری ئەوکاتەیە کە گۆڕان جیابوەوە. بەڵام گۆڕان، گۆڕانی جاران نەماوەو کاریگەرییە پۆپۆلیستیەکەی، وەکو هەموو بزوتنەوە پۆپۆلیستیەکانی دونیا، لەسەرەتاوە کاریگەرییان زۆرە.. بەڵام بەرە بەرە کەمدەبێتەوە. بەدڵنیاییەوە، ئەم سیاسەتەی ئێستایان، گەلێ باشترە لە سیاسەتی پێشوتریان. ئەگەر لەسەر ئەو سیاسەتەی پێشوو بەردەوام بونایە، روداوی چاوەڕوانەکراویان دوچار دەبوو!! بە جیابونەوەی نەوشیروان، دەرکەوت کە هێندەی لەگەڵ مام جەلالدا ناکۆک بووە، نیو ئەوەندە لەگەڵیدا رێک نەبووە. ئەوەی کە لە شاخیش دەیویست، پاڵ بە مام جەلالەوە بنێو مام ببێتە وتەبێژی یەکێتی لەدەرەوەی وڵات، بۆی نەچووەسەر، ویستی لە شاردا، تەواوی ناکۆکیەکانی لەگەڵ مام، لە دامەزراندنی کۆمەڵەوە، بۆ شاخو بۆ دوای راپەڕین، بە جیابونەوەی گۆڕان، هەموو مەرامەکانی بەدی بهێنێ. بەڕاستی یەکێتیو مام جەلالیشی گەیاندە ئاستێک لە خولێکی هەڵبژاردندا تەنها (١٨) کورسی هێنا. بەڵام، لە دوائەنجامدا، گۆڕانو نەوشیروان دوا ئامانجیان لە شکستپێهێنانی یەکێتیدا نەهێنایەدی. ئەوانەی ویستیشیان گۆڕان بهێننەوە ناو یەکێتی، ئەمانیش، پێیان نەکرا!! تا ئێرە، ئەگەر یەکێتی لە شاخدا، فەلسەفە نیمچە بەرەییەکەی شکستی هێناو پەرەی پێ نەدرا، بەرەو بەرەی کوردستانی فراوان، کۆمەڵەش نەکرایە پارتی پێشڕەو، لە یەکەمین تاقیکردنەوەی حوکمڕانیشدا، هاوزەمانی راپەڕینو قورستربوونی ئەرکەکانی دەسەڵاتداریتی، یەکێتی وەکو حیزبێکیش، پێش حیزبەکانی تری کوردستان، دوچاری

کێشەی دەروون حیزبایەتی بوو. واتا: ئیشکالیەتی قووڵی حیزبایەتی بۆ پەیدا بوو. ئەمە لەکاتێکدا، ئەگەر یەکێتی بە پارتی بەراورد بکرێ، بەپێچەوانەوە، پارتی-بنەماڵەی بارزانی، کێشەی بنەماڵەکەیان هی سەردەمی بارزانی باوکیشیان چارەسەر کرد. لەگەڵ "پارتی گەل"یش، یەکیانگرتەوە. تا ئێستاش کێشەی کەمتریان لە یەکێتی هەیە!

دیارە یەکێتیش، لەگەڵ بەشێکی حیزبی سۆسیالیستو ئاڵای شۆڕش یەکیگرتەوە، بەڵام بزوتنەوەی گۆڕان، بە تەوژمو گوژمێکی گەورە، لێی جیابووەوە. لەکاتێکدا، تا ئێستا لەناو پارتیدا جیابونەوەی تر روینەداوە. هەر ئەمەش نا، یەکێتی، جیابونەوەی تریش لەناویا بەناوی هاوپەیمانیەوە سەریهەڵدا. گیانی دەستەگەریش، لەناویا بە چارەسەرنەکراوی ماوەتەوە!

شار دەریخست، یەکێتی، بە تواندنەوەی باڵەکان لەناویدا، بە کێشمەکێشی زۆرەوە، هاتۆتەوە ناو شارەکان. باجی هەموو کێشەو هەڵە چارەسەرنەکراوەکانیشی دا!

## ( ١٥ )

## هاوپەیمانی؛ باری نەڕەخساوی خۆیی!

گیانی دەستەگەری لەناو یەکێتیدا، بە نەخۆشکەوتنی مام جەلال قووڵتر کرا. بەتوندی گرێدرایە خەیاڵی بەرزەفڕی سەرکردەکانیش!

هەتا مام تەندروستی باش بوو، سەرەڕای ئەوەی دوورکەوتنەوەی لە کوردستان، زیانی زۆری بۆ یەکێتی هەبوو، بەڵام وردە وردە بە شکۆ و ئەزمونی خۆی، توانی هەندێک لە ئاسەوارەکانی جیابونەوەی گۆڕان، پشتئەستوور بەو سەرکردانەی یەکێتی کە لەگەڵیا مانەوە، لەگەڵ نوسەرو کادرو هێزی پێشمەرگە، کە هەڵوێستیان بەرامبەر گۆڕان هەبوو، توانی یەکێتی لە گەورەترین مەترسی دەرباز بکات. بەڵام لەناو یەکێتیدا، بەتایبەتی لە پۆستە باڵاکانداو لەناو بنەماڵەی مام جەلالیشدا، هەبوون، نەک هەڵوێستیان بەرامبەر جیابونەوەی گۆڕان نەبوو، کە دەیانویست یەکێتی تێکوپێک بشکێنن‌و مام جەلالیش بە شکستخواردوویی کۆتایی پێ بهێنن، بەڵکو پلە باڵاکانی یەکێتی‌و بنەماڵەکەشی، سازشیان لەگەڵ گۆڕان تا ئەو رادەیە دەکرد، کە ژێربەژێر هاوکاریشیان بۆ دەناردن.

نالی جوانی فەرمووە: "ئەمە دەورە.. نە جەورە.. کەرەمی ساقیش یەک بەیەکەو نۆبە بە نۆبە".. ئەمەیە حیکمەتی حەزرەتی نالی..

ئەو یەکێتیەی جیابونەوەیان بە تاوانێکی نەبەخشراو دەزانی، ئەوەتا، نەوشیروانو گۆڕان، جیابونەوە، زۆربەی سەرکردەکانی یەکێتی لەئاستیاندا متو مات بوون.. هەندێکیان لە هەڵمەتی ڕاگەیاندنی گۆڕانو هەندێکیشیان لەو بەڵگانە، کە لای نەوشیروان بووە، لەسەریان هەیبوو، دەترسان بڵاوی بکاتەوە. تاک تاکیشیان لە پەرۆشیەوە، قسەیان نەدەکرد! بەگشتی، یەکێتی کەوتبووە بەر مەترسییەکی گەورە، کاتێک (سەر-کردە) واتا سەری کردەکەی بەرگری لێنەکات. ئەمە خۆی لەخۆیدا یارمەتی گۆڕان دەدا کە کاریگەری زۆرتر لەناو یەکێتیو خەڵکدا دابنێ. چەشنێکیش بوو لە ڕەنگدانەوەی دەستەگەری نوێ. پاشەکەوتیش بوو بۆ جیابونەوەی تر. خراپتریش لەوە، ژێربەژێر یارمەتیو هاوکاری گۆڕانیش بە سەدان هەزار دۆلار دەدرا، گوایە، لەم ڕێگایەوە، دەتوانن گۆڕان بۆ ناو یەکێتی ڕاکێشنەوە. ئەمەش سیاسەتێکی نەزۆک بوو.. چونکە فەلسەفەی یەکێتیو گۆڕان، تا ئێستاش، خاڵە ناکۆکەکانیان قووڵەو خاڵە هاوبەشەکانیان تەنکە!

ئەوانەی ئەم سیاسەتەیان بەرامبەر گۆڕان دەگرتەبەر، نە لە سەردەمەکە تێگەیشتبونو نە لە پێکهاتەی گۆڕانو نە.. نەوشیروانیشیان، لەڕووی سروشتی پێکهاتەو سایکۆلۆژیەتو قینی سیاسیەوە، دەناسی. مام جەلال نەیتوانی نەوشیروان بگێڕێتەوە، کەچی کوڕو خزمەکانی، دەیانویست لە مام جەلال کاریگەرتر بن!!

مام جەلالو نەوشیروان کۆچی دواییان کردووە. یەکێتی چوارەمین کۆنگرەشی بەست. ئێستا جڵەوەکەی یەکێتی بەدەست ئەو سەرکردانەوەیە، کە ژێربەژێر هاوکاری گۆرانیان دەکردو پێیانوابوو، دەتوانن بەو سیاسەتە گۆڕان لە یەکێتی نزیکبخەنەوە. پاشان یەکێتیو گۆڕان یەکبخەنەوە! کەچی، کوتومت پێچەوانەکەی دەرکەوت؛ گۆڕان پەیوەندی لەگەڵ پارتیدا باشترە. لەم کۆبونەوانەی دوایی نێوان یەکێتی-گۆڕاندا، گۆڕان ئامادە نەبون بەیاننامەی هاوبەشیش لەگەڵ سەرکردایەتی ئێستای یەکێتیش دەربکات. نەخوازەڵڵا بۆ بڕیاری سیاسی تری چارەنوسساز!

گیانی دەستەگەری چارەسەرنەکراوی ناو یەکێتیو خەیاڵی بەرزەفڕی ئەو ناوونیشانانەی لەدوای ڕاپەڕینەوە، لەناو یەکێتیو حکومەتدا، درایە سەرکردە متمانەپێکراوەکانی سکرتێری یەکێتی، بەبێ دڵنیابون لە ئایندەیان، لەدوای جیابونەوەی گۆڕان، بەجۆرێکی ترو لە دۆخێکی تردا، لەناو یەکێتیدا گەیشتنە بنبەست.

هەموو ئەوانەی، لەدوای ڕاپەڕینەوە چەشەی دەسەڵاتو دەستکەوت بوونو بەرە بەرە، زیاتر لە شاخ، پرنسیپەکانی دیموکراسیو دادپەروەرییان فەرامۆش دەکرد، هەر بەناوی ئازادیو دادپەروەریەوە، لە لوتکەوە بۆ دامێن، لەناو یەکێتیو دەرەوەی

یەکێتیدا، چاوەڕوانیان نەکرد لەگیانەڵلادا مام دوا هەناسە بداتو مەیتی لە ئەڵمانیاوە بگەڕێتەوە، نەکا لەڕووی یاساییەوە، فریای لیستی جودا نەکەوون. ڕێبازو لیستیان ڕاگەیاند. لەمەشیاندا، لەناو یەکێتیدا بەهۆی لاوازبونی مەرکەزیەتو مەرجەعیەتی یەکێتی، هەروا لەناو یەکێتیو دەرەوەی یەکێتیدا، چارەنوس بەستنەوە بە لیستی هاوپەیمانی، بەئاشکرا دیار بوو. لەم دۆخەدا، هێندە ئۆباڵەکە بە نەبوونی بڕیارو چەسپاندنی مەرکەزیەت دەزانم.. بە بڕیاری ئەوانەی نازانم جیابونەوە. یان ئەوانەی دۆستی جیابونەوەکە بوون. ئەوەی لە دوو ساڵی پێش کۆچی دوایی مام جەلال لەناو یەکێتی دەگوزەرا، جگە لە کردنەوەی دەرگاکانی تێکدانی یەکێتی.. هیچ ناونیشانێکی تری نییە! ململانێکانیش لەسەر قۆرخکردنی دەسەڵاتەکانی یەکێتی بوو، لەنێوان بنەماڵەی مام جەلالو تەکەتولەکانی تردا. کە ماوەیەک لە ناوەندی بڕیار یەکیانگرتبوەوە. بەڵام زۆری نەخایاند، ئەمانیش پێکەوە نەمانەوە. لەمەوە، هاوپەیمانی-د.بەرهەم سەریهەڵدا. کە هۆیە سەرەکیەکەی بۆ هەڵەکانی یەکێتی لەدوای ڕاپەڕین دەگەڕێتەوە، کە دەسەڵاتی حیزبی بەسەر دەسەڵاتەکانی حوکمڕانیدا، دەسەپاند. ئەمە لەکاتێکدا، دوای (٢٨) ساڵ هەڵەیەکی گەورە بوو ئەو دەسەڵاتانە جیانەکرانەوە. تا ئێستاش. دیارە، هاوپەیمانیش بەبێ بنەما هەڵوێستی وەرنەگرت. ئەمانیش بەشێکی ڕەخنەکانیان ڕاست بوو. چونکە یەکێتی هەڵەکانی چارەسەر نەکرد. گەندەڵی زیادی کرد. گرفتە حیزبییەکان پەرەیان سەندو هاوبیری لەناو یەکێتیدا کرایە قوربانی دەسەڵاتخوازی. مەرکەزیەت هەر نەما. لەوپەڕی ڕۆژگاری لیبرالیەتی بێ زەمینەی لیبرالیزمی کوردستان، یەکێتی لەو دۆخەدا، سیاسەتی دەکرد.

خاوەن ماڵ، ماڵی خۆی نەپارێزێ.. گلەیی لە دز کردن مانای نییە. دزیش بۆی بلوێ نەک ماڵ، بەڵکو سەریش ناپارێزێ! یەکێتی وەکو ماڵێکی نەپارێزراوی دزراوی لێهات. لەم دۆخەدا، مێژووی یەکێتی، هێزەکەی، پلەوپایە بەخشینەوەو موچە نەبوایە، یەکێتی هەڵدەوەشایەوە.

دیسان، کەمترین سەرکردە ئامادە بوون لەبەرامبەر جیابونەوەی هاوپەیمانیدا، بەرگری لە یەکێتی بکەن. بەڵکو نیوەی زیاتری سەرکردایەتی، بە سۆزی برادەرێتیو بە کاردانەوەی گرفتەکانی ناو یەکێتیو مەترسی ئەگەری سەرکەوتنی لیستی هاوپەیمانی، بەشێوەیەک لە شێوەکان، لەگەڵ هاوپەیمانیدا بوون. بنەماڵەی تاڵەبانیش هەمان سیاسەتی پەیڕەوکراوی جارانی گۆڕانیان لەگەڵ هاوپەیمانیدا.. گرتەبەر. سەرەنجام سەرۆکی هاوپەیمانیو ژمارەیەکی کەمی کادرەکانی لەگەڵیا هێنرانەوە ناو یەکێتی.

زۆرینەیان درێژەیان بە خەباتەکەیان دا. ئەوانەی پێیانوابوو، گەڕانەوەی هاوپەیمانی دەیان هەزار دەنگدەر بۆ یەکێتی لە هەڵبژاردندا دەگێڕنەوە، کەچی دوای هاتنەوەی سەرۆکو ژمارەیەک لە هاوپەیمانی، ڕێژەی دەنگەکانی یەکێتی دابەزی. چونکە لە دونیای سۆسیال-میدیادا، نەک کادرو ئۆرگانەکانی یەکێتی، بەڵکو رای گشتیش لە راستیەکانو کەسایەتیەکان تێگەیشت. تەنانەت لەناو کۆنگرەی یەکێتیشدا پرۆسەی هێنانەوەی بەشێکی کادرانی هاوپەیمانی، بەو شێوە دراماتیکییە بە نەگەتیڤ شکایەوە. تا سەریش، پلەو پۆست نەیتوانی کێشە قووڵەکانی یەکێتی ناو یەکێتی، چارەسەر بکات. کۆنگرە، بەجۆرێکی تر کێشەکانی لەمەحەک دایەوە. دیسان ناکۆکیەکانی بوژاندەوە. بەڵام ئەمجارە، زەقو رەق نا!! تا ئێستاش بەردەوامە. بەمەشدا دەرکەوت، کە رێکەوتن کە تەنها لەسەر بنەمای دابەشکردنی پۆستە باڵاکان دەکرێ، هەر لەسەر پۆستی باڵا، دەشێوێ!

هاوپەیمانی، پێچەوانەی گۆڕان، هەلومەرجی بابەتیی لەڕووی گەندەڵیو لێکترازانی خەڵکو حکومەت، لەبار بوو بۆ لیستی جیا. بەڵام لەڕووی خۆیی (ذاتي)یەوە، نە کاریزمایەکی وەکو نەشیروانیان هەبوو، نە بیروبۆچونیشیان لە قاڵبی سیاسی-حزردا، گەڵاڵە کردبوو. تەنها بەناونیشانی سەرۆک وەزیرانو ئەو رەخنانەی ئاراستەی حکومەتو یەکێتی دەکران، نەیانتوانی هاوکێشەکان بگۆڕن. خەڵک، بە هەستی خۆڕسکی خۆی، بەوە وەڵامی دەدانەوە.. کە خۆشیان دوو خول لە لوتکەی دەسەڵاتدا بوون. بۆ کێشەکانیان چارەسەر نەدەکرد؟

هاتنەوەشیان بەوشێوەیە بۆ ناو یەکێتی، سەلماندی کە رەخنەکانیان دژی یەکێتی، تا سەر نەبردە سەر. هاتنەوەکەمان پێ باشترە.. بەڵام لەناو یەکێتیدا، کێشە ستراکچەریەکەی بە چارەسەرنەکراوی ماوەتەوە. ئەویش ئەوەیە، ئەم فەلسەفە سیاسیەی یەکێتی، دوای ئەوەی بەهۆی شۆڕشگێڕیتی شاخو کاریزمایی مام جەلالەوە، لەدوای راپەڕینو حوکمڕانیدا، کاریگەریەکەی لاواز بوو.. دیاردەی دزێو دزێوی گەندەڵیو هەلپەرستی، لەناویا تەشەنەی سەند.. مەرکەزیەتو مەرجەعیەتی کردە قوربانی دەستەگەریو دەسەڵاتخوازی..تاد. دەسەڵاتە حیزبیو دەسەڵاتەکانی حکومەتو پەرلەمانیشی، بە تێکەڵوپێکەڵی ماوەتەوە! مەترسیدارترین کێشە لەناو یەکێتی، کێشەی دەستەگەری پلەو پۆست خوازی بوو. تەکەتولی بێ شوناسی ئایدیۆلۆژی بوو. نەبوونی مەرکەزیەتو مەرجەعیەت بوو!! بەردەوامیش ئەو کێشانە جەزرەبەیان لە یەکێتی داوە.

دوای هاتنەوەی بەشێکی کەمی هاوپەیمانیو دوای ئەو جۆرە کۆنگرەیەش، لەم هەلومەرجە سەراپا نوێیەی سەردەمەکەو ناوچەکەو کوردستاندا، ئایا یەکێتی، تەنها بە پارەو هێزو راگەیاندن، لەناو قوولبونی کێشمەکێشمەکاندا.. بە زۆربەی سەرکردایەتی کەمئەزمونی دوای چوارەمین کۆنگرە، دەرەقەتی ئەرکەکانی چارەسەرکردنی کێشە بنچینەییەکانی دوای راپەڕین، هەروەها ئەرکەکانی ئەم سەردەمەو ئەم دۆخەو ئەم ململانێ فرە رەهەندە دێن؟ ئەگەر بە هیوا بێ.. هیوادارم سەرکەوتوو بن. بەلام ئەگەر بە سیاسەتی لۆژیکیو ماتماتیکیانەی هاوکێشەکان بێ، یەکێتی، پێویستی بە تێگەیشتنی قوولترو هەمەلایەنەتر هەیە، لە دیاریکردنی ستراتیژو پرەنسیپە هاوچەرخەکانی دیموکراسی، ئازادی، مەدەنیەتو دادپەروەری.

یەکێتی.. تەنها بە دروشمو لە شەڕە فەیسبوکدا، جودایە لە لایەنەکانی تر. بەتایبەتی لە حەریفە مێژووییەکەی کە پارتییە. بەلام لە:

- ناسنامەی چینایەتی-کۆمەلایەتی؛
- لە خەباتی دیموکراسیو ئازادی راستەقینە؛
- لە بونیاتنانی مەدەنیەتو مافە بنچینەییەکانی ژن؛
- لە کۆمەلێکی دادپەروەر لە هەموو ئاستەکاندا؛
- لە بونیاتنانی سیستەمێکی هاوچەرخی دوژمنی گەندەلیو شەفافدا؛
- لە مافی مرۆڤو ژینگەپارێزیو سەروەری یاسادا؛
- لە کۆتاییهێنان بە فرە هێزیو فرە لەشکرییدا؛
- لە یەکخستنی دەزگا بە دەزگای حکومەتی هەرێمدا..

لەم ئەرکانەدا، یەکێتی، لە ویژدانی رای گشتیدا، نەیتوانیووە، ناسنامەی حیزبایەتی جیاوازی خۆی، لە لایەنەکانی دیکە جودا بکاتەوە. باسی ویژدانی رای گشتی دەکەم.. نەک دروشم.. ویژدانی رای گشتی، واتا: باوەڕی رای گشتی بەو سیاسەتانە.. بەو جیاوازییانە.. بەو رەخنانە.. بەو ئامانجانە. کە رەنگدانەوەی خواستی قۆناغی نوێی سیاسەتن. مەخابن ئەو باوەڕە لە ویژدانی رای گشتیدا، بونی نییە!

کورتیەکەی یەکێتی.. لەم دۆخەدا، کە بە هەزار حال لە دوا هەلبژاردندا (٢١) کورسی هێناوە. ٦ی حوزەیرانی سالی ئاییندە رووبەڕووی هەلبژاردنی پێشوەخت دەبێتەوە.. لەسەر ئاستی عێراق. بە یاسای هەلبژاردنی نوێ.. کە کەمتر گزی تیا دەکرێ.. بۆیە ئەمجارەیان پشتئەستور بەخۆی، یەکێتی لە دوڕیانێکدایە..

- ڕێی.. بەخۆداچونەوەو هەڵسەگاندنەوەو ڕەخنەلەخۆگرتن.. بەرەو چارەسەری کێشەکانو دیاریکردنی جیاوازییەکانی چینایەتی-فەلسەفەی یەکێتی لە لایەنەکانی دیکە، ئەمەش ساڵەها دەخایەنێت بێتەبەر!

یان..

-ڕێی.. مانەوەی لەناو بازنەی ئێستایدا.. بەهیوای بردنەوەیەکی شیاوتر لە هەڵبژاردنو لە پۆستەکانی دەسەلاتەکاندا. بە هەر شێوەو شێوازێک بوبێ!

ڕێی دووەم.. دەستەبەر نییە. بەڵکو دوور نییە، کێشەی چاوەڕوان نەکراوی تریشی لێبکەوێتەوە. ئەمەش دونیای سیاسەتەو دونیای مەترسیداری بەرژەوەندیە ئابورییەکانە.. کە تا دێت، بەرژەوەندیەکان قووڵترو چەورتر دەبن! مەترسیەکانیشی مۆتەکەئاسا.. بەسەر سەرمانەوەن!!

## ( ١٦ )
## لێکتێگەیشتنی دەباشان - ڕێکەوتنی سەرانسەری

دوای جیابونەوەی بزوتنەوەی گۆڕان، پەیوەندییان لەگەڵ یەکێتیدا، لەوپەڕی خراپیدا بوو؛ هەموو توانایەکی ڕاگەیاندن و پروپاگەندەیان دژی یەکێتی و کەسایەتی مام جەلال خستبووە کار؛ ڕاگەیاندنەکەشیان لە ڕۆژنامە ڕۆژنامەی ڕۆژنامە، K.N.N، سایتەکانیان و ئێزگەی دەنگی گۆڕان، وەکو خۆیان ناویان نابوون، تۆپەکانی گۆڕان، دژی یەکێتی خرابونە کار؛ لە دوای سەرەتای دەرکردنی گۆڤاری گوڵانی پارتی، توندڕەوترین ڕاگەیاندنیان خستە ناو میدیای کوردستانی. سنوری سیاسی و ڕێسای پەیوەندی و ئێتیکی ڕۆژنامەگەریان، تا ڕادەی تانە و تەشەر و شکاندنی کەسایەتیەکانیشیان دەبەزاند. تەنانەت بەها هاوبەشەکانیشیان لە شۆڕش و پێشمەرگایەتی و پەیوەندی هاوڕێیەتی، بێبەها دەکرد.

ئەم ڕەوشە، لە لایەک یەکێتی خستبووە گۆشەیەکی مردوی بەرگریەوە، لە لایەکی دیکەشەوە، پارتیشیان دوچاری کاردانەوەی توند کردبوو. دۆخێکی سیاسی لێوان لێو لە دژایەتی و یەکتر نابوت کردن، خوڵقابوو. سەرەنجامی ئەم سیاسەتە، گەیەندرایە خۆپیشاندانەکانی ١٧/ی شوبات ٢٠١٢. کە چەقەکەی سلێمانی و بەردەرکی سەرا بوو. ویستیان ناوی بەردەرکی سەراش بە مەیدانی ئازادی بگۆڕن، بەلام بۆیان نەچووە سەر.

زۆربەی سەرکردایەتی و کادری ئۆرگانەکانی یەکێتی، لە بەرامبەر ئەو سیاسەتەی گۆڕاندا، لەبەر گەلێ هۆکار، شپرزە کران. بەڵکو کەمترین کادری یەکێتی لە ١٧/ی شوباتدا ئامادەبوون، لەسەر تەلەفزیۆنەکانی یەکێتی بەرگری لە حزبەکەیان بکەن.

گۆڕان، بەیاننامەیەکی لە (٧) خاڵدا دەرکردو تیایدا، بێ تەمومژ داوایان کرد حکومەت و پەرلەمان هەڵبوەشێتەوە. حکومەتێکی کاتی دابمەزرێ و هەڵبژاردنی پێشوەختیش رابگەیەندرێ. بەردەرکی سەرایان کردە مەیدانی دادگاییکردنی بەرپرس و کاربەدەستەکان. تەنانەت چەندین مەفرەزەی نهێنیشیان ئامادە کردبوو، هەڵبکوتنە سەر ماڵی بەرپرسەکان (یەکێک لەوانە من بوم و دەشزانم ئەو فەرماندەیەی دایان نابوو هەڵبکوتنە سەر ماڵ و منالم کێیە!). یەکێتی، لەبەرامبەر ئەم دۆخەدا، دوو تاکتیکی گرتەبەر:

**یەکەمیان**: ژێر بەژێر هەرەشە نێردرا بۆ نەوشیروان ئەگەر دۆخی سلێمانی تێکبدرێ.. لەناو چاوی ئەوانی دەزانین و ئەوەی چاوەڕوانی نەکات، روودەدات.

**دووەمیشیان**: رێگەی گفتوگۆ و چارەسەری ئاشتییانە.

سەبارەت بە خاڵی یەکەم، دەستبەجێ نەوشیروان بەیاننامەیەکی دەرکرد و داوای کرد، خۆپیشاندانەکان کۆتایی پێ بهێندرێ.

بۆ خاڵی دووەمیش، ئەو شەوەی پارتی هێزی نارد هەڵبکوتنە سەر گردەکەی گۆڕان، درەنگ، لە بینایەی پارێزگادا کۆبونەوە کرا، ئەم بەڕێزانە ئامادە بوون:

١-ملازم عومەر ٢- نەوزادی نوری بەگ (نوێنەرایەتی نەوشیروان) ٣-کۆسرەت رەسوڵ ٤-بەرهەم ساڵح ٥- دلێری سەید مەجید ٦-مەلا بەختیار ٧-بەهرۆز قەشانی پارێزگار– یەکێتی. دوای گفتوگۆیەکی زۆر، بەم چەشنە کۆتاییم بەکۆبونەوەکە هێنا:

سڵاومان بۆ کاک نەوشیروان هەیە، دڵنیابێ ناهێڵین هێزی پارتی بێتە سەریان. ئەویش دەبێ دۆخی خۆپیشاندان و شارەکە ئارام بکاتەوە. گوتیشم: هەر ئێستا ئامادەم بۆ رێکەوتن سەری لێبدەم. بۆ بەیانیەکەی، وردە وردە دۆخی شار ئارام دەبوەوە و هێزەکەی پارتیش کشانەوە.

ئەو دۆخە، وەکو عەرەب دەڵێ (رب چارە نافعە) زەمینەی بۆ گفتوگۆی رەسمی، بۆ یەکەمین جار لە نێوان یەکێتی و گۆڕان دا، رەخساند. لە ناو گۆڕاندا، فشارێک بۆ نزیککەوتنەوە لە یەکێتی سەریهەڵدا بوو (سالار عەزیز و قادری حاجی عەلی) نوێنەرایەتیان دەکرد. لەناو یەکێتیشدا، بەربەستێک بۆ ئەو جۆرە گفتوگۆیە نەبوو. هێشتا خۆپیشاندانەکان بە تەواوەتی کۆتاییان پێ نەهێندرابوو. لەگەڵ هێرۆ، دلێری سەید مەجید و بەندە (٢٠١١/٢/٢٥)، بەرەسمی سەردانی ماڵی رێکخەری بزوتنەوەی گۆڕانمان کرد. لە

گۆڕان: نەوشیروان، قادری حاجی عەلی و عوسمانی حاجی مەحمود. سەردانەکە بەهۆی هەڵوێستی یەکێتییەوە کە ڕێگەمان نەدا، هێزی پارتی بێنە سەر گۆڕان، لە کەشێکی نیمچە دۆستانەدا، بەڕێچوو. ئەمەش لەبەر سیاسەتی گۆڕانەوە دژی یەکێتی، ئاسان نەبوو. لە ڕووی دەروونیەوە ئاڵۆزابوین. لەگەڵ ئەوەشدا، بەرژەوەندی کورد و سلێمانی و دەڤەری سەوز، کۆبونەوەکەی کردە پێویستیەکی قۆناغەکە؛ گۆڕان لەوپەڕی توندیدا بون دژی پارتی و حکومەت، ئێمەش هەوڵمان دەدا، چارەسەری گشتی بۆ دۆخی کوردستان بدۆزینەوە. لە قۆزتنەوەی هەڵوێستی گۆڕان، لە بەرژەوەندی یەکێتی هەلپەرست نەبوین.

ئەم کۆبونەوەیە، بەستەڵەکی نێوان یەکێتی و گۆڕانی تواندەوە. ئەنجامەکەشی بە پۆزەتیڤ شکایەوە. ئیتر، لەناو گۆڕاندا ڕەوتی دۆستایەتی یەکێتی بەهێزتر بوو. سەرەنجام، توانرا یەکەمین دیداری گۆڕان – یەکێتی، لەدەباشان بەئامادەبونی مام جەلال – نەوشیروان، ڕێکبخەین (٢٠١٢/٩/٢٤). ئەم دیدارەش، گرنگتر بوو لەدیداری یەکەم، هەم لەبەرئەوەی مام جەلال ئامادە بوو، هەم لێکتێگەیشتنی دەباشانیش گەڵاڵە کرا.

لەم دیدارەدا گۆڕان (نەوشیروان، قادری حاجی عەلی، سالار عەزیز، سەفینی مەلا قەرە)، ئامادە بوون. یەکێتی (مام، کۆسرەت ڕەسول، هێرۆ، مەلا بەختیار، ئازاد جوندیانی و دلێری سەید مەجید) بۆ لێکتێگەیشتنەکە گۆڕان ڕەشنوسیان ئامادەکردبوو. ناوەڕۆکەکەی دژایەتی پارتی بوو. مام جەلال گوتی: کاک نەوشیروان، ئێمە دەمانەوێ لەنێوان ئێوەو پارتیش ناوبژی بکەین. نەک ئێمەش لەگەڵیاندا تێکبچین. چونکە یەکێتی و پارتی تێکبچن، کوردستان تێکدەچێ. خەریکبوو، دانشتنەکە ئاڵۆز ببێ، بەڵام بەهێمنی چارەسەر دۆزرایەوە.

ئەم دیدارەی لوتکە، متمانەی لەنێوان هەردوولادا، باشتر گێڕایەوە. بەڵام پارتی نیگەران بوو. ناهەقیش بوون. چونکە یەکێتی بەهیچ مەرامێکی سیاسی دژی پارتی، کۆبونەوەکانی نەدەکرد!

لەم دیدارەوە، ئیتر پەیوەندی یەکێتی و گۆڕان، پەرەیسەند بۆ ڕێکەوتنی خۆجێی و سەرەنجام بۆ ڕێکەوتنی سیاسی سەرانسەریش!

ڕێکەوتنە سەرانسەریەکە، دوای چەندین کۆبونەوە، گەڵاڵەی (١٩) خاڵی ساغکرایەوە. مەکتەبی سیاسی پەسەندی کرد.

پاش نیوەڕۆی ڕۆژی پێنج شەممە، (١٢\٥)ی (٢٠١٦)، لەشاری ڕانیە، ساڵیادی شەهیدی فەرماندە سەلاح دیلمانیو هاوڕێکانی، کرایەوە. لەوێدا لەسەر ڕێکەوتنەکە وتارم هەبوو. دەقی هەواڵی وتارەکە، بەمشێوەیەی خوارەوە بوو:

لەمەراسیمەکەدا، مەلا بەختیار لێپرسراوی دەستەی کارگێڕی مەکتەبی سیاسی، بەئامادەبوونی ساڵح موسلیم، هاوسەرۆکی پارتی یەکێتی دیموکراتی (پەیەدە)، بەناوی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە، وتەیەکی پێشکەشکردو، تیایدا مێژووی یەکێتی و قوربانیی و خەباتی پڕ سەروەری، وەک شانازییەک گێڕایەوەو وتیشی: سەیرم لێدێت هەندێک دێنە پشتی مایکو لەسەر فەرماندەکان قسە دەکەن، کە هیچ لەبارەیانەوە نازانن. مەلا بەختیار، یەکڕیزیی‌و یەکێتی ناو یەکێتی بەپیرۆز ناوبردو، تەئکیدی کردەوە: دەبێت هەمووان لە ئاست بەرپرسیاری‌و ئەو ئەرکەدا بین کە شەهیدەکانمان بۆ ئێمەیان بەجێهێشتووە.

مەلا بەختیار، لەوتەکەیدا بەبایەخەوە جەختی لە ڕێککەوتنی یەکێتی‌و گۆڕان کردەوەو، وتی: ئێمە ڕێککەوتن لەگەڵ لایەک ناکەین دژی لایەکی ترو، پلانیش لە دژی هیچ لایەک ناگێڕین، ئێمە تەنهاو تەنها پلان لە دژی دوژمنانی کورد دەگێڕین و وتی:

ئێمە ئەرکمان قورسە، مێژوومان، ویژدانمان، شەهیدەکانمان، ئۆباڵی ئەستوی سەرشانمانن، بۆیە ناتوانین وەک خەڵکی تر سیاسەت بکەین! ناتوانین سەنگەر چۆڵ بکەین! ناتوانین لەبەر کێشەکان واز لەم حکومەتە و واز لەم پەرلەمانە و چارەسەرکردنی کێشەکان بهێنین! بەڵکو وەزیفەو ئەرکمانە کێشەکان چارەسەر بکەین و بە بەردەوامیش بەشێک بین لەچارەسەر. چارەسەری ڕاستەقینە لەسەر بنەمای یاسایەک و دەستورێک و پێکەوە هەڵکردنی حزبەکانیش کە بگونجێ لەگەڵ ئەم سەردەمە.

بۆیە ئێستا کە خۆشبەختانە ئێمەی یەکێتی گفتوگۆ لەگەڵ گۆڕان دەکەین، گفتوگۆکەمان بۆ ئەوە نییە بڵێین: دوای ئەم گفتوگۆیەو دوای ئەم ڕێککەوتنە، ئیتر ئێمە بێ منەت دەبین لەڕاپەراندنی ئەرکەکانمان! نەخێر ئێمە دەمانەوێ هەر ڕێککەوتنێک دەکەین، ڕێککەوتنەکە تەوزیف بکەین بۆ چارەسەری ئاشتی گشتی لەکوردستاندا. چونکە ڕێککەوتنەکەمان پیلانگێری نییە لەسەر هیچ کەسێک و ناچاریش نین بەرتیل بە هیچ کەسێک بدەین و سیاسی خۆشمان، خۆمان دایدەڕێژین! سیاسەتی یەکێتی خۆمان بڕیاری لێدەدەین. ئێمەی یەکێتیش ڕێککەوتنمان هەمیشە بۆ ئەوەیە، ئاشتبونەوەی گشتی دروست بکەین. هەموو لایەکیش بۆی دەردەکەوێت کە یەکێتی، قەت لەگەڵ ڕێککەوتنێک، نزیککەوتنەوەیەک، ئاشکرا یان نهێنی نابین بۆ پیلانگێڕان! پیلان لەکێ بگێڕین؟ هەر لایەکمان بەشی خۆی، مافی ڕەوای خۆی لەم کوردستانە هەیە. پیلان لە دوژمنان، لە داگیرکەران دەگێڕین، بەڵام پیلان لەناو خۆماندا، نە لەرابردوودا هیچ لایەک توانیویێتی بە پیلانگێڕان سەربکەوێت، نە لەئێستاشدا دەتوانێت بە پیلان سەربکەوێت و یەکێتیش ناتوانێ بەپیلانگێڕان سەربکەوێت.

یەکێتی، گفتوگۆیەکی سروشتی دیموکراسیمان هەیە، دەمانەوێ ڕێککەوتنێکی سیاسیمان هەبێ و ئەم ڕێککەوتنەش بەقۆناغ بخەینە خزمەتی چارەسەرکردنی گشتی. ئومێدەوارین، هەموولایەک، لەدەوروبەرمان، لەناوخۆماندا، لە عیراقدا، بەو شێوەیە سەیری ئەو گفتوگۆیە بکەن.

یەکێتی، نە بەرتیل دەدەین و نە لەهیچ لایەکیش دەترسین! نەبێ منەتیشین بەرامبەر بەهیچ لایەک و نە بەنیازیشین پەیوەندییەکی مێژوویی کە لەم شۆڕشەدا بۆ ئێمە و لایەنەکانیش دروست بووە، بەهۆی گفتوگۆیەکەوە لەگەڵ گۆڕان فەرامۆشی بکەین! یان بەهۆی پەیوەندییەکەوە کە لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان هەمانە، گفتوگۆی دیکە فەرامۆش بکەین. سیاسەتی هاوسەنگی، جەنابی مام جەلال، لە عیراق، کوردستان، ناوچەکەو لە جیهانیشدا وای فێکردووین و بڕیاری سەربەخۆی حزبەکەشمان هەروا دەدرێت و هەرواش بەردەوام دەبێت، بۆیە ئومێدەوارین، کۆی کارەکان لەقازانجی چارەسەرکردنی کۆی کێشەکان بێت[1].

ئەوە هەڵوێستمان بوو بەرامبەر بە گرنگی ڕێکەوتنەکە..

بەڵام دوو ڕۆژ پێش کۆبونەوەی سەرکردایەتی (٦) خاڵی تر خرابووە سەر ڕێکەوتنەکە، بەبێ ئەوەی لەمەکتەبی سیاسی باسکرا بێ. هەروەکو نەوشیروان لەدیداری من و دلێری سەید مەجیدا گوتی: لەسەر داوای وەفدی یەکێتی ئەو خاڵانە زیاد کراون. واش بوو. ئەو خاڵانەش نێوان یەکێتی و پارتیشی تەواو تێکدەدا. واتا: ئەو هەوڵەی گۆڕان لە دیداری دەباشاندا دای، مام جەلال قبوڵی نەکرد. وەفدی یەکێتی، بەئاسانی ئەنجامیانداو بەمەش، ڕێکەوتننامەی ستراتیژی نێوان یەکێتی – پارتی، بەتەواوەتی نێژرا.

پارتی، لەسەر لێکتێکەیشتنی دەباشان ناهەقی بوو نیگەران بێ. بەڵام لەسەر ئەم ڕێکەوتنە هەقی بوو، مەترسی لەسەر پەیوەندی خۆیان و یەکێتی و دۆخی کوردستانیش هەبێ.

لەکۆبونەوەی سەرکردایەتی دا، هەوڵی زۆرماندا، ڕێکەوتنەکە کاتێکی زۆرتری بدرێتێ بۆ گفتوگۆ. بەڵام مەخابن، تەکەتولەکانی ناو یەکێتی، هەر لایەکیان بەمەرامێک، لەناو یەکێتی و دەرەوەی یەکێتی دا، ڕێکەوتنەکەیان تێپەڕاند.

چەند بەشێکی دەڤەری سەوز، بە ڕێکەوتنەکە دڵخۆش بوون. دەڤەری زەرد، دوو بەرامبەر نیگەران بوون. دۆخەکە، گەیشتە مەترسی دووبارەبونەوەی دوو ئیدارەیی. لەم کاتەدا، کۆبونەوەیەکی دوو قوڵی لەنێوان یەکێتی – پارتی لەماڵی نێچیرڤان بارزانی ئەنجامدرا. لەیەکێتی:

---

[1] بڕوانە کوردستانی نوێ، ژمارە (٦٩٧١) ٢٠١٦/٥/١٥

١-کۆسرەت رەسول عەلی ٢- عومەر فەتاح ٣- حاکم قادر ٤- رزگار عەلی ٥-ئەرسەلان بایز ٦-مەلا بەختیار ٧- سەعدی پیرە.

پارتی: ١-نێچیرڤان بارزانی ٢- فازل میرانی ٣- مەحمود محەمەد ٤-ئازاد بەرواری ٥-فوئاد حسێن ٦- دڵشاد شیهاب.

کۆبونەوەیەکی پڕاوپڕ لە حەساسیەت، ئاڵۆزی، نیگەرانی و کاردانەوە بوو. وەفدی پارتی، لەوپەڕی دردۆنگیدا بوون. وەفدی یەکێتی وا ڕێکەوتبوین کە: ئەرسەلان بایز و مەلا بەختیار قسە نەکەین. چونکە لە بنچینەدا ڕێکەوتنی گۆڕان – یەکێتی، بە زیادکردنی (٦) خاڵەکەمان پێ خراپ بوو. گوتمان: ئەوانە قسە بکەن، کە وردەکاری ڕێکەوتنەکەیان پەسەند کردبوو:

- کۆسرەت رەسوڵ کۆبونەوەکەی کردەوە.
- حاکم قادر، کەمێک لەسەر ناوەرۆکی ڕێکەوتنەکە دوا.
- نێچیرڤان بارزانی، بە نیگەرانیەوە، ڕێکەوتنەکەی بەرز کردەوەو گوتی:

پێویست ناکات بۆمان رون بکەنەوە. فەقەرە بەفەقەرەمان دراسە کردووە. ئەمە موئامەرەیە لەسەر پارتی. نەک لە هەولێر بەڵکو لە سلێمانیش، دژایەتی دەکەین و لێتان قبوڵ ناکەین. هەرچیەکمان لەدەست بێت، دژتان دەیکەین. یەکێتی، هەروەکو پارتی هاوپەیمانی ستراتیژیمان لەگەڵتان نەبێ، ڕێکەوتنی وا لەگەڵ گۆڕان دەکەن. هیچ نەبێ، پێش ڕاگەیاندنی، کۆبونەوەتان لەگەڵماندا بکردایە..

کۆبونەوەکە.. کەشێکی لێکترازان زاڵ بوو بەسەریا. لەو قسانەی نێچیرڤان بارزانی، دەردەکەوت، پارتی کاردانەوەی سیاسیان دەبێ. وام هەست کرد، پارتی دەرسی لە مێژووی کێشەی نێوان یەکێتی و پارتی وەرنەگرتووە. دەشیانەوێ بێباکانە بڕیار بدەن و بڕیارەکەشیان لەسەر بنەمای کاردانەوەی سیاسییە، نەک لێکدانەوەی هەمەلایەنەی لۆژیکی! ناچار سەرەڕای ئەوەی بڕیار بوو، قسە نەکەم.. قسەم کردو گوتم:

ئێمە ڕێکەوتوین، ئێوەش ئازادن چۆنی لێکدەدەنەوە. ئێستاش بۆ رونکردنەوەی ڕێکەوتنامەکەو دڵنیاکردنتان هاتوین کە بۆ دژایەتی ئێوە نییە.

نێچیرڤان پێی بڕیم و گوتی: نەخێر بۆ دوژمنایەتی ئێمەیە!

وەڵامم دایەوە کە:

چۆنی لێکدەدەیتەوە ئازادیت. بەڵام قبوڵی ناکەین بەوشێوەیە قسە دەکەیت. جەنابت شوارز کۆف نیت و ماڵەکەشت چادرەکەی سەفوانی کوییتی نییە.. ئێمەش وەزیری بەرگری عێراق نین هاتبین ئاڵای سپیتان بۆ بەرز بکەینەوە. ئەگەر ئەوە بڕیارتانە کە رونتکردەوە،

دڵنیابە، ئێوە کارتێکتان هەیە، ئێمە دوو کارتمان بەرامبەرتان هەیە. یەکتریشمان لە شەڕ و ئاشتی دا تاقیکردۆتەوە. بەو زمانە قسە مەکە لەگەڵ یەکێتی.

گوتیشم: ئێمە ناچینە هیچ پیلانێکەوە دژتان. سیاسەتی حوکمڕانیمان، پەرلەمان، هێزی پێشمەرگەمان، پەیوەندی نێودەوڵەتی و ئیقلیمی و عیراقیمان لەگەڵتاندا یەکە. ناکۆکیشمان هەیە لەگەڵتاندا. پێمانخۆشە ئێوەش لەگەڵ گۆڕان گفتوگۆ بکەن.. ڕێکیش بکەون. گوتی:

- بەهیچ شێوەیەک لەگەڵ گۆڕان ڕێک ناکەوین. بەڵام مادام دەڵێن، لە حکومەت و پەرلەمان و لەناو پێشمەرگەو سیاسەتی حوکمڕانی، لەگەڵ پارتی دەمێننەوە، ئەمەمان پێخۆشە.. فەرموون با لەسەر ئەم خاڵانە قسە بکەین.

ئیتر.. کۆبونەوەکە ئارام بویەوە، پارتی باشتر لە سیاسەتی یەکێتی تێگەیشتن، یەکێتیش تێگەیشتن، دۆخەکە لە مەترسیدایە و دەبێ بیرێکی قووڵتر لە پەیوەندی یەکێتی – پارتی بکرێتەوە.

لەدوای ئەم کۆبونەوەیە، ئەو سیاسەتە بۆ یەکێتی هاتە پێش کە:

نە لەگەڵ پارتی بین دژی گۆڕان، نە لەگەڵ گۆڕانیش بین دژی پارتی. بەڵکو بەشێک بین لە چارەسەری سیاسی نێوانیان *.

لەو هەلومەرجەدا، هەوڵم دا، چاوەڕوان بم و بزانم، ڕێکەوتنەکەی یەکێتی – گۆڕان چەندی جێبەجێ دەکرێ. بچوکترین کۆسپیشم بۆ ڕێکەوتنەکە دروست نەدەکرد. بەڵام وردە وردە ڕێکەوتنەکە، لەبەردەم دۆخی سیاسی عێراق و کوردستاندا، گیری خوارد. گۆڕانیش بەردەوام، هەڵمەتی ڕاگەیاندنی دەبردە سەر یەکێتی. ڕیزی یەکێتی زیاتر شێوا. تەراتێن لەنێوان سەرکردایەتی گۆڕان و بەشێکی سەرکردەکانی یەکێتیش، پەرەیسەند. گەیشتە کەین و بەینی ژێر بەژێریش.

ئەو سیاسەتە، ژێر بەژێر و لەناو یەکێتیدا، ڕەنگێکی نالەباری ڕشت. هەتا سەرهەڵدانی ناوەندی بڕیاریش، بەردەوام بوو. بەبێ ئەوەی نە گۆڕان و نە ئەوانەی ناو یەکێتی، لە توانایاندا بێ، بەو سیاسەتانە هاوکێشەکان بگۆڕن **، لەدوا سەرەنجامیشدا، یەکێتی و گۆڕانیش، هاتنە سەر هەمان سیاسەت، کە لە دەباشاندا، پێیان گوترا: وا چاکە یەکێتی و پارتی و گۆڕان، ڕێک بکەوین و پێکەوە حوکمڕانی کوردستان بکەین! بەڵام

* کە کۆبونەوەکە تەواو بوو. چەندین ئەندامی وەفدەکە، سوپاسیان کردم لەسەر قسەکانم و دۆزینەوەی چارەسەری کێشەکان. بەڵام دەشمبیستەوە، لە کۆبونەوەی لابەلا، هەلپەرستانە قسەیان دەکرد!!.

** ئاسۆی فەرەیدون عەلی ئەمین (پاریزگاری پێشووی سلێمانی) لەگەڵ دوو هاوڕێی، لە لەندەن سەردانی نەوشیروان مستەفای کردبوو. نەخۆش بوو. باسی ڕێکەوتنەکە هاتبووە پێش. نەوشیروان گوتبووی: تەنها مەلا بەختیار لەبەرامبەرماندا ڕاستگۆبوو. ئەوانی تر ڕاستیان لەگەڵ نەکردین!

بەداخەوە، دوای ئەوەی زەمینەی متمانەیەکی پتەوی سیاسی، تێکدرا. ئاسەوارەکانی تائێستاش ماوە. بەقورسیشی دەزانم، ئەو متمانەیە، کوت و مت، لە نێوان یەکێتی و پارتی دا، بگەڕێتەوە!

## (١٧)
## دوا دیداری نەوشیروان

مێژوویەکی دژوار، نەوشیروان و بەندە کودەکاتەوە. هەمیشە، کۆک و ناکۆک بوین. لە ژیانی سیاسی و پێشمەرگایەتیدا، بە بیرمانایەت ئەرکێکی، پێسپاردبم، سەرەڕای ناکۆکییەکان، جێبەجێم نەکردبێ. سوور دەمزانی، لە کۆنفرانسەکان و هەندێک کۆبونەوەدا، پیلانی لێگێڕاوم، بەلام، دۆخی شۆڕشەکەو شەڕی ناوخۆو کێشەکان، هاوکات پەرۆشیم بۆ یەکڕیزی کۆمەڵە، وای لێدەکردم، هەوڵبدەم جۆرێک لە پەیوەندی شیاو، لە نێوانماندا بمێنێ. تەنانەت، هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەی نەوشیروان و چەندین هاوڕێی تریشم داوە. لە هەموو ژیانی سیاسیشمدا، نە لە کۆنفرانسەکان و نە لە کۆبونەوەکانیشدا، داوایەکی تایبەتیشم لێ نەکردووە؛ هەرگیز بۆ هیچ پلەو پایەیەکیش رووم لێ نەناوە. لەناو خەڵک و لایەنەکاندا، ئەوەندەی توانیومە، رێزیم پاراستووە. بە بەرپرسیاری خۆشم زانیووە. دڵنیام بووم لە دوەمین کۆنفرانسدا، دژم بووە. هەر دەنگیشم داوەتێ. لە کاتی دەنگداندا، هەستم کردبوو، دەویسترێ نێوانم لەگەڵ نەوشیروان تێک بدرێ. لە پشتی کارتەکەم بە بچووکی تەوقیعم کرد. هەتا ئەگەر کێشە نرایەوە، بزانرێ کارتی منە. کە دەنگدان تەتەڵە کرا. کەسێک بە نەوشیروانی گوتبوو، مەلابەختیار دەنگی پێ نەداوی. نەوشیروان-یش سکاڵای بردبووە لای مام جەلال. مامیش تەلەفۆنی بۆ کردم و گوتی: لەو باوەڕەدا نەبووم دەنگ بە کاکە نەوە نەدەیت. منیش وتم چۆن دەزانی؟ وتی: نەوشیروان گوتویەتی، سەرپەرشتیارانی سندوقی دەنگدانەکە، کارتەکەی مەلا بەختیاریان دیووە، دەنگت پێ نەداوە. منیش گوتم: ئەمر بکە کارتەکانت بۆ بێنن و لە پشتی کارتەکەم، تەوقیعم کردووە، بزانە دەنگم پێداوە یان نەداوە؟ کارتەکانیان بۆ هێنابوو، کارتەکەمی بە تەوقیعکراوی دیبوو، کە دەنگم بە نەشیروان دابوو. منیش پێم داگرت، دەبێ ناوی ئەوکەسەم پێ بگوترێ.

نەوشیروان گوتبووی: کەسەکە وەکو ژن عوزری پیا دێت. ناوەکەی نالێم، چونکە مەلا بەختیار.. دەیشکێنێ. ئەو کەسە لە تەکەتولی سجن بوو.. ماویشە.. ناوی نابەم!

هەڵپەرستی.. لەو کاتەوە، لەناو کۆمەڵەو یەکێتیدا، بەو ڕادەیە، خەریکی کنەکردن بوون. بەردەوامیشە!! بەڵام لە بەرامبەردا، بۆ یەکجاریش هەستم نەکردووە، دەرونی نەوشیروان، بەرامبەرم، یان بەرامبەر هاوڕێیانی ترم، لە رق و دژایەتی پاک بوو بێتەوە. لە سێهەم کۆنگرەدا بە تەواوەتی پیلانی شکاندنم دەرکەوت. سەرەڕاش، درێژەم بە پەیوەندیەکانم لە گەڵیدا.

ئەوەی لای من، زامێکی قووڵی دروستکرد. ئەوەیە کە: هەتا توانیم بەرامبەر کێشەکان پشووم درێژ کرد. هەر دەشم ویست، کێشەکانمان لەگەڵ یەکێتیدا نەگاتە بنبەستی جیابوونەوە. بەڵام نەوشیروان، تەنانەت پەنجەرەیەکی چارەسەری کێشەکانیشی نەدەهێشتەوە. هەمووی دادەخست.

لە وەڵامدانەوەی رەخنەکاندا، ئاوڕم لە گەڵێ کێشە داوەتەوە، ناچمە سەریان. لێرەدا، بۆ مێژوو، لام گرنگە دوا دیدار لەگەڵ نەوشیرواندا، پێش کۆچی دوایی بە دوو مانگ باسبکەم.

کە بە نەخۆشی گەڕایەوە، زۆربەی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی یەکێتی سەردانیان کرد. سەردانەکە، لێکدانەوەی جۆراو جۆری بۆ کرا؛ لە رووی کۆمەڵایەتییەوە، بە باشە کەوتەوە.. رێز لەسەرکردەیەک گیرا مێژووی لەناو یەکێتی و شۆڕش بوو. بە حوکمی ئەوەی لە ناو یەکێتیدا ناکۆکی و دەستەگەری قووڵکرابوو، تاڕادەیەک، نا ئومێدی لە چارەسەرکردنی کێشەکان، سەریهەڵدابوو. ئەوکاتە، نەوشیروان و گۆڕان، چاوەڕوان بوون، ناکۆکیەکانی هەناوی یەکێتی، جارێکی تریش بتەقنەوە، لەرووی سیاسییەوە بە خراپ لێک دەدرایەوە.

چەند سەرکردەیەک، لە داخی نەبوونی ئیرادەی مەرکەزیەت و بێسەروبەری، داوایان لە نەوشیروان کردبوو، بیر لە چارەسەری کێشەکانی گۆڕان و یەکێتی بکاتەوەو ببێتەوە بە پەرپرسی یەکێتی. ئەویش زانیبووی، دۆخی یەکێتی دژوارە، نە دۆخی یەکێتی و نە دۆخی گۆڕانیش، هی یەکخستنەوە نییە، بۆیە گفتی نەدابوو.

لەو پۆل پۆل رۆشتنەی سەرکردەکاندا، خۆم دوور راگرت. دەشم ویست لە هەلێکدا سەری بدەم، لێکدانەوەی خراپی بۆ نەکرێ؛ نەوشیروان گلەیی کردبوو، کە هەموو سەرکردایەتی یەکێتی سەردانیان داوە، تەنها مەلا بەختیار سەری نەداوم، ئەمە کەی دڵی لە من چاک دەبێتەوە. کە ئەمەم بیست، سەردانەکەم رێکخست. تەکلیفم لە دلێری سەید مەجید کرد. سەرێکی بدەو کاتێک دیاری بکات، سەری بدەین. بەڵام نە کامێرە وێنەمان بگرێ و نە کەسیش لە سەرکردەکانی گۆڕان لەگەڵماندا دانیشن، دلێر گوتی: بۆ؟

وتم: وێنە ناگرم، هەتا بڵاوی نەکەنەوەو بڵێن: مەلا بەختیاریش لای نەوشیروان خۆی پاک کردەوە. چونکە گومانم لە پاکی خۆم نییە. ناشمەوێ کەس لە گەڵماندا دانیشێ، لەبەرئەوەی ئەمەوێ قسەی دڵی خۆمی لەگەڵ باسبکەم و نامەوێ لەبەر چاوی کەسی تر، ئەو قسانەم لە گەڵیدا بکەم!

پێش دوا سەفەری بۆ لەندەن، سەرمان لێدا. بەهادینی ئەحەی کەلانی لێ بوو، ویستی وێنەمان بگرێ. وتم: مەیگرە.. دانیشتنێکی ئاساییە.. رەسمی نییە!

دانیشتنەکەمان.. هەروەکو، دوا دیدار هاتە بەرچاوم. ئاشکرا دیار بوو، تەندروستی خراپە. بۆیە، لە قسەکانمدا، سۆزو سیاسەت و رێزم ئاوێتە دەکرد... دەتوانم بڵێم:

دوا دیدارمان بوو، بەڵام هەستم کرد یەکەمین جارە، وەکو دوو هاورێی راستگۆ قسە دەکەین؛ لە ویژدانی خۆمدا.. هەستم نەدەکرد، کێشەکانی کۆن لە بیرکردنەوەمدا، بەرامبەری ماوە. ئازارەکانم بیر چونەوە.. چونکە دڵنیابووم.. تەندروستی خراپتر دەبێ.

بەو رۆحیەتەو بەو راستگۆیەتیە، کەوتمە قسە، ئەویش بەجوانی گوێی دەگرت و بۆچوونی خۆی دەر دەبڕی. بۆ مێژوو.. گرنگە! ئەو دوا دیدارە.. هێندەی لە بیرمە، بنووسم:

ساڵی ١٩٩٥ لەگەڵ رزگاری حاجی کایل، لە گردەکەی سەرچنار، سەردانی کردم. وتی: هاتنەکەم بۆ ئەوەیە ببوری و ئێمە برای یەکین.

سوپاسم کرد. کەچی کاتێک دوو سەیارەیان پیا تەقانمەوە. تەلەفونیشی هەڵنەگرت هەواڵێکم بپرسێ!!

وتم: دۆخی کوردستان خراپە. نێوان گۆڕان و پارتی، زۆر خراپە. کاتی خۆی لە دوو کۆبونەوە، یەکێکیان لە ماڵی مام جەلال و ئەوی تر لە بارەگای خۆت، دەم گوت: پارتی لە پارلەمان و حکومەت دەرتان دەکات. ئێوە باوەڕتان نە دەکرد. کە دەریش کران، هەموو توانامان خستە کار، نێوانتان خۆش بکەین.

وتی: راستە.. وایە.

وتم: ئەم سیاسەتەی گۆڕان، بەقووڵکردنەوەی کێشەکان لەگەڵ پارتی، بە سودی پارتی دەشکێتەوە.

وتی: ئەی تەسلیم ببینە پارتی؟

وتم: نەخێر.

وتی: ئەی چی بکەین؟

وتم: سیاسەتتان بگۆڕن.. یارمەتیتان بدەین لەگەڵ پارتی ڕێک بکەون.. هەر سێ لامان، بەرپرسیارێتی حکومەت هەڵبگرین. چونکە، هەر سێ لامان مێژووی خەباتی هاوبەشمان هەیەو ئاراستەکەشمان دیموکراسی- عەلمانییە.

وتی: لەگەڵ پارتی سودی نییە.

وتم: دڵنیام لە دوا ئەنجامدا، دەبێ ڕێک بکەونەوە.

وتی: ناکرێ!

وتم: کە لە یەکێتی جیابونەوە، دەتان وت: هەرگیز لە گەڵیاندا ڕێک ناکەوین و پارتیش لاواز دەکەین. کەچی لەگەڵ یەکێتی ڕێکەوتن و پارتی ئێوەی لاواز کرد.

وتی: مام جەلال.. نەی دەویست، ئەگینا پێکەوە پارتیمان دەشکاند.

وتم: چی ما دژی مام جەلال و یەکێتی نەیکەیت؟

وتی: ئێمە هەر دەم و قەڵەممان هەیە، قابیلە بەکاری نەهێنین؟!

وتم: کاک نەوشیروان.. ١٩٦٤ جەلالییەکان بەرامبەر پارتی شکان. ١٩٦٦ دیسان شکان. ١٩٧٠، کۆتایی بە جەلالیەکان هات. ١٩٧٦-١٩٧٧-١٩٧٨، پارتی یەک لە دوای یەک گورزی کوشندەی لە یەکێتی وەشاند. مفاوەزات سەری نەگرت. ناچار لەگەڵ پارتی بەرەی کوردستانیتان مۆر کرد- ١٩٩٤ شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسایەوە. ١٩٩٦ ٣١ی ئاب/ قەوما و یەکێتی شکا. ١٩٩٧ تورکیایان هێناو یەکێتیان شکاند.

وتم: تاقە سەرکەوتن کە جەنابت بە دەستتهێناوە، شەڕی قرناقاو پشتئاشان بووە، کەچی قەت شانازیشی پێوە ناکەین.

دوای جیابوونەوەی گۆڕان.. سەرەڕای ١٧/ی شوبات، هەر لەگەڵ پارتی ڕێکەوتیت و کۆنفرانسەکەشت بردە هەولێر. مانگی یەک دوو جاریش سەردانی مەسعود بارزانیت دەکرد. ئەمجارەش، با پێکەوە ڕێک بکەوین..هەلەکە لەدەستی مەدە!

وتی: دەتەوێ تەسلیم، ببمە مەسعود بارزانی؟

وتم: نەخێر.. دەمەوێ ڕێک بکەوین. کاتی خۆی لە کۆبونەوەی سێ قۆڵی (پارتی- گۆڕان- یەکێتی).. لە هەولێر، بە قادری حاجی عەلی و د. یوسفیشم وت. باسی قۆڵی ڕێکەوتنی ستراتیژی بکەین. ئێستاش دەیڵێم.

وتی: نا یکەم.

وتم: ئەی باشە.. بۆچی سەرکردەیەکی بە ئەزموونت نەکردە سەرۆکی پارلەمان؟

وتی: نەیان دەکرد.

وتم: مستەفای سەید قادر بۆ وەزارەتی پێشمەرگە قبوڵ دەکات.. سەرۆکی پارلەمان قبوڵ ناکات؟

وتی: ئیتر وایە.

وتم: ئاخر بۆیە پارتی بە ئاسانی بڕیاریدا، سەرۆکی پەرلەمانەکەتان و فراکسیۆنەکەتان و ، وەزیرەکانیشتان دەر بکات. چونکە کەسانی شایستەت دانە نا.

وتی: ئەو پارلەمانەو حکومەتە هەر ئەوەیان قابیلە!!

لە کۆتاییدا.. بابەتەکەم گۆڕی و گوتم:

-لەگەڵ پارتی نایکەی.. فەرموون، بچینە دەرەوەو کۆنگرەی ڕۆژنامەگەری بکەین و رایبگەیەنین، یەکێتی و گۆڕان..یەک دەگرینەوە. با دوای شەش مانگیش ڕێکەوتنەکە مۆر بکەین.. زەمینەی خۆش دەکەین.

وتی: کاتی نییە.. گۆڕان ئێستا ئامادە نییە بڕیاری وا بدات.

وتم: کاک نەشیروان.. هەلێکی باشبوو، یەکێک لەو پێشنیازانە قبوڵ بکەیت. بەداخەوە قبوڵت نەکرد! وای دەبینم.. ئەم هەلەشت لە دەستدا، جەنابیشت نەخۆشی!

کورتیەکەی.. ئیتر دڵم نەهات پێی بڵێم.. فریای چارەسەری کێشەکان ناکەوی.. بەڵام تێ گەیشت، مەبەستم ئەوەیە. کە هاتینە دەرەوە، دلێری سەید مەجید گوتی: بەسەراحەت قسەت لەگەڵ کرد. وتم.. خۆ تێم گەیاند کە لە کۆتایی تەمەنیا.. هەلی سەرکەوتنی گەورەی نەماوە! دلێر وتی: بەڵێ قسەکانت ئەوەی دەگەیاند.

ئەوەتانێ، دوای کۆچی دوایی ڕێکخەری گشتی گۆڕان، بزووتنەوەی گۆڕان، پێش یەکێتیش لەگەڵ پارتیدا ڕێکەوتن.

دڵنیام خۆیشی بمایە، هەمان بڕیاری دەدا. چونکە، سەرکردەیەک بوو، قەیرانە سیاسیەکانی قووڵ دەخوێندەوە.

دەمێنێتەوە بڵێم: ڕەنگە هەبێ بڵێ، بەشێکی ئەم کتێبە، ڕەخنە بوو لە مام جەلال و نەوشیروان، ئەی بۆ هەتا خۆیان زیندوو بوون، ئەم کتێبەت نەدەنووسی. لەوەڵامیاندا دەڵێم:

لە ژیانی هەردوو رابەردا، ڕەخنەو هەڵوێستم هەبووە. بەشێکی لە کتێبەکەدا ئاماژەم پێکردوون. لە کۆبونەوەکانیشدا، کەمجار بۆچوونی خۆم بەرامبەریان شاردۆتەوە. وتارو کۆڕەکانیشم ماوون، کە لە بوونی هەردوکیاندا، ڕەخنەی خۆشم گرتووەو هەڵوێستی راشکاویشم دەربڕیووە!

ڕۆحی هەردووکیان شاد .. تۆ بڵێی هاوڕێ و کەسوکاریان، دەرسیان لێ وەربگرن..؟!

ئەم کتێبە، کۆ وەڵامی بەشێکی ئەو ڕەخنانەن، لە سێ دەهەی ڕابوردودا، لە نوسینی بیرەوەریەکانو چاوپێکەوتنەکاندا، باسکراوون. لە زۆربەشیاندا، باسی کۆمیتەی هەرێمەکانو ئاڵای شۆڕشو بەندە کراوە. پشووم درێژ کرد. خۆم ڕاگرت. کۆرۆنا، هەلی بۆ ڕەخساندم، ڕەخنەکانم لە خەم برەخسێنم. بەناو نوسەرو یاداشت نوسی تر هەبون، باسیان کردوم. نوسینەکانیانم، بە شایەنی وەڵامدانەوە نەزانی! لە دووتوێی ئەم وەڵامانەدا، وەڵامەکان ڕەخنەو گێڕانەوەکانی ئەوانیش دەگرێتەوە.

دەمێنێتەوە بڵێم: "لەبری بیرەوەری" بیرەوەریەکانی من نین. تەمەن یار بێ.. بیرەوەریەکانیشم دەنوسم.

**٣٠/ی حوزەیرانی ٢٠٢٠**

**مێرگەپان**

# پاشەنگ

**کرۆنۆلۆژیای[1] بەڵگەکان:**

**وتارەکان:**

یەکەم وتاری مەلا بەختیار
دوەم وتاری مەلا بەختیار
سێیەم وتاری مەلا بەختیار

**نامەکان**

یەکەم نامەی زیندان
دووەم نامەی زیندان
سێیەم نامەی زیندان
چوارەم نامەی زیندان
پێنجەم نامەی زیندان
شەشەم نامەی زیندان
حەوتەم نامەی زیندان
هەشتەم نامەی زیندان
نویەم نامەی زیندان
دەیەم نامەی زیندان
بەڵگەنامەی نەوشیروان مستەفا

**نامیلکەکان:**

یەکەم نامیلکەی ئالای شۆرش
دووەم نامیلکەی ئالای شۆرش
سێیەم نامیلکەی ئالای شۆرش
چوارەم بەڵگەی ئالای شۆرش
بەیاننامەی یەکگرتن
یادە وێنە
سەرچاوەکان

---

١ کرۆنۆلۆژیا: زانستی مێژووی ڕووداوەکان یان زانستی زنجیرەی ڕووداوەکان بەپێی کاتی ڕوودانیان.

# وتار

**وتارێک بەناونیشانی «چەند تیشکێک بەسەر هەندێ لایەنی خەباتی کۆمەڵەدا» ٧ فولسکاپی گۆڤارەکەیە، لە ١٩٧٩/١٠/٨ لە گوندی شێنێ دا نوسیومە.**

بۆ ئەم مەبەستە پیرۆزەش ئامێن و پەیوەندیمان بەکورد پەروەرو پێشکەوت و خوازەکانەوە کردو بیروڕامان وەرگرتن ( بێ گومان ئەوانەی کەلەشۆڕش پیسوبا نا و زرا و نەبوون .. میللـــەت فرۆش نەبوون .. هتد ) .

هەرچەندە ئەوکاتە توانایەکی ئەوتۆمان نەبوو ، دەمانزانی کەبەو توانا کەمەی کۆمەڵەمان هەیەتی ، نەتوانرێ دەکری و ئەنجامیش نادری . بەڵام بڕوای تەواومان بەهێزو توانـــای لەبن نەهاتوی گەلەکەمان هەبوو ، بڕوای تەواومان بە پاشەڕۆژی روناکی بزوتنەوەکە هەبـوو .. بڕوای بێ سنورمان بەرێبازی سیاسی و ئایدیولۆژی راست و شۆڕشگێرانەی ( م . ل ) گونجاو لەگەڵ بارودۆخی کوردستان هەبوو .

هەرلەبەر بینینی وردو زانستیانەی ئەو راستیانەش بوو کەباشاتوی ستراتیژی بزوتنەوەی گەلەکەمان سەرکەوت و نەهاتە بەرچاو و هەڵپساندنەوەی شۆڕشمان بەکارێکی ئاسایی و پێویست دەهاتە بەرچـــاو .

بۆیە کەوتینە خۆمان و کەوتینە ئامادەکردن و سازدانی خەڵك بۆشۆڕش و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی ( ی . ن . ك ) و جێگرتنی ( یەکێتی ) وەك پێویستیەکی مێژوویی قوناغی ئێستای خەبـات لەناو جەماوەری شۆڕشگێری گەلەکەمانـــدا ، هێندەگەری خەڵك و یەکگرتنیان لەئێمە بەرەیەکـی وەك ( ی . ن . ك ) دا ، هەرچەکی تری پێویست و بەڵگە نەویست بوون بۆ سەرخستنی شۆڕشە نوێیەکەمـــان .. کۆمەڵەو لەو روانگەیەوە دەیروانیە ( ی . ن . ك ) کەگونجاوترین ( کالا)بەقەد ( پســالا )ی باروشوێنی دوای ئاشبەتاڵی کوردستان .. کۆمەڵە دڵنیا بوو لەوەی کە ئەندوبی ( ی . ن . ك ) گشە دەکا و لەناو جەماوەردا رەگی پتەوی خۆیان بڵاودەکاتەوە ، ئە ( ی . ن . ك ) یش بێ کۆمەڵە نەتوانی پێکەوەی و لای جەماوەر پەسەند بکری و جێگیربـــێ .

ئەمەش پاسایەکی تری تایبەتی کوردستانە کە کۆمەڵە بڕوای پێیەتی و هەر بەو بڕوایشەوە خەبات دەکات و هەمیشە ئاوات لە ئەندامانی خۆی دەکا کەبان لەم مەسەلە تایبەتیە بگـــەن و زیاتر خزمەتی جێگیر بوونی بکەن .

ئەمە جگەلەوەی کە لەبیرۆنە گێتیەکانیشدا ئەوراستیەمان باش دەزانی کەنەك هەر لەکۆمەڵگای فرەیی کوردەواری خۆمانـــدا بەڵکو لە هەموو کۆمەڵگایەکی تری فرەیی دونیادا ، دەســتەو توێژو چینی تیك رای هیچ کۆمەڵگایەك پێبەندی نابن بە ( م . ل ) ، خونەکەری بورژوای پلـــە جیاوازی گەلان لە هەولێك و دوان و .. دەر .. هتـــد سەرپێش دەکەوتین و سەلماندیمتی کـــە تەنها بەپارتی پێشرەوی کریکاران ، رەنجدەران نەبێ گەل رووەو سەرکەوتن نـــاچێ . ئـــەگـــەر پیرسین بۆ ؟ ئەوە لەوەڵاما دەڵێیـــن :

چونکە سەرنەکەوتن و گلانی دەستەو توێژیکی بورژوا، هەرپێدانی یەکجارەکی چینی بورژوا ناگەیەنـــێ ... نیشـــانەوە ، ئەوە ناگەیەنێ کە ئیتر جارێکی تر بورژوا یا چینێکی تری بورژوا نایەتەوە سەرپانوەموڵی ئەوە نادەن کەدووبارە جڵەوپانێکەوێتەوە دەست .

چونکە هەتا کۆمەڵی نابەکراوی سەر چەند چینێك بێ و هەتا خوێن مژین و چەوسانەوەو خاوەنداریەتی تایبەتی و جیاوازی چینایەتی بمێنێ ...

هەتا پرولیتاریو رەنجدەران نەتوانن بەهۆی پارتی پێشرەویانەوە بگەنە ترۆپکـــی سەرکەوتن .. هەتا نەتوانن رەگ و ریشەی خوێن مژینی چینایەتـــی لەبنەوە دەربهێنن .. ئەوا بورژوازیەت هەتا گوزی ( هێز ) تیا مابێ لەهەوڵی خۆی ناکەوێ و دەست لەبەرژەوەندیە چینایەتیەکانی خۆی هەڵناگرێ .. ئەنانەت هەتـــا لەپاش سەرکەوتنی پرولیتاریش عەقلیەت و بیرکردنەوەی وردە بورژوازی هەرنەمێنی و هەمیشەش لەهەوڵی ئەگەڕێن وێرانە روخاوەکانی بورژوازیەتی تیا نۆژەن بکەنەوە تابتوانن کۆمەڵ بیا بەرەو باوەڕی سارو ـــری قوناغی لەدەست چویان بەرنەوە ... ئەم راستیەش وەك راستیەکی تر پێویستە لەبەرچاو بێ و پشتگوێ نەخرێ .

ئەوکاتەی ... ، کەهەموو ... ، وونی یەکێتی نیشتمانی کوردستانمان بە پێویستیەکی مێژوویی دەزانی .. هەربۆیەش بوو کەوزەو توانای تەواوی خۆمان خستە کار هۆوریە ئەندامان و کادرانمان بۆ کاروباری تایبەتی یەکێتی تەرخـــان کـــرد ... لەسەر

وەی بڕوامان بەوەبوو کە هەرکاتێک کۆمەڵێکی ستەم دیدەی چەوساوەی دنیا ڕێبازێکی ڕاستەقینەی ڕزگاربوونی گرتبێتە بەر ، ئەو گەلە هەرگیز دەستەمانی چارەنووسی خۆی ، بارێگا زۆر سەخت و دووریش بووبێ ۰

ئێمەش وەک ( ی ۰ ن ۰ ک ) و وەک کۆمەڵەش بڕوای بێ سنوورمان بە ڕێبازی ڕاست و دوا ڕۆژی سەرفرازی خۆمان هەبوو ، بۆیە دەستمان بە دەرکردنی مەفرەزەکانی خۆمان کرد ، لە ناوچەکانی شارباژێڕ سورداش قەرەداغ هەولێر هەورامانـــدا ۰

ماوەیەک دوای ئێمە برادەرانی ( پرونتەوەش ) بەدەنگ بانگەوازەکەی ئێمەوە هاتن و دەستیان دایە چەک ۰ ڕاستییەکەی ئەوە پێویستە بۆ مێژوو بیڵێینەوە ، ئەویش ئەوەیە کە برادەرانی ( پسک ) هەر لە سەرەتای هاتنەدەرەوەیاندا ڕێبازی عەسکەری و ڕوانگەی سیاسی تایبەتیان هەبوو کە لە سەرچاوەی جیاوازی و ئایدیۆلۆژیایەکەوە هەڵقوڵابوو کە بە هیچ جۆرێک لەگەڵ سەرەتاکانی یەکێتی و کۆمەڵەدا نەدەگونجا ، بەڵام لەبەر ئەوەی لێرەدا مەودای ئەوەمان نییە باسی ئەو کێشەیە بکەین ، بۆیە بۆ دەرفەتێکی تری هەڵدەگرین ۰

ئەمە کورتەیەک بوو لە مەتنی وردە بیرەوەری و چەند ڕاستییەکی خەباتی ژێرزەمینی کۆمەڵەو چۆنیەتی دەست پێکردنەوەی شۆڕش ۰ ئومێدەوارین ئەندامان و دۆستان و لایەنگرانی کۆمەڵـــە ( ئەو کۆمەڵەیەی کە هەڵوەشێنرایەوە تاکو ئێستا چەندین جار بەڵای ناهەمواری تێکراوەو زۆربەی تەمەنی بە زرووفی گەلێ سەخت و ئاڵۆزو نالەباردا ڕەت بووەو هەرهەنگاوێکیش کە ناویەتی هەنگاوێکی بەرەو پێش بووە ، هەنگاوی بەردەوام لەدایک بوونی حزبی پێشڕەو بووە ۰ )

ئەو ڕاستیانە بزانن و سوودی لێوەرگرن و بزانن کە خۆڕاگرتن و سوور بوون لەسەر خەبات ، قوربانیدان و مەیدان چۆڵ نەکردن ، گەرچی دوژمنان بە ئەوەندەی ئێستاش درندەتر بن ، فاشستتر بن ، گەرچی بارو زرووفی خەباتیش زۆر لەم بارو زرووفەی ئێستای خەبات سەختتر بێ ، ئەنجام سەرکەوتن هەر بۆ ئێمەیە ۰ چونکە ئێمە خاوەنی فیداکاری و قوربانیدانی زۆرین ، مەیدانی خەبات و سەنگەری تێکۆشانمان چۆڵ نەکردو بەچۆڵی ناکەین ۰ ئێمە ڕێبازی ڕاستی ( م ۰ ل ) و ڕەنجبەرانی کوردستان بەرنادەین ، چونکە ئێمە هەر بە دروشم و بە تیۆری ( م ۰ ل ) نین ، بەڵکو بەکردەوە هەردەم سەلماندوومانەو بەردەوامیش دەیسەلمێنین ۰۰۰

هەروەها ئێمە ، دەتوانین بۆ دوژمنانی نەتەوایەتی و چینایەتی ئایدیۆلۆژیمان بسەلمێنین کە کۆڵ نەدەین و نەبەزین ، خەبات و قوربانیدان لە ڕێبازی ڕاست لانادەین ، چونکە هەمیشە شۆڕشگێڕە ڕاستەقینەکان سەرکەوتنیش هەردەم لەگەڵ ڕاستیدا بووەو دەبێ ۰ ۰۰۰

ئــــەمــــەر بـــــۆ پێشــــــەوە
٨ ـ ١٠ ـ ١٩٧٩
بـــــاوکــــی ئــــاوارە

«هەلومەرجی تایبەتی و پەرەپێدانی خەباتمان».
کۆمەڵە، «گۆڤاری کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان». ژمارە
١ خولی ٢ کانونی دووەم ١٩٨٢ رێبەندانی ١٣٦٠

# هەلومەرجی تایبەتی و پەرەپێدانی خەباتمان

بەختیار

کوردستان وەکو هەمو ولاتێکی دیکە هەل ومەرجی مێژویی،سیاسی کۆمەلایەتی بگرە جوگرافی تایبەتی هەیە لەسەر زەمینەی ئەم هەل ومەرجە تایبەتیەدا بزوتنەوەی مێژو کردی رزگاری خوازی گەلەکەمان لەدایک بوە، کەلەم سەردەمەدا شۆرشە نوێکەمان نوێنەرەوەتی بوبەشێکی ئاسایشە کەئەو هەل و مەرجە تایبەتیە لەبارو دوخی شۆرشەکەدا ، لە ململانی چینایەتیەکانی کۆمەلەکەماندا رەنگ دداتەوە.

دەتوانین بلێین بەشوەیەکی گشتی شۆرشی گەلەکەی ئێمەش لەنێو سازنەی یاسای گشتی شۆرشی گەلانەوە سەرچاوەی هەلگرتوەو بەشێکی لەپسان نەهاتوی خەباتیانە دژی ئیمپریالیزم و داگیرکەرانی گەلان

بەلام لەگەل ئەو راستیەشدا ناتوانین بلێین کەئەو مەسەلە گرنگانەی بڕوامان پێیانە لەپێناوی رزگار بونمان کوت ومت هاتونەتەدی .

راستە بڕوای تەگورمان بە حیزبی پێشڕەو هەیە ، بڕوامان بە بەرەی نیشتمانی و لەشکری شۆرشگێر ، بە خەباتی ناوکۆیی گەلان و بزوتنەوەی کرێکاران هەیە .

(١) ـ کۆمەلە ناوکاوکاکلەی حیزبی پێشڕەوە ، ئەلقەی ناوەندی خەباتیشی لەدایکبونی حیزبی پێشڕەوە . . کە هێشتا نەهاتوتە دی بو سەرکردایەتی کردنی بزوتنەوەی گەلەکەمان .

ـ ی.ن.کا هەبەو کۆمەلەی تیایە، بەلام هێشتا نەبوەبە بەرەی نیشتمانی هەمو چینەکانی گەل و چینەکانی گەل بەتەواوەتی لەژێر ئالایەکدا کۆ نەبونەتەوە .

ـ هێزی پێشمەرگەی دلسوزو ئازاو تاقی کراوەمان هەیە ، بەلام هێشتا نەبوە بەو لەشکرە شۆرشگێرەی کە گەرەکمانە .

ـ خەباتی ئنتەرناسیونالیستی و ناوکویی گەلانمان گەلی پێ گرنگن. بەلام بەداخەوە هێشتا ئەم ئاواتەشمان وەکا پێویستە بو نەهاتوتە دی .

سەرەرای ئەو راستیانەش بو ئەوەی سال دەچێت گەلەکەمان بەو پەری قارەمانانە لە شۆرشی درێژخایەنی رزگار کردنی گەل و نیشتمانەکەماندا بەپێی رادەو رەوتی گەشە کردنی کومەل و شۆرشەکەمان چینە بەرژەوەند جیاوازەکانی کومەل بەشدارن لە شۆرشەکەدا و هەتا دێتیش ئەرکی و فرمانەکانی شۆرش قورستر دەبن .

بەهوی ئەو راستیانەی سەرەوەش

(لە پێشڕەوییاندا نەبوونی حیزبی پێشڕەو) گەلێ گیروگرفت، تەنگ و چەڵەمە، کۆسپ و تەگەرەی گەورەو بچووکی سیاسی و پێشمەرگەیی لە ئارادا هەن و ڕێگرن لە ڕێی گەشە کردنی ئاسایی شۆڕشەکەمان دا.

ئەمە جگە لەوەی کە ئیمپریالیزم و داگیرکەرانی کوردستان و نۆکەرانیان، دەورێکی گەورەیان هەیە لە تەقاندنەوەی ناکۆکییە لاوەکییەکان و دروست کردنی کێشە و ئاژاوەی گەورەی لابەلا بۆمان.

بێگومان تێکڕا ئەو گیروگرفت و کۆسپ و تەگەرانە، سەرئەنجامێکی سروشتی ناکۆکییە چینایەتییەکانی کۆمەڵن، ئاکار و کردەوەکانی کۆڕی خەبات، سیاسەت و ئاکتیکە جۆراوجۆرەکان، هاوکاری و جۆری پەیوەندییەکان، دەستنیشان کردنی دۆستان و دوژمنانی ...هتد هەمو لە چوارچێوەی ناکۆکییە چینایەتییەکان بەدەر نین،

ئەو واقیعی شۆڕشی درێژخایەنی بێ حیزبی پێشڕەودا بێ لەشکری گەلی و بەرەی نیشتمانیدا، لە واقیعی وەک پێویست نەهاتنەدی خەباتی ناوکۆیی گەلەکەمان و گەلان و نەبوونی پشت و پەنای ستراتیژی و لە هەمان کاتدا کێشەی گەورەی ئیمپریالیزم و نۆکەرانی بەسەر شۆڕشدا سەپێنراوە.

هەتا دێت بەهۆی سیاسەتی نادرستی ڕژێمە بیروکراتییە سەرمایەدارە دەوڵەتییەکەی عێراقەوە، وە بەهۆی درێژەکێشانی جەنگی عێراق و ئێرانەوە، تەنگ و چەڵەمەی ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی کە پشتوێنە سەرخی تەقینەوەو پێکدادانی کۆمەڵانی خەڵک و ڕژێم... ڕۆژی دەیان تەرمی بێ گوناح دێننەوە بۆ کەس وکاریان. هەزاران ڕۆڵەی دڵسۆزی گەلەکەمان بەهۆی ئەو جەنگە بەرەوا نازانن ئاوارەو دەربەدەرن. هەزارانیش ڕوو لە ئاوارەیی خۆیان ڕاپێچی بەرەکانی جەنگ کراون.

بۆیە بزووتنەوەی کۆمەڵانی خەڵک گەشەی کردووەو وشیاری و وریایی خەڵک زۆر پەرەی سەندووە.

لە ناوچەکەشدا هەلومەرجی تەقینەوەی خەباتی شۆڕشگێرانە ڕەخساوە هەتا دێت ڕژێمە خوێن مژەکان، زەوتکەرانی مافی گەلان و سەربەستییە دیموکراتییەکان و ئازادییە سیاسییەکان لاوازتر و گەندەڵتر دەبن و توانای چارەسەر کردنی تەنگ و چەڵەمەکانیان نییە. کۆمەڵانی خەڵکیش کرێکاران و جووتیاران، بێکار و ئاوارەکانی جەنگ. ڕۆحیەتی شۆڕشگێرانەیان پەنگی خواردۆتەوە و بانگی پێکدادانیان ئەستور تر بووە.

لەم هەلومەرجە تایبەتییەدا کۆمەڵەمان سەنگێکی سەنگینی هەیەو لە تەرازووی دۆستان و دوژمندا حسابێکی گەورەی بۆ دەکەن.. دۆستان پشتی پێ دەبەستن و دڵیان پێی خۆشە. دوژمنانیش لە بوونی سەنگینی نیگەرانن و پیلانی لێدەگێڕن. کۆمەڵەش ئەرکی دوولایەنەی لە ئەستودایە. لە لایەکەوە توندتر خەبات کردن دژی دوژمنانی، دژی داگیرکەرانی کوردستان بۆ زیاتر زەربەلێدانی لەم هەلە مێژووییەدا لە لایەکی دیکەشەوە بە گەرمی پاراستنی ناوەڕۆکی شۆڕشگێرانەی شۆڕشەکە و جێگیر کردنی ڕێبازە شۆڕشگێرانەکەی کرێکاران و ڕەنجدەرانی کوردستان ئەم ئۆرگانیکیان هەیەو لێکجودانەکرێنەوە، و لێک جوێ کردنەوەشیان زیانی بۆ کۆمەڵەو گەلەکەمان دەگەیەنی و بۆرجوازییەتی کوردستان کەڵکی لێ وەر دەگرن و کیانە زیندووەکەی کۆمەڵەی دەمرێنێ و هێڵی جیاکەرەوەی لە گەڵ بۆرژوازیەندا دەسڕێتەوە.

ئەو وڵاتانەی کە حیزبی کرێکاران تیایاندا بەهێزو بەدەسەڵات بوون پشت و پەنای گەورەیان هەبووە. لەشکری بەهێزیان هەبووە. سەرەڕای خەباتیان بۆ دەرپەڕاندنی داگیرکەران و ڕزگاری سیاسی. سەرەڕای

بەڵکو بە هێزیشیان لەگەڵ لایەنە ...شیان بەرەو پێشکەوتنخوازەکاندا [ئا]کۆکی و ململانێی سیاسی و ئابووری... جیا نەکانیان فەرامۆش نەکرد بوو، باسی پێوەندیان پێ دابوو. سەبەر کەوسمان سەر داگیرکەراندا لەم خەباتە چینایەتیە راست و دروست و بانیە خۆی نەکردبووەوە هەر بۆیە باسای یەکێتی و ململانێ، دیمان بەکتی و ئینجا ململانێ کردنەوە، بووە بنچینەکی کاریگەری چینایەتی حیزبێ رێکخراوە شۆڕشگێڕەکان.

چای بۆ کۆمەڵەمان کەلەواقیعی جیاواز و تایبەتی شۆڕشەکەماندا بە کەهێشتا حیزبی پێشڕەو نیەو ئەڵلەی پارەسەی پێویستیە چینایەتیەکانی بەهاتوتە دی.. بۆیە ئەرکەکانمان لە باو ئەواندا. گەلێ قورستر فرمانەکانمان زۆرگرانترن، رێگای بە ئاواتگەیشتنمان زۆر دوور ترە. لەبەر ئەو راستیانە هەتا دێت پەرە پێدانی خەباتمان پێویستی، گۆڕانەکان، رووداوە نوێیەکان، پەرەسەندنی خەباتی کۆمەڵانی خەڵک هەروا بێ ئیروانین و توێژینەوە و بەخشەو تاکتیکی نوێ رانەگوزەرێن.

چەند هەوری پێویستیەکانی، کرێکاران و جوتیاران، کۆمەڵانی خەڵک، ئەستورتر بێو بارانی خەباتی بە خورەسری لێببارێ، هێندەش پێویستە رێکخراوە شۆڕشگێڕەکان، کێلگەی خەباتیان، جۆری ئیش و تێکۆشانیان باشتر بکێڵن و چاکتری ساز بدەن. هەتا ئازانجی ئەو بارانە بەپیتترو بەروات، کێڵگەی زۆر دارەکان تێر ئەکات هەتا بەرو بوومی کێڵگەی رێکخراوە شۆڕشگێڕەکان بە پێزتر بێت و رەنجدەران پتر کەڵکی لێ وەر بگرن.

ئەمە ناوەڕۆکی جیاکەرەوەمانە وەکو رێکخراوێکی (م.ل) لە لایەنە وورده بورژوا و چین و دەستەو تاقمەکانی دیکە.. ئەم ناوەڕۆکە بنچینەییە ئەوەمان لێ دەخوازێ کەکاری شۆڕشگێڕانەی بێ پچڕپچڕانەی چینایەتیمان چ لە خەباتی نهێنیمان دا وە چ لە خەباتی بردنەوەی گرەوی ڕێبازی کرێکاراندا ئەنجام بدەین بەبێ ئەوەی ڕێگە بدەین لەدەرەوە و ناوەوەی ڕێکخراوەکەماندا هیچ هێزێکی گەورەو بچوک لە ڕووەو پێ چوونی ئەرکو فرمانەکانی سەرشان ساردمان کاتەوە.

هەتا دێت لەهەمو روویەکەوە پەلو پۆی سیاسی، چینایەتی، ئایدیولوژی، تەنزیمی ڕێبازی کرێکارانی کوردستان بە ناو دەروونی جەماوەری دڵسۆزدا بە تایبەتی چینی کرێکاراندا شۆڕبکەینەو ئەم پەل وپۆیە بە چەشنێکی قوڵ ئەوتۆ دابڕێژین کە ببێتە هێزێکی مادی کاریگەری پۆلایین، کەکرێکاران و جوتیاران بە ووریایی و ووشیاریەکی چینایەتی شۆڕشگێڕانەوە لە دەوریا بخالێن و ڕێکخراوەکەمان بە هی خۆیان بزانن و ڕێکخراوەکەشمان لە ڕێگەی ئەوانەوەو بۆ ئەوان و لە پێناوی ئەواندا سەرکەوتن وەدەست بهێنێ و بزوتنەوەی گەلەکەمان بەرە ئاقاری راست و دروستەی مێژوودا بەرێت، ئاقاری جیانەکردنەوەی خەباتی کرێکاران و ئەرکە نیشتمانیەکەمان، ئاقاری پێکەوە گرێدانیان. ئاقاری بایەخ نەدان بە لایەکیان و پشتگوێ خستنی لاکەی تریان، هەر بەم سیاسەتە راست و دروستەی کەگرتومانەتە بەر و بەگەشە پێدانی و بە قوڵتر کردنی دەتوانین ئەرکەین و ڕێکخراوەکەمان لە نەخۆشیەکانی سەردەم و خەتەری چەپڕەوایەتی و بیری تەسکی نەتەوایەتی بپارێزین

شایانی باسە کە بزوتنەوەی کۆمەڵانی خەڵک چەند گەشە بکات، ئەوەندەش بزوتنی راستەقینەی چینەکانی کۆمەڵ دەردەکەون، لەگەڵ

گەشە کردنی بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی هەڵکوودەرگەوتنی سروشتی راستەقینەی چینەکانی کۆمەڵیش جگە لەوەی ئەبێ ڕێکخراوی کرێکاران گەرمترو باشتر خەبات بکەن.

لایەنەکانی دیکەش دوش دانامێنن و ئەوانیش ڕەگ و ریشەیان هەیە. توانا و وزەیان تیا ماوە، بۆیە لە ململانێی خۆیان، لە سیاسەت و تاکتیکی خۆیان نەک هەر ناکەوون بگرە کازی بیستی سیاسەتی چینەکەیان دەگۆڕن وبەکازی نوێوە دێنە گۆڕی بۆ ململانێی نوێ بۆ پاراستنی بەرژەوەندی چینایەتیان

ئەمەش ڕاستیەکی ساغ بۆی درێژە کێشانی ناکۆکیە چینایەتیەکانی خەبات گەشە کردوی کۆمەڵە ئەبێ چینەکان. ئەم ڕاستیە چەندین جار دووپات کراوەو ئەمجارەش سەرئەنجام کۆمەڵە بەهۆی ڕێبازو تاکتیکاو سیاسەتی شۆڕشگێرانەیەوە، پشت ئەستوور بە خوێنی سەرهەڵدراوەکانی مێژوو بە کۆمەڵانی خەڵکا بەگەرمتر خەباتی نیشتمانی و چینایەتی هەر ئەر دەکەوێت و ڕاستیە سەرکەوتووەکانی مێژوو لە کوردستاندا دەسەلمێنێتەوە

بەهیوای هاوڕێیانی دڵسۆزی کۆمەڵەش، شانەو پۆل و کەرت و ڕێکخراوەکان جگە لە فرمانە ناوەندیەکانی سەرشانیان، خۆشیان بەپێی ئەو ڕالیمەی تیایا ئەژین و خەباتی تیا ئەکەن و لە چوار چێوەی دیسپلینی کۆمەڵەدا.

هەنگاوی نوێی چوونە ناو کۆمەڵانی خەڵک هەڵبێنن، شێوەیکاری نوێ دابهێنن، هەڵە بچووک و گەورەکانی ڕژێم چاکتر بقۆزنەوە بۆ باشتر بەکارهێنانیان دژی ڕژێم و بۆ سادانی ڕاپەراندنی کۆمەڵانی خەڵک بە پیر داخوازیەکانی کارو جەماوەرەوە بچن، بەکار و کردەوەو وره و وشتی بەرزی شۆڕشگێرانەی ڕەبانتەوەو ڕێکخستن و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵە.. ڕێبازی کۆمەڵە بەهێز بکەن، ببنە مایەی تەرزم و هاندانی جەماوەری تینووی ڕزگاری گەلەکەمان

٢٥/کانونی دووهەم/١٩٨٢

- خێزان و کەس وکاری شەهیدان و گیراوەکان و پێشمەرگە شەماسەتن. لەئەستۆی ئێوەدایە، پارێزگارییان بکەن، ئیشوکاریان بۆ جێبەجێ بکەن!
- لە پێویستیدا بە دەنگیانەوە بچن، یارمەتیان بدەن!

«کۆمەڵە و ململانێ چینایەتییەکانی کۆمەڵ».
کۆمەڵە، «گۆڤاری کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان».
ژمارە ٣ خولی ٢ مارتی ١٩٨٢ نەورۆزی ١٣٦٠

**کارو باری رێکخراوەیی**

# کۆمەڵ
# و
# ململانێ چینایەتییەکانی کۆمەڵ

بەختیار

ناکۆکی و ململانێ چینایەتییەکانی کۆمەڵە فرە چینەکان، دیاردەیەکی سروشتی و بابەتییە. پرۆسەیەکە دوور لە دەستێوەردانی هیچ هێزو دەستەو چین و تاقمێکی کۆمەڵیش ناتوانێت رێ لە دروست بوونی بگرێت و دەرفەتی هاتنەکایەی نەدەن.

لە هەناوی ئەم ناکۆکی و ململانێ بابەتییەی چینەکانی کۆمەڵەوە، بۆ پاراستنی بەرژەوەندی چینایەتی و سەپاندنی دەسەڵاتی چینێک بەسەر چینەکانی دیکەی کۆمەڵدا.

شۆڕش و راپەڕین هەڵدەگیرسێن، حیزب و رێکخراوی چینایەتی، نەتەوەیی، پیشەیی دروست دەبن

چالاکی توندو تیژی چەکدارانە، ریفۆرمیستی و پەرلەمانییانە روو دەدەن.. دەوڵەت و رژێمی جۆراوجۆر دادەمەزرێن.

کوردەواریش، وەکو هەموو کۆمەڵە فرە چینەکانی دونیا، کۆمەڵێکی فرە چینە و بەرژەوەندی چینایەتی جیاوازو ناکۆکی و ململانێ چینایەتی بابەتی کردی تیایەو لە هەناوی ئەم ناکۆکییە چینایەتییانەوە بەپێی رادەو پلەی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی و ئابووری، فەرهەنگی و سیاسی.. لە پێناوی ئامانجە نەتەوایەتییەکان و لە پێناوی ئەوەی لە رێگەی هاتنەدی ئامانجە نەتەوایەتییەکانیدا دەسەڵاتی چینێکی کۆمەڵ بەسەر چینەکانی دیکەی کۆمەڵدا بسەپێندرێ.

شۆڕش هەڵگیرساوە.. حیزب و رێکخراوی سیاسی دامەزراوە لە چینەکانی کۆمەڵیش. بۆ [illegible] بۆرژوازییەتی کوردستان و موڵکدارەکان هەر لە یەکەمین راپەڕینی چەکدارانەی گەلەکەمانەوە هەتا شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ وە لە دروستکردنی یەکەمین رێکخراوی نەتەوەییەوە هەتا دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان و هەتا ئێستاو چونیشی.. سەرکردایەتیان بەدەستەوە بووەو بەپێی بەرژەوەندی چینایەتییان سیاسەت و تاکتیکیان دارشتووە ستراتیژیان داناوە..

کرێکاران و جوتیارانی کوردستانیش، ئەگەرچی بە درێژایی مێژوو قوربانی قوربانی و هەوڵ و خەباتی راپەڕینیان لە ئەستۆدا بووە سووتەمەنی شۆڕش و راپەڕینە چەکدارییەکان بوون...

بەڵام دوو چینی سەربەخۆ نەبوون و هەمیشە پاشکۆی بۆرژوازییەت و

وورده بۆرژوازی کوردستان تووشبووه بیر راستڕەوەکان لەناو پارتـی و بەهۆی داو و دەزگاکانیەوە. بە توندی، رابەتی سەرەتا چینایەتییەکانی ئەکرد و هەرچەندیان لەدەست هاتبا دریغیان نەئەکرد بۆ سوکاکردنی (م.ل) و دژایەتی کردنی مارکسیست لینینستەکان، لەسەرێکی دیکەشەوە بەداخەوە هەموو ئەوانەی کە خۆیان لە بەرامبەری رووداوەکاندا بوون و نرانایەکی ئەوتۆیان نەبوو لەسەر رووداوەکان .. (م.ل)یان بەتاوانبارکراوی خۆیان ئەزانی و ئەوانیش دریغیان نەئەکرد لە رق گرتن و تۆمەت خستنە پاڵ ئەوان و لە دژایەتی کردنمان.

هەرەس پێهێنانی شۆرشی پێشوو، رووداوە دڵتەزێنەکانی عیراق و کوردستان ...دەری خست کە ئەم پارتیە دەتوانێ نوێنەرایەتی چینەکان بکات و پێک و مەسەلەیان بخات .. وە نە رژێمی عیراق هەتا سەر لە ژێرچەتری پەیماننامەی ئازاردا خۆی بۆ شاردبوەوە، وە نە ئەوانەی لە رژێم و لە پارتی بە هەڵگەڕانەوەیان سیاسەتەکانیان پێ کرد و وەکو مارەکەی شێخ هومەر سیاسەتە ناراستەکانیان ئاڵۆزکەردنی خۆیان و بۆیان دەرکەوت. ئەمەش ماریەدارە.

هەرەس پێهێنانی شۆرشی چواردە ساڵەی ئەیلول، ئەگەرچی گەورەترین کارەساتی چینایەتی و سیاسی بوو بۆ چینی بۆرژوازی کوردستان و هەڵکەوتەی ئاکە حیزبی هەموو چینەکانی گەل .. بۆشاییەکی سیاسی گەورەشی بۆ کۆمەڵە هەڵخست کە بتوانێ زیندووەوە و خەباتی گەلەکەمان بهێنێتەوە سەر قالاری بابەتییەکەی بەرەی گەلانی شۆرشگێڕ و بەدەستی ئەرکێکی قورستر لە ئۆبانەیکی پێوندە

لە ئەرکی ئۆبانی یەکەمی ئەوانەدا کەوتە ئەستۆی کۆمەڵە ... دەرپیش کەوتکە بۆرژوای کوردستان سەرەرای ئەو کارەساتە چینایەتی و سیاسییەی پێگەی کۆمەڵایەتی و وزەی چینایەتیان لێنەبرا و بگرە بەهێزبیش و دەستیش هەڵناگرن لە دەست بەسەرا گرتنەوەی خەباتی گەلەکەمان و سەپاندنەوەی دەسەڵات و بیر و رای چینایەتیان... تەنها ئەوە نەبێت کە ئەمجارەیان لە ژێر ئەلسەری کارەساتەکەدا بە چەشنێکی لێک ترازاو، وە لە رێگەی چەندین رێکخراوی جیاجیاوە هاتنەوە گۆڕێ و کەوتنەوە کێشە و ململانێ. کەوتنەوە دامەزراندنەوەی حیزب و رێکخراوی جیاجیای تەرز جیاواز، هەرلەوەی ئەوانە کۆنەکانیان بهێننەوەی هەتا دەگاتە سازش لەگەڵ میری و بیر کردنەوەی مام ناونجی رارا.

ئەم راستیانە هەرچەند کۆمەڵە پێشتر درکی پێ کردبوو. بەلام لە پاش دەستپێکردنەوەی شۆرشە نوێکەماندا ئەملێوتر دەرکەوتن و ململانێ چینایەتییەکان بەرووی کۆمەڵەدا تەلیسەوە.

ئەو ململانیانەش لەسەر هەمو قاستەکان بە چەندین چەشن رەنگیان دارێژرا و چەندین شێوەی دوژمنایەتیان گیرابەبەر ج وەکو کۆمەڵە بەتایبەتی و ج لە ناو یەکێتیدا بە گشتی.

هەر لە کوشتن و رێگە گرتن لە پێشمەرگە و کاورەکان. کە کۆمەڵە و یەکێتیش هەرگیز نەیانتوانیوە تا کۆتایی بەو ململانێیەکان بکەنە ئاستی پێکدادان و شەڕ و شۆری لاوەکی و بەلام بە دەستی بێگانە و نۆکەرانی هەرسپێندرا.

هەر لەوەی بە پێی بایەخکاری سیاسەت و بەرژەوەندی تەسکی

جیهانییەتی . تا وەکوتا وڵێک بەرو بەو دەوڵەت ، بە فلان و فیسارە حیزب و تاقە کەسیان هەڵدەبەساردین ... تا دەگاتە سەر ئەوەی کە کاێکۆنیان بە رودادەکردین و بە رابووردووە درێژەکانی رۆژگاری رەشی دوبەرەکیان دەبەستینەوە .

لە بەرامبەر هەموو ئەمانەشدا کۆمەڵە پشت ئەستور بە بیروباوەڕەکەی و هێڵی راستی سیاسەتەکەی ، وەکو لە قۆناغی یەکەمی خەباتیدا ئەگەڕێ بچوکا و تاواش بو بەرامبەر ئەو بارو دۆخە چەپاڵەو بالاتستی و بە هێزبەی بۆرژوازییەت خۆی گرت و چەسپا . لەم قۆناغە نوێیەو لە سەختتر بونی ئەرکەکانیشیدا ئەرکەکانی خۆی ئەنجامدا و رێبازە چینایەتییەکەی خۆی پاراست وچلەوری شل نەکرد و هەتا دەهاتیش دڵسۆزانی گەلەکەشمان لە دەوریدا کۆدەبونەوە.

ئینجا با بان دایە سەر ئەوەی کە بونی کۆمەڵە باشە وپێویستە بەلام تەنها بۆ کۆکردنەوەی رۆشنبیرە مارکسیست- لینینیستەکان و بەس . نەک بۆ سەرکردایەتی کردنی بزوتنەوەی گەلەکەمان .

چونکە (گوایە) سەرکردایەتی کردنی ئەم بزوتنەوەیە ، حیزبێکی جەماهیری گەورەی گەرەکە و بۆ دروستکردنی ئەم حیزبەش میکانیکلە داوای فەرزی تەیارانیان دەکرد ... بەبێئەوەی ناکۆکیە چینایەتییەکانی کۆمەڵ لە بەر چاو بگرن و ئەو راستیە زانستیە پەیڕەو بکەن کە سەپارەکانی بزوتنەوەی گەلەکەمان. رەنگدانەوەی ناکۆکیە چینایەتییە بابەتییەکانی هەناوی کۆمەڵەو ئەم ناکۆکیە چینایەتیانەش بە ئارەزوی بای رۆژگاری سیاسەت و بەرژەوەندی چەند کەسانی چینێکا لە چینەکانی کۆمەڵ . فەرز ناکرێ و حیزبی جەماهیری دروست ناکرێ.

لە بەرامبەر ئەم تەفسیرە کێشراوەشدا ، ئەخشەی پادانەوەی لای کۆمەڵەی تەنها بۆ مارکسیست- لینینیستەکان و دامەزراندنی قارەوومەندانەی حیزبی جەماهیری. دیسانەوە کۆمەڵە بەرپەرچیدانەوە و پڕ بە دڵی قارەزوی قالەکراسی ئەو حیزبە جەماهیریە ، خۆی لەو دەلاقەیەدا قەتیس نەهێشتەوە کە بۆیان دەسنیشان دەکرد و بێگومان وردە وردە دەلاقەکەشیان لێدەکردیە گۆڕ و دەیان ناشت .

کۆمەڵە سوور بو لە سەر مانەوەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان (کە دەبێترا ئەو کاتە عشلیوە شێندێنەوە) و لە سەر ئەوەی لە ناوچوارچێوەی یەکێتی و دەرەوەیدا و لە بۆنەی خەبات و ململانێدا .. چینەکانی کۆمەڵ حیزبەکانیان لە دایک ببنو گرەوی پێشرەوایەتی کردنی گەلەکەیان حیزبی ئەو چینە ئەی باتەوە کە دەتوانێ بە سیاسەتی راست بە تاکتیکی دروست و ستراتیژی شۆڕشگێڕانە ، بە کردەوەی دڵسۆزانەی متمانەی کۆمەڵانی خەڵک وەربگرێ (نەک بە ئارەزوو فەرزی تەیار لێ بکرێ و حیزبێکی گەورەی ناوی زل و دێی رێبەران لە سەرەوە بسەپێندرێ ) ...

کۆمەڵە بڕوای ئەکرد بە ململانێی سیاسی و ئایدیۆلۆژی هەبوو ع لە ناو یەکێتیدا و ع لەدەرەوەی یەکێتیدا و هەر ئەمەشی پەیڕەو کردووە ، بەلام بەداخەوە لە ناو یەکێتیدا توانرا هەم یەکێتیەکە و هەم ململانێیەکەیا رێزرێ .. یەکێتی لەسەر ئەوەی ی.ن.کا بمێنێ وخزمەت بکرێ و کۆمەڵانی خەڵکی لە ناو داکۆ بکرێتەوە یا بەرگری و بەرهەڵستی.. ململانێش لە سەر سەربەخۆیی

کۆمەڵە و پاراستنی جیاوازییەکەی لەهەموو رووێکەوە لەگەڵ لایەنە ـ کانی تر بەگشتی . چ لە رووی بیر و باوەڕەوە وە چ لە رووی جۆری کۆکردنەوەی خەڵک و جیـــاوازی تێڕوانینەوە .

کەچی لە دەرەوەی یەکێتیدا بە داخەوە لە بری یەکێتی و یەکگرتن و برایەتی . پشێوی و ئـــاژاوە و تەقاندنەوەی ناوەختی ناکۆکیەکانیان بە سەردا سەپاندبن و گیانـــی زیندووی ململانێیان بە هەڵدێــردا بردو سەرئەنجامەکەشی دەیان گیرو گرفت و کارەساتی جەرگبڕ وناخۆش بوو... کە دەکرا ئەمەش نەکاتـــە ئەم رۆژە ترسناکەو لە جەوێکـــی دیموکراتیانەدا کێشەکان یەکـــلا کرابان .

ئێستاش داهاتوویەکی دوورودرێژ ـ مان لەبەردەمدایە و دەبێ بەردەوام بەگیانی شۆڕشگێرانەی نەگـــۆڕەوە . ڕێبازە راستەکەمان بپارێزین و ئەرکەکانمان ئەنجام بدەین، ململانێی چینایەتی و ئایدیۆلۆژی کۆمەڵە . مانای مان و ژیان وسەرکەوتنـــی کۆمەڵەیە لە هەموو رووێکی خەباتدا.. ناپێ و ناکرێ هەمیشەو لە هەمـــوو رووداو گۆڕانکاریەکاندا . پابەندی یەک تاکتیک و جۆرە ئیشێـــک و سیاسەتێک بین ...

بەردەوام دەبزوێن و دەگۆڕێن .... وردە وردە لە پرۆسەی گەڵەکەبوون و پەنگ خواردنەوەی چەندایەتـــی پەیوەندیە لەگەڵ گەرتووەکـــانی گۆڕنەوە . پەیوەندی نوێی چەندایەتی دەژین و ئەمانیش گەڵەکە دەبـــن و پەنگ دەخۆنەوە و وەرچەرخـــان و گۆڕانی نوێ دێننەکایە .. هەربۆیە مارکسیست ـ لینینیستەکـــان بایەخێکی زۆریان بە هەڵەکـــانی گەشەکردن و رەوتی رووداوەکان وجۆری گۆڕان و پەیوەندیەکـــان داوە و پابەندی سیاسەت و تاکتیکی تایبەتی نەبوون ..

ئێمەش هەردەبێ بەوپێیەو لەسەر ئەساسی ئەو راستیە دیالکتیکیــە بڕوانینە رووداوەکان و هەڵیـــان سەنگێنین و جۆری خەباتمان،تاکتیک و ململانێمان دارێژین...وە قاپندەی خەبات ورووداوەکان لەبەرچاو بگرین و هەرگیز جڵەوی خەباتی چینایەتیمان بەرامبەر سیاسەتە ناراستوهەڵە ـ کانی وردە بۆرژوا و لایەنە بە هەڵە لە راستی گەیشتووەکان شل نەکەین.

ململانێ و رەخنەی زانستیانەمار شان بە شانی ئەرکە نیشتمانیــە ـ کانمان باشتر بە کار بهێنین .هەر بەمەش و بەم رێگا راستەش دەتوانین بەئامانجە دوور و نزیکەکانمـــان بگەین و سەرکەوین .

* * *

کۆمەڵ و رووداوەکانی کۆمـــەڵ

> ماڵی نەتەوەکان ، لەبڕیاردانی چارەنوسی خۆیاندا ،وخەبات لە پێناوی رزگاری تەواوی نیشتمانیدا ، لە پێناوی ســـەر بەخۆیی تەواودا ، دژی پاشکۆیەتی، هەموویان یەکگ ـــتن ،و سۆسیالیستەکان بەبێ نکوڵی کردن لە سۆسیالیست بوونی خۆیان ، ناتوانن نکوڵی لەهیچ شێوەیەکی ئەو خەباتە بکەن، بە شێوەی راپەڕین وجەنگیشـــەوە
>
> لینین، هەڵبژاردەکانی ل١١

یەکەم نامەی زیندان

# هاوڕێیانی تێکۆشەر و خۆشەویست، سڵاوێکی کۆمۆنیستانەو هیوای سەرکەوتن

جارێ ئێمە بە جیا هەریەکە لە شوێنێ سجنین، من لە پرسگەی مەکتەبی سیاسی، شێخ عەلی لە بارەگای سکرتێری کۆمەڵە، هاوڕێ پشکۆ-ش لە ماڵێکی تەنیشت ماڵی فەرەیدون لە ناو گوندی یاخسەمەر، هێندەی دەزانم تەحقیق لەکەسمان نەکراوە، نیتر نازانم لەوانیتر بەنهێنی کراوە یان نە؟. واش دەزانم ئەم دوا خستنەمان لەبەر ئەوەیە وەکو مام جەلال وتی (ئاڵای شۆڕش تەحتیم دەکەین)، نیازیان هەبوو ئەو کەسانەی گومانیشیان لێدەکەن سەر بەخۆمان بن. چەکمان کەن و دەریان بکەن، لەوان وایە ئێمە هەموو سەنگێکی خۆمان خستۆتە ناو پ.م نازانن کە گرنگترین مەیدانی خەباتمان شار بووەو کەم شتی خۆمان بەخەباتی چەکدارییەوە بەستووە، داخ بۆ ئەوە دەخۆم زۆر کەس هەن تەنها برادەرمانن و فرِیان بەسەر ئاڵاوە نییە ئەوانیش دەکەونە بەر پاکسازیان.

هاوڕێیان..ئەوان ئەوپەڕی هەوڵدەدەن شەرعیەتبدەن بەم سیاسەتە دژی ئازادی و دیموکراسیە، پروپاگەندەی بۆ دەکەن و بەدووری نازانم چەند رۆژی تر تێزگەکەشیان بۆ ئەم کارە تەرخانبکەن و زۆر شتی پێوە دەنێن، بۆ نموونە دوێنێ کوڕی شەهید شەهاب سەریدام و لێی پرسیم راستە ئێوە باوکی منیشتان بە جاش زانیوە، خۆتان دەزانن ئەمە درۆیەکی شاخدارە، چونکە ئەو بڕیارانەی دامان شەهید شەهاب-مان بە مارکس و قارەمانی ئەمری بزوتنەوەی کۆمۆنیستی لەقەڵەمداوە، وێڕای ئەویش و شەهید ئارام-یشمان بێ هەڵەو کەموکوڕی نەزانیوە، گوتمان گەر ئەوان بمابان، ئێستا لە ئێمە زیرەکانەتر درکیان بەم بارە نالەبارە دەکردو هەر ئەوان رێبەری پاراستنی م.ل دەبوون، کەچی ئەمەشیان هەڵگێڕاوەو تەنانەت گەرەکیانە لەم بارەشەوە، ئەوەی بە خۆیانمان گوتووە، بەخۆبەستنەوە بە شەهیدەکان، پارسەنگ هەڵسەنگاندنەکەیان هەڵسێننەوە، جگە لەوەی خۆتان دەزانن ئێمە ئەمانەمان بە عنوانی مارکسی و دامەزرێنەری رێکخراوی مارکسستی رەت کردووە، کە هاتۆتە سەر هەڵسەنگاندنی بەراوردکردنی ئەمان و لایەنە بۆرجوازیەکانی دیکە، گوتومانە ئەمان لەوان پێشکەوتووترن گەر ئەمان ئازادی بسەلمێنن هاوکاری ئەمان زۆر شەریفانەترە. بەهەر حاڵ وەکو گوتم ئەوپەڕی هەوڵدەدەن چیان پێدەکرێ پیشەی ئەم سیاسەتە دژە دیموکراسیە بگرن، بەڵام لەبەردەم راستیەکاندا هەر هەڵدەوەشێتەوە. ئێستاش من پێموایە نابێ لۆژیك لەدەستبدەین، نابێ بەکاردانەوەی کارە ناجوامێرەکانی ئەمان، ئێمە هەڵوێستە وەربگرین.. دەبێ وەکو گروپێکی کۆمۆنیست، عەزیمەتی پۆڵایین ئاوێتەی لێکدانەوەی زانستی بکەین و ئەرکی ئایندە دیاری بکەین، دیارە ئەرکێ کە لەبەر رۆشنایی هەڵسەنگاندنی رابردوو، دەستنیشانکردنی گەشی و خامۆشی، هەڵەو راستی دیاری دەکرێ و لەپێناوی پاشەرۆژدا پیادە دەکرێ، لەمەدا مەبەستم ئەوەیە بڵێم لەناو گێژاوی لایەنە بۆرجواکاندا نابێ لەرقی لایەك بچین دۆستایەتی توندی لایەکی دیکە بکەین، سیاسەت بەرق و رقەبەرایەتی ناکرێ و بەراشکاویش دەیڵێم وێڕای ئەم چارەنووسە تاڕادەیەك تاڵە، هێشتا وادەزانم لەسەر ئاستی دوور سودمەندین نەك زەرەمەند، بۆ؟، چونکە هەندێ بڕیار هەیە زۆر چارەنوس رەشە ئەگەر ورد نەبین لە وەرگرتنی، ئەم وەزعە خۆتان دەزانن لەبەردەم مێژوو یەکێتی بەرپرسیارە بەرامبەری هەرچەندە خۆشمان بێ هەڵەو کەموکوڕیش نەبین بەرامبەری، بەڵام هاتباو بەخواهێشت قورسایی خۆمان خستبایەتە ئێران و لای جود، ئەو کات لە ١٠٠٪ خۆمان مەسئولدەبوین لەو شکستەی کە هەیە لەوێدا دەمانخوارد. مارکسیزمی شۆڕشگێڕو (تا انقلابی مهدی خومەینی رانگهدار) کوجا مەرحەبا، مارکسیزمی شۆڕشگێڕو چونە ناو جود چۆن دەسازێن و دەگونجێن. ئەمە واقعێکە بزوتنەوەی

مارکسیسی تێکەوتووەو زیاتریش لەهەمو لایەك خۆمان ئەرکە ئاڵۆزو سەخت و دژوارەکەی تەحەمولدەکەین سەبارەت بەوەی ئەوەی خۆمان لە گروپەکانی دیکە جودا دەکاتەوە، بوونی عەمەلیمانە لە بۆنەی مومارەسە عەمەلیەکەدا. هەر بۆیە تا لەناو ئەم واقعە سەرکەوتوانە دەرباز دەبین، هەموو کارو بەرهەمەکانمان هەر سەرکەوتن نابێ و هیچ حزب و گروپێ بێ هەڵدێرو بەسەرهات، نەگەیشتۆتە هیوا، جا چ بۆ ئێوەومانان کە لە ناو ئەم هەموو لای دوژمن و.نەیارە. جۆراو جۆرانە گەرەکمانە کەشتی خەبات بگەیەنینە دۆخی سەرفرازی. ئێمە بابێین دوور دوور بڕوانین، هێزە بۆرجواکان چ دەکەن و کیانی سیاسی چۆن دەرباز دەکەن، ئەوان تەنها لە ئیحتیمالاتدا (انقلاب، پشێوی، داگیرکردنی عیراق) جۆرە ئومێدێکیان بەسەرکەوتن هەیە وەکو تری لەرووی چینایەتییەوە پێگەی چینایەتی بۆرجوازی بچوکانەو رێبازی ناسیۆنالستی - پۆپۆلیستیان، هەرگیز لەم سەردەمەدا مەسەلە دیموکراسیەکان بەرەو سەرکەوتن نابات. شەقڵی سەرەکی خەباتیشیان کە خەباتی چەکدارانەیە.. لەم سەردەمەدا، لەسەر دەستی ئەم چینەو ئەم بیروباوەڕە ئەم بێ پشت و پەنا ستراتیجییەو لە کوردستانێکی تۆپۆگرافی کەم گونجاوە سنور تەسك بۆ هەڵسوڕانی چەکدارانە، بەرامبەر دەوڵەتان بە نوێترین چەك پڕ چەککراوی سڵنەکردوو لە وێرانەکردنی شارەدێی بەرتەسکبووی کوردستان، ۆ بەم هەموو کێشە ناوخۆیی و شەڕی خوێناوی ناوخۆییە، پێموایە جۆری خەباتی چەکدارانەش لە بن بەستەو مەسەلەیەکی گرنگی واش ببەسترێتەوە تەنها بە ئیحتیمالاتی سیاسی عەسکەریەوە، نەك بە لۆژیك و زەمینەی زانستی، دیارە هەرگیز ئایندەکەی سەبارەت بە هێزە بۆرجوازیەکان رۆشن نییەو بەڵکە لە گرێژنەیەیان دەرچووە ئەمە خۆشیان زۆرباشی دەیزانن، بۆیە لەو لاوە (پارتی) توند ستراتیژی خۆی بە ئێرانەوە بەستووە، یەکێتیش هەمیشە لەسەرپێیە بۆ هودنەو مفاوەزات، حشع و حسکیش بە دوو جۆری جیا ماڵی خۆیان فەقەت دەپارێزن، حشع بۆ ئەوەی کیانە سیاسیەکەی بمێنێ و گەر هەڵیشکەوت لەناو روداوەکان و بەهۆی سیاسەتی دەولی و، بەڵکە لە پاشەرۆژدا چنگی لە چمکێکی گۆڕانی دۆخەکە گیربێ، حسکیش بەو زۆر لاوازییە ئەمسەرو ئەو سەر رایدەکێشن و قەوارەی خۆیان هێشتۆتەوە. هاوڕێیان! ئەمەوێ ئەوەش بڵێم لەساڵی ئایندەشدا بەدووری نازانم جەنگی عیراق- ئێرانیش راگیرێ و هەر لایەك لەناو خۆیاندا بکەوێتەوە بەرگری لە خۆی.،. چونکە ئێران شەکەت بووە، وەزعی ئابوری و کۆمەڵایەتی گەیشتۆتە دۆخێکی سەیر، بەسیج و پاسدارانی جاران بەسەر لوغمدا خۆتەقێنەر، ئێستا بە هەزار حاڵ عەمەلیاتی نفوزیان پێدەکەن.. کە هەزار ئەملاو ئەولا دەکەن و هەزار کەسیش بۆ جەبهە کۆدەکەنەوە، یەك هەفتە ئاهەنگیان بۆ دەگێڕن، کە لە کاتێکدا سەرەتای جەنگ سەد هەزاریش بچوبایەتە جەبهە، زۆریان لائاساییبوو، چونکە دەیناردن بۆ بەهەشت و بگرە منەتیشیان بەسەردا دەکردن، بەراوردی ئێستاو ئەوسای ئێران، جیاوازییەکەی ئاسمان و رێسمانە، کەواتە ئێستا پێموایە قۆناغی نوێی گەرمەی جەنگە سەبارەت بە ئێران، ئەوەیە کە جەنگ ئیدی مەترسی لەناوبردنی خۆیان دەهێنێتە گۆڕێ لەبری ئەوەی جەنگ سەریان خات و بیان چەسپێنێ، کە جەنگیش مەترسی لەناوبردنی هێنانە گۆڕێ، دیارە رژێمی ئێران لە دووریانی درێژە پێدانی جەنگە کە لە ناوی دەبات و لە وەستانی جەنگەکە بیگرێتەوە کامیان هەڵدەبژێرێ من دڵنیام هەر ئەمە هەڵدەبژێری کە دەیگرێتەوە، ئەویش وەستانی جەنگە، گەر نەك مەزهەبی بن، بگرە هەزار جار مەزهەبی بن و (انقلابی مهدی)یش روو بدات ناچار جەنگەکە دەوەستێنن، جا ئیتر نازانم سیاسەتی دەولی بگۆڕێ و ئێرانیش سیاسەتی خۆی بگۆڕێ و لاسەنگێکی سیاسی جیهانی نوێ سەرهەڵبدات، یاخود لەناو عیراقدا راپەڕین، مانگرتن، یان کودەتایەك روبدات، ئەمانەش لە پێشدان و لە ئیحتیمالاتی سیاسیدا حسابیان بۆ دەکرێ.. و خۆشتان دەزانن عیراق تا ئێستا دەرکەوتووە کە لە پاش شەڕی (محمرە)وە، بەرگەی ئیرانی گرتەوەو چەکی کیمیایی و فرۆکەی زۆرو تۆپی دوور بوردو زەمین بەزەمینە نەبڕاوەکانی، کێشی تەرازووی جەنگیان لەسەر سنوور راگرتووەو ئەوەی سێ ساڵە ئێران خەریکێتی کە شارێکی گەورە داگیر بکات و بیکاتە بنکەی کۆبەندی خەڵکی عیراق بە تایبەتی تەیاری ئیسلامی شیعەگەر.. ئەمەی بۆ نەچۆتە سەرو داگیرکردنی حاجی عومەران و وێرانکردنی پێنجوێن-یش، جووت هاتۆتەوە لەگەڵ سیاسەتی راگواستن و کاولکردنی کوردستان و بەعس هێندە خەمیان ناخوات. جا هاوڕێیان..

که وتم دوور دوور بڕوانین، مەبەستم لێکدانەوەی ئەو حساباتانەیە ئینجا بینینی وەزعی خۆمانە، چونکە وەزعی خۆمان لەسەر ئەم زەمینە کۆمەڵایەتیەو بەپێی رادەی خەباتی چینایەتی ئێستای عیراق، ئاستی هوشیاری کۆمۆنیستی، قەد دابڕاو نییە لەو وەزعە گشتییە، تەنانەت شۆڕشی ئۆکتۆبەرو حزبی بۆلشەویکیش دابڕاو نەبوون لە جەنگی یەکەمی جیهان. کەواتە..

وا دەزانم ئێمە لەم واقیعەدا وەکو لە کۆبونەوەکەش لێکدراوەتەوە، ئەوەندەمان لەسەرە بزوتنەوەی دیموکراسی کڵپە سەندوو، کە لە پێناوی ١-لاوازکردنی رژێم و قوڵکردنی تەنگوچەڵەمەکان ٢-بەهێزکردنی گیانی وشیاری و مقاوەمەتی رژێم. ٣-بەستنەوەی ئەم واقیعە بە جوڵانەوەی.. چینایەتی و بزوتنەوەی خەڵکی عیراق بەتایبەت کرێکاران و زەحمەتکێشانی، ٤-دروستکردنی شەخصیەتی سەربەخۆی ناسراوی کۆمۆنیستی تا کۆمۆنیستەکان و مارکسستەکان روی تێبکەن و باری خۆیی دامەزراندنی حزبێکی کۆمۆنیستی شۆڕشگێر برەخسێنین.. وەکو تر زۆر هەڵەیە تەواوی مەسەلەکانی خۆمان بەچەك و شاخەوە گرێبدەین، چونکە وەکو وتمان چەك و شاخ مەوداکەی بەرتەسکەو کارتێکردنەکەی سنووری تایبەتی هەیە. پێچەوانەی بۆرجوازیەکان دەبێ ئێمە شارو بەزۆری شارەکان، کارگەکان، شوێنی زەحمەتکێشان، جەرگەی رۆشنبیری شۆڕشگێڕەکان بکەینە بنکەی بنەڕەتی خەبات و مەیدانی تێکۆشانی چینایەتیمان. جا لە پێناوی ئەوەی ئەوەمان بۆ بچێتە سەر، پێویست بوو ئێمە دانەکەوینە تەحالوفاتی لایەنەکانی ساحەکە بەو چەشنەی ئەوان دەیانویست. جود داوای چونە ناو جودی لێکردین بۆ دژایەتی ینك، ینك-یش داوای مانەوەی لەناوخۆیدا وەکو تەیاری سێهەم لێدەکردین بۆ دژایەتی جودو درێژە پێدانی سیاسەتی چەواشەکردنی کرێکاران و زەحمەتکێشان، ئێمەش ستراتیجمان ئەوە بوو تا بکرێ بێلایەن بین و پەیوەندیش بەهەموو لایەنەکان بکەین بۆ دژایەتی فاشستەکان.. دیارە گەر یەکێتی دیموکراسی و ئازادی سەلماند بوو، تا لەمان زۆرتر نزیك بکەوینەوە، لەبەر ئەوەی لە زۆر رووەوە ئەمانەمان لەوان پێباشتر بوو. ئێمە لەسەر ئەم ستراتیجە رۆیشتین و پێویستیش بوو بە عەمەلی تاقی بکەینەوە، قۆناغێك بوو پیایدا برۆین و تێپەڕین، پێویستبوو لەسەر خوازیاری ئازادی و دیموکراسی سوور بین تا بتوانین یان ئازادی و دیموکراسی بێتەدی (گەر بۆماوەیەکیش بێت)یان حەقیقەتی گەورە دەرخەین کە ئەی خەڵکینە وا یەکێتی-یش دیموکراسی و ئازادی ناسەلمێنێ و لەپێناوی حوکم و دەسەڵاتی تاکە هێزی خۆیدا ئازادی بیروڕا زەوت دەکات، حەقیقەتی بچووکی زۆر دەرکەوتبوو دەربارەی گەلێ مەسەلەی فکری و سیاسی و چینایەتی..، بەڵام تا هاتنە سەر (تەکیە) حەقیقەتە گەورەکە جارێ داپۆشرابوو، و جارێ یەکێتی وازی بە سۆزی خەڵك و بیری ئازادی و دیموکراسیەوە دەکرد. ئیدی یەکێتی لەم بارەوە چیکە لافی پێ لێ نادرێ و باوەڕیش ناکەم بەعام خەڵك ئەم سیاسەتە دژی ئازادییەی قبوڵ بێ. ئایندەش، یان ئەبێ بۆماوەیەکیش بێ ئەم سیاسەتەی راستکاتەوە، یان کە ئێمە لە نەبوونی ئەو ئازادییەو ئەم دیموکراسیە سیاسەت و تاکتیکی دیکەمان گرتەبەر، کەس لۆمەمان ناکات و پێمان ناوترێت هەق بوو هەر دۆستایەتی یەکێتی بکەن. دیارە لە هەموو حاڵەتێکیشدا بەش بەحاڵی خۆم سوورم لەسەر. ئەوەی نەچینە ناو جود، لەپاڵ هیچ لایەکەوە دژی لایەکی دیکە شەڕ نەکەین، هەوڵبدەین شەڕی ناوخۆ ریشەکێش بکرێ و هەموو هەنگاوێ کە بەعس لاواز بکات پشتگیری بکەین، لە هەمو سەنگەرو شوێن و کۆڕو کۆمەڵێ کراو لواو گونجاو کرێکاران و زەحمەتکێشان وشیار بکەین و سووربین لەسەر بڵاوکردنەوەی مارکسیزمی شۆڕشگێڕ بە تایبەتی لە شارەکاندا.

هاوڕێیان..پێویستیشە ئەوە رۆشن بکەمەوە کە لەسەرجەمی ئەو بۆچون و دیاریکردنەی ستراتیجی کاری ئەم قۆناغەدا.. هەڵەی گەورەی ئێمە لەوەدابوو، تەوقیتی جوڵان و جیاوازی دوو واقعی پێش و پاش جیابوونەوەکەمان باش نەپێکا.. واتە دەبوو لەپاش خۆتەرحکردن زۆر زیاتر لەپێش تر ئیحتیاتمان بکردایەو زووتر لە تەکیە بجوڵاینایە، هیچ نەبێ بۆ نزیك سەرکردایەتی یەکێتی، یان شوێنێکی دوورە دەستتر، تا بتوانین لەوەها روداوێ پارێزراو بین، گەرچی پێشم وایە ئەمەش بە بڕوا بۆ ئێمەو بەبێ بڕوا بۆ یەکێتی لە جۆری پەیوەندی و دۆستایەتی تۆمار دەکرێ، بەوە بۆیان دەنوسرێ کە دەگە تەنانەت لە هاوخەباتانی چەند ساڵەی خۆشیان دەدەن، ئەمەش بۆ پترو باشتر ناڕونی ناساندنی حزبە نا کرێکارو نا مارکسستەکان هەر سوودی خۆی هەیە، با ئێستاش شەرابی شانازی بەم کارەمان بنۆشن، بەڵام چ شەرابێکە، تاڵ و تفتەو ژەهراویە، ئەگەر سووربن لەسەر هەڵوێستیان و خۆیان عیلاج نەکەن، حەتمەن وەکو نەخۆشی خستون، دەشیان کوژێ، ئینجا سەد حەیف و مەخابن، تەجروبەکانی چارەسەرکردنی ، ناکۆکیەکانی رابردوو قاڵی نەکردبون کە چەندین هەڵەیان تیا کردووەو دوژمن چەند قازانجی لەو جۆرە چارەسەرکردنە هەڵانە کردووە، ئەمجارەش هەمدیس بەهەمان ئاکاری هەڵەدا دەڕۆن و پێشم وایە کە مرۆڤ بیری جۆرە رێککەوتنێکمان نییە، بۆیە مەسەلەکان بەرۆکی ئێوە دەگرێتەوەو من وای بە پەسەند دەزانم کە ئێوەش هاوڕێیەکی نەناسراو دەستنیشانبکەن کە زیرەك و قسەزان و وشیار بێ، کەمێ تەمەنداریش بێ. ئەو هاوڕێیە بەناوی ئاڵای شۆڕشەوە لەسەر سێ شت قسەیان لەگەڵدا بکات:-

١-ئامادەگی دەر بڕیّ بۆ ڕێککەوتنی سیاسی.
٢-داوای ڕەخساندنی زەمینە ڕێککەوتنەکە لە (ینك) بکات.
٣-تا بەر نەدانی ئێمە هیچ جۆرە ڕێککەوتنێ بڵاوناکرێتەوە.

بۆ مەسەلەی ئیدانەکردنی کارەکە.. ئەمە پێویستیەکە دەبێ دوای بەربونی خۆمان پێی هەڵسین، چونکە ئەمان کاری واناکەن. دیاریشە پێویستە داوای ئاساییکردنەوەی وەزعەکەو گەڕانەوەی زۆربەی چەکەکان و کەلوپەلی دزراومان بکەنەوە. کەی پێویستی کرد ئاگادارکران هەموو ئەڵقەکان راو تەگبیر لە دەستنیشانکردنی هاوڕێیەك بکەن بۆ کاری وا. ڕەنگە ئەوان داوای ئەمە بکەن کە یەکێتی بەهێزی نیشتمانپەروەر لە قەڵەمبدرێ، خۆتان دەزانن ئێمە هەمیشە خۆمان بە مارکسیزم و کرێکاران زانیوە، نەك بە خائین و نا نیشتمانپەروەر.. نیشتمانپەروەرێکی بۆرجوازی بچوکن، پێموایە شتی وا جارێ نەکرێتە گرێ کوێرە بەتایبەتی خۆشمان بڕیارمان نەبووە ئەمان بە نانیشتمانپەروەر نەزانین. جگە لەوەی خۆشتان دەزانن گەر گەرەکمان بێ لە کوردستاندا بۆیەك مانگیش بێ هەڵسوڕێین و سیاسەت بکەین، دەبێ بزانین چۆن لەگەڵ ینك-دا مامەڵە دەکەین و سیاسەتیان لەگەڵ پیادە دەکەین. من مەسەلەی ژیانی ئێمەو چارەنووسمان باسناکەین، ئەگەر پێویست دەکات و مردنمان ئێستا زەرورییە قەناعەت بکەن، بە مارکسیزم، یەك دەقیقە ژیانمان لا گرنگ نییە. ئەوەی زیاتر مەبەستمە کارو خەباتی ئایندەو سەرکەوتنی ڕێبازەکەمانەو هیچی تر. جا هیوادارم ئێوەش تەواوی مەسەلەکان، وردو درشتی، زانستیانە هەڵسەنگێنن و ئێستاو پاشە ڕۆژ ببینن. دڵنیاش بن ئەمە دونیایەو سیاسەت، کەممان ڕۆشتوەو زۆرمان بە بەرەوە ماوە. زۆرمان لەباردایەو پێیە، ڕەوڕەوەی ڕوداوەکان و مێژوو.. هەنگاوی پڕ شکۆی بۆ دونیای کرێکاران و سۆشیالیزم دەچەرخێ.

هاوڕێیانی ئازیز.. چەند ڕۆژێ لەمەوبەر بەرنامەی سێیەمم ئاراستەکردون سەبارەت بە دیداری خۆم و سکرتێری ینك.. هیوادارم وەکو بەڵگەی مێژوویی ئەویشتان بگاتە دەست و هەڵیبگرن و ئەم نامانە نرخی گرنگیان هەیە.

تکایە دەقی ئەم نامانە بە شێوەیەك بڵاوبکەنەوە کە نەزانرێ ئێمەین دەقی نامەی نوسراویش بۆ (م.س)یش، جارێ پیشانی کەسی مەدەن تا ئاگادارتان دەکەین و ڕەنگیشە هەوڵە سیاسیە سەرگرێ، من و هاوڕێیانی دیکە یەك بگرینەوە. ئەوسا نامەی تریشتان ئاراستە دەکەین.

تکاشە پەیوەندی بە سەلام فەقێ بە عەلی و برایمەوە بکەن و بزانن بۆ ئەم کارەیان کردووە.. برایم ناوە نهێنیەکەی (حەمە پشتەیی)یە، هینەکەی سەلام. تەنها ناوی یەکەمی ئەزانم کە (مەحمود)ە.. پێموایە باوکیشی (عەلی)یە واتە (مەحموود عەلی) یان (مەحمود ئەحمەد) لەو دوو ناوە یەکێکیانە.. بۆیان بنووسن کە (گەرمیان) ئەیەوێ بزانێ بۆ واکراوەو دوا نیازیان چییە. گەر یەکێکیش بیان بینێ لێ یان مەترسن.

**ئیتر خۆشیتان هیوامە**
**هاوڕێتان**
**مەلا بەختیار**
**١٩٨٥/١١/٢٢**
**یاخسەمەر**

# هاوڕێیانی ئەڵقەی ژمارە (٢١) تێکۆشەر

سڵاوێکی گەرم و ڕێزی هاوڕێیانەمان هەیەو هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازین.

چەند ڕۆژێکە گەڕاومەتەوەو داخەکەم وەزعی شار خراپ بوو، بۆیە نەمتوانی لەڕێی شارەوە بگەڕێمەوەو بتان بینم. سەفەرەکەم سەرجەم سودمەندبوو توانیم ئەو هاوڕێیانە لە تاران دا ببینم و بەدوورو درێژی قسەمان کردو مەسەلە دەرەکی و ناوەکیەکانمان باسکردو پێکەوەمان سازاندن.

ئەوان سێ مەسەلەیان لا مەبەست بوو.

١-چونە ناو جود ٢-دەستبەجێ جیابوونەوە ٣-دامەزراندنی بنکە لەگەڵ جود دا. دیارە هەر سێ ئەم مەسەلانە پێچەوانەی بڕیارەکانی یەکەمین کۆبونەوەی خۆمان بوو. بۆیە دوای مشتومڕێکی دوورودرێژ گەیشتینە ئەو سەرئەنجامەی ئەو سێ مەسەلەیە ناکرێ و ئەوانیش ئەبێ کارەکانیان لە تەک کارەکانی ئێمەدا جووت کەن و بگرە لە خزمەتی هێنەکانی ئێمەدا بیانخەنە گەڕ. جارێ ئەوان لە شارەکانی ئێراندا ئەمێننەوەو جموجوڵی سیاسی خۆیان درێژە ئەدەنێ تا بەلایەکا کەوتنی وەزعی ناو وڵات.

لە دەرەوەدا ئەوان هەنگاوی گەورەو پەیوەندی باشیان ناوەو درووستکردووە. لە تەك سوریا- لیبیا- ئێران و تەواوی حزبە عێراقیەکان، فەلەستینیەکان و زەمانی یارمەتی و پشتگیریانِ لێوەرگرتوون. کورتیەکەی ئێمە کاروبارەکانمان تەنسیق کردووەو بەهیواین بتوانین لە ناو وڵاتیشدا سەرکەوین و ئامانجی پاشە ڕۆژمان بەدی بهێنین.

-وا هەندێ پێویستی چاپەمەنیمان کڕیوە بۆ پیت و مەقەستی بڕین و ئەو مەسەلانە، تکایە بە وردی بەکاریان بهێنن و عنوانی وتارەکان بەپێی پێویست پێیان بنووسن.

-لەهەموو لایەکەوە نامەو داخوازی ئەوە هاتووە کە ناوی گۆڤارەکە لە ئاڵای کۆمۆنیزمەوە بگۆڕین بە ئاڵای زەحمەتکێشان. دەستەی نووسەران (جگە لە هاوڕێیەك) و چەند کادرێکی کۆبونەوەکە ئەوانەیان دیومانن ڕازی بوین، تکایە ئەمە لەبەر جیابونەوەو هەندێ هۆی سیاسیی تایبەتیە کە ڕەنگە تا کۆنفرانسی یەکەم بخایەنێ و ئەو کاتە ئێمە خۆ ئەگرین و سەربەخۆ ئەبین و سەربەستانە بڕیاری هەموو مەسەلەکان ئەدەین. تکایە فریای چاپەکە بکەون و ناوەکە بە ئاڵای زەحمەتکێشان بنووسن.

هودنە/ سەرکردایەتی یەکێتی بەهودنە ڕازی بوون و مەرجەکانی ڕژێمیان قبوڵ کرد. بەڵام ڕژێم وەڵامی نەداونەتەوەو ئەوانیش بایان داوەتەوە لای ئێران و وەفدیان ناردووە بۆ ئەوێ.

بەراستی مەسەلەی چاپکردنی بڕیارەکان زۆر دواکەوت. ئەگەر تەواوتان نەکردووە، فریای کەون و لەم چەند ڕۆژەدا تەواویان کەن و هەوڵئەدەین لەمەو دوا لای خۆمانەوە شت تایپ کەین و بۆیان بنێرین و ڕایکێشین.

هیوادارین ئیتر ئێوەش پتر هەڵسوڕێن و بجوڵێن. هاوڕێیان هەندەی کە ئەڵقە دراسیەکانی چەتر دراسە بکەن، زیادی بکەنەوە.

بڕیار بوو تەلەفزیۆن بنێرن نەگەیشت. تکایە وا بڵاوە کە دوژمن ئابڵۆقەی ئابوری بەسەر ناوچەکەماندا فەرز ئەکات و پێویستمان بە هەندێ ئازوقە هەیەو وا بکەن لەمبارەوە هەموو هاوڕێیەك ئازوقەی هەمە چەشنە بکڕێ و بۆمان بنێرن، ئەمەیان دوا نەخەن، چونکە لەبرسا ئەمرین! دوایی هیچمان فریا ناکەوێ.

خۆشیتان هیوامانە

هاوڕێتان

گەرمیان

١٩٨٥/٧/١٣

تکایە ٧/١٧ سێی پاش نیوەڕۆ لە نزیك دێی ولیان چاوەڕێتان ئەکەم بۆ زیاتر قسەکردن و لێکتێگەیشتن.

پێنجەم نامەی زیندان

# هاوڕێیانی ئەڵقەی ژمارە (۲۱)ی تێکۆشەر

سڵاوێکی کۆمۆنیستانەی گەرم و هیوای خۆشی و سەرکەوتنتان بۆ ئەخوازین هاوڕێیان.. ئێمە گەیشتینە سەرکردایەتی ینك و ناوەندی کۆڕەك.. تەعقیبی وردی دۆخەکەمان کرد، بیروڕاو سەرنج و رادەی زانیاریان لەسەرمان زانین، بڕیارو بۆچوونی کۆبونەوەکانمان بۆ دەرکەوت.. بۆیە گەیشتینە ئەو سەرئەنجامەی پێویستە بە راشکاوی کێشەکان یەکالا بکەینەوەو چیکە بەم چەشنە لەناو کۆڕەکدا نەمێنینەوە. سەرەتا لە تەك سکرتێری ینك کۆبوینەوەو چوار سەعات قسەمان کرد.. پێمان راگەیاندن کە لە رووی فکری و تیۆری و تەنزیمییەوە تۆزقاڵێکمان باوەڕ بە کۆڕەك نەماوەو ناتوانین لە ناویاندا درێژە بە کارو تێکۆشان بدەین، بەڵام ئەمانەوێ لە تەك ینك دا دۆستایەتی بکەین و جۆری ئەم دۆستایەتیەش پاشەڕۆژ بڕیاری تەواوی لێدەدەین. ئەویش بیروڕای خۆی دەربڕی و رەق و نەرمی و باش و دیبلۆماسیەتی ناوێتە کرد.. نەرمی بەرامبەر ئێمە.. رەقی بەرامبەر کاك سالارو م. جەعفەر. سەرەئەنجام گوتی من وەکو خۆم لایەنگری دۆستایەتی و هاوکاریتانم ئەگەر بەرنامەو بڕیارەکانتان وا بوو پێکەوە بسازێین.

دوای ئەو لەتەك ناوەندی کۆڕەك دا کۆبونەوە، هەمان سەرنج و بیروڕامان لەسەر دۆخەکەو کۆڕەك و بۆچونەکانمان بۆدەربڕین. ئەوانیش سەبارەت بە مفاوەزات، شەڕی ناوخۆ، لەشکر جودا کردنەوە، چەند پرسیارێکیان کردو ئێمەش وەڵامیان دانەوە کە یەکەم ئەگەر ئێوە مفاوەزاتتان کرد ئێمە نایەینە ناوی، بەڵام بۆ ئەوەی رژێم سود لە هەڵوێستی یەکسەرو توندی ئێمە وەرنەگرێ و کەمترین دەستکەوت بکاتە بنەمای رێککەوتن لەگەڵتاندا، تا دەرکەوتنی سەرەئەنجامی گفتوگۆکە، ئێمە ماوەیەکی باش بێدەنگ دەبین، بەڵام دوای ئەوە رای خۆمان دەرئەبڕین. لەسەر شەڕی ناوخۆش، دیسان گوتمان دژی شەڕی ناوخۆین و هیوامانە نەمێنێ.. دوا هەڵوێستیش لە کۆبونەوەی فراوانماندا دەری ئەبڕین.

ئەوان بەرەسمی دژایەتی هەڵوێستیان نەکردین و گەیشتینە ئەوە کە تا سەری ساڵ ئێمە کۆبونەوەی فراوان بکەین و دوا بڕیارو سیاسەتی خۆمان دارێژین.. ئەوانیش ئیجرائات لەگەڵ هیچ هاوڕێیەکدا نەکەن وا ئێستا خەریکین لەناو خەڵك ئەم هەڵوێستە رۆشن دەکەینەوەو ئەوانیش دیارە بەردەوام لەبەرژەوەندی خۆیاندا قسە دەکەن و بەرگری لە رێبازی خۆیان دەکەن و پروپاگەندە بڵاودەکەنەوە. دووریش نیە گێچەڵی لاوەکیشمان دووچار بکەن. دیارە ئێوەش پێویستە بە پشوویەکی شۆڕشگێڕانە پروپاگەندەی ئازادی دەربڕینی بیروڕا بکەن.. سەربەستی هەڵبژاردنی رێباز بڵاوبکەنەوە، بەڵام لە هەمانکاتدا ئەم قۆناغە ناسکە، ئاڵۆزە، بگرە قۆناغێکی ئینتیقالی خەتەرو چارەنووسسازە سەبارەت بە نەیارەکەمان. بۆیە سۆزو سایکۆلۆژییەتی جەماوەر لەبەرچاو بگرن و قسە لەوە بکەن ئەگەر ینك دیموکراسی و ئازادی بسەلمێنێ.. ئێمە جیاکردنەوەی هێزمان پێباش نیە.. ئەم خاڵە زۆر گرنگە تا ئەوەندەی سیاسەتی رۆشنی خۆمان. رۆشن ئەکەینەوە، تا ئەوەندەی لەم قۆناغەش فروفێڵی ئەوان دەرئەکەوێ. ئینجا قۆناغی نوێ دێتە کایە.. دیارە پەرت و کەرت نەکردنی هێزی پ.م لەم قۆناغەدا جەماوەریش پێی خۆشە.. سەرەتا ئێمە کە دەتوانین ئازادی دروستکردنی رێکخستن پیادە بکەین و جەماوەری پێ قایل بکەین.. دیارە دوا بڕیاریش هی ئەم قسەو بۆچوونانە نیە.. بەڵکو هی کۆبونەوەی فراوانی هەموو هاوڕێیانەو وا ئەکەین تا مانگێکی تر سازیبدەین و بیگرین و تەواوی مەسەلەکانی تیا شیبکەینەوە.

هیواداریین بە چری و وردی بکەونە کار، بکەونە قسەو موناقەشە، بکەونە پروپاگەندەی شۆڕشگێڕانە کە بتوانین بەرپەرچی ئەو شاڵاوە دژە کۆمۆنیستیەو پروپاگەندە ژەهراویانە بدرێتەوە حەمەن ئەمڕۆ تا ماوەیەکیش چڕ تر ئەکرێ لەسەرمان.

تێبینی:

هیواداریین لەگەڵ تەواوی ئەڵقەکانی ئاڵای شۆڕشدا بگەینە گفتوگۆ بۆ وەرگرتنی یەك هەڵوێستی هاوبەش.

**ئەڵقەی ناوەندی نوسەران**

**۱۹۸۵/۱۰/۱۷**

**مالومە**

شەشەم نامەی زیندان

# نامەیەك لە زیندانی یاخسەمەر

هاوڕێیانی خۆشەویست سڵاوێکی کۆمۆنیستانە

نامەکەتان گەیشت و ناوەڕۆکەکەیم بەدڵ بوو سەبارەت بەم وەزعەو ئەوەی ئێمەش گوتبوومان و نووسیبومان شتێکی ئەوتۆ لە بۆچوونەکانی ئێوە جیاواز نەبوو تەنها هێندە هەیە کە کار بگاتە سەر بینینیان، ئێوە بە ڕەسمی بیان بینن باشترە لە ئێمە ئەگەر بێت و ڕێککەوتنیشیان لەگەڵ ئێوە هەڵوەشاندەوە بەرامبەر جەماوەرو مەسەلە دیموکراسیەکان داشی خۆمان سوار دەبێ.

ئێستاش لەوە ناچێ ئەو هەوڵانە شتێکی ئەو تۆی سەوز کردبێ بۆیە وای بە باش دەزانین نامەی مانگرتنەکە چاپ بکرێ و بە پێشەکی و پاشەکیەکەیەوە، لە دێڕێکی سەرەوەدا نوسراوە (نزیکەی بیست ڕۆژە سجنی سیاسەتی..هتد) ئەو نزیکەی بیست ڕۆژە (بکەنە نزیکەی مانگێکە).

بێگومان ئەمە مەسەلەیەکی چارەنووسساز سەبارەت بە ژیان و سیاسەت و بڕیارەکانمان. بۆیە پێویستی بە نەخشەی وردو هەمە لایەنەیە. پێویستی زۆربەی خەڵك بەتایبەت دڵسۆزان و شەخسیەتە بەناوبانگەکان، لە نووسەران و پیاوە ئاینیەکان، سیاسیە کۆن و تازە ناسراوە ناودارەکان، ڕێکخراو و گروپ و حزبەکان، هەموو لایەك ببینن و داوای هەڵوێستیش لە هەموو لایەك بکەن. گەر بکرێ کەسوکاری ئێمە و شێخ عەلی و هاوڕێ پشکۆو هەروەها چەندین ئافرەت و خوشکی هاوڕێیانی دیکە بەناوی کەسوکاری هەرسێکمانەوە، تێکرا پێکەوە را بێنە دێی یاخسەمەرو لەوێ لە مزگەوتەکەی مانبگرن و گەر بشکرێ یەك دوو لافیتەی مەعقول وەك (ئازادی بۆ مەلابەختیارو شێخ عەلی و پشکۆ) (پێشێلکردنی دیموکراسی لە خزمەتی دوژمناندایە).. لافتەی واش بنوسن و فعلا بێنن لەو مزگەوتە مانبگرن و تا چارەنووسی ئێمە دەردەکەوێ لەوێ نەجووڵێن کە سەرجەم ١٥٠ ئافرەت بە منداڵەکانیشیانەوە ڕێکبخەن زۆر تەئسیری دەبێ بۆ سەر سۆزی خەڵك پێشمەرگەو زەغتێکی گەورەش دەبێ بۆ سەریان. دیارە دەبێ ئەو خوشکانە بێنن و قسەشیان بۆ بکەن کە زۆر ژیرانە مەسەلەکان تەرح بکەن و بە عاقڵی قسە لەگەڵ پێشمەرگەو خەڵك بدوێنن، نەك بە جنێو هەڕەشە با ئەمەش تەقلیدێکی نوێ بێ ئێمە دای بهێنین تا دیموکراسیەت زۆر خۆشەویستر بکرێ و ببێتە داخوازی جەماوەری و نمونەی مانگرتنەکەی خەڵکی سنەو مەریوان بیر بخەنەوە چەند تەئسیری هەبوو لەسەر دەوڵەتی ئێران بۆ بەردانی چەندین کادری کۆمەڵە، لەوانە کاك ئیبراهیم کە سەرکردایەتیشیان بوو. ساڵی (١٩٨٠).

دیارە تا زۆریش بن زۆرتر تەئسیریان دەبێ گەر بکرێ حسابی پۆشتەیی جلوبەرگ و ئەو شتانەی خۆشیان، لەگەڵ شیرو خواردن بۆ منداڵەکانیان بکەن. خۆیان بگرن و زوو بێتاقەت نەبن، جا ئەمە تەجروبەیەکی نوێیە هیوادارین. بەسەرکەوتوویی لێی بێنە دەرو تەقلیدێکی شۆڕشگێڕانە بێ بۆ ڕەخساندنی زەمینەی خەباتی چینایەتی و جەماوەری، مێژووی مانگرتنەکەش لە ١٩٨٥/١٢/٣٠ بێ. زوو سەرو نوسخەی بنێرن بۆ کۆمەڵەو دیموکرات و چریکەکان کە هەر هەموویان لە یەك ناوچەدان. ئەگەر بتوانن زوو بیگەیەنە جودیش خراپ نییە بەتایبەتی بگاتە سەرکردایەتیان، رووناك لە ڕێی بایزەوە دەتوانێ بیگەیەنێ.. هەروەها دەستتان دەگاتە هەر سەر تیپ و کەرت و شوێنێکی پ.م بە سەیارەو کەسوکاری خۆیان بێ بەناوی نامەی تایبەتی بۆیان بنێرن، هیوادارین لەم پێنج ڕۆژە فریایی تەواوی ئیشەکان بکەون و ئێوە لیژنەیەك بۆ سەر پەرشتی ئەم کارە دروستبکەن هەر زووش هاوڕێیانی هەولێریش ببینن بۆ ئەم مەبەستە تکام وایە شەوو ڕۆژ بخەنە سەر یەك و ئیش بکەن تا ئەم کارە بەنەخشە سەر دەخرێ.

گەر هات و وێڕای ئەوەش سەرکردایەتی یەکێتی سوور بوو لەسەر بەرنەدانمان.. ئەوا بێگومان ئێمە بەرەو کاروانی

شەهیدانی بزوتنەوەی کۆمۆنیستی شۆڕشگێڕ دوا هەناسەی مانگرتن ئەدەین و ئاڵای ئەم خەباتە پیرۆزە بۆ تەواوی هاوڕێیان و کۆمۆنیستەکان بەجێدەهێڵین و ئەو کەموکوڕیانەی هەمان بووبێ راستکردنەوەی لەسەر ئێوەیەو ئەمەش رێی خەباتی چینایەتییە وا رێککەوت بتوانین تا ئەم دووڕیانە مێژوویە بمێنین و خزمەتی مارکسیزم - لینینزم بکەین، ئەوەندە هەیە تا دەمرین سەربەزرین هەڵوێستمان هەبوو، سووربوین لەسەر بیروباوەڕ، دوای ئارەزووە تایبەتیەکان نەکەوتین، بەمەرگی ئێمەش گەورەترین حەقیقەتی کۆنەپەرستی بۆرجوازی بچوکی کوردستان بەموتڵەقی دەردەکەوێ.

**بژی بزوتنەوەی کۆمۆنیستی**

**ژێرکەوێ سیاسەتی دژی دیموکراسی**

**هاوڕێتان**

**مەلا بەختیار**

**١٩٨٥/١٢/٢٨**

**یاخسەمەر**

حەوتەم نامەی زیندان
وەڵامی پرۆژەی ناڵای شۆڕش

## هاوڕێی خۆشەویستو دڵسۆز حەمە ئاوات

سڵاوێکی گەرمو هیوام خۆشیو پێشکەوتنتانە.. چاوی هەمووتان ماچ دەکەم.

برام... پێشەکی، ئەری ناکرێ کەمێ دەستوخەتەکەتان خۆش بکەنو لە نووسیندا بایەخێکی زیاتری بدەنێ..!؟ ئێران وواڵتی خەت خۆشانە ئاگادار بن!

کاکە گیان: نامیلکەکەم پێگەیشتو جوانتان چاپ کردووە، بەدڵمە. هەرچەندە چەندین هەڵەی چاپی تیایە، لە هەموو خراپتر لە پەندێکدا گوتراوە: "سنەیەو پایەی حەقو حساب" کەچی کراوە بە "سبەیەو پایەی حەقو حساب" واش رێک کەوتووە بەم شێوەیەش، بێ واتا نەبێ، بەڵام ئەوەی پەندەکە بزانێ ناشرینە بۆمان. بەنسبەت تێبینیەکانی دیشتان، ئەمە وەڵامەکەیانە:

١- بۆ (بزووتنەوەی کۆمۆنیستی شۆڕشگێڕ) دیارە قسەی ئێوەیەو دڵنیاشم دەزانن کە منیش ئەمە دەزانم.. بەڵام دەرگای ئێرە بە قوڕ گیرێ پەلەو پەنامەکی، ئەو هەڵانەم پێ دەکات.. خۆت دەزانیت لە نامیلکەکانی تردا، هەر بەوشێوەیە نووسیومە.. تەنانەت ناونیشانی نامیلکەیەک: "دژایەتی بان چەپ یان بزووتنەوەی کۆمۆنیستی"یە.

٢- بۆ خامۆش.. ئەگەر دیقەتتان دابێ نووسراوە (خامۆش کراوە) زیاتر مەبەستەکە ریڤیژنستەکان دەگرێتەوە کە بونەتە مایەی ئەو خامۆش کردنە. (کراوە- فعلی مقصودە) ووشەکەش لە کوردیا بە نووزەلێبڕین بەکارنایەت، دەگوترێ: "ئەو زۆپایە خامۆش بکە" واتە خەفەی بکەو کەی وویسترا دەگەشێنرێتەوە. هەروەها دەڵێن: "فلانە کەس ماتو خامۆشە" ئەمە مانای ئەوە نییە مردووە.

٣- بۆ لایەنە باڵادەستەکانیش: لەشوێنێ گوتراوە "بڕیاردەری گۆڕەپانی خەباتە دیموکراسیەکەن" وەکو بڕیار بەڕاستی وایە (بەداخیشەوە) بەڵام بڕیاردەر، داڕشتنێکی سیاسی کاتییە، رێبەر و پێشڕەو ناگەیەنێ. هەر ئەمەش لای کۆمۆنیستەکان گرنگە. لەشوێنێکی دیکە نووسراوە "تا ئەوڕادەیەی دژی بەعس، پێشکەوتون، ئازادی لەژێر گوشاری مەترسیە هاوبەشەکاندا، ئەسەلمێنن... تاد" واتە ئەگەر دژی بەعس نەبن کۆنەپەرستن، وە ئەگەر گوشاریان لەسەر نەبێو ئەمانە باوەڕیان بە ئازادی نییە. هەروەها لەلایەکی دیدا دووپات کراوە کەوا "لەم سەردەمدا تەنها بۆرژوازی بچوک ماون لە تەواوکردنی ئەرکەکانی شۆڕشی

بۆرژوازیدا دەوریان مابێ، واتە بەشێکی ئەرکەکانیان لەسەرە، ڕێبەر نین، پێشەنگ نین.. تاد.

٤- سەبارەت بە مەسەلە فکریەکانیش، پێم وایە لەسەر شورەوی هەندێ شتم بە ڕاستو بەڵگە نوسیووە. وەکو قەناعەتیشم وایە، ئەمانە دەبێو دەکرێ، بکرێنە بنچینەیەکی وورد بۆ کێشە ئاڵۆزەکان. لەم قۆناغەدا، قۆناغی ئازادانە باسکردنی قەیرانەکانی ئەزمونی سۆشیالیزمو بزووتنەوەی کۆمۆنیستی، جارێ پێ لەسەر ئەو ڕاستیانەی دەرکەوتوون دابگرینو هاوشانی بەرە بەرە گەلاڵەکردنی زانستیانەی ئەرکە ناوخۆییەکان، دەتوانین بە پشووی پرۆلیتاریانە، بە دووربینی کۆمۆنیستانە، دوور لە پەلەکاری، ئەرکە گشتیو تایبەتیەکان لەمەڕ کێشە جیهانیو ناوچەییو ناوخۆییەکان دیاری بکەینو بیانکەینە چەکی خەباتی چینایەتیو ئایدیۆلۆژیو سیاسیەکان. حەمە گیان. دەبێ ئێوە بزانن سەردەمەکە، گەلێ لە جاران جیاوازە، ئێمە لەبەردەم ئەرکێکی گەلێ گرانو پڕ گرێداین. ئێوە وای مەبینن سەرکەوتن تەنهاوتەنها بەند بێ بە مەسەلە ئایدیۆلۆژیەکان بە دابڕاوی لە مەسەلە سیاسیو تاکتیکیەکان. ئێوە وا مەزانن ئەگەر پەلە نەکەین لە حوکمی گەورە کە دەتوانم بڵێم هێشتا ئەو حوکمە گەورەیە لە هەموو بارێکی: ئابوریو فەلسەفیو کۆمەڵایەتەوە، نەک لای خۆمان، بگرە لە سەرانسەری جیهانیشدا، ساغ نەکراونەتەوە، ئیتر ئێمە تیادەچین، یان بە هەلپەرست، یان بێهەڵوێستی کۆمۆنیستانە دەناسرێین. ئەمانە وا نینو نابێ وا بیربکەینەوە.

من لە نامیلکەکەدا نوسیوومە سەرئەنجامی ململانێو مشتومڕێکی زۆر، ئەنجامەکە دەبێ لە پاشەڕۆژدا لەخزمەتی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی شۆڕشگێڕدا بێ. تکایە لاپەڕە (١٢)ی بخوێننەوەو بزانن ئەو مەرجەی تیایە یان نەء. جا ئێوە ئەمە بخەنە ناو پرۆسەی ئایندەی ڕوداوەکان.. ململانێیەک.. لە پاشەڕۆژدا بخرێتە خزمەتی ئەو پێناوە، چی بەسەردێو بە چ لایەکدا دەکەوێ؟ کە ئێمە دەڵێین ململانێی تیۆری.. بەڕاستی دەبێ پابەندی ئەم ململانێیە بین، ئازادانە "دیموکراسیانە" زانستیانە زەمانو زەمینەی ئێستاو ئایندەی ڕوداوەکان، دیاردەکان، ناکۆکیو ململانێکان لەبەرچاو بگرین. خۆزگە بە ووردی دورو لە سۆزی دڵسۆزی دابڕاو لە کێشەکان. سەرچاوە کلاسیکیەکانی (م.ل)تان دەخوێندەوە. خۆزگە ووردی ئەوە دەچوون ڕێبەرانی مەزنی فەلسەفەکە، چۆن چۆنی ناکۆکیەکانو مشتومڕەکانیان بەڕێوەبردووە، هەنگاو بە هەنگاو چۆنیان ڕەفتار لەتەک لایەنەکانی نامارکسیدا

کردووە، بەرنامەکانیان چۆن هەڵسەنگاندوون‌و بە چ شێوەیەک رایانکێشاونەتە ناو بازنەی مەسەلە فکریەکان‌و پاشان هانیان داوون بۆ کۆڕی خەبات. کە مارکس‌و ئینجلس لە ئینتەرناسیۆنالیستی یەکەمدا، هاوشانی تریدیۆنەکان، باکونیەکان، لاسالیەکان، لەسەر یەک تریبون دادەنیشتن‌و دەکەوتنە مشت‌ومڕی فکری لەتەکیاندا، دەیانزانی هەڵەکانیان چین‌و تا چەند لەخزمەتی کرێکاراندان؟ بەڵام ئەو دەمە، ئەو سیاسەتە، ئەو رێبازە بۆ مسۆگەرکردنی پاشەڕۆژ پێویست بووە. لینین کە پاش شۆڕشی شوبات (١٩١٧) بەرنامەی کشتوکاڵی سۆشیال شۆڕشگێڕەکان لەسەر جوتیاران قبوڵ دەکات، مەبەستی چی بووە؟ ئەوە نەبێ شۆڕشگێڕانە ئیدارەی ناکۆکیەکان بکات‌و بزانێ چۆنیان یەکالا دەکات‌و کۆسپ‌و تەگەرەکانی لەبەردەم سەرکەوتن لادەبات. ئەو جۆرە نەرمیە، ئەو جۆرە زیرەکیە، ئەرکە ستراتیژیەکانی لا کەمبایەخ نەکردوون، یان دەستیان لێهەڵنەگرتووە. نەخێر، بەپێچەوانەوە پێیان لەسەر داگرتووە. ئێمە کە دەڵێین دەبێ پابەندی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی شۆڕشگێڕ بین‌و پاشەڕۆژی ململانێکانیش لەم پێناوەدا بن، ئیدی روونە بۆ کوێ دەچین. بەڵام چۆن دەچین‌و کەی دەگەین.. ئا ئەمەیان لە هەموو بارێکەوە: هونەریی، فکری‌و سیاسی‌و تەنزیمی دەوێ‌و دەبێ، هەر دەبێ ووشیاریان بین‌و بایەخیان بدەینێ. من پێم وایە نە ئەوە رەهان کە ئێمە ئێستاو لەم کاتەدا دەیانڵێین، نە ئەوەش رەهایە کە لاکانی دیکەی ناو بزووتنەوەی کۆمۆنیستی شۆڕشگێڕ دەیانڵێن. هی ئەوان‌و ئێمەش، قابیلی گۆڕان‌و گەشەکردن، پیاچونەوەو سەرلەنوێ داڕشتنن. باشترین دەستەبەری شۆڕشگێڕانەی ئەمەش، لەئێستاوە هەتا دەرکەوتنی تەواوی راستیەکان، پەلەنەکردن‌و نەسەپاندنی حوکمی قەبەیە، مشت‌ومڕی ئازادانەو مونازەرەی تیۆرییە. بەدڵنیایەوە پێم وایە، هەر هەنگاوێکی قەبەی ئێستا، ئەگەر جووتیش بێ لەگەڵ سۆزی سیاسی رەوتی چەپی بزووتنەوەی کرێکاران‌و چەندین هەنگاویش پێشمان بخات، بەڵام زانستیانەو مێژووییانە نەچەسپێ، لە پاشەڕۆژدا دەیان هەنگاو هەر ئەم هەڵوێستە پاشمان دەخات. هەر ئەو هەنگاوە ئەگەر دوای بخەین‌و بەرە بەرە زانستیانە یەکالای بکەین، ئێستاش بەخێرایی پێشمان نەخات، لە پاشەڕۆژدا، دڵخۆشکەرانە پێشمان دەخات‌و لە سەرکەوتنمان شۆڕشگێڕانەتر نزیک دەخاتەوە. دەتوانم دەیان نموونە بهێنمەوە، بەڵام پێم وایە تەنها نموونەی حیزبی شیوعی قیادەی مەرکەزی بەسە، بۆ ئەوەی بزانین ئەوانە چ هەڵێکی مێژوویی گەورەیان دۆڕاند لەپێناوی هەڵوێستی زلی زانستیانە چارەسەرنەکراودا.

ئێوە بۆ ئەم لاوازییە، ئەم پەرتەوازەییە، ئەم بێهێزییەی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی شۆڕشگێڕ لەم هەلومەرجەدا باش نابینن، ئەمە لەکاتێکیشدا بزووتنەوەکە، ناوەندی جیهانی نییە، رێبەری گەورەی ناسراوی نییە، پشتیوانی بێ درێغی نییە، تەنانەت خەباتی چینایەتی کرێکارانی دەرکەوتوشی نییە. دەی بەبێ هەموو ئەوانە، واتە بەبێ بوونی لەشکرێکی رێکوپێکی پڕ تفاقی جەنگو جەنگین، ستادی شۆڕشگێڕی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی شۆڕشگێڕ، چۆن دەتوانێ بڕیاری شەڕی گەورە بداتو دابەزێتە مەیدان؟ بچن شەڕە فکریەکانی مارکسو ئینجلسو لینین بخوێننەوەو دراسەیان بکەن، بزانن لە بوونی ئەو لەشکرەشدا، واتە: لە بوونی بزووتنەوەی کرێکارانو کۆمۆنیستەکاندا، لە بوونی خۆیانو ناوەندێکی جیهانی خەباتی چینایەتیدا، چۆن دابەزیونەتە مەدانی جەنگینو چەندیش هونەرو مانۆڕی جەنگی سیاسیو ئایدیۆلۆژیان بەکارهێناوە؟

بەڕاستی دەیڵێم، هەر کەسو لایەک، بیەوێ بە کردەوەو کاری شۆڕشگێڕانە، هەتا دوا لوتکەی خەبات، لەگەڵ خەباتی چینایەتی کرێکاراندا بێ، دەبێ، دەربڕینی هیچ هەڵوێستێ دانەبڕێ لە بۆتەی خەباتو رادەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیو ئەندازەی خەباتی چینایەتی، کورتیەکەی وانەزانرێ دەربڕینی هەڵوێست هەر بۆ تۆمارکردنی هەڵوێستە لەسەر لاپەڕەی بڵاوکراوەکان، بەڵکو دەبێ هەڵوێست موتوربەی خەباتە "چینایەتیو سیاسیو جیڤاتی (نقابي)و هونەریو ئەدەبیو عەسکەریو دیبلۆماسیەکان بکرێتو زیرەکانە بچەسپێندرێ هەتا دەبێتە هێزێکی مادی ئایدیۆلۆژی لە شکان نەهاتوو. مارکس دەڵێ: دوای ئەوەی بیروباوەڕ بڵاودەبێتەوەو خەڵک باوەشی پیا دەکات، دەبێتە هێزێکی مادی لە شکان نەهاتوو. لێرەدا جێی خۆیەتی بپرسم، تا ئێستا گروپە مارکسیە شۆڕشگێڕەکان بەڕاستی ئەمەیان پێکاوە؟ بەدڵنیاییەوە دەیڵێم، پێچەوانەکەیان کردووە. چونکە بزووتنەوە بابەتیەکەی مارکسستی شۆڕشگێڕ، باشترو زیاتر لە رێکخراوو گروپەکانی ئەم پێناوە لە عێراقو کوردستاندا، دەرکەوتوەو بووە بە ریالیستیکی حاشاهەڵنەگر، ئەمە لەکاتێکدا گروپەکان لەنێو خۆیاندا هێندەی دژایەتی یەکدیان کردووە، نیو هێندە خزمەتی مارکسیزمیان نەکردووە.

تێبینی: (دوای ئەوەی لە نامەکەتان بومەوەو دەست بە نووسینی ئەم نامەیە کرد، "پرۆژەکەتانم" خوێندەوە. گەرچی جارێکم خوێندەوەو دەتوانم بڵێم ئەم سەرنجانەم بەخێرایی لەسەر کۆکردۆتەوە، وا ئێستا دەیانخەمە بەرچاوتان. واتە تا

ئێرە کە نامەکەم نووسیوە جارێ پرۆژەکەم نەخوێندبوەوە، لەمەودوا سەرنجەکانم هەڵهێنجراوی خوێندنەوەکەن).

٥- چەند سەرنجێکی خێرا لەسەر پرۆژەکە:

هاوڕێیان، پێشەکی ئێوە لەدەرەوەن‌و دەشبێ بڵێم، لەم گۆڕی ئازادیەی من زیاتر ئاگاداری دۆخەکەو پێویستیەکانی سەرشانن، وە ئاگاداری زیاتری ژیانی ڕێکخراوەیی‌و سیاسین. بەڵام لەگەڵ ئەوەشا، چۆنتان نووسیوە پرۆژەو چاوەڕێی ڕەخنەو مشت‌ومڕن لەسەری، ئاواش ئەم چەند سەرنجانەی من وەربگرن.

أ-پێم وایە پەلەتان کردووە لە نووسین‌و داڕشتنیا، لە بڕیاردان لەسەر کۆمەڵێ کێشەی زانستیانە گەڵاڵەنەکراودا. دەبوو ئەم بابەتە لەنێو خۆتاندا، لە کۆڕو کۆبونەوەدا، بە تێروتەسەلی باسیان بکەن، ووردیان بن، ئەوسا لە کۆنفرەنسێکدا کە باشترین کادرو ئەندامی گروپەکەی تیا دانیشتایە، بڕیاری لێبڕاوتان لەسەر دابا، ئەویش وەکو (پرۆژە).

ب-لە مەسەلە ئابوریەکاندا، سەبارەت بە سیستەمی سەرمایەداری جیهان. تاڕادەیەکی زۆر باشی بۆ چوون، ئەوە نەبێ پێم وایە کەمتر شتەکانتان بەستۆتەوە بە ئیمپریالیزمی نوێ، کە خۆی لە کۆمپانیا فرە ناسنامەکاندا دەبینێتەوە. چونکە ئەمە گەوهەری ئیمپریالیزمی ئەم سەردەمەیەو لەگەڵ سەردەمەکەی لینین‌و ئۆکتۆبەردا، دەتوانم بڵێم: ئیمپریالیزمی ئیمپریالیزمە. باسکردن‌و روونکردنەوەی ئەمە گەلێ گەلێ گرنگە بۆ مارکسیە شۆڕشگێڕەکان. پێشم وایە هەر ئەمەش بنەمای ئابوری سەرهەڵدانی بزووتنەوەی مارکسستی شۆڕشگێڕە، پاشان مەسەلەی ریڤیژنیزم (کە ئێوە لەمەشدا بەهەڵە چوون) چونکە لە روانگەی مارکسیەکانەوە، هێزو پەیوەندی سەرمایەداری سەردەمەکە بنچینەیە بۆ رێبازی ئایدیۆلۆژی، پاش ئەوە ئەو دیاردانەی هەن‌و خراپن. با تۆزێ ئەمە روون بکەمەوە:

مەسەلەی سەرەکی‌و بنچینەیی لای مارکسیەکان چییە؟ دیارە ناکۆکی نێوان کارو سەرمایەیە، باشە، ئەم ناکۆکیە لەم سەردەمەدا خۆی لە چییا دەدۆزێتەوە، هەڵبەتە لەناو ئەنباشتی ئەو سەرمایەو سەرمایەداریەدا کە ئیمپریالیزمی نوێ نوێنەرێتی‌و ئەو هێزی زەبەندی کارەدا، کە هێزی کاری کرێگرتەی جیهان، کرێکاران، بەرجەستەیەتی. کە ئەمە دیاریکرا و ناسرا، ئەوسا سیستەمە ئابوری جیهانیەکە خانەبەند، یان بەش بەش دەکرێن‌و دەبەسترێنەوە بە دەوڵەتە جیاجیاکانی جیهانی سەرمایەداری کە لەژێر دەستی پەیوەندیەکانی سیستەمی سەرمایەو

سەرمایەداری سەردەمەکەدان. پاش ئەمانە دێین‌و ڕێبازە ئایدیۆلۆژی‌و سیاسیە جیهانی‌و ناوچەییەکەی کرێکاران هەڵدەسەنگێنین‌و دیالیکتیکیانە تاوتوێ دەکەین‌و دەریدەخەین کە ئاخۆ: ئەو ڕێبازەی هەیەو بووە، توانیویەتی‌و دەتوانێ لەئاستی خواستە چینایەتیە بنچینەیەکانی پرۆلیتاریاو گەلاندا بێ، یان نەء. ئەگەر توانیویەتی، چۆنی توانیووە؟ ئەگەر نەیتوانیووە، بۆچی نەیتوانیووە؟ سەرەنجام، بەرەنجامی یەکێتی دژەکانمان بۆ دێتەدەستو دەردەکەوێ، ڕێبازە کۆنەکە، بەسەرچووەکە، چۆن چۆنی ئەتوانێ پێشڕەوی پەرەسەندووی سەردەمەکە بێ، وە دەبێ بە چ شێوەیەک ڕێبازی گەشەپێدراوی مارکسیزم بسەلمێندرێ، کە ئەویش بزووتنەوەی نوێی کۆمۆنیستی شۆڕشگێڕە. هەڵبەتە لەناو ئەو لێکدانەوەیەدا، پایەو پێگەی پەیوەندییە ئابوریەکانی شورەوی‌و هاوپەیمانیەکانی، چین‌و مامەندەکانی، دەبێ بایەخێکی گرنگی بدرێتێ‌و هەمەلایەنە، مارکسستانە، دیاری بکرێ. کە پێم وایە کۆن‌و نوێ، لەوساوە لینین مردووە تا گورباتشۆفو پروسترویکاو گلاس مۆش سەریهەڵداوە، هەمان پێوەر دەیانگرێتەوەو دەشبێ ئەمە بەئەندازەی پێویستیەکانی ساغ بکرێتەوە، نەک بەگوێرەی ئارەزوو.

ج-ئێوە نووسیوتانە (پرۆژەی بەرنامە)، چاکە، هەڵساوون، بەند بەندی ئەرکەکانی بەرنامەی لایەنی کەمتان داڕشتووە، بەڵام کەم‌و زۆر بەلای ئەرکەکانی بەرنامەی لایەنی دوردا نەڕۆیشتوون. کە خۆتان دەزانن بەرنامەی لایەنی کەم لای مارکسیەکان، ئەرکی تاکتیکین بۆ گەیشتن بە ئەرکە ستراتیژیەکان، کە بەرنامەی لایەنی دوورن. زۆر گرنگە مارکسیەکان مەکزیمۆم‌و مینیمۆمی ڕۆشنیان هەبێ. پێشم وایە بەرنامەی لایەنی دوور، وەکو ئەرکی سەرەکییە، بەڵام کەم کێشەترە لەچاو بەرنامەی لایەنی کەم، کەچی ئەوتان پشتگوێ خستووەو ئەمتان کردۆتە سەرەکی. واتە سەرەکیەکە کراوەتە ناسەرەکی‌و ناسەرەکیەکە کراوەتە سەرەکی. ئەمەش روون نەبوونی ئەرکە ستراتیژی‌و تاکتیکیەکانی مارکسیەکان دەگەیەنێ لاتان. کە دەبوو هیچ نەبێ بتانوسیبا بۆ واتان کردووە.

د-بەرنامەی لایەنی کەم، بەدیهێنانی ئەرکە سیاسیە دیموکراسیەکانە، ئەگەر جاران مەسەلەی جوتیاران، ناوەرۆکی ئەرکە ڕزگاری‌و دیموکراسیەکانی شۆڕشی دیموکراسی بوبن، لەم سەردەمەدا، سەردەمی ئیمپریالیزمی نوێیدا، خۆتان دەزانن کۆمپانیە فرە ناسنامەکانیان خۆیان هەڵدەستن بە جێبەجێکردنی ریفۆرمی کشتوکاڵی‌و تەنانەت هانی ڕژێمە وابەستەکانیان ئەدەن نوتو پیشەسازییە

گەورەکانیش خۆماڵی بۆرژوایانە بکەن، چاوتان لێیە سەردەم چی لێهاتووەو پەیوەندیەکانی چۆن گۆڕاوون..؟ کەواتە چی جێگەی مەسەلەی جوتیارانی گرتۆتەوە؟ چی جێگەی مەسەلەی ریفۆرمی کشتوکاڵی‌و خۆماڵی بۆرژوایانەی گرتۆتەوە کە جاران دروشمی هەرە سەرەکی حیزبە بۆرژواکانی ئۆپۆزسیۆن بوون.. ئێستا مەسەلەی نەتەوایەتی چارەسەرنەکراو، یان نیمچە چارەسەرنەکراو، سەرتاقی (لوحة) مەسەلە دیموکراسیە بۆرژوا ژێردەستەو سەردەستەکانە، بەتایبەتی لەناو وولاتە دواکەوتوەکاندا. تەنانەت لەناو وولاتە پێشکەوتوتر لە عێراق‌و تورکیاو ئێرانیشدا، وەکو ئیسپانیاو ئیرلەندە.. هەروەها لەناو شورەوی‌و چین‌و ئۆروپای رۆژهەڵاتیشدا. بزانە:

عێراق: لە ریفۆرمی کشتوکاڵ‌و خۆماڵی‌و یاسای کار و شارستانیەت.. تاد. هەنگاوی پێشخستن‌و پێشکەوتنی بەرچاوی ناوە لەچاو قاسم‌و عارفیەکان. بەڵام لە مەسەلە نەتەوایەتیەکەدا شۆڤێنستە. تورکیا هەروەها و سوریاش. بۆرژوای نەتەوەی ژێردەستەش ئا ئامەی بۆ ماوەتەوە دانەتەپێ‌و بازرگانی بە داخوازیەکانیەوە بکات.

ئیسپانیاو ئیرلەندەش: هەروەها، بەڵام جیاوازتر لەوانی دی. مەسەلەی باسک‌و ئیرلەندە بووە بە کیشەیەکی قوڵ‌و ئەو دوو رژێمە لەڕووی پیشەسازی‌و کۆمەڵایەتیەوە پێشکەوتووە، بەوپەڕی توانا لە سەرکوتکردنی ئەو پاشماوە خواستە نەتەوایەتیەن کە ماوون‌و دەزانرێن.

لەناو ئەوانە مەسەلەی کوردو کوردستان، ئەرمەن‌و ئەرمەنستان، بلوچ‌و بلوجستان، وەکو تاقە سێ نەتەوەی داگیرو دابەشکراو بەسەر چەند دەوڵەتدا، تایبەتمەندیەکی تایبەتی هەیە لەجیهاندا کە دڵنیابین، لە پاشەڕۆژدا دەبنە مەسەلەیەکی گەورەو گرانی رۆژهەڵات. چونکە شۆڕشی دیموکراسی.. ئەرکە دیموکراسیەکان.. هەر دەبێ ببرێنەسەرو ئەمەش لە هیچ وولاتێکدا، ستەمە وەکو پێویست فەراهەم بێ ئەگەر مەسەلەی نەتەوایەتی باش‌و دیموکراسیانەی تەواو و چارەسەر نەکرێ. گەر بمانەوێ‌و نەمانەوێ، وورده بۆرژوا هەر لەم مەیدانەدا ماوەو لەم پێناوەشدا هەموو شتێ دەکات. جا کەوابێ، دەبێ مارکسیەکان لەم سەردەمەدا، زۆر باشتر لە جاران درک بەمە بکەن‌و لە بەرنامەی لایەنی کەمیاندا، باشترین‌و شۆرشگێڕانەترین چارەسەری بۆ داڕێژن. رۆڵ‌و بایەخی بزانن‌و ئەڵقەی پەیوەندیەکانی بە خەباتە چینایەتیەکە دیاری بکەن‌و ئەمیان بخەنە خزمەتی ئەو، پێکیان ببەستن‌و زیرەکانە

ئەم چەکەش، کە بەهێزترین چەکی بۆرژوا ناسیۆنالیستەکانە لەشانیان داماڵن. بەداخەوە ئێوە واتان نەکردووەو نەتانپێکاوە. چۆن؟

بە عەقڵی کێدا دەچێ ئێوە خۆتان کوردن‌و لەکوردستاندان، ئاگاتان لەوە بێ نەتەوەی عەرەب پارچە پارچەیەو مافیانە یەک بگرن. بەڵام کەم‌و زۆر بەنسبەت کوردەکە، وەکو نەتەوەیەک ئەمەتان پێ رەوا نەبینووە. هیچ نەبێ ئەوان ستەمی نەتەوایەتیان (جگە لە فەلەستین) لەسەر نەماوە، بەڵام کورد (جگە لە کەمایەتیەکەی شورەوی) درندانەترین ستەمی نەتەوایەتی لەسەرە. بۆ دەبێ نەتەوەیەکی سەردەستە، خاوەنی بیست قەبارەی دەوڵەتی، مافی یەکگرتنی هەبێ، بەڵام نەتەوەیەکی بێ قەوارەی سیاسی‌و بێبەش لە مافە دیموکراسیەکانی ئەم مافەی نەبێ. ئێوە دەزانن ئەم سیاسەتە چ زیانێکی کاریگەری لە "حیزبە کۆمۆنیستەکانی!" ئەو وولاتانە داوە کە کوردستانیان بەسەردا دابەشێندراوە؟ ئاگاتان لەوەیە تەنانەت ریڤیژنستەکانی تورکیاش خەریکن مەسەلەی نەتەوەی کورد دەهێنە گۆڕێ..! چاوتان لێیە چ پەلەیەکتان کردووە لەم مەسەلە گرنگە؟ پێ بزانم شکستی ئێستای شۆڕشی کوردستان کارامەییەکی زۆری لەسەر ئەو بڕیارەتان داناوەو دوور نییە پێتان وا بوبێ، ئەم شکستە، شکستی یەجگاری خەباتی نەتەوایەتیە. ئای کە هەڵەن‌و بەهەڵەدا چوون، ئای کە کورت بینیەکی سیاسیانەی سەیرە! ئەوپەڕەکەی رەنگە پاساوی ئەمە لاتان ئەوەبێ: گوایە مەسەلە ئابوریەکان لای مارکسیەکان گرنگەو ئەمەش، واتە پەیوەندی ئابوری هاوبەش لەناو نەتەوەی کورددا لەکوردستاندا، نابینن. هەڵبەتە لە وەها حاڵەتێکدا بەهەڵە چوون، چونکە:

ئەو مەرجانەی کۆن بۆ نەتەوەبوونی نەتەوەکان دادەنران‌و مەسەلەی ئابوری تیایا دەکرایە پێوەری بنەڕەتی: ١- زمانی هاوبەش. ٢- مێژووی هاوبەش. ٣- پێکهاتنی سایکۆلۆژی هاوبەش. ٤- خاکی هاوبەش، کە خاڵی دواییان ئابوری هاوبەشیش دەگرێتەوە. ئەو مەرجانە ئەسڵەن، لە مەرجە قوڕەکانی سەردەمی ستالینەو زەمانەو روداوەکان دەریان خست، مەرجی ئابوری ئەگەر بۆ خەباتی چینایەتی هاوبەش‌و خەباتی نیشتمانی هاوبەش وەکو مەسەلە سیاسیەکان گرنگ‌و کاریگەر بێ، بەڵام ئەگەر نەشبێ‌و نەخەملابێ، یان رێگەیان لە پرۆسەی خەملینی سورشتیانەشی گرتبێ، لە وەها حاڵەتێکیشدا، شیرازەی ئابوریەکەش پسێندرابێ، رشتەکانی دیکە نەتەوە پێکەوە دەبەستن‌و بۆیان هەیە ببنە مەسەلەیەکی سیاسی شۆرشگێڕانەی هاوبەش. بۆ نموونە دیقەت بەن:

لە وڵاتێکی وەکو شورەوی کە زیاتر لە (١٠٠) نەتەوەو گەلو کەمینەو گروپی میللی تیایە، دۆخی ئەمانە هەموو چونیەک نییە، گەلێ مەسەلەیان جیاوازو گەلێکی دیشیان لەگۆڕاندان. ناوچە کڵپەسەندووەکان لەکوێی ئەم وولاتەدان؟ لە ئاسیای ناوەندیدا نین. کەچی لە (باڵتیک) دا کە مێژوویەکی ئاڵۆزی هەیەو لەبەرئەوەی هاوسنوورەکانی (پۆڵۆنیاو فنلاندە) سەربەخۆییان وەرگرتووە لەکاتی خۆیا، هەلومەرجەکە دەگۆڕێو ئەم مەسەلە مێژووییە لە باڵتیکدا کاردەکاتە سەر رەوتی روداوەکانو کێشەی نەتەوایەتی، سەرەڕای نەبوونی ئابوری هاوبەش، دەبزوێنێ. لە لیتوانیای کاسۆلیکدا کە رۆژگارێکی کۆن خاوەن ئیمبراتوریەتی گەورەی چەرخەکانی ناوەڕاست بوون، هەستی نەتەوایەتیو سەربەخۆیی وەرگرتن گەلێ بەهێزترە لە هی ئستوانیای پروتستان کە بەدرێژایی مێژوو ژێردەستەی سویدو هۆڵەندەو ئاڵمانیاو رووسیا.. تاد بوون. تەنانەت لە ئۆکرانیاشدا، جیاوازی گەورە لەنێوان بەشەکانی رۆژهەڵاتو رۆژئاواییدا هەیە. ناسیۆنالیستی ئۆکرانی هەتا ئێستاش لە بەشی رۆژئاوادا، جۆ دەخوا، هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ رابوردوو، چونکە ناوچەیەکی سنوور بووە لەنێوان پۆڵۆنیاو رووسیاداو دەستی بەدەستی پێکراوەو جۆرێ جوڵانەوەی بەرهەڵستی تیابووە. لەهەمان کاتدا رۆژئاواکەی وا نەبوەو نییە. باسکەکانی ئیسپانیاو فەرەنساو بالکانەکان، هی ئیسپانیەکانیان زیاتر لە خەباتی رزگاری میلیدان چونکە مێژوویان روداوی جیاوازی دیوەو هەستو هەڵوێستیان گۆڕانی بەسەرا هاتووە. دەی باشە، لەم نمونانەدا کوا مەسەلەی ئابوری هاوبەش، بەئەندازەی هەستی نەتەوایەتیو روداوی مێژوویيو دیاردەی سیاسی، تەئسیری هەبووە؟ بەحساب لەو وولاتانەدا هەرگیز نەدەبوو وابێ.. برام!

ئەم جیهانە لە بۆتەی تەسکدا، یەک لایەنیدا، قەتیس نییەو قەتیسیش ناکرێ. داڕشتنی بەرنامەی مارکسیانە (ئەوپەڕی رستەی شۆڕشگێڕانەشی تیابێ) ئەگەر گیانی سەردەمەکەو ئەزمونە مێژووییەکانو رەوتی روداوەکانو ئایندەی ئەرکەکان، بەرجەستە نەکاتو نەبێتە کلیلی چارەسەرکردنی زانستیانەی کێشەو گرفتەکان، بە چ دەچێت!؟

ه-لە پرۆژەکەدا، کەمو زۆر بەلای دۆخی تایبەتی کوردستانی عێراقیش نەبون کە روونە هاوشانی خەباتە چینایەتیە هاوبەشەکەو ئەرکە دیموکراسیەکان، بۆ خۆیشی شتێکە. ئەگەر ئەم مەسەلەیە بنەمای نەبێ، ئەمە چۆن لەساڵی (١٩٥٨) وە، بۆتە مەسەلەیەکی کاریگەری وولاتەکە، بگرە مەسەلەی سیاسی سەرەکیشە.

نووسیوتانە مافی چارەنووسی بدرێتێ.. باشە ئەم مافە کێ بەڕێوەی بەرێ، حیزبی کۆمۆنیستی کرێکارانی عێراق، چۆن چۆنی رێکی دەخاتو بە چ رێکخراوێ بەڕێوەی دەبات؟ ئەمانە لەبن گۆمی پرۆژەکەدان. پرسیارێ لەخۆتان بکەن.. کە مەعقولە ریڤیژنستەکان، هەرێمی کوردستانی حیزبەکەیان هەبێ، رێکخراوی مارکسی شۆڕشگێڕ (یانەی) کوردستانی رێکخراوەکەیانیش نەبێ؟! (سەیرە!) بەراشکاوی دەیڵێم ئەمە لادانە لەو بنچینەیەی کاتی خۆی ململانێی لەسەر کراوەو ئاڵای بۆ دامەزراوە. بەش بەحاڵی خۆم پرۆژەکە وەکو کودەتایەک (هیچ نەبێ لەمبارەوە) دێتەبەرچاووم کە بەسەر پرۆژە کۆنەکەدا کراوە. هەڵبەتە ئەمەم وا بۆ لێکمەدەنەوە کە لایەنگری ئەوە نیم پرۆژەی کۆن پەرەی بدرێتێو گەشەبکات.. یان دەستکاری بکرێ، نەخێر مەبەستم ئەمەیان نییەو رەنگە رای من لەمبارەوە باش بزانن. مەبەستەکەم هێندەیە کە کاتی خۆی جیاوازی گەورەو کاریگەری ئێمە لەگەڵ گروپە چەپەکانی تر لەوەدا بوو کەوا هەمیشە –ئاڵا– لەناو بزووتنەوە ریالستیەکەدا قاڵ دەبوو، لێی دانەدەبڕا، خەباتی تیا دەکردو روانگەی چارەسەرکردنی بۆ کێشەکانی دەردەبڕی. واتە بە کارو کردەوە لەناو بۆتەی جوڵانەوە ریالیستەکەدا (واقعی) بوینو هەنگاومان بۆ هەڵدەگرت، لەکاتێکدا گروپەکانی دی، زیاتر تیۆریو شێوە کاری ئەکادیمیان گرتبووە بەر، بۆیە ئەوان پاشو ئێمە پێش دەکەوتین. کە مارکس فەرموویەتی:

"هەر هەنگاوێ کردار هەڵیدێنێ، گرنگترە لە هەزار دەرزەن بەرنامە". زانیویەتی چی دەڵێ.. هاوڕێیان. دەتوانم دوپاتی بکەمەوە ئەم پرۆژەیە رێک پێچەوانەی بۆچونی مارکسە.

و-مەسەلەی جووتیاران: جارێ لە رووی مێژووییەوە ئێوە بەهەڵە چوون ئەگەر واتان زانیبێ پاش سەرکەوتنی کۆماری بۆرژوازی لەعێراقدا، سیستەمی دەرەبەگایەتی نەماوەو رماوە. هەر واشتان نووسیوە. راستە لەو شۆڕشەدا، یاسای ریفۆرمی کشتوکاڵ بانگەشە کراو هەنگاوی باشیشی بۆ نراوە. بەڵام دەبێ بزانن هەتا ئەوکاتەی قاسم گەرمەی لافلێدانی دیموکراسیانەی بوو، روپێوی ئەو زەویانەی دانرابوون بکەونە بەر یاسای کشتوکاڵیەکە (١٢) دوانزە ملیۆن دۆنم بووە، هەتا تەممووزی (١٩٦٠) زەوی دەرەبەگەکانو زەوی ئەمیری پوخت کە دەستیان بەسەرا گیراوەو دابەشێندراونەتە سەر جووتیاران، (٥٠٠,٠٠٠) پێنج سەد هەزار دۆنم تێنەپەڕیوە. واتە لە (٥٪)ی ئەو زەویانەی بڕیار بووە دەستیان بەسەرا

بگیرێ. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ نۆ ملیۆن دۆنم ئەرز بەدەست دەرەبەگەکانەوە ماوە.

لە مادەی یەکەمی یاساکەشدا (ژمارە ٣٠ ساڵی ١٩٥٨) وای بەشی دەرەبەگ داناوە:

١- هەزار دۆنم بەراو... دوو هەزار دێمەکار.

٢- پاش پێنج ساڵ دەست بەسەر ئەرزی زیاتر لەو رووپێوەی بۆ دەرەبەگ دانراوە بگیرێ.. واتە هەتا پێنج ساڵیش زۆرتریشیان لەدەست مابێ حەلاڵیان بێ.

بۆ جوتیارانیش:

٣- لە (٣٠) هەتا (٦٠) دۆنم بەراو... لە (٦٠)یش هەتا (١٢٠) دۆنم دێم.

ئینجا لە ساڵی ١٩٧٠ دا، بەپێی یاسا ژمارە (١١٧) بەعسییەکان هەتا ساڵی (١٩٧٥) دەست بەسەر (٦،٠٦٦،٧٣٨) ملیۆن دۆنمی دیدا گیراوە. سەرجەم کردویەتی (١٠٢٥٦٢٣٩) دۆنم.. واتە سەرجەم لە (١٩٥٨)وە هەتا ئەوکاتەی سەرەوە. ئەمەش بکەینە بنەمای یاساکانی رژێمە بۆرژواکان. جگەلەوەی هێشتا دوو ملیۆن ئەرز بەدەست دەرەبەگەوە لەو ئەرزانەی بۆ کشتوکاڵ دەستنیشان کراوە ماوە.. سەدان هەزار دۆنم ئەرزی دیکەشی چۆتە سەر. ئاڵوگۆڕەکانی کوردستان لەم ساڵانەشدا سەبارەت بە دەرەبەگ لەبەرچاو بگرن.. سەرەنجام:

جووتیاران لەپاش روخاندنی رژێمی پاشایەتی وا نەبوون کە ئێوە بۆی چوون، پاش ئەوە زیاتر لە (١٥) ساڵی دیکەی وویست وەکو ئێستای لێهاتووە.. ئەمە جگە لەوەی پێ دەچێ ئێوە جووتیاران بە تەواوەتی بە بەشێ لە چینی کرێکاران بزانن‌و هەر بەو پێیەش حوکمیان لەسەر بدەن. (کە ئەمە وا نییە) بۆیە نووسیوتانە (ئەنجومەنە کرێکاریەکان) دەست بەسەر کێڵگەکانی دەوڵەتی‌و تایبەتیدا بگرێ. باشە کە دەڵێن لە دیموکراسی شۆڕشگێڕدا دکتاتۆریەتی کرێکاران‌و زەحمەتکێشان پیادە دەکرێ، بۆچی ئەو دەسەڵاتە ئەنجومەنەکانیشی نەگرێتەوە؟ خۆ ئەنجومەنەکانی شۆڕشی ئۆکتۆبەر کرێکاران‌و جووتیاران‌و سەربازەکانیشی دەگرتەوە. ئەگەر تەنها کرێکاران شۆڕەسوار بن لە شۆڕشی دیموکراسیدا.. کەواتە بۆچی شۆڕشی سۆشیالیستی ناکەن؟ لەبەرئەوەی وا نییە، جگە لە کرێکاران، زەحمەتکێشانی شارو لادێش رۆڵی گرنگیان ماوە.. بۆیە دەگوترێ: تەواوکردنی ئەرکەکانی شۆڕشی دیموکراسی، کە رۆڵیشیان مابێ‌و سەنگیان هەبێ، مەحاڵە لەو شۆڕشەدا کۆبکرێنەوە ئەگەر لە دەسەڵاتی سەرکەوتوی شۆڕشەکەدا (ئەنجومەنەکان)و باڵاتریش، شوێنیان دیاری

نەکرێ‌و بەو دەستکەوتەش هان نەدرێن بۆ هاوخەباتیکردن لەگەڵ کرێکاراندا. جگە لەمانەش بەش بە حاڵی خۆم پێم وایە:

مەسەلەی جووتیاران لە وولاتانی مانەندی عێراق، پێویستی بە توێژینەوەی قوڵ هەیە کە ئاخۆ لە شۆڕشی دیموکراسی شۆڕشگێڕانەدا، چۆن چۆنی سەیر بکرێن‌و باقی کێشە چارەسەرنەکراوەکانیان، یان هی تازەی سەرهەڵداویان، چۆن یەکالا بکرێن؟ بە کۆمەڵەی هەرەوەزی.. بە کۆمۆنی کشتوکاڵی.. کۆڵخۆزات.. بە هی تایبەتی‌و دەوڵەتی.. بە کامە لەوانە. چونکە مەسەلەی جووتیاران زۆر زۆر لەوە قوڵترە کە سەیر کراوون. خۆ لەبەرچاویشتانە شورەوی گیرۆدەی چی بووە بەدەستیەوە.

هاوڕێ:

ئەو تێبینیانە خۆت دەزانیت بنچینەیین، ناشێ بتانخەڵەتێنم‌و بڵێم رەوتەنین. ئێوە کە بڕیاریشتان داوە پرۆژەکە بنووسرێ، یان هیچ نەبێ ئەوانەی نووسیویانە، باوەڕی تەواویان پێی هەیە. بێگومان لەمەیدا ئازادن. وا ئەم نامەیەی منیشتان دەگاتێ، دوور نییە هی چەند کەسێکی دیشتان بگاتێ. ئەگەر بۆچونەکانی من‌و هی ترتان سەلماند، پێتان راست بوون، ئەوا پێم پەسەندە ئەو پرۆژەیە تەنها بۆ ئەندامانی رێکخستن دانێن‌و بەهیچ چەشنێ مەیدەنە خەڵکی غەیرەو لایەنەکانی تر. ئەگەر ئەم پێشنیازەی منیشتان قبوڵ نەکردو سووورن لەسەر بڵاوکردنی، دیسان لەمەشدا سەرپشکن، لەمبارەوە دوا رای خۆم هەڵدەگرم هەتا ئازاد دەبم، ئەوسا دیارە بەتەواوەتی ساغ دەبینەوە.

لەکۆتاییشدا، بۆیە لە رەخنەکانمدا مەسەلەی شورەوییم باسنەکردووە. چونکە لە پێشەکی نامەکەدا پێش خوێندنەوەی پرۆژەکە، بۆچونەکانم هەمان مەسەلەی گرتۆتەوە، پاشان دوا نامیلکە زۆر شتم رۆشن کردۆتەوە. کە نووسەرانی پرۆژەکەش بە ئیمپریالیزم‌و ئەو بابەتە بۆچونانەی دەزانن.. هیچ ناڵێم.. هێندە نەبێ، پێنج ساڵیش تەرح بۆ ئەوان بەڵکو ئەم بڕیارەیان، لەسەر بنچینەی زانستی، ئابوری مارکسستی، بسەلمێنن.. پڕبەدڵ لەمبارەوە ئەگەر پێنج ساڵی دیش سەرکەوتن، لەئێستەوە دەستخۆشی‌و پیرۆزباییان لێدەکەم. بۆ خۆشم چیم پێ بکرێ درێغیم نەکردووەو ناشیکەم.

بەنسبەت نووسینیش. ئەگەر زانیم زیاترم دوادەخەن، جار جارە هەر لەو بابەتە نامیلکەیەی چاپتان کردووە لەسەر ئایار، بابەتی جۆراوجۆر دەنووسم‌و

بۆتانی دەنێرم. ئەمجارە بڕیارم داوە نامیلکەیەکی وا لەسەر شۆڕشی چەکداری درێژخایەن لەژێر ناوی (ڕێبازی شۆڕشی درێژخایەن نەگۆڕە؟) هیوادارم بتوانم تەواوی بکەم، چونکە خۆت دەزانیت دراسەی زۆر دەکەم‌و نووسینی گرنگترم بەدەستەوەیە، بەتایبەتی ئەو کتێبەی لەسەر (شۆڕشی دیموکراسی). ئەگەر تەنها بم، شەوو ڕۆژێ هەشت سەعات دەخوێنم‌و دوو تا سێ سەعاتیش دەنووسم. سەعاتێ وەرزش‌و باقیەکەشی خەوتن‌و خواردن‌و خەفەت.

- زۆریشتان لەسەر (عماد) نوسیووەو کەمتان لە من بیستووە. لەمەشدا حەزدەکەم بزانن نەمویستوەو ناشمەوێ ئازادی زۆرانی ئایدیۆلۆژیتان سڕ بکەن‌و گوێی نەدەنێ. ئەمەیان ئێوەو ئەوانیش با بیکەن. بەڵام گوتومەو دەیڵێم، هەموو شتێ سنووری هەیە، شتەکان مەخەنە قاڵبی دوژمنایەتی ڕقەبەرایەتی ناسیاسیانە، (کە شەڕ دەکەن بەشی ئاشتی تیا بهێڵنەوە). ئینجا کە ئەوان هەڵیانکوتاوەتە سەر ژوری م.پشکۆ، کارێکی زۆر ناجوامێرانەیان کردووەو مرۆڤ قێزی لە کردەوەی وا دێتەوە. بەڵام بیرتان نەچێ ئەوە موویەکە لەو کردەوانەی (ینک) بەرامبەری کردووین. حەقە بایەخیش بەوە بدەن لەوەزیاتر پاڵیان پێوە بنێن، یان دژیان بوەستن، بەتایبەتی ئێستا کەوا بیستومە خەڵکیان لێدەبێتەوە، دوور نییە لەوە خراپتر هەڵوێست وەربگرن، بەتایبەتی لەگەڵ (ینک)دا. لەو ماوەیەشدا (کاردۆ) وەڵامی ناردووە بۆ ینک کە ئەگەر لەم ناوە جێیان بکەنەوە بارەگایان دێننە لایان. ئەمە بکەن هی دیش دەکەن. حسابی بۆ بکەن.. حسابی سیاسیش گرنگە هاوڕێیان، نەک تەنها پرۆژە.

- بیستوتانە کەوا لەناو (کملک)دا کێشە کۆنە خەفەکراوەکان دژی خۆمان، بەتوندی سەریانهەڵداوە. بەئاشکرا فراکسیۆنی زیندانی کۆن، کەوتونەتەوە جموجۆڵ.. نووکی ڕمی سەرەکیان دژی (نەوشیروان). گوایە!! دەیانەوێ کۆمەڵە بکەنەوە بە مارکسی. لەسەر ئەمانە ئەمە کورتەی ڕامە:

جارێ ستەمە کۆمەڵە بکرێتەوە بە مارکسی.. فراکسیۆنەکە خۆشیان مارکسی نین، تاک تاکیان ڕەنگە باوەڕی بە مارکسیزم هەبێ، بەڵام هەرگیز وەکو تاقم‌و ڕێباز، فریان بەسەرەوە نییە. ئەمەیان وایە، ئەی چارە؟ چار ئەوەیە لەڕووی سیاسیەوە، بۆ ئەم هەلومەرجەی کورد، ئەگەر قسەیان لەگەڵ ئێوە کرد، پێیان بڵێن برایان:

ئیستا (نەک ئەوسای ئێمە) شۆڕشی کوردستان‌و (ینک) بەرگەی ئەوە ناگرێ ئەوان لەناوخۆیاندا بیگەیەننە رادەی جیابونەوە. هەر بەراستیش باوەڕم وایە، ئەگەر ینک ئەو جیابونەوەیەی تیا نەکرێ‌و بتوانێ شتێ بە شتێ، وەکو ینک بکات. ئێمە دژی جیابونەوەکە نین، ئەگەرچی هەردوولایان ئەوەی کردویانە بەرامبەرمان، ناکرێتەوە. چونکە پێم وایە دەبێ چارەنووسی کوردمان لا گرنگتر بێ، لەوەی چی بەمانە دێ. ئەمەیان حەق‌و حسابێکە پەیوەستە بە پاشەڕۆژێکی دوورەوە. دەزانم چارەنووسی کورد بەدەست ئەمانە نییە. لەگەڵ ئەوەشا، هەتا کوسپی دەربازبوون لەم میحنەتە کەم بکرێ، باشترە.

ئەگەر هات‌و هەر کردیشیان، ئەوکاتە پەیوەندی بەخۆیانەوە هەیەو هێندەی بەئێوەشەوە بەستراوە، پێویستە لایەنگری ئەو باڵە بن کە لە باڵەکەی تر پلەیەک، یان چەند پلەیەک پێشکەوتوتر، یان بڵێین، چەپترن. خۆشتان دەزانن گەر لەئێستاوە بەلای هەر باڵێکیاندا دایشکێنن، باڵەکەی تر دژی بەردانی من دەبێ. جا ئەمەشتان لەبەرچاو بێ.

- جگە لەمانە، پێدەچێ گروپێکی گچکەی دیکە هەبن‌و ئەوانیش سەریان ناوە بەیەکەوە. من تا ئێستا ناوی (ئازاد جندیانی)م بیستووە، ئەمیش نزیکە لە کاک (یوسف)ی وەرگێڕ، پێم وایە ئەمانە کەسانی ئەمین، بێ فروفێڵ، راستگۆن. بەڕاستی دڵسۆزن. دەمێنێتەوە سەر رادەی باوەڕیان بە کۆمۆنیزم‌و رێبازی مارکسی شۆڕشگێڕ، کوردستانی‌و عێراقی، بەشێوەیەکی گشتی هاوکاری‌و دۆستایەتی لەگەڵیاندا لە فراکسیۆنی زیندان، بۆ پاشەڕۆژی خەباتی شۆڕشگێڕانە، بەکەڵکتر دەزانم. مەسەلە فکریەکانیش، بەرە بەرە سەرەنجامی مشت‌ومڕی هەمەلایەنە گەلاڵە دەبن. خۆتان دەزانن ئاسان نییە ئەوان، یان هەر لایەکی دیکە، بەئاسانی‌و ئاسایی بێت‌و کۆمەڵێ مەسەلە هەیە تا ئێستا لایان روون نییە، یان پێچەوانە بیریان کردۆتەوە، بسەلمێنن‌و سەراپا، بڕوایان بگۆڕن. بۆیە تکامە لەگەڵ ئەماندا، هەوڵێکی جدی بدەن‌و هەرچیەکتان پێدەکرێ لە کۆمەکیان درێغی نەکەن.

برای خۆشەویست!

لەکۆتاییدا، پێم خۆشە نامەکە پشانی م. پشکۆو کاکە شێخیش بدەیت.. گەلێ بیریان دەکەم.. راستە من ساڵ‌و دوو مانگ دوای ئەوانیش لەم گۆڕی ئازادییە زیندوو نەبومەتەوە، بەڵام لە (١٩٨٨/٤/١٠)وە کە زانیومە دوای ئەوانیش رزگاریان بووە، لە (٥٠٪)ی پەژارەم کەمبۆتەوە. من ژیانی ئەوانم گەلێ لا مەبەست بوو.

لەپاش هەڵهاتن‌و گرتنەوەم، گەلێ ئەشکەنجەیان دام‌و گەلێ هەوڵیان دا بزانن ئەوان ئاگاداری هەڵهاتنم بوون‌و ئەوانیش ویستویانە هەڵبێن.. بەهیچ شێوەیەک نەم درکاند کە ئەوانیش ئاگادار بوبن. کە بیستیشم شێخ نارەحەتە.. نامەیەکی شەخسی‌و تکا کارانەم بۆ سکرتێری ینک نووسی کە ئەو هیچ گوناحێکی لە راکردنی مندا نەبێ، بۆ لەسەر من ئەزیەتی دەدەن. دوای ئەوە بیستمەوە، تەحقیقیان لەسەر هەڵگرتوەو بردبوشیان بۆ لای م.پشکۆ.

تکاشم وایە هەرچی نامەو بەڵگەنامەی منتان لایە، لە زێوەو ئەو نزیکانەیان مەهێڵن. نەکا (هەڵمەتێکی شێرانە)ی دیکە بەرنە سەر ژوورەکانتان! شوێنێکی ئەمین‌و ئومان بدۆزنەوە.

دیسان رێزی بێ پایان‌و خۆشەویستی هاورێیانە.

هاورێی دڵسۆزتان
م.بەختیار
١٩٨٩/٥/١٤

ئەرشیفی حەمە ئاوات، ئەندامی سەرکردایەتی ئالای شۆرش و جێگە باوەری مەلا بەختیار.

*
بەبێ بزوتنەوە و ڕاپەڕینی کرێکاران و جەماوەری سەرتاپای عێراق بە عەرەب و کورد و کەمە نەتەوایەتیەکانەوە بە سەرکردایەتی حیزبی پێشڕەوی پرۆلیتاریا ڕوخاندنی ڕژێم خەون و خەیاڵە.

بەبێ ئەم بزوتنەوەو ڕاپەڕین حیزبە پێشڕەوەی کرێکارانیش ، ڕژێمێکی دیموکراتی کرێکاری ( دیموکراتیکی شۆڕشگێڕانە ) بەرقەرار نابێ.

بەبێ بەرقەرار بونی ڕژێمێکی دیموکراتی کرێکاریش، دابین کردنی مافی چارەنوس بۆ کورد و مافی ڕەوای کەمە نەتەوایەتیەکان نایەتە دی.

ئەوەش پرنسیپێکی لینینیە مێژوو ساغی کردوەتەوە و هەتا دێت واقیع زیاتری ئەچەسپێنێ ، ئەگەر نا هەشت ساڵ بگرە هەشتا ساڵی تریش ووتەی بۆرجوازی سەرکردایەتی بزوتنەوەی میللەتەکەمان بکات و خەبات زەرد و سووری ( ڕزگاری و ڕامالین ) بلاو بکاتەوە ئەم ڕاستیەش لە حالەتی کوردا و ڕیشەی تایبەتیدا ناگۆڕێ.

چوارەم /

بڕوونی حالی سێهەم سەرچاوەکەی سیستەمی ئابوری زاڵ و واقیعی کۆمەلایەتی ئێستامانە - کە ئەتوانین بلێین هێزەکانی بەرهەم هێنان و پەیوەندی یەکانی بەرهەم هێنان لە کوردستانی عێراقدا ، سەرەڕای پاراستنی هەندێ سیمای تایبەتی خۆیان ، بەلام بە شێوەیەکی گشتی، سیستەمی ئابوری سەرمایە- داری ووڵاتەکەی بەسەرا زاڵە .

*
چینەکانی کوردستان ، چ ئەوانەی لەگەڵ ڕژێمدا ڕوێشتون و چەوسێنەرن ، وە چ ئەوانەی لە بەرەی گەلن و چەوساوەن ، لە چوار چێوەی سیستەمی ئابوری ووڵاتەکەدا ئەچەوسێننەوە یان ئەچەوسێنرێنەوە.

بۆ نمونە بورجوازی پیشەسازی کوردستان ، توێژێکی کەم و کەم بایەخیان نیە سەربەخۆیەکیان ماوە لە مەیدانی ئابوریدا ، باقیان وەکو چین لە ئەنجامی چینەکانی گرەوی پاشکۆی ڕاستەوخۆی ڕژێمن و لە خانەی چەوسێنەران ئەژمێررێن .

کرێکارانی کوردستانیش بە شێوەیەکی گشتی، کەمیان نەبێ لە کەرتە ئابوریە تایبەتیەکانی کوردستاندا کار ئەکەن ، ئەمیش لە ژێر تەئسیری ڕەوتی ئابوری ووڵاتە باقیان کە زۆرینەن و زۆربەی کارگەرەکەن ، لە کەرتە ئابوریە گشتیەکە ( القط

!لعام أ ! هێزی بازوێان ئەفرۆشن و لەگەڵ باقی کرێکارانی عێراق
لە رووی ،، نەك لە رووی نەتەوایەتیەوە) بەرەی چینی کرێکارانـــی
چەوساوە ڕەی چینی سەرمایەداری چەوسێنەریێك ئەهێنن٠
واتە ناکۆکی بنچینەیی و سەرەکی، نێوان کار و سەرمایە لە عێراقدا هاتۆتە کایە و تووند و تیژی نێوان سەرمایەدارانی دەوڵەتی عێراق و پاشکۆکانیانە لە لایەك وەك کرێکارانی عەرەب و کورد و کەمە نەتەوایەتیەکانە لە لایەکی تر٠
لە واقیعی ئابوری و ناکۆکی نێوان کار و سەرمایەی وولاتی، وادا لـــەم سەردەمدا کە ناکری مەسەلەی میللەتەکمان وەك میللەتی ژێر دەستە نەگــە چی بە هۆی شۆڤینیەتی بورجوازی نەتەوەی سەردەستە و چەندین هـــۆی ترەوە بزوتنەوە میللیـەکە ی بە هێزبی و پێویستـە لە ڕوانگەی پرولیتاریا وە هەڵسەنگینەری و دوا رۆژی دیاری بکری و حسابی پێویستی بۆ بکری بەلام لە رووی زانستیەوە وە لە ڕوانگەی چینایەتی پرولیتاریەوە ناکری ئەم مەسەلە میللیەمان لە سیستەمی ئابوری و واقیعی چینایەتی وولاتی جیا بکەینەوە کـــە دەیان ساڵە میللەتەکە شمانی گرتوتە خۆ٠
ناکری (م٠ل) کوردستان بـە کرێکارانی کوردستان بڵێین ئێوە تەنیـــا بیرتان لای مەســـەلە نەتەوایەتیە کەو کوردایەتیەکە بی و حەقتان بەمـــەوە پەیوەندی بەرهەم هێنان و سیستەمی ئابوری و رۆژانە چەوساندنەوەی چینایە ـ تیتانەوە نەبی ،کە لە راستیدا ئەساسی چەوساندنەوە نەتەوایەتیەکەیـە و بەستراوەتەوە بە سیستەمە ئابوریەکەوە٠
ناکـــری م٠ل کوردستـان بە جوتیاران بڵێین گوی مەدەنە ئەوەی سیستەمی دەرەبەگایەتی لە کوردستـاندا بە هۆی گۆرنکاریـیــەکانی عێراق و کوردستانەوە هەڵ ئەوەشێتەوە ئێوە کوردایەتی بکەن ئەگەرچی ئەم کوردایەتیە وەکو بزوتنەـ وەی نیشتمانی سەردەمی کـــۆن ناوەرۆکەکـــەی کوت و مت مەسەلە جوتیـاران نیە٠ ئەمە دژی زانستی گەشە کردنی کۆمەڵایەتیە ،دژی لۆژیك و پرنسیپـــی ئەساسی (م٠ل) ە ، هەراندنی ناوەرۆی مارکسیزم و قبول کردنیەتی بەو مەرجەی تەواوی ناسیونالیستەکان پێی رازی بـن و سەربە خۆی کرێکاران ئەهێڵن٠
بێگومان لە هەمان کاتیشدا ناکری (م٠ل)کـان تەنها بایەخ بە لایـەنـە تیئوری و چینایـەتیەکان بدەن و لە رووی پراکتیکیـەوە خەباتی دیموکراتیانەی تەقیوی میللەتی ژێر دەستـە کە میللەتی کوردمانە بۆ ووردە بورجــــوازی و
ـ٩١ـ

پاشماوەی باقی چینەکانی ئەو مەسەلە بەجێ بهێڵن ، پەیوەندی ئۆرگانیکـــی نێوان ناکۆکی بنچینەیی کار و سەرمایەی واقیعی ئێستای عێراق و مەسەلەی میللەتە ژێر دەستەکان ، لە چوار چێوەی سیستەمی ئابووری وولاتەکەدا پێویستە سەیر بکرێ و ناکرێ هیچیان لە بنچینەی ئابووری وولاتەکەوە لە مەسەلە میللییەکە لە سەر حسابی یەکتر حسابی بۆ بکرێ ، تەنانەت لە رووی سیاسییەوە ، وە لە رووی نەتەوەیی و ئیدیۆلۆجی و مافی دیموکراتییەوە مارکسیستەکان ئەبێ ئەوەش لە بەر چاو بگرن کە عەرەب و کورد لە عێراقدا ، هەر لە یەکەمیان بەشێکن لە نەتەوەی گەورەی دابەش کراویان کە هیوای یەکگرتنەوەیان لە نێوان دا هەیە ، هەرکاتێ جیا بوونەوە و یەکگرتنەوەی هەر نەتەوەیەکیان لە قازانجی بزووتنەوەی بەتایبەتی کوردی کرێکاران و سۆسیالیزمدا هاتە گۆڕێ ، وە ئەگەر ئەو جیا بوونەوە یەکگرتنـ ـەوەیە دژی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستان بوو ، ئەوا ئەرکێکی مارکسیستانەی سەر شانی مارکسیستەکانە بێ چەند و چوون پشتگیری ئەم جۆرە جیابوونـــەوەو یەکگرتنەوەیە بکەن ، بە تایبەتی ئەرکی سەرشانی مارکسیستەکانی نەتەوەی سەر دەستە لە هەموو ئەو وولاتانەی کوردستانیان بەسەرا دابەش کراوە پشتگیری ئەم جۆرە جیابوونەوەیەی کورد بکەن ئەگەر لە رۆژێکی پرۆلیتاریا وە هاتە گۆڕێ ، هەروەها لە بەرامبەر ئەو ئەرکەی مارکسیستەکانی نەتەوەی سەردەستە ، ئەرکی سەرشانی مارکسیستەکانی ئێمەی نەتەوەی ژێردەستیش ئەوەیە گیانی یەکگرتنەو و یەکیەتی چینایەتی پرۆلیتاری بلاو بکەینەوە و خۆمان لە دەمارگیری نەتەوایەتی و گۆشەگیری ناسیونالیستانەی نەتەوەی ژێر دەســت رزگار بکەین و تەنها بەم گیانە مەزن و رۆحیەتە پیرۆزەی فەلسەفەی مارکسیزم ـ لینینیزم ئەتوانین بەسەلمێنین، دروست کراوی بورجوازی شۆڤێنستی نەتەوەی سەردەست و نەتەوەی بن دەســت بتوێنینەوە و روو بە رووی ئەرکەکان ببینەوە.

پەیوەندی دیالکتیکی مەسەلەی کورد و خەڵکی عێراق بە تایبەتی کرێکارانی کورد و باقی کرێکارانی عێراق لەو راستیانەوە دەرئەکەوێ و تەنها بە ســۆزی نەتەوایەتی پەتی ناتوانین راستی زانستی چارەنووسمان وا پێشبینی بکەین ، ئەوانەی پێشبینی ئەکەن و دژی ئەبن بە بیانووی ئەوەی مەسەلەی کورد یەک مەســەلەیە و هەر ئەبێ یەک ستراتیجی بۆ دانێین و ئەوەش کوردستانییەتی سەرتاسەرییە ، ئەوانە ناسیونالیستە گۆشەگیرەکانن کە بەو جۆرە سیاسەتانــە رێگا بۆ خۆیان خۆش ئەکەن بۆ ئەوەی بە ناوی بەرژەوەندی تەسکـــــــی

ـ ٣٠ ـ

...ـەلەی ... ، ئەو لایەنی دیموکراتی ، نەتەوایەتی لێبدوان و گفت
...وی تیرو ... بکرێ و هەموو لایەك بەشداری تیا بکات ، هەتا دوای
...شێکی د... ر و لێکۆڵینەوەیەکی وورد لە پاشە ڕۆژدا! بەرنامەی چینایەتی
...ربازی سیاسی بۆ کێشە چینایەتیەکان و مەسەلەی میللەتەکان و خەباتی
...موکراتیانە دیاری بکرێ •
...تیکرای ئەو کێشانەی کۆمەڵ ، تیکرای ئەو پێویستیانەی ئەرکی سەرشان
...ە سەر شانی پرۆلیتاری شۆرشگێرانە

بۆ پێشەوە

بەهیوای دوا ڕۆژی سەرکەوتنی کرێکاران و زەحمەتکێشان
ژێرکەوتوو بێ سیاسەتی مساومە خوازی
سەرکەوتوو بێ خەباتی شۆرشگێرانەی کوردستان
بژی سۆشیالیزم ،
بڕوخێن فاشیستەکانی عێراق •

ئاڵای شۆرش

-٣٣-

ناساندنی
چاپخانەکەمان!

خوێنەری بەڕێز...

ئێستا لە هەموو کاتێ زیاتر مارکسیستەکان پێویستیان بە بەرهەمی نووسراو و چاپخانەی ڕێک و پێک هەیە چونکە دوژمنە هەمە جۆرەکانی کرێکاران، دوژمنانی مارکسیزم، زاڵ و بە نفوزن، خاوەن پارە و پوڵن ئیمکان و چاپەمەنیان هەیە، وە دەرەتی چەواشەکارییان گەورەیە.

مارکسیستەکانیش تەنها و تەنها بیر و باوەڕ کۆڵ و نەدان و ڕێکخستنیان بە دەستە تا بتوانن دەنگی خۆیان بە ڕاشکاوی و بەردەوامی بگەیەننە کرێکاران و زەحمەتکێشان و ڕێبازە ڕاستەکەیان بڵاو بکەنەوە. ئەمەش بە بێ چاپخانە و چاپەمەنی هەرگیز ناکرێ. بۆ ئەم ئەرکەش (ئالای شۆڕش) توانی بە پێی توانا چاپخانەیەک دامەزرێنێ بە ئومێدی ئەوەی ببێتە بناغەی دامەزراندنی چاپخانەیەکی مۆدێرن لە پاشە ڕۆژدا.

بۆ تەرزانین و یادی ئەو قارەمانانەی لە سەختترین ڕۆژگاردا بە جوانە مەرگ کردنی خۆیان تلسمی سامناکی مەرگیان بەزاند و بە جەماوەریان ووت کرێکاران شۆڕشگێڕترین چینی کۆمەڵ ڕچەشکێنەری ڕێی دوا ڕۆژی نەهێشتنی هەموو جۆرە چەوساندنەوەیەکن.

ناوی چاپخانەکەمان بە ناوی ڕۆڵەیەکی نەمری چینی کرێکاران، بە ناوی کرێکارێکی مارکسیستی شۆڕشگێڕەوە ئەنێین، کە لە دێی (سازان) لە دایک بووە، لە هەڵەبجە پەروەردە بووە، لە سلێمانیدا کرێکاری کردووە، لەم شۆڕشەدا یەکەمین شاوریی پێشمەرگەی کۆمەڵە بووە، گوڵی ئەحمەد هەڵمەتەیەوی داوە لە بەرۆکی مێژووی نوێی ئەم شۆڕشە. ئەویش شەهید (فاتیح شێخ حەمەد مەرە) کە لە دێی قاینجەدا لە شەڕێکی دەستەویەخەدا ئەنگاوترا و نەیویست مێژوو بە دیل گرتنی کرێکارێکی پێشمەرگە تۆمار بکا و فاشیستەکان شانازی بە گرتنی مارکسیستێکەوە بکەن. بۆیە بە دەستی خۆی گوللەی شەرەفی یەکەم شەهیدی ئەم شۆڕشەی نا بە خۆیەوە.

پێمان وایە زۆر نیە و خەڵکی کوردستان بە تایبەتی کرێکاران و زەحمەتکێشان و ڕووناکبیرە شۆڕشگێڕەکان باشیان لە بیرە کە دوای ئاشبەتاڵ هەرچی باوەڕ و هیوا بە وردە بۆرجوازی و پاشماوەی باتی چینەکانی کۆمەڵ نەمابوو

ئەی کرێکارانی دونیا یەکگــــــرن !

نامانامەی تیئـوری ... بەشـی یەکەم /

قوناغی وەرچەرخاندن

( دەرسەی زانستیانە ، خەباتـی شۆڕشگێڕانـە ، ڕێکخستنی پۆلاییـانە )

لەدێر زەمانەوە کاروانی پێشەنبەری و زانیاری میللەتەکەمان بزێوتووە، کاروانیش قوناغ بە قوناغ بە پێی یاسای گۆڕان و گەشەکردنی کۆمەڵایەتی لە رەوتی تایبەتی کوردەواریدا لە وەرچەرخانە چینایەتییەکاندا وەچانی چینایەتی سەپێنەری تایبەتی قوناغەکەی داوەو رەنگ و بارگی گۆڕیوە و تەکانی بەرەو پێشکەوتنە کۆمەڵایەتی،

داوە و بەردەوام لە گۆڕانا بووە و گەر بێت و
ڕەوتی گۆڕاوی ڕۆشنبیری قۆناغەکان لەبەر
چاو بگرین بۆمان ساغ ئەبێتەوە کە لەو
ڕۆژەوە بە پەندی پێشینیان و حیکایەت خوانان
یەکەمین هەنگاوی هەڵهێناوە تا چاخی
ڕۆژنامەگەری کوردی و فەرهەنگی حیزبایەتی
جۆراوجۆر،

هەر قۆناغی ئاکار و ئاثاری چینی زاڵی
قۆناغەکە و چینەکانی تریشی پێوە دیارە بەڵام
ئێستاش نەتوانراوە وەك پێویستە ڕۆشنبیری
و زانیاری کۆمەڵایەتی لە کوردستاندا پاك و
پەسەن بگری، تا بزانری چەوسێنەران بۆ
درێژە پێدانی چەوساندنەوە چییان بۆ خۆیان
هەڵبەستووە، چەوساوەکانیش بۆ نەهێشتنی
چەوساندنەوە چییان ووتووە.

بینی جاریار نوسەری، دڵسۆزی، ڕەخنەگری
لەم حیزب و ئەم حیزبدا؛ لەم نووسینا و
ئەو نووسیندا هەوڵیان داوە ئەم ئەرکە

- ٦ -

بگرنە ئەستۆ ، بەڵام بۆ کەس و هیچ داپۆدەمزە گاریکی سیاسی ئەرکی وا نەچۆتە سەر ، چونکە ئەرکەکە گرانە و بەبێ نوێنەری راستەقینەی کرێکاران و زەحمەتکێشان فەراهەم نابێ ، عانەت بەم حیزبەش ماوەیەکی زۆرو کۆششێکی گەورەی گەرەکە .

ئەم حالەتی تێکەلاویەی رۆشنبیری چینەتی و نەبوونی نوێنەری راستەقینەی کرێکارانە هەمیشە بورجوازیەکان قازانجیان لێکردووە و تا ئیستاش زەمینەیەکی سازە بۆ چینە زاڵەکان لە رووی سیاسیەوە بیقۆزنەوە و ئەرامەکانیانی پێ بەرنە ری و ریباز و سیاسەتی جەواشەی پرواتیانیا بسەپێنن . . عەراق مێژوویەکی نەزۆکەوە تا ئەگاتە شکستی ، ناشبەتاڵ،داشکاندن بەلای دوژمنان ،شەری ناوخۆ تائێستە بوونەوەی ناوخۆ . بەرژەوەندیان چی خواستبێ و خەیان چۆنیان پێ باش بوبێ ئەوەیان کردووە و کەیان نەداوەتە جەماوەر و نیشتمان و راستیە

— ٢ —

زانستیەکـان •

رووداوەکانی ئیستاش سەلمینەری ئەو راستیا-
نەن ، بەهـۆی زالی ووورده بورجوازی نفوزداری
( کوردایەتی چوارپارچەوە ) ، بە هۆی نەبوونـی
پیشرەوی راستەقینەی کریکاران و زەحمەتکیشانـەوە ؛
بەهـۆی نزمـی ئاستی ووشیاری چینایەتیـەوە
نەینەرانـی ریبازی چەواشەی پرولیتاریا ، بـی
گوی دانە خواستی خەلك و هەل و مەرجـی
عیراق وکوردستـان و ناوچەکە هەر لـە ریی
ـەدان لە وانەی بەحساب باوەریشیان بە (م‌ل )
و کریکاران و خەباتی چینایەتی هەیە بەهـۆی
چەواشەکردنیانەوە شـۆرش زیندە بەچال ئە-
کەن و دەیهان سیاسەت و تاکتیکی دژبـە
عیدای کریکاران و جەماوەر هەر لە ریی ئەوانـەوە
[illegible]بەجی ئەکەن و بە ناوی (م٠ل)وە گیانـی
زیندووی مارکسیـزم ئەبرن و دلی خەلکـی
ای [illegible]ارد ئەکەنەوە•
ئەو راستیانە و دەیهان راستی زانستی تـر

- ٤ -

لێك دانەوەی زانستیانە و لێكۆڵینەوەی ماركسیستانەی گەرمەكە تا لە دووریانی ئەم قوناغەدا سنووری دوور لە یەك و دژ بە یەكی كرێكاران و بورجوازییەكان سەرتاپا دیاری بكری و دەستی وورد ەبورجوازی بخرێتە روو ماهییەتیان رسوا بكری •

گەر مرۆ وورد و دوور لە پەیوەندی تایبەتی سەرنج بداتە بەرنامە و جۆری پەروەردەی رۆشنبیری كادیران و ئەندامانی كۆمەڵە • بۆی دەردەكەوی كۆمەڵە لە كۆڕ و كۆبوونەوەكانیاندا ئەوەیان چەسپاندووە كە (م•ل) تەنها فەلسەفەی روشنكردنەوەی رێی خەباتە، بە بۆچوونی دوستان و قەواعدیان بەهەندێ لایەنی تایبەتی فەلسەفەی مەتریالیزمی مێژوویی و مەتریالیزمی دیالكتیكی گوێ ئەدەن، بە حساب ئەوان ماركسیزم • ئەگوردێنن • و لەگەڵ بارودۆخی تایبەتی كوردستانی • ئەگونجێنن • ایەتی وەكو بورجوازی بچوكی كوردستان

— ٥ —

مەبەستیان ڕوشنە ئەویش ئەوەیە تەنهـــا
مەسەلە ناسیونالیستیەکیان لا گرنگە و هێندێش
ئیشیان بە مارکسیزم هەیە کە خەلکی چەوشە
بکەن . لە کاتێکدا ئەوان ڕاستیە زانستیەکەش
باش ئەزانـــن کە بە هیچ جورێ مەتریالیزمـــی
مێژوویی و دیالکتیکی لە زانستی ئابووری و زوانی
چینایەتی و سوشیالیـــزم و دکتاتوریەتـــی
پرولیتاریا و کومونیزم جیا نابیتەوە و هەموو ئـــەو
لایەنە گری دراوانەش ئەکاتە مارکسیزم – لینینیزم .
لـــە ناو هەر کومەل و دەولەت و میللەتیکیشـــدا
ڕێ و شوێنی تایبەتی چونیەتی گورینی ئەو کومەلـــە
و سەرخستنی مارکسیـــزمی تیا بە جەشنیکـــی
ئورگانیك ڕەچاو ئەکری و مارکسیزمیش زانستی –
تریـــن ئەواسنەی دونیایە کە لەم بارەوە یاسای
گشتی و یاسای تایبەتی پیکەوە بەستوتەوە . ئەم
ڕاستیانە لە لایەن تیوریستیەکانی ڕیبازی چەپ–
ەوە باش ئەزانـــری . بەلام بەدبەختیان
ئەوە ئەخوازی دژی بن و پشتیوانی کەن ، ...

— ٦ —

چون برنشتاین و کاوتسکی و هاوەڵەکانیان لەهەڵبژاردنی و دزێشی بوون •

ئەگەر مارکسیزم تەنها بریتی بوایە لە ناکۆکی چینایەتی و باس کردنی سوشیالیزم ، زۆر کەس و شەری دونیا هەموو ڕوویان تێدەدا، وە هیچیش پێویستی نەئەکرد پرولیتاریا حیزبی سەربەخۆی تایبەتی خۆی هەبێ • چونکە دەمێکە هەموو چینەکانی کۆمەڵ دان بە بوونی ناکۆکی چینایەتی دا ئەنێن و جار جارەش دەم لە سوشیالیزمی زانستیش وەرئەدەن ، جیاوازی بنەرەتی جیهانبینی پرولیتاریا و باقی چینەکان بە تایبەت بورجوازی بچووک لەوەدایە پرولیتاریا باوەڕی پتەویان بە ناکۆکی چینایەتی بە دیکتاتۆریەتی پرولیتاریا ئەبەستنەوە و سوشیالیزمیش بە قۆناغی گواستنەوەی پێویست بەرەو کۆمونیزم ئەزانن • واتە سوشیالیزم لای مارکسیستە شۆڕشگێڕەکان بەردە بازەی ڕێی کۆمەڵایەتی پرولیتاریە کە ئێستا



پاشماوەی ناکوکی چینایەتی تیا ئەمێنـــــێ ، بی‌ئەوە پەرینەوە بو دونیـــــای بەهەشتی راستەقینەی مروڤایەتی کە کومونیزمە و تیایا دەولەت و هیـــچ جورە جیاوازی و پاشماوەی چینایەتی شوینەواریشی نامینی ۰

ئەم دوو جورە جیهان بینی یە چینایەتیە نەك هەر جیاوازن ، بەلکە لە بنچینەوە بە توونـــدی دژی یەکتـن و لە پاشـــە روژدا هەر بوچـو ـــ ـــ نیکیـان جیگیر ئەبی کە ئەویش هی پرولیتار ـــ ـــ یایە ۰ بویە ئەرکی سەرشانی روله هوشمە ـــ ـــ ندەکانی پرولیتاریا ئەوەیە ئەو جیاوازیـــــە دژبە یەکە دەســت نیشان بکەن و ریگـــەی شورشگیرانەی پرولیتاریا بگرنە بەر و دراســـەی تولی سەرەتـا گشتیەکانـــی (م۰ل) بکەنەوە و وریا و ووشیـاری بورجوازی بچوکی کوردستان و خەتەرناکیتی ریبازە چەواشەکــەی بـــن ۰

ئیمە لای خومانەوە دەمیکە دەرکمان بەم راستیە کردووە و تا رادەیەکیش ئەرکی خومان راپەراندووە ،

- ٨ -

بەلام ئەبێ ئەوەش بڵێین سەرەڕای ئەوەی کۆمەڵە بۆ (م.ل) ەکان دەرکەوتبوو کە ڕێکخراوێکی بۆرجوازی بچووکی ناسیونالیستە بەلام بەو شێوەیەکی گشتی توانیبووی کار بکاتە سەر دڵسۆزانی کوردستان و ڕێبازە چەواشەکەی بالا دەست کات.

لەم مناوەڕاتەدا کۆمەڵە وا خۆی دەرخست کە ئەتوانین بڵێین بە چەندین ساڵ خەباتی فکری و ناکۆکی چینایەتی و ئایدیۆلۆجی نەئەتوانرا حەقیقەتی کۆمەڵە بەم چەشنەی ئێستای لە کۆمەڵانی خەڵک بگەیەندرێ. گەورەترین سوودی مناوەڕات لە دەرکەوتنی حەقیقەتی چینایەتی کۆمەڵەدا ئەبینین و ئەمەشمان زۆرش گوتووە کە ئەسار زۆرتر مەیدانی دەرکەوتنی ڕاستیەکانە نەک ئەساخ. بەشێمان بایە جارێکی تر کۆمەڵە ئەمڕۆش ناتوانێ وەکو جاران کەرتووشی ئەمڕیش بیەوێ جەماوەر بەتایبەتی گەنجان و ڕۆشنبیری شۆڕشگێڕمان چەواشە بکاتەوە.

بۆیە لە رووی سیاسی و فکرییەوە مقاومەتەکە
وبە زەعفی دەرکەوتنی حەقیقەتی کۆمەڵە، بە
توانای وەرچەرخاندنی چینایەتی لە کوردستان دا
نەزانین . ئەمەش لە رووی فکری و سیاسییەوە
وەرچەرخانێکی زۆر پیرۆزە، بۆیە تواناکە
ئەوە لە (م.ل)کان ئەخوازی و ورد و درشتی
بارودۆخی ئێستای کۆمەڵایەتی ئابووری، سیاسی
،فکری نەتەوایەتی زانستیانە لێك بدەنەوە و
مەبەستەکانی ئابووری و واقیعی سیاسی و خەباتی
دیموکراتی لەبەر چاو بگرن و دوور لە خەیاڵ
و هەستی نەتەوایەتی پەتی، ئەرکی سەرشانیان
بەپێی هێزەکانی بەرهەم هێنان و پەیوەندی
[illegible]انی بەرهەم هێنان و [illegible] پێچەوانەی
[illegible] سەرمایە و واقیعی خەباتی دیموکراتی
[illegible]ی کوردستان [illegible] و [illegible]
[illegible] بکەن .

[illegible] ئەرکی سەرشانی ئەم توانای وەرچەر[illegible]
[illegible]

— ١٠ —

زانستیانە ، خەباتی شۆڕشگێڕانە ، ڕێکخستنی
پۆلاییانە )دا بۆ خۆمان دیاری ئەکەین و پتر
لە جاران ئەکەوینە کۆشش و کاری شۆڕشگێڕانە
و دەرسی ئەلقە سینەکەی دوژمنەکەمان
کە تەواو کەری یەکترن و وەڵام دەرەوەی
ئەرك و فەرمانی ئێستای قۆناغی وەرچەرخا-
ندنەکەن - جێبەجێی ئەکەین و توانای خۆمانی
بۆ ئەخەینە گەر لە پێناوی ڕەها کردنی مەسئو-
-لیەتی چینایەتی و دیموکراتیمان کە خۆی
لە دارشتنی باشترین بەرنامەی پرۆلیتاریو
ڕاسترین ڕێبازی سیاسیدا ئەنوێنێ .

ئەم ئەرکە گرنگانەش ئەوەمان لێ ئەخوازێ
کە تێلغ بە قۆناغ نمانامەی تیۆری دیاری بکەین
تا بتوانین لە ڕووی تیۆریەوە تاڵ بینین و
وڵامی پرسیارە جۆراوجۆرەکان بدەینەوە ،
لە ئەمەوە بارێکەوە یەك ڕۆڵەی بە وەفای
ئۆششەندی ... و زەحمەتکێشان ڕووبە-
-ڕووی ئەرکەکانی ببینەوە .

- ١١ -

و دراسەکان داڕێشتن و پەیوەندی هاوڕێ-
یانەیان دامەزرێنن .

گەڕان و عەودال بوونیش بە دوای کتێب
و سەرچاوە دەست نیشان کراوەکان دا بە
زۆری ئەرکی سەرشانی ئەلقە دراسیەکانە ،
تەنانەت وەرگێڕان و گێڕانەوەی کتێبەکانیش بۆ
سەر زمانی زگماکیمان تا رادەیەک ئەرکی
سەرشانی ئەلقە دراسیەکانە ، تا ئەتوانین
خۆمان بە ئەرکەکان هەڵسین .

سەرکەوتووبێ خەباتی شۆڕشگێڕانەی گەلی کورد
شەکاوەبێ ئالای کرێکاران و زەحمەتکێشان

ئـــالای شـــۆڕش

١٩٨٤/١١/١١

## بەشەکانی نامیلکە

أ ـ بەشی فەلسەفی

١ ـ ئوسولی فەلسەفەی مارکسیزم — جورج پولیتسەر — دوو بەشە

٢ ـ دژی دوهورنیخ — ئینگلس

٣ ـ مەتریالیزم و رەخنەی تەجروبەگەری — لینین

ب ـ بەشی ئابوری

١ ـ ئابوری سیاسی — مارکس

٢ ـ ئیمپریالیزم بەرزترین قوناغی سەرمایەداری یە — لینین

٣ ـ بەرهەم هێنانی ئاسیایی — مارکس

٤ ـ رژێمی کاری کرێ گرتە و سەرمایەداری — ئینگلس

٥ ـ پاسا بنەرەتیەکانی ئابوری سەرمایەداری — جان بابی

٦ ـ ئابوری سیاسی — نوسەر لانگە سی بەش

ـ ١٧ ـ

ج ـ بەشی کۆمەڵایەتی ، سیاسی ، [illegible]

١ ـ مانیفێست — مارکس و ئەنگلس
٢ ـ چی کردن ( ماالعمل ) — لینین
٣ ـ هاوپەیمانی نێوان کرێکاران و جوتیاران — لینین
٤ ـ دەولەت و شۆرش — لینین
٥ ـ دوو تاکتیکی سۆشیال دیموکراتەکان لە شۆرشی دیموکراتیدا — لینین
٦ ـ هەنگاوێک بۆ پێشەوە دوو هەنگاو بۆ دواوە — لینین
٧ ـ نەخۆشی چەپ رەوی منداڵانە لە بزوتنەوەی کۆمونیستیدا — لینین
٨ ـ مارکسیزم و کاوتسکی هەڵگەراوە — لینین
٩ ـ دە رۆژ کە دونیای هەژاند — جۆن رید
١٠ ـ چەند سەرنجێکی رەخنەگرانە دەربارەی مەسەلەی نەتەوایەتی — لینین

١١ ـ هەڵبژاردە نوێیەکان لەسەر مەسەلەی نەتەوایەتی
لینین
وەرگێرانی جورج ترابیش
١٢ ـ بزووتنەوەی رزگاری نیشتمانی گەلانی رۆژهەڵات
لینین
١٣ ـ لینین و ئافرەتان
١٤ ـ سێ ئینتەرناسیونالیزم (

د ـ بەشی عیراق و کوردستان

١ ـ جوولانەوەی رزگاری نیشتمانی کوردستان
دوکتور عەزیز شەمزینی دەیبەخشێ
٢ ـ دەربارەی مەسەلەی دەرەبەگایەتی لەناو کورددا
د. کەمال مەزهەر
٣ ـ دەوری کورد لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا
د. کەمال مەزهەر

٤ ـ مێژووی چینی کرێکاری عیراق
د. کەمال مەزهەر
٥ ـ مێژووی [illegible] عیراق

ـ ١٩ ـ

٦ ــ میژووی وەزارەتەکانی عیــراق
عبدالــــرزاق حسیــن

هـ ــ بەشــی گشتی ســوود و رەخنە

١ ــ خوێندنەوەی ئەدەبیاتی حیزبی کومونیستی
ئیران و گوێ گرتن لە ئیزگەکانیان

بو شارەزایی و سوود وەرگرتن

٢ ــ خوێندنەوەی ئەدەبیاتی تەواوی شورشــوتی
عیراق و کوردستــان و گوێ گــرتن لە ئیستگەکانیان

بو زانیاری و رەخنــــە

٣ ــ گوێ گرتن لە ئیستگەکانی جیهان
بو زانینی دەنگ و باس و
لیکدانــــەوە

( . ئ .)

ـ ٤٥ ـ

٢

# ئەی کرێکارانی جیهان یەکگرن !

# نما نامەی تیئــــوری

ئالای شـــــۆڕش

نما نامەی تیۆری لە ئەرشیفی (سامی هادی)

# بنیەدی کۆماری

# دیموکراتی شۆڕشگێر

# لە عێراق دا

[illegible]

# کرێکارانی جیهان یەکگرن!



[illegible]

[illegible]

کۆبوونەوەی [illegible]

ئاڵای شۆڕش

٢٠ / حوزەیران / ١٩٨٥

٣٠ / جۆزەردان / ٢٦٨٥

# راگەیاندنی کۆتایی یەکەمین کۆبوونەوەی خۆئامادەکردنی ئەلقە دراسیەکان

هاوڕێیانی تێکۆشەر
کرێکاران .. زەحمەتکێشان

لە بارودۆخێکی نالەباری جیهانیدا کە ئیمپریالیستەکان چنگالی چەوسێنەرانەیان لە جیهانی کار و کرێکاران گیر کردووە و تەواوی وڵاتانی خوار خۆیان بەخۆیانەوە بەستوەتەوە و بەکۆیلە کردووی سەرمایەیان بەرامبەر ئوردووی کاری کرێ گرتە پێ هێناوە و چوار ملیارد مرۆی سەر زەمینیان دووچاری جۆرەها نەخۆشی نابووری چەوسێنەرانە ، سیاسەتی ستەمکارانە ، پیلانی ئەمریکی کردووە هەل و مەرجێکی بابەتی جیهانی لەباری وا پێک هاتووە کە هەم لە وڵاتانی ئیمپریالیستی و سەرمایەداری پێشکەوتوودا ، پاش کەشوو ماتییەکی گشتی جار جارە مانگرتن و ڕاپەڕینیش تاوکەسێنی و تادێت ناکۆکییەکانی دونیای سەرمایەداری پەرەدەسێنن و قووڵتر دەبنەوە تاپێندەکەشی هەر شۆڕشی سۆشیالیستی ئەبێ . وە هەم لە وڵاتانی سەرمایەداری دواکەوتووی وابەستەشدا کە ئەرکەکانی قۆناغی دیموکراتیان تیا تەواو نەبووە پاش تەواو بوونی دەوری ئیمپو ناچلی بورجوازی - بورجوازی بچووکی ئەم وڵاتانە ، دیسان ناکۆکییەکانیان ڕوو لە تەقینەوەی نوێی خستن بۆ بڕینی قۆناغی دیموکراتی بە ڕێبازی دیموکراتی شۆڕشگێرانەدا .

لەو بارودۆخە جیهانییەدا ، بەرژەوەندی ڕاستەوخۆی ئیمپریالیستەکان لە ناوچەکەدا ڕەنگی ڕیاکارانەی داوەتەوە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و خەلیجی دووچاری چارەنووسێکی نادیار کردووە ، ئەمەش لە کڵپە سەندنی جەنگی عێراق و ئێران : سەر

١

کوتاندنەوەی شۆڕشی فەلەستین ، ونجڕ ونجڕ کردنی لوبنان ، گەمارۆدانی بزووتنەوەی ڕزگاری دیموکراتی کوردستانەکان ، وە لە هەوڵ دانی کۆنەپەرستانە بۆ ( کامپ دیڤیدێکی نوێ ) ی وڵاتە عەرەبیە کۆنەپەرستەکان زیق دەر ئەکەوێ .

لەناو گێژەی ئەو ڕوداوانەشدا ، هەتا دێت ئۆپۆزسیۆنی بۆرجوازی بچوکی سەرتاپای ناوچەکە ئەبینین زیاتر ماهیەتیان دەر ئەکەوێ و لەهەر وڵات و ناوچەیەکدا نوێنەرەکانیان بە بیانوەکی عەرەبی ، فەلەستینی ، لوبنانی ، کوردستانی ، ئێرانی ... هتد چوک دادەدەن و دڵی بەرژەوەندی سازشکارانەیان ئەکەن و لە ئۆپۆزسیۆنی دیموکراتیەوە هەڵئەگەڕێنەوە بۆ بۆرجوازی سەرکوتکەر و ئەکەونە ڕیزی کرێکاران و زەحمەتکێشان .

لەناو ئەو واقعەشدا ، ڕیفۆرمیستەکان لەجاران زیاتر لەبەر سونگەو بەرامبەر ئەو هەموو ڕوداوانە بەری شکستی ڕەمز هەڵپەرستاوی ئەدروێنەوە و ڕیفۆرمیزم پایەگا فکری و سیاسیەکانی لەدەست داوە . بەڵام هێشتا باشەڕێکی زەهراویان ماوە .

لەمەناوی تێکڕای ئەو مەسەلانەی باسمان کردن و تێشکی پێشەکیمان خستە جەر . مارکسیستەکان وشیارانەتر پەرە بە بزووتنەوەی کۆمۆنیستی شۆڕشگێر ئەدەن و بەپێچەوانەی خواستی چەوسێنەران ئەمش و ئەوا بەرەو سۆشیالیزم و دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا ئەکەن .

ئێمەش وەک ئەزمونێکی ( م.ل ) ی ساڵەهایە لە کۆڕی خەباتدایەو لەسەر خاکی واقعی ڕوداوەکاندا ، نەک دابڕاو لە واقیع و خولاوە تەنها لە بازنەی تیئۆری دا . گەلێ تەجروبەو زانیاری دەچوبڕیوە گەلێ ڕاستی چینایەتی ، فکری ، سیاسی ، پراکتیکی ، ڕێکخراوەیی بۆ دەرکەوتووە وخۆمان بەبەشێ لەو بزووتنەوە کۆمۆنیستیە ئەزانین کە سەرەڕای نەبوونی هیچ ئازادی سیاسی و جۆرێکی دیموکراتی ، سەرەڕای تیرۆر و ترساندن ، کوشتن و جاردانی ( جستایۆکان ) ی بەعسی عێراقی وەک بنداوێستیەکی گرنگی ڕەوتی خەباتی ئێستامان ، توانیمان لە

٢

شوێنێکی لەبارا پاشی (١٥/٦/١٩٨٥) یەکەمین کۆبونەوەی خۆئامادە
کردنی ئەلقە دراسیەکانمان لەژێر ئەم دروشمانەدا بکەین :-
١- کرێکارانی جیهان یەکگرن !
٢- سەرنگون بێ ئیمپریالیزم و سەرمایەداران
٣- بژی ئینتەرناسیونالیزمی پرۆلیتاریا لە پێناوی :-
- دیموکراتیکی شۆڕشگێڕانە .
- سۆشیالیزمی کرێکارانە .
- کۆمۆنیزمی زانستیانە .
٤- بیتەدی کۆماری دیموکراتی شۆڕشگێر لە عێراقدا .
٥- سەرکەوتوو بێ خەباتی شۆڕشگێڕانەی گەلی کورد .
٦- دابین کردنی یەکسانی بۆ ئافرەتان لە ماف و فرماندا .
٧- مونازەرە کردن دەسەڵاتدن بەکخستن .

بە سروودی ئینتەرناسیونالیزم و دەقیقەیەک وەستان بۆ
گیانی شەهیدانی بزووتنەوەی کرێکاران و گەلەکمان، کۆبونەوەکە لە
لایەن هاوڕێیەکەوە کرایەوە دوای بەخێرهاتنی نوێنەرانی ئەلقە
دراسیەکان و باس کردنی کورتەیەکی بارودۆخەکە، پرۆگرامی پێشنیاز
کراوی کۆبونەوەکەی لەم خاڵانەدا ڕاگەیاند، هاوڕێیان ١- مێژووی
تیارەکمان بەلایەنە گەش و خاڵە ڕەشەکانی یەوە ٢- پرۆژەی ئاقاری
گشتی بەرنامەی لایەنی کەم ٣- باری جیهانی ئیمپریالیستی
٤- باری ئێستای بزووتنەوەی ئینتەرناسیونالیستی ٥- دیاری کردنی
بنەمای ئابووری عێراق ٦- گرنگی شۆڕشی دیموکراتی کوردستان
٧- جەنگی عێراق و ئێران ٨- جەنگی ناوخۆی کوردستان ٩- ڕۆڵی
ئافرەتان ١٠- بەهێز کردنەوەی دروشمە پەیوەستەکان ١١- دەرکردنی
گۆڤارێکی تیۆری - سیاسی ١٢- دۆخی سیاسی ئێستای عێراق و
کوردستان، تێڕا ئەو مەسەلانە بە گیانێکی هاوڕێیانەی ڕەخنەگرانە-
وە دوای دوانی هاوڕێیەکی تر لەسەر گرنگی کۆبونەوەکە و بڕیارە-
کانی و شی کردنەوەی هەل و مەرجەکە و بایەخی خەباتی کۆمۆنیستەکان و
٢

بڕیاری زانستیانەی شۆڕشگێڕانەمان ، باسمان لێوە کرا و بەسەرهاتی
پەیوەستیان لەسەر درا ، سەرەنجامی باس و خواسی کۆبوونەوەکە ئەم
بنچینە و بۆچوونانەن کە ئێمان خستە بەردەم هاوڕێیان ، کرێکارانەو
زەحمەتکێشانی وشیار ، گروپە ( م.ل ) ەکان . بە هیوای مونازەرەو
هەڵسەنگاندنیان تا بتوانین لە پاشەڕۆژدا کۆبوونەوەی فراوانتر ، پلینیۆم
کۆنفرانس، کۆنگرەمان لەسەر بگرین و کۆمەڵەی ڕەخنە و مونازەرەکانی
ئەم مەسەلانە و مەسەلە پەیوەستەکانی تر ، لە بەرنامەیەکی شۆڕشگێڕانە-
دا فۆرمولە کەین بە هیوای ئەوەی تەنها نیە بەڵکو تەواوی کۆمونیستەکان
دوای سەلماندنی بیرو بۆچوونەکان نزیک ببینەوە و بەرامبەر دوژمنانی
کرێکاران و بیروباوەڕی کۆمونیستی بگەڕێین و ئامانجی نزیک و دووری
پرۆلیتاریا وەدی بهێنین .

دوای چەندین کۆبوونەوە و لێدوان و گفتوگۆی هاوڕێیانەوە ،
دوای دیاری کردنی قەناعەتی پرانسیپی لەسەر خاڵە باسکراوەکانەو
جۆری ئیمزات کردن لە پەناوپێنا ، کۆبوونەوەکە بە سروودی ئینتەرنە-
ناسیونالیزم کۆتایی پێ هات و بە خۆشی و گیانی بەرزی شۆڕشگێڕانەوە
هاوڕێیان بەجێی کۆبوونەوەکەیان بەردەوە ناو ئەلقەکان و کرێکارانەو
زەحمەتکێشان بە ئومێدی زیاتر گەڵاڵە کردنی ئەرکە چینایەتییەکان کە
لە هەل و مەرجی هەڵکەوتووی ئێستادا (پەیوەستییەکی لە تەرخانەدن
نەهاتووە بتوانین بەرە بەخەباتی چینایەتی بدەین و ڕیبازی
کۆمونیستانە بچەسپێنین و ناوەڕۆکی مارکسیزمی شۆڕشگێڕ لە گیا ئەلمی
ناسیونالیزمی بۆرژوازی ڕیفۆرمیستی بپارێزین و ئەملین باری بەسە
چارەنووسی کرێکاران و زەحمەتکێشانەوە بکری و ڕیبازی چەواشەیان بەسە
سەرا بسەپێنری .)

١٩٨٥/٦/٢٠

# ١- هەڵوێستەیەکی مێژوویی

هەڵسەنگاندنی زانستیانەی مێژووی چینەکان، خەباتی چینایەتییان ریبازی سیاسی و فکری و فەلسەفییان، ئەرکێکی گرنگی شۆڕشگێڕەکانە تا بتوانن مێژوو وەک هەیە بابەتیانە تۆمار بکەن و زانستیانە هەموو رووەکانی دەربخەن . ئەم راستییە عیراق، کوردستان، رێکخراوەکان، شۆڕشەکان، تەجروبەکان تێکڕا دەگرێتەوە و ئەتوانین بڵێین کەم جار ئەم ئەرکە مەزنە مێژووییە بە سەبارەت بە رابوردووی وڵاتەکە، کوردستان و لایەنە سیاسییەکانی لێک دراوەتەوە و لایەنە گەش و خامۆشەکانی هەڵهێنجراون، بێگومان ئەو مەسەلەیە جیهانێک گیروگرفتی پڕ لە رووداو دەرکەوت، باشە و خراپە، سەرکەوتن و ژێرکەوتن، شانازی و شەرمەزارییەوە لە پاشە رۆژدا هەر ئەبێ بخرێتە روو، هەر چین و لا و کەسێ مافی مێژوویی بخرێتە پێش چاو .

لەناو ئەو جیهانە گەورەیەدا، خەباتی (م.ل)ەکان تایبەتمەندییەکی تایبەتی هەیە کە پێمان وایە شان بەشانی مەسەلە چینایەتییەکان سەرئەنجامی خەباتیان، هۆی شکستی کرێکاران و سەرکەوتنی بۆرجوازییەکان ئەبێ باسی لێوە بکرێ . ئێمەش وەکو تەیارێ کە درێژەدەری ئەم راستییەین و ئەم تایبەتمەندییە ئەگرێتە خۆی بەشێکی گرنگی ئەم ئەرکەمان ئەکەوێتە ئەستۆ کە ناکرێ و نابێ، وەک بۆرجوازییەکان، وەکو ریڤیزیۆنیستەکان لە بەرژەوەندی تەسکی حیزبایەتییەوە بڕوانینە رابوردوو، وە بە ئارەزووی ئایندەمان مێژوومان دابڕێژین باس کردن لە زانستی مێژوو، ئەمانەتێکی مێژووییە کە مەحاڵە بە خۆشی و ئارەزوو هەندانە لە قاڵب بدرێ . بۆیە یەکێک لە بڕیارە گرنگەکانی کۆنگرەکەمان، ئەمانەت چەکمین بابەتی کۆنگرەکەش لێکۆڵینەوەی ئەم مەسەلەیە بوو، وە مشت و مڕێکی زۆری لە سەر کرا تا گەیشتینە ئەو قەناعەتە کە ئەم تەبارە لە نووسینی ( سالای

•

شۆڕش)ەوە سەری هەڵنەداوە، بەڵکو کۆتەو چەندین قۆناغی بڕیوە، چەندین پەڕداوی دیوە، لایەنی چاکو خراپەی هەیە. هەموو ئەوانە پێویستیان بە پێدا چوونەوەیەکی هەمەلایەنە هەیە بۆ ئەوەی بەشێک هەڵوێستی مێژوویی زانستی لەسەر دەربڕین و ئەمەش بەبێ بەڵگەی مێژوویی، بەبێ باسکردنێکی دوور و درێژ، بەبێ دیاری کردنی قۆناغەکان و لەبەر دەست بوونی نووسراوەکان، رادەربڕینی ئێستا لەسەری لەڕێگای مێژوو لەدەست ئەدا. بۆیە داوامان وایە ئەوەی ئەڵقە دەراسیەکان ئەم ئەرکە بە ئەرکێکی گرنگی خۆیان بزانن و هەموویان هەوڵ بدەین ئەم ئەرکە رابپەڕێنین و نەهێڵین مێژوومان کوێر بێتەوە هەر بە راپەڕاندنی ئەم ئەرکەش ئەتوانین بەچەشنێکی زانستی چاکە و کەمی رابووردوو بە ئێستاوە ببەستین و خراپە و خامۆشی رابووردوو دووبارە نەکەینەوە، بەڵکوو گرێ دانی رابووردوو ئێستاشمان ئایندەمان لا روونتر ئەکات و شارێی سەرکەوتنمان ئەنەخشێنێتی.

## سەرکەوتووبێ

## خەباتی شۆڕشگێرانەی گەلی کورد

٦

## ٢- پرۆژەی ئاگاری گشتی بەرنامەی لایەنی کەم

## « بۆ لێدوان »

سەرئەنجامی گۆڕان و پێشکەوتنی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەو قووڵتر بوونی ئەرکی سەرشان، وە بۆ دانەران لە ڕەوتی خەبات و پێکەوە بەستنی ( دراسەو زانستیانەی خەباتی شۆڕشگێڕانە، ڕێکخستنی پۆلایانەو) ئەبێ بتوانین هاوئاهەنگ لەگەڵ پێشکەوتنی ڕووداوەکان، گەشە بکەین و ئامانجی خۆمان دیاری بکەین، لەبەرئەوە لە کۆبوونەوەی خۆئامادە کردندا بڕیارمان دا وەک پرۆژەیەک ئاگاری گشتی بەرچاوی ئەندامان بۆ بەرنامەی لایەنی کەم بخەینە بەردەم هاوڕێیان و کرێکاران و زەحمەتکێشانی وشیار و لایەنە (م.ل) ەکان تا بتوانین شان بەشانی دراسە کردنی زانستیانە، دراسەی بەرنامەی ئێمە ڕێگەیش بخەینە بەر لێکۆڵینەوە و سەرئەنجامی سەرجەم لێدوانەوەی هەموو هاوڕێیان لەم مەسەلەیە، لە پاشە ڕۆژدا بەرنامەکەمان بخەملێنین و هەر ئەمەش بە ڕێی زیندووی گەڵاڵە کردنی پێبازی کۆنگرەکەمانە ئەزانین، نەک داڕشتنی کلێشەو لە سەرەوەڕا داسەپاندنی بەسەر خوارەوەدا بەناوی بەرنامەی پێشڕەوەوە.

ئاگارە گشتییەکەش لە دیاری کردنی سروشتی ڕژێم و هەڵوێست بەرامبەری، دەست نیشان کردنی دۆخی سەرەکی و ڕوون کردنەوەی دۆخەکە، ئاڵتەرناتیڤی ڕژێم و شێوەی خەبات لە پێناویا، لەگەڵ دەست نیشان کردنی چەند خاڵێک پەیوەستی ئامانجی بەرنامەی لایەنی کەم کە ئەبێ بهێنرێتە دی و ئیئتلافی دیموکراتییان پێ تەواو بکرێ.

### یەکەم/أ- بنەمای ئابوری عێراق

عێراق وڵاتێکی سەرمایەداری دەوڵەتیی وابەستەی ئیمپریالیزمە، یەک جۆرە ناکۆکی لە نێوان پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان و هێزەکانی بەرهەم هێناندا هەیە کە سەرئەنجامەکەی هێزی کار و هێزی سەرمایەی

لەنێوان کرێکاران و سەرمایەداران دا دابەش کردووە و ناکۆکی چینایەتی بەکچڕینی لە نێوانیان دا دروست کردووە ئەم واقیعە ئابووری ـ چینایەتی ـ ناکۆکی بنچینەییە سەرتاپای وڵاتەکەی بە کوردستانیشەوە گرتۆتەوە خۆ (جگەی تایبەتمەندی چەوساندنەوەی نەتەوایەتی لە کوردستان دا) بۆیە کرێکارانی عیراق لە رووی چینایەتیەوە وەك یەك چین ڕووبەڕووی سەرمایەدارانی عیراق ئەبنەوە و ئامانجی چینایەتی ناوکۆیی کیان ئەکاتەوە.

## ب ـ ماهیەتی سیاسی/فکری/ئایدۆلۆجی ڕژێمی عیراق

(١ـ لە رووی سیاسیەوە جۆری ڕژێمەکەی کۆماری بورجوازی ئوتوکراسیە، دەستورە کاتیەکەی داسەپێنراوی بیروکراتیانەیە ڕاستەقینەکەی دیکتاتۆریەتی مطلقە. دام و دەزگا و فەرمانەکەی ئیستبدادی و تیرۆریستیە.)

(یاسا و بڕیار و بڕوای ئەم ڕژێمە کۆماری ئوتوکراسیە، بۆ پاراستنی خاوەندارێتی تایبەتی چەوسێنەرانە تەرخان کراوە و لە سەر ئاستی چینایەتیشدا وەك بەشێکی بۆرژوای خاوەن کار دژی کاری کرێ گرتە پاڵپشتی حوکمی داکوتاوە و بەشێکە لە سیستەمی سەرمایەداری جیهان و ئەرکی دیاری کراویشی ئەوەیە دەستی هەرزانی کار، کەرەستەی خاو، بازاڕی مسۆگەر بکات و پاسەوانی سەرمایەداری جیهانی بێ.)

(٢ـ لەرووی فکریشەوە، ناسیونالستی شۆڤێنستی عەرەبیە بە دەماری نەتەوەگەری تەسکی هەیە و بە توندی دژی بوون و مافی نەتەوە و کەمەنەتەوەکانی تری ناو عیراق و وڵاتانی عەرەبیە و بۆ هەستی شۆڤێنستانەشی هیچ بڕوایەکی عەسکەری و سیاسی و عەقلی نابینی و دڕندانە جێبەجێیان ئەکات.)

(٣ـ لە رووی ئایدیۆلۆجیەوە، کوت و مت فاشیەکی دواکەوتوو

٨

نوکەری رژێمی فاشی بەعسەکەش دژی کرێکارە ووشیار و زەحمەتکێشانی شۆڕشگێر و کۆمۆنیستەکان و پێشکەوتن خوازەکانە بەگشتی و بو لەنا و بردنی بوونی نەتەوایەتی کورد و بزووتنەوە شۆڕشگێرانەکەی بەتایبە-تی یە .)

## ج- دروشمی سەرەکی بەرامبەر رژێم (روخاندن)

لەگەل رژێمی وادا کە ناکرکی بنچینەیی لەگەل کرێکاران و زەحمەتکێشان دا هەیە و دوژمنی سەرەکی چینایەتی یان و داگیرکەری کوردستانە . هیچ جورە سیاسەتێکی سازشکاری و پەرلەمانی و ریفورمیستی و سوودی نی یە و دژی سیاسەتی شۆڕشگێرانەی کرێکاران و زەحمەتکێشانە ،دژی کورد و گەلە نەتەوایەتیەکانە سیاسەتی ووردە بورجوازی هەتاسە کورت .)

بۆیە حزبی کۆمۆنیستەکان ، وەك تاڵا هەڵگری کرێکاران و زەحمەتکێشانی ووشیار بەرامبەر رژێمی فاشی تەواوی رژێمە سەرمایەدارییەکان ، بەرز کردنەوەی دروشمی روخاندنیانە ، سەر نگون کردن و سڕینەوەی شێوەی چەوسێنەرانەیانە . بۆیە ئێمەش بەشەرکی شۆڕشگێرانەی ئەزانین بی پێچ و پەنا ،دروشمی روخاندنی رژێمی فاشی عێراق بەرز ئەکەینەوە و بی گوێ دانە دووبەرەکی و سەختی بەدبەختیەکانی لە پێناویا دریژە بە خەبات ئەدەین . ریگای شۆڕشگێرانەی روخاندنەکەشی تەنها راپەرینی کرێکاران و زەحمەتکێشانە و روشنبیرە شۆڕشگێرەکان ، سەربازو ئەفسەر کاسبکار و مامۆستا وگشت ئازادی خوازێکی ئەم وولاتەیە .کە لە هەل و مەرجی ئێستامان دا لە هەموو رەهەکەوە کوردستان و بزووتنەوە دیموکراتی یە رەواکەی گەلی کورد ،دەوریکی گەورە ی کاریگەری هەیە و پێویستە مارکسیستە شۆڕشگێرە...

٩

شۆڕشگێڕانە خەبات بکەن و بەرنامەی لایەنی کەمی کرێکاران و زەحمەتکێشانی تیا پیادە بکەن و دروشمە پێویستەکانی کێشەکانی بزووتنەوەکە بەرز بکەنەوە .

ڕاشکاوانە لە هەموو لایەک باشتر بەرنامەی مافی چارەنووسی گەلی کورد و کەمە نەتەوایەتییەکان دیاری بکەن و بە بەرنامەی ڕاست و بە کردەوەی شۆڕشگێڕانە ڕێبەری بزووتنەوەکە بگرنە دەستو جووتی کەن لەگەڵ ئەو ڕاپەڕینە سەرتاسەرییە بۆ ڕوخاندنی ڕژێم .

## دووەم/ ئالتەرناتیفی پاش ڕوخاندن «کۆماری دیموکراتیکی شۆڕشگێڕانە»

لای مارکسیستەکان لە هەموو قۆناغەکاندا ئامانجی چینایەتی پرۆلیتاریا ڕوونە، بەرنامەی لایەنی کەمی کۆمونیستەکان وەک تاکتیکی شۆڕشگێڕانە وسیاسی گرێدراوە بە بەرنامەی لایەنی دوور وئەم ڕاستییە هیچ جۆرە لێکدانەوەیەکی ئاینی و نەتەوایەتی هەڵناگرێ بەوپێیە ئالتەرناتیفی پرۆلیتاریا لە وڵاتێکی وەکو عێراق دا کە هێشتا ئەرکەکانی قۆناغی دیموکراتی تیا تەواو نەبووە وپێداویستییەکانی گواستنەوەی قۆناغی سۆشیالیزم فەراهەم نەبووە .

تەنها حکومەتی کرێکاران و زەحمەتکێشانە ، ئەویش لە هاتنە کایەی کۆماری دیموکراتیکی شۆڕشگێڕدا دەبینین کە بتوانێ تەواوی ئەرکەکانی ئەم قۆناغە تەواو بکات و هەموو پێویستییەکی ئامادەی گواستنەوە بۆ سۆشیالیزم لە ڕووی پیشەسازی و کۆمەڵایەتییەوە دابین بکات و بگوازرێتەوە بۆ کۆمەڵی کۆمونیستی.

بۆ ئەم ئامانجە پێویستە ، دروشمی سەرەکی وتاکتیکی کۆمەڵایەتی بەرنامەی لایەنی کەم لەمانەی خوارەوەدا دەبینین :-

میللەتانی ژێر دەستەش ئەسەلمێنن و باشترین ڕێگای یەکگرتنــــــی
کرێکارانی وڵاتانی چەند میللەتی لە جیابوونەوەی ئــارەزوومەندانەی
میللەتان و ئینجا لە یەکگرتنەوەی کرێکارانی ئەو میللەتانەشـــــــدا
ئەبینن تەنها کۆمۆنیستەکانن ئەتوانن بەراستی و ڕاشکاوی ئەم مافـە
دیاری بکەن و دابین بکەن بۆ فەل و هەرای تایبەتی دەروێشی
(مالی چارەنووس) هەلناگرن ؟

ئێمەش لە عێراقدا ، وەك وڵاتی هاوبەشی برایانەی عــەرەب و
کورد و کەمە نەتەوایەتییەکان ، بە ئەرکی بنچینەیی تەواوکردنی ئۆنافی
دیموکراتی ئەزانین کەمافی چارەنووسی کورد و کەمە نەتەوایەتییەکــان
بچەسپێنێتە دی ، ئەم مافەش بۆ کورد لە جیابوونەوە بۆ دامەزراندنی
دەوڵەتی کوردستانی عێراق ، بۆ یەکگرتنەوەی لەگەڵ باقی پارچەکانی
کوردستان وە بۆ دامەزراندنی یەك دەوڵەتی دیموکراتی شۆڕشگێر
لە عێراق دا کە کوردستان تەواوی مافە نەتەوایەتی ، کۆمەلایەتــی ،
سیاسی ، دیپلۆماسی ، فەرهەنگی ، ئابووری ، یەکسانی کوردستــانی
دابین کراو بێ و هیچ جۆرە گوشارو فشارێکی نــەتــەوەگــەری
نەتەوەی سەردەستی لەسەر نەبێ ، هەر بەمەش یەکێتی ڕیــزی
کرێکارانی وڵاتەکە لەبەرامبەر دوژمنانی چینایەتییان دا ئەپارێزرێ و
ئەچەسپێ .

(بەهیوایین لە ئایندەدا بەشێکی گرنگی بەرنامەی
لایەنی کەمان پرۆژەیەکی تایبەتی بێ سەبــارەت
بە کێشەی نەتەوایەتی لە کوردستاندا ، تیایا لــە
ڕوانگەی پرۆلیتاریاوە مافە ڕەوا دیموکراتییەکانــی
گەلەکەمان دیاری ئەکەین .)

بۆ کەمە نەتەوایەتییەکانیش ، جگە لە دابین کردنی تەواوی مافە
فکری و سیاسی ، کۆمەلایەتی و فەرهەنگییەکان ، ئەمانەت ئـــــەو
مافەشیان لە کۆماری دیموکراتی شۆڕشگێڕدا هەبێ کە وەکو کەمە
نەتەوایەتی بە حوکمی زەمانە و ڕووداوە ناهەموارەکانی مێژوو لەبە
١٢

نیشتمانی و نەتەوەیی خۆیان دا لە ئێران و لە عێراق دا نیشتەجێ بوون،
هەموو لایەکیان دڵخوازانە ئەتوانن پێکەوە سەر ئەنەوە و نیشتمانی
دایکیان لە هەر لایەکی ئەم سەر زەمینە دا بێ و بە مولکی کرێکاران
لەم بارەشەوە ئەبێ نەک هەر رێگایان بدات، بەڵکو ئەبێ یارمەتیشیان
بدات و لەم باوەدا بەختیاریان کات . ئەگەر چی ئێمە پەگرتمان
لا لە جیا بوونەوە بێ باشترە بە بێ دابین کردنی ئەم مافـــی
چارەنووسەش بە گفتار و کردار هەتاڵە بتوانین تا کە هەنگاوی لـــە
ئوتانی دیموکراتی ئێمەین و باشی لە سۆشیالزم و دیکتاتۆریەتی
پرۆلیتاریا بگەین .)

١٣

## چوارەم / خاڵە بنچینەییەکانی ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی بەرنامەی لایەنی کەمی پێشنیار کراو

ئەم خاڵە بنچینەییانە ، وەکو بنچینەیەکی پێشنیاز کراوی ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی بەرنامەی لایەنی کەم . ئەخەینە بەردەم ئەڵقە دراسییەکان تا ڕای خۆیانمان لەسەر بۆ دەربڕن بە هیوای ئەوەی لەنزیکترین دەرفەتدا ، لە ناوەڵکەیەکی تایبەتیدا بڕوای ئاڵاوی گشتی بەرنامەی لایەنی کەم فۆرمولا بکەین و بە کاملی بیخەینەوە بەردەم کرێکاران و زەحمەتکێشانی وشیار و شۆڕشگێڕەکان . دەرگای لێدوانیش ئاوەڵایە بۆ هەموو جۆرە موناقەشەیەک لەلایەن هەموو گروپ و دڵسۆزێکی (م.ل) تا گەڵاڵەی ئەکەین و بەرێوەیەکی شۆڕشگێڕی لێ دێتـــە بەرهەم .

ئەو خاڵانەش کە پێویستیان بە دراسەو لەسەر نووسین و گەڵاڵە کردنە ئەمانەن :-

١- باری کۆمەڵایەتی کرێکاران .
٢- کێشەی جوتیاران و مەسەلەی زەوی .
٣- مافی چارەنووس .
٤- ئازادییە سیاسی و نقابییەکان .
٥- مەسەلەی ئـــافرەتـــان .
٦- پێشخستنی کوەڵ و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی .
٧- میکانیزە کردنی شار و لادێی وڵات .

هاوڕێیانی تێکۆشەر !
کرێکاران و زەحمەتکێشان !

ئەم بنچینانە پەیوەندیمان بە فرمانێکی گرنگی ژیانی هەمـــوو کۆمەڵ بە تایبەتی کرێکاران و زەحمەتکێشانەوە هەیە کە تەنها لـــە ڕوانگەی جیهانبینی پرۆلیتاریاوە ئەکرێ تیۆرییەی زانستیانە بکرێ و لە عەمەل و مەرجی خۆی دا پیادە بکرێن . بۆیە پێویستە بە وردی و

بابەتی ، واقیعی و زانستیانە ڕوون بکرێنەوە و پێداویستی بە
واقیعیەکانی بەدی هێنانی بنوێنرێ ! ئەم قۆناغە ، قۆناغی
تەواو کردنی قۆناغی دیموکراتی بە ڕێبازی دیموکراتیکی
شۆڕشگێڕانەیە لە هەموو بارێکەوە نەوان و ململانێی چینایەتی زۆری
لە سەرە و بۆرجوازی بچوک کە تەنها لەم قۆناغەدا تا ڕادەیەک
دەوری کەسیان ماوە ، بەڵام بە ئاراستە کردنی بەرنامەی
چینایەتیمان بە بەرژەوەندی کرێکاران ئەوپەڕی هەوڵ ئەدەین
کرێکاران و زەحمەتکێشان جیاواشە بکەن و سەرامەکانیان بەرێ
بهێنێتە دی لەناوەڕۆکدا ڕێبەرەکە بوەستێ . بۆیە ئەبێ
مارکسیستەکان بە ڕاشکاوی ، شۆڕشگێڕانە ، باشترین بەرنامەی
دیموکراتی بۆ ئەم قۆناغە دابنێن و ناوەڕۆکە کۆمەڵایەتییەکەی
بەرنامەکەیان زۆر جیاواز بێ لە بەرنامەی زوردە بۆرجوازییەکان
کە ڕیاکارانە بەرنامەی خۆیان هەندێ جاروا هەندێ برگە و
بەند و ڕستەدا بە بەرژەوەندی کرێکاران ئەڕازێننەوە .

ئەوەی لەم پرۆژەیەدا ڕوون کراوەتەوە ئەوەی تەنها وەکو
خاڵ و بنچینە بۆ ناوەرۆکی کۆمەڵایەتی باس کراون ، هەوڵێکە
بۆ یەکخستنی گۆشەنیگای تیۆری و فکری و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان
تا لە پاشەڕۆژدا هەنگاو بە هەنگاو سەرجەمیان پێکەوە بخەین و
پیان چەسپێنین ، بەهیوای ئەوەین لەم قۆناغی وەرچەرخانەدا
کە لە تیا نامەکەدا دەست نیشانمان کردووە ، ئەرکەکانی
خەبات گەڵاڵە بکەین تا بتوانین بۆ قۆناغی ئایندەی خەباتمان
لەڕووی ڕێکخراوەیی و سیاسییەوە تەیار بین ، ئەمەشمان بۆ
ئەوە نییە پەلە بکرێ و دەراسە کردن کەم بکرێ ، نەخێر باشترین
(ڕێگای دارشتنی باشترین بەرنامە لە قووڵتر کردنەوەی دیراسەی
زانستیانەدا ئەبینین و هەموو جۆرە سەرنج و دڵسۆزییەک لە
دیراسە کردندا لەناو خۆماندا ڕاستەوخۆ کاری ئەکات ...
١٠

## ٣- هەڵوێستێکی ئینتەرناسیونالستی

(مارکسیزم ـ لینینیزم وەک بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی پرۆلیتاریا لە کۆنەوە تائێستا، لە دوو مەیدانی سەرەکیدا گەرمی خەباتی بردۆتەوە. یەکێکیان خەباتی شۆڕشگێڕانەیەتی دژی سەرمایەداران دووەمیان مەڕلەی زانستیانەیەتی دژی هەلپەرستان. ئەم دوو مەیدانە سەرەکییەی خەبات هەمیشە دوو دیوی لێک جیا نەبووی مارکسیزمی شۆڕشگێڕ بووە، ئەوەتەی پەیدا بووە تائێستا، هەر لاو حیزب و شۆڕشێ لایەکی بەسەر لاکەی ترا زاڵ کردبێ وگرنگی تەنها بە مەیدانێکی دابێ، ئەوا هەرگیز نەیتوانیوە ڕیزی کرێکاران و کۆمەڵی خەباتی چینایەتییان کۆمۆنیستانە بەرجەستە بکات و ڕێ لە کە کردنی بۆرجوازییەکان لەناو ڕیزی سەربەخۆی کرێکاران بگرێ. لەمەیدانی یەکەمدا، سەرمایەداران بە ڕاشکاوی سەنگەر لە کرێکاران و مارکسیزمی شۆڕشگێڕ ئەگرن و هەموو قودرەت و تواناییەکیان بەکار ئەهێنن بۆ ڕێگە گرتن لە گەشە کردنی خەباتی کرێکاران و سەر ئەکەوتنی مارکسیزم. لەمەیدانی دووەمیشدا، کە هەر سەرمایەدارەکانن سەنگەری تیا دژی کرێکاران و مارکسیزم ئەگرن. بەڵام بەناوی دروست کردنی ئەم سەنگەرە دوای پەرە سەندن و سەقامگیر بوون و سەرکەوتنی مارکسیزم بەجۆرێکی تر دروست کراوە. لەم مەیدانەدا دوای پەرە سەندنی مارکسیزم ـ لینینیزم و سەرکەوتنی لە دنیادا، دوای کەوتنەوەی ملیۆنان پرۆلیتاریا و زەحمەتکێشی دنیا لەدەوریا. دوای تێک شکاندنی هەموو عیبارە بەناو ڕزگاری کەرەکانی کرێکاران.

بۆرجوازییەکان لەڕێگای سڵماندنی مارکسیزمەوە، هاتنە ڕیزی بزووتنەوەی کرێکاران و لە هەر وڵاتێ بەجۆرێ کەیان تیا کرد و بزووتنەوەکەیان گەندەڵ کرد و ماوەیەکی باش بزووتنەوەکەیان لادا، تا گەیشتنە دەوەیانی سەختی کۆتایی و لەسەرەکی خەباتی

١٧

چینایەتی ئەدران و دەستەکانیان ئەکەوتە ڕوو.)

(ئەم ڕاستیانەش دوای صراعێکی سەختی مارکسیستەکان بە ڕێبەرایەتی مارکس و ئینگلس لە ئەنتەرناسیونالیستی یەکەمەوە و سەرکەوتنیان بەسەر باڵە جیاکانی تردا تا ئەمڕۆ دەرئەکەوێ.

لەوساوە ئاشکراش ئەو ڕاستیانە بۆ هەموو بەرە جەنگەکانی خەباتی کرێکاران و زەحمەتکێشان و گەشە کردنی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی لە چەندین بەرگ و ڕەنگدا دەرئەکەوێ تا سیستەمی سەرمایەدارییش لە جیهاندا بمێنێ ئەم لادان و دژایەتی کردنەی ئاشکراو ناشکرای بزووتنەوەی کۆمۆنیستی ئەمێنێ و هەردەم ڕەنگ و بەرگێکی ئەگۆڕێ و بەردەوامیش ئەبێ.)

(سەردەمی ئێستاشمان کە ئیمپریالیزمی تیا ئێجگار باڵادەستە و بازاڕی جیهانی کۆنترۆڵ کردووە. زانست و زانیاری گەیشتۆتە لوتکەیەکی بڵند و سەدان کاری لۆجستیکی (ئیداری) و بانکی و ئابووری بە کۆمپیوتەر بەرێوە ئەچێ. لە وڵاتە سەرمایەدارییە زۆر پێشکەوتووەکاندا، پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی ئەندازەی نییە، پارە و پول و ئیمکانیەتی سەرمایەداران لە ژمارە نایە، ڕێگا و بان و وەسیلەی گواستنەوە و هاتوچۆ چاپ و چاپەمەنی، ڕادیۆ تەلەفزیۆن و ئامرازەکانی تری ڕاگەیاندن بە هۆی مانگی دەستکردەوە (القمر الصناعي) سنوور نازانن.

بەڵام لەگەڵ ئەوانەشیدا، چونکە ئیمپریالیستەکان و سەرمایەدارەکان نەیان توانیوە و هەرگیز ناتوانن هیچ جۆرە چارەسەرێ بۆ بناغەی ناکۆکییەکان و ناکۆکی بنچینەیی نێوان کار و سەرمایە بدۆزنەوە و هەرگیز پێیان نادۆزرێتەوە بەهەموو ڕاستەوخۆ چ ناڕاستەوخۆ، چ ئاشکرا چ بەکەم کردنی، زۆرتر لە جارانیان (بەتەجروبەتر لە جارانیان) بە فرستنەوەی هەڵەی حیزبە ناو کۆمۆنیست و سۆشیالیستەکان دژایەتی مارکسیزمی

١٨

شۆڕشگێڕ ئەکەن و کرێکاران دەستەمۆ ئەکەن . بۆیە ئەبینیـــن
شانبەشانی پێشکەوتنی سیستەمی سەرمایەداری دژایەتی کردنی
مارکسیزمی شۆڕشگێڕیش پەرەی دراوەتی و بگرە سەرمایەداران
مانی خۆیان لەدژایەتی کردنی مارکسیزم و بۆ تەفسیر کردنی
فکریانەی مارکسیزم لەسەر خەباتی کرێکاران ئەبینین ، بۆ ئەم
سیستەمەش لادانی مارکسیزم لە ڕێبازی شۆڕشگێڕانە باشتریـــن
چەکی ژەهراوی دەستیانە . بۆیە ئەبینین کالای ڕیفزنیستـــی ،
تیۆری ڕیفزنیستی چەندین بەرگی مۆدێرنی لەبەر ئەکـــرێ و
ملیۆنەها دینار و دۆلار ، ئیمکانیەتی چاپ و چاپەمەنی و دەسەر
دام و دەزگای بۆ تەرخان ئەکرێ )
(گەشە کردنی ناسەرمایەداری ، ئێوروکۆمۆنیزم ، سۆشیالدیموکرا-
تیزم ، تیۆری سێ جیهان ، نەمانی بایەخی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریـــا ،
پۆپولیزم . هتد لە وڵاتانی پێشکەوتوو ، وە داکەوتودا لە دیاردە
هەرە زەقەکانی ڕیڤزنیزمی سەردەمن و ئاڵا هەڵگرانیان لـــە
تەواوی دنیادا هەوڵی پەیڕەوی کردنیان ئەدەن و ڕیـــزی
پرۆلیتاریای پێ ئەشێوێنن و دژایەتی بزووتنەوەی کۆمۆنیستـــی
شۆڕشگێڕی پێ ئەکەن . ئێمە لەکاتێکدا بە ڕاشکاوی ئەڵێیـــن
دژی هەموو ئەو جۆرە لادانانەین لەناو بزووتنەوەی کۆمۆنیستیدا
و لێبڕاوانە ڕەتیان ئەکەینەوە ، لە هەمان کاتدا ساغی ئەکەینەوە
کەتەنها سەرچاوە ئەسڵیەکانی (م.ل) کە شاکارە فەلسەفـــی و
ئابووری و کۆمەڵایەتی و جەنگی و سیاسیەکانی مارکس و ئینگڵـس و
لینین ئەگرێتەوە ، بەسەرچاوەی پاك و دەست تێوەنەدراوی (م.ل)
کان ئەزانین باقی تەجرەبەکانی جیهان بەتەجرەبەی ناوچەیـــی
ئەزانین و چاولێکەری فوتیانەیان هەڵەیەکی کوشندەیە )
(ئەوەش ناشارینەوە کە گەلێ مەسەلەی گرنگی بزووتنـــەوەی
کۆمۆنیستی هەیە کێشەی گەورە و قووڵیان لەسەرە هێشتا هەموو
جۆرە بڕیاردانی لەسەریان (سەبارەت بە خۆمان) ، بە پەلە

ئەزانین و سەرجەمیان بە تایبەت یەکێتی سۆڤیەت و وڵاتانی لەمەر سۆڤیەت، هەندێ لێدوانی وورد و دراسەی زانیستیانەن لامان بەتایبەتی لە کاتێکدا لەناو (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان)دا ماوەیەکی زۆر بەبێ ئەساسی زانستی دوچاری چاولێکردنی کوێرانەی چین و چەپی چینچیتی بووین لە دژایەتی کردنی یەکێتی سۆڤیەت دا، بەبێ ئەوەی تاکە بەڵگەیەکی سەلمێنراومان لەم بارەوە بۆ ڕوون کرابێتەوە. ئەمە جگە لەوەی بۆچوونی جیاواز لەم بارەوە زۆرە، بەڵام سەرچاوەی باوەڕپێکراوی زانستی بۆ سەلماندنی ئەو بۆچوونانە کەمە و ئەوەی هەشە هەر بۆچوونە)

(بۆیە لەم بارەوە هەموو جۆرە پەلە کردنێ بە هەڵە ئەزانین و داوامان وایە تەنها ئەڵقە دراسەییەکان بۆئەم مەبەستە بە گەرمی و بە ووردی بکەونە دراسە کردن و پەیدا کردنی سەرچاوە و موناقەشە کردن. تا بتوانین لە پاشە ڕۆژدا یەک هەڵوێستی ڕاست و دروستی لەسەر دەربڕین کە دوور بێ لە بڕیاری سەرپێیی و هەڵوێستی سەرپێیی. کارێکی گرنگی ئاوەها نەپەلەی ئەوێ و نە کەمتەرخەمیش هەڵنەگرێ، گرنگ کۆشش کردنە لە پێناوی حەقیقەت، دوور لە سۆز و تەئسیراتی کۆنی کۆمەڵە حەقیقەتی کە لە خزمەتی خەباتی چینایەتی و دیموکراتیدا بێ، لە خزمەتی مارکسیزمی شۆڕشگێڕدا بێ)...

# مەرگ بۆ ئیمپریالیزم

# ٤ـ ریگای شورشگیرانە بو چەسپاندنی ئاشتی راپەرینە بو روخاندنی رژیمی فاشی

کومەلانی شورشگیری کوردستان و عیراق ..

بو پینج سالی رەبەق ئەچی بە دەست پیشکەری رژیمی سەرمایەداری فاشی عیراق کونەپەرستانە ترین و درندانە ترین جەنگی ناڕەوای سەردەم بە سەر کومەلانی خەلکی زەحمەتکیشی عیراق و ئیران دا سەپینراوە .

بو پینج سال ئەچی ئەم دوو رژیمە هەرچی هیزو توانای ئابووری و سەربازی و بەشەری .. هەتا دوا [illegible] خستویانەتە سوتەمەنی دوزەخی جەنگ و گرهاویژی کورەی ئەم جەنگەش سەراپای وولاتی عیراق و زوربەی شارەکانی ئیرانیشی سوتاندووە و ئەنجامیش فەوتاندن و لەناو چوونی هەزاران روڵەی زەحمەتکیشی هەردوو وولاتە و ویران بوونی دەیان شار و شاروچکە و گوندە . سوتان و چول بوونی چەندین ناوچەی بە پیت و بەر سامانی نیوان سنووری هەردوو لایە .

رژیمی فاشی عیراق کە لە سەرەتای جەنگەدا لە خوارووی روژئاوای ئیران دا هەندی سەرکەوتنی بە دەست هینا بوو و چەند شاروچکەیەکی خستبووە ژیر رکیفی سەربازیی خویەوە و ئەو ئالا هەلگری بەرگری کردنەوە لە ئاو و خاکی نیشتمانی گەورەی عەرەب و دەروونی رزگاری خوزستان و بە فریا چوونی براعەرەبەکان و دیفاع کردن لە مافە نەتەوایەتیەکانیان بەرز دەکردەوە بو راگرتنی شەرو دەست هەلگرتن لە هیرش و پەلاماردانی داگیر کردن و بە مەرجی نەخوشی ئاشتیانە ، لە پەنای سەپاندنی دەسەلاتی خویان بە سەر گەندا و گەراندنەوەی دووگە لە دەست چوونەکانیان ، بو ئەوەی وەکو پارێزەری ی هاتنای

بەرژەوەندییەکانی ئیمپریالیزم لە ناوچەکەدا بدرێنە قەلەم ، چەندین
هەرچی شیعە و گرانیان هەبوو .

کەچی ئێستا هەر ئەو حیزب و دەولەتەی کە بەناوی هەموو عەرەبەوە دەجەنگی و هەمان شێوە سواری عەرەب کە پاسەوانی ئەمنی سنووری رۆژهەلاتی هەموو وولاتانی عەرەبی بوو ، پاش تێکشکانی لەشکرە بەزیوەکەی لە تەواوی بەرەکانی شەردا ، پاتر بە زۆر بێ جیهێشتنی تەواوی ئەو ناوچانەی داگیری کردبوون و پاشەکشێ پێ کردنی بۆ ئەم دیوی سنوور و بگرە بەدەستەوەدانی چەند ناوچەیەکی گرنگی سەر سنووری عێراق و داگیر کردنی لە لایەن هێزەکانی ئێرانەوە ، پاش ئەوەی شیرازەی لەشکرەکەی لێک ترازاوە و بەرگری ناچارییشی پێ ناکرێ ، پاش ئەو هەموو کوشت و کوشتار و کارەساتە دڵتەزێن و پڕ کەموکورییەی بە سەر خەلکی دا هێناوە ، پاش سەرف کردنی زیاتر لە سێ ملیار دۆلار کە بودجەی پاشەکەوتی وولات بووە و قەرز کردنی دەیان ملیار دۆلاری تریش ، بەلێ پاش ئەوەی کابرای عێراق دووچاری شەڕانێکی قورس بووە و داوێشاوە (ئێستاش ئیتر ئاگری شەرەکە شالاوی بۆ خۆیان هێناوە و تەختی بە ئێسک و پرووسکە راگیراوی سەدام کوتوتە لەرزین و هەترەسی بەوە . ئێستا نەک هەر دروشمەکانی سەرەتای جەنگیان بیر بردۆتەوە و باس لە رزگاری خوزستان و عەرەبستان ناکەن بگرە بەشێ ئەوانیش لەو یارمەتی و پشتگیری کردنەی فاشستەکان هاوشان لەگەل کۆمەک و دەستگیرەی باقی گەلانی تری ئێران بەهۆی جیاوازی ، هەر بۆمبای تێیە دەرهاوێژەکان و موشەکی زەمین بەزەمین و پەروەردەی پڕ لە قینی فاشیانەی فرۆکەکانیانی . ئەو کوشت و کوشتار و مال وێرانیەی خەلکی خوزستان لە سایەی بالا دەستی تەکنەلۆجیای سەربازی بەعسی دا دووچاری بوون هەرگیز لەبیر ناکرێ

٢٢

حوکمداری هیچ یەکێ لە ڕژێمەکانی ئێران دا توشی نەهاتون.

ئێستا ئیتر فاشیەکانی عیراق بو ئاگرتنی شەڕ و گەڕانەوە بو بارودوخی پێش شەڕ، نەک هەر هیچ حەرج و داواکاریەکیان نەماوە بەڵکو هیچ لایەن و دەولەتێکی عەرەبی و ئیسلامیش نەماوە نەیکەنە تکاکار بو کوتایی پێ هێنانی جەنگە دڕاوەکەیان.

لە هەل و مەرجی ئێستای جەنگ دا، فاشیەکان بە ناچاری ئالا هەلگری ئاشتی و ڕاوەستاندنی شەڕەکەن، دەولەتی ئێرانیش هەر سوورە لە سەر هێرش بردن و درێژە پێدانی هەتا کەوتنی ڕژێمی سەدام و دامەزراندنی کوماری ئیسلامی لە عیراق دا (.)

کرێکاران و زەحمەتکێشان و هەموو ئەو چین و توێژانەی بەرژەوەندیان لە شەڕەکەدا نییە بە گشتی، یەکخراو و گروپە مارکسیستەکان بە تایبەتی دەبێت کام هەلوێستی شورشگێرانە وەرگرن؟ و ئەرکی شورشگێرانەی ئەم قوناغەیان کامەیە؟

کرێکاران و زەحمەتکێشان، بو ئەوەی دەوری کاریگەر و بەرپەسایەتی شورشگێرانەی خویان لەم بەلادا خستنی جەنگ و دابین کردنی ئاشتی دا بگێڕن، بەر لە هەموو شتێک و بەر لە هەر کارێک بەو پەڕی وشیاریەوە بالە سروشت و ناوەروک و هەوی بەرپا بوونی جەنگەکە بکەن. پێویستە ئەوە بکەن کە درێژە کێشانی جەنگ و سەرکەوتن و ژێرکەوتنی هەر لایەکیان بە قازانجی کێیە و بەرژەوەندی کێ تەیاردەکا؟ ڕوون کردنەوەی ئەم مەسەلانە و هەلمالینی پەردەی بە درو و دەلەسەی چەندساڵەی فاشیەکان و کونە پەرستان سەبارەت بە جەنگ و ئامانجەکانی جەنگ، بە ئاگا هێنانی کرێکاران و زەحمەتکێشان کوکردنەوەی هێزی لە ژمارە نەهاتوی ئەوان وشیارکردن و ڕابەری کردنیان

خان بە خانی ئاراستە کردنی ، هەموو ئەم چین و بزووتنەوانەش کێشە
بەرژەوەندییان لە جەنگەکەدا نییە ، لە پلەی یەکەمدا ئەرکی
شۆڕشگێڕانەی کۆمۆنیستەکانی هەردوو وڵاتە ....

(کرێکاران و زەحمەتکێشان پێویستە لەو ڕاستییە زانستییە
بگەن کە جەنگ و ئەنجامە دزێو و چارە بێزراوەکانی حوکمی
قەدەر و دیاردەیەکی بەدەری کۆمەڵایەتی نییە کە هەڵگیرسان و
ئەبەر کردنی ، لە سەر و هێز و توانای چینە شۆڕشگێڕەکانی
ترەوە بێت.)

(جەنگ هاوزەمانی پەیدا بوونی کۆمەڵی مرۆڤایەتی پەیدا نەبووە
چونکە بەشێکی ... هەتا سەری ئەو کۆمەڵەش نییە . جەنگ وەکو
دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی ، هاوشانی پەیدا بوونی خاوەنداریەتی
تایبەتی و کۆمەڵگای چینایەتییە ، بەگشتی ... پەیدانی
سیاسەت و پارێزەری بەرژەوەندی و دابین کەری ئامانجەکانی ئەم
یان ئەو چینی کۆمەڵایەتییە ، هەر بۆیە ڕەوایی و ناڕەوایی
جەنگ لە پلەی یەکەمدا لەوەدایە کە ئەو جەنگە کێ هەڵی
دەگیرسێنێت و پەنگدانەوەی سیاسەت و نوێنەرایەتی دەسکەوت و قازانجی
چینایەتی کام یەک لە چینەکانی کۆمەڵە.)

(هەموو ئەو جەنگانەی کە چینە باڵادەستەکان ، سەرمایەدارانی
چاوچنۆک و فاشییەکان دژی کرێکاران و زەحمەتکێشان و میللەتانی
ژێر دەستە بەرپایان دەکەن ، جەنگی ناڕەوان ، جەنگی دزێوی و
تالان کاری و داگیر کردنن ، جەنگێکن ڕێ لە پێشکەوتنی
مرۆڤایەتی ئەگرن و شارستانییەت وێران ئەکەن ، هەر وەک چۆن
جەنگی خاوەن کۆیلە و دەرەبەگەکانیش لە مێژوودا ناڕەوا و کۆنە
پەرستانە بوون.)

(چینی سەرمایەدار هەر کە دەسەڵاتی سیاسی خۆی بە
سەر کۆمەڵانی خەڵکی وڵاتدا دەسەپێنێ ، بە زەبری دام و

٢٤

دەزگا سەربازییەکان بە تیرۆر و کوشتن و هەڵواسین هێزە تیاو
کانی خۆی سەرکوت دەکات ، ئیتر گەلگەلی هێرش و پەلامار
دان بۆ داگیرکردنی وڵاتانی تر بەیەکجێیە سەری لە پێناوی
فراوان کردنی قەڵەمڕەوی فەرمان ڕەوایەتییەکەی ، لە ژێر چەندین
پەردە و دروشم و بەرو بیانوی جۆراوجۆردا ، لە سەر لاشەو ڕەنج
و کۆمەڵانی خەڵکی زەحمەتکێش و بۆ زیاتر دزین و کۆکردنەوەی
سەروەت و سامان ، ئاگری جەنگی ناڕەوا هەڵیا دەکەن. کرێکاران و
زەحمەتکێشان لە هەر زەمان و زەمینەیەکدا ڕووبەڕووی جەنگێکی
ئاوەها بوونەوە ، لە ماهیەتی چینایەتی و سروشت و ئاکامەکانی
گەیشتن و لەژێر ئاڵای حیزبی پێشڕەوی چینایەتی خۆیان
کۆبوون ، نەک هەر بە توندی ڕق و بێزارییان دژی جەنگ و
شەڕ ئەنگێزان دەربڕیوە بەڵکو خەباتی شۆڕشگێرانەی چینایەتی
خۆیان بە ئاقارێک بەرە و پێش بردووە کە هەموو کۆمەڵانی
خەڵکیان بەدوای خۆیاندا هێناوەتە ناو کۆڕی خەباتی دژ بە
چەوسێنەران و شەڕ ئەنگێزان ، جەنگی نێوان سەرمایەدارانیان
گۆڕیوە بە جەنگی شۆڕشگێرانەی کرێکاران و زەحمەتکێشان لە
پێناوی ڕوخاندنی ڕژێمی سەرمایەداری و دامەزراندنی دەسەڵاتی
چینایەتی کرێکاران ، لەلای کۆمۆنیستەکانیش تەنیا هەر ئەوە
سیاسەتی ڕاست و دروستی شۆڕشگێرانە بووە لە پێناوی کۆتایی
پێ هێنانی جەنگ و دابین کردنی ئاشتی ڕاستەقینە )

جەنگی ئێستای نێوان عێراق و ئێرانیش ، سەرئەنجامی
تەشەنەی ناکۆکییە جۆراوجۆرەکانی دەوڵەتی سەرمایەداری
یە لە ژێر پەردەی ناسیونالیستی و مەزهەب دا ، [illegible]
جەنگی ناڕەوای داگیر کردن و تاڵانکارییان خستوتە گەر
جەنگێک کە سووتەمەنییەکەی کرێکاران و زەحمەتکێشانی [illegible]
عێراق نەبووی هیچ دەسکەوت و قازانجێکی [illegible] لەم

٢٥

شەڕەدا دوچاری سەختترین کوێرەوەری و تەنگان و نالەباری بوونە لەماڵ و لانەی خۆیان ئاوارە و دەربەدەر بوون و هێندەی تر باری گوزەرانیان ڕەنجڕۆ ناڵەبارتر بووە .

«کرێکاران و زەحمەتکێشانی عێراق ، بەتایبەتی چی تر بەرگەی باری گرانی جەنگی ناڕەوای فاشییەکان هەڵناگرن و لەمە زیاتر نایانەوێ سووتەمەنی کوورەی کڵپەسەندووی ئەم جەنگە ناڕەوایە ، بەتایبەتی لە کاتێکدا کە جەنگەکە پێنج ساڵ لە تەمەنی نەگریسی خۆی بەرە و تەواو بوون دەبا ، هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆنی بۆرجوازی و وردە بۆرجوازی و ڕیفۆرمیستەکانی عێراق نەک هەر نەیان توانیوە و ناتوانن بار و دۆخی نا ئاسایی وڵات لە سایەی جەنگدا بقۆزنەوە بەرنامەیەکی سیاسی گونجاو بۆ کۆکردنەوەی هەموو لە و چین و توێژانەی کە بەرژەوەندییان لەم جەنگەدا نییە دابڕێژن و بە کردەوە بۆ ڕووخاندنی ڕژێم ساز و ئامادەیان بکەن ، بەڵکو سەبارەت بە ڕاڕایی و تەنگەنەفەسی و دوودڵییان لە خەبات و تێکۆشاندا هەم سیاسەتی سازش و سات و سەودا کردنیان گرتۆتە بەر و هەم تا ئێستاش کەم دەور و تەماشەوەن لە کەناری ڕووداوەکاندا ڕاوەستاون »

ئیتر ئێستا و بۆ هەمیشە ئەرکی سەرشانی کۆمۆنیستەکانە کرێکاران و زەحمەتکێشان وشیار بکەنەوە ، ڕێکیان بخەن و سازیان بدەن ئەو ڕاستییەیان بۆ بسەلمێنن ، کە تەنیا ڕێگای شۆڕشگێڕانە بۆ دابین کردنی ئاشتی یەکجارەکی ، بۆ بنبڕ کردنی جەنگ و کارەساتەکانی ، بۆ پاراستنی عێراق و پاراستنی سەربەخۆیی عێراق ، بۆ ئاوەدان کردنەوەی وڵات و سڕینەوەی شوێنەواری جەنگ بە تەنیا هەر خەباتی چینایەتی شۆڕشگێڕانەی ئەوان و باقی کۆمەڵانی خەڵکی ستەم دیدەیە بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی سەرمایەداری فاشی و دامەزراندنی کۆماری دیموکراتیی

شۆڕشگێڕی کرێکاران کە تاکە دەستەبەری ئازادی و دیموکراتی و مافی چارەنووسی گەلی کوردیشە .

(کرێکاران ئەو چینە هەتا سەر شۆڕشگێڕە ، کاتێک لە سەر دەستی کۆمۆنیستانی پێشڕەودا وشیار دەکرێنەوە و بە ئاگا دەبن خۆیان دەناسن و ساز دەدرێن و رێکخراو دەبن و بە سروباوەڕی کۆمۆنیستی چەکدار دەکرێن و لەلایەن حیزبی چینایەتی شۆڕشگێڕی سەربەخۆی خۆیانەوە رابەری دەکرێن ، بە تەنیا ئەوان ئەبنە هێزێکی شۆڕشگێڕی مەزن وا شیلگیرانە زەحمەتکێشان و کۆمەڵانی خەڵک بۆ مەیدانی ئەو خەباتە راکێشن و رژێمی سەرمایەداری هەڵدەتەکێنن . کۆماری کرێکاران لە جێگایدا بنیاد ئەنێن )

کرێکاران و زەحمەتکێشان و کۆمەڵانی شۆڕشگێڕی کوردستان و عێراق ئاگری لەو راستییە نەگەن کە دەرباز بوون لە جەنگ ، دابین کردنی ئاشتی راستەقینە و ئازادی تەواو و دیموکراتیەت و بەدەست خستنی مافی چارەنووس بۆ گەلی کورد ، بە تەنیا لە خەباتی شۆڕشگێرانەی هەتا سەری خۆیان دایە بە بێ روخاندنی رژێمی فاشی و سەرنگوون کردنی تەواوی پەیوەندییە ئابووری ، سیاسی ، کۆمەڵایەتی ، فەرهەنگییەکانی ئەم رژێمە نە هەوای گەشە کردنی بزووتنەوەی کرێکاران و سەرکەوتنی هەیە و نە دابین کردنی مافی چارەنووسی گەلی کوردیش ئیمکانی دەبێ .

هەر بۆیە تەنیا (رێگای شۆڕشگێرانە بۆ چەسپاندنی ئاشتی رابەریە بۆ روخاندنی رژێمی فاشی ) دەبا خەبات بکەین بۆ رابەری سەرتاسەری بۆ روخاندنی رژێم و چەسپاندنی ئاشتی و تەواوی ئامانجەکانی تری کرێکاران و زەحمەتکێشان و گشت دیموکراتی و ئازادی خوازێ لە عێراق دا .

## ٥- ئازادی بێ قەیدو شەرتی سیاسی و پێشمەرگەیی کۆتایی بە شەڕی ناوخۆ دێنێ

کرێکاران و زەحمەتکێشان !

هاوڕێیانی تێکۆشـــەر !

(لەوکاتەوە کۆمەڵ دابەش بووە بەسەر چین و توێژ و دەستەی کۆمەڵایەتی جیاجیادا ، کە ئەویش سەرەنجامی هەوڵی مرۆڤ بـــۆ دابین کردنی پێداویستییەکانی ژیان پەیوەندییەکانی بەرهەمی گۆڕی ، ئابووری کۆمەڵ بەپێی قۆناغەکانی ژیان گەشەی کـــرد ، تا لەو کاتەوە ناکۆکی و ململانێ لە نێوان دوو چین و دوو سەنگەری دژ بەیەک هەتا ئێستەش هەر بەردەوامە ، هەر لە قۆنـــاغی کۆیلەتی و قۆناغی فیودالییەوە تا قۆناغی سەرمایەداری ئـــەو ناکۆکییە لەگەڵ پێشکەوتنی باری کۆمەڵایەتی و شارستانیەتـــی کۆمەڵەوە شێوە و تین و تاوی لە گۆڕان دا بووە ، ئامرازی هـــۆی بەرگری و جۆری بەکار هێنانی ئەو ناکۆکییەش هەر لە گـــۆڕان و پێشکەوتن دا بووە بێگومان بەپێی ئاقاری مێژوو ، بەپێی یاسای گەشە کردنی کۆمەڵ سەرکەوتن هەر بۆ چینە شۆڕشگێڕەکان بـــووە و ئەبێ .

ئەمڕۆ لە عێراق دا ڕژێمی سەرمایەداری باڵی ڕەشـــی چەوسانەوەی کێشاوە بەسەر هەموو بوارەکانی ژیان دا ، لەبـــەر ئەوەی نوێنەری سیاسی دەسەڵاتداری سەرمایەداری کۆنەپەرستی فاشی لە عێراق دا بووتە مۆتەکەی سەر سنگی هەموو خەڵکـــی عێراق بەتایبەت کرێکاران و زەحمەتکێشان بەهۆی ڕەنج و ماندووبوونی کرێکاران بەشی زۆری بـــۆ خەزێنەی فاشییەکان ئەگەڕێنـــەوە

لەم بوارەدا بورجوازی عیراق بەهۆی کوردستانیشەوە وابەستەی بازاری ئەمری ئیمپریالیزمن و دژی بزووتنەوەی نیشتمانی و کرێکاران و زەحمەتکێشانن و لەبەرەی گەل وەکو چین چونەتە دەرەوە . ماوەتەوە بورجوازی بچوک کەتەنها ئەوەندەی بەرەست تیدا ماوە وەک چینێکی ژێردەستەی نەتەوەی ژێردەستە تا رادەیەک دەوربببینی . کەچی لەبری ئەوەی ئەم دەورە وەک پێویست ببینی ،بەرژەوەندی تەسکی ئەخاتە سەروی هەموو مەسەلەیەکەوە ئەمەش ناوەروکی راستەقینەیەتی . ئەمەش لە قوول کردنەوەی شەری ناوخو ، نەبوونی دیموکراتیەت ،وابەستەیی ،سازش دا خوی ئەنوێنێ وماهیەتیان دەرئەخات .)

( چەندین سالە هێزە بورجوازییە جیاجیاکانی کوردستان ،لە باتی ئەوەی رووی چەکەکانیان لە پێناوی زیندوی هێنانی مافە دیموکراتیەکانی خەلکی کوردستان بەکار بهێنن ، کەچی هێندە خەریکی لایەلا کردنی ناکوکی سەرەکین ، لەوە زیاتر خەریکی شەری ناوخوین ،نموونەش ( ١٩٦٤ – ١٩٧٠) و لەبەرگێکی تر ( ١٩٧٦– ١٩٨٥ ) و ئیستاش هەر بەردەوامە .

شەری ناوخو لە کوردستان دا گەیشتوتە رادەی دلساردبوونەوەی خەلکی شار و زەحمەتکێشانی لادێ ،دانیشتن و واز هێنانی پێشمەرگە جوامێرەکان . سەرەرای ئەمانە هەموی هەر بەهۆی ئەو شەرەوە چەندین کێشەی گەورە و گچکە بو پێشمەرگە کەس و کاری پێشمەرگە دروست بووە ، دوژمنایەتی زوریان بو پەیدا بووە ،کار گەیشتوتە تیرۆر کردنی دەیان کەسی بەتوانا و بێ تاوان ،ئەمەش بەلگەیەکی رەشی شەری ناوخویە .)

( ئیمە لە روانگەی کرێکاران و زەحمەتکێشانەوە رای دەگەیەنین ،نەوەستاندنی ئەو شەرە شوڕشی کوردستان دوچاری لەوتان ئەکات بویە داواتان لەکرێکاران و زەحمەتکێشان و روشنبیرە شورشگیرەکان ئەکەین ،چونکە بو بەرژەوەندی بورجوازیەکان لەم

٢٩

شەرە شوەدا بەشدار نەبن ، بو ئەوەی دەستەبەری ئەوە بکری بزووتنەوەی میللەتەکەمان شکست نەخوات وقوربانی بێهوودەش نەدری ، مەرجی بەدی هاتنی ئەو مەبەستەش چەسپاندنی رێبازی کرێکاران و زەحمەتکێشانە وە رێبەرایەتی کردنی بزووتنەوەی میللەتەکەمانە لەلایەن حزبی پێشڕەویانەوە ).

( لەوانەیە کوڕەلێ خەڵکی جیاجیا بڵێن مەسەلەی وەستاندنی شەری ناوخو ، باس کراوە ، نوسراوە ، پەیمانی دووقوڵی ، چوار قوڵی و بگرە نوزدە قوڵیشی بو مورکراوە ، ئەی بوچی کوتایی پی نەهاتووە و پاش ماوەیەك وەك تیراوی سەری هەڵداوەتەوە) ؟

(وەلام ئەوەیە ، تا جڵەوی سەرکردایەتی بزووتنەوەی دیموکراتی بەدەست بورجوازیەکانەوە بێت ، شەری ناوخو کوتایی پێ نایە . بویە ئەبێ کرێکاران و زەحمەتکێشان ووشیار بن و لە دەوری مارکسیزمی شورشگێردا کوببنەوە ، رێبەرایەتی بزووتنەوەکە بگرنە دەست تا بتوانن کوتایی بە کێشەکان بهێنن و سەرکەوتنی یەکجارەکی بەدەست بهێنن ، کە ئەویش تەنها هێنانە کایەی کوماری دیموکراتیکی شورشگێرانەیە کە لە سایەیا مافی چــــارە نووس دابین ئەبی . لەبەرەوەی گەیشتن بەو هیوایە لە قوناغە دژوارەدا ، هەر هەنگاوێ کە پێش ئەکەوین ئەبێ بیکەینە پالپەستوی شورشگێرانە بو کەم کردنەوە و نەهێشتنی شەری ناوخو بویە هەموو تێکوشەر و شورشگێر و دڵسوزی ئەبێ هەوڵ با ئازادی و دیموکراتی و لانی کەمی پێکەوە کار کردن بهێنرێتە دی ، ئەمەش خوی لە روانگەی ئێمەوە لە هاتنە دی دروشمی :- ئازادی ، هاوکاری

## یەکیتی بو رزگاری

ئەبێن X ئازادی کاری سیاسی و سەربەستی بیروباوەر ، هاوکاریش بـــو راپەڕاندنی کاروبارەکان و یەکێتیش لە پێنـــاوی

پێکهێنانی ئەوەی شۆڕشگێڕانە دژی فاشیستەکان لە بۆ ڕزگاری ئەم ئەرکانەش هیوایەکی بەهێزی ئەم قۆناغە نابێ بە هـــۆی هیچ بیانوویەکی فکری و سیاسی و ئایدیۆلۆجی و تەنزیمیەوە نکوڵی لێ بکرێ . ئەمە مەسئولیەتێکی مێژووییە کە نابێ (م.ل) ەکان بە بیانووی ئەوەی شەڕی بۆرجوازییەکانە دەوری تەماشاکەری تیا ببینن . بۆیە داوا لە هەموو گرووپێکی (م.ل) ئەکەین ، داوا لە هەموو تێکۆشەری ، شۆڕشگێڕ و دڵسۆزی ئەکەین بەقەد توانای خۆیان لە پێناوی هێنانی ئەم هیوایە ، هیوای دابین کـردنـی ئازادی و دیموکراتیدا دەور ببینن .

ئێمە لای خۆمانەوە بۆ پشتگیری کردنی هەموو هـەنگاوێکی پێشکەوتن خوازانە ، بۆ لابەلا کردنی ناکۆکیە لاوەکیەکان لــە کاتێکدا دەرێغی ناکەین ، لە هەمان کاتدا سوور ئەبین لەسەر ڕێبازی مارکسیزم ، لەسەر پتر ووشیار کردنەوەی کـرێکـــارانو زەحمەتکێشانی کوردستان بۆ داکۆکی کردن لەسەر مـــافـــە دیموکراتی و چینایەتیەکانیان .)

## تێکۆشن لە پێناوی

## بەدیهێنانی مافی چارەنووس

٣١

## ٦- دابین کردنی یەکسانی بۆ ئافرەتان لەماف و فرمان دا

(لە سەرەتای پەیدا بوونی خاوەنداریتی تایبەتی یەوە، شان بەشانی دابەش بوونی کۆمەڵ بە سەر چین و توێژە جیاجیاکان و دەست پێ کردنی چەوساندنەوە و مژینی ڕەنج و بەرهەمی چینێک لەلایەن چینێکی ترەوە، چەوساندنەوەی دەولایەنەی ئافرەتانیش سەری هەڵداوە.. چ لەڕووی چینایەتییەوە، وەکو بەشێک لە چینە چەوساوەکان و چ لە ڕووی زایەن (جنس) یشەوە وەکو ئافرەت لەلایەن پیاوەوە کەتەنیا خۆی لە منال بوون و بەخێو کردنی و دابین کردنی پێداویستییەکانی ماڵ و لە خۆشگوزەرانی و ئارامی و حەسانەوە بۆ پیاو بەولاوە هیچی تر نەبووە .. ئیتر لە سەرجەم مافەکانی تری مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتی بێ بەش بووە..

هەر لەکۆنەوە لەپاش نەمانی مافی دایکیتی کە ئافرەت خۆی خاوەنی منال بووە، تا ڕادەیەک دەسەڵات و ماف و ئازادی و ڕێزێکی تایبەتیشی هەبووە پاش ئەوە کە قوناغی سەرەتایی و خاوەنداریتی سەرەتایی کۆمەڵایەتی دواکەوتووی بەرهەم هێنان و خاوەنداریتی تایبەتی پەیدا بووە ئیتر وردە وردە و لە ئەنجامی گەشە کردنی ئامرازە سەرەتاییەکانی بەرهەم هێنان و دابەش بوونی کار بۆ یەکەمین جار، لەنێوان ژن و پیاودا ئەو دەسەڵاتەی لێ سەندراوەتەوە و قوناغ بە قوناغی گەشە کردن و بەرەو پێشەوەچوونی مێژوو، ئافرەت چەندین چەوساندنەوەی بە خۆیەوە دیوە.. هەر لە کڕین و فرۆشتنەوە تا زیندە بەچاڵ کردن

چەوساندنەوەی ئافرەتان، ئەگەر چی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، هەندی گۆڕانی سادەی بەسەرا هاتووە و هەندی یاسای تایبەتی دانراوە بۆ چاک کردنی بە ڕواڵەت باری ناهەمواری ئافرەتان لەناو کۆمەڵ دا، بەتایبەتی لە وڵاتە

پێشکەوتووەکان دا ، وەکو مافی شووکردن و جیابوونەوە و خوێندن بەشداری کردن لە کۆبوونەوە گشتیەکانی ، مافی هەڵبژاردن و خۆهەڵبژێران و هەندێ شتی تر لەو بابەتە ، ئەوە لە بەرامبەر ئەوەی کە ئافرەت بووە بە کاڵا لە بازاری قازانجی سەرمایەداران و بازرگانی بە شەرەف و شەخسیەتیەوە ئەکرێ ، لە پێناوی کەڵەکەو قازانجی تایبەتی ... ، توشی چەندین نەخۆشی رەوشتی و دەروونی گۆم بوون و خۆ نەناسین و گوێ پێنەدان و بۆگەن بوونی ئەخلاقی و ...هتد بووە . بەڵام ناوەڕۆکی چەوسانەوەکە بێ بەش کردنیان لە مافەکانیان ، جگە لەو لایەنانە ، هەر وەکو خۆی ماوەتەوە .)

(ئەگەر سەرنج بدەینە باری ئافرەتان لە وڵاتانی دواکەوتوودا دەبینین لە زۆر رووەوە نالەبار ترە لە باری ژیانی کۆمەڵایەتی ئافرەتانی وڵاتانی پێشکەوتوو ( سەرەڕای مافی چەوسانەوەی چینایەتی لەسەر ئەوانیش) ئافرەتانی وڵاتانی لەمەر خۆمان هێشتا لە ژێر باری زوڵم و ستەمێکی ئێجگار سەختدا دەژین هێشتا وەکو مرۆڤ مامەڵەیان لەگەڵ دا ناکرێ ، هێشتا بێ بەشن لە مافی بە ئارەزوو هەڵبژاردنی هاوسەری خۆیان ، لە مافی جیابوونەوە ـ طلاق ـ بێ بەشن لە بەشداری کردن لە چالاکیە کۆمەڵایەتیەکان ، تێکەڵ بوون بە پیاوان دا نەک هەر قەدەغەیە ، بگرە لە زۆر شوێن و جێگادا تاوانێکی گەورەیە ، خۆ هەڵبژاردنی سەربەستانەی هاوسەر تا کوشتنیش لەسەری دەکەوێ هێشتا رزگاریان نەبووە لە ژن بەژن پێ کردنیان و گەورە بە بچوک و سێ بەکایی و ...هتد ، بەرامبەر ئەوەی کە پیاوان ئەو مافانەو بگرە زیاتریشیان هەیە ، ئەو پیاوانەی چ وەکو چینی چەوسێنەر بەدەسەڵاتن وە چ وەکو تاککەس باڵا دەستن لە کاتێکدا لە هەموو بارێکەوە سنوور بۆ رەوشت و هەڵس و کەوت و جل و بەرگی ئافرەتیش دائەنێن . بۆ خۆیان مافەکانیان سنووری

٢٢

شۆڕشگێڕانە کە لە سەردەمی ئێستادا تەنها بەم دیموکراتییەتە تەواوی مەسەلە دیموکراتییەکان چارەسەر ئەکرێن بە مەسەلەی ئافرەتیشەوە ).

(هەر بەم بۆنەیەشەوە داوا لە ئافرەتانی زەحمەتکێش ئەکەین کە جێگای ئاسایی خۆیان لەناو مارکسیستەکان دا بگرن و خەبات و هەوڵی خۆیان لەگەڵ (م.ل ) ەکان دا یەکخەن و ئەو هەوڵ و کۆششەی کردیانە لە پەرش و بڵاوی ڕزگار بکەن. جێگە بە دروشمی بریقەداری بورجوازییەکان هەڵنەخەڵەتێن کە نەك هەر ڕاستگۆ نین بۆ ئەو دروشمانەی بەرزیان کردوتەوە بەڵکو لە ژێر سێبەری ئەو دروشمانەدا ئافرەتان ئەچەوسێننەوە و لەم حاڵەتە ناهەموارەی قەفەس ئەهێڵنەوە. کە بێگومان بێ ئەو کارە محاڵە ئافرەتان بتوانن بەئاسانی سەرجەم مافەکانی خۆیان بە دەست بهێنن ... ئیتر کاتی ئەوە هاتووە، ئاوڕێك لەبارێ پڕ لەجەور و ستەمی خۆیان بدەن . کاتی خۆڕێکخستن و خۆ ئامادەکردنیان .. کاتی بەشداری کردنیانە لە خەباتی شۆڕشگێڕانە دژی زوڵم و چەوساندنەوە بۆ گۆڕینی ئەو واقیعە نالەبارەی کە مافەکانی ئەوانی تیا پێشێل کراوە ... لەهەمان کاتیشدا داوا لەگشت کرێکار و زەحمەتکێشێکی وشیار و ڕۆشنبیری شۆڕشگێڕی ڕاستگۆ و هاوڕێیانی ئەڵقە دراسییەکان ئەکەین کە نیهلگیرانە خەبات بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەم ئەرکە بکەن، بە شێوەیەك لەسەر زەمینەی واقیع ڕەنگ بداتەوە .. لە هەڵوێست و بیر و بۆچوون و ڕەفتار ،لەناو خۆمان و دەوروبەرمان دا، بەو بەدیهێنانی ئەم دروشمە و بەکردەوە چەسپاندنی یەکسانی ڕاستەقینە بۆ ئافرەتان لە ماف و فرمان دا. تا بتوانین ئێمەی (م.ل ) ی بە پێچەوانەی بورجوازییەکان، ووتە و دروشمەکانمان ببەستینەوە بە کار و کردەوەکانمان و جیاوازی ئەو دوو واقیعە بە ڕوونی دەربخەین .. )

# ٧- مونازەرە کردن، سەلماندن، یەکخستن

پێناسی جیاکەرەوەی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی سەردەمی ئێستا لە سەردەمی کۆن، ئەوەیە ئەم بزووتنەوەیە لەسەر ئاستی جیهان دوچاری کێشەی زل و زەبەردەست بووە، چەندین ناوەندی کۆمۆنیستی خۆیان بە ( دووزمای ) کۆمۆنیستەکانی تەواوی جیهان ئەزانن .

لەکاتێکدا ئەگەر چی کۆن لەناو بزووتنەوەی کرێکاران دا ڕوانگەی جیا و جیاواز هەبووە، لەناو کۆمۆنیستەکانیشدا ململانێی فیکری هەبوو . بەڵام تا مەرگی نا وەختی لینین، بزووتنەوەی کۆمۆنیستی یەک ناوەندی ئەمین و هەرجاری پێشەوایەکی ئەمینی هەبووە . سەردەمی مارکس و ئینگلس بوون . دوای مەرگی مارکسیش ئینگلس تەنیا مایەوە و دوای ئەویش ماوەیەک هەڵپەرستان ئەنتەرناسیونالیزمی دووەمیان شێواند، زۆری نەخایاند لینین هەڵکەوت و هەڵپەرستەکانی هەڵتەکاند .

لەکاتی لینین و دوای مەرگی لینینیش کەم تا زۆر کێشەی فکری و سیاسی و تیۆری هەر هەبوون و زووانی ئایدیۆلۆجی وەک پرۆسەیەکی سروشتی ناکۆکییەکانی کۆمەڵ ئەبڕابەوە. بەڵام لە حوکمی ستالین بەدواوە تا ئێستاش کێشەکان ڕوو لە قووڵ بوون و تەنینەوەی جیهانین بە بێ ئەوەی ناوەندی وەکو ئەنتەرناسیونالیزم و پێشەوایەکیش وەکو مارکس و ئینگلس و لینین هەڵکەوتبێتەوە بۆ جڵەو ڕاگرتنی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی بەچەشنێ کە لە خزمەتی کرێکاران و گەلانی جیهان دا پێشڕەوی شۆڕشگێر بێ، ئەمەش بوتە هۆی لاواز کردنی زۆری خەباتی کرێکاران و قازانجی گەورەی سەرمایەداران، کە بێگومانین سەرچاوەی ئەم ناهەمواریە بۆرجوازییە کەمکردنەکانی ناو بزووتنەوەی پرۆلیتارییان

کە وەکو چەندێکی وەك داکۆتاوی سیستەمی گەشەکردنی سەرمایە
داری خۆیان و بەدوا ڕەفتەنستانەکانیان جیهانگیرتر بوون
جووەها تەنی بەتواوی ناو بە مارکسیزمی شۆڕشگێڕیان هێناوەتە
کوڕی و لە وولاتانی پێشکەوتوو و دواکەوتوودا پەیدایان ئەکەن و
بزووتنەوەی کرێکارانیان دوچاری ئەم ڕۆژگارە کردووە و لەبەردەم
ئیمپریالیستەکان دا بۆ قۆناغێکی باش لاوازیان کردووە .

ئەم بارە دوخە ناهەموارە وولاتانی لەبەر خۆماتی لێ بەدەر
ئیمە (م.ل) کانی ئەم وولاتانەشی گرتۆتەوە ، شان بەشانی
گەشەی ئەو ناکۆکییە کە ئیمپریالیزم مایەی گەشەکردن و پێشکەوتن و
دەرخستنی کاکڵەی کێشەو ناکۆکییەکان . بەهۆی توندڕەوییەو شێوەی
چاولێکەری مەرامەکە ، بەبێ بەستنەوەیان بە واقیع و ڕادەی بەهێزی و
پێشخستنی خەباتی چینایەتییەوە زیانێکی زۆری لێداوین و زۆر
جار هێندەی بەو کێشانەوە ، یان ڕاست تروایە بڵێین بە جۆرێنەوەی
قسەی لایەنەکانەوە خەریك بووین ، نەو هێندە خەریکی ئەرکە
بنچینەییەکانی ناکۆکی بنچینەیی نەبووین ، سەرەنجامیش حکومەتە
بورجوازییەکان هەر ماون و تەواوی ئەو ڕێکخراوانەی سەری
چەپ بوون شکستیان خواردووە ، بگرە هەندێکیان لە ناوچەکە و
عیراق دا تازە تازە لە کۆتایی چەرخی بیستەم دا گەڕاونەتەوە سەر
ئیسلام و گرنگی ئاینی ئیسلام .

کە ئەوانە ئەڵێین ، مەرامی فکری ناو بزووتنەوەی کۆمۆنیستی
ڕەت ناکەینەوە و دەرگاتیمت لەم بارەوە نەخۆشییەکی کوشندەیە
ئێمە پێمان وایە ئەبێ ئەو ناکۆکییانە ، زۆران و مەرامی فکری ،
ئایدۆلۆجی و تیۆرییانە بخەینە سەر ئاقاری بابەتی و بەرەستی
زانستی خۆی و تەواوی ئەو مەسەلانە ، گشت و تایبەت ، دەرەکی و
ناوەکی ، کۆن و نوێ لە چوارچێوەی بەرەستییەکانی گەشەکردنی
خەباتی چینایەتی لە وولاتەکەدا لەبەر چاو بگرین و هیچ لایەك
لەو مەسەلانە یەك لایەنە حسابی بۆ نەکەین و هەموو حسابێکیش

۳۸

له پێناوی گەشەپێدانی خەباتی کرێکاران و زەحمەتکێشان و بەرز کردنەوەی ئاستی وشیاری شۆڕشگێرانەیان و گەڵاڵە کـــردنی بەرنامەی مارکسیستانەی شۆڕشگێرانە بێت،وە لە پێناوی قـــــبوڵ کردنەوەی ڕێبازی چینایەتی و مارکسیـــستانەی ناوخـــەباتی ڕەوای دیموکراتی گەلەکەمان بێ .

ئێمە پێمان وایە بزووتنەوەی کۆمۆنیستی و کۆمۆنیستەکان ئەبێ بۆ مەیدانی هەموو جۆرە شەڕێکی تیئۆری ،فکری ،ئایدۆلـــۆجی خۆیان ئامادە بکەن و بیانەوێ و نەیانەوێ دوچاری ئەو شەڕانە ئەبنەوە و بەبێ پاک ڕاگرتنی مارکسیزمی شۆڕشگێر و دوورخستنەوەی لە بیروڕا ژەهراویە ڕیفۆرمیستەکانی ناو بزووتنەوەی کرێکاران ناتوانن بەبێ ی گۆڕانی ڕەوتی ڕووداوەکان و پێشکەوتنی وشیاری کرێکاران و زەحمەتکێشان و ڕووناکبیرە شۆڕشگێڕەکان بەرنامەی کاری شۆڕشگێرانە پیـــادە بکـــەن .

بەڵام شەڕی تیئۆری و ئایدۆلۆجی و فکریش وەکو شــــەڕی چەکدارانە وایە، وەکو ناکرێ دابمەزێتە مەیدانی شەڕێکەوە پێش ئەوەی لە تاقی شەڕ و ژمارەی شەڕکەر و شوێنی شەڕی دوژمنان و خۆت شارەزا بێت،ئاوهاش ناکرێ بەبێ قووڵ بوونەوە ،لێکدانەوە توێژینەوە ، زانیاری کۆکردنەوە لە سەر تەواوی مەسەلەکان و سەلماندنی بە بەڵگــەی بۆچوونەکان حوکم لەسەر کێشە گەورەکان بدەیـــن و نەتوانین ئەو حوکمانەمان لە واقیعی خەباتی چینایەتــــــــی و دیموکراتیدا جێ بکەینەوە و بیکەینە هێزی پەرەپێدانی خەباتـــی کرێکاران و نزیک کەوتنەوە لە سەرکەوتن بەسەر سەرمایەداراندا .

ئەو مەسەلانەی باسمان کردن و تا رادەیەک لە( هەڵوێستێکی ئەنتەرناسیونالیستی ) بەش ئەسەمان لە سەر کردووە . ئێستا مایەی دوورکەوتنەوەیەکی بەرینی ئەسلمێنرای نێوان گروپی ( م.ل ) کانە ئێمە هەر لە سەرەتای دەرچوونی ( ئاڵای شۆڕش) ەوە و لەوەوپێشیش هەوڵمان داوە دوور کەوینەوە لەتاودانی سیاسەتی سەرکەشـــی

٣٩

صرافی تا واقیعی دەر وەرکەوتنەوە لە رادیکالیزمی ئەکادیمیزم و شۆڕش
گێڕتنی ڕستەی چەنرای جنیسی جوانی ئەوتۆ کە بیانووی بـــو
دەوورکەوتنەوە لە کۆڕی خەبات ، لە هەمان کاتیشدا هەوڵمان داوە
تا بەتەواوەتی لە ناوەڕۆکی هەموو لایەنەکان و بەرنامە و جۆری بیـــر
کردنەوەیان تێبگەین ، دەلێینەوە هیدائی صرافی ئایدۆلۆجیـــی و
هیندەی تر واقیعی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی لە وولاتەکەدا نــــە
ئالۆزێنین . پێمان وایە ئەکادیمیزم کردنی مارکسیزم و تەتبیـــق
هێنانی تەنها لە قالبی دراسی و تیئۆری و صرافی چاولێکەریدا
مارکسیستەکان دوور ئەخاتەوە لە ڕووداوەکان و تووشی گۆشـــەگیـــری
فکریان ئەکات . ئەوانە بەو مانایە نالێین کە داوای پەیوەنـــدی و
یەکێتییەکی ڕووکەشی لایەنە ( م .ل ) کان بکەین و صرافی ئایدۆلۆجی
پشت گوێ بخەین . وەکو هەستی سەرەوە بە هەڵە ئەزانین و دژین
ئەمەش بە هەڵەی کوشندە ئەزانین ، ئەوەی لە سەر ئاستی جیهان و
ناوچەکەدا دەرکەوتووە و سەلماوە لەناو بزووتنەوەی کۆمۆنیســـتی دا
لەسەر ڕیفۆرمیزمی کۆن و نوێ و سەرەنجامەکەی ســـاڵەهای ســـاڵی
خەبات بۆمان ساغ بۆتەوە . هەڵوێستمان لێ وەرگرتووە و بە ڕاشکاوی
دژین ، ئەوەی مارکسیزمیش وەك پرنسیپی ئەگۆڕ بیانی پرۆلیتاریای
لە سەر بینا کردووە و قابیلی پیاچوونەوە و گۆڕین نین لای ئێمـــە
چەسپیوە و لە سەرەتای کاربانەوە تا ئێستا باوەڕمان پێی بووە و
خەباتیشمان لە بیناییە بەدیهێنانی کردووە .

بۆ نموونە ئێمە پێمان وایە ( م .ل ) فەلسەفەیەکی هەژار و
بزووتنەوەی کۆمۆنیستی کەم تەجرەبە نییە تا بێین دراسەی ئەمەرە
بکەین کە ئایا دروشمی ڕووخاندنی ڕژێم هەڵگرین یا نەء ئەسەر
ئەمە ڕێك ئەکەوین یا نەء ؟ پەیوەستە ڕژێمی سەرمایەداری بڕوخێ
یا نەء ؟ ئەمە لە نووسینی مانیفێستەوە بەتایبەتی لــە پــــاش
کۆمۆنەی پاریسەوە ساغ کراوەتەوە ، ئیتر زیادە ڕۆیی لەم بارەیەوە
سەفسەتەیە ، بگرە بیانووشە بۆ دوورکەوتنەوە لە ئەرکە پراکتیکیـــە

سەختەکانی کوێی خەباتیان بە خۆمان بلێین (م.ل) و شۆڕشگێڕ و دوژمنی ڕیفۆرمیزم ، کەچی مشت و مڕ لەسەر ئەوە بکەین کە ئایا خەبات بۆچی جۆرە دیموکراتیەتێك ئەکەین ؟ ئەمە شیان ڕوون و ئاشکرایە کە کۆمونیستەکان دیموکراتیەتیش لە ڕوانگەی چینایەتیەوە هەڵدەسەنگێنن و خەباتیشیان لە پێناوی دیموکراتیەکی شۆڕشگێرانەدایە . گەر مارکس بەو پێیە سیاسەتی بکردایە و مامەڵەی لەگەڵ ناکۆکیە چینایەتی و فکریەکان بکردایە . هەرگیز و هەرگیز ئەنتەرناسیۆنالیزمی یەکەمی لەو هەموو باڵە جیاجیایانەی ناو بزووتنەوەی کرێکاران دروست نەئەکرد و (کۆمەڵەی کۆمونیستەکان) ی پێك نەئەهێنا . مارکس زۆر و قوناغی خەباتی باش هەڵئەسەنگاند ، ڕادەی وشیاری ، فکری و خەباتی چینایەتی لەبەر چاو بوو . بۆیە ئەگەرچی مارکسیزم لاوازتر بوو ، وە باڵەکانی تری ناو پرۆلیتاریا بالیان هەبوو ، بە شێوەیەکی شۆڕشگێرانە کۆی کردنەوە و هەنگاو بە هەنگاو بزووتنەوەی کۆمونیستی لەناو کرێکاراندا چەسپاند .

لەم دۆخە تایبەتیە گواسترا وەیەی ( الحالە الانتقالیە الخاصە ) بزووتنەوەی کۆمونیستی کە یەکگرتو نییە ، خاوەن یەك بەرنامەی کۆمونیستی نییە ، وە چەندین گروپ و لایەن هەن هەموو ( بە خۆیشمانەوە ) . بە (م.ل) و کۆمونیست ئەزانین . وە هێشتا خەباتی چینایەتی ، وشیاری چینایەتی ، ئاستی کۆمونیستی وەك نیروی پێویستیەوە نییە و ئەوەی هەمیشە پتر لەناو خوێندەوارە شۆڕشگێڕەکانایە لەبری ئەوەی لەناو کرێکاران و زەحمەتکێشاندا بێ هیچ لا و گروپێکیش نەیتوانیوە ئاستی شعاری کرێکاران و زەحمەتکێشان و خەڵکی بەرز بکەنەوە . لەم دۆخە تایبەتیەدا ئەمەیە لا ڕاستە کە لە سەر کۆمەڵی خاڵی هاوبەش نزیك ببینەوە و هاوکاری بکەین و لە بەرامبەر دوژمنانی بزووتنەوەی کۆمونیستی پشتی یەکتری بگرین هەنگاو بە هەنگاویش مەسەلە فکری و ئایدیۆلۆجیەکانیش ساغ بکەینەوە کە دیارە هەر ئەو لایە ئەتوانی

٤١

سەرکەوی کە بتوانێ هەڵوێستی ئایدۆلۆجی کۆمۆنیستی واقیعیانە بچەسپێنێ .

بۆ نموونە ئەتوانین لەسەر دروشمی ١- ڕووخاندنی ڕژێم ٢- ئەلتەرناتیڤی ڕژێم و ٣- بەرگری لە یەکتر و ٤- بەرگری لە (م.ل) و بڵاوکردنەوەی زۆرترین سەرچاوەکانی و ٥- مافی چارەنووس و ٦- هەوڵدان بۆخۆشکردنی زەمینەی دیموکراتی و ئازادی سیاسی ..هتد ڕێککەوین و پێکەوە کاریان بۆبکەین باقی کێشەکانیش، ناکۆکی و جیاوازییەکانیش بهێڵینەوە بۆ پرۆسەی ڕووداوەکان و ڕەوتی خەبات کە بێگومان فاکتەری کات و دەرکەوتنی ڕاستییەکان، شانبەشانی ووشیاری چینایەتی و گەشەکردنی ئاستی فکری و تیۆری . دەوری کاریگەر ئەگێڕن لەوەی یەکلاییان کەن وە بەیەکی بسەلمێنن .

بۆ ئەوەی ئەم جۆرە بیرو ڕایە لەسەر حسابی لێدوان و مونازەرەی ئایدۆلۆجی نەبێ . سێ مەسەلەی ئەلتەقی لە دروشمێکدا پێک هاتومان بەناوی ( مونازەرەکردن .. ئەلماندن .. یەکخستن) کە (یەکخستنی کۆمۆنیستەکان خۆئامادەکردن ) مان بەرێی کردوتەوە ئەخەینە بەردەم هەموو گروپ و تەرەف و کەسێکی (م.ل) ی بە هیوای بەدیهێنانی بەرنامەیەکی کۆمۆنیستی شۆڕشگێڕانە لە پێناوی بەدەست هێنانی ئامانجە دوور و نزیکەکانی پرۆلیتاریا کە لای ئێمە لە تەواوکردنی قۆناغی دیموکراتی و سۆشیالیزم (دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا) و کۆمۆنیزم بەرجەستە ئەکرێ .

١- مونازەرە کردن :-

لەسەر تەواوی مەسەلە فکری و تیۆری و ئایدۆلۆجییەکان و لە کارە ناوخۆییەکانیشەوە دەست پێ بکات باشترە .تا ئەیانگەیەنێتە ئاستی لەیەک تێگەیشتن و کاڵاڵە کردن .

٤٢

٢- سەلماندن :-

دوای کەڵاڵە کردن و لێك تێگەیشتنی وردی مەسەلەکـــان . ئیتر ئەتوانین بە گیانێکی کومونیستانە ڕاستی و هەڵەکان بەیەك بسەلمێنین و هەڵەی یەکتر هەڵبژێرین و ڕاستی یەکتر قبول بکەین .

٣- یەکخستن :-

دوای هەڵبژێرینی هەڵەی یەکتر و قبول کردنی ڕاستـــی بوچونی یەکتر و نزیك بوونەوەی بوچونە فکــری و تیئـــوری و ئایدولوجییەکان . ئەوسان وایە ئیتر هیچ جورە بەربیانوێك لە نێوان دا نامێنی بو یەکگرتن و کاتی یەکخستنی بەرنامەی کومونیستی دێتە پێش .

ئەوەش ئەزانین تەواو کردنی هەر بەشێکی ئەم دروشمە ماوەیەکی ئەوێ و گەیشتن بە یەکخستنی ئەو لایەنانەی لە سەر یەك بەرنامە ڕێك ئەکەوین ، پروسەیەکی ئاسان نییە . بەلام لەگەل ئەوەشدا کار بو کردن و تێکوشان لە پێناویا ، زوو بێ یا درەنگ هەر ئەمانگەیەنێتە هیوای یەکخستن و بەهێز کردنێکی پرنسیپی گەورە لە دوژمنانی بزووتنەوەی کومونیستی ئەدەمێن و ڕێی دووری سەرکەوتنی کرێکاران و زەحمەتکێشان نزیـــك ئەخەینەوە .

# بـژی سـوشـیالیزم

# پەیامێکی ئاواڵە

هاوڕێیانی تێکۆشەر !

کرێکاران و زەحمەتکێشی وشیار !

(ئەرکی دروست کردنی ڕێکخراوێکی کۆمۆنیستی ، واتە ئەو تەیار کردن بۆ جەنگین دژی دوژمنانی کرێکاران و زەحمەتکێشان ، دژی دوژمنانی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی لە ڕووی فەلسەفی و تیئۆری و فکری و سیاسی و خەباتی توند و تیژیشەوە بۆ بڕینی قۆناغی دیموکراتی شۆڕشگێڕانە ، بۆ بەستنەوەی ئەو قۆناغە بە سۆشیالیزم وە گواستنەوە لە سۆشیالیزمەوە بۆ کۆمۆنیزم ، ئەمە بەرنامەی لایەنی کەم و دووری کۆمۆنیزمەکانە بێ پێچ و پەنا و شاردنەوە)

بۆ ئەو ئەرکانەش شەرەفێکی مرۆڤایەتی مەزنە مرۆڤ شەرەفی کۆمۆنیستی بێ بەری لە پێناویانا تێ بکۆشێ ، ئازار ببینێ ، بگیرێ ، ئەشکەنجە بدرێ ، بکوژرێ و تادوا هەناسەی ژیان کۆمۆنیستانە بژی .

(بەڵێ هاوڕێیان ، ئەرەکە بتوانین ببینە کۆمۆنیست و وەکو کۆمۆنیست بژین ، وەکو کۆمۆنیست پەیوەندی هاوڕێیانە ببەستین و وەک کۆمۆنیستێکیش بە دەست دوژمنانی کۆمۆنیزم و کرێکاران و زەحمەتکێشانی لە هەر سەنگەر و بەرگێکدا بێن شەهید بکرێین . چونکە تەنها بیر و باوەڕی کۆمۆنیزمە بە خۆشەویستی ڕاستەقینەی مرۆڤ و مرۆڤایەتی ، بە دوور کەوتنەوە لە سەر حسابی خەڵک ژیان ، بە دوژمنایەتی چەوسێنەران گۆشیان ئەکات و هەر کۆمۆنیستەکانیشن دوورن لە خۆ پەرستی ، ئینانیەت ، ڕقەبەرایەتی ، تایەفەگەری ، پیلان گێڕی ، نەتەوەپەرستی ، ناپەراسەری ، خورافیات پەرستی ، کە هەموو ئەمانە ئەبوو گەورەی بەردەم پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و زەمینەی لەبارن بۆ کۆنەپەرستی .)

(نابین بە کۆمۆنیست ئەگەر هەموو ژیانمان بۆ بیروباوەڕەکەمان تەرخان نەکەین و هەموو بوارەکانی ژیان نەکەینە تەریبونی بڵاو کردنەوەی بیر و باوەڕەکەمان ، ئەگەر ڕزگارمان نەبێ لە بیروباوەڕی

٤٤

ناسیونالیستی و پاشڕەوکی بۆرجوازی .

کۆمونیستیش هەرگیز ناتوانێ خزمەتی تا سەری بزووتنەوەی کۆمونیستی بکات ئەگەر ئەوەندەی حزبی بیروباوەڕەکەی ئازا و چاونەترس نەبێ و لەپێناویا ئامادەی مردن نەبێ . ئەگەر لە دوژمنانی کرێکاران بترسێ و دوژمنانی مارکسیزم بتوانن بیترسێنن .

کوانە هاوڕێیان !

بیروباوەڕەکەمان جیهانێکی گەورەو مەزنە ، ئەرکێکی سەختە یەکی دوورە و ئەتوانین بڵێین هێشتا سەرەتای کارمانە و گەیشتنە ئاکامیش زۆری ماوە . بەڵام کە ڕووداوەکانی مێژوو بە ڕوونی ئەبینین ، کە پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی دیاری ئەکەن ، کە سەراپای جیهانیش فێر ئەبین ، کە حەقیقەتی مێژوو ئەبێتە دووربینمان ، ئیتر لەهەردەم هەنگاوی کۆمونیستانەماندا سەختی ئەرکی خەبات ئاسان و ڕێی دووری سەرکەوتن نزیک ئەبێتەوە . بۆیە ئەبێ لەو بڕوایەوە خەبات بکەین کە سبەی سەرئەکەوین و لەبەرامبەر دوژمنانیشدا وا سوور بین کە تەمەنیان چەند ڕۆژێکی ترە و گۆڕیان هەڵئەکەنین .

هاوڕێیان !

«ئەگەر پێمانیا بێن ، شانەیەك بن ، مەیل و تەیاری بن ، گروپ و حزبێ بن ، چونکە کۆمونیستین ، چونکە بیروباوەڕی کرێکارانمان هەیە ، چونکە قوڵایی بیرمان ئەنتەرناسیونالیزمە ، ئەبێ وا تێبکۆشین ، وا سەراغ بکەین ، وابجەنگین کە هەموو کۆمونیست و کرێکارانی شۆڕشگێڕو زەحمەتکێشانی دنیامان لەگەڵە »

«هەر لەم ڕوانگەیەوە ئەو مافە دیموکراتییە بە خۆ ڕەوا ئەبینین ڕوو بکەینە هەموو کرێکار و زەحمەتکێشێ ، هەموو ڕووناکبیرێکی شۆڕشگێڕی لایەن بێ یا لایەنگر ، حزبی بێ یا نەبێ ، دانیشتوو بێ یا پێشمەرگە ، شاری بێ یا لادێیی ، کورد بێ ، عەرەب بێ ،

٤٥

# فەرهەنگۆک

١- ئایدۆلۆجی / سیستەمی تیئۆری بیرکردنەوەی فەلسەفی و سیاسی و هونەری بە بە چەشنێکی زانستیانە .

٢- ئالتەرناتیڤ / لەبری ، لە جیاتی ، ( البدیل ) .

٣- ئوتۆکراسی / دەسەڵاتی بێ سنووری حوکم و حاکمێکە کە یاسا و نەریتیش نەبێ چاودێری بکـــات .

٤- ئۆپۆزسیۆن / بەرهەڵستکاری ی سیاسیانە ( المعارضة ) .

٥- پوتچیزم / ڕێبازی لادەرانەی بورجوازی بچووکە ، ڕوون کردنی سنوور و مەرامی چینەکانە ، ڕێگرتنـــە لە سەربەخۆیی ڕێی شۆڕشگێرانەی کرێکاران .

٦- بیرۆکراتی / حوکمی داسەپاوی ئیداری پشتی مێـــز .

٧- دۆگماتیزم / کار و بیرکردنەوەی نەگۆڕ و گەشەنەکردن و مۆمکو بیروباوەڕی ئاینی ...

٨- ناسیۆنالیزم / نەتەوە پەرستییەکی گۆشەگیرانە .

٩- شۆڤێنیزم / نەتەوە پەرستییەکی کۆنەپەرستانە و دژایەتی کردنی نەتەوەکانی تر تا تواندنەوەیـــان .

١٠- پرەنسیپ / بنەما ( مبدأ ) .

١١- سازشکاری / سات و سەودا ، ( مساومە ) .

١٢- فۆرمولا / دارشتن ، ( صیغە )

١٣- ریفۆرم / گۆڕینی ڕووکاریی بەپێچەوانەی گۆڕینی ڕیشەیی .

١٤- ریڤژنیزم / لادان لە ڕێبازی کرێکاران ، هەڵگێڕانەوەی ( م.ل ) و ڕاماڵینی ناوەڕۆکی شۆڕشگێرانە ی .

١٥- تیئۆری / بیری زانستیانەی ڕێ نیشاندەرانە لە سەر بنچینەی کارکردنی عەمەلـی .

١٦- تیرۆر / پیاو کوشتن و کۆڵنەکردن لە خراپەو کوشتن .

# پێڕست



٤٨

لەئەرشیفی مۆفەق میراودەلی یەوە

روانگەی ژمارە

# ناکامەکانی جەنگ و دەرکەکانمان

• دوای نەمانی هەڵاندنی شوورەوی و حیزبی بەعسی دەوڵەتانی عەرەبی بە نیازی داگیرکردن و لکاندن، پەلاماری عەسکەری یەکتریان نەداوە. گەر کێشەیەکیش کەوتبێتە نێوانیان لەگەڵ ئەوەشدا نەگەیشتۆتە رادەی داگیرکردن. هەر ئەمەش لەناو دەستمان پەروەرانی عەرەبدا، هەروەها ناسیونالیست و حزبگەڵەکانیشیدا باسی یەکگرتنەوەی نیشتمانی گەورەی عەرەب کراوە، بەڵام هەرگیز باسی یەکێتی کەفیرەیی (اندماج)ی بەهێزی عەسکەری، وەکو ئەمەی رژێمی عێراق دژی کوێت، نەکراوە.

رژێمی فاشی عێراق، تاکە رژێمە بیری لە هێرشی داگیرکەرانەی وا کردبێتەوە و بێ حسابکردن بۆ سەرەنجام و توانای خۆی و پەیمانەکانی کوێت، ڕۆژی (١٩٩٠/٨/٢) ئەو وڵاتەی داگیر کرد و سەرەتا بۆ هێنانەوەی بیانوو رژێمێکی دەستنیژی تۆتکردەوە و دوای هەفتەیەك وەکو بڵێی سەرتا و رژێمەکە ئەما و عێراق کوێتی ماعیەوە. گوایە سنووری دەستکردی کۆلۆنیالیستی دەسڕێتەوە. هەروەکو رژێم ئەزانی کە هەم کوێت پێش هاتنی کۆلۆنیالیزم جۆرێ لەسەربەخۆیی هەبووە و... هەم سنووری کۆلۆنیالیستی راستەقینە لکاندنی کوردستانی عێراق بە عێراقە، کە بۆ نەهێشتنی ئەو سنوورە دەکرێ، سەدام بە زاری کیمیابی وەڵامی گەلی کورد دەداتەوە.

بەم جەنگە ناڕەوایە رژێمی عێراق جیهانی سەرسام کرد و پرسیارێکی ڕەوای خستە سەر وێردی زمانان، بەتایبەتی هی خەڵکی عێراق و کوردستان کە:

داخۆ سەدام تازەگی لە جەنگێکی هەشت ساڵە رزگاری بووە و هێشتا نەیتوانیوە تەنانەت لەگەڵ ئێراندا سەروای وەستانی جەنگ، کێشەکانی یەکالا بکاتەوە... ئەوە چۆنە وێراوەتی جەنگێکی نوێ وا زوو بەرپا بکا؟

پ.د.ل(١)

سەروتاری ئاڵای شۆڕش- ژمارە ٤ ساڵی ١٩٩٠

## پاشماوەی ... ناکامەکانی جەنگ

سەر لێکردنی یەکێتییەکی سیاسی لەسەر بۆچوونە هاوبەشەکانیان ، بە تایبەتی لەسەر: رووخاندنی رژێم و کۆمارێکی دیموکراسی خۆرەگێڕو دابین کردنی ئازادی بێ مەرج و دابین کردنی مافە سیاسی و پیشەییەکانی کرێکاران و زەحمەتکێشان ، ئەمجارە هەموو ئەوانەی لە عێراق و لە کوردستانی عێراقیشدا ، گەر هات و هەلێکی سیاسی باشی هەڵکەوت کوردستانی عێراق لە دژی ئیمپریالیزم و لە ئازانجی پەستنی حەیاتی خۆرەگێڕانە جیابێتەوە ، ئەوا دەبێ دژی هەموو جۆرە کۆسپ و پیلانێك بێن لەم پێناوەدا ، نابێ لەبەر هیچ بیانوویەکی سیاسی و تیۆری هەڵی سەربەخۆیی کوردستان لە گەلی چەوساوەی کورد بدرێ .

خاپانی ئەم هەڵە مێژووییەیە بۆ مێژوو پێش هەموو لایەك بڵێین : زۆر لە مێژووی رووداوە عەسکەری و سیاسییەکانی کوردستاندا ، رێبەرایەتی راپەرینە چەکدارە-ەکانی کوردستان ، کەوتوونەتە ناو تەپکەی ناکۆکییەکانی، داگیرکەران و بە هاندانی داگیرکەری دژی داگیرکەری دیکە جەنگیون و هیوادارین ئەمجارە ئەگەر بۆ جارێکیتر بێ ، پەندەکانی مێژوو سوودلێوەرگیرێن و کورد نەکرێنەوە داری گەمەیەکی دیکە ، بە تایبەتی خەریکە گۆمەکە قووڵ دەبێ و دەوڵەتانی ئیمپریالیزمیش ئەمجارە راستەوخۆ دابەزیونەتە مەیدان و لە کوردستاندا دەوڵەتی تورکیایان کردۆتە دەسکێشی دەستەکانیان ، بۆیە وریابی ... وریابی گەلێ .. پێویستە ! ●

# بەیاننامەی یەکگرتنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان- پەیڕەو یەکگرتن

- جەماوەری ئازادیخوازی کوردستان!

لەهەلومەرجێکدا کە گۆڕانکارییە دیموکراتیەکانی جیهان جۆشی تێک شکاندنی کۆنە دیکتاتۆرەکانی رابوردوو دەخۆن و چارەسەرکردنی کێشە چارەسەرنەکراوەکانی گەلان خەریکە دەبێتە سیمای سەردەم، خەڵکی ئێمەش لەکوردستاندا، نۆبەرەی چارەسەکردنی کێشەکەی دەرکەوتوەو راچەنینی ویستی نەتەوەیی‌و خواستی دیموکراتی لەکوردستاندا لەگەش بونەوەو پێشکەوتندایە، راپەڕینی پێرار ساڵی کوردستان کە ی.ن.ک دەوری دیاری خۆی تیادا هەبو، سەرەتای:

وەرچەرخانی ئەو راچەنینەیە، هەربۆیە، راپەڕینەکە پارێزراو و پەرەپێدراو چەندین دەستکەوتی مێژوویش هاتەدی، لەوانە: -رزگارکردنی کوردستان لەسوپای داگیرکەرو دام‌و دەزگا سەرکوتکەرەکانی.

- سەرخستنی تاقی کردنەوەیەکی کەم وێنە لەرۆژهەڵاتدا بەهەڵبژاردنی ئازادانەی پەرلەمانی کوردستان‌و پێکهێنانی حکومەتی هەرێمی کوردستان‌و جاڕدانی فیدراڵی.

- دەستەبەرکردنی دیموکراسی حزبایەتی و ئازادی چاپەمەنی‌و سەربەستی کۆڕو هەڵوێست دەربڕین و بەدیهێنانی هەموو شێوەکانی دیموکراسی لەوڵاتدا.

- دروست کردنی پەیوەندییەکی دیپلۆماتیکی بەرین لەسەر ئاستی جیهان‌و راکێشانی سۆزی رای گشتی بۆلای کێشەی میللەتەکەمان. -بەرگری کردنی ئابڵوقەی جیهانی، هەروا گەمارۆی رژێمی فاشستیش.

- تێک شکاندنی نەخشەکانی ئابوری پێنجەم.. تاد.

ئەوانە.. دەستکەوتە گەورەو گرنگەکانی راپەڕینی بەردەوامی میللەتەکەمانن؛ ماکی ئەو دەستکەوتانە، هەست‌و هەڵوێستی پیرۆزی پاراستنی ریزی یەکگرتووی میللەت و هێزی سیاسی پێشمەرگایەتی. ئەمەش، زۆربەی دەسیسەو دەستکێشەکانی

دوژمنانی کوردستانی پوچەڵکردووە، لەپاڵ ئەم دەستکەوتەداو، لەناو پرۆسەی بەردەوام بوونی دیموکراسی لەکوردستاندا، دیاردەی یەکگرتنی هێزە سیاسە هاوبیرو هاوهەڵوێستەکانی کوردستانی لەبەر رۆشنایی دەرکەوتنی راستیەکانی سەردەم، وەکو پەرۆشیەک بۆ سەرخستنی ئێجگارەکی خەباتی میللەتەکە، سەریهەڵداوەو بەمەش، خەریکە برینە بەسوێکانی پارچەپارچە بونی ریزەکانی بزوتنەوەی گەلەکەمان بەئارامی چارەسەرکردنی برینەکان، سارێژ دەبنەوە.

- جەماوەری خۆراگری کوردستان!

دوای ئەوەی یەکێتیەکەمان یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، بۆ بەدەنگەوە چونی بانگەوازە دیموکراسییەکەی بەرێز مام جەلال، لەگەڵ حیزبی سۆشیالیستی کوردستاندا دڵسۆزانە تاقی کردنەوەی یەکگرتنی سەرختیو کوتایی بەژانی سیاسی ساڵەهای رابوردوو پێچەوانەی پیلانی دوژمنان هێنا، ئەوجا لەتەک باڵێکی دیکەی بزوتنەوەی رزگاری خوازی گەلەکەمان کە رۆڵی دیارو شۆرشگێرانەیان لەشۆرشە نوێکەدا شاردراوە نییە، لەگەڵ حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستان (پەیرەو-یەکگرتن) دوای ماوەیەک لێدوانی ئازادانە یەکگرتنیان بەگیانێکی دیموکراسیانە و هەست کردن بەئۆباڵە مێژووییەکانی سەرکەوتنی رێرەوی دیموکراسی، گەیاندە ئامانج. یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بەم یەکگرتنەش دەیسەلمێنێ کە بە بەرنامەو روحیەتێکی تازەی سەردەم مامەڵە لەگەڵ رێبازە جیاوازەکانی بۆتەی خەباتی دیموکراسی و چینایەتی دەکاو، بەکردەوەش دەبێتە چوارچێوەیەکی هاوچەرخی گونجاوی رێبەرایەتی کردنی کوردایەتی دیموکراسی میللەتەکەمان.

زەحمەتکێشانی پەیرەو-یەکگرتنیش، بەو سور بونەیان لەسەر یەکالابوونی دیموکراسیانە لەگەڵ هاورێیانی ناو حیزبەکەیان و بەم یەکگرتنەیان لەگەڵ یەکێتی دا، دەیسەلمێنن کەوا نوێنەرەوەیەکی سەرەتای خەمڵینی وشیاری چەپی ریالیستی و دیموکراتی کوردستانن لەپێناوی درێژەپێدان و قوڵکردنی رێرەوی دیموکراسی دا.

جەماوەری کوردستانی ئازاد! ئەم یەکگرتنە لەنێوان یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و (پەیرەو-یەکگرتن)دا، لەنێوان دوو هێزی نامۆ بەیەکدی پێکنەهێنراوە، بەڵکو لەنێوان دوولایەندا پێکدێ کە سەرەتای ئەوەی کاتی خۆی بیروڕای جیاواز لێکی کردنەوەو ئێستاش بیروڕای نوێ یەکیان دەخا، وێڕاش، شەرەفی هاوبەشی

سەرەتای خەباتی سیاسی یەکێتیی نیشتمانییو دارشتنی بناغەی سەر لەنوێی مەفرەزە سەرەتاییەکانی شۆڕشیان هەیەو لەزۆربەی شانازی و سەروەریەکانی شارو شاخی شۆڕشەکەدا، لەسەر رەگێک نشونمایان کردووە، باشترین بەڵگەی ئەم شەرەفە مێژووییە هاوبەشەش، سەدان شەهیدی کوردستانە کە هاوڕێ و هاوسەنگەری هەموولایەکمانن، کەواشبێ:

ئیدی جێی خۆیەتی یەکگرتنی یەکێتی و پەیڕەو-یەکگرتن، لەپێناوی سەرخستنی تەواوی ئەرکەکانی دیموکراسی و چارەسەرکردنی کێشە جۆراوجۆرەکان و ریفۆرمی زیاتری ریزەکانو کاروبارەکانْ، سەربخرێ و بەمەش، لایەنە گەش و پرشنگدارەکانی مێژووی هەردوولامان دەبێتە زەمینەیەکی پتەو بۆ ئەوەی سوربین لەسەر شارێبازی دیموکراسی کۆک و کۆبین بۆ بەدی هێنانی ئامانجە ستراتیژیەکان، هیواداریشین ئەم یەکگرتنە دەرگا ئاواڵە بکات بۆ ئەو گروپ و لایەنە چەپانەی راستگۆن لەگەڵ ئامانجە دوورو نزیکەکانی گەلەکەمان، هەروا لەگەڵ تێکڕای ئەو تێکۆشەرانەی لەدەرەوەو لەکوردستاندا شوێنی شیاویان سەنگەری خەباتی رزگاری گەلەکەیانە.

- بەردەوام بێ رێرەوی یەکگرتن
- بژی ئازادیو دیموکراسی

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان
حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان
(پەیڕەو-یەکگرتن)
١٩٩٣/٧/٢٤



**شەهید حەمید ناسراو بە (شاسوار)**

١٩٥٥/٧/١ لەدایکبووە، ١٩٨٨/١١/١١ شەهیدبووە،

شاسوار.. هاوڕێی سەردەمی قوتابی مەلا بەختیار بوو، لە ناوەڕاستی شەستەکانەوە. پەروەردەکراوی گیانی ئازادیخوازی بناری بەمۆی سەرکەش بوو. یەکێک بووە لە قارەمانەکانی هەڵمەتی هەکاری. هەستی بە مەترسی لەسەر کۆمەڵگە کردبوو، سەنگەری ئالای شۆڕشی کردە بەرگری لە ڕێبازی ڕەنجدەران.. لەگەڵ شەهید فەرید.. بە بڕیاری نەوشیروان، لەکاتێکدا خواردنیان لەگەڵ مەفرەزەیەکی یەکێتی دابەش کردبوو.. لەکاتی ڕۆیشتنندا دەستڕێژی ڕقیان لێکروو گەیشتنە کاروانی نەمران.




**شەهید ئازاد فەقێ عەلی ..**

ساڵی ١٩٦٣ لەدایکبووە، رۆژی ١٩٨٨/٤/٢٤ شەهیدبووە، رۆڵەی بنەماڵەیەکی تێکۆسەرو شەهید پەروەری گەرمیان – کفری بوو. لە بنەماڵەکەیەوە، هەستی کوردایەتی پشکوتووە، کە ڕێچکەی برا شەهیدەکەی (شەهید قاسم) دەگرێتەبەرو دەبێتە پێشمەرگە.. سەنگەری رەنجدەرانی هەڵبژارد. بۆیە بوو بە ئاڵای شۆرش.. تا شەهیدیش کرا نمونەی پارتیزانی خۆراگرو دەربەستی سەربەستی بوو.. بە تاقی تەنیا کێوی ورە بووە لەناو هەڤالانیدا..



**شەهید سالار حاجی دەروێش ١٩٥٣ - ١٩٨٨**

شەهید سالار، لە چوارتای خۆراگرییەوە، دەبێتە تێکۆشەرێکی شۆڕشگێڕو پێشمەرگە. پێشمەرگەیەکی بە ورەو بە هەڵوێست بوو. سڵی لە دوژمن‌و لە دوژمنانی ئازادی نەدەکردەوە. پیاوێکی سەنگین‌و کەسایەتی کۆمەلایەتی بەهێز بوو. سەنگەری ئالای شۆڕشی لە ناو شۆڕشدا، بۆ پاراستنی ڕێبازی ڕەنجدەرانی هەڵبژارد. بێباک بوو لە ئەستۆپاکی خەبات. لە کەسایەتیەکەی سل دەکرایەوە، بۆیە بە غەدرێکی کەموێنە بەبڕیاری نەوشیروان شەهید کرا.



**شەهید عومەر بچکۆل**

١٩٦٦/٧/١ لەدایکبووە، ساڵی ١٩٨٥ شەهیدبووە. لە تەمەنی (١٥) ساڵی دەبێتە پێشمەرگە، رۆڵەیەکی هەرە ئازاو بە هەڵوێست بوو. سڵی لەمەرگ نەدەکردەوە ئەندامێکی کۆڵنەدەری ئاڵای شۆڕش بوو. لە کاتی پەلاماردانی هاوڕێیانی ئاڵای شۆڕش.. بەرامبەر دژەکانی ئازادی.. بێباک بوو.. فەرماندەکان لێی دەترسان. بۆیە لە نێوان (ولیانو نەوتی)دا.. بە بڕیاری مەڵبەندی یەک.. شەهیدیان کرد.



**شەهید سۆران**

١٩٦٣ لە دایکبووە – شوباتی ١٩٨٩ شەهید بووە

هاوڕێ سۆران .. لە پێشمەرگەو کادیرە وشیارەکانی کۆمەڵەو ئاڵای شۆڕش بوو. هەر لەتافی لاوێتیەوە، لە ناو بنەماڵەیەکی خاوەن هەڵوێستی جوتیاران. بەرامبەر دەرەبەگو داگیرکەران، پەروەردە کرابوو.. بۆیە، کادیرێکی بە ئەمەکو خاوەن هەڵوێستی ڕەنجدەرانبوو، لەو پێناوەشدا گیانی بەخت کرد.



**شەهید مستەفا ئەحمەد ئەمین رۆستەم ناسراو بە شەهید ( هەڵۆ)**

لەدایکبووی ١٩٦٨، لە ساڵی (١٩٨٥) لە گوندی (بیوەک) شەهید کراوە، لە گوندی (میرمام) نێژراوە.

شەهید مستەفا (هەڵۆ) کوڕە جوتیارێکی شۆڕشگێڕو بە هەڵوێست بووە. پێشمەرگەیەکی خۆشەویستو خۆنەویستو خاوەن بیرو باوەڕ بووە، لە پێناوی بیرو باوەڕەکەی.. نامەردانە لەسەر ئاڵای شۆڕش یەکێتی شەهیدیان کرد.



**شەهید عیدان ناصر**

۱۹۸٦/٦/۱۲ شەهید بووە.

خانەقین کوڕی جۆشدانی خەباتە. عیدان، لاوێکی گەورەبووی سەردەمی تەعریبە. لاوێکی خوێن گەرم. عاشقی کوردستان‌و فیداکاری.. دەبێتە پێشمەرگەو ڕێبازی ئاڵای شۆڕش هەڵدەبژێرێ. بێ ئاگا لەوەی، ئازادی لە ناو شۆڕشیدا، ئەتک دەکرێ‌و بەبڕیاری نەوشیروان دەکرێتە قوربانی ڕقێکی نەگریس!



**شەهید ئەکرەم حەسەن قادر ١٩٦٢/٥/١ – ١٩٨٦/٨/١٢**

ئەکرەم حەسەن.. تەعریب، رقی پیرۆزی لا تیا دەچێنێت. سەنگەری خەبات هەڵدەبژێرێت. دەبێتە ئالای شۆڕش. بەبڕیاری نەوشیروان دەکرێتە قوربانی دژایەتی ئازادی. لەکاتی تیربارانکردندا.. بە پێشمەرگەکان دەڵێ: دوربکەونەوە، با پارچەی فیشەکەکانت بەرنەکەوێ.. بژی کوردو کوردستان.



**شەهید حەیدەر**

حەیدەر هەر لە لاویتیەوە، لە ریزی قوتابیان تێکۆشاوە. کەسێکی هێمن و دڵسۆز بووە، ١٩٨١ هاتووەتە ریزی شۆڕش، راستیەکانی زانی رێبازی ئاڵای شۆڕشی هەڵبژارد. لەگەڵ هاوڕێکانی (عێدان و ئەکرەم).. لەسەر بڕیاری نەوشیروان بە رێژنەی گوللەی سەرکوتکردنی ئازادی، ١٩٨٦/١/١٢ شەهید کرا.



**شەهید فەرید ئیبراهیم عبدالقادر ١٩٥٩-١٩٨٧**

تێکۆشەرێکی هەرە دڵسۆزی کوردستانو خانەقینو شۆڕش بوو. کەسێکی راستگۆ، ئازا. خۆشەویست بوو. جوامێری بە روخساریو هەڵسوکەوتیا دیار بوو. پاداشتی قارەمانێتیەکەیو خزمەتکردنی هاوسەنگەرەکانی بەبروسکەی نەوشیروان لەگەڵ شەهید شاسوار لەپشتەوە دەستڕێژیان لێکرا.. چونکە پارتیزانو ئالای شۆڕش بوو!



**عبدالرحمن مەولود ناسراو بە ( كاروان)**

ساڵی ١٩٦٥ لە دایكبووە، شەهید كاروان.. لە خێزانێكی كوردپەروەری تێكۆشەر پەروەردەكرا. لەو لاوانەبوو لە هەولێردا، نمونەی خۆڕاگریو كۆڵنەدان بوو. لە بیروباوەڕو ئازایەتیدا.. تێكۆشەرێك بوو تەواوی ژیانی بۆ فەلسەفەی چەپ و ئازادی تەرخانكرد.. هەتا ڕژێم لە ١٩٨٧/٢/١١دا لەسێدارەی نەمری دا.



**شەهید ئازاد خالە مینە گەلالی**

لە ساڵی ١٩٥٧ لە دایکبووە لە ١٩٨٧/١٠/١٢ شەهید بووە.

شەهید ئازادلە چۆمانی سەرکەش چاوی بە ژیان هەڵهێناوە.. کولنەدەرێکی کۆمەڵە بووە بۆ بەرگریکردن لە ڕێبازی چەپ و کرێکاران، ڕێبازی ئاڵای شۆڕی هەڵبژاردووە. لە کاتی سەرکوتکردنی ئازادیدا لەگەڵ ڕێبوار پێنجوێنی، بەدەستی یەکێتی شەهید کرا



**فەرهاد ئەحمەد رەسول ناسراوە بە (فەرهاد کاوانی) لەدایکبووی ۱۹٦۷ لە ساڵی ۱۹۸۸ شەهید کرا.**

شەهید فەرهاد کاوانی، لە کومەڵەوە بو ئاڵای شورش.. رێبازی کرێکاران‌و رزگاری و دیموکراسی بەرنەدا. بوێرو گیان لەسەر دەست بوو. گیانیشی لەسەر دەستی رژێم کردە قوربانی گەل‌و رەنجدەران.



**کامەران عبدالرعزیز محەمەد**

له ١٩٦٦ له دایکبووه له ١٩٨٤ پەیوەندی کردووه به کومەڵەی زەحمەتکێشانی ئێرانەوە، ١٩٨٥ پەیوەندی کردووه به ئالای شۆڕشەوه له جیابوونەوەی ئالای شۆڕش دەستگیر دەکرێت. ١٩٨٦ جارێکی تر پەیوەندی به ئالای شۆڕشەوه دەکات. له ١٩٨٧/١٠/١٢ له گوندی (بەربیان) لەگەڵ دوو هاوڕێی تری دەکەوێته کەمینێکی تیپی (٨٥)ی بەڕانەتیو شەهید دەکرێن..



**شەهید موشیر محەمەد سادق .ناسراو بە کاردۆ ساڵ ١٩٦٤ لەدایکبووە، سالی ١٩٨٦ شەهیدبووە**

شەهید موشیر.. برای شەهید فارس محەمەدە.. تێکۆشەرێکی نمونەیی کوڕی خەبات بوو. پابەندبوو بە ڕێبازی چەپی چینایەتی. بەرگەی رۆژگارە نالەبارەکانی دەگرت.. هەتا بنیەروا، گیانیشی لە ساڵی ١٩٨٧دا بەخت کرد.



**شەهید مەناف تاهیر توفیق سالی ١٩٦٥ لەدایکبووە،**

**١٩٦٥شەهیدبووە.**

شەهید مەناف لە گوندی کاوانیانی زرارەتی لەدایکبووە. لاوێکی خوێن گەرمی کوڵنەدەر. خەمی نیشتمانو ئازادی کردبووە خەمی چارەنووسو پێشمەرگایەتی. هەمیشە گیان لەسەر دەست بووە.. هەتا ئەو کاتەی گیانی بەخشیە کوردستانو کرێکاران.



**شەهید واحیدە سور... .سالی ١٩٦٩ لە دایکبووە. سالی ١٩٩١ لە راپەرین شەهید بووە**

شەهید واحیدە سوور.. نمونەی تێکۆشەری لەخۆبردوو بوو، پێشمەرگە.. بەهەڵوێست.. دەربەستی خەباتی چینایەتی.. خاوەن فەلسەفەی چینایەتی کۆمۆنیستی.. ژیانی بۆ خەباتی کرێکاران‌و شۆسیالیزم تەرخانکردبوو . لە راپەریندا .. گیانی کردە سورخەلاتی سەرکەوتن.



**شەهید رزگار عەلی حەسەن .ساڵی ١٩٧٠ لە دایکبووە. ساڵی ١٩٩١ شەهیدبووە**

شەهید رزگار.. لە خەباتی نهێنیدا، ئارامو خەمخۆری ڕێکخستنو هاوڕێکانی بوو. لە ڕاپەڕیندا، شێرئاسا ڕاپەڕیو گیانی پیرۆزی کردە چرای سەرکەوتن.



**شەهید فەرهاد عەلی حەسەن .ناسراو بە مامۆستا فەرهاد. .سالی ١٩٥٧ لە دایکبووە. سالی ١٩٩١ شەهیدبووە**

شەهید مامۆستا فەرهاد.. هاوڕێی دەربەستی ئالای شۆڕش‌و هەمیشە ئامادەبوو بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی.. سەرەڕای ناڵەباری ئالای شۆڕش.. بەڵام فەرهاد.. فەرهاد ئاسا ڕاپەڕی لە ڕاپەڕیندا.. ڕۆڵێکی دلێرانەی بینی. گیانیشی بەخشیە سەرکەوتنی ڕاپەڕین.



**شەهید رەشاد عەلی حەسەن.ناسراو بە هیوا جیهاز .ساڵی ١٩٦٣ لە دایکبووە. ساڵی ١٩٩١ شەهیدبووە**

شەهید رەشاد.. ناسراو بە هیوا، بە هیوایەکی شۆڕشگێڕانە هاتە ڕیزی تێکۆشان. پێشمەرگایەتی بوو بووە خولیای هەتا ڕاپەڕین.. لە ڕاپەڕیندا.. دڵی بەرایی نەدەدا شکست بێنێ، بە خۆی و دوو برای لە کاتی کوڕەوەکەدا گیانی کردە قەڵغانی پاراستنی شکۆی ڕاپەڕین.



**شەهید مونەید ملا حەسەن ....لەدایک بوی ١٩٦٩ ساڵی شەهید بوون ١٩٩١**

شەهید مونەیەد.. تێکۆشەرێکی سەر ڕاست.. بێباک.. پابەند بە ڕێبازی دیموکراسیو سۆسیالیزمی کرێکاری.. ڕاپەرینی بە دەروازەی فراوانبوونی کرێکارانی دەزانی.. بۆیە ، شەهید بوونی کردە مەشخەڵی ئامانجەکانی کرێکارانو کوردستان!



**شەهید هەژارکەریم مەسیفی لە سالی ١٩٦٧ لە دایکبووە. لە سالی ١٩٩١ شەهید کرا.**

شەهید هەژار کەریم.. تێکۆشەرێکی وشیار.. نووسەر .. کۆڵنەدەری کوڕی خەباتی چینایەتیو نەتەوایەتی بوو. هەمیشە ئامادەی گیان بەخشین بوو.. لە ڕاپەڕیندا.. کە دژەکانی ئازادی ناتوانن کۆڵ بە چەپەکان بدەن..



**شەهید جەنگی بەکر هیرانی ناسراو بە (ڕەوەند).**

ساڵی ١٩٦٣ لەدایکبووە، ناوی جەنگی بوو.. بۆ کرێکاران و کوردستانیش دەجەنگی.. دەیویست.. کوردستانەکەی.. وەکو دەڤەری هیران و نازەنین.. ئازادو ڕازاوە بێ.. هەتا لەو پێناوەشدا شەهید کرا.




**شەهید فاخر ناسراو بە (دیلان شەقڵاویی).لەدایکبووی ١٩٦٢ لە ١٩٨٧ شەهیدکرا**

شەهید فاخر.. هەموو خۆشیەکانی شەقڵاوەی رەنگینی وەلانا.. بوو بە پێشمەرگە..پێشمەرگەیەکی بە هەڵویستی ئالای شۆڕش بوو.. گیانیشی لەو پێناوەدا .. کردە مەشخەڵی خەباتی چینایەتی‌و نەتەوایەتی..



**شەهید عبدالوهاب سابیر سمایل ..ساڵی ١٩٦٠ لەدایکبووە، لەساڵی١٩٨٥ شەهید بووە**

یەکەم شەهیدی ئاڵای شۆڕشە. هاوڕێ لەگەڵ شەهید ئەسعەد ڕەسول ئیبراهیم. لە باغەمرەی ڕەقەی بن هەولێر.. گیانی سپاردە کرێکاران و ڕەنجدەرانی کوردستان.



**شەهید خسرۆ کاویس. ناسراو بە سەپان، سالی ١٩٦٦ لە دایک بووە. سالی شەهیدبوونی ١٩٨٧**

شەهید سەپان.. لاوێکی قارەمانی کوڕی گیانبازی بوو. باوەڕی بتەوی بە شۆڕش‌و ئازادی کرێکاران بوو.. هەر لە پێناوی سەرفرازی‌و سەرکەوتنیاندا سالی ١٩٨٧ شەهید کرا.



**شەهید سەدرەدین لە ساڵی ١٩٦٥ لەدایکبووە لە ١٩٨٧/١٢/٣١ لەئەبو غرێب لە سێدارەدرا**

شەهید سـەدرەدین .. هەمیشە بە هەڵوێست بووە ، لە ژێر فشاری (یەکێتی) ناچار دەبوون، خۆیان لە دورەدەست پەنا بدەن..لەگەڵ شەهید ڕێباز دەست رژێم دەکەونو شەهید دەکرێنو دبن بە شەهیدی کرێکاران.



**شەهید خەلیل ئیبراهیم عەباس ناسراو بە (خەلیل تورکمان) ساڵی ١٩٦٢ لە دایکبووە، ساڵی ١٩٨٧ شەهید بووە.**

بەنازناوەکەی دیارە کە لە خێزانێکی تورکمان پەروەردە کراوە، بەڵام پەروەردەکراوێکی سەردەمی تەعریبی خانەقینە، کە رۆژگارێکی رەش بوو..

خەلیل.. لاوێکی چەپ.. پاک.. راستگۆ.. بە هەستی پاکی خۆی ئاڵای شۆڕشی هەڵبژارد. هەر لەسەر رێبازی چینایەتی- دیموکراسی ئاڵاش، گیانی بەخت کرد. ئێستاش خەلیل کسپەیەکی هەمیشە بە ئازاری ناخی هاوڕێو هاوسەنگەرەکانیەتی، شانازی شاری خانەقینیشە.



**شەهید ڕەشاد موراد مەلا....ناسراو بەشێرکۆ....لەدایک بووی١٩٦٢-**

**لەساڵی١٩٨٧ لەسێدارە دراوە**

ڕەشاد.. لە ١٩٧٨.. درکی خەباتی چینایەتیو نەتەوایەتی کردووە. کە زانی کۆمەڵە.. سەنگەری ڕێبازی کرێکاران جێدێڵی.. بە دڵو گیان ئاڵاکەی ئاڵای شۆڕشی شەکاندەوە، لە زینداندا قارەمان بوو، بەعس نەیهێشت تەمەنی درێژ بێت لە (٢٥) ساڵیدا شەهیدی کرد.



**کە لە ١٩٧٥/٩/٥ – خۆم لە سلێمانی شاردەوە.**

**ئەم وێنەیەم بۆ مێژوو گرت..**



**١٩٧٨/٣/٢١ نۆكان**

لەسەر راسپاردەی مام جەلال، دوای دامەزراندنی ئیزگە لەلایەن ئەندازیاری شارەزا (تەڵعەت گلی)یەوە، بۆ یەکەمین جار بەرەسمی، ئێزگەی شۆڕشی عێراق هەڵگیرساو لە چیاکانی کوردستانەوە، کرایەوە، یەکەمین ڕاگەیاندنی عەسکەریش.. سەرکەوتنی پێشمەرگە بوو لە دزلی ١٩٧٨/٣/١٩



**بەهاری ١٩٧٨ – نۆکان**

پێش کەوتنەڕێی هەڵمەتی هەکاری

عەلی عەسکەری، مام جەلال، نەوشیروان

تازە کۆبونەوەی فراوانی کۆمەڵە تەواو کرابوو. نەوشیروان بۆ ناوەندی هەڵبژێردرابوو. بە کردەوەش وەکو سکرتێر بوو. بەلام تەنها یەک پێشمەرگەی لەگەڵدا بوو. پێشمەرگە کەمتر بە دیار مەکتەبی سیاسیەوە، دەمانەوە! مام جەلالیش مەفرەزەکەی بەکری حاجی سەفەری بە دیارەوە بوو.



**وێنەیەکی مێژووییە: ١٩٧٨/٤/١٣**

ڕۆژێک پێش جوڵاندنی هێزی هەکاری. مام جەلال قسەیان بۆ دەکات. شەهید عەلی عەسکەری بەرپرسی مەکتەبی عەسکەری، دانیشتوەکان لە پێشەوە. ١- ملازم عومەر ٢- مەلا بەختیار، ٣- بەکری حاجی سەفەر.. لە دواشەوە دلێری سەید مەجید دیارە.. باسی گرنگی هێنانی چەکو فریاکەوتنی جوتیارانی کوردستانی کرد.. کە حکومەت رایان نەگوێزێ!



**زستانی/ ١٩٧٨**

له راستەوە: شەهید سەردار ئیخی مالّی- مەلابەختیار- عەبەرەش- مەلا یاسین- شەهید کاوە مەحمود- هێمن (زرار) شەهید جەبار.

وێنەکە لە شێنێ گیراوە، مەفرەزەکەی خۆمان بوو.. دوای شەڕی شێنێ مانگی ١١/ی ١٩٧٨. ئەم پێشمەرگانە لە شەڕەکە نمونەی قارەمان بوون. دووەم ڕۆژ سەرماکە تینی بۆ هێناین. مەخزەنم پێ دەرنەهات. مەلا یاسین مەخزەنەکەی گۆڕیم!



ئەم وێنەیە ، هەفتەیەک دوای بەرپابوونی جەنگی عیراق-ئێرانە. لەسەر بریاری مەکتەبی سیاسی، راسپێردرام کۆبونەوەیەکی فراوان بە پێشمەرگەو ئۆرگانەکانی سەرکردایەتی لەسەر جەنگەکە بکەم، هۆمەر شێخ مووس ئیدارەی کۆبونەوەکەی کرد. لە قسەکانمدا گوتم:

ئەم جەنگە نارەوایە عیراق سەپاندویەتی. هەلێکی گەورەیە هێزە سیاسیەکانی کوردستان، کێشەکانمان چارەسەر بکەین و خەبات قوڵ بکەین بۆ روخاندنی رژێمی فاشیستی عیراق.



**١٩٨٠ – تورژنه**

له راستەوە:

شەهید نەجۆ، مەلا بەختیار، ئیبۆ، نەناسراوە.

شەهید نەجۆ: رابەری حزبیی ئازادی باکوری کوردستان.

ئیبۆ: جێگری هەڤال خەجێ.. ئالای رزگاری.

ئەو کاتە.. سەرکردایەتی یەکێتی پەناگای شۆڕشگێڕانی باکورو رۆژهەلاتی کوردستان بوو. پێشی ئەوەی ساڵی ١٩٨٤ pkk شۆڕش بەرپا بکات. ئەگەر ئالای رزگاری دەستی بە پارتیزانی کردبا، دەبووە پێشەنگی کوردایەتی لە باکوردا.. ئەمانە هەر خەریکی مشتومڕی تیۆری بوون.. PKK گرەوەکەی بردەوە!



**بەهاری ١٩٨٠-یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵە**

بەکری حاجی سەفەر، روناکی شێخ جەناب، مەلا بەختیار

لە پشتەوە: شێخ جەعفەر، مام رۆستەم و شەهید ئەنوەر حەسەن دیارن، ئەوەی پاڵکەوتووە: سەلاح فەیلییە، کە لە هەڵۆی سوور بوو. لەم وێنەیەدا، مشتومڕی زبرو پیلانگێڕان.. لە ناو کۆنفرانسەکەدا.. بە سیمامانەوە دیارە!




**بەهاری ١٩٨٠-یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵە**

سێهەمین کۆنگرەی زەحمەتکێشانی شۆڕشگێرانی کوردستانی ئێران-هاوینی ١٩٨٢- زیندانی بەردە سوور-مەنگورایەتی رۆژهەلات

لەم کۆنگرەیەدا، مام جەلال بە ناوی یەکێتی و من بەناوی کۆمەڵەی رەنجدەرانەوە قسەمام کرد. هەوڵێکی زۆرماندا، کۆمەڵە ناسنامەی کوردستانی لە دەست نەدا. بە تایبەتی مام جەلال. سوودی نەبوو. لەم کۆنگرەیەدا، بناغەی حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاری دانرا. لەگەڵ مەنسوری حیکمەت‌و ئیرەجی ئازەربی، دیالۆگی گەرم کرا.. مام جەلال توانایەکی تیۆری زۆری نواند. مەنسوری حیکمەتیش.. لۆژیک‌و توانای زۆری هەبوو!

دانیشتوان: عومەر ئیلخانی زادە-عەبدوڵڵای موهتەدی-برایمی عەلی زادە



**بەهاری ١٩٨٠**

پەخشان حەفید، روناکی شێخ جەناب،ئەگنێتا، فاتمە خان.

عومەر شێخ موس، مەلا بەختیار، ئەرسەلان بایز، شێخ عەلی.

چوار شێرە ژن، لەگەڵ هاوسەرەکانیان.. کە لەو دۆخەدا..

هاوسەنگەر بوون.. بەڵام دژایەتی دیموکراسی لەیەکی دابڕین.



سالی ۱۹۸۰- پشتی شاخی دەلوجە و سەرکانی دەرویـان، یەکەمین کۆبوونەوە لەکاتی دانانی مستەفا چاوەڕەش بە ئامر هەرێمی قەرەداغ، لەگەڵ مامۆستا ئەنوەر باسی هەرێمەکە دەکەین. لەدووریشەوە شەهید گۆران تلەزەیتی و حەمە قاشتی.. دیارن.



**هاوینی/ ١٩٨٠**

شەهید ئازاد و شێخ عەلی، تازە لای پارتی دوای کارەساتی هەکاری هەڵهاتبوون.. داوەتێکی پێشمەرگانەم کردن. گیانی هاوڕێیەتی و خۆشەویستی.. لەو پەڕی بەرزیا.. دەفڕی! شەترەنجمان کرد. زۆربەی جار ئازاد هەورامی لێی دەبردمەوە. لە یاریکردندا.. لە من وردترو بە پشووتر بوو.



**١/ی ئایاری ١٩٨٠**

ئەم یادە لە تۆژەڵە گیرامان، یەکەمین جار بوو بە بۆنەی یەکی ئایارەوە، ئاهەنگ بگێڕین. ناسری ڕەزازی.. لە ئاهەنگەکەدا، یەکەمین جار سروودی کرێکارو ڕەنجەدەرانی گوت.. کە دەڵێ:

ڕەنجدەرین جەنگاوەرین

بۆ قەڵای سەرمایەدار ڕابەرین.. ئاوازەکەشی هەر لەناو خەیمەکەی ئێمە دانا.




**بەهاری ١٩٨١ —خڕی ناوزەنگ**

سەربانی بارەگای تازە دروستکراوی مام جەلال

لە راستەوە: هەڤاڵ خەجێ، رەفعەتی مەلا، یوسف زوزانی، مەلا بەختیار، د. کەمال خۆشناو، هێرۆ برایم ئەحمەد.

جەنگی عیراق – ئێران هەلایسابوو.. دڵنیایی لە بارەگاو سەرکردایەتی زاڵبوو بەسەرماندا.ئومێدێکی زۆرمان هەبوو سەرکەوین.. بەلام لە شەڕی ناوخۆدا بە فیڕۆماندا. هەتا دووچاری ئەنفالو کیمیاباران بووین!!



**١٩٨١ —دۆڵی خۆشناوەتی**

**شەهیدان: عەلی نەبی - کاوە مەخموری**

لە کاتێکدا..هێزێکی هاوبەشمانم لە قەراغ، شارەزوور، سەرکردایەتی و هەولێر، برد بۆ پاککردنی زیاتر لە (٨٠) یاخی، بەسەرپەرشتی سلێمان بیریژی. رۆژێکیان لە چیوەی سەروو بووین. لە چیوەی خواروو هێزێکمان بە فەرماندەیی محەمەدی حاجی مەحمود کەوتنە بۆسەوە. بەندەو سامان گەرمیانیو عەلی نەبی، بە پرتاو بە هانایانەوە چوین. عەلی نەبی.. بە پێ خاوسی هەڵمەتی دەبرد. هێزەکەشمان رزگار کرد!



**هاوینی/ ١٩٨١** – بەرەو گەشت!

مەفرەزەی خۆمان، لە پشتی مەکتەبی عەسکەری، بارەگای ئاڵای رزگاری-زەڵێ.

دەڕۆیشتین بۆ گەشتی وەرتێ، خۆشناوەتی، دەشتی هەولێر. هێرۆ برایم ئەحمەد، یەکەمین جاری بوو، سەردانی سنوری هێزەکان بکات. کامێرای ڤیدیۆیی پێ بوو. هەندێک لە وێنەکان کە پیشان دەدرێن لە تی(TV) هەر ئەو گەشتەن. لەناو مەفرەزەکەماندا. شەهید: فەرمان هەورامانی (پوورزای شەهید ئازاد) شەهید حەمەی ئازاد، خەلیل دەبەرند بێرولەیی کۆچکردوو... وەستاون. لەم گەشتەدا، بۆ یەکەمین جار (٢٥٠) پێشمەرگە چووینە ناو هەولێر- گەڕەکی باداوان. مامۆستا جەلال، ئار بی جی نا بە ماڵی ئەمنیکەوە کە تەقەیان لێکردین.




**دوومین کۆنگرەی کۆمەڵە- هاوینی ۱۹۸۲**

سەید برایمی عەلی زادە-مەلا بەختیار-مامۆستا شێخ عزالدین حوسەینی- قادری حاجی عەلی- سەید حەسەن.

مامۆستا شێخ عزالدین.. زانای ئاینی پایە بەرز. بەڵام باوەڕی بە دیموکراسی و کورستانی و چەپی ریالیستی کۆمەڵە بوو. مامۆستا وەکو رابەرێکی سیاسی لە ڕاپەڕینی گەلانی ئێراندا هەڵکەوت. مەخابن، لە ناو ناکۆکی کۆمەڵەو دیموکراتدا، دووچاری فشاری سیاسی.. دەروونی کرا.



**کۆتایی مانگی ۱۲/ی ۱۹۸۳ -بەرەو دانوستان**

بەشێکی وەفدی یەکێتی شەهید د. قاسملوو- مەلا بەختیار-ملازم عومەر- سەید کەریم

لە زیخانەوە، کۆپتەر بردینی بۆ کەرکوک. بەسەر کۆیەدا تێ پەڕین. مام جەلال سەیری شارەکەی کردو شوێنی ماڵی خۆیان و قشڵەو. مەکتەبەکەی، دەستنیشانکرد. د. قاسملوو پێی وت: چاوتان لێیە چەند شارەکەی خۆی خۆش دەوێ. بۆیە دەگوترێ کۆیی‌و خۆیی!



**مەلا بەختیار، نەوشیروان مستەفا**

ناوەڕاستی مانگی یەکی ١٩٨٤.. گوندی بالیسان لەسەر داوای نەوشیروان مستەفا، کۆڕێک لە مزگەوتەکە بەسترا.. جمەی دەهات، سەرگوزشتەی یەکەمین دانیشتنەکانی وەفدی یەکێتیو حکومەتی عێراقم، باسکرد، پرسیارو وەڵامی بەرچاویش هاتە ئاراوە. لە شارەکانیشەوە، میوان هاتبوون!



مەلا بەختیار، نەوشیروان مستەفا، مام جەلال
دوا کۆبونەوەی وەفدی یەکێتی و حکومەتی عێراق .. لە سورداش.
هاوینی ١٩٨٥
لەم کۆبوونەوەیەدا، وەفدی حکومەت بەسەرۆکایەتی عیزەت دووری و عەلی حەسەن مەجید.. ئەمە دوا دیداری هاتنی وەفدی عیراق بوو، جیاوازییەکان لەسەر ڕێککەوتن قوڵ ببوون. وەفدەکە بەترسێکی زۆرەوە هاتبوون.. سورداشیان کۆنترۆڵکرد!!



**کۆڕەوەکەی ڕاپەڕین.. ١٩٩١/٣/٢٢**

ڕەفیق صاڵح، عەلی عەزیز، مەلا بەختیار، فایق صاڵح، ئازاد تۆفیق، دووەم ڕۆژی کۆڕەو.. نزیک سەیدسادق.

ڕۆژێکی زۆر سەخت بوو.. دەیان هەزار ژن و مناڵ و لاو.. پیر، بەپیادەو هەندێکیان لەناو قوڕو لیتاودا، پێڵاوەکانیشان جێمابوو. تراژیدیای نەتەوەیی بوو!



**کۆڕی مەلا بەختیار – شەقڵاوە**

**یەکەمین کۆڕی سیاسی دوای راپەڕین ١٩٩١/٨/٢٠**

کۆڕی.. شکستی راپەڕینو راپەڕینی بەردەوام، یەکەمین کۆڕی سیاسی دوای راپەڕین بوو، نوێنەری چەپەکانو لایەنە سیاسیەکان، لە تەواوی کوردستانەوە بەشدار بوون، خەڵک ئامادەی کۆڕەکە بوونو زیاتر لە (٣) سەعاتی خایاند. دیالۆگێکی ئازادی تیاکرا. رەخنەی ئاشکراش لە تالانیو بڕۆی بەرەی کوردستانی گیرا. داوای هەڵبژاردنو کۆتایی هێنان بە دەسەلاتی بەرەی کوردستانیم کرد!.



**یەکەمین کۆنفرانس ئاڵای شۆڕش – شوباتی ١٩٩٢ – سلێمانی**

ئەم کۆنفرانسە.. وەکو چەپی دیموکراتی کوردستانی، سازدرا. تیایدا.. یەکەمین ڕێکخراوی چەپ بوو، ئاڵای شۆڕش ،بە ڕۆشنی، ستراتیژی دیموکراسیو ئازادیەکانی بەستەوە، بە سۆسیالیزم، سەرەرای نەبونیو فشاری سیاسیو دەسیسەی کێشەنانەوە لە ناو کۆنفرانسەکەدا، بەڵام ڕۆحیەتی چەپگەراییو پەرۆشی یەکخستنی چەپەکان، زاڵبوو.. دەسیسەکان تێکشکێنران!



**٢٠١١/٢/٢٥ یەکەمین کۆبوونەوەی وەفدی یەکێتی:**

هێرۆ برایم ئەحمەد، مەلا بەختیارو دلێری سەید مەجید، سەردانی نەوشیروان مستەفا، لە گەرمەی ١٧/ی شوباتدا. بە راشکاوی گفتو گومان لەسەر دۆخی کوردستانو سلێمانیو پەیوەندی نوێی یەکێتی - گۆڕان کرد، لەم کۆبوونەوەیە بە دواوە، پەیوەندی گۆڕانو یەکێتی، ئارامی بەخۆیەوە بینی.



لەکاتی بەڕێ کردنی وەفدی گۆڕان..

نەوشیروان مستەفا مەلا بەختیار، سالار عەزیز



**دەباشان- ٢٠١٤/١١/٥**

مەلا بەختیار،کۆسرەت رەسول، نەوشیروان مستەفا،مام جەلال، عومەری سەید عەلی، جەلال جەوهەر

لەکاتی نەخۆشکەوتنی مام جەلال.. نەوشیروان مستەفاو وەفدی گۆڕان، سەردانیان کرد. سەردانەکە، مێژووی کۆن و نوێی.. بەرجەستە کرد. لەکاتی بەرێ کردندا نەوشیروان وتی: ژیان ئاوهایە.. مام جەلال دونیا زەلالەتی بوو بە دەستیەوە، کەچی ئاوای بەسەر هاتووە.

## سەرچاوەکان:

أ- عەرەبی:
١-سايكولوجية العدوان. بحوث في ديناميكية العدوان لدى الفرد، الجماعة، الدولة (فرويد، لورنز، ولترز، ميلر وأخرون). ترجمة عبدالكريم نامق.
٢-لماذا يتمرد البشر. تأليف (تيد روبرت غير) ترجمة و نشر (مركز الخليج للأبحاث) ٢٠١٤.
٣-يوفال نوح هراري. العاقل. تأريخ مختصر للنوع البشري. ترجمة: حسين العبري. صالح بن علي الفلاحى. دار منجول للنشر. ٢٠١٨.
٤-صراعات الكنيسة و سقوط القسطنطينية. نجيب اسطيفان. الطبعه الاولى ٢٠١١- دار التكوين.
٥-حسين العودات- النهضة والحداثة بين الارتباك والاخفاق. دار الساقي- الطبعة الاولى ٢٠١١.
٦-جيوفانا رورادوري. الفلسفة في زمن الارهاب. حوارات مع يورغن هابرماس و جاك دريدا. ترجمة: خلدون النبواني. الطبعة الاولى. بيروت- حزيران/٢٠١٣.
٧-فيتوريو بوفتشي-العنف- مختارات فلسفية. ترجمة: ياسر قنصوة. المركز القومي للترجمة. ٢٠١٧.
٨-د.علي الوردي فى الطبيعة البشرية. محاولة فى فهم ما جرى. تقديم: سعد البزاز/١٩٩٦.
٩-عادل مراد. الانطلاقة من طليطله الى بغداد. من ارشيف الانصات المركزي.

ب- فارسی:
١٠-افكار هگل. دكتر كريم مجتهدى. چاپ دوم. پژوهشگاه علوم انساني و مطالعات فرهنگي.
١١-فرهنگ توصيفي علوم رفتاري: شناختى. دكتر على اكبر شعارى نژاد. انتشارات اطلاعات. چاپ اول١٣٩١.
١٢-دانشنامه ارتباطات ٢٠. جامعه شناسى نوين ارتباطات رسانه هادر جهان امروز. دكتر باقر ساروخانى. استاذ دانشگاه تهران. انتشارات اطلاعات. تهران-١٣٩١.
١٣-لارو شفوكو- حكمت ها، ترجمة دكتر حمدى گلپايگانى. انتشارات اطلاعات. تهران. ١٣٩٠.

ج- کوردی:
١٤-ئیبراهیم جەلال. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە. چاپی یەکەم- ٢٠١١
١٥-مام جەلال. دیداری تەمەن- لە لاوێتییەوە بۆ کۆشکی کۆماری. بەشی دووەم. ئامادەکردنی: سەلاح رەشید. چاپی یەکەم.٢٠١٧.
١٦-نەوشیروان مستەفا ئەمین. پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن- دیوی ناوەوەی روداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٧٩-١٩٨٣. چاپی دووەم ١٩٩٨-سلێمانی.
١٧-نەوشیروان مستەفا. خولانەوە لەناو بازنەدا- دیوی ناوەوەی روداوەکانی کوردستانی عێراق (١٩٨٤-١٩٨٨). چاپو بڵاوکردنەوەی (ناوەندی چاپەمەنیو راگەیاندنی خاک) ١٩٩٩. چاپی دووەم.
١٨-نەوشیروان مستەفا ئەمین. لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ. دیوی ناوەوەی روداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٧٥-١٩٧٨. چاپی دووەم. سلێمانی-١٩٩٧.

١٩-یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان. لە کۆمەڵێ بەڵگەنامەی ساڵی ١٩٧٥-١٩٨٢دا. کتێبی یەکەم. ئامادەکردن‌و ساغکردنەوەی (یوسف محەمەد بەرزنجی) ٢٠١٧.
٢٠-پشکۆ نەجمەدین. ئەزموون‌و یاد- کتێبی یەکەم. فڕین لە شەودا (١٩٧٨-١٩٨٣). چاپی پێنجەم-٢٠١٩.
٢١-پشکۆ نەجمەدین. ئەزموون‌و یاد. کتێبی دووەم. ئاڵای شۆڕش‌و حیکایەتەکانی زیندان ١٩٨٣-١٩٨٨. چاپی پێنجەم ٢٠١٩. چاپخانەی هەژار موکریانی.
٢٢-فەرەیدون عەبدولقادر. بیرەوەریەکانم لەگەڵ خاڵە شیهاب‌و هاوڕێکانی. لە بڵاوکراوەکانی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ. چاپخانەی شەهید (ئازاد هەورامی) چاپی یەکەم ٢٠١١.
٢٣-فەرەیدون عەبدولقادر. هەڵۆ سوورەکانی قەندیل. دەزگای چاپ‌و پەخشی سەردەم. چاپی یەکەم. سلێمانی-زستانی ٢٠١٧.
٢٤-ڕێباز. قەندیل بەغدای هەژاند. بەشی یەکەم‌و دووەم. سلێمانی- ٢٠٠٨. چاپی دووەم. لە زنجیرە بڵاوکراوەکانی بنکەی ڕۆشنبیری شەهید. ژمارە(٢٠).
٢٥-کامەران ئەحمەد محەمەد ئەمین (کامەران مەنتک). کوردستان لەنێوان ململانێی نێودەوڵەتیی‌و ناوچەییدا ١٨٩٠-١٩٣٢). دەزگای چاپ‌و پەخشی سەردەم. سلێمانی-٢٠٠٠. چاپی یەکەم.
٢٦-هەڵبژاردەیەک لە نوسینەکانی شەهید ئارام. ناوەندی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان-عێراق- چاپخانەی شەهید برایم عەزۆ. ١٩٨٠.
٢٧-د.ئەحمەد حەمەئەمین. ڕەوتی چەپ لە باشووری کوردستان، کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان نموونە. ٢٠١٦- هەولێر- چاپخانەی ڕۆژهەڵات.
٢٨-شاخەوان عەباس. سەفەری کوردایەتی بیرەوەریەکانی شارو شاخ ١٩٧٤-١٩٨٠. چاپی دووەم. ٢٠١٢. ئەکادیمیای هۆشیاریی‌و پێگەیاندنی کادران.
٢٩-د.سەعدی عوسمان هەروتی. بزاڤی ڕزگاریخوازی نیشتیمانی لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا (١٨٨٠-١٩٣٩ز). هەولێر-٢٠٠٧. بڵاوکراوەی کۆڕی زانیاری کوردستان. ژمارە (٣٠).
٣٠-حەمەی حەمە سەعید. دەنگی خاک. بیرەوەری ١٩٧٦-١٩٩١. بەرگی یەکەم. چاپی یەکەم-٢٠١٦.
٣١-ئینسکلۆپیدیای یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان- فەرید ئەسەسەرد. سەرپەرشتیاری گشتیی‌و سەرۆکی دەستەی کارا. لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای هۆشیاریی‌و پێگەیاندنی کادیران. چاپی دووەم.
٣٢-هەواڵنامەی کوردستانی عێراق. یەکەمین هەواڵنامەی شۆڕش. ئامادەکردنی: نەوزاد عەلی ئەحمەد. ئەکادیمیای هۆشیاریی‌و پێگەیاندنی کادیران- سلێمانی-٢٠١١.
٣٣-ڕاگەیاندنی کۆتایی یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان. لەژێر دروشمی (بەرەو پتەوکردنی ڕیزەکانی کۆمەڵەو ڕاپەڕاندنی جەماوەری گەلەکەمان) ئایاری ١٩٨١.
٣٤-ژیان‌و خەباتی سیاسی د.ئەرسەلان باییز لە چاوپێکەوتنێکی مێژوویدا. چاوپێکەوتن: ئیسماعیل کوردە. چاپی یەکەم: ٢٠١٩.

٣٥-به خەونی گەورەوە کەوتینەڕێ. مامۆستا جەعفەر (فازل کەریم ئەحمەد). چاپی یەکەم.٢٠١٩.
٣٦-عەبدوڵلا حەسەن زادە-سکرتێری پێشووی حیزبی دیموکراتی کوردستان. ئەفشینی مدریسی-(لەرۆژهەلاتەوە ٤). ٢٠١٩.
٣٧-عیسا پژمان. نهێنییەکانی بەستنی پەیمانی ١٩٧٥-ی ئەلجەزایر (لە ئارشیفی تەواو نهێنی ساواک). وەرگێڕانی: ناسر ئیبراهیمی. بنکەی چاپەمەنی رۆژ-سوید١٩٩٧.
٣٨-جەلیل گادانی. (٥٠ سال خەبات) کورتە مێژوویەکی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران. بەرگی یەکەم.
٣٩-پشکۆیەک لە خۆلەمێشدا.. بەشێکی گرنگ لە ژیاننامەی هۆمەر شێخ مووس. نەوزاد عەلی ئەحمەد ئامادەی کردووە.
٤٠-د.نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد. سەرەتایەک دەربارەی سۆسیۆلۆژیای مەعریفە. چاپی ٢٠٢٠.
٤١-ئەحمەد بانیخێلانی. یادەوەرییەکانم. چاپی دووەم- سلێمانی-٢٠١٤.
٤٢-بەختیار عەلی. دوا خەندەی دیکتاتۆر. چاپخانەی کارۆ. ٢٠٢٠.
٤٣-بەختیار عەلی. رەخنە لە ئەقلی فاشستی.
٤٤-مۆدێرنیزم- پرۆژەی چەمکە فکریو فەلسەفیەکان- دەزگای ئایدیا. ٢٠١٨.
٤٥-عەلی بچکۆل. سەختەڕێ لە چەمی رەزانەوە تا ترۆپک. چاپی یەکەم. سلێمانی ٢٠١٨.
٤٦-بەهمەنی سەعیدی. خەبات بەرەو سەرکەوتن. (دیدارێک لەگەڵ ئیبراهیمی عەلیزادە تایبەت بە مێژووی کۆمەڵەو کوردستانی ئێرانو بزووتنەوەی چەپ). بەرگی دووەم- چاپی سێهەم ٢٠١٢.
٤٧-سالار رەشید. ئەو کاروانەی بۆ هەواری ئێمە نەچوو. چاپخانەی تاران. چاپی یەکەم ٢٠٢٠.
٤٨-کۆمەڵە. (گۆڤاری کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان). ژمارە (١) خولی (٢) کانونی دووەم ١٩٨٢- رێبەندانی ١٣٦٠. بەختیار.
٤٩-کۆمەڵە. (گۆڤاری کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان). ژمارە (٣) خولی (٢) مارتی ١٩٨٢-نەورۆزی ١٣٦٠. بەختیار.
٥٠-کۆمەڵە. (گۆڤاری کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان). ژمارە (٦) پایزی ١٩٧٩.
٥١-گۆڤاری چیا. ژمارە (٢) ئایاری ٢٠٠٧.
٥٢-لەیادی ١٩ ساڵەی داستانی شێنێ دا، محەمەد سور شێنەیی. رۆژنامەی ئاڵای ئازادی. ژمارە (٢٥٦). ١٩٩٧/١١/١٧.
٥٣-گۆڤاری سڤیل. فوئاد قەراغی: دەربارەی دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسی لینینی.
٥٤-ئاڵای شۆرش. ژمارە(٧). کانونی دووەمی ١٩٩١
٥٥-رۆژنامەی کوردستانی نوێ. "ژمارە (٤٤٤)- ١٩٩٣/٧/٢٥ یەک شەممە".
٥٦- کۆمەڵە، ئۆرگانی ناوەندی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان- خولی یەکەم ژمارە (١-٩) پایزی (١٩٧٨- زستانی ١٩٨١)، ئامادەکردن: نەوزاد عەلی ئەحمەد.
٥٧- کۆمەڵە، گۆڤاری کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان- عیراق، خولی دووەم ژمارە (١-٦) (کانوونی دووەمی ١٩٨٢- حوزەیرانی ١٩٨٢)،پرۆژەی هاوبەش.

هاوڕێ حەمە ئاواتی زۆر خۆشەویست

[illegible]

پێش ئازادکردنی مەلا بەختیار بە (٧) مانگ، دوای سێ ساڵ لە باری ناڵەباری دۆخی زیندان، نامە بۆ هاوڕێکانی دەنوسێ، کە دور لە رق و کاردانەوە، هەڵوێست وەرگرن ودەربەستی خەباتی ڕزگاری کوردبن.

لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنگەریی چاودێر
2020